بەرگی یەکەم

رۆمان

فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

# گەمژە



وەرگێڕانی: حەمەکەریم عارف



گەمژە – بەرگی یەکەم

* بابەت: ڕۆمان
* نووسینی: دوستۆیفسکی
* وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف
* پیتچنین: ڕزگار حەساری
* هەڵەچن و ڕێنووس: شکار بروسک
* شوێنی چاپ: چوارچرا
* نەخشەی بەرگ: ئیبراهیم سالح
* چاپی دووەم ٢٠٢٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی ( ١٣٢٥) ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.




# پێڕست


گـەمـژە

**کاراکتەرە سەرەکییەکانی ئەم ڕۆمانە**

* - ئافاناسی ئیڤانوفیچ:

ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکییە: بڕوانە ناوی توتسکی.

* - ئاگلایا:

ئاگلایا ئیڤانوڤنا یەپانچین: کیژی جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین و لیزاڤیتا پروکوفیڤنایە. هەندێ جار بە سووکەلە ناوی گلاشا، ناوی دێت.

* -ئادیلاید ئیڤانوڤنا یەپانچین: کیژی جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین و لیزاڤیتا پروکوفیڤنایە.

* -ئاردالیون ئەلکسندروفیچ ئیڤولگین. بڕوانە ناوی ئیڤولگین.

* -ئەلکسندرا ئیڤانوڤنا یەپانچین: کیژی جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین و لیزاڤیتا پروکوفیڤنایە.

* -لیزاڤیتا پروکوفیڤنا: ژنی جەنەراڵ یەپانچینە. خزمێکی دووری میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکینە (گەمژە)یە. زۆر جار لە ڕۆمانەکەدا بە نازناوی خانم جەنەراڵ ناوی دێت. وەکو چۆن لەناو زۆر میللەتاندا ژن نازناوی مێردەکەی وەر دەگرێت.

* - یەڤگێنی پاڤلوفیچ:

یەڤگێنی پاڤلوفیچ، یان بافلیچ، ڕادومسکییە. ئەفسەرێکی گەنجە، حەز دەکات ئاگلایا بخوازێت.

* -یەپانچین:

جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچینە. فەرمانبەرێکی گەورە و بزنسمانە. برادەر و شەریکی ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکییە. خانم جەنەراڵ یەپانچین، ژنیەتی، خزمایەتییەکی دووری دەگەڵ میر میشکین (گەمژە)دا هەیە.

* - ئیڤان فیدوروفیچ:

دەکاتە ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین. بڕوانە ناوی یەپانچین.

* - ئیڤولگین:

دەکاتە ئاردالیون ئەلکسندروفیچ ئیڤولگین. جەنەراڵێکی خانەنشینە. کابرایەکی مەینۆشی ئالوودەیە. مێردی نینا ئەلکسندروڤنایە، باوکی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ و ڤارڤارا ئاردالیونوفیچ و کولیای برا بچووکیانە.

* - باراشکوفا:

دەکاتە ناستاسیا فیلیپوڤنا باراشکوفا. بڕوانە ناوی ناستاسیا فیلیپوڤنا.

* - ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا:

دەکاتە کیژی جەنەراڵی ئالوودە، ئیڤولگین و ژنی ئیڤان پترۆفیچ پتیتسنە. زۆر جار بە ناوی سووککراوەی ڤاریا، فارکا، ڤارتشکا ناوی دێت.

* - پارفیون سیمیونوفیچ:

دەکاتە بارفیون سیمیونوفیچ ڕوگوژین – بڕوانە ناوی ڕوگوژین.

* - پاڤلیشچوف:

دەکاتە نیکولا ئاندریوفیچ پاڤلیشچوف، کە میر میشکین دەگرێتە ژێرباڵ. لەسەر کیسەی خۆی میرزادە بۆ سوسیرا دەنێرێت، تا لەوێندەر چارەسەری (گەوجاتییەکەی) بکەن.

* - پتیتسن:

دەکاتە ئیڤان پترۆفیچ پتیتسن. کابرایەکە کاری سووتخۆری دەکات. ژوورێکی لە ماڵی جەنەراڵ ئیڤولگینی بەکرێ گرتبوو، ڤارڤارای کیژی ئیڤولگینی خواست.

* - دۆتمیر بیلوکونسکایا، دۆست و ڕاوێژکار و شیرەتکاری لیزاڤیتا پروکوڤیڤنایە.

* - توتسکی:

دەکاتە ئاناڤاسی ئیڤانوفیچ توتسکی. موڵکدارێکی دەوڵەمەندە، ئەمە، ناستاسیا فیلیپوڤنا دەگرێتە ژێر باڵی خۆی و پاشان لە خشتەی دەبات و دەیکات بە قەپاتمەی خۆی.

* - تیرنتییف:

دەکاتە هیپولیت تیرنتیف. کوڕی مارتا بوریسوفنای ماشقەی جەنەراڵی مەینۆشی ئالوودە ئیڤولگینە. گەنجێکی سیلدارە. هاوڕێی کولیایە.

* - گانیا: بڕوانە ناوی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، گانیا سووکەڵە ناوی گاڤریلایە.

* - گاڤریلا ئاردالیونوفیچ:

دەکاتە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ ئیڤولگین، کوڕی جەنەراڵ ئاردالیون ئەلکسندروفیچ ئیڤولگینە. سکرتێری جەنەراڵ یەپانچینە. هەوڵدەدا ناستاسیا فیلیپوڤنا بخوازێت. حەز لە ئاگلایا ئیڤانوڤنا یەپانچین دەکات. زۆر جار بە سووکەڵە ناوی: (گانیا، گانکا، گانشکا)یش ناوی هاتووە.

* - ڕادومسکی:

دەکاتە یەڤگینی باڤلوفیچ ڕادومسکی. ئەفسەرێکی گەنجە. حەز دەکات ئاگلایا بخوازێت. بڕوانە ناوی یەڤگینی پاڤلوفیچ.

* - ڕوگوژین:

دەکاتە بارفیون سیمیونوفیچ ڕوگوژین: کوڕی بازرگانێکی دەوڵەمەندە، سەروەت و سامانێکی زۆری لە بابیەوە بۆ ماوەتەوە. حەز لە ناستاسیا فیلیپوڤنا باراشکوفا دەکات و دەیەوێ بیخوازێت.

* - ڤاریا:

بڕوانە ناوی ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، ڤاریا سووکەڵە ناوی ڤارڤارایە.

* - فردیشچینکۆ:

گەنجێکی کرێچی ماڵی ئیڤولگینە، هاتوچۆی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەکات.

* - ڤیرا لوکیانوڤنا:

دەکاتە کیژی لوکیان تیموفیفیچ لیبدیف. کیژی گەورەی ماڵە و بنەوانەی ماڵە.

* - کولیا:

دەکاتە نیکولا ئاردالیونوفیچ ئیڤولگین. خوێندکاری قۆناغی دوا ناوەندییە. کوڕی بچووکی جەنەراڵ ئیڤولگینی بەدمەستە، کولیا، ناوی کورتکراوەیەتی.

* - کیللەر:

بوکسبازە. لیوتنانی خانەنشینە، یەکێکە لە ئەندامانی گروپەکەی بارفیون سیمیونوفیچ ڕوگوژین و ناستاسیا فیلیپوڤنا. دوای ئەوان خووی دایە میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین و ڕموودەی ئەوە بوو.

* - لیبدیف:

دەکاتە لوکیان تیموفیفیچ لیبدیف. فەرمانبەرە، سەر بە گروپەکەی ڕوگوژینە. پاشان بە فێڵ دەکەوێتە دەوروخونی لیون نیکولایوفیچ میشکین.

* - لوکیان تیموفیفیچ لیبدیف: بڕوانە ناوی لیبدیف.

* - لیون نیکولایوفیچ:

دەکاتە میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین. شا قارەمانی ڕۆمانی گەمژەیە.

* - مارتا بوریسوڤنا:

بێوەژنی کابتن تیرنتیفە. ماشقەی جەنەراڵ ئیڤولگینە. دایکی گەنجە سیلدارەکە، هیپولیتە.

* - میشکین:

دەکاتە میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین، شا قارەمانی ڕۆمانی "گەمژە".

* - ناستاسیا فیلیپیوڤنا باراشکوفا:

ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی بە منداڵی دەیگرێتە ژێر باڵی خۆی، پاشان لە خشتەی برد، بە خێوی دەکرد. ڕەدووی بارفیون سیمیونوفیچ ڕوگوژین کەوت، بەڵام قاییل نەبوو مێرد بە توتسکی بکات.

* - نیکولا ئاندریوفیچ:

دەکاتە نیکولا ئاندریوفیچ پاڤلیشچوف، کە سەرپەرشتیاری میر میشکینی دەکرد. بڕوانە ناوی پاڤلیشچوف.

* - نینا ئەلکسندروفنا:

دەکاتە ژنی جەنەراڵی ئالوودە ئاردالیون ئەلکسندروفیچ ئیڤولگین. دایکی گاڤریلاو ڤارڤارا و کولیا. لەبەر دەسکورتی و بە مەبەستی پەیداکردنی بژێویی خاوخێزان، ژوور بەکرێیان دەدات.

**لەجیاتیی پێشەکی**

گەمژە

جۆری بەرهەم: ڕۆمان

نووسەر: فیودور میخائیلوفیچ دوستویفسکی (١٨٢١- ١٨٨١)

پلۆت: سایکولوژی ڕیالیستی

زەمان: ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم

شوێن: شاری پترسبۆرگ- ڕووسیا

مێژووی یەکەم بڵاو بوونەوە: ١٨٦٨- ١٨٦٩

کاراکتەرە سەرەکییەکان

١- میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین.

٢- پارڤیون ڕوگوژین: برادەری میرزادە.

٣- مەدام یەپانچین: خزمی میرزادە.

٤- ئاگلایا یەپانچین: کیژی مەدام یەپانچین.

٥- ناستاسیا فیلیپوڤنا: ڕەقیبی ئاگلایا.

٦- گانیا ئاردالیونوفیچ: کاتب و سکرتێری جەنەڕاڵ یەپانچین.

"١"

چونکە ئەم کتێبە لە لایەن نووسەری "تاوان و سزا" و "برایانی کارامازوف"ەوە نووسراوە، بۆیە لە دنیای ئەدەبیاتدا ئیحتوبار و پێگەیەکی تایبەتی هەیە. کاراکتەرانی ئەم ڕۆمانە، وەکو گەلێک لە کاراکتەرانی نێو ئەفسانانی ڕووسی، ڕەفتاری تایبەت بە خۆیان هەیە، کە لە زۆر ڕووەوە لە بیرکردنەوە و هزرینی ئەمریکاییەکان جیاوازە و چیرۆکەکە لای زۆربەی خوێنەران ناواقیعی و باوەڕنەکردەنییە. ڕەنگە جیددیترین کێشە لای خوێنەران ئەو وێنەیەی میرزادە میشکین بێ، کە لە لایەن نووسەرەوە پیشان دراوە و بەرجەستە کراوە. میشکین بە پێچەوانەی هەموو کاراکتەرەکانی دیکەوە، کەسێکە کە دێوانە و گێل و گەوج دەنوێنێ، بەڵام

لەواقیعـدا، زۆر وریـا و زیرەکـە، بـەڵام واقیعـی فێدارییەکـەی میـرزادە، مەسـەلەکە تـا ڕادەیـەک لـە خوێنـەر دەئاڵۆزێنێ و پیـاو تیـا دەمێنێ کـە ئایـا میـرزادە بـە ڕاسـتی گەمژەیـە یـان نـا، بـەڵام وێڕای ئەمـەش، گـەمژە وەکـو ڕەنگـدانەوەیـەکی ئـەخلاقیات و ڕەفتـار و دابونـەریت و فەلسـەفەی ئەو ڕۆژگارەی ڕووسیا، ڕۆمانێکی جوان و پڕ عیبرەتە.

"٢"

میرزادە میشکین، بۆ چارەسەری فێداریەکەی دەچێت بۆ سویسرا، چوار دانە ساڵ لە نەخۆشخانەیەکی دەروونی دەمێنێتەوە و ئەوسا بۆ پترسبۆرگ دەگـەڕێتەوە. لـە ڕێـی گـەڕانەوەدا، لـەناو قیتـاردا، جلوبەرگـە شـەپڕێو و چرچولۆچەکـەی سـەرنجی ڕێبوارەکـانی دی ڕادەکێشـێت. یـەکێک لـە ڕێبوارەکـان، بـە نـاوی پـارفیون ڕوگـوژین، لەگـەڵیا دەکەوێتـە پرسـوجۆ و گفتوگۆ. تا دەگەنە پترسـبۆرگ، میرزادە و ڕوگـوژین، بـە تەواوەتـی بە وەزع و حاڵی یەکدی دەزانن، ڕوگوژین پێشنیاز دەکات کە میرزادە لەگەڵ خۆیدا بەرێتەوە و تۆزێک پارەی بداتێ.

لـێ میشـکین، حـەزی لەوە بـوو، هەوەڵ جـار بچـێ خـۆی بـە جەنـەڕاڵ یەپانچین بناسێنێ، کە هاوسـەرەکەی خزمـی دووری میشکین بـوو. لـە مـاڵی یەپانچیندا، جەنـەڕاڵ و گانیـای کـاتبی بینـی. گانیـا دەعـوەتی دەکات کە قسـە دەگەڵ دایکیا بکات. میرزادە سـەرنجی جەنـەڕاڵ، هاوسـەرەکەی و هـەر سـێ کچەکـەی ڕادەکێشـێت. بـێ شـێلەوبێلەیی، سـاکاری و ڕاشـکاوی میشـکین دەبێتـە مایـەی سـەرگەرمی خانەوادەکە. زۆری پێناچێت، نـاوی گـەمژەی لـێ دەنـەن. ئیـدی میـرزادە دۆسـتایەتی و پەیوەندییـەکی پـتەو و ڕاسـتەقینەیان دەگەڵـدا پەیـدا دەکـات، گانیـا کـوڕێکی گـەنجی خۆپەرسـتی هـەرزەڕەفتاری بێشەرمی ڕوودار بوو، بەتەماحی پارەوپووڵەوە مرخـی لەوە خۆش کردبوو کـە ئاگلایـا یـەپانچینی شـۆخ و شـەنگوڵ بخوازێـت و لـە هـەمان کاتیشـدا پەیوەندیی دەگەڵ ناستاسیادا هەبوو، ناستاسـیا ژنێکی گـەنجی دڵڕفێن بـوو، لـە سـایەی پیاوێکدا دەژیـا کـە هـیچ خۆشـی نەدەویسـت. ناستاسـیا، زۆر

هەستیار و تووڕە بوو، بە ڕاستی لەو قسە و قسەلۆکانەی کە لە دووی دەکران، دوور بوو.

میشکین، هەستی بە بێدەسەلاتیی ناستاسیا بردبوو و دڵی بە حاڵی دەسووتا و بەزەیی پێیدا دەهاتەوە. شەوێک لە شەونشینی و ئاهەنگێکدا، دوای ئەوەی ناستاسیا وەڕوور دەکەوێ، ئەم (میرزادە) پێشنیازی ئەوە دەکات شووی پێ بکات و باسی ئەوەی بۆ دەکات کە بەشە میراتێکی چاوەڕواننەکراوی بەر کەوتووە. ناستاسیا، پێشنیازەکەی ڕەت کردەوە و پێی گوت حەز ناکات ببێ بە مایەی وێرانبوونی ئایندەی ئەو. ئیدی ناستاسیا بەگەڵ ڕوگوژینی دۆستی میرزادە کەوت، کە سەد هەزار ڕۆبڵی دایە (دایە ناستاسیا).

ناستاسیا، لە هەموو کاتێ پتر بووە مایەی ناکۆکی نێوان ماڵباتی یەپانچین و کوڕ و کۆمەڵەکەیان. (میشکین)یش هیچ نارەحەت نەبوو، بە هەمان ڕووخۆشی و دڵخۆشیی خۆیەوە مایەوە. گانیا و ڕوگوژین کێشەکانی خۆیان بۆ باس کرد، تاڵی و بێشەرمیی ژیانی خۆیان بۆ گێڕایەوە و سوێندی وەفادارییان بۆ خوارد. سەرباری ئەوەش، میشکینیان بە جێی متمانە و باوەڕ نەدەزانی و سەنگەری دژایەتییان لێ گرت. کاتێ ناستاسیا لە ڕوگوژین تۆرا، ڕوگوژین سوێندی خوارد کە گێلە دەکوژێت، چونکە دڵنیایە، ناستاسیا لەبەر ئەوەی بە ڕاستی ئاشقی میشکینە بۆیە تۆراوە و وازی لەو هێناوە. میشکین دوای ماوەیەک، بوو بە قوربانی پیلانێک کە خانەوادەی یەپانچین تیایا شەریک بوون. لە سیناریۆیەکی زۆر قێزەوندا، سەرکەوتووانە، ئەو تۆمەتەی ڕەت کردەوە کە کوڕە ناشەرعی و گریمانەیەکەی پافلیشچۆفی لە میراتی قانوونی خۆی مەحرووم دەکرد. سەلماندی ئەو کەسەی کە میراتەکەی پێ دەبڕێ، کوڕی ناشەرعی نییە. ئەوسا بە پێچەوانەی حەزی مەدام یەپانچینەوە، پێشنیازی کرد کە پارە بە یارۆی زیادە خواز بدرێت و ببێ بە دۆستی مەدام یەپانچین، میشکینی لە جاران بە گەوجتر لەقەڵەم دا.

ئاگلایا یەپانچین، ژێراو ژێر ئاشقی میشکین بوو. میشکین لە سەرەتاوە

گوێی نەدایە و لە خۆی نەدەگرت خۆشەویستیی خۆی بۆ بنوێنێ، بەڵام وەختێ کە هەستی ڕاستەقینەی دەرکەوت، مەدام یەپانچین بە زەماوەندی ئەو دووە قاییل بوو، جا بۆ ئەوەی میشکین بە کۆمەڵگەی ئەرستوکراتیی پترسبۆرگ بناسێنێ، ئاهەنگ و شەونشینییەکی قورسی ساز دا. دایک و کچ، لە ترسی ئەوەی نەبادا میشکین لە ئاهەنگەکەدا پۆتێ بشکێنێ، ئامۆژگارییان کرد کە بە بێدەنگی دانیشێت و بە درێژایی شەوەکە هیچ قسەیەک نەکات، بەڵام لە کاتی ئاهەنگەکەدا هەر مەدام یەپانچین بوو کە میرزادەی هێنایە قسە، میرزادەش، خێرا دەکەوێتە باسی خۆی. میوانە محافەزەکارەکان سەریان لەم مەسەلەیە سوور دەمێنێ. بەدەم گەنگەشە و گفتوگۆکانەوە میرزادە، بەر گوڵدانێکی گەورە و بەنرخ کەوت و وەکو بابایەکی گێل و گەمژە لە پارچەکانی ڕادەمێنێ، دوای چەند دەقیقەیەک فێ دەیگرێت و میوانەکان ناچار دەبن بۆ ماڵەکەی خۆی بەرنەوە. خانەوادەی یەپانچین بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لێی زیز دەبن و دەگەڵی سارد دەبن، سەرەنجام مەدام یەپانچین دڵی چاک بوو و جارێکی دی دەعوەتی کرد بۆ ماڵەوە. لەم بەینەدا ئاگلایا کەوتە نامەناردن بۆ ناستاسیا و دۆستایەتییەکی سەیریان پەیدا کرد. شەوێک ئاگلایا داوای لە میشکین کرد کە پێکەوە بچنە دیدەنی ناستاسیا، لە شوقەکەی ناستاسیا، شەڕێکی توند لەنێوان ئاگلایا و ناستاسیا بەرپا بوو، هەر دووکیان، داخی خۆیان بە یەکدی ڕشت. لە ماوەی شەڕەکەدا، ئاگلایا بۆ یەکەم جار ئەشقی خۆی سەبارەت بە میشکین بە ئاشکرا دەربڕی. بەدەم شەڕەکەوە ناستاسیا بورایەوە، کە میشکین چووە کۆمەکی، ئاگلایا ئەمەی پێ قووت نەچوو، هەستی کرد کە ئەمە نیشانەی ڕەفزکردنی ئەوە، بۆیە بە توڕەیی لە ماڵەکە وەدەر کەوت و ڕۆیشت.

شەڕی نێوان ئەو دووانە بوو بە کارەساتێک لەو گۆڕە و ماڵباتی یەپانچین دەرگای ماڵەکەی خۆیان لە ڕووی میشکین داخست. ناستاسیا قاییل بوو کە شووی پێ بکات و ئیدی کەوتە ئامادەسازی بۆ زەماوەندەکە، بەڵام لە ڕۆژی زەماوەندەکەدا، کاتێ میرزادە لە کڵێسادا چاوەڕوانی ئەو

بوو، ناستاسیا دەگەڵ ڕوگوژیندا ڕەڤی.

میشکین، کە هێشتا نیگەرانی بێپەنایی خۆی و خۆشبینی ترسناکی خۆی بوو، هەواڵەکانی بەوپەڕی خوێنساردی وەر دەگرت. کاتێ ئەو لە خەمی دۆزینەوەی ناستاسیادا بوو، زۆر کەس هەبوون کە گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام خەڵکانێکیش هەبوون، داخیان بۆ دەخوارد.

میشکین، لە کاتی ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەدا، پاڤلوفسکی جێ هێشت و چوو بۆن شار، لەوێ کەوتە سۆراخ و تاقیبی شوێن و جێگای ناستاسیا. لێ کەس نەیدەزانی لەکوێیە.

ئەنجام لێبڕا کە بچێ بۆ شوقەکەی ڕوگوژین. لەوێ یەکێک لە دەرگاوانەکان پێی ڕاگەیاند کە ڕوگوژین دوێشە و لە ماڵ بووە. میشکین لە حاڵێکا دڵنیا بوو کە دوای دیدار دەگەڵ ڕوگوژیندا دەکوژرێ، هەر درێژەی بە گەڕان و تاقیبکردنی خۆی دا. تا ئەنجام ڕوگوژینی لە جادەوبانا بینیی و دەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ئەو شوقەیەی کە بە ڕواڵەت ناستاسیا لەوێ خەوتبوو، بەڵام میشکین یەکسەر تێگەیشت کە ڕوگوژین کوشتوویەتی.

میشکین، وێڕای نەفرەتی زۆری لە ڕوگوژین، ئەو شەوەی لەوێ دەگەڵ جەنازەکەی ناستاسیا و بکوژەکەیدا بەسەر برد. بۆ سبەینێ دانی بەیانی دۆستانی نیگەرانی ناستاسیا و پۆلیس خۆیان بە شووقەکەدا کرد. دوای پرسوجۆ لە ڕوگوژین و میرزادە، ڕوگوژین ئیعترافی لەسەر خۆی کرد و میشکین بێتاوان و تەبرێ دەر چوو. میشکین دووبارە بۆ هەمان نەخۆشخانەی دەروونیی سویسرا نێردرایەوە، کە جارجارێک خانەوادەی یەپانچین و هەموو دۆستەکانی تری، لەوێندەر سەریان دەدا. سووکە ئومێدێکی کەم هەبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەم فێداریە چاک ببێتەوە.

بڕوانە:

شاهکارهای ادبی جیهان/ ویراسته فرانک نورتن مگیل/ ترجمه امیر اسماعیل ادر/ انتشارات سخن، تهران ۱۳۳۸ / ص ٤٩٥-٤٩٩

## بەشی یەکەم

### فەسڵی یەکەم

لــە ســـەعات نزیکــی نــۆی بــەیانی، یــەکێک لــە دوا ڕۆژەکــانی مــانگی نۆڤەمبـەردا، لـە کـاتی تـوانەوەی بـەفر و بەسـتەڵەکاندا قیتـاری وارسـۆ* بـە خێرایی دەهات و لە پترسـبۆرگ نزیـک دەبـووەوە، دنیـا تـەمومژێکی ئەوەنـدە سخ و چڕ بوو کە تیشکی هـەتاو بەئاسـانی نەدەگەیشـتە زەوی، پیـاو کـە لـە پەنجەرەی قیتـارەکەوە تەمەشـای ڕاسـت و چـەپی کردبـا، هـەر دە شـەقاوێک چاوی بڕی دەکرد.

هەندێ لە ڕێبـواران، لـە هەندەرانەوە دەگـەڕانەوە، بـەڵام فارگۆنـانی نمـرە سێ، کە لە هەموو فارگۆنـەکانی دی قـەرەباڵغتر بـوون، پڕ بـوون لـە خـەڵکی ئاسـایی کـە بـە بۆنـەی کـار و کاسـبییەوە سـەفەریان دەکـرد و لـە ڕێگـای دوورەوە نەهاتبوون.

گشـت ڕێبوارەکـان شـەکەت و مانـدوو دیـار بـوون، خەو گرتبـوونی و پێڵوی چاویـان قورس بووبوو، سـیمایان وەکو تەمومژەکـەی دەرێ مـەیلەو زەرد بوو.

لـە فـارگۆنێکی نمـرە سـێدا، دوو ڕێبـوار هــەر لــە بـەیانییەوە لـە نزیکـی پەنجەرەکەوە، بەرانبەر بە یەکتر ڕۆنیشتبوون.

هــەر دووکیـان گـەنج بـوون و سـیمایان جیـاواز و مایـەی سـەرنج بـوو،

هیچیان شیکپۆش نەبووو، کەلوپەلێکی ئەوتۆشیان پێ نەبوو. پێدەچوو هەر دووکیان حەز بکەن سەری قسان بکەنەوە و دەرگای گفتوگۆ بکەنەوە. ئەگەر لەو دەمەدا بیانزانیبا چەند لە یەکدی جیاوازن، سەریان لەو ڕێکەوتە سەیرە دەسوووڕ ما کە بەو شێوە سەیرە لە فارگۆنێکی نمرە سێی قیتاری (وارسۆ- پترسبۆرگ)دا کۆی کردبوونەوە.

یەکێکیان، گەنجێکی کورتەبالا، قژلوولی، قژڕەش، چاوکەوەییەکی چاوچکۆلەی نیگازیتەڵ بوو، لە تەمەنی دەوروبەری بیست و حەوت ساڵیدا دەبوو، کەپووی پان و فس بوو، گۆناکانی زەق، هەمیشە بزەیەکی غەریب بەسەر لێویەوە بوو، بزەیەکی تەوسئامێز، لاسار و بە ڕیشخەن. دەموچاوی زۆر ناشیرین بوو، ڕەزای ئەوەندە قورس بوو کە یەکەم جار دەتبینی ڕقت لێی دەبووەوە، بەڵام هەنیە و نێوچەوانی بەرز و جوان بوو، لە تۆ وایە قەرەبووی ڕەزاقورسییەکەی دەکاتەوە. ئەوەی کە لە سیمای ئەم گەنجەدا پتر مایەی سەرنج بوو، ڕەنگە زەردەکەی بوو، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو، هەرچەندە بتەو دیار بوو، بەڵام ڕەنگە زەردەکەی ماندوو و شەکەتی دەنواند، ئەم ڕەنگزەردییە، دەگەڵ بزە گۆساخ و نیگازیت و لە خۆرازییەکەیدا تێکی نەدەکردەوە.

ئەم پیاوە خۆی لە فەروەیەکی دەڵبی ڕەشەوە پێچابوو، نە منەتی بە سەرما بوو و نە سەرمای شەویش کاری تێ کردبوو.

بەڵام هاوسەفەرەکەی، کە بەرانبەری دانیشتبوو، دیار بوو کە سەرمایەتی و تا بەیانی لەبەر سەرمای ئەو شەوە تەڕ و شێدارەی مانگی نۆڤبەری ڕووسیادا هەڵلەرزیبوو. ئەم پیاوە قاپووتێکی بێقۆڵی، کڵاوداری لەبەر کردبوو، وەکو ئەو قاپووتانەی کە زستانان، ڕێبواران، لە وڵاتانی غەیرە ڕووسیایی وەک سویسرا و باکووری ئیتاڵیا لەبەری دەکەن، بەڵام ئەم قاپووتە بۆ سەفەری دووروودرێژی وەکو سەفەری نێوان ئایدکونن* و پترسبۆرگ بەکەڵک نەدەهات. ئەم قاپووتە پڕ بە پێستی ئیتاڵیا بوو، بەڵام بۆ کەشوهەوای ڕووسیا دەستی نەدەدا. ئەم پیاوەش، گەنجێکی تەمەن بیست و شەش، بیست و حەوت ساڵان بوو. باڵای کەمێک لە مامناوەندی

بەرزتر بوو، گۆناکانی قۆپا بوون، مووزەردێکی تووکن بوو، ڕدێنێکی چکۆلەی کاڵی هەبوو، لە ڕۆشنیدا سپیی دەنواند. دوو چاوی درشتی شینی، نیگاهۆشنی هەبوو، کە جۆرە ئارامی و ناسکی و شیرینییەکیان پێوە دیار بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا مەند و غەریب بوون، هەر کەسێکی دنیادیدە سەیری کردبا، یەکسەر هەستی دەکرد کە خاوەنی ئەم چاوانە پیاوێکی فێدارە. فێی لەگەڵە. وێڕای ئەوەش سیمای ئەم گەنجە ناسک و جوان بوو، دەچووە دڵەوە، بەڵام بەگشتی ڕەنگ و ڕوو سیسەڵە و چرچەڵە بوو، تەنانەت لەسەرما شین هەڵگەڕابوو.

بوخچەیەکی شڕۆڵەی کاڵەوەبووی بە دەستی ڕاستەوە بوو، دیار بوو هەرچی هەیە و نییە لەو بوخچەیەدایە. جووتێ قۆندەرەی بنئەستووری لە پێ بوو، سەری قۆندەرەکانی لە لباد گیرابوو، ئەم شتانە زۆر لە ڕووسیادا باو نەبوو.

هاوسەفەرەکەی، گەنجە ئەسمەرە قژڕەشە قاپووتلەبەرەکە، بە دیقەت تەمەشای ئەو شتانەی دەکرد. ئەوجا بێدەنگییەکەی شڵەقاند، بەدەم بزەیەکی گۆساخانەوە، لەو بزانەی کە زۆر جار کابرایەکی دڵڕەقی لووتبەرزی خۆپەسند لە ئاستی نەگبەتی و بەڵای خەڵکانی دیدا، دەری دەبڕێت، شانەکانی هەڵتەکاند و پێی گوت:

- سەرمایە، ها؟

هاوسەفەرەکەی بەوپەڕی ڕووخۆشی بەرسڤی دایەوە:

زۆر ساردە، ئەمە کاتی بەفرتوانەوەیە ئاوهایە ئەگەر کاتی بەفرکەوتنبایە چۆن دەبوو؟ تەسەورم نەدەکرد وڵاتەکەمان ئەوەندە سارد بێ. ئەم سەرمایەم بیر چووبووەوە!

- بە ئەقڵم لە هەندەرانەوە دێیتەوە، وا نییە؟

- بەڵێ، لە سویسراوە دێمەوە

گەنجە ئەسمەرەکە، فیکەیەکی کێشا و بەدەم قاقاوە گوتی:

- ئۆو... زۆر دوورە!

کەوتنە گفتوگۆ. گەنجە مووزەردەکە، ئەوەی قاپووتە سویسرییەکەی





لەبەر بوو، بەوپەڕی ڕووخۆشی و نیازپاکییەوە بەرسقی هەموو ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە هاوسەفەرە ئەسمەرەکەی لێی دەکرد و هیچ گوێی لەوە نەبوو کە هەندێ لە پرسیارەکان، گۆساخانە و بۆ ڕابواردن بوو. بەدەم قسانەوە ئەوەی گێڕایەوە کە چوار ساڵ پترە لە هەندەرانە و بۆ چارەسەری نەخۆشییەکی عەسەبیی غەریب، کە جۆرە فێ و پەرکەمێکە و جۆرە لەزرۆکییەکی لەگەڵە. هاوسەفەرەکەی بەدەم گوێگرتنەوە چەند جارێک تەوسخەنی بە ڕوویا دا و تەنانەت کە لێی پرسی: "باشە، چاکیان کردیتەوە؟" کوڕە مووزەردەکە بەرسقی دایەوە: "نەخێر، چاکیان نەکردمەوە!" گەنجە ئەسمەرەکە بەدەم قاقای پێکەنینەوە و بەتەوسەوە گوتی:

– ئێ... مەگەر خوا بزانێ چەندیان پارە بەخۆڕایی لێ سەندوویت! کەچی لەبەر گێلی و نەزانیی خۆمان ئەوپەڕی باوەڕو متمانەمان پێیان هەیە!

پیاوێکی دی، کە لە نزیکیانەوە دانیشتبوو، هەڵی دایە:

– ڕاستە، قسەیەکی دروستە!

ئەم پیاوە کەسێکی شرپۆش بوو، تەمەنی هەر چل ساڵێک دەبوو، بە دیمەنیا لە فەرمانبەرێکی بچووک دەچوو. کابرایەکی تۆکمەی بە داروبار بوو، کەپووسوورێکی دەموچاو زیپکاوی بوو.

کابرا دووبارەی کردەوە:

– بەڵێ، دروستە. دەیانەوێ هەرچی سەروەت و سامان و پارەوپولی ڕووسیا هەیە، بۆ خۆیانی بکێشنەوە!

گەنجە نەخۆشەکە، بە دەنگێکی نەرم و ناسک و ئاشتیخوازانە وەڵامی دایەوە.

– نەخێر، تۆ هەڵەیت، بەلای کەمەوە سەبارەت بە مەسەلەکەی من هەڵەیت. هەڵبەتە من ناتوانم گەنگەشەی ئەم مەسەلەیە بکەم، چونکە من ئاگام لە هەموو شتەکان نییە، بەڵام ئەوەندەی شتەکە پەیوەندیی بە منەوە هەیە، دکتۆرەکەم دوا پولی سەفەرەکەی بۆ داوم، ئەمە جگە لەوەی کە دوو ساڵی ڕەبەقی بەخۆڕایی، لە کیسەی خۆی مالیجەی کردووم.

گەنجە ئەسمەرەکە هەڵی دایە:

- بۆ! چما کەس نەبوو بتوانێ پارەی چارەسەرەکەت بۆ بدات؟

- نەخێر کەس نەبوو! چونکە جەنابی بافلیشچوف کە مەسرەفی مانەوەی منی لەوێندەر، دەکێشا، نزیکەی دوو ساڵ بوو مردبوو. هەنگێ نامەم بۆ خا جەناراڵ یەپانچین کە خزمێکی دووری خۆم بوو، نووسی کە فریام بکەوێ و یارمەتیم بدات، بەڵام وەڵامی نەدامەوە. ئیدی ئەوەتا ناچار بووم بگەڕێمەوە!

- باشە بەتەمای بۆ کوێ بڕۆیت؟

- مەبەستت ئەوەیە بەتەمام لەکوێ لا بدەم؟ لەکوێ بژیم؟ باوەڕ بکە... هێشتا نازانم! ..

- یانی هێشتا بڕیارت نەداوە؟

هەر دوو گوێگرەکە، لە قاقایان دا. گەنجە ئەسمەرەکە پرسیی:

- ئەدی ئەم بوخچەیە چییە، ڕەنگە ئەمە هەموو موڵک وماڵەکەت بێت!

فەرمانبەرە کەپووسۆرەکە، بەوپەڕی شادییەوە هەڵی دایە:

- گرە و دەکەم وایە! هیچ جانتا و شتێکی ترت لەنێو ئەم فارگۆنەدا نییە. بەهەرحاڵ هەژاری عەیب نییە!

کە گەنجە مووزەردەکە بەوپەڕی ئەدەبەوە قسەکانی کابرای فەرمانبەری سەلماند، دەر کەوت کە هەرچی هەیە و نییە، دارونەداری هەر ئەو بوخچەیەیە و لەو بوخچەیەدایە!

فەرمانبەرەکە، پاش ئەوەی لەگەڵ کوڕە ئەسمەرەکەدا بە دوو قۆڵی تێر پێکەنین – سەیر ئەوە بوو خاوەنی بوخچەکەش کە سەیری ئەوانی دەکرد، ئەنجام کەوتە پێکەنین و ئەمە هێندەی دی ئەوانی هێنایە پێکەنین- لەسەری ڕۆیشت:

- بەڵام وێڕای ئەوەش بوخچەکەت بایەخی خۆی هەیە. ڕاستە پیاو دەتوانێ مەرج بکات کە سکەی زێڕی تیا نییە، نە سکەی زێڕی ناپلیۆن، نە سکەی زێڕی فردریک و نە سکەی زێڕی هۆڵاندی تیا نییە، پیاو یەکسەر بە لبادی دەوری پێڵاوە بیانییەکانتا ئەوەی بۆ دەر دەکەوێ، بەڵام ئەگەر ڕاست بێ و خزمایەتیت دەگەڵ خاجەنەراڵ یەپانچیندا هەبێ، هەنگێ

بوخچەکەت بایەخێکی گەورە پەیدا دەکات. هەڵبەتە ئەگەر لێت تێک نەچوو بێ و بە سەهوو خەیاڵ خات جەنەراڵت نەکردبێ بە خزمی خۆت. زۆر جار شتی وا دەبێت... ئیدی پیاو خەیاڵی دەڕوات و بۆ نموونە بە باڵی خەیاڵ دەفڕێت! ...

گەنجە موزەردەکە، هەڵی دایە و گوتی:

– هەق بە تۆیە! ڕاست دەکەی! وا بزانم من هەڵەم. خا جەنەراڵ. هەر بە حاڵ خزمم دەبێ و نابێ، بۆیە هیچ پێم سەیر نەبوو کە وەڵامی نەدامەوە. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە وەڵام نەداتەوە.

– کەواتە پارەی پۆستکردنی نامەکەت بەفیڕۆ چوو، ها!... دەی گوێ مەدەیە، هیچ نەبێ گلەیی ئەوەت لێ ناکرێ کە پیاوێکی سادە و ساکار و بێگەرد و ڕاستگۆ نیت. ئەمانە خەسڵەتی جوانن، شایەنی ستاییشن. ها!... سەبارەت بە جەنەراڵ یەپانچین من دەیناسم، چونکە کەسێکی زۆر ناسراو و بەناوبانگە، بەڵام سەبارەت بە مەرحوم بافلیشچوف، کە لە سویسرا مەسرەفی دەکێشایت، ئەویشم دەناسی، هەڵبەتە ئەگەر مەبەستی تۆ نیکولا ئاندریفیچ بافلیشچوف بێ، چونکە دوو ئامۆزا بە هەمان ئەو ناوەوە هەبوون. یەکێکیان تا ئێستاش لە قرم دەژی، بەڵام مەرحوم نیکولا ئاندریفیچ، پیاوێکی بەڕێز و خاوەن دەسەڵات و دەستڕۆ بوو، لە سەردەم و ڕۆژگاری خۆیدا چوار هەزار ڕەعیەتی هەبوو... بەڵێ...

گەنجە موزەردەکە، کە بە حەپەساوی و کونجکاوی دەیڕوانیە ئەو کابرایەی کە پێدەچوو هەموو شتێک بزانێت، گوتی:

– بەڵێ ئەوە! دروستە ناوی نیکولا ئاندریفیچ بوو.

ئەم جۆرە خەڵکە هەموو شتزانە، نەک جارجارێ، بەڵکو زۆر جار لەنێو هەندێ توێژی کۆمەڵایەتیی تایبەتیدا دەبینرێن.. ئەوانە هەموو شتێک دەزانن، چونکە زۆر فزوڵین و هۆشوگۆشیان بە یەک ئاراستەدا کار دەکات، دیارە ئەمە بەگوێرەی لێکدانەوەی هزرڤانانی هاوچەرخ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ کار و خەمێکی جیددییان نییە کە مێشکیان مژوول بکات. جا ئێمە کە دەڵێین "ئەوانە هەموو شتێک دەزانن" دەبێ ئەوە بزانین کە مەیدانی

زانین و زانیارییەکانیان سنووردار و تەنگە. زانیارییەکانیان لە بازنە و چوارچێوەی ئەم جۆرە شتانەدایە: فلان فەرمانبەری گەورە لەکوێ کار دەکات، پەیوەندییەکانی چییە و چۆنە، چەندی سەروەت و سامان هەیە، لە چ شار و دەڤەرێکدا فەرمانداری بووە، کێ ژنیەتی، ئەو جیاوازییەی ژنەکەی بۆی هێناوە چەندە، کوڕە مام و خاڵەکانی کێن، کێ خزمی خەزووری سەپانی شێخیەتی و... هتد، ئەوانە هەر هەموو ئەو شتانە بە باشی دەزانن. جا ئەم (هەموو شتزانانە) بە زۆری خەڵکانێکی فشەکەری فیشاڵبازی لات و لەوێرن و مووچە و دەرامەتی مانگانەیان لە هەڤدە ڕۆبلان تێناپەڕێت. هەڵبەتە ئەو خەڵکانەی، ئەم (هەموو شتزانانە) هەموو شتێکیان دەربارە دەزانن، بە خۆیشیان نازانن، بە چ نیازێ ئەو زانیارییانە دەربارەی وان کۆ دەکەنەوە، بەڵام زۆربەی ئەوانە گوایە هەموو شتێک دەزانن، زۆر بەم مەعلوماتانەی خۆ دەنازن و بە زانستی ڕاستەقینە و بێ چەند و چوونی دەزانن و بە مایەی ڕێز و حورمەتی خۆیانی دەزانن و لەزەتێکی ڕوحی و دەروونیی گەورەی لێ دەبینن و ئارامی و ئاسوودەییەکی فیکریی گەورەیان پێ دەبەخشێت. بە کورتیەکەی شتێکی موغری و فریبۆکە. من زانایان، ئەدیبان، شاعیران و سیاسەتوانانم دیتووە کە لە ڕێگەی ئەم جۆرە زانیارییەوە گەیشتوونەتە ئاوات و ئامانجی بەرز و ئاسوودەیی ڕوحی و ئارامیی دەروونیی خۆیان لەمەدا دیتووەتەوە، بە هۆی ئەمەوە لە بواری کاری خۆیاندا گەیشتوونەتە پۆست و پایە.

بە درێژایی ئەم گفتوگۆیە، گەنجە ئەسمەرەکە هەر باوێشکی دەدا، بێ ئامانج و مەبەست لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە دەرێ. دیار بوو پەلەیەتی کە بگاتە جێ. پەریشان، زۆر پەریشان و نیگەران دەهاتە بەرچاو، ئەوەندە خەمین بوو، کە ڕەفتاریشی غەریب و نائاسایی دەینواند. وا دەهاتە بەرچاو کە گوێ دەگرێ، بەڵام هیچی نەدەژنەوت. هەندێ جار دەتگوت تەمەشا دەکات، بێ ئەوەی هیچ ببینێ، ئەوسا بەبێ هیچ هۆیەک دەکەوتە پێکەنین.

کابرای دەموچاو زیپکاوی، لەناکاو ڕووی کردە گەنجە مووزەردە بوخچە بە دەستەکە و گوتی:

– ببورە... دەکرێ بزانم جەنابت کێی؟

گەنجە مووزەردەکە، بە کەسەر و بە دڵێکی پاکەوە بەرسڤی دایەوە:

– من میرزادە (لیون نیکولایوفیچ میشکین)م

فەرمانبەرەکە، مات و خەیاڵاوی گوتی:

– میر میشکین، لیون نیکولایوفیچ میشکین؟ نایناسم، ئەم ناوەم نەبیستووە... قەت بەرگوێم نەکەوتووە. هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نییە کە ئەم ناوەم نەبیستووە، ئەمە ناوێکی مێژووییە* و لە مێژووەکەی کارامازیندا* ناوی هاتووە. نا، بەڵکو مەبەستم تۆیە. پێم وایە ئەمڕۆ لە هیچ شوێنێکدا کەس ناوی ماڵباتی میرانی میشکین نایەنێ، بنەماڵەکەیان کوژاوەتەوە و ناویان لە کولەکەی تەڕیشدا نەماوە.

میرزادە، بەپەلە هەڵی دایە و گوتی:

– دروستە! جگە لە من کەسیان نەماوە، جگە لە من هیچ میرێکی دی بەو ناوەوە نییە. دڵنیام من دوا نەفەری ئەو ماڵبات و بنەماڵەیەم. باب و باپیرانی من خەڵکانێکی دەوڵەمەند نەبوون، بەڵکو لەو وردە موڵکدارانە بوون کە زەویوزارەکانیان بە خۆیان ڕەعەمەلدێنا و دەیان کێڵاو... بەڵام بابم مولازم دووەمی سوپا بوو، دەرچووی کۆلیجی جەنگ بوو. جا بە ڕێکەوت خات جەنەراڵ (یەپانچین)یش لە بنەماڵەی میرانی میشکینە، ئیدی نازانم ئەمە چۆنە و چۆن بووە! ئەویش دوا بەرەی تیرەی خۆیەتی.

کابرای فەرمانبەر بەدەم قاقایەکی تەوسامێزەوە گوتی:

– ها، ها، ها! دوا بەرەی تیرەی خۆیەتی! ها، ها، ها! بە ڕاستی وشەبازێکی بەتوانای.

یارۆی ئەسمەریش پێکەنی. لێ یارۆی مووزەرد، سەر سامی ئەوە بوو، کە توانیبووی ئەو گەمەیە – با زۆریش سەرکەوتوو نەبووبێ- بە وشەکە بکات. دوای تۆزێ لەسەری ڕۆیشت:

– باوەڕ بکە، من ئەو قسەیەم هەر وا، بێ هیچ مەبەستێک و بێ بیرکردنەوە، کرد!

فەرمانبەرەکە بەدەم بزەیەکەوە بۆی سەلماند:

- بەڵێ، بەڵێ، هەستم پێ کرد!

کابرای ئەسمەر لەناکاو لێی پرسی:

- باشە میرزادە بڵێ بزانم، تۆ لەوێ هیچ لە مامۆستاکەتەوە فێر بوویت؟ هیچت خوێندووە؟

- ئەی مانای چی...

- بەڵام من قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان هیچ کەسێک هیچی فێر نەکردووم....

میرزادە، بە نیمچە پۆزشێکەوە گوتی:

- بەهەرحاڵ، من کەمێکم خوێندووە، ئەویش بە پچڕپچڕی! بە هۆی نەخۆشییەکەمەوە، دەیانگوت بەکەڵکی خوێندنی بەردەوام و بە زەبت و ڕەبت نایەم!

یارۆی ئەسمەر لەناکاو پرسیی:

- باشە تۆ بنەماڵەی ڕوگوژین دەناسیت؟

- نەخێر، نایانناسم. بەهەرحاڵ من لە ڕووسیادا خەڵکێکی زۆر کەم دەناسم. ڕوگوژین، ناوی تۆیە؟

- بەڵێ، من (ڕوگوژین)م، پارفیون ڕوگوژین-م.

فەرمانبەرەکە، بە بایەخێکی زۆرەوە هەڵی دایە و گوتی:

- پارفیون؟ ڕاوەستە... یانی تۆ یەکێکی لە بنەماڵەی ئەو ڕوگوژینەی کە...

یارۆی ئەسمەر قسەکەی پێ بڕی:

- بەڵێ، یەکێکم لەوان، لەوان بە خۆیان.

یارۆی ئەسمەر، لە هەوەڵی گفتوگۆکەوە دەگەڵ میرزادەدا، تا ئەو کاتە زاری لە زاری فەرمانبەرە کەپووسۆرەکە نەگەڕابوو.

فەرمانبەرەکە سەرسام و حەپەساو چاوی تێ بڕی و گوتی:

- بەڵام... سەیرە... شتی وا دەبێ؟

هەنگێ سیمای گۆڕا، نەک هەر ڕێز و حورمەت، بەڵکو نیگەرانی و ماستاوچییەتی و ترسیشی لێ دەباری، لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت.

- تۆ خزمی سیمون پارفیونوفیچ ڕوگوژین، نیت، ئەو بورژوا فەخرییە ویراسییەی* کە نزیکەی مانگێک لەوە پێش مرد و دوو ملیۆن و نیو،

ڕۆبلی لەپاش جێ ما؟

ڕوگوژین، بە تەوسەوە و بێ ئەوەی لە خۆی بگرێ تەماشای بکات، گوتی:

– تۆ لەکوێ دەزانی دوو ملیۆن و نیوی لەپاش جێ ماوە؟

ئەوسا چاوێکی لە میرزادە داگرت و لەسەری ڕۆیشت:

– ئەمانە سەیرن! بلێ ئێوە هەقتان بەسەر خەڵکییەوە چییە، چیتان پێ دەبڕێت وا دەکەونە تاقیبی ئەو خەڵکە؟ ڕاستە بابم مانگی ڕابردوو مرد. من حاڵی حازر، کە یەک مانگ دوا کەوتووم، لە پسکۆفەوە دێم. تەماشای حاڵی شەپرێوم بکە، هەر بە ناو پێڵاوم لە پێدایە، باوەڕ بکە خاوەنی دینارێکی خۆم نیم. نە برا خوێڕی و خوانەناسەکەم و نە دایکم، نە تاقە پولێکیان بۆ ناردم و نە بە نامەیەکی دوو دێڕی ئاگاداریان کردمەوە! هەر بە سەگیشیان نەزانیم! یەک مانگی ڕەبەقە لە پسکوف، بەدەم لەرزوتاوە لە جێدا کەوتووم.

فەرمانبەرەکە دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردنەوە و گوتی:

– جا ئێستا بەلای کەمەوە لە عەردێکا یەک ملیۆن و بگرە زیاتریش وەر دەگریت! خوا نەیبڕێت!

ڕوگوژین بە تورەیی دەستەکانی جووڵاند و گوتی:

– ئەرێ من ناڵێم تو بیلێ، بەو چی، ئەمە چیی پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە؟ خۆ ئەگەر خۆت باویتە سەر دەست و لاقیشم تاقە قروشێکت نادەمێ!

– من ئەوە دەکەم، خۆم داوێمە سەر لاقت، چ دەڵێی؟

– تۆ تەماشای ئەم پیاوە! پێم گوتیت هیچت نادەمێ، ئەگەر یەک هەفتەی تەواو لە بەردەمما بڕەقسیت و سوورڕم بۆ بدەی تاقە قروشێکت نادەمێ!

– کەیفی خۆتە! مەمدەیە! هیچم مەدەیە، من شایستەی ئەوە نیم هیچم بدەیتێ، بەڵام من هەر بۆت دەڕەقسم. سووڕت بۆ دەدەم. ژنەکەم، منداڵە بچووکەکانم جێ دێڵم، دێم لە بەردەمت دەڕەقسم، لەبەر خاتری تۆ و بۆ خۆشیی تۆ هەموو کارێک دەکەم، هەر بۆ خۆشیی تۆ...

گەنجە ئەسمەرەکە، بە قیژەوە تفێکی ڕۆ کردە زەوی و گوتی:

- عەمرت نەمێنێ، داوەشێی!

ئەوجا ڕووی دەمی کردە میرزادە:

- پێنج هەفتەیەک بەر لە ئێستا، ڕێک وەکو ئێستای تۆ بووم. بە خۆ و پریاسکەیەکی بچووکەوە، لە ماڵی بابم هەڵاتم و چووم بۆ لای پوورم لە شاری پسکوف. لەوێندەر نەخۆش کەوتم، لەو ماوەیەدا بابم مرد! سەکتە لێی دا! ڕەحمەت لە گۆڕەکەی! باوەڕ بکە ئەگەر فریای خۆ نەکەوتبام و هەڵنەهاتبام، بە گیانی ئەو میرزادەیە دەیکوشتم!

میرزادە، کە بە کونجکاوی دەیڕوانییە ئەم ملیۆنێرە فەروەکۆنە، بەوپەڕی هێمنی گوتی:

- دیارە تووڕەت کردووە، وا نییە؟

هەر چەندە ئەم میراتە و ئەم ملیۆنە، جێگەی بایەخ بوون، بەڵام میرزادە سەری لە شتێکی دی، لە شتێکی جیاوازتر سووڕ مابوو. لە لایەکی تریشەوە ڕوگوژین، هاونشینی و هاودەمیی میرزادەی پێ خۆش بوو و متمانەی پێی هەبوو. وێڕای ئەوەش پیاو هەستی دەکرد وەکو پێویستییەکی میکانیکی نەک پێویستییەکی دەروونی قسانی دەکرد. بۆ ڕەواندنەوەی تەنیایی خۆی نەک بۆ دواندنی بەرانبەرەکەی قسەی دەکرد، جۆرە خەم و پەژارەیەک بۆ قسەکردنی هان دەدا، تەنیا لەبەر ئەوە قسەی دەکرد کە هاودەمێکی هەبێت. گرینگ ئەوە بوو قسان بکات. دیار بوو کە هێشتا تایەکە بەری نەدابوو، وڕێنەی دەکرد.

بەڵام فەرمانبەرەکە، هەناسەی لە خۆی بڕیبوو، ڕیاکارانە چاوی بڕیبووە دەمی ڕوگوژین و بۆ تاقە ساتێک نەی دەگواستەوە، هەر وشەیەکی ئەوی بە جۆرێ هەڵدەسەنگاند وەکو ئەوەی مرواری بن.

- بۆ تۆڕە بوون، ئەگەر بڵێی تووڕە بوو. هەڵبەتە نەهەقیشی نەبوو، بەڵام تاوانباری گەورە لە هەموو مەسەلەکەدا براکەم بوو. دایکم هیچ خەتایەکی نەبوو، گلەیی لێ ناکرێت، پیرەژنێکە هەمیشە سەری لە بەر خۆ ناوە و خەریکی خوێندنەوەی کتێبی دووعا و وێرد و ژیانی پیاوچاکان و

خواناسـانە. ڕۆژ تـا ئێـوارێ دەگـەڵ پیرەژنـانی هاوتەمـەنی خۆیدا خـەریکی قسـانە. سـێمونی بـرام هەمـە کـارەی ماڵەکەیـە، قسـە، قسـەی ئەوە، بڕیـار، بڕیاری ئەوە، بەڵام بۆچی خەبەریان نەدامێ؟ شتەکە دیارە! ڕاستە مـن لەو کاتەدا هۆشم بە خۆ نەبوو. دەڵێن گوایە بروسکەیەکیان بۆ ناردبووم، بـەڵام بروسـکەکە گەیشـتبووە دەسـتی پـوورم. پـوورم، کـە سـی سـاڵ بـوو بێـوەژن بوو، هەموو کاتی خۆی، لە بەیانییەوە تا ئێوارێ دەگەڵ ژنـانی شـێتۆکەدا، بـە باسـی مەسـیح دەبـردە سـەر. ڕاسـتە پـوورم ڕەبەنیتـە نییـە، لەو ژنانـە نییـە پێیان دەگوترێت ڕەبەنیتە، بـەڵام هـەزار خۆزگـە بـە ڕەبەنیتـە. کـە بروسـکەکە دەبینێ زارەتەرەک دەبێت، بێ ئەوەی بیکاتەوە، ڕێک دەیبـات بـۆ پۆلیسـخانە، کـە تـا ئێسـتاش هـەر لەوێنـدەرە. ئەوەی کـە یارمـەتیی دام تـەنیا ڤاسـیلی ڤاسیلیوفیچ کونیف بوو، کە نامـەی بۆ ناردم و لـە هـەموو شـتێک ئاگاداری کردمەوە. نووسیبووی کە براکەم هەموو شەوەکەی بەوە بردبـووە سـەر کـە ڕیشـووە زێڕەکـەکانی، چەرچەفـە زێڕبافـەکانی سـەر تابووتەکـەی بـابمی بڕیبوو، بەو بیانووەی کـە زۆر "گرانقیمـەتن". دەزانـی ئەگـەر بمەوێ دەتـوانم هەواڵەی سیبریای بکەم، چونکە ئەم کارە پێشێلکردنی موقەدەساتەکانە! ..

ڕوگـــوژین (گەنجـــە ئەســـمەرەکە) دوای ئەو قســـانە ڕووی کـــردە فەرمانبەرەکە و لەسەری ڕۆیشت:

– ئەهای داهۆڵەفەنی! یاسا چ دەڵێ؟ ئەمە پێشێلکردنی موقەدەسات نییە؟

فەرمانبەرەکە، بە خۆشحاڵییەوە بۆی سەلماند:

– بێگومان، پێشێلکردنە و ئەولاتریش!

– یانی شایەنی ئەوەیە هەواڵەی سیبریا بکریت، وا نییە؟

– ڕاسـتە، هەواڵـەی سـیبریا بکرێت، قۆڵبەسـت بکـرێ و یەکسـەر هەواڵـەی سیبریا بکرێت! .

ڕوگوژین، ڕووی کردەوە میرزادە و لەسەری ڕۆیشت:

– ئێستا هـەموویان وا دەزانـن مـن هێشـتا نەخۆشـم، بـەڵام مـن بـێ ئەوەی بە کەس بڵێم، یان کـەس لـە هـیچ شـتێک ئاگـادار بکـەمەوە، سـەرباری ئەوەی هێشتا هەر نەخۆش و بێتاقەتم، سـواری قیتـار بـووم، هـاتووم تـا غافڵگیریـان

بکەم! ئیدی ئەی برا ئازیزەکەم، سیمون سیمیونوفیچ-ی ئازیز! لەسەرتە دەرگام لێ بکەیتەوە، پێشوازیم بکەیت! من چاک دەزانم کە بابمی لێ پڕ دەکردم، لێمی تیژ دەکرد! جا لێرەدا پیاو هەق بڵێ، من بە حەقیقەت لەبەر خاتری ناستاسیا فیلیپوڤنا، بابم زۆر ئەزیەت دا، ئەمە حەقیقەتە. لەوەدا هەر من خەتابار بووم. شەیتان لە خشتەی بردم!

فەرمانبەرەکە، ڕیابازانە قسەکەی ئەوی دووبارە کردەوە و وەکو یەکێک چینە لە یادگەی خۆی بکات و شتێک وەبیر بێنێتەوە، پرسیی:

- لەبەر خاتری ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

ڕوگوژین، بە تورەیی بە ڕوویا هەڵشاخی و گوتی:

- فشە مەکە، تۆ هیچ شتێکی دەربارە نازانیت! هەر نایناسیت!

فەرمانبەرەفەنی، بە سیمایەکی سەرکەوتووانەوە بەرسڤی دایەوە:

- با، دەیناسم!

- واز بێنە، چی زۆرە، ئافرەتی ناستاسیا ناو، لە دنیادا زۆرە! بەڵام تۆ، با ڕێک و ڕەوان پێت بڵێم، کە پیاوێکی ڕوودار و زۆر زۆر بێشەرمی.

ئەوجا ڕووی کردە میرزادە و لەسەری ڕۆیشت:

- ئا... پێشوەختە دەمزانی، پێشوەختە دەمزانی کە تووشم دەبێت بە تووشی کابرایەکی وەکو ئەمەوە!

کابرای فەرمانبەر بەپەلە دووبارەی کردەوە:

- زۆر لەگینە بیناسم. لیبدیڤ هەموو شتێک دەزانێ. جەنابت گلەیی لە من دەکەیت کە نایناسم، هیچی لە بارەوە نازانم، ئەدی ئەگەر ناسیم، کەواتە با بۆتی باس بکەم: ئەم ناستاسیا فیلیپوڤنایە، هەمان ئەو ژنەیە کە بابت لەسەر وی بە دارعاسا گۆیژەکەی دارکاریی کردیت و ناوی شۆرەت و خانەوادەیی ئەو ژنە پاراشکوفایە. لە بنەماڵەیەکی بەڕێز و حورمەتە، ئەویش لە پێستی خۆیدا، دۆتمیرێکە بۆ خۆی، ئەوە یەک. دوو، پەیوەندیی بە پیاوێکەوە هەیە ناوی توتسکی، ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکییە، جگە لەو پەیوەندیی بە هیچ کەسێکی دیکەوە نییە. ئەم پیاوە یەکێکە لە مەلاک و سەرمایەدارە گەورەکان، چەندین کۆمپانیا بەڕێوە دەبات، دۆستایەتییەکی

نزیکی دەگەڵ جەنەراڵ یەپانچیندا هەیە...

ڕوگوژین، بە سەرسامییەکی زۆرەوە گوتی:

– عەجایەب! لەوە دەچێ تۆ بە ڕاستی ئاگات لە هەموو شتێک هەبێت! شەیتان بە نەحلەت بێ! بە ڕاستی دەیناسێت، هەموو شتێک دەزانێت!

– هەموو شتێک! لیبیدیڤ هەموو شتێک دەزانێت! جا جەنابی بەڕێز، با ئەوەشت عەرز بکەم، من لەو دواییانەدا دوو دانە مانگی خشت، هەرچی شوێن هەیە لەگەڵ لیخاچوفدا، ئالکسی لیخاچۆفدا وەکو دەلیل و ڕێنوێن گەڕاوم. ئەویش بابی لەدەست دابوو. بەو حیسابەی من هەموو پەناوپەسێران و کونوکەلەبەران شارەزام، وای لێ هات نەیدەتوانی بەبێ لیبدیڤ تاقە هەنگاوێک بنێت. حاڵی حازر، لەبەر قەرزداری لە زنداندایە. ئیدی لەو گەشت و گەڕانەماندا هەلی بۆ هەڵکەوت کە ئاشنایەتی و میانە دەگەڵ ئارمانس، کورالی*، دۆتمیرپاتکایەو، ناستاسیا ڤیلیپوڤنا و زۆر ئافرەتی دیکەدا پەیدا بکات.

ڕوگوژین، کە لێوەکانی زەرد هەڵگەڕان و کەوتنە تەتەڵە، نیگایەکی توڕەی کرد و گوتی:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا؟ مەبەست ئەوەیە پەیوەندیی دەگەڵ لیخاچۆفدا هەبوو؟

لیبیدیڤ، بەلەز بەرسڤی دایەوە:

– نا، نا، هەرگیز شتی وا نەبووە و نییە! لیخاچۆف، بە هەموو دەوڵەمەندییەکی خۆیەوە، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیتوانی بەو مەرامە بگات کە دەیویست. ناستاسیا، وەکو ئارمانس نەبوو. تەنیا پەیوەندیی دەگەڵ توتسکیدا هەبوو، جگە لە توتسکی پەیوەندیی دەگەڵ هیچ پیاوێکی تردا نەبوو. هەموو شەوێک لە لۆژەکەی خۆیدا لە شانۆ، ئیدی (ئۆپرای گەورە) یان (شانۆی فەرەنسی)دا دادەنیشێت. باکی بەوە نییە کە ئەفسەرەکان لە بەینی خۆیاندا چیی پێ دەڵێن و چۆنی باس دەکەن، چونکە ناتوانن هیچ لەکەیەکی پێوە بنەن، هیچ شتێکی لەسەر بکەن بە ماڵ. ئەوپەڕەکەی دەتوانن بڵێن: ئەوەتا! تەمەشا! ئەوە ناستاسیا فیلیپۆنای بەنێوبانگە! لەوە





زیاتر ناتوانن هیچی تر بڵێن، چونکە هیچ زەمێکی تری پێوە نییە!

ڕوگوژین، برۆکانی وێک هێنایەوە، چارەی گرژ کرد و گوتی:

- دروستە، وایە (زالیوژیڤ)یش کاتی خۆی هەمان شتی بۆ گێڕامەوە. لە بیرمە ڕۆژێک بە شەقامی نفسکیدا ڕێم دەکرد، کۆنە پاڵتۆیەکی بابم لەبەر بوو، سێ ساڵ بوو، هەر ئەو کۆنە پاڵتۆیەم لەبەر بوو، کە دیتم خانم لە موغازەیەکەوە دەر کەوت و چوو سواری گالیسکەکەی بێت، تف ڕاکە بەرەو پیری، هەر کە دیتم هەستم کرد ئاگرێکی بێئامان بەر بووە جەستە و هەناوم. دوای ئەوە ڕێکەوتی (زالیوژیف)م کرد. زالیوژیف وەکو من نەبوو. ڕێکوپێک و شیکپۆش، دەتگوت شاگرد بەربەرە، عەینەکێکی یەک چاوی لە چاو کردبوو. کەچی ئێمە لە ماڵی بابماندا پێڵاوە شڕمان لە پێ دەکرد، خواردنمان شۆربای کەلەرم بوو. زالیوژیڤ پێی گوتم: "ئەم ژنە خواردنی خەڵکی وەکو تۆ نییە. ئەمە دۆتمیرە*. ئەمە ناوی ناستاسیا فیلیپۆڤنایە و ناوی شۆرەت و خانەوادەییشی پاراشکوفایە. لەگەڵ توتسکیدا دەژی. ئەم توتسکییە داماوە نازانێ چۆن خۆی لە دەستی ڕزگار بکات. ئاخر چووەتە ساڵەوە، تەمەنی -پەنجا و پێنج ساڵە- دەیەوێ دەگەڵ جوانترین ئافرەتی پترسبۆرگدا زەماوەند بکات!

ئەوجا زالیوژیڤ کەوتە ئەوەی قەناعەتم پێ بکات کە من دەتوانم شەوێ ناستاسیا فیلیپوڤنا لە لۆژەکەی خۆیدا، لە (شانۆی گەورە)دا کە ئەمشەو شانۆنامەیەکی بالێی تیا پێشکەش دەکرێت، ببینم. بابم قەت ڕێی نەدەداین بچینە بالێ. ئەگەر داوای شتی وامان کردبا، بێگومان بە کوشتن دەیکوشتین! بەو حاڵەشەوە من توانیم بۆ ماوەی سەعاتێک خۆم بدزمەوە. جارێکی دیکە ناستاسیا فیلیپوڤنام دیتەوە. ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوانم. بەیانییەکەی، بابی ڕەحمەتیم دوو کۆمپیالەی دامێ کە هەر یەکێکیان بایی پێنج هەزار ڕۆبڵ بوو، گوتی: برۆ بیانفرۆشە. پاشان بچۆ بۆ نووسینگەکەی ئاندرییڤ و قەرزێکی حەوت هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی لامانە بیدەرەوە و بەپەلە و بەبێ دواکەوتن باقییەکەم بۆ بێنەوە. لە ماڵەوە چاوەڕوانت دەکەم. هەر دوو کۆمپیالەکەم فرۆشت، پارەکەم وەر گرت،





بەڵام نەچووم بۆ لای ئاندرییڤ، بەڵکو یەکڕاست چووم بۆ (موغازەی ئینگلیزی)، جووتێ گوارەم هەڵبژارد کە هەر یەکەیان ئەڵماسێکی بەدرشتی بوندقێکی پێوە بوو. هەر دە هەزار ڕۆبڵەکەم دا و هێشتا چوار سەد ڕۆبڵی کەم بوو، بەڵام کە ناوی خۆم گوت یارۆی بازرگان باوەڕی پێ کردم و قایل بوو. گوارەکانم برد و یەکڕاست چووم بۆ لای زالیوژیڤ و پێم گوت: "دەی هاوڕێ با بڕۆین بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا!". بە دوو قۆڵی کەوتینە ڕێ. وام لێ هاتبوو هەستم نەدەکرد بەسەر عاردیدا دەڕۆم، دەوروبەری خۆم نەدەبینی و یەکسەر خۆمان بە هۆڵی پێشوازییەکەی ئەودا کرد! بە خۆی هاتە پێشوازیمان، لێ من لەو ساتەدا زاتم نەکرد خۆمی پێ بناسێنم، بەڵام زالیوژیڤ گوتی: "ئەمە دیاریی پارفیون ڕوگوژینە، بەو بۆنەیەوە کە دوێنێ تۆی بینیوە، جا تکام وایە بە لوتفی خۆت قەبووڵی بکەیت." ناستاسیا، قوتووەکەی کردەوە، نیگایەکی وردی گوارەکانی کرد، ئەوجا بەدەم بزەیەکەوە گوتی: "بێزەحمەت بە ناوی منەوە، لەجیاتیی من سوپاسی هاوڕێکەت ئاغای ڕوگوژین بکە، بۆ ئەو زەحمەتەی کێشاویەتی!" ئەوجا خواحافیزیی لێ کردین و ڕۆیشت. خۆزگە ئەو ڕۆژە دەمردم و بەرم بەدواوە نەدەکرد، نازانم بۆچی ئەو ڕۆژە نەمردم! ئەلهەقی من وا چووبووم کە بە زندوویەتی نەگەڕێمەوە. ئەوەی لە هەموو شتێک پتر تووڕەی کردم ئەوە بوو، ئەو حەیوانە، زالیوژیڤ هەموو چاکە و پیاوەتییەکەی کرد بە هیی خۆی. من بە باڵا کورتەکەم و جلە کۆنەکانمەوە کە لە جلی خوڵام و خزمەتکاران دەچوو، لەوێندەر وەستابووم، بە شەرمەوە چاوانم بڕیبووە ئەو، بەڵام زالیوژیڤ، تازەترین مۆدی جلی لەبەر کردبوو، بۆنی لە خۆی دابوو، قژی نیگرۆ کردبوو، ڕۆنی لێ دابوو، ئیدی ژیانی لێ هەڵدەقوڵا، دەموچاوی پرشنگی دەدا، بۆینباخێکی خانەخانەی لە مل بەستبوو، ئیدی بزەی لە لێو دەباری و بەردەوام ئیکلامی بۆ دەکرد و لەبەری دەنوشتایەوە، ئیدی دڵنیا بووم کە ناستاسیا بەهەڵە ئەوی بە من زانیوە. ئەوی بە خودانی دیارییەکە زانیوە. کە هاتینە دەرەوە بە تووڕەیی پێم گوت: "نەخەڵەتابی، بیر لەو بکەیەوە کەکڵاوم بکەیە سەر، تێدەگەی؟"





گوتی: "خۆزگە دەمزانی چۆن و چ جوابێکی سیمون پارفیونیچ دەدەیەوە!".
باوەڕ بکەن، لەو کاتەدا حەزم دەکرد خۆم بخەمە رووبارێکەوە و بۆ ماڵ نەگەڕێمەوە. پاشان لە دڵی خۆدا گوتم: "نا، شتەکە ئەوەندەش گرینگ نییە! " وەکو یەکێک بۆ ناو ئاگر بڕوات، بەو ئاوایە بۆ ماڵ گەڕامەوە. لیبیدیڤ، لە بن لێوانەوە و بەسەرسامی گوتی:

- ئەللا، ئەللا...

ئەوجا رووی دەمی کردە میرزادە و گوتی:

- بابی رەحمەتی ئامادە بوو لەسەر دە رۆبڵ، زەلامێک بکوژێت، چ جای دە هەزار رۆبڵ!

میرزادە، بە کونجکاوی دەیڕوانییە ڕوگوژین کە لەو دەمەدا هێندەی دی رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو.

ڕوگوژین گوتی:

- هەر کوشتن؟ تۆچی لەم بارەیەوە دەزانی؟

ئەوجا رووی کردە میرزادە و لەسەری و رۆیشت و گوتی:

- هەڵبەتە بابم دوای ماوەیەکی کەم بە هەموو شتێکی زانی (زالیوژیڤ)یش مەسەلەکەی بۆ دۆم و خەڕاتیش دەگێڕایەوە، دنیای لێ پڕ کردم. بابم بردمیە ژوورێکی قاتی سەرەوە، دەست و لاقی بەستمەوە، دەستی دایە دارێک و بگرە کوێت دێشێت، یەک دانە سەعاتی تەواو دارکاریی کردم. گوتی: "هێشتا لەکوێتە، چیت دیوە، ئەمە تەنیا بەرکوڵە، ڕاوەستە بۆم تا شەوێ دێمەوە، هەنگێ دەرەقەتت دێم! مەگەر هەر خۆم بزانم چ شەوێکی خۆش و چ خەوێکی قووڵت بۆ فەراهەم دەکەم! ". دەزانی دوای ئەوە چیی کرد؟ بە خۆی چوو بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە سەری سپییەوە چو بۆلای، خۆی لە بەرپێیانی هاویشت، کەوتە لالانەوە و پاڕانەوە و گریان. ئەنجام ئەویش قوتووەکە دێنێ و بۆی تووڕ دەدات و دەڵێت: "پیرەمێر، بگرە، ئەوە گوارەکانت! ئێستاکە بۆم دەر کەوت، پارفیون بەو ڕیسکە بەدەستی هێناون دە ئەوەندە لەلام بەنرخ تر بوون! ڕێز و سڵاوم بگەیەنە بە پارفیون!"

ئەوسا، بە ڕەزامەندیی دایکم چووم بیست و پێنج ڕۆبڵم لە سیرگی پروتوشین قەرز کرد، سواری قیتار بووم و پسکوف خۆت بگرە وا هاتم. کە گەیشتمە ئەوێندەر، تا و لەرز گرتمی ئەمما تا و لەرز. پیرەژنان لە دەورم خڕ بوونەوە و کتێبانیان هێنا و کەوتنەوێرد و دووعاخوێندن. ئیدی بە حاڵی بێحاڵەوە حەپەسابووم. پاشان وەدەر کەوتم، کەوتمە گەڕان بە کابارێ و مەیخانەکاندا، دوا قرۆشم خەرج کرد، هەموو شەوەکەم لە کوچە و کۆڵانان بەسەر برد، هیلاک و ماندوو، خەریک بوو لە مەستیدا بمرم، تا ڕۆژیش بووەوە هەر وڕێنەم دەکرد. تومەز شەوێ کسۆکان لێم خڕ بوونەتەوە و لستیویانمەتەوە و قەپالایان لێ گرتووم. و زۆر بەزەحمەت وەهۆش هاتوومەتەوە.

لیبیدیڤ، لە کاتێکا دەستەکانی هەڵدەگلۆفت و بەدەم پێکەنینێکی تەوسامێزەوە، گوتی:

– ها، ها! نها هەموومان زیاتر ناستاسیامان بۆ دەر کەوت و ناسیمان، مەسەلە هەر ئەو جووتە گوارەیە نییە، لە ئێستا بەدواوە ئەوەندەی دیاری بەسەردا دەبارێ کە...

ڕوگوژین، باسکی لیبیدیڤی گرت و بەتوڕەیی پێیدا هەڵشاخی:

– قەسەم بەخوا... یەک قسەی قۆڕ دەربارەی ناستاسیا بکەی مارهەنجنت دەکەم.. ئەوەندەت تێ هەڵدەدەم کە... نەڵێی لەگەڵ لیخاچۆفدا سووڕاویتەوە، ئامادەم بە شەلاقان پێستت بگرووم.

– من شانازی بەوەوە دەکەم! ئەوە بۆ من یادگارییە، فەرموو ئەوە پشتی من و قامچیی تۆ. ئەوە جارێ وا گەیشتین!

قیتارەکە، بەرەبەرە گەیشتە ناو وێستگەکە. هەرچەند ڕوگوژین گوتبووی، بەدزییەوە و بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بکات لە بسکوفەوە وەڕێ کەوتووە، بەڵام چەندین کەس لەوێستگەکەدا لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوون، کە چاویان پێکەوت، کەوتنە بانگکردن و کڵاوەکانیان بۆ لە سەر داگرت.

ڕوگوژین، کە بەدەم بزەیەکی سەرکەوتووانە و مانادارەوە تەمەشای دەکردن، بە دەنگێکی نزم گوتی: "سەیرە! زالیوژیڤ-ش هاتووە!





لەناکاو ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و گوتی:

- گویّ بگرە میرزادە، نازانم بۆچی چوویتە دڵمەوە. ڕەنگە لەبەر ئەمە بێ کە لەم وەخت و ساتەدا تووشت بووم. خۆ ئەو خوێڕییەشم لە هەمان وەخت و ساتدا بینی (بەدەم ئەو قسەیەوە ئاماژەی بۆ لای لیبیدیڤ کرد) کەچی خۆشم نەویست، نەچووە دڵمەوە. میرزادە سەرم لێ بدە. ئەو پێڵاوە شڕ و ناشیرینانەت لە کۆڵ دەکەمەوە. چاکەتێکی زۆر جوانت دەدەمێ، پاڵتۆیەکی بیلادیی زۆر چاک و یەلەکێکی سپی یان هەر ڕەنگێکی تر کە بە دڵی خۆت بێ، بۆ دەدەمە دروون. گیرفانەکانت پڕ دەکەم لە پارەوپول... هەنگی دەچین سەردانی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەکەین.. سەرم دەدەی یان نا؟

لیبیدیڤ، بە پەرۆشەوە گوتی:

- میرزادە، بە گوێی بکە، ڕێوی بە پیرتەوە هاتووە! لە کیسی خۆتی مەدە!..

میرزادە هەستا، بە نەزاکەتەوە تەوقەی دەگەڵ ڕوگوژیندا کرد، بە دەم و لەبزێکی شیرین بەرسڤی دایەوە:

- زۆر حەز دەکەم سەردانت بکەم. زۆر زۆر سوپاسی ئەو هەموو لوتفەت دەکەم. لەوەیە ئەگەر دەرفەتم هەبێت هەر ئەمڕۆ بێمە خزمەتت، حەز دەکەم بێ پێچوپەنا ئەوەت عەرز بکەم کە منیش تۆم زۆر بەدڵە، هەر لە هەوەڵەوە چوویتە دڵمەوە و خۆشم ویستی، بە تایبەتی کە باسی حیکایەتی جووتە گوارەکەت بۆ کردم. تەنانەت پێش ئەوەی باسی گوارەکانیش بکەیت، هەر خۆشەویست بووی لام، هەرچەندە هەندێ گرژومۆن بوویت. هەروەها سوپاست دەکەم بۆ ئەو پاڵتۆ و جلکانەی کە بەتەمای بمدەیتێ، چونکە دەزانم بەو زووانە پێویستم بەو جلکانە دەبێت، خۆ حاڵی حازر تاقە قروشێک شک نابەم کە ئەو جۆرە جلکەی پێ بکڕم.

- خەمت، من پارەم دەبێت، ئەم ئێواەیە دەبم بە خاوەن پارە. وەرە بۆ لام! خەمت نەبێ!

فەرمانبەرەکە، هەڵی دایە:

- پارەی دەبێت، بەڵێ پارەی پێ دەبێت، ئەم ئێوارەیە، پێش ئەوەی دنیا

تاریک بێت، دەبێ بە خاوەن پارە.

ڕوگوژین پرسی:

- میرزادە، پێش هەموو شتێ پێم بڵێ بەینت دەگەڵ مێیازیدا چۆنە؟ حەزی لێ دەکەیت؟

- من.. من؟ نا! پێویستە ئەوەت پێ بڵێم... دیارە تۆ نایزانیت... من بە هۆی نەخۆشینەکی زگماکەوە، قەت تێکەڵاوی ژنان نەبووم!

ڕوگوژین گوتی:

- ئەگەر وا بێ میرزادە، تۆ پیاوێکی بە ڕاستی پاک و بێگەردی! ئێوەگەل خۆشەویستی خوان!

لیبیدیڤ، هەر بۆ پشتیوانیی قسەکانی ڕوگوژین گوتی:

- بەڵێ بەڵێ، ئەی مانای چی، خوا خۆشی دەوێن.

ڕوگوژین، بە ئەمرکردنەوە بە لیبیدیڤی گوت:

- تۆش دوام بکەوە میرزا بنووس!

بە سێ قۆڵی لە فارگۆنەکە دابەزین. لیبیدیڤ ئاخری بە ئاواتی خۆی گەیشت. زۆری پێنەچوو جماعەتە پڕ سەروسەداکەی ڕوگوژین، بەرە و شەقامی فوزنسنسکی لایان دا. میرزادە ناچار بوو بەرە و شەقامی لیتاینایا پێچ بکاتەوە.

دنیا تەمومژ و سارد و سەرما بوو. میرزادە پرسیاری ڕێگاکەی لە ڕێبواران کرد. بۆی دەر کەوت کە هێشتا سێ فەرسەخی بۆ ئەو شوێنە ماوە کە ئەو دەیەوێ. بڕیاری دا گالیسکەیەک بەکرێ بگرێت.

پەراوێز:

* - قیتاری وارشۆ: خەڵکی لە هەندەرانەوە، لە ڤیێنا و بەرلینەوە لە ڕێگای (ئایدکونن)ەوە بۆ پترسبۆرگ دەهاتن.

* - ئایدکونن: دوایەمین وێستگەی بروسیایە لەسەر سنووری ڕووسیا.

* - ئەمە ناوێکی مێژوویییە: ئەم ناوە بۆ تاقە جارێک لە "مێژووەکەی کارامازین"دا هاتووە، لە سەدەی نۆزدەدا، بەڵام ئەمماڵباتە زۆری نەخایاندووە کە کوژاوەتەوە. ڕەنگە دۆستویفسکی بۆیە ئەم ناوەی هەڵبژاردبێ – کە لە

وشەی میشکاوە (مشکی چکۆلە) وەر گیراوە- کە ئاماژە بێت بۆ تەبع و تەبیعەتی متەوازیعی ئەم کاراکتەرە.

* - کارامازین: (نیکولا میخائیلوفیچ کارامازین): دیرۆکنوسێکی بەناوبانگی ڕووسییە (١٧٦٦- ١٨٢٦)، دانەری کتێبی "مێژووی دەوڵەتی ڕووسی"یە، کە بریتییە لە دوازدە بەرگ، کە لە ساڵی ١٨١٩- ١٨٢٦دا پاچڤەی فەرەنسایی کراوە.

* - "بۆرژوای فەخری ویراسی": زۆربەی هەر زۆری بازرگانان، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، فەلاح بوون و بە هۆی بازرگانییەوە دەوڵەمەند بووبوون. کە ئەوان لە دانی ئەو باجەی کە دەبوا بازرگانان بیدەن، وەستان، گەڕانەوە بۆ ئەسڵی فەلاحی و دێهاتی خۆیان. ئیدی موشەڕیع بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هەستە چینایەتییە دوو جۆرە گرووپی سەربە خۆی بۆ باجدان دیاری کرد کە بریتی بوون لە گرووپی بۆرژوای کرێکار و گرووپی بۆرژوای فەخری ویراسی.

* - "شایەنی ئەوەیە ڕەوانە و نەفی سیبریا بکرێت": هەر تاوانێک پێشێلکردنی مەقەدەساتی تیا بووایە، بەپێی یاسا، تاوانبار سزایەکی قورس دەدرا، دزینی شتە تایبەتییەکانی عیبادەت دەچووە خانەی ئەوە جۆرە سزایەوە.

* - ئارمانس، کورالی: دیارە ئەمانە لەو ژنانە بوون کە لە کۆمەڵگەدا دیار و مەڕمووق بوون، بە ئەسڵ فەرەنسی بوو.

* - بۆ خۆی دۆتمیرێکە: ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە ڕاستیا دۆتمیر و میرزادە نەبوو، ئەمە موبالەغەی زالیوژیڤ بوو.

* - میرزادە: نازناوی میرزادە لە باب و باپیرانەوە بۆ کوڕ و نەوە و نەتیرە دەمایەوە، بۆیە مەرج نییە میرزادە هەر دەبێ دەوڵەمەند بێت.

* - جەنەراڵ: لە سەردەمی پترۆسی یەکەمدا، چواردە دەرەجەی وەزیفیی سوپایی و مەدەنیی هەبوو، پێنج لەو درەجانە دەرەجەی جەنەراڵی بوو کە هەم بۆ سوپاییان و هەم بۆ مەدەنییانیش بەکار دەبرا.. جا ئەم لەقەبی جەنەراڵییە لەگەڵ ناوی ژنانی خاوەن ئەو پێنج دەرەجە باڵایەدا بەکار دەهات. بۆیە (خا جەنەراڵ) لەو ڕوانگەیەوە بەکار براوە نەک لەبەر ئەوەی ژنەکە بە ڕاستی جەنەراڵ بووە.. وەک شێخژن و مەلاژن و مامۆستاژن و ئەوشتانەی کوردەواریی خۆمان..

## فەسلی دووەم

جەنەراڵ پەیانچین لە ماڵێکا دەژیا، کە لە کۆتایی شەقامی لیتاینایادا، نزیکی کڵێسای میعراجی عیسا مەسیح بوو. جگە لەم خانووە جوانە کە پێنج شەشی دیکەی لە کرێدا بوو، خانووەیەکی زۆر گەورەشی لە شەقامی سادوڤایادا هەبوو کە لەوەش دەسکەوت و دەرامەتێکی باشی دەست دەکەوت، جگە لەم دوو خانووە، موڵکێکی گەورەی پڕ سوود و مەنفەعەتی لە نزیکی پترسبۆرگ هەبوو. هەروەها کارخانەیەکیشی لە دەوروبەری پترسبۆرگ هەبوو. پیاوێکی زۆر ناودار بوو، هەموو دەیانزانی جاران جەنەراڵێکی کشتیار بوو، زەویوزاری بەوەرزێر و جووتیار و فەلا بەکرێ دەدا، بەڵام نها، بەشدارێکی گەورە بوو لە چەندین کۆمپانیای مەزن. بە پیاوێکی زۆر زەنگین و دەوڵەمەند و خودان کۆمپانیا و پرۆژەی گەورە و فرە پەیوەندی و خاوەن دۆستانی دەسەڵاتدار و دەسترۆ دەژمێردرا. جگە لە کاری فەرمیی دەوڵەتی، توانیبووی لە زۆر ناوەندی دیکەدا بوونی خۆی بسەپێنێ. هەڵبەتە لای هەمووانیش ئاشکرا بوو کە ئیڤان فیودورفیچ یەپانچین، کابرایەک بوو کوڕی خانەوادەی سەربازێکی سادە بوو، یانی ژیانی سەربازیی وی لە مەدرەسەیەکی عەریفانەوە دەستی پێ کردبوو. هەڵبەتە شانازیی بەمەوە دەکرد. بەهەرحاڵ جەنەراڵ هەرچەندە پیاوێکی زیرەک بوو، بەڵام خاڵی لاواز و کێماسی خۆیشی هەبوو، یەکێک لەو خاڵە لاوازانەی ئەوە بوو، کە هەرگیز تەحەمولی ئەوەی نەدەکرد ئاماژە بۆ ڕابردووی بێتە کردن، بەڵام گومان لە وریایی و زیرەکیی ئەو نەبوو. کەس

نەیدەتوانی نکوڵی لە زیرەکیی وی بکات. بۆ نموونە لە کاتی پێویستدا هەرگیز خۆی ڕەپێش نەدەخست، خۆی نەدەنواند و بە خۆی نەدەفشی، بۆیە خەڵکانێکی زۆر، ڕێز و حورمەتی ئەم سادەیی و بێفیزییەیان دەگرت. ڕێزیان دەگرت، چونکە سنووری خۆی دەزانی و پێی لە بەرەی خۆی زیاتر ڕانەدەکێشا. جا خۆزیا ئەو خەڵکەی ئەو ڕاوبۆچوونە باشەیان دەربارەی هەبوو، ئەوانەی بەو باشییە هەڵیان دەسەنگاند، دەیانزانی هەندێ جار چ شتێک بە مێشک و خەیاڵ و دڵی ئەم ئیڤان فیودوروفیچەدا دێت، کە بەو جوانییە قەدری خۆی دەزانی و حورمەتی خۆی دەگرت!...

جەنەراڵ یەپانچین، وێڕای پڕ ئەزموونی و کارامەیی فراوانی لە کاروباراندا، سەرباری بەهرە و توانا بەرجەستەکانی، هەمیشە حەزی دەکرد وا بنوێنێ خولامێکی ئەمین و وەفادار و گوێڕایەڵی بیروبۆچوونی خەڵکی ترە، نەک ڕاوبۆچوونی خۆی بسەپێنێ. "هەڵبەتە خولامێکی ئەمین و بەوەفا، نەک دەڵەچەیەکی ڕیابازی ماستاوچی سووک و چرووک"* جا لەگەڵ ئەوەشدا – بەگوێرەی ڕۆژ و سەردەم- بەوپەڕی شەرەفی دەزانی کە پیاو کەسێکی بەورە و بەهەڵوێست و سەرڕاست بێت، ڕووسییەکی ڕاستەقینە و بێ غەلوغەش بێت. جا لەم ڕووەوە هەندێ ناو و ناتۆرە و ڕووداوی کۆمیدی دوا خرابوو، بەڵام جەنەراڵ لەو پیاوانە نەبوو بەم شتانە شێلو ببێت و ورەی بڕوخێت و لە تەنگانەترین تەنگانەدا، تووشی نائومێدی ببێت. کابرایەک بوو هەمیشە بەختی یار بوو، تەنانەت لە قوماریشدا، کە قوماری گەورەی دەکرد، هەر بەختی هەبوو. هەڵبەتە هەرگیز هەوڵی نەدەدا ئەم عەیبە چکۆلەیەی خۆی یان ئەو هەڵە بچووکەی خۆی، کە زۆر جار دەسکەوتی گەورەی لێ دەست دەکەوت، وەشێرێت. بە پێچەوانەوە جاڕی بۆ دەدا.

جەنەراڵ، هەڵبەتە سەر بە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی هەرەمە بوو، بەڵام بەهەرحاڵ ژینگەیەکی دەوڵەمەند و دەسترۆ بوو. ئارەزوو و ئاواتێکی زۆری هەبوو، چاوی لە ئایندە بوو، بەڵام هیچ پەلەی نەبوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەموو ئاوات و ئامانجەکانی دێنە دی. جەنەراڵ یەپانچین هێشتا

وەک دەڵێن —لە هەرەتی قەوەتا بوو. تەمەنی پەنجا و شەش ساڵ بوو، یانی هێشتا لە هەرەتی ژیانا بوو، ژیانی ڕاستەقینەی پیاو لەو تەمەنەدا دەست پێ دەکات! تەندروستی و ڕەنگ و ڕووی لە جێ و تەڕوبڕ بوو، دانەکانی هەرچەندە ڕەش بوون، بەڵام زۆر ساغ بوون، بەدەنی تۆکمە و بتەو، بە ڕۆژەوە خەریکی کار بوو، بە شەوانیش چ لەسەر مێزی قومار و چ لە حوزووری جەنابی کۆنتدا*، هەر هەموو ئەوانە کۆمەکیان بە سەرکەوتنەکانی ئێستا و ئایندەی جەناب عالی جەنەراڵ دەکرد و ڕەونەقیان بە ژیانی دەبەخشی.

جەنەراڵ، سەرگەڤاری خێزانێکی بەختەوەر بوو، خێزانێکی گوڵئاسا. ڕاستە لێرەدا، لەم خێزانەدا هەمیشە و بەردەوام ڕەوشەکە بەگوێرەی مرازی دڵ نەبوو، بەڵام هەندێ ئاوات و ئامانج هەبوو هەر لە کۆنەوە جێگەی خۆزیای جەنەراڵ بوو. ئەوەی ڕاستی بێت گرینگترین و پیرۆزترین شت لە ژیانی خێزانداریدا، منداڵە. ئاخر پیاو ئەگەر پابەند نەبێ بە خێزانەوە بە چ شتێکەوە پابەند دەبێت؟ خێزان و ماڵباتەکەی جەنەراڵ بریتیبوو لە هاوسەرەکەی و سێ کیژە عازەبەکەی. جەنەراڵ لە هەرەتی لاویدا لە کاتێکا هێشتا ملازمی یەکەم بوو، کیژێکی هاوتەمەن و هاوساڵی خۆی خواست. کیژە نە جوان و نە خاوەن شادەتنامە و خوێنەواری بوو، بەڵام پەنجا دانە ڕەعیەتی وەکو جیازی دەگەڵ خۆیدا هێنابوو، کە پیاو هەق بڵێ، ئەم جیازییە، بوو بە سەرەتا و هێم و بناغەی سەروەت و سامانە زۆرەکەی ئایندەی جەنەراڵ. جەنەراڵ هەرگیز گلەیی ئەوەی نەدەکرد کە زوو ژنی هێناوە و ڕۆژێ لە ڕۆژانیش ئەم زەوجین و زەماوەندەی بە زادەی جۆشوخرۆش و حەماسەتی لاوی لە قەڵەم نەدا. بێئەندازە حورمەتی ژنەکەی دەگرت و هەندێ جار ئەوەندە لێی دەترسا و ڕووپامایی دەکرد، لە تۆ وایە ئاشقێنی دەگەڵ دەکات.

هاوسەرەکەی لە بنەماڵەی میرانی میشکین بوو، هەرچەندە ئەم بنەماڵەیە زۆر دەوڵەمەند نەبوون، بەڵام وەکو دەڵێن ڕەسەن و خانەدان و بنەماڵەی کۆن بوو. خاجەنەراڵ، زۆر بەم ئەسڵ و فەسڵەی خۆی دەنازی،

کەسێتییەکی دەستڕۆی وەخت و ڕۆژ، کەسێتییەک لەو کەسێتییانەی حەز دەکەن دەمسپێتی و پشتیوانیی خەڵکی بکەن (ئەو جۆرە پشتیوانی و دەم سپییەتییەی کە هیچ لەسەر خاوەنەکەی ناکەوێ) حەزی دەکرد ئەم دۆتمیرە گەنجە بە شوو بدات، ئیدی دەرگای بەرزبوونەوە و پێشکەوتنی لەبەردەم ئەم ملازم یەکەمە گەنجە کردەوە. جا لەو دەوروزەمانە هەر نیگا و ئاوڕدانەوەیەکی بە خێری ئەو جۆرە پیاوە دەسرۆیانە زۆر گرینگ بوو چ جای بگاتە ئەوەی پشتیوانیت بکات. ئەم ژن و مێردە، لە ژیانی دوورودرێژی هاوسەرییانا، زۆر بەتەبایی ژیا بوون، هەندێ ڕێکەوتی کوتوپڕ و ڕەوتەنی نەبێ، ئیدی بۆ خۆ سازابوون، ئەم مەدام جەنەراڵە، توانیبووی بە زەبری ئەسڵ و فەسڵ و ڕەگ و ڕەچەڵەکی خانەدانی خۆی، وەکو میرزادەیەک و وەکو دوا وەچەی بنەماڵەکەیان، هەروەها بە هۆی خۆش تەبیعەتی خۆیەوە، هەر لە منداڵییەوە توانیبووی پشتیوانانێکی زۆر گەورە و دەسڕۆ بۆ خۆی پەیدا بکات. دوای ئەوەش بە زەبری جیازییەکەی و بە فەزڵی ئەو پایەبەرزەی بە هۆی سەروەت و سامان و پایەی فەرمی مێردەکەیەوە بەدەستی هێنابوو، وای لێ هات لە کۆڕ و کۆمەڵە ئەرستۆکراتی و ئەشرافەکاندا، کەم و زۆر لە ڕوو دانەدەما هەستی بە کێماسی نەدەکرد، بە پێچەوانەوە، زۆری پێ خۆش بوو و هەستی بە کەماڵی ئاسوودەیی دەکرد.

لەو ساڵانەی دواییدا، هەر سێ کیژەکەیان: ئالکساندریا، ئادیلایدا، ئاگلایا، عازەب و وەختی شوویان بوو، ڕاستە ئەمانە هەر سێکیان هەڵگری ناو و شۆرەتی یەپانچین بوون، یانی لە تایفەی یەپانچین بوون، بەڵام بە پشتیوانە و ڕەسیدێکی گەورەوە هاتبوونە ژیانەوە! لە دایکەوە سەر بە بنەماڵەی میران بوون، لە باوکەوە خاوەنی جیازی مۆڵ بوون، باوکیان لە کاروباری خۆیدا زۆر سەرکەوتوو بوو، خەوی بە بەرزترین پلەوپایە و پۆستەوە دەبینی، سەرباری ئەمانەش، هەر سێکیان کیژانی ڕەزاسووک و بەرچاوی بوون، گەورەکەیان، واتە ئالکساندریا تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بوو، ناوەنجییەکەیان بیست و سێ ساڵان بوو. بچووکەکەیان، یانی ئاگلایا تازە

پێی نابووە ناو بیست و یەک ساڵییەوە. ئەم کیژەیان بە ڕاستی جوان بوو و مایەی سەرنجی هەمووان بوو، ئیدی ناوی کەوتبووە سەر زاران و ستاییشی جەماڵ و کەماڵیان دەکرد، بەڵام ئیمتیازاتی ئەم کیژانە هەر ئەوەندە نەبوو، هەر سێکیان لە ڕووی خوێنەواری و ڕۆشنبیرییەوە، لە باری زیرەکی و بەهرەمەندییەوە خەڵکانێکی کەموێنە بوون. وا باو بوو کە لەنێو یەکتردا زۆر تەبا بوون، یەکیان خۆش دەویست،و پشتیوانی یەکتریان دەکرد. تەنانەت خەڵکی باسی ئەو فیداکارییەیان دەکرد کە دوو خوشکە گەورەکە، لەپێناوی خوشکە بچووکەکەیان، کە نازداری خانەوادەکە بوو، کردبوو. لەنێو خەڵک و خوادا، خاکی و بێفیز و هەوا بوون، خۆیان لە کەس بە گەورەتر و زیاتر نەدەزانی، تەنانەت هەندێ جار زیاد لە پێویست خۆشکێنییان دەنواند، کەس نەیدەتوانی گلەییان لێ بکات کە لووتبەرز و خۆپەسند و بەهەوا و دەعییەن، بەڵام وێڕای ئەوەش قەدری خۆیان دەزانی و ڕێز و حورمەتی خۆیان دەگرت. خوشکە گەورەکەیان سازڤان بوو. ئادیلایدا، بەهرەمەندێکی گەورەی بواری نیگار و ڕەسم بوو، بەڵام ئەم بەهرەیە ساڵانێکی زۆر بوو کە لە خەڵکی شاراوە بوو، کەس پێی نەدەزانی و بە تازەگی و بەڕێکەوت ئاشکرا بووبوو. بەکورتی هەر سێکیان مایەی مەدح و ستاییشی خەڵکی بوون، بەڵام بەدخواشیان هەبوو، هەندێ کەس بە ترسەوە باسی ژمارەی ئەو کتێبانەیان دەکرد کە ئەو کیژانە خوێندبوویانەوە.

ئەم کیژانە پەلەی شووکردنیان نەبوو، هەرچەندە حیسابی زۆریان بۆ ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیان دەکرد، بەڵام لەڕادەبەدەریش گوێیان نەدەدایە، هەڵبەتە ئەمە دەگەڵ تەبیعەت و سروشتی تایبەتی و نیاز و ئارەزووەکانی باوکیان، تێکی نەدەکردەوە.

دەوروبەری سەعات یازدەی بەیانی بوو کە میرزادە میشکین لە زەنگی دەرگای ماڵی جەنەراڵ (یەپانچین)ی دا، شوقەکەی جەنەراڵ لە قاتی یەکەمی تەلارێکدا بوو، ئەگەر چی بە ڕواڵەت سادە بوو، بەڵام پڕ بە پێستی پلەوپایەی جەنەراڵ بوو.

پێشخزمەتێکی پۆشتەوپەرداخ دەرگای لێ کردەوە، میرزادە ناچار بوو، شەرح و شرۆڤەیەکی دوورودرێژ پێشکەش بەو پێشخزمەتە بکات کە لە هەوەڵەوە بە گومانەوە دەیڕوانییە خۆی و بوخچەکەی. دوای ئەوەی میرزاد بۆی دووپات کردەوە کە میرزادە میشکینە و پێویستە بۆ کارێکی پەلە و پێویست و زەروری جەنەراڵ بدینێ، پێشخزمەتەکە بەسەرسامی بردیە ئەو پرسگە بچووکەی کە ڕێک بە ژووری میوان و چاوەڕوانییەوە نووسابوو، دەچووە نووسینگەکەی جەنەراڵ. لەوێندەر بە خزمەتکارێکی دیکەی سپارد کە هەموو بەیانییەک لەو پرسگەیەدا، پێشوازیی میوانانی دەکرد و جەنەراڵی لە هاتنی میوانان ئاگادار دەکردەوە. ئەم خزمەتکارە کە تەمەنی لە چل ساڵ زیاتر دەبوو، جلێکی فەرمیی لەبەر بوو، نیگەرانی بە سیمایەوە دیار بوو، وا خۆی دەنواند یەجگار پڕ کار و سەرقاڵە. ئەم پیاوە لە نووسینگەکەی جەنابی جەنەراڵ بەرپرس بوو، بۆیە بۆ خۆی و لە دڵی خۆیدا هەستی بە جۆرە گەورەیەک دەکرد.

ڕووی کردە میرزادە و بەوپەڕی ویقار و سەلاری گوتی:

- لە هۆڵەکەدا چاوەڕوان بکە، بەڵام بوخچەکەت لێرە دابنە.

ئەوسا بە فیزو دەعیەیەکی زۆرەوە لەسەر یەکێک لە کورسییەکان ڕۆنیشت، بەسەرسامیۆ و ژیری دەیڕوانییە میرزادە.

میر بە خۆی و بوخچەکەی دەستیەوە، لەسەر کورسییەک دانیشت و گوتی:

- ئەگەر ڕێم بدەی، حەز دەکەم لێرە، لەلای تۆ چاوەڕوانی بکەم، باشترە لەوەی لەوێندەر بە تەنیا چاوەڕوان بکەم!

- ئاخر جوان نییە تۆ لێرە، لە پرسگە چاوەڕوان بکەیت، چونکە تۆ میوانی. یانی جۆرە میوانێکی. دەتەوێ جەنەراڵ بە خۆی ببینی؟ قسە دەگەڵ خۆی بکەیت؟

دیار بوو، کابرای خزمەتکار، لە ناخی خۆیدا بەوە قایل نەبوو کە جەنەراڵ لە هاتنی میوانێکی واهی! ئاگادار بکاتەوە، بۆیە بڕیاری دا پرسیارەکەی دووبارە بکاتەوە.

میرزادە کەوتە قسان و گوتی:

- بەڵێ، گەرەکمە قسە دەگەڵ جەنەراڵدا بکەم، کارم بە خۆی هەیە...

خزمەتکارەکە، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- من لێت ناپرسم چ کارێکت پێی هەیە، هەقم نییە چ کارێکت پێیەتی، چونکە ئەرکی من تەنیا ئەوەیە بتکەمە ژوورەوە، بەڵام دووپاتی دەکەمەوە کە بەبێ ئیزنی سکرتێری تایبەتی ناتوانم. جەنەراڵ لە هاتنت ئاگادار بکەم.

دیار بوو، یارۆی خزمەتکار سات بە سات بەگومانتر دەبوو، چونکە دیمەن و ڕواڵەتی میرزادە، زۆر جیاوازتر بوو لە دیمەن و ڕواڵەتی میوانانی ئاسایی. ڕاستە جەنەراڵ زۆر جار، ناوبەناو، نەک هەموو ڕۆژێ، لە کاتێکی تایبەتیدا، میوانانی هەمەجۆری، بە تایبەتی بۆ "کار" پێشوازی دەکرد و دەبینی، بەڵام وێڕای ئەوەش یارۆی خزمەتکار لەم میوانە بەگومان بوو، ئەقڵی ئەم میوانەی نەدەبڕی. هەستی دەکرد، دەبێ پرس بە سکرتێری تایبەتی بکات ئەوجا بیکاتە ژوورەوە بۆ لای جەنەراڵ.

ئەوسا، بە شێوەیەکی نیمچە توانجەوە لێی پرسی:

- یانی... تۆ بە ڕاستی... لە هەندەرانەوە دێی؟

ئەوسا کەوتە پرتاندن، لە تۆ وایە دەیەوێ بڵێ: "تۆ بە ڕاستی میری، یانی لە بەرەبابی بنەماڵەی (میشکین)ی؟"

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، ئێستا لە ڕێوە، لەوێستگەی قیتارەوە دێم، پێم وایە دەتویست بپرسیت کە ئایا من بە ڕاستی میرزادە میشکینم، بەڵام لە ڕووی ئەدەبەوە ئەم پرسیارەت نەکرد.

یارۆی خزمەتکار، بەسەرسامی و لە بن لێوانەوە، پرتاندی:

- ئم...

میرزادە گوتی:

- دڵنیا بە کە درۆم دەگەڵ نەکردوویت. لەسەر من سەرزەنشت ناکرێیت. سەبارەت بە جلوبەرگ و بوخچەکەم سەرت سووڕ نەمێنێ: جارێ وەزع و حاڵی من ئاوایە!

- ئم... من لەمە ناترسم. ئەرکی من ئەوەیە جەنەراڵ لە هاتنی تۆ ئاگادار بکەمەوە. هەڵبەتە سکرتێر دێت تا قسەت لەگەڵ بکات... مەگەر... کێشەکە لەم مەگەرەدایە... ڕێم دەدەیت پرسیارێکت لێ بکەم؟ تۆ بۆ ئەوە نەهاتوویت جەنەراڵ ببینی و داوای قەرز و کۆمەک و یارمەتیی لێ بکەیت؟

- نەخێر، نەخێر، خەیاڵت تەخت بێ، ئەرخایەن بە... کە بۆ کارێکی زۆر جیاواز هاتووم.

- ببورە، کە جلوبەرگەکەم بینیت، بۆیە ئەو پرسیارەم لێ کردیت. چاوەڕوانی سکرتێر بکە. جەنەراڵ دەگەڵ کۆلۆنێلدا مژوولە. دوای ئەو، سکرتێری یەکێک لە کۆمپانیاکان دێت.

- ئەگەر وایە و قەرارە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بکەم، بێزەحمەت لەکوێ پایپێک بکێشم. بە خۆم پایپ و توتنم پێیە.

کابرای خزمەتکار، سەری لەم داوایەی سووڕما، بەبێزارییەوە، وەکو یەکێک باوەڕ بە گوێی خۆی نەکات، گوتی:

- پایپ دەکێشیت؟ پایپ؟ نەخێر، بۆت نییە لێرە پایپ بکێشیت، باشە تۆ تەریق نابیتەوە. هم... سەیرە!

- ببورە! من مەبەستم ئەوە نەبوو لەم ژوورەدا پایپ بکێشم. من بەشی خۆم دنیام دیتووە، ئەتەکێت و دابونەریتی کۆمەڵایەتی دەفامم. من دەمویست تۆ شوێنێکم پێ نیشان بدەیت و بچم لەوێندەر پایپ بکێشم. من بابایەکم جگەرەکێش، ئالوودەی بووم، سێ دانە سەعاتە پایپم نەکێشاوە. بەهەرحاڵ کەیفی تۆیە. هەڵبەتە ئەو پەندەت بیستووە کە چوویتە شاری کوێران دەبێ دەست بگریتە چاوانتەوە...

کابرای خزمەتکار، لە بن لێوانەوە کەوتە پرتاندن:

- باشە من چۆن کەسێکی وەکو ئەمە بکەمە ژوورەوە؟ چۆن بە جەنەراڵ بڵێم کەسێکی واهی هاتووە؟ یەکەم ئێرە شوێنی تۆ نییە، پێویستە لە هۆڵەکەدا چاوەڕوان بکەیت، چونکە تۆ بابایەکی موراجیعی، یانی وەکو میوان وایت. ئاخر من مەسئوول دەبم، لەسەر تۆ سەرزەنشت دەکرێم..

کابرای خزمەتکار بەنیگەرانییەوە، سەیرێکی بوخچەکەی میرزادەی کرد و

لە سەری ڕۆیشت: "خۆ بەتەمانیت لێرە بمێنیتەوە و لەگەڵ ئێمەدا دانیشیت؟
میر گوتی:
- نەخێر، نیازی شتی وام نییە. ئەگەر داواشم لێ بکرێت، لێرە نامێنمەوە. من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم تەعاروف دەگەڵ جەنەراڵدا بکەم، هیچ نیاز و مەبەستێکی دیکەم نییە.
کابرای خزمەتکار، حایر و سەرسام، بەوپەڕی گومانەوە هاواری کرد: چی؟ تەعاروف؟ ئەدی بۆچی بە منت گوت بۆ کارێکی تایبەتی هاتوویت؟
- نا، کار نا... مەبەستم.. ئەگەر حەز دەکەی ناوی بنە کار، یان تۆ بڵێ بۆ ڕاوێژێک هاتووم، بەڵام هاتنەکەم لە بنەڕەتدا بۆ ئەوەیە خۆمی پێ بناسێنم، چونکە من یەکێکم لە میرانی میشکین، خا جەنەراڵ (یەپانچین)یش دوا مێوینەی بنەماڵەی میرانی (میشکین)ـە. جگە لە من و ئەو، هیچ کەسێک لەوماڵبات و بنەماڵەیە نەماوە.
کابرای خزمەتکار کە نیمچە هەراسان، هەراسان بووبوو، هاواری کرد:
- یانی بەم قسەیە ئێوە خزمن؟
- خـزم؟ خزمایەتییەکی زۆر دوور، بەڵام ئەگەر مەسەلەکە زیاد ورد بکەینەوە و بە خۆمان بمانەوێ، دەشێت بە خزم بژمێردرێین، بەڵام ئەوەندە دوورین زۆر ئەستەمە بە خزم حەساو بکرێین. جارێکیان لە هەندەرانەوە نامەیەکم بۆ مەدام جەنەراڵ نارد، بەڵام وەڵامی بۆ نەناردمەوە. وێڕای ئەوەش هەستم کرد کە هەر کاتێ بۆ وڵات گەڕامەوە، پەیوەندیی دەگەڵدا بگرم. من بۆیە هەموو ئەم شتانەت بۆ دەگێڕمەوە، تا هیچ گومانێکت لەلا نەمێنێ، چونکە هەست دەکەم هێشتا هەر بەگومانیت و باوەڕم پێناکەی. تۆ تەنیا ئەوەندە بڵێ کە میرزادەمیشکین هاتووە و دەیەوێ بێتە ژوورەوە، ئیدی هەموو نیاز و مەبەستێکی دیدارەکەی من خۆ بە خۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەگەر قەبووڵیان کردم نوری عەلا نور، خۆ ئەگەر پێشوازییش نەکرام، قەیدی نییە، بەڵام پێم وا نییە داواکەم ڕەفز بکەنەوە، چونکە بێگومان مەدام جەنەراڵ، حەز دەکات، دوا پیاوی بنەماڵەکەیان ببینێ. وەکو بیستوومە، ڕێزی تایبەتی بۆ ئەسڵ و فەسڵ و ئابا و ئەژدادی خۆی هەیە.
قسەکانی میرزادە، ئەو پەڕی ڕاستگۆییان پێوە دیار بوو، چەند ڕاستگۆ

بوون، ئەوەندەش سادەبوون. وێڕای ئەوەش کابرای خزمەتکار. هەرچیی دەکرد و دەکۆشا، ئەقڵی ئەو قسانەی نەدەبڕی. ئەو گفتوگۆیە، گفتوگۆی نێوان دوو مرۆڤی ئاسایی بوو، گفتوگۆی نێوان موراجیعێک و خزمەتکارێک نەبوو. جا لەو پێوەدانگەوە کە خزمەتکاران زۆر لەوە زیرەکتر و بەهۆشترن کە ئاغاکانیان تەسەور دەکەن، یارۆی خزمەتکار دڵنیا بوو کە ئەم مەسەلەیە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان ئەم میرزادەیە، لەو نەدار و خوازەلۆکانەیە کە دێن بۆ ئەوەی کۆمەک و یارمەتییەک وەر بگرن، یان کەسێکی سا ئەقڵی، بێ شەخسیەتی بودەڵەیە، چونکە میرێکی ئەقڵمەندی بەشەخسیەت، نایەت لە پرسگەیەکی چکۆلەدا بوەستێ و باسی وەزع و حاڵی شەخسیی خۆی بۆ بابایەکی خزمەتکار بکات. بۆیە خۆ بە خۆ گەیشتە ئەم ئەنجامگیرییەی کە لە هەر دوو حاڵەتەکەدا مەسئول دەبێت و گلەیی دێتە سەر. بۆیە بەو پەڕی سووربوونەوە بە میرزادەی گوت:

– پێویستە بچێت لە هۆڵەکە، لە ژووری میوان و پێشوازی چاوەڕوان بکەیت.

میرزادە، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

– بزانە، ئەگەر لەوێندەر چاوەڕوانم کردبا، هەرگیز نەمدەتوانی ئەو هەموو شتەت بۆ باس بکەم. هەنگێ هەر خەیاڵت لە لای جلوبەرگ و بوخچەکەی من دەبوو، بۆیە لەوەیە ئێستا ئیدی پێویست بەوە نەکات چاوەڕوانی سکرتێر بکەیت. پێم وایە ئێستا بە خۆت دەتوانی جەنابی جەنەراڵ لە هاتنم ئاگادار بکەیت و بمکەیتە ژوورەوە.

– من ناتوانم، سەربەخۆ، میوان و موراجیعێکی وەکو تۆ بکەمە ژوورەوە. دەبێ ئەمە لە ڕێگەی سکرتێرەوە بکرێ، نەخاسما جەنەراڵ، تۆزێ لەمە پێش بە خۆی دەستوری دامێ کە تا کوڵۆنێل لە ژوورەوە بێ، بە هیچ جۆرێ، ڕێگەی هیچ کەسێک نەدەم بچێتە ژوورەوە. تەنیا گاڤریلا ئاردالیوفیچ* بۆی هەیە بەبێ ئیزن بێتە ژوورەوە.

– کێیە، فەرمانبەرە؟

– کێ؟ گاڤریلا ئاردالیونوفیچ؟ نەخێر، کارگەری کۆمپانیایە. گوێ بگرە، بێزەحمەت، بەلای کەمەوە بوخچەکەت لێرە دابنە.

- ئەوەی ڕاستی بێت بیرم لێ کردبووەوە. دەڵێی لە دڵی منداێت. جا کە وای لێ هات، ئەگەر ڕێم بدەیت حەز دەکەم پاڵتۆکەشم دابنەم، چ دەڵێی؟

- هەڵبەتە، ناتوانی بەم پاڵتۆیەوە بچیتە نک جەنەراڵ.

میرزادە، هەستا، بەپەلە پاڵتۆکەی داکەند. لەژێر پاڵتۆکەوە چاکەتێکی کۆنی، ڕێکوپێکی، خۆشدرومانی، ئەگەر چی هەندێ کاڵەوە بوو و شڕۆڵە بوو، لەبەر بوو. لەژێر چاکەتەکەوە ئێلەکێکی لەبەر بوو، کە زنجیرێکی کانزایی پێدا شۆڕ بووبووەوە و سەعاتێکی زیوی سویسری پێوە بوو.

یارۆی خزمەتکار، هەرچەندە میرزادەی بە کابرایەکی سائەقڵ دانابوو، لەو بۆچوونەی خۆی دڵنیا بوو، سەرەنجام گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە درێژەدان بە گفتوگۆ دەگەڵ ئەم موراجیعەدا لەوەی پتر کارێکی بەجێ نییە. کەچی وێڕای ئەوەش، بە خۆیشی نەیدەزانی، بۆچی میرزادەی چووبووە دڵەوە! بەڵام میرزادە بەئاشکرا پەست و بێتاقەتی کردبوو.

میرزادە، دووبارە لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتەوە و گوتی:

- باشە خات جەنەراڵ، کەی و لەکوێ پێشوازیی موراجیع و میوان دەکات؟

- ئەمە پەیوەندیی بە منەوە نییە، پەیوەستە بە جۆری میوانەکەوە. بۆ نموونە خەیاتەکەی، وەستای کڵاو و شەپقەکانی، سەعات یازدە دێت و دەچێتە ژوورەوە. خۆ گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ، بۆی هەیە لە پێش هەموو کەسێکدا بچێتە ژوورەوە، تەنانەت بۆی هەیە لە کاتی نانخواردنیشدا وەژوور بکەوێت.

میرزادە گوتی:

- ماڵانی ئێرە لە زستاندا لە ماڵانی وڵاتانی هەندەران گەرمترن. جەوی هەندەران گەرمترە لە جەوی ئێرە، بەڵام هیچ ڕووسییەک. لە بەر سەرما، ناتوانێ لە ماڵەکانیاندا هەڵبکات.

- چما زستانان ماڵەکانیان گەرم ناکەن؟

- با، گەرمی دەکەن! بەڵام خانووەکان بە شێوەیەکی دی دروست کراون، مەبەستم پەنجەرە و سۆپا و موغەیریەکانە.

- هم... باشە زۆر لەوێندەر مایتەوە؟

- چوار ساڵ، مەبەستم ئەوەیە کە بە درێژایی ئەو چوارساڵە تەقریبەن لە یەک شوێن، لە گوند، مامەوە.

- هەڵبەتە ژیانی وڵاتی خۆمانت لەبیر چووەتەوە، نا؟
- دروستە. باوەڕ دەکەی؟ هەندێ جار سەرم سووڕ دەمێنێ کە زمانی ڕووسیم بە تەواوەتی بیر نەچووەتەوە. من هەنوکە کە قسان دەگەڵ تۆ دەکەم لە دڵی خۆدا دەڵێم: "هەر باشە زمانەکەم زۆر تێک نەچووە". ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ کە بەم ڕادەیە سوێرە قسەم. لە دوێنێوە، خوا خوامە شەو و ڕۆژ هەر بە ڕووسی قسە بکەم!
- هم... تۆ پێم بڵێ: جاران لە پترسبۆرگ دادەنیشتی؟
خزمەتکارەکە، وێڕای ئەوەی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە کۆنترۆڵی خۆی ڕابگرێت و قسان نەکات، بەڵام هەرچیی دەکرد و دەکۆشا نەیدەتوانی لەم شوێنە ناسکەدا شیرازەی گفتوگۆیەکە بپچڕێت.
میرزادە وەڵامی دایەوە:
- پترسبۆرگ؟ نەخێر... قەت لەوێندەر ئاکنجی نەبووم.. هەر پێیدا تێ پەڕیوم. من ئەوساش هیچم دەربارەی ئێرە نەدەزانی، چ جای ئێستا، دنیا زۆر گۆڕاوە، تەنانەت ئەوانەی کە شتیانش زانیوە، هەنوکە ناچارن هەموو شتێکی تازە فێرببن. بۆ نموونە ئەو دادگا تازانەی کە لەم ڕۆژانەدا زۆر باس دەکرێن*
- هم... دادگا... بەڵێ، بێگومان، تۆ پێم بڵێ: ئایا دادگاکانی ئەوێندەر، مەبەستم هەندەرانە، لە دادگاکانی ئێرە دادپەروەرترن؟
- نازانم. زۆرم ستاییش لەمەڕ دادگاکانی خۆمان بیستووە. بۆ نموونە سزای ئیعدام لابراوە*.
- ئەدی لەوێندەر، خەڵکی ئیعدام دەکرێن؟
- بەڵێ، جارێکیان لەوێ، لە فەرەنسا، لە شاری لیون*، حاڵەتێکی ئیعدامم بینی. شنایدەر دەگەڵ خۆیدا بردمی.
- لە سێدارە دەدرێ؟
- نەخێر... لە فەرەنسا لە ملی دەدەن.
- ئەدی ئیعدام کراوەکان هاوار دەکەن؟
- هاوار؟ لەکوێ فریا دەکەوێ، لە چاوتروکانێکا تەواو دەبێ. کابرای مەحکوم بە دەما پاڵ دەخەن. ئامێرێکی تایبەتیان هەیە پێی دەڵێن گیوتین

(مقصله)، ئەم ئامێرە کێردێکی زۆر قورس و تیژی پێوەیە، زۆر بە توندی و خێرایی لە بەرزییەوە دێتە خوارێ و لە چاوتروکانێکا ملی یارۆی مەحکوم دەپەڕێنێ و سەری لە لاشە جوێ دەکاتەوە. هەڵبەتە ئامادەکاری و زەمینەسازیی ئیعدامکردنەکە زۆر ناخۆشە، کاتێ قەراری حوکمەکە دەخوێننەوە، تاوانبارەکە ئامادە دەکەن، جلی تایبەتی لەبەر دەکەن، دەست و لاقی دەبەستنەوە، سەری دەخەنە سەر سەکۆیەکە — دیمەنە ترسناکە کە لێرەدایە - تەماشاڤانان کۆ دەبنەوە، تەنانەت ژنانیش، هەرچەندە دامودەزگا فەرمییەکان حەز ناکەن ژنان ئەو دیمەنە ترسناکە بدینن، لەوێندەر خڕ دەبنەوە

- هەقی خۆیەتی، چونکە ئەوە شوێنی ژنان نییە.

- بەڵێ، بەڵێ! ئاخر چۆن دەبێ ئەو ئەشکەنجەیە بدینن؟ جا یارۆی مەحکووم، لەو ڕۆژەدا، پیاوێک بوو، پێدەچوو کەم و زۆر نەترسێت، پیاوێک بوو زیرەک و بەهۆش، تۆکمە و بتەو، گەنجێکی شلکی چکۆلە نەبوو، بەڵکو پیاوێکی تەواو بوو، نێوی لیگرۆسی بوو. کەچی وێڕای ئەوەش، نازانم باوەڕ دەکەی یان نا، بەدڵنیاییەوە دەیڵێم کاتێ سەر کەوتە سەر سەکۆیەکە هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت. دەموچاوی بووبوو بە زەعفەرانی زەرد، ئایا شتی وا دەبێ؟ ئەمە ترسناک نییە؟ ئایا دەشێت پیاو لە ترسا بگری؟ هەرگیز باوەڕم نەدەکرد، پیاوێکی گەورە و تەواو — نەک منداڵێک، بەڵکو پیاوێکی چل و پێنج ساڵان، کە لە ژیانیا نەگریابێ، دەشێت لە ترسا بەو ئاوایە بگری! پیاو دەبێ لەو ساتەدا، لە ڕووی دەروونییەوە چیی بەسەردا بێت؟ دەبێ چ ئاشوبێک وای لێ کردبێ بەو جۆرە بگری؟ هەڵبەتە ئەمە سووکایەتییە بە دڵ و دەروون، خراپەیە دەرهەق بە ڕۆح. هەرچەند گوتراوە: "قەتڵ مەکە"، کەچی دێن، کەسێک لەسەر قەتڵ دەکوژنەوە، نازانم ئەمە چەندی بە چەندە؟ نا، نابێ شتی وا قەبووڵ بکرێت! ئەمە کارێکی نامرۆڤانییە! مانگێک پترە ئەو دیمەنەم دیتووە، کەچی هێشتا هەر لە بەرچاومە، بەلای کەمەوە شەش جاران هاتووەتە خەونم.

میرزادە، بەدەم ئەم قسانەوە، گەرم و گەرمتر دەبوو، ڕەنگە زەردەکەی، کەمێک سوور هەڵدەگەڕا، بەڵام سەدا و دەنگی هەر وەکو جاران هێدی و ئارام بوو. کابرای خزمەتکار بە دڵ و بە گیان، بە میهر و دلۆڤانییەوە گوێی

لێ دەگرت و لە تۆ وایە ناتوانێ دەستبەرداری ئەو چیرۆکە بێت. لەوە دەچوو ئەویش ئەهلی خەیاڵ بێ.

یارۆی خزمەتکار گوتی:

- خۆشبەختانە، هەر نەبێ، لە ملدان ئازاری کەمترە.

میرزادە، بە گەرم و گوڕی دەستی بە قسان کردەوە:

- ئەمە تەسەوری تۆیە، تەسەورێکی جوانە، هەموو کەسێک ئەم تەسەورەی لەلایە، ڕێک وەکو تۆ. جا ئەم ئامێرە -گیوتین- بۆ ئەم مەبەستە داهێنراوە، بەڵام من ئەو ڕۆژە بیرۆکەیەکی دیکەم بە خەیاڵدا هات، لە خۆم دەپرسی: "تۆ بڵێی ئەمە خراتر نەبێت؟" ڕەنگە گاڵتەت بەم بیرۆکەیەی من بێت، بەلاتەوە سەیروسەمەرە بێت، بەڵام دەشێت ئەم بیرۆکەیە، بە خەیاڵی هەر مرۆڤێکدا بێت، ئەگەر تۆزێک جڵە و بۆ خەیاڵی خۆی شل بکات. تۆ بیر لە شتەکە بکەوە: با بۆ نموونە بێینە سەر مەسەلەی ئەشکەنجە. ژان و زام و ئازاری بەدەنی، عەزابی دەروونی لە بیر دەباتەوە، یانی پیاو تا دەمی مەرگ، تەنیا بەدەم ئازاری زامانەوە دەتلێتەوە، بەڵام ئازاری سەرەکی، ئەو ژان و ئازارەی کە لە هەموو ئازار و عەزابێک بەسوێترە، ئازار و عەزابی زامان نییە، بەڵکو ئەو عەزابە ڕوحی و دەروونییەیە کە پیاو دڵنیایە دوای سەعاتێک، دوای دە دەقیقەی دی پاشان دوای نیو دەقیقە و ئەوجا ئا ئێستا و یەکسەر ڕوحی لە بەدەنی جیا دەبێتەوە و دەفڕێت، دوای ئەو ساتە فڕی بە تیرەی بەشەرەوە نامێنێ، ئەمە شتێکی بەڵگەنەویستە، هیچ گومانێکی تیا نییە، کاتێ پیاو هەست دەکات گیوتینێکی تیژی تیژ بە دیار سەریەوەیە، گوێی لە داهاتنەوەی گیوتینەکە دەبێت، پیاو لەو دەمەدا، لەو دوا چارەکەدا، هەست بە ترسێکی گەورە دەکات. دەزانی ئەمەی من دەیڵێم زادەی خەیاڵی ڕووت نییە؟ زۆر کەس باسیان کردووە. من قەناعەتی تەواوم پێی هەیە، بۆیە بەڕاشکاوی، ڕای خۆمت، لە بارەیەوە پێ دەڵێم: کوشتنەوەی کەسێک لەسەر ئەوەی تاوانی قەتڵی ئەنجام داوە، زۆر تاوانترە لە خودی تاوانەکە. قەتڵی قەزایی، قەتڵی قەساس، زۆر تاوانترە لە قەتڵی جینایی. ئەو مرۆڤەی چەتە و ڕێگران، یان پیاوکوژان لە ڕێگەوبانان، یان لە بێشەیەکدا ڕێی پێدەگرن و دەیکوژن، تا دوا دەمی ژیان هەر بە ئومێدی ڕزگاربوونە، ئومێد بڕ نابێت، دەگێڕنەوە دەڵێن

خەڵکی وا هەبوون، لەو دەمەدا کە کێردیان لە ملیان ناوە و ویستوویانە سەریان ببڕن، هەر بەتەمای ڕزگاربوونە و هەوڵیان داوە هەڵێن، یان پاڕاونەتەوە کە بیانبەخشن. یانی هیوا بڕاو نەبوون، بەڵام لە حاڵەتی ئیعدامدا، هیچ هیوا و ئومێدێک نامێنێ، کە هەڵبەتە مردن بەدەم هیوا و ئومێدەوە زۆر ئاسانترە لە مردن بەبێ ئومێدی. ئیدی قەراری دادگا، قەفەزی پۆڵایینە، کەمترین ئومێدی ڕزگاری نییە، دوا تروسکەی ژیان لەوێدا دەکوژێتەوە، ئیدی هیچ عەزابێک، لە جیهاندا هاوتای ئەم عەزابە ناکاتەوە، ئەگەر سەربازێک ببەیتە ناوجەرگەی شەڕەوە، بیخەیە بەر سێرەی تۆپان، پاشان تۆپباران و گوللەبارانی بکەی، هێشتا هەر ئومێدێکی بە ڕزگاری هەیە. تا دوا دەمی ژیان بەو ئومێدەوە دەژی، بەڵام ئەگەر قەراری مەرگی ئەسەح و بێ چەندوچوون بۆ هەمان سەرباز بخوێنیتەوە، هەنگێ یان ئەقڵی لەدەست دەدات، یان لە سەلای گریان دەدات و کوڵی گریانی لە جۆش ناکەوێت. ئاخر کێ دەڵێت تەبیعەتی بەشەر دەتوانێ بەرگەی ئەم عەزابە بگرێ و شێت نەبێت؟ ئاخر ئەم گەمە سەخیفە، ئەم ڕێتمە نەنگین و نەزۆکە چییە و چ سوودێکی هەیە؟ لەوەیە یەکێک لەم دنیایەدا هەبێت کە حوکمی ئیعدامەکەیان خوێندبێتەوە و تاڵاوی ئەو عەزابە سامناکەیان پێ چەشتبێ و پاشان پێیان گوتبێ: 'بڕۆ، عەفوو کرایت!' * مەگەر هەر ئەو کەسە بتوانێت باسی ئەوەتان بۆ بکات کە هەستی بە چ عەزابێک کردووە، چ هەستێکی لا دروست بووە، مەسیح بە خۆیشی باسی ئەم جۆرە عەزابەی کردووە، باسی ئەم ترسەی کردووە! نا، هەرگیز نابێ ئەم جۆرە مامەڵەیە دەگەڵ هیچ بنیادەمێکدا بکرێت!.

یارۆی پێشخزمەت (خزمەتکار) ئەگەرچی نەیتوانیبوو بە باشی لە هەموو قسەکانی میرزادە بگات و وەکو ئەو گوزارشتی لێ بکات، بەڵام بە سیمایا دیار بوو کە لە جەوهەر و نێوەڕۆکی قسەکانی گەیشتووە. بۆیە بە تۆنێکی بەزەیی و میهرئامێزەوە بە میرزادەی گوت:

- ئەگەر زۆر حەز دەکەی پایپ بکێشیت، دەتوانی بچی بیکێشیت، بەڵام دەبێ لەزێ بکەی، چونکە لەوەیە لەو کاتەدا کە تۆ لە دەرەوەی نۆرەی چوونەژوورەوەت بێ، هەنگێ من چ بکەم! گوێ بگرە: ئا لەوێندەر، لەژێر ئەو قاڵدرمەیەدا، دەرگایەک هەیە، دەیبینی؟ ئەوە دەرگایە بکەوە، بە دەستە ڕاستا،

ژوورێکی چکۆلە هەیە، دەتوانی لەو ژوورەدا پاپیەکەت بکێشیت، بەڵام لە بیرت نەچێ کەمێ پەنجەرەکە بکەرەوە، چونکە جگەرەکێشان لەوێ قەدەغەیە...

بەڵام میرزادە، فریا نەکەوت بچێ بۆ ژوورە چکۆلەکە، گەنجێک کە دەستەیەک کاغەزی بە دەستەوە بوو، لەناکاو خۆی بە ژوورا کرد، یارۆی پێشخزمەت خێرا چووە پێشوازی تا یارمەتیی بدات کە پاڵتۆکەی دابکەنێت. گەنجەکە بە گۆشەی چاو نیگایەکی گوماناویی میرزادەی کرد.

کابرای خزمەتکار، بە ڕێزەوە و بە شێوازێکی خۆمانی وەکو یەکێک نهێنییەک بدرکێنێ گوتی:

– گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، ئەم بەڕێزە دەڵێت ناوی میر میشکینە، گوایە خزمی خا جەنەراڵە. لە هەندەرانەوە هاتووەتەوە و تازە بە خۆی و ئەم بوخچەیەوە لە قیتار دابەزیوە، بەڵام...

میرزادە، نەیتوانی پاشماوەی قسەکانی بژنەوێ، چونکە خزمەتکارەکە دەنگی تەواو نزم کرد. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بە دیقەت گوێی دەگرت و بە کونجکاوی دەیڕوانییە میرزادە میشکین، ئەنجام وازی لە گوێگرتن هێنا، بەلەز لە میرزادە نزیک بووەوە و بەوپەڕی ئەدەب و نەزاکەتەوە پرسی:

– تۆ میرزادە میشکینی؟

کوڕێکی زۆر جوان و قۆز بوو، تەمەنی نزیکەی بیست و هەشت ساڵێک دەبوو، باریکەلەیەکی مووزەردی، باڵابەرزتر لە مامناوەندی بوو. ڕدێنێکی زۆر چکۆلەی وەکو ڕدێنەکەی ناپلیۆنی سێیەمی دانابوو، زیرەکی و هۆشمەندی و جوانی لە سیمای دەباری، جارجار ناسکە بزەیەکی دڵپەسند، درزێکی دەکردە لێوی و ڕیزێ ددانی سفتی زۆر سپی مرواری ئاسایی دەنواند. نیگای، بە هەموو گەشی و ڕاستگۆییەکیەوە، بە هەموو بێگەردییەکیەوە، یەجگار کونجکاو و بەدیقەت بوو.

"باوەڕ ناکەم ئەم گەنجە، کە دەگەڵ خۆیدا تاک دەکەوێتەوە، هەمان نیگا و نۆڕینی هەبێت، ڕەنگە کە بە تەنیا دەبێت هەرگیز پێ نەکەنێ."

ئەوە هەستی میرزادە بوو بەرانبەر بەو گەنجە.

میشکین، بەلەز، هەر هەموو ئەو شتانەی دووبارە کردەوە کە بۆ خزمەتکارەکە و پێشتریش بۆ ڕوگوژینی باس کردبوو. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ،

لەو ماوەیەدا، لە کەسێک دەچوو چینە لە یادەوەرییەکانی خۆی بکات. ئەوجا پرسیی:

- باشە تۆ ئەو کەسەنیت کە نزیکەی ساڵێک یان کەمتر، پێش ئێستا، وا بزانم لە سویسراوە نامەیەکت بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا (خانم یەپانچین) نووسیبوو؟.

- بەڵێ، وایە.

- کەواتە تۆ لێرە ناسراویت، بێگومان تۆیان لەبیرە و بیریان دەکەویتەوە. دەتەوێ عالی جەناب بدینی؟ هەر ئێستا ئاگاداری دەکەم. دوای تۆزێکی دی دەستی بەتاڵ دەبێ، بەڵام دەبوایە... هەق وا بوو لە هۆڵی میواندا بوایەی. ئەوسا، بە تۆنێکی جیددی لە خزمەتکارەکەی پرسی:

- بەڕێزیان بۆچی لێرەیە؟

- قوربان، بە خۆی وای پێ خۆش بوو!

لەو کاتەدا، لەناکاو دەرگای نووسینگەکە کرایەوە، ئەفسەرێکی سوپایی، کە فایلێکی ئەوراقی بە بن هەنگڵەوە بوو، وەدەر کەوت و بە دەنگی بەرز خوداحافیزیی کرد.

دەنگێک لەو سەری نووسینگەکەوە گازی کرد:

- گانیا*، ئەوە تۆ لێرەی؟ کەواتە وەرە...

گاڤریلا ئاردالیوفیچ، بەئاستەم سەرێکی بۆ میرزادە دانەواند و بەپەلە خۆی بە نووسینگەکەدا (ژووری کار) کرد. دوای دوو دەقیقەیەک، دیسان دەرگا کرایەوە، دەنگی ئاشنای گاڤریلا ئاردالیوفیچ هاتە گوێ، گوتی:

- میرزادە، فەرموو وەرە ژوورەوە!

پەراوێز:

* - "خولامێکی ئەمین و وەفادار، نەک دەڵەچەیەکی...": جەنەراڵ ئاراکتشییف کە پتروسی یەکەم، لە ساڵی ١٧٨٩دا نازناوی بارۆنی پێ بەخشیبوو، ئەو پرەنسیپەی کردبوو بە دروشمی خۆی.

* - "جەنابی کۆنت" ئەم کۆنتەی کە نووسەر ناوی نابات و پاشتریش باس

دەکرێت، ڕەنگە سەرۆکی جەنەراڵ یەپانچین بێ.

* - "ئاردالیوفیچ" ئەمە ناوە میللییەکەی بابا "ئاردالیونوفیچ"ـە. خوێنەر دەبینێ کە ناوی ئەم کاراکتەرەی ڕۆمانەکە، جارێ بە ئاردالیوفیچ و جارێ بە ئاردالیونوفیچ دێت.

* - "ئەو دادگا تازانەی کە لەم ڕۆژانەدا زۆر باس دەکرێن..." کە ڕیفۆرمی ٢٠/ نۆڤەمبەر/١٨٦١ ڕاگەیەنرا، ئیدی کۆبوونەوە و دانیشتنی دادگاکانی ڕووسیا بوون بە کۆبوونەوە و دانیشتنی ئاشکراو عەلەنی، سیستمی سوێندەران لە هەموو مەسەلە جینایەکاندا بەکار دەهێنرا. دۆستویفسکی زۆری بایەخ بەم دادگا تازانە دەدا.

* - "بۆ نموونە سزای ئیعدام لا برا..." لە ڕاستیدا ئیمپراتۆرە ئیلیزابت، سزای ئیعدامی لە هەموو مەسەلەکانی مافی گشتیدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ساڵی ١٧٤١دا هەڵوەشاندەوە و لە ساڵی ١٧٥٤دا ڕاستەوخۆ و بەپێی قانوون و بەفەرمی هەڵی وەشاندەوە، بەڵام سزای ئیعدام لە بواری تاوانی سیاسیدا هەڵنەوەشایەوە. بۆ نموونە لە ١٨٦٦/٩/٦ دا کاراکوزوف لەسێدارە درا، چونکە لە هەوڵێکی ناکامدا ویستبووی ئەلکساندەری دووەم لە "باخی هاوین"دا تیرۆر بکات. ئەم پیاوە بەئاشکرا و بە بەرچاوی خەڵکییەوە، لە مەیدانی سمولنسکی، لە شاری پترسبۆرگ هاتە ئیعدامکردن. بۆیە ئەوەی دۆستۆیفسکی لێرەدا وەکو نموونە هێناویەتییەوە، هەموو حەقیقەت نییە.

* - "بەڵێ، جارێکیان لەوێ، لە فەرەنسا، لە شاری لیون حاڵەتێکی ئیعدامم بینی." ئیعدامی تاوانباران لە فەرەنسا هەم زۆر بوو و هەم بەئاشکرا بوو. ئەم سیستمە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەش بەردەوام بوو. تورگینیف لە وتارێکیا بە ناونیشانی "ئەشکەنجەی تروبمان" باسی یەکێک لەو ئیعدامانەی کردووە.

* - "لەوەیە یەکێک لەم دنیایەدا هەبێت کە حوکمی ئیعدامەکەیان خوێندبێتەوە و تاڵاوی ئەو عەزابە سامناکەیان پێ چەشتبێ..." دۆستویفسکی لێرەدا ئەو ساتە ترسناکانەی بیر دەکەوێتەوە کە بە خۆی جەڕباندبوونی بەر لەوەی قەراری عەفوەکەی بگات.

* - "گانیا": سووککراوەی گاڤریلایە.

## فەسڵی سێیەم

جەنەراڵ ئیڤان فیودوروفیچ یەپانچین، کە لە ناوەڕاستی ژووری کارەکەی خۆیدا (نووسینگە، ئۆفیس) ڕاوەستابوو، بەوپەڕی کونجکاوی دەیڕوانییە میرزادە کە خەریک بوو وەژوور دەکەوت، تەنانەت دوو هەنگاویش بەرەو پیری ڕۆیشت، میرزادە نزیک بووەوە و خۆی ناساند.

جەنەراڵ گوتی:

- زۆر چاکە، من دەتوانم چ خزمەتێکی تۆ بکەم!

میرزادە گوتی:

- حاڵی حازر هیچ کارێکی پێویستم نییە، مەبەستم لەم سەردانە تەنیا ئاشنایەتیی تۆ بوو. حەز ناکەم نارەحەتت بکەم، چونکە ئاگاداری کات و بەرنامەی کاری تۆ نیم، کە لە سویسراوە گەیشتمە ئێرە، یەکسەر لەوێستگەی قیتارەوە بۆ ئێرە هاتووم...

سووکە بزەیەکی تەوسامێز لێوی جەنەراڵی کشاند، بەڵام زوو فریا کەوت و قووتی دایەوە. ئەوسا لە فکران ڕاچوو، چاوەکانی بچووک کردنەوە و سەراپای میوانەکەی بە نیگا دابێژت، ئەوجا ئاماژەی بۆ کورسییەک کرد تا لە سەری دانیشێت. بە خۆیشی لە تەنیشتیەوە دانیشت و بە جۆرە نیگەرانی و کەم حەوسەڵەیەکەوە ڕووی تێ کرد. لەم کاتەدا

گانیا، لەپشت مێزێکی، سووچێکی ژوورەکە وەستابوو و چەند کاغەزێکی دەر دێنا.

جەنەراڵ یەپانچین بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- بە شێوەیەکی گشتی ناپەرژمە سەر ئەوەی تەعاروف دەگەڵ خەڵکانی تازەدا بکەم، بەڵام سەبارەت بە تۆ کە هاتووی بۆ ئێرە، هەڵبەتە دەبێ مەبەستێکت هەبێ، من...

میرزادە، قسەکەی پێ بڕی:

- پێشوەختە هەستم دەکرد کە وا وێنا دەکەیت بە مەبەستێکی تایبەتی هاتووم بۆ لات، بەڵام باوەڕم پێ بکە، هیچ مەبەستێکی تایبەتیم نییە و تەنیا حەزم کرد سەرت لێ بدەم و بە ناسینت خۆشحاڵ بم.

- هەڵبەتە منیش خۆشحاڵم، بەڵام مەرج نییە هەمیشە خۆشحاڵی لەپێناوی خۆشحاڵیدا بێ، جاری وا هەیە کاریش دەکەوێتە ناو ناوانەوە... کاریش دێتە پێشی... من تا ئێستا نازانم چ شتێک ئێمە کۆ دەکاتەوە، پێکمانەوە دەبەستێ... مەبەستم ئەوەیە نازانم بۆچی بۆ لای من هاتوویت...

- هیچ شتێک و هیچ پەیوەندییەک... گومان لەوەدا نییە... خاڵی هاوبەشی نێوانمان زۆر کەمە... تەنانەت ئەگەر من میرزادە میشکین بم و هاوسەرەکەی تۆش لە هەمان بنەماڵە بێت، هەر ناکاتە بیانووی ئەوە کە... من ئەمە باش دەزانم. وێڕای ئەوەش تەنیا ئەنگێزەی هاتنی من بۆ ئێرە، وەکو گوتم ئەوە بووە. من چوار ساڵە لە ڕووسیانیم، کە سەفەرم کرد، لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواو نەبووم، ئەو کاتە هیچم دەربارەی ژیان نەدەزانی، ئێستاش شتێکی ئەوتۆی دەربارە نازانم. من پێویستم بە ناسینی خەڵکانی میهرەبان و دڵاوایە، بۆ نموونە، حاڵی حازر کێشەیەکم هەیە پێویستە چارەسەری بکەم، بەڵام نازانم لەکوێوە دەست پێ بکەم. کە گەیشتمە بەرلین لە دڵی خۆدا گوتم: "خۆ ئەوانە هەرچییەک بێ خزمی خۆمن، کەواتە لەوانەوە دەست پێ دەکەم، ڕەنگە سوودێک بە یەکتر بگەیەنین و بە تایبەتی کە خەڵکێکی میهرەبان و دڵاوان. هەڵبەتە بیستبووم کە تۆ پیاوێکی میهرەبان و دڵاواو جوامێریت."

جەنەراڵ، بە کەمێک سەرسامییەوە گوتی:

- سوپاس، دەکرێ بزانم لەکوێ لات داوە؟ لەکوێ ماڵت گرتووە؟

- تا ئێستا لە هیچ کوێ لام نەداوە و ماڵم نەگرتووە!

- کەواتە، یەکڕاست لەوێستگەی قیتارەوە بۆ لای من هاتووی، ها؟ بە کەلوپەلەکانتەوە هاتوویت؟

- هەموو کەلوپەلەکەم بریتییە لە بوخچەیەکی بچکۆلە و چەند پارچە جلێکی تیایە و هیچی تر، ئەویش دایمە بە دەستمەوەیە، لە ئێستاوە تا ئێواری دەرفەتی ئەوەم دەبێ کە ژوورێک لە ئوتێلێکدا بەکرێ بگرم.

- یانی نیازت وایە ژوورێک بەکرێ بگریت؟

- بەڵێ، ئەی چۆن.

- من وا لە قسەکانت حاڵی بووم کە بەتەمای لەلای من بمێنیتەوە.

- ئەگەر بە خۆت خوڵکت کردبام لەگین بوو، بەڵام حەز دەکەم ئەوەشت پێ بڵێم کە تەنانەت لەو حاڵەشدا هەر نەدەمامەوە، نەک لەبەر هۆیەکی تایبەتی، بەڵکو لەبەر ئەوەی تەبیعەتم شتی وا قەبووڵ ناکات.

- کەواتە زۆر باش بوو خوڵکم نەکردیت و خوڵکیشت ناکەم، جا جەنابی میرزادە، با قسەیەکی دیکەش بکەم، بۆ ئەوەی لە کورتی بیبڕینەوە، مادامێکی هەر دوو لا قاییلین کە هیچ خزمایەتییەکمان لەنێواندا نییە و پێویست بە باسکردنی شتی وەها نییە، هەرچەندە دەشیا شانازی بەو خزمایەتییەوە بکەم، ئیدی بەو پێودانگە...

- ئیدی بەو پێیە دەبێ هەر هەستم و بڕۆم.

میرزادە، بەدەم هەستانەوە، لە ناخی دڵەوە پێکەنی. هەرچەندە وەزعەکە مایەی نیگەرانی و پەریشانی بوو، لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

- جەنابی جەنەراڵ، دڵنیات دەکەم، من سەرباری ئەوەی شارەزای دابونەریتی ئێرە نیم و ئەزموونێکی زۆر کەمم لەو بارەیەوە هەیە، دەمزانی کە مەسەلەکە بەم جۆرە دەشکێتەوە. بە هەر حاڵ، ڕەنگە ئەمە باشتر بێت... تەنانەت وەڵامی نامەکەشم نەدرایەوە... زۆر چاکە... خودا حافیز... ببورە کە نارەحەتم کردیت.





نیگای میرزادە، لەو کاتەدا لوتفی لێ هەڵدەقولا، بزەکەی سەر لێوی پاک و بێگەرد، زەڕەیەک ڕقوکینەی پێوە دیار نەبوو، تەنانەت کەمترین ڕقوکینەی پەنهانیشی لە خۆ نەگرتبوو، جەنەراڵ بێدەنگ بوو، بە چاوێکی تازە کەوتە ڕوانینی میرزادە، زۆر گۆڕا، ئەو جەنەراڵەی تۆزێک لەمە پێش نەبوو. لە چاوتروکانێکا ئەم گۆڕانە کوتوپڕەی بەسەردا هات. جەنەراڵ ڕووی کردە میرزادە و بە شێوازێکی تەواو جیاواز گوتی:

– گوێ بگرە میرزادە: ئەوەی ڕاستی بێت من تۆ ناناسم، بەڵام لەگینە هاوسەرەکەم حەز بکات کەسێک ببینێ کە هەمان شۆرەت و ناوی خانەوادەیی ئەوی هەیە، ئەگەر کاتت هەیە و حەز دەکەی، لێرە بمێنە و چاوەڕوان بکە.

میرزادە، یەکسەر کڵاوە خڕە لبادەکەی لەسەر مێزەکە دانا و گوتی:

– ئۆ! وەختم یەجگار زۆرە! هیچ کارێکم نییە! بەتاڵی بەتاڵم! ئەوەی ڕاستی بێت لە دڵی خۆدا بەتەما بووم کە هاوسەرەکەی تۆ، لیزاڤینا پروکوفیڤنا، ئەو نامەیەی بیر بکەوێتەوە کە من بۆم ناردبوو. تۆزێ لەمە پێش، کە لە پرسگەکە چاوەڕوانم دەکرد، وام هەست کرد کە خزمەتکارەکەت وا تەسەور دەکات من بۆکۆمەک و باربوو هاتووم بۆ ئێرە. زۆر بەزەقی ئەوەی پێوە دیار بوو. پێدەچێت دەستوورەکانت لەو بارەیەوە زۆر توند بێ، جا دڵنیات دەکەم کە من بەو نیازە نەهاتووم، تەنیا بۆ تەعاروف هاتووم، بەڵام هەست دەکەم نارەحەتم کردوویت، زۆر بەداخەوەم، داوای بوردن دەکەم.

جەنەراڵ بزەیەکی خۆشحاڵی بۆ کرد و گوتی:

– زۆر چاکە میرزادە، ئەگەر زاهیر و باتینت بە ڕاستی یەک بێت، ڕەنگە تەعاروفەکەمان خێری پێوە بێت، بەڵام وەکو دەبینی من کەسێکی سەرقاڵ و مژوول و کۆمەڵێک کاغەز و مامەڵەم لە بەردەستدایە دەبێ تاوتوێیان بکەم، ئیمزایان بکەم و دوای دیداری جەنابی کۆنت، بڕۆم بۆ ئۆفیسەکەم. بۆیە وەکو دەبینی وێڕای ئەوەی بە دیتنی خەڵکانی بەڕێز و حورمەت خۆشحاڵ دەبم... یانی... من... هەرچەند دڵنیام کە تۆ پیاوێکی ڕەسەن و

ئەسلزادەیت و دەبێ... ئەرێ بە ڕاست میرزادە تەمەنت چەندە؟

- بیست و شەش ساڵ.

- بە ڕاست؟ وام وێنا دەکرد زۆر بچووکتر بیت.

- بەڵێ، زۆر کەس وام پێ دەڵێن. دەڵێن لە تەمەنی خۆت بچووکتر دەنوێنی. سەبارەت بە ناڕەحەتکردنی تۆ، هەوڵ دەمەم ناڕەحەتت نەکەم، چونکە بە تەبیعەت حەز ناکەم کەس ناڕەحەت بکەم... پێم وایە ئێمە لە ڕواڵەتا زۆر لێکدی جیاوازین... لەبەر زۆر هۆ، خاڵی هاوبەشی زۆرمان لەنێواندا نییە، هەرچەندە من لەلای خۆمەوە زۆر باوەڕم بەو بۆچوونە نییە، چونکە زۆر جار لە ڕواڵەتدا خاڵی هاوبەش نابینرێ، بەڵام لە حەقیقەت و جەوهەردا خاڵی هاوبەش هەن... خەڵکی لە تەمەڵی خۆیاندا، بڕیار لەسەر ڕواڵەت دەدەن و بەگوێرەی ڕواڵەت خەڵکی پۆلێن دەکەن و ناتوانن حەقیقەتی خەڵکی بدۆزنەوە. دەترسم ناڕەحەتت بکەم، خۆ ناڕەحەتم نەکردوویت؟ پێدەچێ کە تۆ...

- باشە شتێکی دیکە: تۆ هیچ سەرچاوەیەکی شەخسیی بژێویت هەیە، یانی پارەیە، سەروەتێ، سامانێ شک دەبەیت؟ بە نیازیت کارێک بۆ خۆ پەیدا بکەیت؟ بمبورە کە ئەم پرسیارە کاڵوکرچانەت لێ دەکەم...

- گوێ مەدەیە، پێم ناخۆش نییە... من لە مەبەستت دەگەم، بە پێچەوانەوە سوپاست دەکەم. حاڵی حازر نە هیچ سەروەت و سامان و دەستمایەیەکم هەیە، نە هیچ کار و کاسبییەک، هەڵبەتە پێویستیشم پێی دەبێت. ئەو پارەیەی کە تا ئێستا هەمبووە، خەڵکی داویانمەتێ. شنایدەر، ئەو مامۆستایەی کە لە سویسرا دەرسی پێ دەگوتمەوە و مالیجەی دەکردم، پارەی دامێ، منیش تەنیا بەشی ئەوەندەی بمگەیەنێتە ئێرە، بەشی سەفەرەکەمم لێ هەڵگرت، جا ئێستا تەنیا چەند کۆپیکێکم پێ ماوە، شتێکم لە خەیاڵدایە دەبێ پەیگیری بکەم و پێویستم بە ڕاوێژ و تەگبیرە، بەڵام...

جەنەراڵ قسەکەی پێ بڕی و پرسیی:

- باشە، حاڵی حازر بە چی دەژیت، بە ئومێدی چیت، پرۆژە و نەخشەکانت چین؟

- گەرەکمە کارێک پەیدا بکەم، بە هەر جۆرێ بووە کارێک بکەم.

- ئەها... بە ڕاستی تۆ فەیلەسووفیت. باشە هیچ توانا و بەهرەیەک لە خۆتا دەبینی؟ یانی ئەو توانا و بەهرەیەت هەیە کە نانی ڕۆژانەی خۆت دابین بکەیت؟ بمبورە کە ئەو قسەیە دەکەم...

- پێویست بە عوزرخوازی ناکات! پێم وا نییە ئەو توانا و بەهرەیەم هەبێت. بە پێچەوانەوە: من کابرایەکی نەخۆشم، خوێندنێکی ڕێکوپێک و بەردەوامم نەکردووە. سەبارەت بە دابین کردنی نانی ڕۆژانەش، پێم وایە..

جەنەراڵ، دیسان قسەکەی پێ بڕی و بە پرسیار دای گرتەوە. میرزادە، هەمان قەوانی وەکو خۆی، بۆ لێدایەوە. دەر کەوت کە جەنەراڵ ناوی ئاغای (باڤلیچوف)ی ڕەحمەتیی بیستبوو و تەنانەت بینیبووشی.

میرزادە نەیدەتوانی ئەوە ڕوون بکاتەوە کە بۆچی ئەو پیاوە بەڕێزە (باڤلیچوڤ) بە خەمی پەروەردە و فێرکردنی ئەوەوە بووە. تەنیا ئەوەندەی گوت کە لەگینە بە هۆی پەیوەندی و دۆستایەتییەوە دەگەڵ بابی ڕەحمەتی ئەودا بووبێ، جۆرە ڕێزێک بووبی بۆ ئەو دۆستایەتییە. میرزادە، هەر بە منداڵی هەتیو کەوتبوو و سەرەتاکانی تەمەنی لە گوندیدا بەسەر بردبوو، چونکە سیحەتی باش نەبوو و کەشوهەوایەکی کراوە و پاکی دەخواست. ئیدی باڤلیچوف بە هەندێ پیرێژنانی خزمی خۆی، کە لەسەر موڵکەکانی وی دەژیان، سپاردبوو.

لە هەوەڵەوە کارەکەرێکیان ڕاسپاردبوو کە بە خودان و پەروەردەی بکات. پاشان مامۆستایەکی تایبەتیان گرتبوو کە دەرسی پێ بڵێ و فێری خوێنەواریی بکات، میرزادە، گوتبووی هەرچەندە هەموو شتێکی بەڕوونی لە بیرە، بەڵام هەرچی دەکات ناتوانێ ئەو بیرەوەرییانە وەکو پێویست بگێڕێتەوە، چونکە -خۆی گوتەنی- ئەوسا، لەو سەردەمانەدا وەکو پێویست لە شتەکان حاڵی نەدەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە خووی لەگەڵدا بووە و زوو زوو فێی لێ هاتووە و ئەم نەخۆشییە بە ڕادەیەک شپرزەی کردووە کە گێل و ئەبلەی کردووە، جا ئەو حاڵی حازر کابرایەکی ئەبلەیە (میرزادە دەقاودەق و شەی ئەبلەی بەکار برد).

میرزادە، ئەنجام هاتە سەر باسی ئەوەی کە باڤلیچۆف، جارێک لە بەرلین، پرۆفیسۆری سویسریی شنایدەری، کە پسپۆری ئەم جۆرە نەخۆشیانە بوو، بینیبوو، شنایدەر لە دەڤەری والیس (Wallis)، لە سویسرا، نەخۆشخانەیەکی تایبەتی هەبوو، کە بە شێوازی تایبەتی چارەسەری ئەم جۆرە نەخۆشییانەی دەکرد، یانی ڕێگەی وەرزشی بەدەنی و دوشکردن بە ئاوی سارد و مالیجەی دەروونییەوە، ئەبلەهان و شێتانی مالیجە و دەرمان دەکرد، پاڤلیچوف، نزیکەی ساڵێک دەبێت کە میرزادەی بۆ لای شنایدەر ناردبوو، بەڵام بە خۆی سێ ساڵێک پاش ئەوە، لەناکاوا مردبوو، بێ ئەوەی هیچ وەسیەتێکی لە بارەی میشکینەوە کردبێت، بەڵام شنایدەر، میرزادەی لەلای خۆی گل دابووەوە و دوو ساڵی تریش مالیجە و دەرمانی کردبوو. هەرچەندە، بە تەواوەتی چاک نەبووبووەوە، بەڵام سوودێکی فرەی لە مالیجە و دەرمانەکانی شنایدەر بینیبوو. ئەوسا شنایدەر، لەسەر خواستی خودی میرزادە و بە هۆی دروستبوونی ڕەوش و ڕووداوێکی تازەوە، بڕیاری دابوو، کە بۆ زێدی خۆی، بۆ ڕووسیای بنێرێتەوە.

جەنەراڵ، کە تەواو حەپەسا بوو، پرسیی:

– یانی بەم پێیە لە ڕووسیادا کەست نییە؟ هیچ خزم و کەسێکت نییە؟

– تا ئێستا هیچ کەسێکم نییە، بەڵام ئومێدەوارم... نامەیەکیشم پێ گەیشتووە.

جەنەراڵ، بێ ئەوەی گوێی لە دوا ڕستەکەی و باسی نامەکە ببێ، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– خۆ بەلای کەمەوە دەبێ شتێک فێر بووبیت، کارێک، پیشەیەک فێر بووبیت... خۆ نەخۆشییەکەت ئەوە نییە کە نەتوانی هیچ کارێک بکەیت... هەڵبەتە مەبەستم کاری قورس نییە... بەڵکو سووکە کارێک لە دایەرەیەکدا، لە شوێنێکدا...

– هەڵبەتە نەخۆشییەکەم ڕێی ئەوەم لێ ناگرێت، سەبارەت بەوەزیفە و کاریش، خوا خوامە کارێکم دەست بکەوێ، چونکە بە خۆیشم حەز دەکەم

بزانم بە کەڵکی چ کارێک دێم و توانام بەسەر چ کارێکدا دەشکێ. من بە درێژایی ئەو چوار ساڵە زۆرم خوێندووە، بەڵام خوێندنەکەم ڕێکوپێک و بەردەوام نەبوو، چونکە مامۆستاکەم (شنایدەر) ناچار بوو میتۆدێکی تایبەتی لە فێرکردنما بەکار بێنێ، توانیم لەو ماوەیەدا زۆر کتێبی ڕووسی بخوێنمەوە.

- کتێبی ڕووسی؟ کەواتە دەبێ لەم زمانەدا زۆر شارەزا و کارامە بیت و بتوانیت بەبێ هەڵە بەم زمانە بنووسیت؟

- ئا... هەڵبەتە... ئەی چۆن...

- زۆر چاکە، ئەدی دەستخەتت چۆنە؟

- دەستخەتم زۆر باشە، دەتوانم بڵێم لەم ڕووەوە خودان بەهرەم، لێم نەبێ بە درۆ خۆشنووسێکم لەو گۆڕەی.

میرزادە، بە تاسەوە لەسەری ڕۆیشت:

- ڕاوەستە... ئێستا هەر بۆ تەجروبە شتێکت بۆ دەنووسم، بنووسم؟

- ئا! بنووسە! زۆرم پێ خۆشە. ئەو جۆشوخرۆشەتم زۆر بە دڵە. میرزادە، بە ڕاستی تۆ زۆر خوێنگەرم و ڕوحسووک و ڕەزاشیرینی.

- کە قەڵەم و ئامێرەکانت جوانن! ئەم قەڵەمانە، ئەم پەڕەمووچانە... لەم کاغەزە جوانە! چەند ئەستوورو جوانە! چ ئۆفیس و مێزێکی جوانت هەیە! تۆ گوێ بگرە: من ئەم دیمەنەم دیوە. تابلۆیەکی جوانە. دیمەنێکی سویسرایە. دڵنیام کە نیگارکێشەکە لە تەبیعەت و سروشتەوە وەری گرتووە، من دڵنیام کە ئەم شوێنەم دیتووە: لە دەڤەری (uri= یوری) نییە؟

- زۆر لەگینە وا بێ، دەشێت، هەرچەندە من تابلۆکەم لێرە کڕیوە. گانیا گیان، کاغەز بدە بە میرزادە. فەرموو ئەمەش پەڕەمووچ و کاغەز. بچۆ سەر ئەو مێزە بچووکە.

جەنەراڵ، ئاوڕێکی لای گانیای دایەوە، سەیری کرد وێنەیەکی فۆتۆگرافیی گەورە لە جانتاکەی دەر دێنێ و بۆ یەپانچینی درێژ دەکات، جەنەراڵ پرسیی:

- ئەمە چییە؟ بەهـ بەهــ..! ناستاسیا فیلیپوفنایە! وایە! بە خۆی ئەم

وێنەیەی بۆ ناردوویت؟

بە فزوڵیەت و کونجکاوییەکی زۆرەوە ئەو پرسیارەی کرد. گانیا، وەڵامی دایەوە:

- ئەم بەیانییە، کە بۆ پیرۆزبایی چووبووم بۆلای بە خۆی دایمێ. دەمێک بوو داوای وێنەیەکم لێ کردبوو. گانیا بەدەم بزەیەکی تاڵەوە لەسەری ڕۆیشت: نازانم تۆ بڵێی مەبەستی ئەوە نەبووبێ کە بە تەشەرەوە پێم بڵێ کە لە ڕۆژێکی ئاوادا بە دەستی بەتاڵ، بەبێ هیچ دەست و دیاری و سەوقاتییەک چووبووم بۆ لای؟

میرزادە، قسەکەی پێ بڕی و بە شێوەیەکی بنجبڕ گوتی:

- نا، نا، بە ڕاستی بیرکردنەوەیەکی سەیرت هەیە! ناستاسیا و تەشەر! حەیفت نەکرد! تۆ بە خۆت دەزانی کە ئەو ئافرەتێکی خۆپەرست نییە و چاوی لەو شتانە نییە. دەبێ دیاریی تۆ چ بێ؟ دیاریی ئەو جۆرە ژنانە هەزاران ڕۆبڵی تێدەچێ! ئەوپەڕی تۆش دەتتوانی وێنەیەکی خۆتی پێشکەش بکەیت، ئەرێ تا ئێستا داوای وێنەی لێبنەکردویت؟

- نەخێر، تا ئێستا داوای نەکردووە، ڕەنگە قەتیش داوای نەکات. ئەرێ ئیڤان فیودوروفیچ، ئاهەنگەکەی ئەم شەوت لە یادە، لە بیرت نەچووە؟ چونکە تۆ یەکێکی لە میوانانی شەرەف.

- هەڵبەتە لە بیرمە... بیرم نەچووە... بێگومان ئامادە دەبم.. ئاهەنگی لەدایکبوونیەتی، بیست و پێنجەمینساڵیادی لەدایکبوونیەتی... هەم، گانیا دەمەوێ نهێنییەکت پێ بڵێم، جا گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم: وەعدی بە ئاڤاناسی ئیڤانوفیچ و من داوە کە ئەمشەو، لە ماڵی خۆیدا، دوا قرێری خۆی بدات، بە بوون یان نەبوون. ئیدی ئەم حیسابە لەنک خۆت بگرە، لە بیرت نەچێت!

گانیا، کە گوێ لەو قسەیە بوو، تەواو پەشۆکا، ڕەنگی پەڕی و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

- ئەسەح قەولی وای داوە.

- پێرێ ئەو قەولەی دا. ئێمە بە دوو قۆڵی، ئەوەندەمان گوشار لێ کرد تا





ئەنجام چاری نەما و ملی دا یەخەت، بەڵام تکای لێ کردین، جارێ هیچ شتێک لەو بارەیەوە بە تۆ نەڵێین تا وەختی خۆی دێت.

جەنەراڵ، بەئانقەست نیگای برییە گانیا. بە ئاشکرا دیار بوو کە نیگەرانی و پەشێوییەکەی گانیای پێ ناخۆش بوو: گانیا بە پەشۆکاوی و دوو دڵی گوتی:

– ئیڤان فیودوروفیچ، جەنابت دەزانی، کە ئەو ئازادی بڕیاردانی تەواوی دابوو بە من، تا ئەو کاتەی بە خۆی دەگاتە قەناعەت و بڕیار دەدات. قەرار وا بوو لەو حاڵەشدا هەر دوا بڕیار و دوا قسە، بڕیار و قسەی من بێت.

جەنەراڵ، بەوپەڕی پەشێوی و شپرزەیی و نیگەرانییەوە گوتی:

– بۆچی، مەبەستت... یانی مەبەستت...

– نا، من هیچم نەگوتووە، هیچ مەبەستێکم نییە.

– تکایە، تۆ دەتەوێ چ بکەی، چۆن دەتوانی کاری وا بکەی؟

– من پاشگەز نەبوومەتەوە، ژێوان نیم. پێدەچێ نەمتوانی بێت، بە باشی مەبەستی خۆم دەر برم.

جەنەراڵ، بەتوڕەیی، بێ ئەوەی هەوڵ بدات، توڕەیی و پەستییەکەی خۆی وەشێرێت، گوتی:

– هەر لە ژێوانبوونەوە و ڕەفزمان کەم بووا نۆبەتی ئەو قەوانەیە! کاکە مەسەلەکە لەوەدا نەماوە کە بڵێین ژێوان مەبەوە، پاشگەز مەبەوە، بەڵکو دەبێ لەو کاتەدا کە ئەو بڕیار دەدات، دەبێ ئەوپەڕی شادمانی و خۆشحاڵی دەر ببڕی، زۆر منەتباری نیشان بدەیت. ئەدی دەنگ و باسی ماڵتان چییە؟

– دەنگوباسی ماڵمان؟ ئا، لە ماڵەوە هەموو شتێک بە دڵی خۆمە، بە خۆم هەمە کارەم. قسە، قسەی منە. باوکم دیارە ناڕازییە، بە تەواوەتی ناخۆشی کردووە. خۆی شێت کردووە، بۆ هیچ شتێک پرسی پێ ناکەم و قسەی دەگەڵ ناکەم. خۆ ئەگەر لەبەر دایکم نەبوایە، لە ماڵەکە دەرم دەکرد. هەڵبەتە دایکم بەردەوام دەگری و فرمێسک دەڕێژێ. خوشکەکەم لێم تۆراوە و بەعزی کردووە، بەڵام من بەئاشکرا پێم گوتوون کە هەر خۆم

بەرپرسی ژیانی خۆمم، من لە ماڵەوە هیچم ناوێ تەنیا ئەوە نەبێ کە گوێم لێ بگیرێت و قسەم لە عاردی نەدرێت. من ئەمەم لەبەر چاوی دایکم بە خوشکەکەم گوتووە.

جەنەراڵ، بە حەواس پەرتییەوە، دەستەکانی بڵاو کردنەوە و شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی:

– مـن تـا ئێستاش تێناگەم! . ئەو ڕۆژەت لە بیرە کە دایکت، نینا ئالکسندروڤنا هاتە دیدەنیم؟ کە داخ و زوخاوی هەڵدەڕشت و دەگریا، لێم پرسی: "چیتە" بۆم دەر کەوت کە خەمی ئەوەیەتی بەم کارە ئابڕووی خانەوادەکەیان دەچێت. دەشێت بپرسم چ ئابڕووچوونێک لەم کارەدا هەیە؟ ئاخر کێ دەتوانێ بچووکترین عەیبوعار لە ناستاسیا فیلیپوفنا بگرێت، یان خراپەیەکی بڵێت؟ هەر لەبەر ئەوەی پەیوەندیی دەگەڵ توتسکیدا هەبووە؟ ئەمە قسەی قۆڕە، بە تایبەتی کە لە زروفێکی تایبەتیدا بووە. بیرتە لێی پرسیم: "باشە تۆ ڕازیت تێکەڵی کچەکانت ببێت؟". ها! گوێت لێ بوو؟ ئەم نینا ئالکساندروفنایە سەیرە! هەرچەند مەسەلەکە ڕوون و ئاشکرایە، نازانم بۆ تێ ناگات... چونکە جەنەراڵ، نەیدەزانی چۆن لەسەر قسەکەی بەردەوام بێت، گانیا فریای کەوت و بەم ڕستەیە بۆی تەواو کرد:

– بۆچی سنووری خۆی نازانێ؟

ئەوسا لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

– با، باش دەیزانێ. لێی مەگرە! من ئەوسا تێم گەیاند کە نابێ خۆی لە کاروباری خەڵکانی دی هەڵقورتێنێ.

بەهەرحاڵ، وەزع و حاڵی ماڵمان هێشتا کەمێک ئارامە، چونکە هێشتا دوا قسە نەکراوە. هەڵبەتە کە دوا قسە کرا، هەنگێ ئیدی قیامەت ڕادەبێت. ئەگەر ئەمڕۆ دوا قسە بکرێت ئیدی هەموو شتێک لە گرێژەنە دەچێت.

میرزادە، کە لە سووچێکدا دانیشتبوو و سەرقاڵی خۆشنووسیی خۆی بوو، گوێی لە هەموو ئەم گفتوگۆیە بوو.

کە لە کارەکەی بووەوە، هەستا لە ئۆفیسەکە نزیک بووەوە و کاغەزەکەی خستە سەر مێزەکە. لەو کاتەدا کە بەوپەڕی تاسە و

کونجکاوییەوە دەیڕوانییە وێنەکە. لەبن لێوانەوە گوتی:

– ئەمە ناستاسیا فیلیپوفنایە؟

ئەوسا، بە شێوەیەکی گەرمتر لەسەری ڕۆیشت:

– بە ڕاستی جوانە!

وێنەکـە، سەروسـیمای ژنێکـی یـەجگار جـوانی، بێهاوتـای نیشـان دەدا. کراسێکی هاودامانی ئاوریشمی ڕەشی سادەی، بەدەن چەسپی لەبەر بوو. قژی خورمایی، بە شێوەیەکی زۆر جوان و سادە، ڕێک خرابوو. چاوەکانی ڕەش و مەنگ، جۆرە مەنگی و ڕامانێک بە تەوێڵیەوە دیار بوو، سیمای خەمین و پڕ غروور، دەموچاوی کەمێک لاواز و پێدەچوو هەندێ کاڵ بێت.

گانیا و جەنەراڵ، کە گوێیان لە میرزادە بوو، بەسەرسامی ئاوڕیان لێ دایەوە. جەنەراڵ پرسیی:

– چی؟ گوتت ناستاسیا فیلیپوفنا! یانی دەیناسیت؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

– بەڵێ، هەرچەندە من تەنیا بیست و چوار سەعاتە، بگرە کەمتریشە بۆ ڕووسیا گەڕاومەتەوە، بەڵام ئەو شاجوانە دەناسم.

ئەوسا بەلەز باسی ئەوەی کرد کە چۆن ڕوگوژینی دیتووە و ڕوگوژین، چیی لەو بارەیەوە گێڕاوەتەوە.

جەنەراڵ، پاش ئەوەی بەدیقەت گوێی لە میرزادە گرت، نیگایەکی پرسیارئامێزی گانیای کرد و بەنیگەرانییەوە گوتی:

– نۆبەتی ئەو قەوانەیە! ئەمە چییە!

گانیاش کە شپرزە بووبوو، لە بن لێوانەوە گوتی:

– هیچ نییە، سەرکێشییەکی گەنجانە بووە و هیچی تر! ئەمە کوڕە بازرگانێکی دەوڵەمەندی مەیخۆری بەدمەستە! پێشتر ئەم حیکایەتەم بیستووە.

جەنەراڵ گوتی:

– منیش بیستوومە. ئەوساکە، ناستاسیا فیلیپوڤنا بە خۆی، دوای مەسەلەی جووتە گوارەکە، هەموو چیرۆکەکەی بۆ گێڕاینەوە، بەڵام ئێستا

مەسەلەکە زۆر جیاوازترە. ڕەنگە مەسەلەی یەک ملێون ڕۆبڵ لە ئارادا بێ- ئەمە جگە لە ئەشق و شەیدایی شێتانە- یا با بڵێین هەوەسبازی ڕەوتەنی... ئێمە هەموو دەزانین کاتێ ئەم جۆرە خەڵکە پەت دەپچڕن و سەرخۆش دەبن چ چەپکە گوڵێ بە ئاودا دەدەن، کۆ لە هیچ کارێک ناکەنەوە.

جەنەراڵ، خەیاڵاوی لە فکران ڕاچوو و بەم جۆرە کۆتایی بە قسەکەی هێنا:

- هم... هیوادارم بەخێر بگەڕێ، ئاخری خێر بێ!...

گانیا، بەڕووگرژی، بزەیەکی تەوسامێزی بۆ کرد و گوتی:

- تۆ لە ملێون ڕۆبڵەکە دەترسیت؟

- هەڵبەتە تۆ ناترسیت.

گانیا لەناکاو ڕووی کردە میرزادە و پرسیی:

- میرزادە، تۆ هەستت بەچی کرد بەرانبەر بەو پیاوە؟ بە ڕای تۆ پیاوێکی جیدی بوو یان فشەکەرێکی فیشاڵباز بوو؟ ڕای تۆ چییە؟

گانیا، بەدەم ئەو پرسیارەوە، لە ناخی خۆیا، لە دەروونی خۆیا هەستی بە شتێکی سەیر و غەریب کرد، وەک بڵێی بیرۆکەیەکی تازە و دەگمەن لە هزر و بیریا هەڵهات و پرشنگی بێقەراری لە چاوەکانییەوە بەرز بووەوە. جەنەراڵیش، کە بەئاشکرا پەرێشانی و نیگەرانیی پێوە دیاربوو، بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێکی قەناعەتبەخش و جیددی بێ، ئاوڕی لە میرزادە دایەوە.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- نازانم چیت پێ بڵێم. بەهەرحاڵ من وام هاتە بەرچاو کە زۆر شپرزە و پەریشانە، لەڕادەبەدەر شەیدایە و تەنانەت ماخۆلانیەتی. بە یەکەم نیگا هەستت دەکرد نەخۆشە. لەو باوەڕەدام هەر کە بگاتەوە پترسبۆرگ، دوای چەند ڕۆژێک سیحەتی تێک بچێت و نەخۆش بکەوێت، بەتایبەتی ئەگەر دەست بە خواردنەوە بکات.

جەنەراڵ، هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی:

- ئاوا... یانی ئەمە هەست و بۆچوونی تۆ بوو؟

- بەڵێ، من وام دەبینی.

گانیا، بەدەم بزەیەکی تەوسامێزەوە، ڕوو لە جەنەراڵ گوتی:

- بەهەرحاڵ، ئەم جۆرە ڕیسک و سەرکێشییە، پێویستی بە چەند ڕۆژێک نییە تا بتەقێتەوە و دەنگ بداتەوە. ڕەنگە ئەمڕۆکە، نەگاتە شەوێ، بتەقێتەوە و دەنگ بداتەوە و ئاشکرا ببێت.

جەنەراڵ گوتی:

- هم... بەڵێ... لەگینە... بەڵام هەموو شتێک وەستاوەتە سەر ئەوەی، کە ناستاسیا فیلیپوفنا چ شتێکی بە خەیاڵدا بێت!

گانیا گوتی:

- تۆ بە خۆت چاک دەزانیت کە ناستاسیا فیلیپوفنا هەندێ جار دەبێ بە چ بە شەرێک!

جەنەراڵ، کە زۆر شپرزە بووبوو، بە توندی گوتی:

- دەتەوێ چ بڵێی؟ مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

گوێ بگرە گانیا، تکات لێ دەکەم ئەمڕۆ ئەوەندە لاساری و عینادی دەگەڵدا مەکە. بە پێچەوانەوە: هەموو هەوڵێکی خۆت بخەگەڕ کە... مەبەستم ئەوەیە... نەرم بە لەگەڵیا. دڵی ڕابگرە.. ڕازیی بکە... هم! بۆچی بەو جۆرە لێو هەڵدەقورتێنی؟ گوێ بگرە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ: کاتی ئەوە هاتووە ئەم مەسەلەیە یەکلایی بکەینەوە! ئەم هەموو دەردیسەرییەی ئێمە لە پای چییە؟ تۆ بە خۆت زۆر چاک دەزانی ماوەیەکی زۆر بەرژەوەندیی من لەوەدا بوو پەیگیری ئەم مەسەلەیە بکەم. ئیدی بە هەر جۆرێ بووە، دەبێ مەسەلەکە بە قازانجی خۆم ساغ بکەمەوە و لێی دەر بچم. توتسکی قەراری یەکجارەکیی خۆی داوە، هێز نییە پەشیمانی بکاتەوە، من لەو ڕووەوە هیچ خەم و نیگەرانییەکم نییە. تەواو ئاسوودەم، زۆر دڵنیا و ئەرخایەنم. من ئەگەر شتێکم بوێ، تەنیا بەرژەوەندی و خێری تۆیە و هیچی تر. ئیدی بۆ خۆت باش بیر بکەوە: ئایا متمانەت بە من نییە؟ خۆ تۆ پیاوێکی... پیاوێکی.... پیاوێکی زیرەک و هۆشمەندیت. خۆ من هەموو هیوایەکم بە تۆ بوو. جا ئەمە... ئەمە...

دیسان گانیا، فریای جەنەراڵ کەوت و بەم جۆرە ڕستەکەی بۆ تەواو کرد:

- جا ئەمە ئەسڵی مەسەلەکەیە!

هەنگێ، بزەیەکی تەوسامێزی تاڵ لێوی بزواند، بێ ئەوەی تەنانەت هەوڵی شاردنەوەشی بدات. نیگا تیژە ئاگرینەکەی بڕییە جەنەراڵ، دەتگوت دەیەوێ بە نیگا، هەموو هزر و بیر و بیرکردنەوەیەکی خۆی لە جەنەراڵ بگەیەنێت. دەموچاوی جەنەراڵ سوور هەڵگەڕا، بە نیگایەکی تورە ڕوانییە گانیا و لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

- بەڵێ، زیرەکی و هۆشمەندی ئەسڵی مەسەلەکەیە. تۆ کابرایەکی سەیریت گاڤریلا ئاردالیونیچ! لەوە دەچێ بە هاتن و پەیدابوونی ئەم گەنجە بازرگان زادەیە زۆر خۆشحاڵ بیت، وەکو ئەوەی فریاڕەسێک بێت و لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە! دەبوایە لەم کار و مەسەلەیەدا، هەر لە سەرەتاوە هوشیار بیت و زیرەکی و کارامەیی خۆت بسەلمێنی. دەبوایە زۆر بە باشی هەڵوێستەکەت هەڵسەنگاندابا و تێی بگەیت و بەدروستی ڕەوشەکەت تەخمین کردبا... و... و... دەبوایە لە هەر دوو سەرەوە کار بکەیت.... دەبوایە ڕێک و ڕەوان، بە ڕاشکاوی و سەرڕاستی کار بکەیت... دەبوایە پێشوەختە هەموو شتێکت گوتبا، تا خەڵکانی دی تێوە نەگلێن و دووچاری کێشە و سەریەشە نەبن. وەختێکی زۆرت بۆ ئەم کارە بە دەستەوە بوو. ئێستاش نەچووە بچێت. (لێرەدا جەنەراڵ، بە شێوەیەکی دیار برۆکانی هەڵبڕین)، هەرچەندە تەنیا چەند سەعاتێک بەدەستەوە ماوە. تێدەگەی؟ بەڵێ؟ دەتەوێ یان نا؟ ئەگەر ناتەوێ، بڵێ نامەوێ و بڕایەوە، دەبێ لە کاتی خۆیدا ئەوە بڵێی! کەس زۆرت لێ ناکات گاڤریلا ئاردالیونیچ، ئەگەر ئەمە بە داو دەزانی، دڵنیابە کە کەس داوی بۆ نەناویتەوە، کەس نایەوێ بتخاتە داوەوە.

گانیا، بە دەنگێکی نزم، بەڵام بە شێوەیەکی بنجبڕ گوتی:

- من دەمەوێ ئەم کارە بکەم!

ئەوجا چاوانی داخست و بێدەنگییەکی تاڵ نیشتە سەر سیمای جەنەراڵ،

کە تۆزێ لەوە پێش زۆر تووڕە بووبوو، هەنوکە هێور بووبووەوە، دڵی خۆش بوو. دیار بوو کە لە زێدەڕۆییەکەی خۆی ژێوان بووەتەوە. لەناکاو ئاوڕی لە میرزادە دایەوە، دیار بوو لەوە نیگەران بوو کە میرزادە لەوێ بووبوو و گوێی لە هەموو شتەکان بووبوو.

بەڵام، زۆری پێنەچوو کە جەنەراڵ هاتەوە تایم، چونکە تاقە تەمەشاکردنێکی میرزادە بەس بوو، بۆ ئەوەی دڵی جەنەراڵ ئاسوودە و بیری ڕەحەت بێ.

جەنەراڵ، کە تەمەشای نموونەی دەستخەتەکەی میرزادەی کرد، بەسەرسامی گوتی:

– دەستت نەڕزێ! ئەوەیە خەت! بە ڕاستی جوانە! یەکپارچە هونەرە! هونەرێکی دەگمەن! گانیا، تەمەشا تەمەشا، بڕوانە چ بەهرەیەکە!

میرزادە، بە حەرفی ڕووسی سەدەکانی ناڤین، لەسەر کاغەزە ئەستوورەکە ئەم دەستەواژەیەی نووسیبوو:

"ئەمە دەست و ئیمزای عەبدی زەلیل، خودی پاپا پافنوسە"*.

میرزادە، بەوپەڕی جۆشوخرۆش و بە ئاو و تاوێکی زۆرەوە گوتی:

– ئەمە واژۆ و ئیمزای خودی پاپا پافنوسە، لە دەستنووسێکی سەدەی چواردەمەوە وەر گیراوە. جاران پاپا و پەتریارکەکانمان ئیمزای جوانیان هەبووە! بۆ ئیمزایەک ئەم هەموو زەوق و سەلیقە و سەبر و حەوسەڵەیەیان بەکار بردووە. تۆ نوسخەی چاپەکەی پوگودین* –ت نییە جەنەراڵ؟ تەمەشا لێرەدا لاسایی جۆرە خەتێکی دیکەم کردووەتەوە. خەتی درشتی چەماوە، کە لە سەدەی ڕابردوودا، لە فەرەنسا باو بووە. تەنانەت هەندێ لە پیتەکان بە شێوەی جیاواز نووسراون، ئەمە خەتی ئاسایی گشتییە، تێکڕای نووسەران بەکاری دەبەن. ئەمە لە دەستخەتی، خۆشنووسانی ئەسڵییەوە وەر گیراوە، کاتی خۆی نوسخەیەکم هەبوو. دەزانی جۆرە جوانییەکی خۆی هەیە. تۆ جوان تەمەشای ئەم داڵ و ئەلفە بازنەییانە بکە. شێوازی فەرەنسیم تێکەڵ بە ڕووسی کردووە. ئەمە کارێکی زۆر ئەستەم و زەحمەتە، بەڵام پێم وایە من دەرەقەتی هاتووم. فەرموو





ئەمــەش نموونــەی جــۆرە خــەتێکی دیکەیــە، نموونەیــەکی زۆر ڕەســەن، تەمەشــای ئــەم ڕســتەیە: "هــیچ کۆســپێک خــۆی لەبــەر هەوڵ و تێکۆشــان ناگرێت". ئەمە شێوازێکی ڕووسییە، خەتێکە کە حکومەت بەکاری دێنێ، یان دەشێت بڵێی نووسینێکی حکومـەتی- سـوپاییە. بـەم خەتـە نامـە بـۆ پیـاوی گەورەی پایـەدار دەنووسـرێت. ئەمــەش خــەتێکی بازنــەیی چــەماوەیە و زۆریش جوان و ناسکە، پێی دەڵێن خـەت و نووسـینی "ڕەش". بە ڕاسـتییش زۆر ڕەشـە، بـەڵام یـەجگار جوانـە. خۆشنووسـی پیشـەیی و کارامـە، ڕێ بـە خـۆی نـادات، ئـەم وردە شـت و وردەواڵانـەی بـۆ زیـاد بکـات. دەی بینـی؟ لەگەڵ ئەوەشدا، شـەقڵێکی تایبەتی بـە خەتەکە دەدات. پیـاو دەتوانێ ڕوحـی نووســەرە ســوپایەکەی تیـادا بـدینێ، کـە دەیەوێ زەوق و سـەلیقەی خـۆی بنوێنێ، بەهرەکەی داوای ئەوەی لـێ دەکـات، بـەڵام زەبت و ڕەبتـی سـوپایی ڕێی نادات. سیستەمی سوپایی، زۆر بە جوانی لە خەتدا گوزارشـت لـە خـۆی دەکات. تۆ بڕوانـە چەنـد جوانـە! کاتی خـۆی کـە ئـەم شـێوازە خەتـەم بینـی، زۆر حایرمـام، دەزانـی ئـەم نموونەیـەم لـە سویسـرادا بینـی! ئێسـتاش چەنـد نموونەیــەکی ئاســایی و بــاوی خــەتی ئینگلیزیــت نیشــان دەدەم، نموونــەی خـەتی خالیسـە و بـێ خەوش و بـێ ڕتوشـکاری ئینگلیـزی. هـەر بـە خـۆی، خۆڕسک جوانە! یەکپارچە سـیحر و ئەفسـوونە: مرواریيـە، دوڕە، گەوهـەرە! چـاو لـە کـەماڵ و جـەماڵی تێـر نابێـت. ئەمـەش خـەتێکی دیکـە، بـە شـێوازی فەرەنسـی، هـەر هـەمان ئەو خەتـە ئینگلیزییـەیە و بڕێـک دەسـکاری کـراوە، ئەمەم لە چەرچییەکی فەرەنسی وەرگرتووە. هەر هەمان شێوازی ئینگلیزیـە، بەڵام پیت و حەرفە پڕەکانی زەقتر و ڕەشترن و ئەمەش هاوسـەنگی ڕێژەی ڕەش و سـپییەکەی گۆڕیـوە. تـۆ دیقـەت بـدە، پیتـە چـەماوەکانیش زیـاتر هاتوونـەتەوە یـەک و کـەمێک خڕتـر بـوون، هـەروەها وردەکـاری تیـاکراوە، بـەڵام ئـەم وردەکـاری و ناسککاریە لـەم خەتـەدا ناپەسـند نییـە، هەڵبەتـە ئـەم وردەکاریانە یەجگار هەستیار و پڕ خەتەرە، بۆیە خۆشـنووس دەبێ یـەجگار بەهرەمەنـد و کارامــە بێــت ئەوجــا خــۆی لەو وردەکارییانــە بــدات، دەنــا ڕیسەکەی لێ دەبێتەوە بە خوری، بـەڵام ئەگـەر خۆشـنووس توانیی مەودا و

ڕیژە دروستەکان بدۆزێتەوە، هەنگێ خەتێک بەرهەمدێنێ، بێهاوتا، خەتێک کە ئینسان وەکو ئاشق، دڵبەندی دەبێت.

جەنەراڵ بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- جوانە، جوانە، سەیرە! تۆ شارەزای هەموو ڕەمز و وردەکاری و ناسککارییەکانی! برادەری ئازیز، تۆ هەر خۆشنووس نیت، بەڵکو هونەرمەندێکی تەواوی، تۆ چ دەڵێی گانیا؟

گانیا، بۆی سەلماند و گوتی:

- شتێکی سەیرە!

ئەوسا بەدەم تەوسخەنەوە لەسەری ڕۆیشت:

- ئەمە نیشانەی بەهرەیەکی گەورەیە و دەشێت لە سایەی ئەمەوە کار و پیشەیەکی موحتەرەمی دەست بکەوێت.

جەنەراڵ گوتی: پێبکەنە، تا دەتوانی پێبکەنە، بەڵام بەهرەیەکی ئەوتۆی هەیە، کە بتوانێ پیشەیەکی زۆر باش بە دەست بێنێ، گوێ بگرە میرزادە، چۆنە تەکلیفت بکەم جارجار بەو خەتە جوانەت نامەیەک بۆ کەسێتییەک بنووسیت؟ دەتوانم مانگانەیەکی بیست و پێنج ڕۆبڵیت بۆ ببڕمەوە...

جەنەراڵ بەدەم ئەو قسانەوە سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و لەسەری ڕۆیشت:

- سەعات دوازدە و نیوە! گوێ بگرە میرزادە، با بێینە سەر ئەسڵی مەسەلەکە، من کارم هەیە و پەلەمە، ڕەنگە ئەمڕۆ دەرفەت نەبێت جارێکی دی یەکتر بدینینەوە. کەمێک دانیشە: وەکو پێم گوتیت، من ناتوانم هەموو جارێ بتبینم. دەرفەتم نییە، بەڵام لە ناخی دڵەوە حەز دەکەم سووکە یارمەتییەکت بدەم، دەستگیرۆییەکی کەمت بکەم، تا دەکەویتە سەر پێی خۆت و کاری دڵخوازی خۆت پەیدا دەکەیت و دەتوانی تەگبیری حاڵی خۆت بکەی، من وەزیفەیەکی چکۆلەت بۆ دەدۆزمەوە، هەڵبەتە وەزیفەیەکی قورس و زەحمەت نا، بەڵام نەزم و زاکونی دەوێ، جا گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم: ئەم کوڕە گەنجە، یانی گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ دەبینی، ئەم گەنجە هاوڕێی منە، حەز دەکەم باشتری بناسیت، لەگەڵ کەسوکارەکەی خۆیدا





دەژی، خوشکەکەی و دایکی لە شوقەکەی خۆیاندا، دوو یان سێ ژووریان موبیلە کردووە، بە هەموو کەلوپەلێک و بە خواردنەشەوە بەکرێی دەدەن، هەڵبەتە تەنیا بە خەڵکی ڕەوشتبەرز و ئابڕومەندی دەدەن، یانی بە کرێچییەکی دەدەن کە کەسێکی مەعتەبەر زەمانەتی بکات. جا من دڵنیام کە نینا ئالکساندروڤنا، قسەی من لە عاردی نادات و پێشوازیت دەکات. جا ئەمە بۆ تۆ میرزادە کۆزو شەشە، چونکە بە تەنیا نابیت و وەکو دەڵێن لە باوەشی خێزانێکدا دەژی. بە ڕای من نابێ لە هەوەڵ ڕۆژەوە لە پایتەختێکی وەکو پترسبۆرگدا بەتەنیا بژیت. هەڵبەتە نینا ئالکساندروڤنای دایکی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ و ڤارڤارا ئاردالیونوفیچای خوشکی، دوو خانمی زۆر بەڕێزن، من زۆرم خۆش دەوێن و لەڕادەبەدەر حورمەتیان دەگرم. نینا ئالکساندروڤنا، هاوسەری ئاردالیون ئالکسندروفیچە، ئالکسندروفیچ، جەنەراڵێکی خانەنشینی هاو دەورەی منە، لە سوپادا دۆست و برادەری یەکدی بووین، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی هەموو پەیوەندییەکم دەگەڵیا بڕی، بەڵام وێڕای ئەوەش هەر ڕێزم گرتووە و قەدر و حورمەتی خۆی لەلام هەبووە. جا میرزادە من بۆیە هەموو ئەم شتانەت بۆ دەگێڕمەوە تاکو بزانیت کە من زەمانەتت دەکەم، یانی من مەسئولیەتی تۆ هەڵدەگرم. کرێی ژوورەکە و خواردن و خزمەت، زۆر نابێ، دڵنیام کە مووچەکەت بە تەواوەتی بەش دەکات. ڕاستە پیاو پێویستی بە خەرجیی گیرفان هەیە، با کەمیش بێ، بەڵام بە قسەی من دەکەی، بەبێ عاجزی، سەبارەت بە تۆ وا باشترە خەرجیی گیرفانت پێ نەبێ، هیچ پارەیەکی زیادەت نەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی حاڵی حازر جزدانەکەت هیچی تیا نییە، با بیست و پێنج ڕۆبڵێکت وەکو پێشەکی بدەمێ، پاشان حیسابی خۆمان پاک دەکەینەوە. جا ئەگەر تۆ، دڵیشت وەکو ڕواڵەتت وا بێ، قسەی دڵ و دەمت یەک بێت، پێم وایە هیچ کێشەیەکمان ناکەوێتە نێوان. ئەگەر دەبینی ئەوەندە بە خەمی تووەم، هی ئەوەیە کە بەتەمام هەندێ کارت پێ بسپێرم و پشت بە تۆ ببەستم، کە پاشان بەدەم کارکردنەوە ئەو شتانەت بۆ دەر دەکەوێت. گانیا گیان، خۆ پێتان ناخۆش نییە، میرزادە بێتە ماڵی ئەنگۆ؟

گانیا، بەوپەڕی ڕووخۆشی و زمانشیرینی بەرسڤی دایەوە:

- بە پێچەوانەوە! دایکیشم زۆری پێ خۆش دەبێت...

- وا بزانم جارێ هەر یەک ژوورتان بەکرێ داوە، ئەو پیاوەی تیایە کە پێم وایە ناوی فردیـ... فردیـ..

- فردیش چینکۆ*

- بەڵێ فردیش چینکۆ. من حەز لە چارەی ئەم فردیش چینکۆیە ناکەم. لێبۆکێکی پیسە. تێناگەم بۆچی ناستاسیا فیلیپوڤنا هەمیشە پشتیوانیی لێ دەکات. ڕاستە گوایە بن عام و خزمیەتی؟

- نە بابە! خزمی چی! هەر ئەوەندەی من خزمەیەتی!

- دەی... هەقمان چییە، چاوی دەرەهات... میرزادە چ دەڵێی، ئەم تەگبیرەت بە دڵە؟ پێت خۆشە یان نا؟

- بەڵێ، سوپاس جەنەراڵ. بە ڕاستی قەرزاربارت کردم، بە تایبەتی کە من، نەبێ بە غروور و خۆ هەڵکێشان، داوای شتی وام لێ نەکردبوویت. بە ڕاستی تیا مابووم و نەمدەزانی شەو لەکوێ بحەوێمەوە و ڕۆژ بکەمەوە. هەرچەندە ڕوگوژین، خولکی کردبووم کە بچمە نک وی، بەڵام....

- ڕوگوژین؟... نا... واز لە ڕوگوژین بێنە، من وەکو باوکێک، یان وەکو هاوڕێیەکی خۆت، ئامۆژگاریت دەکەم، ئەم پیاوە لە بیر خۆت بەرەوە. من ئامۆژگاریت دەکەم با پەیوەندیت تەنیا بەو خانەوادەیەوە هەبێت کە لەمەودوا دەگەڵیان دەژیت.

میرزادە گوتی:

- تۆ کە پیاوێکی ئەوەندە بە لوتف و باشیت. شتێکی دیکەم هەیە حەز دەکەم پرست پێ بکەم.

جەنەراڵ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ببورە، یەک دەققەش وەختم نییە. هەر ئێستا سەبارەت بە تۆ دەگەڵ، هاوسەرەکەم، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، قسان دەکەم. ئەگەر قابیل بوو کە ئێستا پێشوازیت بکات- هەڵبەتە من هەوڵ دەدەم قابیلی بکەم – ئەوا ئامۆژگاریت دەکەم، ئەم دەرفەتە لە کیس مەدە و هەوڵ بدە بچیتە دڵیەوە، چونکە لەگینە

خزمەتێکی گەورەت بکات، قازانجێکی باشت پێ بگەیەنێت، چونکە تۆش هەمان لەقەب و شۆرەتی خانەوادەیی ئەوت هەیە، بەڵام ئەگەر نەیویست ئێستا پێشوازیت بکات، ئەوا دڵ لە دڵ مەدە، چاوەڕوانی دەرفەتێکی دیکە بکە. جا گانیا تۆش وەرە تەمەشایەکی ئەم لیستی حیساباتە بکە. من و فیدوسییڤ لە دوێنێوە خەریکین، سەرمان لێی دەر نەکرد. دەبێ لە... تۆمار بکرێن.

جەنەراڵ، بەلەز لە نووسینگە و ئۆفیسەکەوە دەر کەوت. میرزادە چەندی کرد و کۆشا نەیتوانی هیچی لەبارەی مەوزعەکەی خۆیەوە پێ بڵێ. گانیا جگەرەیەکی پێ کرد و یەکێکیشی بە میرزادە دا. کە وەری گرت، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبا گانیا ناڕەحەت بکات، درێژەی بە قسەکانی خۆی نەدا. کەوتە تەمەشاکردنی دەوروبەری ئۆفیسەکە. گانیاش، نیگایەکی لامسەرلایی بەو کاغەزە پڕ ژمارانەدا گێڕا کە جەنەراڵ دابویە. گانیا، بێتاقەت و حەواس پەرت بوو. کە بە دوو قۆڵی و بە تەنیا مانەوە، میرزادەوای هەست دەکرد، کە تەنانەت بزە و نیگا پەریشانەکەشی، بوون بە بارێکی قورس و لە سەر دڵی ئەو دانراون.

گانیا، لەناکاو لە میرزادە نزیک بووەوە کە لەم کاتەدا بە دیار وێنەکەی ناستاسیا فیلیپوفناوەوێستا بوو و بە چاوی مشتەری کەوتبووە تەمەشاکردنی.

- میرزادە، تۆ ئەم ژنەت بەدڵە؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- دەمو چاوێکی سەیری هەیە، من دڵنیام قەدەر و چارەنووسێکی دەگمەن و نائاسایی هەیە. دەموچاوێکی گەش و شەنگوڵی هەیە، بەڵام دەردو ڕەنجی زۆری چەشتووە، وا نییە؟ پیاو ئەمە لە نیگایا، لە گۆناکانیا، لەو دوو خاڵەی ژێر چاوەکانی و سەرووی ڕوومەتەکانیدا دەخوێنێتەوە. غروور و فرناخییەکی زۆر زۆر بە سیمایەوە دیارە! بەڵام نازانم دڵپاکە یان نا؟... خۆزگە دڵپاک بوایە! دڵپاکی هەموو عەیبێکی دی دەسڕێتەوە، قەرەبووی هەموو شتێک دەکاتەوە!

گانیا، بێ ئەوەی چاوە ئاگرینەکانی لە میرزادە بگوازێتەوە، لەسەری ڕۆیشت:

- باشە تۆ ئامادەی ژنێکی واهی بێنی؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- من ناتوانم هیچ ژنێک بێنم. من نەخۆشم.

- ئەدی ڕوگوژین؟ تەسەور دەکەی ڕوگوژین بیخوازێت؟ ها؟

- ڕوگوژین؟ پێم وایە لەگینە بیخوازێت. لە سبەینێ زووتر نییە بیخوازێت! بۆ هەفتەیەک دەیخوازێت و پاشان سەری دەبڕێت!

هێشتا میرزادە، بە تەواوەتی لەو قسانە نەبووبووەوە کە گانیا بە جۆرێ لە ترسانا ڕاجفری، کە لەزگ بوو میرزادە دەست بە هاوار بکات، باسکی گرت و پرسیی:

- چیتە؟

لەم کاتەدا خزمەتکارێک هاتە بەردەرگا و گوتی:

- جەنابی کۆنت، جەناب عالی، دەفەرمووێ بچیتە دیدەنی خا جەنەراڵ.

میرزادە، لە ژوورەکەوە دەر کەوت و دوای خزمەتکارەکە کەوت.

پەراوێز:

* - "ئەمە دەست و ئیمزای عەبدی زەلیل، خودی پافنووسە": ئەم پاپایە لە سەدەی چوار دەیەمدا، لە دەڤەری گوستروما‌دا، تەریقەتێکی تایبەتی دامەزراند، دیرۆکنووس و ئارکولوژیست، میشیل پوگودین (١٨٠٠- ١٨٧٥) ئیمزاکەی لە ئەلبومێکی دوو بەرگیدا پاراستووە، بە ناویشانی (چەند نموونەیەک لە خەتی سلاڤی ڕووسی. (مۆسکو، ١٨٤٠- ١٨٤١).

* - "فردیش چینکۆ...": ئەو ناوانەی بە پاشگری (ینکو) کۆتاییان دێت، ئەسڵیان ئۆکرانییە.

## فەسڵی چوارەم

هەر سێ کیژەکەی یەپانچین خانم، کیژانی تەندروست، شاد و شەنگوڵ، تۆکمە و زەلام، بە شانوشەوکەت، ناوشانپان، سینەبەرز، باسک و بازوو بەهێز بوون، بە شانوباهۆ هیچیان لە پیاو کەمتر نەبوو، جا بە هۆی ئەم سیحەتەوە، هەموویان نەوسن و چڵێس و زۆرخۆر بوون و ئەمەشیان لە کەس نەدەشاردەوە.

دایکەکەیان، خا جەنەراڵ، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، هەندێ جار ئەم چڵێسی و نەوسنی و زۆرخۆرییەیانی لەبەر گرانبوو، بەڵام کیژەکان، وێڕای ئەوەی بە ڕواڵەت وایان دەنواند گوێ لە ئامۆژگارییەکانی دەگرن و بە گوێی دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا دەمێ بوو، ئەو دەسەڵاتەی جارانی بەسەریانەوە نەمابوو. زۆر جار یەکێتیی نێوان کیژەکان خا جەنەراڵی پەست دەکرد، خا جەنەراڵ، کە ژنێکی سەنگین و سەلار و بەویقار بوو و حورمەتی خۆی ڕادەگرت، وای بە باش دەزانی، دەمە دەمەیان دەگەڵ نەکات و خۆی لە کاروباریان هەڵنەقورتێنێ و بە دەقی خۆیەوە دانیشێت، بەڵام هەموو جارێکیش خۆی پێ نەدەگیرا و مجێزی خۆی پێ جڵە و نەدەکراو بەسەر ئەقڵا سەر دەکەوت و ملی بۆ بڕیار و قەراری کیژەکان نەدەدا. ئیدی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ساڵ بە ساڵ کەم حەوسەڵەتر و بێسەبرتر و تەنانەت نالۆژیکیتر دەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی مێردەکەی پیاوێکی گوێڕایەڵ بوو و

بــە تەواوی دەســتەمۆی کردبــوو، ئیـدی هــەر داخێکــی کەوتبــا دڵ، بەوی دەڕشـت و هـەنگێ ئارام دەبـووەوە، تـەبایی و نـەزم و زاکوونی بۆ ماڵەکـە دەگەڕایەوە و شەڕ و بشێوییان بەخێر دەگەڕا.

ئەگەر بڵێی مەدام جەنەراڵیش، بەشی خۆی نەوسن بوو. هـەموو ڕۆژێک، قاوەڵتییەکی تێروتەسەلی دەگەڵ کیژەکانیا دەکرد، قاوەڵتیی چـی! هیچـی لـە فراقین (نیوەڕۆژە) کەمتر نەبوو کە عادەتـەن بـە نیو سـەعاتێ دوای نیـوەڕۆ پێشکەش دەکرا. خۆ کیژەکان پێش ئەمـەش، کە لـە خەو ڕادەبوون، هـەر لـە نـاو جێگاکانیانـدا، لـە سـەعات دەی تەواودا سـەرو فینجـان قـاوەی خەسـتیان دەخواردەوە. لە سـەعات دوازدە و نیوی تەواودا، خـوان و سـفرە لـە ژوورە چکۆلەکـەی، تەنیشـت شـوقەکەی لیزاڤینـا پروکوفیڤنـای دایکیـانەوە ڕادەخـرا، جەنەراڵیش جار بە جار، ئەگەر دەستی گەیشتبا و بیپەرژایـە، بەشـداریی لـەم ژەمـە تێروتەسـەلە خێزانیـەدا دەکرد. سـفرەی چـی! بـە جۆرەهـا خـواردن و نیعمـەت ڕازابـووەوە، چـای، قـاوە، پـەنیر، هـەنگوین، کـەرە، گۆشـتی بـرژاو، پەراسـوو، شـیرینیی تایبـەتی کـە خـا جەنـەراڵ حـەزی لـێ دەکـرد، کفـتە و گۆشتاوی خەست و خۆڵ.

ئەو دانــی بەیانییــەی کــە لێـرەدا باســی دەکــەین، هــەموو ئەنــدامانی خانەوادەکـە، لـە ژووری نـاخواردن خـڕ بـوونەوە و چـاوەڕوانی جەنـەراڵیان دەکرد، کە بـەڵێنی دابـوونێ سەعات دوازدە و نیوی ڕێک بگاتـە لایـان. خـۆ ئەگەر تاقە یەک دەقیقەش مەحتەل بوایـە، خێرا یـەکێکیان بـە شـوێنیا دەنـارد، بـەڵام جەنـەراڵ لەسـەر بـەڵێنی خـۆی لەوەختـا هـاتەوە. لـە کاتێکـا کـە بـەدەم ڕۆژباشەوە خەریک بوو دەستی ژنەکەی ماچ دەکرد، حاڵـەتێکی نائاسـایی لـە نیگاو سـیمایدا بـەدی کـرد. هـەر چەنـدە دوێشـەو، هەسـتی بەوە کردبـوو، کـە شـتێکی لەو بابەتـەی دێتـە ڕێ، کـە چووبـووە نـاو جێگـا، هەسـتی بـە جـۆرە نیگەرانییـەک کردبـوو، ترسـێکی زۆری لـێ نیشـتبوو، هەرچـەندە کچـەکانی چووبوون ماچیان کردبوو، هیچ تورەیی و ناڕەزاییـەکیان پێوە دیار نـەبوو، بەڵام هەر ناڕەحەت بوو، پێدەچوو شتێکی نائاسـایی لـە ئـارادا بـێ، دروسـتە، جەنەراڵ، بە هۆی زروفی تایبەتییەوە، لەڕادەبەدەر، پڕ گومـان دەر چووبـوو،

بەڵام چونکە باب و مێردێکی کارامە و پڕ ئەزموون و زیرەک بوو، هەر چارێکی بە پێویست زانیبایە دەیکرد.

ڕەنگە، ئەگەر لێرەدا هەڵوەستەیەک بکەین و لە ڕێگەی شەرح و شرۆڤەیەکی ورد و دروست و مەیلەو ڕاستەوخۆوە باسی ئەو وەزع و حاڵ و زرووفە بکەین کە خانەوادەی جەنەراڵ یەپانچینی تیا بوو، هیچ زیانێک بە چیرۆکەکەمان نەکەوێت.

وەکو پێشتر ئاماژەمان کردێ، جەنەراڵ، هەرچەند خوێنەوارییەکی زۆری نەبوو و خۆی گوتەنی (پیاوێک بوو خۆی بە خۆی ڕاگەیشتبوو) مێرد و باوکێکی کارامە و پڕ ئەزموون و هوشیار و زیرەک بوو. بڕیاری دابوو لە مەسەلەی شووکردنا، گوشار لە کیژەکانی نەکات. بڕیاری دابوو نەبێت بە سێبەر و بەردەوام بە دویانەوە بێت و بە ناوی خۆشەویستی و دڵسۆزیی باوکانەوە، وەکو زۆربەی خێزانەکان، تەنانەت خێزانە خوێنەوار و ڕۆشنبیرەکانیش، لە خەمی دۆزینەوەی مێردا بێت بۆ کیژەکانی.

جەنەراڵ، نەک هەر خۆی وا بیری دەکردەوە، بەڵکو لیزاڤیتای هاوسەریشی هێنابووە سەر هەمان بیروباوەڕ، دیارە ئەوە کارێکی زۆر قورس بوو، چونکە ڕێک پێچەوانەوەی تەبیعەت و غەریزەی ئافرەت بوو، بەڵام بەڵگە و بیانووەکانی جەنەراڵ، چونکە لەسەر هێم و بناغەی واقیعی ڕۆنرا بوون، یەجگار قەناعەتبەخش بوون. جەنەراڵ، قەناعەت و بیروباوەڕی وا بوو کە: کیژانی گەنج و عازەب، ئەگەر ئازادیی ڕەفتاریان بدرێتێ، خۆبەخۆ ڕێگەی ئەقڵ و مەنتیق دەدۆزنەوە و دەگرنە بەر، وەزع و حاڵەکان بەدڵی خۆیان دەبێت و هیچ هەنجەت و بیانوویەکیان نامێنێ، هەنگێ دایک و باب تەنیا ئەوەیان لەسەر دەبێت کە بەگوێرەی توانا چاودێرییان بکەن تا نەکەونە هەڵەی هەڵبژاردنەوە یان تووشی هیچ کەچڕەوی و لادانێکی نادروست و نابەجێ نەبن. ئەوسا، لە کاتی گونجاو و لەباردا دەتوانن، بە هەموو هێز و توانایەکی خۆیانەوە، ڕێنوێنییان بکەن و ڕێگەی دروستیان نیشان بدەن. ئەمە جگە لەوەی ساڵ بە ساڵ سەروەت و سامانی خانەوادەکە زیادی دەکرد، پایەی کۆمەڵایەتیی بەرز دەبووەوە،

ئەمەش بە قازانجی کیژەکان، تەنانەت لە ڕووی جیازی و شیتشەوە، دەشکێتەوە، بەڵام وێڕای هەموو ئەم حەقیقەتە حاشاهەڵنەگرانە، بویەرێکی تازە هاتبووە ئاراوە، ئەویش ئەوە بوو کە کیژە گەورەکە، یانی ئەلکساندریا، لەناکاوا، بە شێوەیەکی وەک بڵێی چاوەڕواننەکراو – کە ئەمە هەمیشە هەر وایە – گەیشتبووە تەمەنی بیست و پێنج ساڵان.

جا هەر تەقریبەن هەر لە هەمان سەروبەندا، ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی، جارێکی دی کەڵکەڵە و ئارەزووی ژنهێنانی کەوتەوە سەر. توتسکی پیاوێکی دەستڕۆ و زۆر دەوڵەمەند بوو، خودان پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرز بوو. تەمەنی نزیکەی پەنجا و پێنج ساڵ بوو، پیاوێکی ناسکتەبع و خۆشمەشرەب و بە سەلیقە و هەستناسک بوو. بە نیازی زەماوەندێکی ئاقیبەتخێر و جوان بوو، جوانناسێکی زەبەردەست و بێهاوتا بوو. لەمێژ بوو دۆستی جەنەراڵ یەپانچین بوو، جگە لە دۆستایەتی، لە چەند پرۆژەیەکی داراییشدا، هاوبەش و هاوبەرژەوەندی بوون. ئیدی گرێی دڵی خۆی بۆ جەنەراڵ کردبووەوە لە ڕووی دۆستایەتییەوە پرسی پێ کردبوو، کە ئاخۆ داوای کیژەکەی بکات دەیداتێ یان نا؟ ئیدی لەبەر ئەمە، ڕەوتی ژیانی ئارام و ڕێکوپێکی خانەوادەکەی جەنەراڵ یەپانچین، بەئاشکرا شلۆق بووبوو.

وەکو پێشتریش گوتمان، کیژە هەرە بچووکەکەیان، واتا ئاگلایا، لە دوو خوشکەکەی تری جوانتر بوو، وەک دەڵێن نازداری باوان بوو. تەنانەت (توتسگی)یش کە پیاوێکی یەجگار خۆپەسند بوو، دەیزانی نابێ بە هیچ جۆرێ بەتەمای ئاگلایا بێت، چونکە ئاگلایا بۆ ئەو نابێت و خواردنی ئەو نییە.

بەهەرحاڵ، خوشکەکانی ئاگلایا، زۆریان خۆش دەویست، کوێرانە خۆشیان دەویست و خانەواندەی یەپانچین تێکڕا، ڕاستگۆیانە و دڵسوزانە، لە ناخی دڵەوە بەتەمای ئایندەیەکی نموونەیی و نائاسایی بوون بۆ ئاگلایای کیژە بچووکیان، ئاییندەیەک کە نزیک و هاوتای بە هەشتی زەمینی بێت. یانی مێردی ئاییندەی ئاگلایا دەبێ پیاوێکی ئایدیالی بێ، هەموو

سـیفەتێکی ئایـدیالیی تیـا بێـت، لـە هــەموو ڕوویــەکەوە ســەرکەوتوو بــێ، زۆریــش دەوڵەمەنـد بـێ. تەنانــەت هــەر دوو خوشــکەکەی، بــەبێ قســە و گفتوگـۆ، لــە دڵــی خـۆدا، بڕیاریــان دابـوو، ئەگــەر پێویسـتی کـرد، هــەموو فیداکارییــەک لــەپێناوی ئاگلایــادا بکــەن و جیازییەکــەی دەبــێ زۆر گەورە و دەگمەن بێت.

داک و باوکەکەیان، ئاگایان لـەم ڕێکەوتنـەی نێوان دوو خوشکە گەورەکـە هــەبوو. بۆیــە کــاتێ توتسـکی گرێــی دڵــی خـۆی بـۆ خــانەوادەی یــەپانچین کردەوە و نیازی خۆی ئاشکرا کـرد، زۆر بـەگومان نـەبوو لەوەی کـە یـەکێک لە دوو خوشکە گەورەکە داواکەی قەبووڵ بکات، بە تایبەتی توتسکی لەوانـە نەبوو گوێ بە مەسـەلەی جیازی بدات و چـاوی لـە جیـازی و مـارەیی بێت، بۆیـە جەنـەراڵ، وەکـو پیـاوێکی کـارامە و بەئـەزموون، یەکسـەر ڕەزامەنـدیی خـۆی ڕاگەیانـد، (توتسـکی)یش لەبـەر هەنـدێ هـۆی تایبـەتی خـۆی، زۆر بـە تــانی شــتەکەدا نــەچوو، گەنگەشــە و گفتوگۆیــەکی زۆری دەربــارە نــەکرد، شــتەکەی بــە مــەیلەو شــاراوەیی هێشــتەوە، تــەنیا تــاقیکردنەوەی دەمــی خـانەوادەی یـەپانچین بـوو، بۆیـە داک و بابەکـەش شـتەکەیان، تـەنیا وەکـو گریمــانە و ئەگــەرێکی دوور، دا بــە گــوێی کچەکانــدا، کیژەکــانیش لــەلای خۆیــانەوە وەڵامێکــی گۆنــگ و ئاڵۆزیــان دایەوە، بــەڵام دڵخۆشــکەرە بــوو، ئەوەی لـێ بـەدی دەکـرا کـە کیـژە گەورەکـە، واتـا ئالکسـاندرا، لەگێنـە قاییـل ببێت.

ئەلکساندرا، ئەگەرچی تەبعێکی ڕەقی هەبوو، بەڵام کیژێکی دڵپاک، ئاقڵ و خۆشمەعشـەر بوو، ئەگەری ئەوە هەبوو قاییل بێت مێرد بـە توتسکی بکـات، ئەگەر قەول و بەڵێنی دابا، بەڵێنی خۆی دەبردە سەر. زۆر گوێی لـە ڕواڵـەت و ڕواڵەتبازی نـەبوو، ئەگـەری ئەوەی لـێ نـەدەکرا نیگـەرانی و کێشـە و هـیچ دەردیســەرییەک بـۆ مێـرد چــێ بکــات، ترســی هەڵگــەڕانەوە و بــادانەوەی کوتـوپڕی لـێ نـەدەکرا. بـە پێچەوانەوە، تەسـەوری ئەوەی لـێ دەکـرا، ژیـانی پیـاو خـۆش و ئاسـان بکـات. هــەر چەنـد ڕواڵـەتێکی دڵڕفێنــی نـەبوو، بـەڵام کیژێکـی جـوان و ڕنـد بـوو. ئیـدی کەسـێکی وەکـو توتسـکی لەوەی پتـر چـی

دەویست؟

وێڕای ئەمەش مەسەلەکە زۆر بە هیواشی و ترسەوە دەچووە پێشێ. جۆرە ڕێککەوتنێکی ناڕاستەوخۆ لەنێوان توتسکی و جەنەراڵدا هەبوو، کە جارێ هیچ هەنگاوێکی فەرمی و یەکجارەکی نەنەن. داک و بابەکەش هێشتا بەئاشکرا، مەسەلەکەیان دەگەڵ کیژەکانیاندا، باس نەکردبوو. تەنانەت پێدەچوو، جۆرە ناکۆکییەکیانیش کەوتبێتە نێوانەوە. مەدام جەنەراڵ، بەو ئیحتوبارەی کە دایکە، جۆرە ناڕەزاییەکی نیشان دەدا، کە ئەمە کارێکی زۆر خەتەر بوو. ئەمە جگە لەوەی کە وەزع و حاڵ و زروفێکی ئاڵۆزی ئەوتۆ لەئارادا بوو، کە لەگین بوو ببێتە بایسی هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکیی پڕۆژەکە.

ئەسڵی ئەم وەزع و حاڵ و زروفە ئاڵۆزە، وەکو توتسکی دەیگوت، کۆن بوو، دەگەڕایەوە بۆ هەژدە ساڵی لەوەپێش. لە نزیکی یەکێک لە موڵکەکانی توتسکیدا، لە یەکێک لە دەڤەرەکانی ناوەندی ڕووسیادا، خوردە موڵکدارێکی دەستکورت و نەدار، بە گیانەمەرگی دەژیا. ژیانی ئەم پیاوە، زنجیرەیەک بەڵا و نسیبەت بوو، زنجیرەیەکی یەک لەدوی یەکی ئەوتۆ کە پتر لە حیکایەتێک یان چیرۆکێک دەچوو. ئەم پیاوە ئەفسەری خانەنشین بوو، لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و خانەدان بوو، ڕەسەنتر و خانەدانتر لە بنەماڵەی توتسکی. نێوی فیلیپ ئەلکسندروفیچ پاراشکوف بوو. ئەنجام، وێڕای ئەوەی زۆر قەرزار بوو و موڵکەکەی لە ڕەهەن و بارمتەدا بوو، توانیی بە زەبری کاری قورس و هەوڵی بێوچان، کە لە فەلاح و ڕەعیەتێک زیاتر کاری دەکرد، دەستێک بە موڵکە چکۆلەکەیدا بێنێ و بە ڕێکوپێکی ڕەعەمەلی بێنێ. کەمترین سەرکەوتن، دڵخۆشی دەکرد، ورەی بەرز دەکردەوە، هیوایەکی زۆری پێدەبەخشی، کار گەیشتە ئەوەی، گەشبین و دڵخۆش ئەوپەڕی متمانە بە خۆی پەیدا بکات، ڕۆژێک خۆشحاڵ و دڵخۆش، بۆ شار چووبوو تا یەکێک لە گەورە خاوەن قەرزەکانی خۆی ببینێ و بەگوێرەی توانا دەگەڵیا ڕێک بکەوێت. ڕۆژی سێیەم، پێشکارەکەی، بە سواری ئەسپێکەوە لە گوندە چکۆلەکەی ئەوەوە کە لایەکی سەروچاوی سووتابوو و هەموو

ڕدێنی هەڵکوڕوزابوو، خۆی گەیاندە شار و خەبەری دایە کە دوێنێ، بە ڕۆژی ڕووناک ئاگر بەر بووەتە موڵک و مەزراکەی، ژنەکەی سووتاوە و مردووە، بەڵام منداڵەکانی بە سەلامەتی دەرباز بوون.

پاراشکۆف، هەرچەندە دەگەڵ چەپۆکی چارەنووس و قەدەردا ڕاهاتبوو، بەڵام بەرگەی ئەم کارەساتە قورسەی نەگرت، ئەقڵی لەدەست دا و شێت بوو، دوای یەک مانگ بە سەکتەی مێشک مرد.

ئیدی موڵکە سووتاوەکانی بە ڕەعیەتەکانیەوە، خرانە هەڕاجەوە تا قەرزەکانی پێ بدەنەوە، بەڵام دوو کیژە چکۆلەکەی، کە یەکێکیان شەش ساڵان و ئەوی تریان حەوت ساڵان بوو، ئانافاسی ئیڤانوفیچ توتسکی، جوامێر و دڵاوا گرتنیە ژێر باڵی خۆی.

ئیدی ئەم دوو کیژە دەگەڵ، منداڵەکانی پێشکار و وەکیلەکەی توتسکیدا، کە فەرمانبەرێکی خانەنشین و خودانی ڕەشە خێزانێکی فرە ژمارە و ئەڵمانی نەژاد بوو، گەورە بوون، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم تەنیا یەکێک لەو دوو کیژە لە ژیانا ما، ئەویش ناستاسیا بوو، چونکە خوشکە چکۆلەکەی بە نەخۆشیی کۆکەڕەشە مرد، بەڵام توتسکی کە لە هەندەران دەژیا، زۆری نەبرد کە هەر دوو کیژەکەی لەبیر کرد.

دوای پێنج ساڵان، ڕۆژێک ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی کە بەو دەڤەرەدا تێدەپەڕێ، دێت بە خەیاڵیا کە سەرێکی موڵکەکانی بدات، لەوێ لە خانووەکەی خۆیدا، لەناو ماڵ و منداڵی پێشکار و وەکیلە ئەڵمانییەکەی خۆیدا، چاوی بە کیژێکی دوازدە ساڵانی یەجگار جوان و دڵڕفێن دەکەوێت. کیژێکی شۆخوشەنگ، زیتەڵ و شەنگوڵ، بە هۆشوگۆش کە دیار بوو لە ئاییندەدا دەبێت بە شۆخوشەنگ و جوانێکی یەجگار جوان. توتسکی لەو مەیدانەدا پیاوێکی کارامە و ئەزموونندار بوو، مەزەندەی بەخەسار نەدەچوو.

ئەم جارەیان، تەنیا چەند ڕۆژێکی لەم موڵک و مەزرایەی خۆیدا بەسەر برد، بەڵام کاتەکەی بایی ئەوەی کرد هەندێ بڕیار بدات، ئەوە بوو گۆڕانێکی گەورە لە پەروەردە و فێرکردنی کیژێدا ڕووی دا: مامۆستایەکی

تایبەتییان بۆ گرت. ئەم مامۆستایە ئافرەتێکی سویسریی بەڕێزی بەتەمەن بوو، لە بواری پەروەردە و فێرکردنا کارامە و ئەزموونداربوو، کەسێکی رۆشنبیر بوو، جگە لە زوبانی فەرەنسی، دەیتوانی لە زۆر بواری دیکەی زانستدا، دەرس بڵێتەوە. مامۆستا گواستیەوە ئەم خانووە و ئیدی پەروەردە و فێرکردنی ناستاسیای چکۆلە بەپەلە دەستی پێ کرد. دوای چوار ساڵ ئەم قۆناغەی خوێندنی ناستاسیا تەواو بوو، مامۆستاکەی رۆیشت. ئەوسا خانمێکی دیکە هات کە بە خۆی زەویدار بوو، لە هەرێمێکی دوورەدەستی دیدا، دراوسێی موڵکی توتسکی بوو. ئەم خانمە هات و لەسەر داوای ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی، ناستاسیای لەگەڵ خۆیدا برد، جا ئەم موڵکە چکۆلەیەی توتسکی، خانوویەکی دارینی تیابوو، هەرچەندە چکۆلە بوو، بەڵام تازە بوو، زۆر بە رێکوپێکی و جوانی موبێلە کرابوو. جا بەرێکەوت، رێکەوتێک کە زیاتر لە عەمدی دەچوو، ئەو گوندە ناوی "ئوتراد نویی*" بوو.

ئەم خانمە، یەکسەر ناستاسیای بۆ ئەوێندەر برد، کە شوێنێکی زۆر هێدی و هێمن بوو، چونکە ماڵەکەی خۆی لەوێندەرەوە نزیک بوو، بە خۆی بێوەژن بوو و منداڵی نەبوو، هەر لە هەمان شوێنداو، دەگەڵ ناستاسیادا، ئاکنجی بوو. لەوێندەر پاسەوانێکی پیر و کارەکەرێکی گەنجی کارامە لە خزمەتی ناستاسیادا بوون. ئەم ماڵە پڕ بوو لە ئامێری مۆسیقی، کتێبخانەیەکی پڕ لە کتێبی بابەتی کیژانی گەنج، تابلۆ، وێنەی لە دارهەڵکەندراو، قەڵەم، فڵچە و بۆیە، هەروەها دێڵە تاژییەکی جوان.

دوای دوو هەفتە، ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی بە خۆیشی چوو بۆ ئەوێندەر...

لەوە بە دواوە، زۆری حەز چووە ئەم گوندە چکۆلەوێڵەی ناو ئەم دەشتودەرە دوورەدەستە. هەموو هاوینێک دەچوو بۆ ئەوێندەر و دوو هەیڤ و هەندێ جار سێ هەیڤی لەوێ دەقەتاند. ماوەیەکی زۆر، چوار دانە ساڵی خشت، بە ئارامی و هێمنی و بەوپەڕی خۆشی و شادی تێپەڕی.

رۆژێک، تازە هەوەڵی زستان بوو، دوای نزیکەی چوار مانگ لە



## گەمژە

سەفەرێکی هاوینەی ئافاناسی ئیڤانوفیچ بۆ ئوترادنویی، کە سەفەری ئەوجارەی تەنیا پازدە ڕۆژی خایاندبوو، دەنگۆیەک بڵاو بووەوە، یان بە گوتەیەکی دی دەنگۆیەک بەر گوێی ناستاسیا فیلیپوڤنا کەوت کە گوایە توتسکی خەریکە لە پترسبۆرگ، کیژێکی جوانی دەوڵەمەند، لە بنەماڵەیەکی خانەدان دەخوازێت، یانی کەسێکی هاوکوف و هاوتای خۆی دەخوازێت. پاشان دەر کەوت کە ئەم دەنگۆیە لە هەندێ ڕووەوە، دروست نییە، واتە شتەکە لەو کاتەدا، تەنیا قسەیەک بووە و کراوە و هێشتا هیچ شتێک دیار نییە و نەبڕاوەتەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش، ئەم ڕووداوە نیگەرانی و پەریشانییەکی تەواوی خستە ژیان و دڵ و دەروونی ناستاسیا فیلیپوڤناوە. یەکسەر و کوتوپڕ، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو خۆی نواند و سەلماندی کە کەسێکی بە ئیرادە و ورە پۆڵایینە، بێ دوو دڵی گوندە چکۆلەکەی جێ هێشت و بە تاقی تەنیا بەرە و پترسبۆرگ کەوتە ڕێ و خۆی گەیاندە ماڵی توتسکی.

توتسکی غافڵگیر بوو، سەری سوور ما، ویستی مەسەلەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە و هەنجەتان بۆ خۆی دابتاشێت: بەڵام هەر لە یەکەم وشەوە پەیی بەوە برد کە دەبێ بە تەواوەتی جۆری قسەکردنەکەی، سەدای دەنگی و بابەتی قسەکەی کە تا ئەو کاتە زۆر سەرکەوتوو بوو، بگۆڕێت، دەبێ لۆژیکی خۆی بگۆڕێت، دەبێ هەموو شتێک بگۆڕێت، هەموو شتێک! ئێستا ڕووبەڕووی ئافرەتێک بوو هەرگیز ئەو ئافرەتە نەبوو کە تا پێشتر دەیناسی و لە مانگی تەمووزی ڕابردووا لە گوندی (ئوترادونی) جێی هێشتبوو.

هەر لە ڕێوە ئەوە ڕوون بووەوە کە ئەم ئافرەتە تازەیە، زۆر شتان دەزانێ و تێدەگات، ئەوەندەی دەزانی پیاو ناچار بێ لە خۆی بپرسێت ئەم هەموو شتە لەکوێوە فێر بووە، چۆن توانیویەتی ئەم بۆچوونە ڕوون و ڕەوانانە پەیدا بکات. ئایا سەرچاوەی ئەم هەموو زانیارییانە کتێبخانەکەی بوو کە تایبەت بوو بە کیژان؟ سەرباری ئەمەش شارەزاییەکی باشی لە پرسە دادڤانی و مافەوانییەکاندا هەبوو، ئەگەرچی ئەزموونی ژیانی کەم

بوو، لێ تەسەورێکی ڕوون و خویای لەمەڕ هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی و جڤاکی هەبوو، دەیزانی هەندێ بویەر و ڕووداوان چۆن دەچنە ڕێوە و بنجوبناوانیان لەکوێیە. ئەمە جگە لەوەی کە تەبیعەتی بە تەواوەتی گۆڕابوو. وەکو جاران نەمابوو. ئەو شەرم و ترسەی جارانی نەمابوو، ئیدی ئەو ڕۆژگار و سەردەمە بەسەر چووبوو کە وەکو کیژە مەکتەبلیانی بێئەزموون بترسێت و شەرم بکات، ئیدی ئەو کیژە ساکار و سادە و لاسار و خەیاڵاوییە نەبوو کە بە باڵی خەیاڵ بفڕێت و هەندێ جار بەدەم خەم و پەژارە و ترسەوە، بە چاوانی درشتی بێمتمانەوە بکەوێتە ڕوندکڕشتن.

نا، توتسکی نها، ڕووبەڕووی ئافرەتێک بوو هەرگیز بەم شێوەیەی تەسەور و وێنا نەکردبوو، ئافرەتێکی سەیر، پڕ بە زار پێدەکەنێ، قاقا لێدەدا، زماندرێژ، چەنەباز، دەمڕێژی تەوس و توانجی بەسەردا دەبارێنێ، ئافرەتێک کە ڕووبەڕوو، بە ڕاشکاوی پێی ڕادەگەیەنێ، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان جگە لە هەستی بێزاری و ڕقی قووڵ، هیچ هەستێکی تری دەربارەی نەبووە، هەستێک کە هەندێ جار گەیشتووەتە ئەو ڕادەی کە قێزی لێ بکاتەوە و دڵی لێی تێک هەڵبێت، ئەم هەستی قێزهاتنەوەیە، دوای تەواو بوونی یەکەم هەستی سەرسامی، یەکسەر دڵ و دەروونی پڕ کرد.

ئەم ئافرەتە تازەیە، پێی ڕادەگەیەنێت، بەلایەوە گرینگ نییە، هەر ژنێک دێنێ، لەگەڵ هەر کەسێکدا زەماوەند دەکات، بەڵام وێڕای ئەوەش، بە نیازی شەڕ هاتووە، بۆ ئەوە هاتووە نەیەڵێت ئەم زەماوەندە سەر بگرێت، لێبڕاوە لە ڕووی کینە کێشییەوە و هەر بۆ کەیفی دڵی خۆی، نەیەڵێت ئەم زەماوەندە سەر بگرێت، چونکە لە کانگای دڵەوە ئەم کارەی پێ خۆشە و دەبێ بەدەم بانگی ئەم نەخۆشییە دەروونییەوە بێت. پێی گوت: "بەڵێ، بۆ ئەوەی پڕ بە دڵ پێت پێبکەنم، پێت ڕابوێرم، چونکە ئیدی نۆرەی پێکەنینی منە ".

ئەوەی گوتی، هەموو ئەو شتە نەبوو کە لە زەین و دڵیا بوو، ئەوەی لە زەین و دڵیا بوو بەو ئاسانییە نەدەهاتە دەربڕین، بەڵام هەر باش بوو، بەلای کەمەوە نیاز و نیەتی خۆی بەو شێوەیە دەربڕی. لەو کاتەدا کە





ناستاسیا فیلیپوڤنای تازە، بە دەنگی بەرز پێدەکەنی و هەڵوێستی خۆی دەنواند، بیروبۆچوونەکانی خۆی هەڵدەڕشت، بەڵگە و بیانووی دێنایەوە، ئافاناسی ئیڤنانوفیچ توتسکی، لە دڵی خۆیدا، مەسەلە و هەڵوێستەکەی تاوتوێ دەکرد، بە هەموو توانایەکی خۆیەوە هەوڵی دەدا جۆرە نەزمێک بە بیرە پەریشانەکانی خۆی ببەخشێت. ئەم حاڵەتە ماوەیەکی درێژی خایاند، توتسکی نزیکەی دوو هەفتەی بە بیرکردنەوە لەم مەسەلەیە، بردە سەر، ئەوجا عەزمی جەزم کرد و بڕیاری خۆی دا.

دەبێ لێرەدا ئەوە بگوترێ کە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، لەو سەروبەندەدا لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، پیاوێکی سەنگین و بەشەخسیەت بوو، پێگە و ناوبانگێکی کۆمەڵایەتیی بەهێز و پایەداری هەبوو، پیاوی ناو کۆمەڵگەی پێشکەوتوو بوو. زۆر قەدری خۆی دەگرت، وەکو هەر پیاوێکی دی کە لەو پایەبەرزەدا بێت، لە دنیادا، خۆی و ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی خۆی لە هەموو شتێکی دی پتر خۆش دەویست!... بۆیە هەر بشێوی و ئاژاوەیەک، هەر کۆسپ و تەگەرەیەک، ئەو نەزم و نیزامەی کە عەمرێکی تیا سەرف کردبوو، بشێوانایە، قەبووڵی نەدەکرد. بۆیە توتسکی، بە حوکمی ئەزموونی دەوڵەمەند و دووربینی و دروستی فام و بۆچوونەکانی خۆی پەی بەوە برد کە حاڵی حازر سەروکاری دەگەڵ ئافرەتێکی نائاساییدایە، ئافرەتێکی بێباک و بێپەروا، کە هەموو کاتێ ئامادەیە هەڕەشەکانی خۆی جێبەجێ بکات، بە تایبەتی کە لەم دنیایەدا دڵبەندی هیچ شتێک نییە و هیچ تەماحێک لە خشتەی نابات. نا، نا! ئاشکرایە ئەمە شتێکی دییە، شتێکی زۆر جیاوازە! لێرەدا تێکەڵاوییەکی ئەقڵی و سووکە یاخیبوون و توڕەییەکی ڕۆمانتیکیی هەیە، نە هۆیەکی ئاشکرای هەیە و نە بابەتێکی دیاریکراو. نەفرەت و ڕقێکی لە دامرکانەوە نەهاتوو و بێسنوور لەئارادایە، بەڵێ،... شتێک لەئارادایە... شتێکی زۆر سەخیف و ناپەسند، شتێکی ناجۆر، نابەجێ و ناپەسند کە مەحاڵە لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا قەبووڵ بکرێت، شتێک کە سەبارەت بە پیاوێکی ئابڕوومەندی سەنگینی جوامێر و دڵاوا، بە کارەسات و بەڵای خوا دێتە ژماردن.

هەڵبەتە توتسکی، دەیتوانی بە زەبری سەروەت و سامان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی، زۆر بەئاسانی و لە رێگەی کاریکی ژێراو ژێری چکولەوە خۆی لەم وردەکێشە و ئاستەنگانە رزگار بکات. لەلایەکی دیکەشەوە، پڕ خویا و ئاشکرا بوو کە ناستاسیا فیلیپوڤناش، لە رووی یاساییەوە لەو ئاستەدا نەبوو بتوانێ هیچ ئاسیو و زەرەرێکی پێ بگەیەنێت، تەنانەت نەیدەتوانی لە پترسبۆرگدا، ریسواییەکی چکۆلەشی بۆ دروست بکات، چونکە ئافاناسی ئیڤانوفیچ دەیتوانی بەئاسانی جڵەوی بگرێت، بەڵام هەر هەموو ئەمانەوەختێ وا دەر دەچوو ئەگەر ناستاسیا فیلیپوڤنا، وەکو هەر خەڵکێکی دی لەو جۆرە بوارانەدا رەفتاری کردبا، لە رێسای باو لای نەدابا، بەڵام دووربینی و زیرەکی و هوشیاریی توتسکی فریای کەوت و توانیی پەی بەوە ببات کە ناستاسیا فیلیپوڤنا بە خۆی دەزانێت کە لە رووی یاسایی و دادڤانییەوە باری ئەو نابات، بەڵام بە چاوەکانیا، بە پرشنگی نیگاکانیا، ئەوە دیار بوو کە شتێکی دیکەی لە زەین و بیردایە. ناستاسیافیلیپۆڤنا بایەخی بە هیچ شتێک نەدەدا، هیچ شتێکی بەلاوە گرینگ نەبوو، تەنانەت دەربەستی چارەنووسی خۆشی نەبوو. (بۆ کەسێکی بەگومان و بێنەزاکەتی دنیاپەرستی وەکو توتسکی، زەروو‌ری بوو ئەوەندە زیرەک و دووربین بێت کە لەو دەمەدا پەی بەوە بەرێت کە ناستاسیا دەمێکە دەستی لە خۆی بەر داوە و دەربەستی چارەنووسی خۆی نییە و ئەم شتەشی بە جیددییە نەک بە گاڵتە) جا ناستاسیا فیلیپوڤنا چونکە دەستی لە خۆی بەردابوو و تەنانەت دەربەستی چارەنووسی خۆیشی نەبوو، ئامادە بوو خۆی بە ئاو و ئاگرا بدات، خۆی لەناو بەرێت، ئەگەر پێویست بکات بخرێتە زندان و رەهەنەی تاراوگەی سیبریاش بکرێت، تەنیا لەبەر ئەوەی سووکایەتی بەو پیاوە بکات کە لەڕادەبەدەر، رقی لێی بوو، رقێک کە لە توانای بەشەر بەدەر بوو، چونکە زۆری لەزەت لە ئیهانەکردن و ئازاردانی ئەو پیاوە دەبینی.

ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی، قەت رۆژێ لە رۆژان ئەوەی نەشاردبووە کە پیاوێکی ترسنۆک، یان با بڵێین محافەزەکارە. بۆیە کەوێنای ئەوەی

دەکرد لە بەر پەرستگەیەکدا بێتە کوشتن، یان بە بەرچاوی خەڵکییەوە، پێشهاتێکی دیکەی لەو بابەتەی بێتە ڕێ، پێشهاتێکی نابەجێ و حەیابەرە، زۆر دەترسا، بەڵام خەمی ئەوەی نەبوو بکوژرێ، یان بریندار بکرێت، یان بە بەرچاوی خەڵکییەوە تف بکرێتە چارەی یان هەر پێشهاتێکی دیکەی لەو جۆرەی بێتە ڕێ، بەڵکو زیاتر خەمی چۆنیەتی ئەو جۆرە ڕووداوانەی بوو کە بە شێوەیەکی نائاسایی و ناشایستە بەرۆکی بگرن و لەنێو خەڵکیدا حەیای بچێت... جال ناستاسیا فیلیپوڤناش دەقاودەق هەمان شتی دابووە چاو، هەرچەندە تا نها ڕاستەوخۆ ئەو هەڕەشەیەی لێ نەکردبوو. توتسکی، دەیزانی کە ناستاسیا دەماری دەناسێت و دەتوانێت جەزرەبەی کاری و کوشندەی لێ بدات. بۆیە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، لە مەسەلەی زەماوەندەکەی کە هێشتا هەر لە قۆناغی قسەی ڕووتا بوو، ژێوان بووەوە، ملی بۆ چارەنووس دا، لەهەنبەر ناستاسیا فیلیپوڤنادا کۆڵی دا.

شتێکی دیکەش کە زەمینەی بۆ ئەم بڕیارە خۆش کرد و کردیە کارێک بتوانێ بەئاسانی ئەم بڕیارە بدات، ئەوە بوو کە ناستاسیا فیلیپوڤنای تازە، ناستاسیاکەی جاران نەبوو، یەجگار جیاواز بوون، تەنانەت لە ڕووی بەدەنیشەوە... جاران کیژۆڵەیەکی یەجگار خشیک و جوان بوو، بەڵام ئێستا... هەیهو!... توتسکی هەرچیی دەکرد و دەکۆشا نەیدەتوانی لە خۆی ببورێ، کە ماوەیەکی دووردرێژ، چوار ساڵی ڕەبەق تەمەشای کردبوو، نەیتوانیبوو جوانی و شۆخیی ئەو ببینێ و کەشف بکات! دروستە کە گۆڕانێکی کوتوپڕ، لە پەیوەندی نێوان هەر دوو لای هاوکێشەکەدا چێ بووبوو. توتسکی لە فکران ڕاچوو، ئەو ساتە تایبەتیانەی وەبیر هێنایەوە کە بەدەم بیرۆکەی غەریبەوە دەیڕوانییە چاوەکانی ناستاسیا، جۆرە نهێنییەکی گۆنگی لە ناخی نیگایدا بەدی دەکرد کە نەیدەزانی چییە! نیگای ڕاستەوخۆ لەسەر ئەم لەنگەری دەگرت، لە تۆ وایە دەیەوێ لەگەز یان مەتەڵ یان تەلسیمێکی لێ دابێنێ، لەم دوو ساڵەی دواییدا، زۆر جار گۆڕانی ڕەنگ و ڕووی ناستاسیا فیلیپوڤنا، سەرنجی ڕاکێشابوو: ڕاستە هەندێ جار ڕەنگی بە تەواوەتی زەرد هەڵدەگەڕا، بەڵام ئەمەی زۆر لێ دەهات، هێندەی دی

جوانی دەکرد.

توتسکی، وەکو زۆربەی ئەو پیرەمێرانەی کە خەریکی ڕابواردن و خوشگوزەرانین، جاران بە چاوی سووکەوە دەیڕوانییە ئەم کیژە سادە و ساکار و بێ ئەزموونەی کە بەو ئاسانییە کەوتبووە دەستی، بەڵام لەو ماوانەی دواییەدا، ڕەئی خۆی کەمێک گۆڕی. بەهەرحاڵ لە بەهاری ڕابردووەوە کەوتبووە بیری ئەوەی جیازییەکی شایستە بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا تەرخان بکات و بەپەلە بیدات بە فەرمانبەرێکی بەڕێزو دڵفراوان و بیرکراوەی دەوڵەتی، کە لە شارێکی دی کاری دەکرد (مەگەر هەر خوا بزانێ کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئێستا بە چ تەوس و توانجێکەوە ئەمەی بە ڕوودا دەدایەوە! چ گاڵتەیەکی پێ دەکرد!).

بەڵام ئافاناسی ئیڤانوفیچ، ئەم هەڵوێستە تازەیەی بە هەل زانی، لە دڵی خۆیدا گوتی دەتوانێ، جارێکی دیکە سوود لەم ئافرەتە گەنجە ببینێ و بە قازانجی خۆی بەکاری بێنێ، بڕیاری دا کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە پترسبۆرگدا ئاکنجی بکات و هەموو پێویستییەکی ژیانی ئەرستۆکراتییانەی بۆ فەراهەم بکات. ئیدی دەیتوانی بۆ هەندێ کۆڕ و مەجلیسانی بەرێت و خۆی پێوە با بدات کە ئافرەتێکی ئاوهای بەدەست هێناوە، هەڵبەتە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، هەر بۆ خۆنواندن و خۆهەڵکێشان و ناوبانگ، زۆری بایەخ بەم جۆرە کارانە دەدا.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، پێنج ساڵ بوو لە پترسبۆرگ دەژیا، هەڵبەتە لەم ماوەیەدا زۆر شت گۆڕابوو. وەزع و حاڵی ئافاناسی ئیڤانوفیچ باش نەبوو. لە هەموو شت خراتر ئەوە بوو کە ترسێکی نادیاری کەوتبووە دڵ، بە ئامان و زامان لە دڵی دەرنەدەچوو. دەترسا – بەبێ ئەوەی بزانێ هۆیەکەی چییە و لەکێ دەترسێت- هەموو ترسێکی ئەو لە ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو. ماوەیەک، یانی لە زەرفی دوو ساڵی یەکەمدا، وای زەن دەبرد، کە ناستاسیا لە هەوڵی ئەوەدایە شووی پێ بکات، بەڵام لەبەر ڕوحزلی و فرناخی خۆی قسان ناکات و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی پێشنیازی ئەوە، کە تەسەورێکی غەریب و سەیر بوو! . ئیدی بەرەبەرە

گومان و ترسی توتسکی دایە زیادی. کە بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، بروکانی دێنایەوە یەک و چارەی گرژ دەبوو، جۆرەها بیر و بیرەوەریی ناخۆش لە مێشکیدا دەخولایەوە. تا ڕۆژێک، لەناکاویکا و بە هۆی پێشهاتێکی تایبەتییەوە، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر خوازبێنییشی بکات، ڕەفزی دەکات و شووی پێ ناکات، ئەمەی زۆر پێ سەیر بوو، وەکو پێویست سەری لێ دەر نەدەکرد، هەستی بە داخ و کەسەرێکی زۆر کرد (ئیدی ئەوە دڵی بەشەرە!) دوای ماوەیەکی زۆر، ئەوجا پەیی بەو ڕاستییە برد.

هەرچی سەری هێنا و سەری برد تەنیا یەک تەفسیری بەلاوە ماقوول بوو، ئەویش ئەوە بوو کە فرناخی و ڕوحزلی " ئەم ئافرەتە سەرکێش و خەیاڵپەروەرە" گەیشتووەتە ئاستێک، زیاتر لەزەت لە ڕەفزکردن و بوغزاندنی ئەو وەر دەگرێت، تا لەزەت لەو پێگە و پایە کۆمەڵایەتییە بدینێ کە بە خەویش بە خەیاڵیا نەدەهات.

ئەوەی لە هەموو شتێک خراتر بوو، ئەوە بوو کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەرەبەرە داشی سوارتر دەبوو. هیچ تەماحێکی مادی، چەندیش گەورەبوایە، لە خشتەی نەدەبرد، هەرچەند ئەو ژیانە ئەرستۆکراتییانەی قەبووڵ بوو کە بۆی فەراهەم کرابوو، بەڵام زۆر خاکیانە دەژیا، بە درێژایی ئەم پێنج ساڵە هیچ پارەوپولێکی پاشەکەوت نەکردبوو.

ئافاناسی ئیڤانوفیچ، نەخشە و فێڵێکی زۆر جوان و ناسکی دانا بوو تا کۆت و زنجیرەکانی بپچڕێت، ژێراو ژێر و بە کۆمەکی خەڵکانی زیرەک و کارامە، کۆمەڵێک چەشەی گەورە و نموونەیی بۆ دانابوو تا تەماح بیگرێت و بێتە ڕەدا، بەڵام بێهودە، نە میر و میرزادە، نە ئەفسەرانی سوپای سوارە، نە سکرتێری سەفارەتخانان، نە شاعیران و نە ڕۆماننووسان، نە سوسیالیستانیش نەیانبزواند و زەڕەیەک کاریان تێ نەکرد. وەکو بڵێی دڵی لە بەرد بێ و هیچ هەست و سۆزێکی تێدا نەبێت و بە یەکجارەکی وشکی کردبێت و مردبێت.

ناستاسیا، زۆربەی کات بە تەنیا دەژیا، نیمچە گۆشەگیر بوو، کتێبانی





دەخوێندەوە، موتالای دەکرد و زۆربەی کاتی خۆی بە مۆسیقاوە دەبردە سەر، پەیوەندیی دەگەڵ خەڵکیدا کەم و سنووردار بوو، پەیوەندیی دەگەڵ هەندێ ژنە فەرمانبەری پیری سەیر و سەخیفدا هەبوو.

دوو ژنی ئەکتەری دەناسی، ژمارەیەک پیرەژنی بەویقاریشی دەناسی، هاتوچۆی ماڵی مامۆستایەکی سەرەتایی بەتەمەنی دەکرد. ئەم مامۆستایە پیاوێکی باش بوو، ڕەشە خێزانێکی بە ملەوە بوو. ئەندامانی ئەم خێزانە ناستاسیایان زۆر خۆش دەویست و بەگەرمی و خۆشی پێشوازییان دەکرد. زۆر جار، شەوانە تەنیا پێنج یان شەش کەس لە ئاشناکانی خۆی لە ماڵەکەیدا کۆ دەبوونەوە، توتسکی میوانی هەمیشەیی بوو لەو دواییانەشدا، جەنەراڵ یەپانچین، دوای زەحمەتێکی زۆر، توانیبووی تەعاروف دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا بکات و پێی بۆ ماڵەکەی وی بکرێتەوە. هەروەها لە هەمان کاتدا، فەرمانبەرێکی چکۆلەی دەوڵەتی گەنج، بە نێوی فردیش چینکۆ بە بێ هیچ زەحمەتێک ئاشنایی دەگەڵدا پەیدا بکات، ئەمە لیبۆکێکی سەرسەری و بەدناو و تەعلیقباز و مەیخۆر بوو. ناستاسیا، ئاشنایەکی دیکەشی هەبوو بە ناوی پتیتسن، ئەمە گەنجێکی سەیر بوو، پیاوێک بوو سەنگین، خاکی و پۆشتەوپەرداخ، لە هەژارییەوە پێ گەیشتبوو، بووبوو بە سووتخۆر. سەرەنجامیش ئاشنایی دەگەڵ گاڤریلا ئاردالیونوفیچدا پەیدا کردبوو.

هەڵبەتە هەر هەموو ئەمانە ناو و شۆڕەتێکی سەیریان بۆ ناستاسیا فیلپوڤنا پەیدا کردبوو. جوانییەکەی بووبووە داستان و کەوتبووە سەرزاری هەموو خەڵکی، بەڵام هەر ئەوەندە بوو و تەواو، هیچ شتێکی تری بەدواوە نەبوو. کەس حەدی نەبوو بتوانێ بڵێ پێی خوار داناوە. یان خۆی گەیاندووەتێ. ئەم ناوبانگە پاکەی ناستاسیا، خوێنەوارییەکەی، جوانیەکەی، زیرەکیەکەی کردیانە کارێک کە ئاڤاناسی ئیڤانوفیچ، دوا نەخشەی خۆی بکێشێت. ئەم نەخشەیە دەمانگەیەنێتە قۆناغێک کە جەنەراڵ یەپانچین لەو قۆناغەدا ڕۆڵێکی کارا و کاریگەر لە چیرۆکەکەماندا دەبینێ.

کاتێ توتسکی، بەوپەڕی ئەدەب و نەزاکەتەوە، داوای لە جەنەراڵ

یەپانچینی دۆستی کرد کە دۆستانە وەڵامی بداتەوە کە ڕەئی چییە خوازگاری یەکێک لە کیژەکانی بکات، بەوپەڕی ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی گرێی دڵی خۆی بۆ کردەوەو، گوتی لێبڕاوە لەپێناوی ئازادیی خۆیدا، هەر ڕێگەیەک بگرێتە بەر و هەر کۆسپێک تەخت بکات. ئەگەر ناستاسیا فیلیپوڤناش بەڵێنی بداتێ کە لە ئاییندەدا هیچ کێشەیەکی بۆ دروست ناکات، باوەڕ ناکات، چونکە قسە و بەڵێن بە تەنیا بەس نییە و زەمانەتی تەواوی دەوێ. ئەم جووتە پیاوە، مەسەلەکەیان تاوتوێ کرد، قسەیان لێ کرد و ڕێکەوتن هەوڵەکانیان یەک بخەن و بڕیاریان دا پێکەوە کار بکەن.

ڕێک کەوتن، لە سەرەتاوە لە بارترین و نەرمترین و ناسکترین شێواز بەکار بەرن، وەک دەڵێن لە دەرگای دڵەوە بۆی بچنە ژوورەوە و لە مرۆڤانەترین ژێی دەروون بدەن. بە دوو قۆڵی بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا چوون. توتسکی هەر لە ڕێوە کەوتە سەرزەنشتی خۆی، هەرچی درێغی و قسوورییەک هەبوو گرتیە ئەستۆی خۆی و دانی بەوەدا نا کە لەو ڕەفتار و خەتایەی یەکەمی بەرانبەر بەو، زۆر پەشیمانە و چی بکات، چونکە پیاوێکی شەهوانی و هەوەسباز و بێ سەروبەر بووە، تاوی سەری داویە لەبەری و خۆی پێ زەوت نەکراوە. ئێستاش بەتەمایە ژن بێنێ و چارەنووسی ئەم کاری خێرە لەدەستی ئەودایە، ئیدی پەنای بۆ ئەو هێناوە و خۆی خستووەتە بەختی ئەو و ئەویش خۆی و شیر و شەهامەتی. ئەوسا نۆرە هاتە سەر جەنەراڵ یەپانچین و وەکو باوکێک و باوکانە کەوتە قسان و قسەکانی زۆر سەنگین و ماقوول و لۆژیکی و دوور لە هەر سۆزبزوێنی یەک بوو. ناستاسیای دڵنیا کردەوە کە هەقی خۆیەتی چارەنووسی ئافاناسی ئیڤانوفیچ دیاری بکات و جگە لەو کەسی دی ئەو مافەی نییە، بەدەم ئەو قسانەوە و بە نمایشێکی زیرەکانەی پڕ لە داماوی و بەلەنگازییەوە، ئەوەی دا بە گوێیدا کە چارەنووسی ئەم کچەی و ڕەنگە هیی دوو کچەکەی دیکەشی بەندبێت بە بڕیاری ئەوەوە. کاتێ ناستاسیا فیلیپوڤنا پرسی کە: "دەقاودەق چییان لەو دەوێ؟" توتسکی بە هەمان ڕاستگۆییەوە گوتی کە لەوەتای پێنج ساڵە، بە جۆرێکی ترساندووە، کە تا

دەکات، چونکە ئەم وەزع و حاڵەی ئێستا جگە لە مەرگی ئەو بەهرە و توانا پرشنگدارەی کە لە ناستاسیادا هەیە، جگە لە خەم و نائومێدی، جگە لە جۆرە خەیاڵپەروەرییەکی بێهودە هیچی دیکەی لێ شین نابێت و ئەمەش هەرگیز دەگەڵ هۆش و دڵپاکیی ناستاسیا فیلیپوڤنادا تێک ناکاتەوە.

پاش ئەوەی توتسکی جارێکی دی دووپاتی کردەوە کە قسەکردن لەم بارەیەوە بۆ وی لە هەموو کەسێکی دی ئەستەمترە، بەمە کۆتایی بە قسەکەی هێنا کە ئومێدەوارە ناستاسیا فیلیپوڤنا، دەستبەرداری بوغز و ڕق ببێت و بۆ ئەوەی ژیانی خۆی دابین بکات، ئەم ئارەزووە ڕاستەقینەیەی وی، کە لێبڕاوە بڕی هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵی بداتێ، ڕەفز نەکاتەوە و بەدەم ئەو قسەیەوە ئەوەشی گوت کە ئەم بڕە پارەیەی لە وەسێتنامەکەیدا بۆ ناستاسیا تەرخان کردووە و پێویست ناکات بە قەرەبوو یان بە جۆرە باجێکی لێک بداتەوە... ئیدی بۆچی نابێ ئەم ئارەزووە مرۆڤانییەی ئەو لەپێناوی ئاسوودەیی ویژداندا بێتە دی و عەفوو بکرێت.

بە کورتی و کرمانجی ئافاناسی ئیڤانوفیچ، هەر قسەیەک بۆ ئەو جۆرە مەجلیس و حاڵەتە لەبار بوو، کردی. ئافاناسی ئیڤانوفیچ بۆ ماوەیەکی زۆر بەوپەڕی فەساحەت و بەلاغەتەوە قسەی کرد و بەدەم قسانەوە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد — هەڵبەتە ئەمە شتێکی یەجگار گرینگە - کە ئەمە یەکەم جارە باسی ئەو هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵە دەکات و تاکو هەنوکە کەس بەمەی نەزانیوە، تەنانەت ئیڤان فیدرورفیچش کە لێرە دانیشووە، پێی نەزانیوە.

وەڵامی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەم جووتە دۆستەی سەرسام کرد. دەتگوت ئەو بەشەرەی جاران نییە، زمانێکی نەرم، دوور لە تەوس و توانج، دژمنایەتی و بوغز و ڕکونی، وژار خەنەکەی جاران، کە توتسکی زۆری لێ دەترسا و کە بیری دەکەوتەوە موچوڕکەی پێدا دەهات، لە حەوت کێوان ئاوا بووبوو. بە پێچەوانەوە لە تۆ وایە خۆشحاڵە بەوەی کە ئەنجام توانیویەتی بەڕاشکاوی و بێپەردە و دۆستانە، دەگەڵ کەسێکدا گفتوگۆ بکات. دانی بەوەدا نا کە دەمێ بووە بە ئاواتی گفتوگۆیەکی دۆستانە بووە، بە ئاواتی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکی دۆستانە بووە، بەلام غروور و





فرناخی ڕێی نەداوە تا هەنوکە داوای ئامۆژگاری بکات، جا ئێستا کە پەردەکان لاکەوتوون و ئەم دەرفەتە ڕەخساوە، زۆری پێ خۆشە و مردوو لەوەی پاکتر ناشۆردرێت. ناستاسیا فیلیپوڤنا، هەوەڵ جار بەدەم بزەیەکی خەمین و ئەوجا بەدەم قاقایەکی شادی و شەیتانانەوە گوتی کە جارێکی دی تووڕەیی و سەرکێشییەکانی جارانی دووبارە نابێتەوە و لەمێژە ڕاوبۆچوونی دەربارەی زۆر شتان گۆڕاوە و هەرچەندە دڵی نەگۆڕاوە، بەڵام چاری ناچارە دەبێ ئیعتراف بە ئەمری واقیع بکات، خۆی دەگەڵ واقیعدا بسازێنێ، ئەوەی بوو، بوو. تفێک ڕۆکرا هەڵناگیرێتەوە، ئەوەی چوو، چوو و ناگەڕێتەوە، پێی سەیرە کە بۆچی دەبێ ئافاناسی تا نها لەو بترسێت، ئەوجا بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە ڕووی کردە ئیڤان فیدوروفیچ و گوتی: زۆر شتی دەربارەی کیژەکانی وی بیستووە و لەمێژە دەیانناسێت و ڕێز و حورمەتی زۆری بۆیان هەیە. زۆری پێ خۆشە و سەرفراز دەبێت ئەگەر بتوانێت خزمەتێکیان بکات.

دروستە کە لەو سەروبەندەدا ژیانی زۆر تاریک و دژوار بوو، ئەوپەڕی تاریک و سەخت. دیار بوو ئافاناسی ئیڤانوفیچ، توانیبووی نیاز و ئارەزووەکانی وی بخوێنێتەوە. بەڵێ، چونکە ئەو حەز دەکات بەگوێرەی واقیع و لە چوارچێوەی مەبەست و ئامانجێکی تازەدا، بژێتەوە، خۆی تازە بکاتەوە، با بە ئەشقیشەوە نەبێت، بەڵام لە باوەشی خێزانی خۆیدا بێت، بەڵام وێڕای ئەوەش ناتوانێ هیچ شتێک دەربارەی مەسەلەکەی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بڵێت. ڕاستە پێدەچێت ئەشقی وی دەرهەق بە ناستاسیا ئەشقێکی ڕاستەقینە بێت و هەست دەکات کە ئەگەر لە خۆشەویستی پایەداری گاڤریلا دڵنیا ببێت ئەوا لەگینە ئەمیش ئەوی خۆشی بوێت. جا گریمان گاڤریلا ڕاست دەکات، بە ڕاستیەتی، بەڵام هێشتا منداڵە، لەوە گەنجترە بتوانێ بەئاسانی بڕیاری خۆی بدات. بەهەرحاڵ ئەوەی کە ناستاسیا، لە گاڤریلادا بە دڵیەتی، ئەوەیە کە کاردەکات، بە ڕەنجی شان هەموو خێزان و خانەوادەکەیان دەژێنێ. بیستوویەتی کە گەنجێکی ئیشکەر و چالاکە، نەفس بەرزە، فڕناخە، حەز دەکات لە ژیانا پێش بکەوێ. هەروەها





بیستوویەتی کە دایکی، نینا ئالکساندەرۆڤنا ئیڤوگلینا، خانمێکی زۆر سەلار و سەنگین و بەڕێزە، (ڤارڤارا ئاردالیونوفیچ)ی خوشکیشی خانمێکی ئابڕوومەند و چالاکە. پتیتسن زۆر باسی ئەوانی بۆ کردووە و زانیویەتی کە خێزانێکی کۆشیار و زەحمەتکێش و کۆڵنەدەرن، حەز دەکات ئەم خێزانە بناسێت، بەڵام دڵنیا نییە کە ئاخۆ ئەم خانەوادەیە ئەو قەبووڵ دەکەن، پێشوازیی دەکەن.

بە کورتیەکەی، بیرۆکەی ئەم زەماوەندەی بەلاوە نابەجێ نەبوو، نەیدەگوت مەحاڵە، بەڵام وێڕای ئەوەش دەبوایە بەوردی بیری لێ بکاتەوە، بۆیە نەیدەویست پەلە بکات یان پەلەی لێ بکرێت. سەبارەت بە هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکەش، ئافاناسی ئیڤانوفیچ، هەق نییە بە باسکردنی ئیحراج بێ، چونکە ناستاسیا، بایەخی پارەی دەزانی و پێویستی بە پارە هەبوو، بۆیە بە خۆشحاڵییەوە ئەو دیارییەی قەبووڵ دەکرد. سوپاسی ئافاناسی ئیڤانوڤیچی کرد، کە کەسێکی بە نەزاکەت و هەستناسک و سرڤاییم بووە و ئەم مەسەلەیەی تەنانەت لەلای جەنەراڵ و گاڤریلا ئاردالیونوفیچش نەدرکاندووە، بەڵام پرسیار ئەوە بوو بۆچی گاڤریلاش پێشوەختە بەمە نەزانێ، بۆ لێی بشاردرێتەوە؟ خۆ ئەگەر ببێت بە یەکێک لەو خێزانە، هیچ شەرمێکی لەو پارەیە نییە، ئەو پارەیە بۆ ئەو مایەی شەرمەزاری نییە، مکووڕ بوو ئەوە بزانرێ کە بە نیاز نییە، دەربارەی هیچ شتێک عوزرخوایی بۆ هیچ کەسێک بێنێتەوە. ئامادە نییە شوو بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بکات، تا دڵنیا نەبێت کە خۆی و خانەوادەکەی هیچ بیروبۆچوونێکی خراپیان دەربارەی نییە. هەست ناکات لە هیچ ڕوویەکەوە و لە هیچ شتێکدا خەتابار یان تاوانبار بێت، هەروەها حەز دەکات گاڤریلا ئاردالیونوفیچ لە هەلومەرج و ژیانی خۆی لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەی ڕابردوودا، لە پترسبۆرگ ئاگادار بکاتەوە، پەیوەندییەکانی خۆی و (ئافاناسی ئیڤانۆفیچ)ی بۆ باس بکات، بڕی ئەو سەروەت و سامانەی - ئەگەر سەروەت و سامانێکی هەبێت - پێ بڵێ کە توانیویەتی بەدەستی بێنێ و پاشەکەوتی بکات. ئەو هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەش وەر بگرێت، لە بری ئەوەوەریناگرێت کە لە کچێنی خستووە و

فەساتی کردووە، بەڵکو باجی ئەوەیە کە ژیانی داغان کردووە.

هێندە بە جددی و هەڵچوونەوە باسی هەموو ئەو شتانەی دەکرد – کە هەڵبەتە زۆریش ئاسایی بوو- کە جەنەراڵ یەپانچین، هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر کرد و گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە مەسەلەکە بڕاوەتەوە و کۆتایی پێ هاتووە.

بەڵام توتسکی مارانگەستە، شەرمەزارو تەریق، وەکو پێویست باوەڕی نەدەکرد و هێشتا دەترسا، ئەم گوڵزارە هەژدیهایەکی لە ژێردا بێت. بەهەرحاڵ گفتوگۆی نێوان دۆستان دەستی پێ کردبوو، مەسەلەی ڕازی بوونی ناستاسیا فیلیپۆڤنا بە ڤیانی گانیا، بەرەبەرە ڕوونتر و ئاشکراتر دەبوو، بە جۆرێ دەچووە پێشێ کە هەندێ جار خودی توتسکی دەگەیشتە ئەو قەناعەتەی کە کارەکە سەر دەگرێت. لەو ماوەیەدا ناستاسیا فیلیپوڤنا و گانیا چەند قسەیەکی کەمیان کرد، لەوە دەچوو ناستاسیا لەبەر شەرم و حەیا زۆر درێژەی نەداتێ، بەڵام وێڕای ئەوەش ڕەزامەندییەکی دەر بڕی و بۆرە بەڵێنێکی دایە، بەڵام دووپاتی کردەوە کە ئەمە پەیمانی یەکجارەکی نییە و هەقی ئەوەی هەیە تا ئەو ڕۆژەی زەماوەندەکە سەر دەگرێت – ئەگەر لە بنەڕەتدا سەر بگرێت - ڕەفزی بکات. هەڵبەتە هەمان ئازادی و هەقی بە گانیاش دا.

دوای ماوەیەکی زۆر کەم، گانیا، بە ڕێکەوت، ئەوەی بۆ دەر کەوت کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، زۆر چاک دەیزانی ماڵبات و خانەوادەکەی گانیا نە بەم زەماوەندە ڕازین و نە بە ناستاسیاش ڕازین، ئەم هەواڵەش لە ئەنجامی دەمەقاڵە و قەرقەشەی بەردەوامی وانەوە دزەی کردبوو، ناستاسیا فیلیپوڤنا هەموو ئەمەی دەزانی و ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەمەی بە چاوی گانیادا نەدایەوە، لە کاتێکا گانیا هەموو ڕۆژێ چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بیداتەوە بە ڕوویا.

هەڵبەتە دەکرێت زۆر حیکایەتی دیکە دەربارەی وەزع و حاڵ و زروفی ئەم پرۆژەی زەماوەندە و گفتوگۆکانی نێوان جووتە دۆست، (جەنەراڵ و توتسکی) لەو بارەیەوە بکرێت، بەڵام ئەوەی تا هەنووکەش باسمان کردووە

هەندێک زێدەڕۆیی تیا بووە، چونکە گەلێک لەو دەنگوباس و حیکایەتانە تەنیا مقۆمقۆ و دەنگۆی بە تەمتومان بووە و هیچی تر. بۆ نموونە توتسکی بیستبووی کە گوایە ناستاسیا فیلیپوڤنا، پەیوەندیی ژێراو ژێری دەگەل کیژەکانی یەپانچیندا پەیدا کردووە، کە ئەمە درۆیە و ناچێتە ئەقڵەوە! لەلایەکی دیکەوە توتسکی باوەڕی بە دەنگۆیەکی دی هێنابوو کە بە ڕاستی نیگەرانی کردبوو و خەوی لێ حەرام کردبوو، ئەویش ئەوە بوو کە توتسکی -یان دڵنیا کردبوو گوایە ناستاسیا فیلیپوڤنا، چاک دەزانێت کە گانیا تەنیا لەبەر پارە ئەو دەخوازێت، دەنا کوڕێکە نەفسنزم، چڕوک و ئاڵچاخ، دڵڕەش، تەماعکار، بێسەبر، بەغیل، خۆپەرست و جگە لە قازانج و بەرژەوەندیی خۆی لە خەمی هیچ شتێکی دیدا نییە. هەروەها ئەوەش بڵاو بووەوە کە ناستاسیا بەوەشی زانیوە کە ئەگەر گانیا جاران خۆشی ویستووە بە دڵ حەزی لێکردووە و ویستوویەتی بە ڕاستی بیخوازێت، ئەوا لەو ڕۆژەوە کە جووتە دۆست، واتە جەنەراڵ و توتسکی ڕێک کەوتن و قەراریان داوە سوود لەم ئەشق و ڤیانە ببینن و ناستاسیا فیلیپوڤنای، وەکو ژنێکی شەرعی، بە زەبری پارە بەسەرا ساغ بکەنەوە، بە جارێ لە بەرچاوی کەوتووە و لێی بووە بە مۆتەکەیەک و لێی دەرەوێتەوە، پاشان ئەشق و نەفرەتی لە لا تێکەڵ بووە و دوای دوو دڵییەکی دووردودرێژ، قرێری داوە ئەم "ئافرەتە بەدناوە" بخوازێت، بەڵام بە مل گوتیاری لە دڵی خۆیدا سوێندی خواردووە کە تۆڵەیەکی وەهای لێ بسەنێ، تاماوە، پێوەی بناڵێنێ. ئەوە بڵاو بووبووەوە کە ناستاسیا فیلپوڤنا، بە هەموو شتێکی زانیوە، ئەویش ژێراو ژێر کەوتووەتە نەخشەکێشانی خۆی.

توتسکی، ترسێکی وەهای لێ نیشبوو، کە تەنانەت (یەپانچین)یشی لەو ترسانەی خۆی ئاگادار نەکردەوە، بەڵام جاری واش هەبوو، ئەم پیاوە ترسنۆکە، وەکو هەر کەسێکی دی، زاتی پەیدا دەکردەوە و ورەی بەرز دەبووەوە. بۆ نموونە یەکێک لەو حاڵەتانەی ئەو کاتە بوو کە ناستاسیا فیلپوڤنا، بەڵێنی بە هەر دوو دۆستەکەی، واتە جەنەراڵ و توتسکی دا کە لە شەوی ئاهەنگی لەدایکبوونەکەیدا، جوابی یەکجارەکییان دەداتەوە. پاشان

غەریبترین و باوەڕنەکردەنیترین دەنگۆ دەربارەی ئیڤان فیودوروفیچی بەڕێز و حورمەت بڵاو بووەوە و کەوتە سەرزاران، دەنگۆیەک بوو کە مخابن زۆر شارەزایانە هۆنرابووەوە.

هەڵبەتە لە هەوەڵەوە، کەس باوەڕی بەم دەنگۆیە نەدەکرد، چونکە هەرگیز نەدەچووە ئەقڵەوە کە کەسێکی وەکو فیودوروفیچ، بەم تەمەنەوە، بەم هەموو زیرەکی و پوختەیی و کارامەیی و ئەزموونداریيەوە بکەوێتە داوی ئەشق و ڤیانی ناستاسیا فیلیپوفناوە، ئەشق و ڤیانێک بگاتە ئاستی شەیدایی. باشە بە چ ئومێدێ، بە چ ئەقڵێ ئەمەی دەکرد؟ هەڵبەتە زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. ڕەنگە ئیڤان فیدوروفیچ ئەمەی بە ئومێدی گەنجاتی و لەخۆبردوویی گانیا کردبێت. توتسکی گومانی ئەوەی هەبوو کە بەلای کەمەوە ڕێکەوتنێکی پەنامەکی لەنێوان جەنەراڵ و گانیادا هەبێت، ڕێکەوتنێکی تاکتیکی لەسەر بنەمای سازشی دوو قوڵی، بەڵام لای هەمووان عەیانە کە کابرایەکی شەیدای سەوداسەر، بەتایبەتی ئەگەر تەمەنێکی بەسەر بردبێت، بە تەواوەتی کوێر دەبێت و دڵ بەهەر فشە تروسکەیەکی خەیاڵی خۆش دەکات، هۆشوگۆشی لەلا نامێنێ و چەند زانا و زیرەکیش بێت، وەکو منداڵێکی نەفام ڕەفتار دەکات!

وا باو بوو کە جەنەراڵ گەردنبەندێکی مرواری یەجگار گران بەهای بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا کڕی بوو، حیسابێکی زۆری لەسەر ئەم دیارییە دەکرد، هەرچەندە دەیزانی کە ناستاسیا، ژنێکی بێ تەماعە و چاوی لەو شتانە نییە. جەنەراڵ، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ڕۆژی لەدایکبوونەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنای دەکرد، بەڵام توانیبووی زیرەکانە هەست و سۆزی خۆی لە خەڵکی وەشێرێت.

جا خاجەنەراڵ یەپانچین، لە زمانی خەڵکییەوە هەندێ شتی لەمەڕ ئەو گەردنبەندە مروارییەوە ژنەوتبوو! لە ڕاستیدا لیزاڤیتا پروکوفیڤنا دەمێک بوو تۆلازی و مێبازی و سووکیی مێردەکەی بۆ دەر کەوتبوو و لەگەڵیا ڕاهاتبوو و خووی پێوە گرتبوو، بەڵام ئەم جارەیان نەیدەتوانی چاوپۆشی لەم ڕووداوە بکات و خۆی لە گێلی بدات، دەمگۆی گەردنبەندەکە زۆری

نیگەران کردبوو. جەنەراڵ، لەوەختی خۆیدا بە مەسەلەکەی زانی. دوێشەو هەندێ قسەی بە تویکڵی ژنەوتبوو. بۆیە دەترسا ئەمڕۆکە، تووشی گەنگەشەیەکی فرە ببێت.

بۆیە جەنەراڵ لەم بەیانییەوە کە چیرۆکەکەمان تیایدا دەست پێ دەکات، حەزی نەدەکرد دەگەڵ خانەوادەکەیدا و لەناو ئەواندا نان بخوات. بۆیە لێبڕا، بەر لەوەی میرزادە بگاتە جێ، بە هەنجەت و بیانووی کارەوە لە ماڵ بچێتە دەرێ. دیارە وشەی "چوونەدەرەوە" هەندێ جار لە جەم جەنەراڵ هاوتای "هەڵاتن"ی دەکردەوە و ئەو مانایەی دەدا. جەنەراڵ، دەیویست بەلای کەمەوە ئەمڕۆکە، بەتایبەتی شەوەکەی، بەبێ کێشە و بە کەیفی دڵی خۆی بگوزەرێنێ. لەم کاتەدا، لەناکاودا میرزادە پەیدا بوو، بە ڕاستی هاتنە کوتوپڕەکەی زۆر بەجێ بوو.

جەنەراڵ، لە کاتێکا خۆی بە ژووری هاوسەرەکەیدا دەکرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: "خودا ناردوویەتی!"...

پەراوێز:

* – ئوترادانویی: وشەیەکە لە "ئوترادا"وە وەر گیراوە، ماناکەی لەنێوان هەر دوو وشەی (ئاسوودەییم) و "لەزەتم" دایە.

## فەسڵی پێنجەم

خا جەنەراڵ یەپانچین، زۆر بە ئەسڵ و فەسڵ و ڕەگ و ڕەچەڵەکی خۆیەوە دەنازی. جا تەسەور بکە و بیهێنە بەرچاوی خەیاڵی خۆت، کاتێ لە ناغافلا و بێ هیچ پێشەکییەک پەیی بەوە بردووە. کە ئەم میرمیشیکینە، دوا نێرینەی ماڵبات و بنەماڵەکەیان، کە پێشتر هەندێ شتی ناڕوونی لە بارەیەوە ژنەوتبوو، گەنجێکی داماوی گێلۆکەیە، هەژار و نەدارێکە کە زیاتر بە خێر و سەدەقان دەژی، نیمچەگەدایەکە لەو گۆڕەی، چ هەست و هەڵچوونێکی لەلا چێ بووە. جا جەنەراڵ، بۆ ئەوەی بابەتە سەرەکییەکە لە بیری هاوسەرەکەی بباتەوە و خۆی لە باسی گەردنبەندە مرواریییەکە بدزێتەوە، زیاد لە پێویست کەوتە ختووکەدانی هەست و سۆزی ژنەکەی..

خا جەنەراڵ، کاتێ پەست و تووڕە دەبوو، چاوەکانی ئەبڵەق دەبوون و دەکرانەوە، کەمێک خۆی بە پشتا دەبرد، زەق زەق دەیڕوانییە پێش خۆی، بێ ئەوەی ورتەی لە دەم بێتەدەر.

ژنێکی باڵابەرز، هاوسونحی مێردەکەی بوو. قژی ڕەش و پڕ، داو داوی سپیی تێ کەوتبوو، کەپووی کەمێک خوار بوو. دەموچاوی باریک و ڕەنگی زەرد، گۆناکانی سیس و قوپاو، لێوەکانی تەنک و هەڵقورتاو بوون، تەوێڵی بەرز، بەڵام باریک بوو. چاوە کەژاڵ و درشتەکانی، هەندێ جار حاڵەتێکی گوزارشتەوانی چاوەڕوان نەکراویان وەر دەگرت. سەردەمانێک، بێ هیچ هۆیەک ئەو قەناعەتەی لا دروست بووبوو کە نیگاکانی کاریگەرییەکی

گەورەیان بەسەر بەرانبەرەوە هەیە و ئیدی ئەم قەناعەتەی بۆ هەتاهەتایە لەلا چەسپی بوو. خاتوو یەپانچین. لە ژەنەراڵی پرسی:

– چی؟ دەتەوێ پێشوازیی بکەم؟ یانی ئێستا، بەم دەمودەستە، بێ هیچ پێشەکییەک پێشوازیی بکەم؟

خا جەنەراڵ بەدەم ئەو قسانەوە، بە هەموو هێز و توانایەکییەوە چاوانی بڕینە ئیڤان فیودوروفیچ، کە چالاکانە بە دەوریا دەسووڕایەوە.

جەنەراڵ، بەهەشتاو بەرسڤی دایەوە:

– پێویست ناکات خۆت زۆر سەغڵەت و شپرزە بکەی، کەیفی خۆتە گیانەکەم، ئەگەر دەتەوێ بیدینی مەرج نییە زۆر ڕەسمییانە پێشوازیی بکەیت و هەموو ئەتەکێتێکی میوانداری بەجێ بێنی. کوڕێکی بەستەزمانە، بە ڕاستی وەکو منداڵ وایە، پیاو بەزەیی پێدا دێتەوە. نەخۆشی فێی لەگەڵە و تازە لە سویسراوە گەیشتووەتە ئێرە و یەکسەر لەوێستگەی قیتارەوە بۆ ئێرە هاتووە. جلێکی سەیری لەبەردایە دەشوبهێتە سەر جلکی ئەڵمانی، تاقە قرۆشێکی لە بەرکا نییە، کە قسەی دەگەڵدا دەکەی خەریکە دەگری. من بیست و پێنج ڕۆبڵم دایە و بەتەمام ئەگەر بکرێت کارێکی بچووکی فەرمانبەری بۆ بدۆزمەوە! تکا لە ئێوە خانمان دەکەم خواردنێ، شتێکی بدەنێ، چونکە پێم وایە لە برسا لاکەی سەری دێت! زۆری برسییە...

خا جەنەراڵ، بە هەمان سەرسامی و حیرەت لەسەری ڕۆیشت:

– من سەر لەم قسانەی تۆ دەر ناکەم! برسیەتی، خووی لەگەڵدایە؟ خووی چی؟

– فێیەکەی بەردەوام نییە. ناوبەناو فێی لێدێت. دامـاوە هەرچەندە خوێنەوارییەکی باشی هەیە، بەڵام ڕێک دەڵێی منداڵە..

جەنەراڵ بەدەم ئەو قسانەوە ڕووی کردە کیژەکانی و لەسەری ڕۆیشت:

– حەزم کرد سووکە تاقییەکی بکەنەوە. چ قەیدیە با بزانین چیی لە بارایە و چیی پێ دەکرێت. خۆ زەرەر ناکەین.

خانم یەپانچین کە چاوە دەرپۆقیوەکانی، بەسەرسامی، لەنێوان کیژەکانی و مێردەکەیدا کێژ دەدا، بەوپەڕی سەرسامی گوتی:

– تا.. قی.. کرد.. نەوە؟

- ئا، گیانە تۆ خۆت زۆر سەخڵەت مەکە.. گوێ بەوەش مەدە! ئیدی قسەیەکە و کردم، تۆ بە کەیفی دڵی خۆت بکە، چیت پێ خۆشە وا بکە. من هات بەسەرما چاکەیەکی لەگەڵ بکەم و لێرە گلی بدەمەوە، چونکە ئەمەم بە کارێکی باشزانی و دەچێتە خانەی خزمایەتی و سیلەی ڕەحمەوە.

- یانی لێرە، لەگەڵ خۆمانا گلی بدەیتەوە؟ لە سویسراوە هاتووە؟...

- بۆ، سویسرا چیەتی، چ قەیدیە لەوێندەرەوە هاتبێت؟ بەهەرحاڵ، وەکو گوتم کەیفی خۆتە، بە دڵی خۆت بکە، من دەمویست کۆمەکی بکەم، چونکە هەڵگری هەمان ناو و شۆرەتی بنەماڵەکەی تۆیە، لەوەشە خزمت دەر بچێت، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە هیچ شوێنێ شک نابات تیای بحەوێتەوە. من وام بە بیردا هات کە لەوەیە تۆ ئەمەت پێ خۆش بێت، چونکە هەر چییەک بێت، لە هەمانماڵبات و بنەماڵەی تۆیە.

ئالکساندریای نۆبەرەیان گوتی:

- ڕاستە دایکە، ئێمە کە ناچار نەبین هیچ تەشریفاتێکی فەرمیی بۆ بکەین، هیچ ئەتەکێتێکی میوانداری بەجێ بێنین، ئەویش لە ڕێیەکی دوورەوە هاتبێ و برسی بێ و هیچ شوێنێ شک نەبا ڕووی تێ بکات، بۆچی خوڵکی نەکەین نانێکمان لەگەڵدا بخوات.

- ئەمە جگە لەوەی ڕێک وەکو منداڵ وایە، پیاو دەتوانێ چاوشارکێی دەگەڵ بکات.

- چاوشارکێ؟ مەبەستت چییە؟

ئاگلایا، بە جۆرە خەمینییەکەوە هاواری کرد:

- ئۆف دایکە! بەسە، تکایە لەوەی پتر خۆت لە گێلی مەدە...

ئایدلایدا، کیژی دووەمیان، کە کیژێکی خەنۆل و دەم بە پێکەنین بوو، خۆی پێ نەگیرا و لە قاقای پێکەنینی دا.

هەنگێ ئاگلایا، گوتی:

- باوکە بنێرە بەدوایا با بێت. دایکە ڕازییە.

جەنەراڵ لە زەنگی دا و بە خزمەتکارەکەی گوت میرزادە بێنێتە ژوورەوە.

خانم یەپانچین، بە توندی گوتی:

- بەڵام بەو مەرجەی کەوەختێ لەسەر خوانەکە دانیشت خاولییەکی لە مل

بکەین. بانگی فیدور بکەن، نا ماروا باشترە. با لە کاتی نانخواردنا بە دیارییەوە بێت و ئاگای لێی بێت. کە فێیەکە دەیگرێ دەست ناوەشێنیێ؟ بەدەم قسەکردنەوە دەست ناجوولێنیێ؟

– نە بابە، بە پێچەوانەوە، زۆر بە تەربیەتە، تا بڵێی پابەندی ئەتەکێتی کۆمەڵایەتییە. هەموو عەیبێکی ئەوەیە هەندێ جار زیاد لە پێویست سادە و ساکارە، برێک گێلۆکەیە. فەرموو ئەوە خۆیەتی! بە یارمەتیت با میرزادە میشکین، کە هاوناو و شۆرەتی تۆیە و دوا پیاوی بنەماڵەی ناقبرییە، ڕەنگە خزمیشمان بێت، بناسێنم، تکایە بە کەماڵی میهر و مەحەبەت پێشوازیی بکە، هەر ئێستا خواردن پێ دەگات میرزادە، هەنگێ گەورەمان بکە و... دەگەڵ خانمانا بمێنە، بەڵام من داوای بوردن دەکەم.... دەبێ بڕۆم، چونکە کاری بەپەلەم هەیە و دواش کەوتووم...

خا جەنەراڵ بە دەنگی بەرز گوتی:

– هەموومان دەزانین بۆ کوێ دەڕۆیت و پەلەی کوێتە!

– زۆر، زۆر پەلەمە گیانەکەم، دواش کەوتووم! کچینە دەفتەرەکانتانی بدەنێ، با سەرو شتتان بۆ بنووسێت... خۆشنووسێکی یەجگار بەهرەمەند و بەسەلیقەیە! بەهرەمەندێکی دەگمەن و بێهاوتایە! تۆزێ لەمەپێش لە ئۆفیسەکەی خۆما ئەم شتەی بۆ من نووسی: "ئەمە دەست و ئیمزای بەندەی حەقیر پاپا پافنوسە"... جارێ من خواحافیز، بە هیوای دیدار!

خا جەنەراڵ بە تورەیی و نیمچەهەڕەشەوە گوتی:

– پافنوس؟ پاپا؟

لە کاتێکا مێردەکەی پاشەو پاش دەکشایەوە، ئەو بە هاوارەوە لێی دەچووە پێشەوە و هاواری بەسەردا دەکرد:

– ڕاوەستە! ڕاوەستە! بۆ کوێ تەشریف دەبەی؟ ئەم پافنوسە کێیە؟

– بەڵێ، بەڵێ گیانە، کاتی خۆی لە زەمانی کۆندا پاپایەک بەم ناوەوە هەبووە. من دەبێ بڕۆم، پەلەمە، جەنابی کۆنت چاوەڕوانمە و ئەو بە خۆی سەعاتی دیدارەکەی دیاری کردووە. میرزادە، بە هیوای دیدار...

هەنگێ جەنەراڵ خۆی نەجات دا و بەلەز وەدەر کەوت.

ئەوسا لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، چاوێکی لە میرزادە کرد و بە تورەیی گوتی:





- دەزانم کام کۆنتی مەبەستە؟

پاشان وەک یەکێک بیەوێ شتەکەی بیر بکەوێتەوە، بە تورەیی لەسەری رۆیشت:

- ئەرێ، باسی چمان دەکرد؟ ئا.... ئەو پاپایە کێیە؟

ئالکساندریا ویستی خۆی لە مەسەلەکە هەڵقورتێنێ، ئاگلایا لە ژێرەوە پێی نا بە پێیدا، گوتی:

- دایکە!

خا جەنەراڵ بە توندی گوتی:

- قسەکەم پێ مەبڕە ئالکساندریا! وازم لێبێنە، منیش دەمەوێ بزانم مەسەلەکە چییە! میرزادە لەوێ دانیشە، لەسەر ئەو کورسییەی بەرانبەرم... نا، نا لێرە، لەبەر هەتاوەکە، لە هەتاوەکە نزیک ببەوە تا بە باشی بتبینم. زۆر باشە دەی هەنوکە باسی ئەو پاپایەم بۆ بکە!...

میرزادە، زۆر بە ئەدەبەوە گوتی:

- پاپا، پافنوسە...

- پافنوس؟ بە ڕاستتە! باشە ناوبانگی ئەم پیاوە لە چدا بوو؟

خا جەنەراڵ، بێ ئەوەی چاوی لێ بگوازێتەوە، زۆر بە خێرایی و نیگەرانی ئەو پرسیارانەی لێ دەکرد، کە میرزادە وەڵامی دەدایەوە، ئەویش لەگەڵ هەر وشەیەکیدا سەرێکی بۆ دەلەقاند.

میرزادە گوتی:

- پاپا، پافنوس لە سەدەی چواردەدا ژیاوە، لە ڕەخی ڕووباری ڤۆلگادا، لەو دەڤەرەی هەنوکە پێی دەڵێن دەڤەری کوستروما، دێرێکی بەڕێوە دەبرد. بە زوهد و خواپەرستی بەناوبانگ بوو. چەندین جار چووبوو بۆ وڵاتی تەتەرستان تا هەندێ لە کێشەکانی ئەو ڕۆژگار و وەختە حەل و فەسڵ بکات. لە یەکێک لەو جارانەدا و لە یەکێک لە بۆنەکاندا، بە دەستی خۆی قەواڵەیەکی ئیمزا کردبوو، یانی ئیمزای خۆی لێ دابوو. بە ڕێکەوت جارێک نوسخەیەکم لەو قەواڵەیە بینی، خەتەکەم زۆر چووە دڵەوە، ئیدی فێر بووم لاسایی بکەمەوە. جا کە تۆزێ لەمە پێش جەنەراڵ ویستی دەسوخەتم ببینێ تا کارێکم بۆ بدۆزێتەوە، منیش هەستام چەند دەستەواژەیەکم بە پیتی جیاواز بۆ

نووسیوە، یەکێک لەو دەستەواژانە بریتی بوو لەمە: "ئەمە دەست و ئیمزای بەندەی حەقیر پاپا پافنوسە." هەڵبەتە بە هەمان شێوازە خەتی پافنوس نووسیم، ئیدی جەنەراڵ زۆری بەگەن کرد، ئەوەی کە تۆزێ لەمە پێش ئاماژەی بۆ کرد، ئەوە بوو.

خا جەنەراڵ گوتی:

- ئاگلایا، ئەم پافنوسەت لە بیر بێت، باشترە بینووسیت، چونکە من لە بیرم دەچێت. من بەتەمای ڕوونکردنەوەیەکی گرینگتر بووم. ئەدی کوا ئیمزاکە؟

- وا بزانم، لەسەر مێزی ئۆفیسەکەی جەنەراڵ جێ ما.

- هەر ئێستا بچن بۆمی بێنن.

- ئەگەر بتەوێ دەتوانم دووبارە بۆتی بنووسمەوە.

ئالکساندرا گوتی:

- ڕاست دەکات دایکە، جارێ وەرن با نان بخۆین، هەمووومان برسیمانە.

خا جەنەراڵ گوتی:

- زۆر باشە. فەرموو میرزادە، ڕەنگە زۆرت برسی بێت.

- بەڵێ، ئێستا هەست بە برسیەتی دەکەم، زۆرت لێ مەمنوون و منەتبارم.

لەو کاتەدا کە بۆ هۆڵی نان خواردن دەچوون، خانم یەپانچین بەدەم ڕێوە گوتی:

- خۆشحاڵم کە تۆ کەسێکی بە ئەدەب و نەزاکەتی، ئەوەندەش وەکو دەیانگوت عەجیب و غەریب نیت. وەرە پێشەوە، لێرە دانیشە، لە بەرانبەرم، تا بتوانم باشتر بتبینم. ئالکساندرا، ئادیلاید، بێزەحمەت بە میرزادە ڕابگەن! ئەو نەخۆشەش نییەوەکو دەیانگوت، وا نییە؟ ڕەنگە پێویست بە خاولی نەکات. میرزادە، جاران خاولیان لە مل دەکردیت؟

- بەڵێ بە منداڵی، ئەوسا کە تەمەنم حەوت ساڵان بوو، بەڵام ئێستا خاولی دەدەم بەسەر کۆشما.

- دەی کچینە خاولی بۆ بێنن، ئەدی خوو و فێیەکەت چۆنە؟

میرزادە، بە جۆرە سەرسووڕمانێکەوە گوتی:

- فێیەکەم؟ زۆر باشە، بەدەگمەن دەمگرێ. ئیدی... نازانم دەڵێن ئاووهەوای ئێرە بۆ نەخۆشییەکەی من باش نییە.

خانم یەپانچین، کە دەگەڵ هەر قسەیەکی میرزادەدا سەرێکی دەلەقاند، ڕوو لە کیژەکانی گوتی:

- قسە کردنی باشە. چاوەڕوانم نەدەکرد وا بێت. کەواتە هەر هەموو ئەوەی لەبارەیەوە گوترابوو، وەکو هەمیشە تەنیا قسەی بۆش و بەتاڵ بوو.

ئەوجا ڕووی کردەوە میرزادە و گوتی:

- میرزادە فەرموو نان بخۆو بەدەم نانخواردنەوە پێمان بڵێ لەکوێ بوویت و لەکوێ گەورە و پەروەردە بوویت. گەرەکمە هەموو شتێک دەربارەی تۆ بزانم، وەزع و حاڵی تۆم زۆر مەبەستە.

میرزادە، لە کاتێکا بە تاسوقەوە نانی دەخوارد، دەستی بە گێڕانەوەی هەر هەموو ئەو شتانە کردەوە کە ئەو بەیانیە، چەند جارێک گێڕابوویەوە.

مەدام جەنەراڵ، دەم بەدەم خۆشحاڵتر دەبوو. کیژەکانیش زۆر بەووردی گوێیان لە میرزادە دەگرت. باس هاتە سەر ڕادەی خزمایەتی وان. دیار بوو کە میرزادە شارەزاییەکی زۆر باشی لەمەڕ ئەسڵ و فەسڵ و شەجەرەی خۆی هەبوو، بەڵام هەرچییان کرد و کۆشا، نەیانتوانی خزمایەتی و پەیوەندییەکی نزیک لەنێوان میرزادە و خانم جەنەراڵدا بدۆزنەوە، ڕەنگە ئەوپەڕی بۆرە خزمایەتییەکی دووری وەکو خزمایەتیی بن عامان لەنێوان ئابا و ئەژدادایان هەبووبێت. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ئەم باسەی زۆر لە گیان خۆش بوو، چونکە زۆر بە کەمی دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوت باسی ئەژدادی خۆی بکات. بۆیە بەخۆشحاڵییەوە لەسەر مێزەکە هەستا و گوتی:

- وەرن با بڕۆین بۆ هۆڵی کۆبوونەوە و قاوەکەمان بۆ بێنن بۆ ئەوێندەر.

ئەوجا ڕووی دەمی کردە میرزادە و لەسەری ڕۆیشت:

- هۆڵێکی هاوبەشە، یانی هۆڵێکی چکۆلەی منە کە بە تەنیا دەبین، لەوێندەر خڕ دەبینەوە، ئیدی هەر کەسە و خەریکی کاری خۆی دەبێت: کیژە گەورەکەم، ئالکساندرا بۆ خۆی پیانۆ لێدەدات یان دەخوێنێتەوە یان خەیاتی دەکات. ئادیلایدی کیژم یان دیمەنی سروشت وێنە دەکێشێت یان پۆرترێتان دەکێشێت (کە قەت تەواوی ناکات)، بەڵام ئاگلایا، بۆ خۆی دادەنیشێت و هیچ کارێک ناکات. منیش هیچ کارێکم لەبەر ناڕوات و ناتوانم بەدیار کارەوە دانیشم. دەی وا هەموو ئامادەین، فەرموو میرزادە لای سوپاکەوە دانیشە و

قسانمان بۆ بکە. دەمەوێ بزانم چی دەڵێیت تا پاشان ئەگەر شازادە خانمی پیر، بیلوکونسکایام بینی، بە دووروودرێژی باسی تۆی بۆ بکەم. دەمەوێ هەموویان بتناسن. دەیسا فەرموو قسان بکە!

ئادیلاید، کە لەو کاتەدا ستاندی تابلوکانی قایم کردبوو، دەستی دابووە فڵچەکەی و پالێتی ڕەنگەکانی بەدەستەوە گرتبوو، خەریک بوو کارێکی کۆنی تەواو دەکرد کە لە نوسخەیەکی چاپکراوی دیمەنێکی سروشتییەوەوەری گرتبوو، گوتی:

– دایکە، باشە گێڕانەوەی هەموو شتێک ناخۆش نییە؟ بە تایبەتی بۆ یەکێکی وەکو میرزادە کە بەو جۆرە بەگیرت هێناوە.

ئالکساندرا و ئاگلایا، بە دوو قۆڵی، لەسەر قەنەفەیەکی چکۆلە، دەست لەسەر سینە دانیشتبوون و ئامادەی گوێگرتن بوون. میرزادە سەیری کرد هەموو چاویان بڕیوەتە ئەوو چاوەڕوانی ئەون.

ئاگلایا گوتی:

– ئەگەر بەو شێوەیە داوایان لە من کردبا، نەمدەتوانی هیچ قسەیەک بکەم.

خا جەنەراڵ گوتی:

– بۆچی؟ چما ئەمە چی تیایە؟ بۆچی قسە نەکات؟ ئەویش زمانی هەیە. حەز دەکەم بزانم چۆن قسان دەکات. بە کەیفی خۆت قسان بکە. بڵێ بزانم سویسرات پێ خۆش بوو، هەوەڵین هەستت دەرهەق بەم وڵاتە چی بوو؟ هەنوکە دەبینی چۆن دەست پێ دەکات و چەند باشیش قسان دەکات.

میرزادە دەستی بە قسان کرد:

– هەوڵین هەستم! حەپەسام...

خا جەنەراڵ، قسەکەی پێ بڕی، ئاوڕی لە کیژەکانی دایەوە و گوتی:

– خۆ بینیتان؟ فەرموون، دەستی پێ کرد...

ئالکساندرا، قسەکەی بە دایکی بڕی و گوتی:

– دایکە، بەلای کەمەوە وازی لێ بێنە با بەردەوام بێت!

ئەوجا بە گوێی ئاگلایای خوشکیا چپاند:

– ئەمە ڕەنگە سەرکزی دڵوریا بێت، بەڵام هەرگیز گێلۆکە و سائەقڵ نییە!

ئاگلایا بەرسڤی دایەوە:

– ڕاست دەکەی، منیش هەستم بەمە کردووە! بەڵام بۆچی دەوری گێل دەبینی، خۆی لە گێلی دەدات، تێناگەم، بەتەمایە چی لەمە دەست بکەوێت؟

میرزادە لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت و گوتی:

– هەوەڵین هەستم ئەوە بوو کە حەپەسام. کە لە ڕووسیاوە بردیانم و بە چەند شارێکی ئەڵمانیادا تێپەڕین، هەر ئەوەندەم پێ دەکرا ئەبڵەق و حەپەساو تەمەشا بکەم، هەنوکەش لە بیرم ماوە کە هیچ پرسیارێکم نەدەکرد. من ئەزموونێکی ناخۆشم دەگەڵ نەخۆشییەکەمدا هەبوو. هەر کاتێ بیگرتمایە، بە تایبەتی ئەگەر زوو زوو و یەک لەدوای یەک بیگرتمایە، بە جارێ لە پەلوپۆ دەکەوتم، گێژو کاس دەبووم، مێشکم جام دەبوو، هیچم لە بیر نەدەما. ڕاستە مێشکم کاری دەکرد، بەڵام بابەتەکانم بە شێوەیەکی لۆژیکانە بۆ نەدەدرایە دەم یەکەوە. ئەوپەڕەکەی دوو یان سێ بیرۆکەم لە زەینی خۆدا بۆ دەدرایە دەم یەکەوە. بەهەرحاڵ ئەمە ئەو هەست و بیرەوەرییەیە کە لە یادم ماوە. کە فێیەکە بەری دەدام دەگەڕامەوە سەر دۆخی جاران، عەیب و ئەلەمم لێ نەدەما، ساغ و سەلامەت، تین و تاوم تێ دەگەڕایەوە، ڕێک وەکو ئێستا. لە بیرمە ماخۆلانێکی سەیرم گرتبوو، لەڕادەبەدەر خەمین و خەمبار بووم، هەمیشە فرمێسک و گریانم حازر بوو. هەمیشە دووچاری نائومێدی و نیگەرانی بووم، ئەمە کارێکی وەهای لە دڵ و دەروونم کردبوو، کە لە گیانی خۆم بێزار بووم، غەریب و نامۆ لە خۆم و لە هەموو شتێک. بەڵێ دەمزانی گەیشتوومەتە هەندەران. ئەم (هەندەرانە) هێندەی دی خەمین و خەمباری کردم، دەتگوت خەم و نائومێدیی هەموو دنیام بە کۆڵدا دراوە. ئێستاش لە بیرمە، کە ئێوارێ گەیشتنە سویسرا و چووینە شاری بازل Basle، ئیدی ئەو خەمینییە بەریدام، نێرەکەرێک لە ناوجەرگەی بازاڕا بینی گرتبوووەوە و دەزەڕی ئەمما زەڕین. زەڕەی ئەو کەرە نازانم بۆچی زۆر دڵی خۆش کردم. ڕوحی بوژاندمەوە، لەو دەمەدا بوو هەستم کرد مێشکم لەپڕ ڕووناک بووەوە...

خا جەنەراڵ گوتی:

– کەر؟ سەیرە... بەڵام نا... هیچ سەیر نییە. لەنێو ئێمەی خێڵی ژناندا هیی وا هەیە دەکەوێتە داوی ئەشقی کەرێکەوە.

بەدەم ئەو قسەیەوە، بە تورەیی ڕوانییە کیژەکانی کە پێدەکەنین، لەسەری ڕۆیشت:

- ئەم جۆرە شتانە لە ئەفسانانی کۆنی یونانیشدا بووە و ڕووی داوە. دەی میرزادە فەرموو بەردەوام بە.

میرزادە درێژەی بە قسەکەی دا و گوتی:

- ئیدی لەو کاتەوە خۆشەویستییەکی سەیرم بەرانبەر بە کەر پەیدا کردووە. لە کانگای دڵەوە و بە حوبی دڵ کەرم خۆش دەوێ. ئیدی کەوتمە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی کەران، چونکە پێش ئەو جارە، بۆ تاقە جارێکیش کەرم نەبینیبوو. ئیدی بۆم دەر کەوت کە کەر حەیوانێکی زۆر بەسوود، بەهێز، بەسەبر، قانیع، کۆڵنەدەر و بە مقاوەمەت و کەمخەرجە. بە هۆی ئەم کەرەوە، لەپڕ سویسرام لەلا خۆشەویست بوو و خەم و ماخۆلیاکەم بە تەواوەتی پەڕی.

- هەموو ئەمەی باست کرد خۆش بوو، بەڵام با واز لە کەرەکە بێنین و بچینە سەر بابەتێکی دیکە... ئاگلایا بە چی پێدەکەنی، ئەدی تۆ ئادیلایدا؟ میرزادە بۆیە متووی کەر بووە و خۆشی ویستووە چونکە بە چاوی خۆی دیتوویەتی. ئێوە چیتان دیتووە؟ ئێوە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەفەری هەندەرانتان نەکردووە، کردووتانە؟

ئادیلاید گوتی:

- دایکە، بەڵام من کەرم دیتووە.

ئاگلایاش گوتی:

- منیش گوێم لە دەنگی بووە.

هەر سێ کیژ، دەستیان بە پێکەنین کرد، میرزادەش گوێ بە گوێی وان کەوتە پێکەنین.

خا جەنەراڵ گوتی:

- عەیبە بۆ ئێوە، شەرم ناکەن لە خۆتان! میرزادە لێیان مەگرە، بیانبورە، کچی باشن دڵیان پاکە، من هەمیشە دەمم لەسەریانە، دەگەڵیان بەشەڕ دێم، بەڵام چبکەم خۆشم دەوێن، هەرچەندە کەم ئەقڵ و کاڵفام و شێتن!...

میرزادە بە پێکەنینەوە گوتی:

- بۆچی پێنەکەنن؟ من لەجیاتیی وان بوایەم، خۆم خەنی دەکرد، بەڵام من هێشتاش هەر بیرم لای ئەو کەرەیە، بە ڕاستی کەرم خۆش دەوێ: کەر، بوونەوەرێکی خۆش تەبیعەت و بەسوودە.

خانم یەپانچین (خا جەنەراڵ) گوتی:

- میرزادە تۆش خۆش تەبیعەتی؟ لە ڕووی فوزوڵیەت و کونجکاوییەوە ئەو پرسیارەت لێ دەکەم.

دیسان، هەموو کەوتنە پێکەنین.

خانم یەپانچین گوتی:

- بزانە ئەو کەرە نەفرەتیە چۆن بوو بە وێردی سەر زمانمان، میرزادە باوەڕ بکە نیازم خراپ نەبوو... هیچ... مەبەست نەبوو.

- هیچ بەراوردێک؟

میرزادە بەو جۆرە ڕستەکەی بۆ خا جەنەراڵ تەواو کرد، بەدەم پێکەنینەوە. لە سەری ڕۆیشت:

- دڵنیام کە هیچ بەراوردێکت مەبەست نەبوو!

خا جەنەراڵ گوتی:

- خۆشحاڵم کە پێدەکەنیت. هەر بەمەدا دیارە کە گەنجێکی یەجگار باش و دڵپاکیت.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵام مەرج نییە هەموو کاتێ وا بم، هەندێ جار، خراپ پەست و تووڕە دەبم، دەبم بە کەسێکی بەدخوا.

خا جەنەراڵ، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوتی:

- وەکو من، من دڵێکی میهرەبانم هەیە، هەمیشەی خوا دڵساف و دڵپاکم، ئەوە عەیبی هەرە گەورەی منە، چونکە ئینسان نابێت هەمیشە دلۆڤان و مێریڤان بێت. زۆر جار لە دەستی ئەم کیژانەی خۆم و بە تایبەتی لە ئیڤان فیودوروفیچ تووڕە دەبم، بەڵام داخەکەم لە هەرەتی پەستی و تووڕەییشدا هەر هەست بە میهر و دڵپاکی دەکەم! هەر ئێستا کەمێک پێش هاتنی تۆ، زۆر تووڕە بووم، خەریک بوو دۆودۆشاوم تێکەڵ دەکرد، چاوم هیچی نەدەبینی، هەندێ جار وام لێ دێت، وەکو منداڵ گڕوو دەگرم. باش بوو ئاگلایا عەمری درێژ

بێت فریا کەوت و ئامۆژگاری کردم. بەهەرحاڵ هەموو ئەم شتانە تورەهاتن! من بەو ڕادەیە گەوج نیم وەکو کیژەکانم وێنای دەکەن. هەمیشە ورەم بەرزە، زۆریش شەرمن نیم. ئادەی ئاگلایا وەرە بۆ ئێرە و ماچم بکە...

پاش ئەوەی ئاگلایا، بەوپەڕی دڵسۆزی ڕوومەت و دەستەکانی ماچ کرد، دایکی گوتی:

- بەسە کچێ!

ئەوسا ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و گوتی:

- فەرموو میرزادە بەردەوام بە! بەڵکو بابەتێکی خۆشتر لە بابەتی ئەو کەرە دەدۆزیتەوە!

ئاگلایا گوتی:

- من تێناگەم، پیاو چۆن دەتوانێ ئاوا ڕاستەوخۆ و بەزارەکی شت بگێڕێتەوە، ئەگەر داوای شتی وەها لە من بکرێت تاقە وشەیەکم بۆ نایەت.

- بەڵام میرزادە دەتوانێ، چونکە زۆر زیرەکە، بەلای کەمەوە دە-دوازدە هێندەی تۆ زیرەک و هوشیارە. هیوادارم لە ئێستاوە ئەمە بزانی. میرزادە دەی قسەکەی منیان بۆ بسەلمێنە، بەردەوام بە. بە درۆم نەخەیتەوە، بەڵام با جارێ واز لە کەرەکە بێنین. دەی بزانم جگە لە کەر، لە هەندەران چیترت بینی؟

ئالکساندرا گوتی:

- باسی کەرەکەش زۆر خۆش بوو. بە تاسوقەوە باسی نەخۆشییەکەی خۆی بۆ کردین، زۆر بە ئاو و تاو بۆی گێڕاینەوە کە چۆن لە ڕێگەی شۆکێکی دەرەکییەوە، فێری ئەوە بووە هەموو شتێکی خۆش بوێ. من هەمیشە حەزم کردووە کە بزانم خەڵکی چۆن ئەقڵیان لە دەست دەدەکەن و چۆن چارەسەر دەکرێن و ئەقڵیان بەدەست دێننەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئەم حاڵەتە لەناکاوا ڕوو بدات !

خا یەپانچین (خا جەنەراڵ) هەڵی دایە و گوتی:

- ڕاست دەکەی، وایە، ئافەرین بە ڕاستی تۆش هەندێ جار زیرەکی، ئەقڵت ئیش دەکات ها! دەی هەنوکە شۆخی و پێکەنین بەسە! میرزادە پێم وایە لە باسی دیمەن و سروشتی سویسرادا وەستایت، دیمەنی سویسرات چۆن بینی؟

میرزادە گوتی:

- گەیینە لوسیرن، لەوێندەر بردمیان بۆ تەمەشای دەریاچە، هەستم دەکرد جوانە، بەڵام وێرای ئەوەش دڵم زۆر تەنگ بوو.

ئالکساندرا پرسی:

- بۆچی؟

میرزادە گوتی:

- بە خۆیشم نازانم. من هەمیشە جۆرە دڵتەنگییەکم لەگەڵە. کە بۆ یەکەم جار ئەو جۆرە دیمەنانە دەبینم دڵم دەگوشرێت، نیگەران دەبم. باسی ئەو کاتانە دەکەم کە هێشتا نەخۆش بووم...

- بەڵام من زۆر دڵم بەو دیمەنانە دەکرێتەوە. هەموو جارێ لە خۆم دەپرسم تۆ بڵێی ڕۆژێ لە ڕۆژان سەفەری هەندەران بکەین. دوو دانە ساڵە عەوداڵم کە بابەتی تابلۆیەک بدۆزمەوە و وێنەی بکێشم. شاعیر گوتەنی: وەسفی ڕۆژاواو ڕۆژهەڵات لەمێژە کراوە، کۆنە*. دەی میرزادە باسی بابەتێکم بۆ بکە کە بیکەم بە تابلۆ !

میرزادە بەرسقی دایەوە:

- لەو بارەیەوە هیچم پێ نییە. من پێم وایە نیگارکێش دەبێ بڕوانێتە دەوروبەر و هەرچییەک دەبینێ وێنەی بکێشێت.

- من نازانم بە باشی سوود لە چاوانم ببینم.

خا یەپانچین، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- بۆچی کەوتوونەتە لەگەز بێژی؟ ئەم لەگەزبێژییەتان لە چییە؟ تێناگەم چ دەڵێن! مەبەستت چییە کە دەڵێی ناتوانی بەباشی سوود لە چاوانت بدینی؟ چاوت هەیە و تەمەشا بکە، نیتە؟ ئەگەر لێرە نەتوانی تەمەشا بکەی و سوود لە چاوانت ببینی، بێگومان لە هەندەرانیش فێری دیتن و تەمەشاکردن نابیت. میرزادە باشتر وایە تۆ بۆمان بگێڕیتەوە کە تۆ لەوێندەر چۆن تەمەشات دەکرد و چیت بینی؟

ئادیلاید گوتی:

- وایە، زۆر باشترە، چونکە میرزادە لەوێندەر فێر بووە چۆن تەمەشا بکات! چۆن سوود لە چاوانی ببینێ!

- نازانم! من بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەم چووبوومە ئەوێندەر، سیحەتم

باش بوو. ئیدی ناتوانم بڵێم فێری بینینی شتان بووم. بەهەرحاڵ، بە درێژایی ئەو ماوەیە، لەوێندەر، تا ڕادەیەکی زۆر، خۆشحاڵ و دڵخۆش بووم !.

ئاگلایا هەڵی دایە:

- خۆشحاڵ بوویت؟ یانی تۆ دەزانی چۆن خۆشحاڵ دەبیت؟ ئەدی چۆن دەڵێی فێری بینینی شتان نەبوویت؟ بێگومان دەتوانی فێری دیتنمان بکەی، فێری ئەو شتەمان بکەیت کە فێری بوویت.

ئادیلاید بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- ڕاست دەکات، چی فێر بوویت، ئەوەمان فێر بکە!

میرزادە، هاوکات دەگەڵ ئەواندا، بە پێکەنینەوە گوتی:

- من ناتوانم هیچ شتێک فێری هیچ کەسێک بکەم. من بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لە هەندەران بووم، زۆربەی کات لە هەمان گوندی چکۆلەی سویسریدا دەژیام. بەدەگمەن لەوێ دەر دەچووم، ئەگەر دەریش چووبام زۆر دوور نەدەکەوتمەوە. ئیدی چیتان فێر بکەم؟ لە سەرەتاوە بەرەبەرە بەوە ڕاهاتم کە هەست بە بێتاقەتی و بێزاری نەکەم. نەخۆشییەکەم زۆر زوو بەرەو باشی چوو. دوای ئەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ژیانم لە بەرچاو بەنرختر دەبوو، بە تەواوەتی هەستم بەوە دەکرد. شەوان، ئاسوودە بیر و دڵڕەحەت دەچوومە ناو جێگا و بەیانییان دڵخۆشتر ڕادەبووم. بە خۆیشم نازانم هۆی ئەمە چی بوو، یانی نازانم چۆن گوزارشتی لێ بکەم!

ئالکساندرا پرسیی:

- یانی ئەوەندە خۆشحاڵ بوویت، حەزت نەدەکرد بۆ شوێنێکی دی بڕۆیت؟

- با، لە سەرەتاوە، زۆر ناڕەحەت بووم، هەستم بە خەمباری و نیگەرانی دەکرد. لە فکران ڕادەچووم، بیرم لە ژیان و ئاییندەی خۆم دەکردەوە، دەمویست چارەنووسی خۆم بزانم. هەندێ جار یەجگار نیگەران دەبووم. هەستم بەبێ قەراری دەکرد، بە خۆت دەزانی مرۆڤ هەندێ جار، بەتایبەتی کە تەنیای تەنیا بێت، ئەو هەستەی لە نک چێدەبێت. جا لەو گوندە چکۆلەیەدا، تاڤگەیەکی چکۆلەی باریک باریک هەبوو، لە بەرزاییەکی بەرزی بەرزەوە، بە شێوەیەکی نیمچە ئەستوونی، سپی کەفچەڕین، بەدەم هاڕە و هاژەوە، دەهاتە خوارەوە. لە بەرزاییەکی زۆر بەرزەوە دەهاتە خوارێ، بەڵام پیاو هەستی بەو





بەرزییە زۆرە نەدەکرد. بەرزیەکەی نیو کیلۆمەتریک دەبوو، کەچی وات دەزانی هەر پەنجا مەتریکە. حەزم دەکرد شەوانە گوێ لە دەنگ و هاژە هاژی دارژانی تاڤگەکە بگرم، بەڵام لەو دەمانەدا نیگەرانی و پەریشانییەکەم زیادی دەکرد.

یان هەندێ جار، بە ڕۆژەوە، دەچووم بۆ چیا، لەوێ لە جێیەکی بەرزا، بە تاقی تەنیا دەوەستام. هەر چوار نکالم دار کاژ و پیرە سنۆبەران بوو، کە وەکو بورجی شیلاوی چووبوون بە ئاسمانا. لەولاترەوە لەسەر کەپکە شاخێکی بەرزا، شوێنەواری وێرانەی قەڵایەکی سەدەکانی ناڤین دیار بوو. تۆزێ لە خوارترەوە لە نزماییدا، گوندە چکۆلەکەی لەمەڕ خۆمان بە ئاستەم دەبینرا. دنیا لە تیشکی هەتاودا نقوم بوو، ئاسمان ساف و شین بوو، بێدەنگییەکی بە سام هەموو دنیای گرتبووە باوەش. لەو سات و دەمانەدا هەستم دەکرد دەنگێک لە دووری دوورەوە، لە نادیارەوە، لە پێوارەوە گازم دەکات، وام دەهاتە خەیاڵ ئەگەر ماوەیەکی زۆر بڕۆم و ئەو هێڵە ببەزێنم کە ئەرز و ئاسمان پێکەوە دەدورێت، کلیلی هەموو شتێک دەدۆزمەوە و وەڵامی هەموو شتێکم دەست دەکەوێ. ژیانێکی تازەی ئەوتۆم بۆ کەشف دەبێت، کە زۆر لە ژیانی لای ئێمە سخ و چڕتر، پڕ جۆشوخرۆشتر و گەرموگوڕترە. یان خەونم بە شارێکی گەورەی وەکو ناپولییەوە دەبینی، پڕ لە کۆشک و تەلاران، قەوغاو پڕ جموجووڵ، کە ژیانی لێ هەڵقوڵێت... ئیدی خەوم بە زۆر شتی لەو بابەتەوە دەبینی!... هیچ شتێک نەما خەونی پێوە نەبینم! ئەوسا بۆم دەر کەوت کە بەشەر دەکارێت، تەنانەت لە زیندانیشدا، ژیانی بێسنوور و دڵخوازی خۆی بدۆزێتەوە.

ئاگلایا گوتی:

– ئەم بیرۆکەیەی دوایی، بیرۆکەیەکی بەجێیە، من لە تەمەنی دوازدەساڵیدا، لە کتێبی هەڵبژاردەدا، خوێندوومەتەوە.

ئادیلاید گوتی:

– ئەمە هەمووی فەلسەفەیە. تۆ فەیلەسووفیت و هاتوویت ئێمە فێر بکەیت.

میرزادە بەدەم بزەوە گوتی:

– ڕەنگە هەق بە تۆ بێ. لەوەیە فەیلەسووف بم، کێ چوزانێ؟ لەگینە بەنیاز

بم فێری فەلسەفەتان بکەم... دەشێت و زۆریش دەشێت..

ئاگلایا هەڵی دایە و گوتی:

– فەلسەفەکەی تۆ، کوتومت وەکو فەلسەفەکەی یولامپیا نیکولایڤنایە، ئەمە بێوەژنی کابرایەکی فەرمانبەرە، ناوبەناو لە ڕووی فزوڵیەتەوە دێ بۆ لامان. ژنێکی زۆر فزوڵییە. خەمی هەرە گەورەی لە ژیاندا ئەوە بوو شت بە هەرزان بکڕێت و بە کەمترین خەرجی ژیان بگوزەرێنێ. سەری زمان و بنی زمانی باسی کۆپی بکە، ئەگەر بڵێی دەوڵەمەندیشە: بەڵام هەر هەمووی بە فێڵ و تەڵەکەبازی پەیدا کردووە. ئەمە ڕێک وەکو ژیانە بێسنوور و دڵخوازەکەی ناو ئەو زندانەیە کە تۆ باسی دەکەیت. ڕەنگە ڕێک وەکو ئەو چوار ساڵە خۆشە بێت کە تۆ لە زندانی ئەو گوندەدا بەسەرت برد، یانی بۆ قەسابخانەیەک وشترێکت مردار کردەوە، لەپێناوی قازانجێکی کەمدا، ڕەنگە لە چەند کۆپێکێک تێنەپەڕی بووبێ، دەستبەرداری ناپۆلی بوویت و بەو گوندە ڕازی بوویت.

میرزادە گوتی:

– سەبارەت بە ژیانی نێو زندان، دەشێت قسەکەم زۆر دروست نەبێ، بەڵام من ئەو قسەیەم لە پیاوێک گوێ لێ بوو کە نزیکەی دوازدە ساڵی لە زندانـدا قەتاندبوو. یەکێک بوو لە نەخۆشەکانی دکتۆرەکەی من. ئەم پیاوە ناوبەناو فێـی لـێ دەهـات، لەو دەمانـەدا زۆر پەریشـان و شـەپرێو دەبـوو، ئـۆقرەی نـەدەگرت و تەنانـەت جارێـک هەوڵـی خۆکوژییشـی دا. ژیـانی ئـەم پیـاوە لـە زنداندا زۆر خەمناک بوو... دەتوانم دڵنیاتان بکەم کە ژیانی لە زنداندا خـەمناک بوو،، بەڵام بێگومان لە چەند کۆپیکێک زیاتری دێنا،و تاقە دۆستی لەوێندەر، جاڵجاڵۆکەیـەکی نێـو سـالولەکەی و دەوەنێکـی چکۆلـە بـوو کـە لەو دیـو پەنجەرەکەیەوە ڕوا بوو... بەڵام من حەز دەکەم باسی پیاوێکی دیکەتان بۆ بکەم کە پارەکە دیتم. جا ئەوەی ئێستا بۆتانی دەگێڕمەوە، شتێکی سەیر بوو، سەیر بوو چونکە زۆر دەگمەنە و یەجگار کەم ڕوو دەدات. ئەمە پیاوێک بوو، لەگـەڵ چەنـد کەسـێکی دیکـەدا حـوکمی ئیعـدام درابـوو، دەبـرێن بـۆ شـوێنی ئیعدامکردن* (٢) لەوێندەر قەراری حوکمەکەیان، کە تیربارانە لەسەر تاوانێکی سیاسی، بۆ دەخوێننەوە. دوای بیست دەققەیەکی دی قەرارێکی دیکەیان بۆ دەخوێننەوە کە حوکمی ئیعدامەکەیان بۆ سووک دەکەن و دەیکەن بە حوکمی

بێگارەزندان، بەڵام لە ماوەی نێوان خوێندنەوەی هەر دوو قەرارەکەدا کە هەر چارەکێک یان بیست دەقیقە دەبێت، کابرا دڵنیای دڵنیا بووە کە دوای چەند دەمێکی دی دەمرێت و مردنەکەی مسۆگەری مسۆگەرە. کە باسی ئەو هەستانەی دەکرد کە لەو ماوەیەدا بەرۆکی گرتووە، سەراپام دەبوو بە گوێ و پەیتاپەیتا بە پرسیاران دام دەگرتەوە! هەموو شتەکانی مووبەموو لە بیرما بوو و دەیگێڕایەوە، دەیگوت هەتا ماوە ناتوانێ ئەو ساتانە لەبیر بکات.

لە بیست مەتری ئەو سەکۆیەدا کە خەڵکی لەدەوری خڕ بووبوونەوە و سەربازەکان بەڕیز وەستابوون، چونکە ژمارەی مەحکومەکان زۆر بوون، سێ ئەستوونیان لە عاردی چەقاند بوو، هەوەڵ جار سێ مەحکوومی یەکەمیان بردە پای ئەستوونەکان و بە ئەستوونەکانیانەوە بەستنەوە، جلکی مەرگیان – کە دیزداشەیەکی درێژی سپی بوو- لەبەر کردن و چاویان بەستنەوە تا تفەنگەکان نەبینن. ئەوجا دەستەیەک سەرباز، ئامادە و تەیار، بە تفەنگی سوارەوە لەهەنبەر هەر ئەستوونێکا ڕیز بوون. ئەو پیاوەی کە بۆتانی باس دەکەم، هەشتەمین کەسی لیستەکە بوو. یانی دەبوا لەگەڵ گرووپی سێیەمدا بە ئەستوونەکەوە ببەسترێتەوە. قەشەیەکی خاچبەدەست دەچووە لای هەر یەکێکیان و وێردی بەسەردا دەخوێندن. یانی دیار بوو کە تەنیا پێنج دەققەیان لە ژیاندا مابوو. جا ئەو پیاوە بۆی باس کردم، دەیگوت ئەو پێنج دەقیقەیەی بە ڕادەیەک لێ درێژ بووبوو کە هەر نەدەبڕایەوە، وای هەست دەکرد لەو پێنج دەقیقەیەدا ئەوەندە دەژی ئەوەندە دەژی کە هیچ پێویست بەوە نەکات بیر لە دوا ساتەکانی ژیان بکاتەوە. ئیدی وەختەکەی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە دابەش کرد. دوو دەقیقەی بۆ خواحافیزی لە هاوڕێکانی تەرخان کرد، نزیکەی دوو دەقیقەی بۆ ئەوە تەرخان کرد کە بۆ دواجار بۆ خۆی بیری بکاتەوە، باقیی کاتەکەی بۆ ئەوە تەرخان کرد کە نیگایەکی دەوروبەری خۆی بکات. دەیگوت جوان لە بیری ماوە کە تەواو پابەندی ئەو دابەشکردنەی وەختەکە بووە... دەبوایە لە تەمەنی بیست و حەوتساڵیدا* (٣)، لە هەرەمەی تەندروستی و لە تافی لاویدا و بمرێت. جوان جوان لە بیری بوو کاتێ دووعاخوازیی لە هاوڕێکانی کردبوو، هەندێ پرسیاری لێ کردبوون، فری بە وەزع و حاڵی ئەو ساتەیانەوە نەبووبوو، لەوەش سەیرتر زۆر

بەجیددی و بەتاسەوە گوێی لە وەڵامەکانیان گرتبوو. کە لە دووعاخوازی بووبووەوە، ئیدی نۆرەی ئەو دوو دەقیقەیە هاتبوو کە بۆ خۆی و بۆ بیرکردنەوە و رامانی خۆی تەرخان کردبوو و پێشوەختە دەیزانی دەربارەی چی بیر دەکاتەوە. دەیویست بەوپەڕی خێرایی و بەوپەڕی روونی ئەوە بۆ خۆی بەرجەستە و وێنا بکات کە وەزع و حاڵەکان چۆن دەگوزەرێت: ئەو هەنوکە و لێرەدا زندووە، بەڵام دوای سێ دەقیقەی دی دەبوو بە چی؟ دەبوو بە کەسێکی دی یان بە شتێکی دی؟ دەکەوتە کوێ؟ دەیویست هەر هەموو ئەو شتانە لە ماوەی ئەو دوو دەقیقەیەدا لە بنجوبناوان بکات و بیانزانێ!... هەر لەو نزیکانەدا، کڵێسایەک هەبووە کە گومەزە زێڕینەکەی لە بەر تیشکی هەتاودا دەدرەوشایەوە. ئێستاش لە بیری ماوە کە چۆن چاوی بڕیوەتە ئەو گومەزە و نەیتوانیوە چاو لە تیشکی هەتاوەکە بگوازێتەوە و وای هاتووەتە بەرچاو کە ئەو تیشکە بەشێکە لە ماهیەت و تەبیعەتی تازەی ئەوو، دوای سێ دەقیقەیەکی دی ئاوێتەی دەبێت و تیایدا دەتوێتەوە... دیارە ئەو گومان و نەفرەتەی لەو شتە نادیارەی لە پێشی بوو و لە ئانوساتی روودانددا بوو، یەجگار ترسناک بوو، بەڵام دەیگوت لەو دەمەدا شتی لەوە ترسناکتر و بەسوێتر ئەو بیرە بوو کە ئامانی مێشکی نەدەدا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خۆزگە نەدەمردم، چ دەبوو ئەگەر نەمردبام؟ چ دەبوو ئەگەر ژیانیان دابامەوە! لە گیانم خۆشبان! ئەگەر شتی وا دەبوو، چ ئەبەدیەتێکم بەدەست دێنا! هەر دەقیقەیەکیم دەکرد بە عومرێ! بە سەدەیەک، حیسابم بۆ دەقیقە بە دەقیقەی دەکرد، تاقە دەقیقەیەکم بەخەسار نەدەدا، تاقە زەڕەیەکیم بەفیڕۆ نەدەدا! دەیگوت ئەم بیرۆکەیە لەدوا ئەنجامدا، بوو بە ڕەنج و عەزابێکی ئەوتۆ کە خۆزیای دەخواست، یەکسەر تیربارانی بکەن تا لەو عەزابە بخەلەسێت.

میرزادە، لەناکاوا بێدەنگ بوو، هەموو چاوەڕوانی ئەو بوون کە قسەکەی تەواو بکات و ئەنجامێک بەدەستەوە بدات.

ئاگلایا پرسیی:

– تەواو؟

میرزادە، خەواڵو و خەیاڵاوی، وەکو یەکێک تازە خەو بەری دابێ گوتی:

– ها؟ بەڵێ... تەواو!

- باشە تۆ ئەمانەت بۆچی بۆ ئێمە گێڕایەوە؟

- هەروا بەڕێکەوت بیرم کەوتەوە.. تا ڕادەیەک دەگەڵ قسەکانماندا تێکی دەکردەوە!

ئالکساندرا گوتی:

- بەڵام تۆ زۆر لەناکاو و کوتوپڕ کۆتاییت بە قسەکەت هێنا. میرزادە پێدەچێ ویستبت لە میانەی قسەکەتەوە بگەیە ئەو ئەنجامگیرییەی کە هیچ سات و دەمێکی ژیان بە کوپیکان پێوانە ناکرێت، هەندێ جار پێنج دەقیقە ژیان هەموو گەنجی سەر ڕووی زەوی دێنێ؟ هەر هەموو ئەمە جوان و بەجێیە، بەڵام بە یارمەتیت پرسیاری من ئەمەیە: باشە ئەو دۆستەی ئەو هەموو بەسەرهاتە ترسناکەی بۆ گێڕایتەوە، حوکمەکەی لە ئیعدامەوە بۆ نەکرا بە بێگارە زندان؟ واتە ئەو ژیانە ئەبەدییەی پێ بەخشرا کە خۆزیای پێ دەخواست، یانی ئەوە بۆ خۆی دەسکەوتێکی یەجگار گەورە بوو، سەرمایە و دەوڵەت بوو، باشە پاشان چۆن ئەو سەرمایە و دەوڵەتەی بەکار برد؟ ئایا حیسابی وردی بۆ هەر دەقیقەیەکی دەکرد؟

- نا، نەخێر، منیش هەمان پرسیارم لێ کرد... ڕێک و ڕاست وەڵامی دامەوە، کە نەک هەر بەو شێوەیە نەژیابوو، بەڵکو زۆر دەقیقانی بەفیڕۆ دابوو.

- کەواتە ئەمە ئەزموونە و تاقیکردنەوە سەلماندوویەتی کە هیچ کەسێک ناتوانێ بە حیسابی دەقیقان ژیان بەسەر بەرێت، یانی حیساب بۆ دەقیقە بە دەقیقەی ژیان بکات، نەبا بەفیڕۆ بچێ. هەڵبەتە ئەمەش هۆی خۆی هەیە.

میرزادە گوتی:

- بێگومان، هەڵبەتە هۆی خۆی هەیە. منیش باوەڕم وایە – بەڵام وێڕای ئەوەش ناتوانم باوەڕ بکەم کە...

ئاگلایا گوتی:

- یانی دەتەوێ بڵێی، لە هەر کەسێکی دی ئاقڵانەتر دەژی؟

- بەڵێ هەندێ جار وام بە خەیاڵدا هاتووە.

- هێشتاش هەر وا خەیاڵ دەکەی؟

میرزادە، کە بەدەم هەمان بزەی ناسک و شەرمنەوە لە ئاگلایای دەڕوانی گوتی:

- بەڵێ، پێم وایە.

بەلام دوای تۆزێک، کە بەوپەڕی خۆشییەوە لەوی دەڕوانی، لە قاقای پێکەنینی دا.

ئاگلایا، بە جۆرە بێزارییەکەوە گوتی:

- چەند کەسێکی خاکییت!

میرزادە گوتی:

- بە ڕاستی ئێوە ئازان! بەغیلیتان پێ دەبەم! لە کاتێکا ئێوە پێدەکەنن، بەڵام من ئەم چیرۆکە بە جۆرێ نیگەرانی کردبووم، ترساندبوومی کە هەر هەمووی هاتە خەوم، دەتگوت خەو دەبینم، بە تایبەتی ئەو پێنج دەقیقەیە...

میرزادە، جارێکی دیکە و بە نیگای جیددی ڕوانییە کیژەکان و لە کاتێکا چاوی بڕیبووە دوڕ چاوانیان، لەناکاو و بەپەشۆکاوی پرسیی:

- خۆ ئێوە لێم تووڕە نین؟

هەر سێکیان بەسەرسامی پرسییان:

- بۆچی تووڕە بین؟

- چونکە جۆری قسەکردنەکەم، لە شێوازی دەرسگوتنەوە دەچێ...

هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد.

میرزادە گوتی:

- ئەگەر تووڕەن، بێزەحمەت لەمە بەدوا تووڕە مەبن، چونکە بە خۆم دەزانم لە خەڵکانی دی کەم ئەزموونترم، کەمتر لە خەڵکی ژیاوم و کەمتر لە خەڵکی لە ژیان دەگەم. بۆیە ڕەنگە جۆری قسەکردنەکەم غەریب بێت!...

بە ڕاستی میرزادە، زۆر پەشۆکا.

ئاگلایا، بە توندی و بە پێداگرتنەوە گوتی:

- تۆ مادامێکی دەڵێی بەختەوەر بوویت، مانای وایە لە خەڵکی زیاتر ژیاوی نەک کەمتر، ئیدی بۆچی مەوزوعەکە دەگۆڕیت و داوای بووردن دەکەیت؟ هیچ خەمی ئەوەشت نەبێ کە گوایە مامۆستا ئاسا دەرست بە ئێمە گوتووەتەوە، چونکە ئەمە هیچ سەرکەوتنێکی بۆ تۆ تیا نییە. کەشفێکی تازە نییە، چونکە پیاو دەتوانێ بەو سۆفیگەرییەی تۆ، سەد ساڵ بەخۆشی و بەختەوەری بژی، سەبارەت بە تۆ چ ڕێوڕەسمی جێبەجێکردنی ئیعدامت نیشان بدەن و چ هەر

بویەرێکی ناچیز، وەکو یەک وایە، هەمان پەند و دەرسی فەلسەفی لە هەر دووکیان هەڵدەهێنجێ و هەست بەوپەڕی شادی و ڕەزامەندی دەکەیت. هەڵبەتە ژیان بەو جۆرە زۆر ئاسانە!

خا یەپانچین، کە ماوەیەکی زۆر بوو لە سیمایان ورد دەبووەوە، هەڵی دایە و گوتی:

- ئاگلایا، نازانم تۆ بۆچی هەمیشە توڕەیت؟ من نازانم تۆ باسی چی دەکەی، بویەری ناچیز چییە، مەبەستت لەو قسەیە چییە؟ قسەکانی میرزادە، عەیبی نییە، زۆر باشی هێناوە، هەرچەندە بڕێک خەمناکە. بۆچی ساردی دەکەیتەوە ئاگلایا؟ بە پێکەنینەوە دەستی بە قسان کرد، کەچی ئێستا تەواو خەمینە، وەکو کەو چووە.

- گوێ مەدەیە دایکە! میرزادە حەیفێ کە تۆ هەرگیز ڕێوڕەسمی ئیعدامت نەدیتووە، دەنا هەندێ پرسیارم هەبوون، لێم دەکردیت.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- با، ڕێوڕەسمی ئیعدامم دیتووە.

ئاگلایا، هاواری کرد:

- دیتووتە؟ دەبوایە بە مەزەندە زانیبام!. سەیرە! کە ئیعدامت بە چاوی خۆ دیتووە، چۆن دەڵێی بە درێژایی ئەو ماوەیە خۆشحاڵ بوویت؟ هەست ناکەی هەق بە من بوو؟

ئادیلاید پرسی:

- یانی لە گوندەکەتان، خەڵکیان ئیعدام دەکرد؟

- نا، لە لیون، ئەو ڕێو ڕەسمی ئیعدامەم بینی. دەگەڵ شنایدەردا بۆ ئەوێندەر چووم. شنایدەر لەگەڵ خۆیدا بردمی، هەر کە گەیشتینە ئەوێندەر، ڕێوڕەسمی ئیعدامم بینی.

ئاگلایا، بە پێداگرتنەوە گوتی:

- ئەو دیمەنەت پێ خۆش بوو؟ هیچ دەرس و عیبرەتێکی بەسوودت لێ هەڵێنجا؟

میرزادە گوتی:

- نا، هەرگیز پێم خۆش نەبوو، بە پێچەوانەوە، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم

نەخۆش کەوتم، بەڵام پیاو ڕاست بڵێ دیمەنەکە بە جۆرێ سەرنجی ڕاکێشا بووم کە نەمدەتوانی چاوی لێ بگوازمەوە.

ئاگلایا گوتی:

- منیش ئەو دیمەنەم دیتبا، نەمدەتوانی چاوی لێ بگوازمەوە!

- لەوێ، خەڵکی حەز ناکەن، ژنان بچنە تەمەشای ئەو جۆرە دیمەنانە، تەنانەت ئەگەر ژنێک شتی وا بکات، ڕۆژنامە باسی دەکات.

- مانای وایە ئەگەر ئەم کارە بۆ ژنان بە ناپەسند بزانن، دەیانەوێ بڵێن ئەمە کاری ژنان نییە، کاری پیاوانە و بەوە پاکانە بۆ خۆ دێننەوە، کە لۆژیکێکی سەیرە! بێگومان تۆش هەمان بۆچوونت هەیە.

ئادیلاید قسەکەی پێ بڕی:

- باسی ئەو ئیعدامەمان بۆ بکە!

میرزادە، بە نیگەرانی و ناڕەحەتییەوە گوتی:

- نا، حەزناکەم، چونکە تۆزێ لەمە پێش باسی ئیعدامم بۆ یەکێک کرد.

- بۆ کێت باس کرد؟

- بەدەم چاوەڕوانییەوە بۆ خزمەتکارەکەتانم باس کرد.

هەر چوار ئافرەتەکە پرسییان:

- کام خزمەتکار؟

- ئەوەی لە پرسگەکەدایە، ئەوەی لە ژوورە چکۆلەکەی بەرەوەیە... پیاوێکی پیری سوورەیە، من لە ژوورەکەدا چاوەڕوانی ئەوە بووم کە ئیڤان فیودوروفیچ بمدینێ.

خا جەنەراڵ گوتی:

- سەیرە!

ئاگلایا گوتی:

- میرزادە پیاوێکی دیموکراتە. مادامێکی بۆ (ئالکسی)ت باس کردووە، دەبێ بۆ ئێمەشی باس بکەیت.

ئادیلاید دووبارە گوتی:

- من زۆر حەز دەکەم گوێم لەو چیرۆکە بێت، هەر دەبێ باسی بکەی!

میرزادە، ئاوڕێکی لێ دایەوە، کەمێک گەشایەوە و بە متمانە و

جۆشوخرۆشێکی خۆرسکەوە گوتی:

- تۆزێ لەمە پێش، کە داوات لێ کردم، بابەتی تابلۆیەکت بۆ پێشنیاز بکەم تا وێنەی بکێشیت، ئەوەم هات بە بیرا کە دەموچاوی کابرایەکی مەحکوم بە ئیعدام، ئیعدام بە گیوتین (مقصلە) لەساتی پێش داهاتنەوەی کێردەکە، کاتێ لەسەر سەکۆیەکە وەستاوە و دەیانەوێ، لەسەر لەوحەکە بە دەما پاڵی بخەن، بکێشیت.

ئادیلاید پرسیی:

- چۆن؟ دەموچاوی هەر دەموچاوی؟ بابەتێکی سەیرە! چۆن تابلۆیەک دەر دەچێت؟

میرزادە، بەجۆشوخرۆشەوە لەسەری ڕۆیشت:

- نازانم، بەڵام بۆ نا؟ من ماوەیەک لەوەپێش، تابلۆیەکی لەو بابەتەم لە (بازل)دا بینیی* (٤). زۆرم حەز دەکرد بۆتانی باس بکەم. ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆتانی باس دەکەم. ئەو دیمەن و تابلۆیە زۆری کار تێ کردم.

ئادیلاید گوتی:

- هەڵبەتە دەبێ باسی ئەو تابلۆیەمان بۆ بکەی کە لە شاری بازل، بینیوتە، بەلام دوایی. هەنوکە دەمەوێ باسی دیمەنی ئیعدامەکەم بۆ بکەیت. دەتوانی دیمەنەکەم، وەکو چۆن خۆت بینیوەتە، بۆ باس بکەیت؟ دەموچاوەکە چۆن وێنە دەکێشرێت؟ هەر دەموچاوێکی ڕووت بێ و تەواو؟ چۆن دەموچاوێک بێت؟

میرزادە، بە ڕادەیەک ئەم بیرەوەرییە کاری تێکرد، دەتگوت هەموو شتێکی بیر چووە، تەنیا ئەو شتە نەبێت، بۆیە یەکسەر و بەپەرۆشەوە هاتە قسان.

- ئەمەی باسی دەکەم، ڕێک یەک دەقیقە پێش مردنەکەی بوو. پاش ئەوەی بە پەیژەکەدا سەر کەوت و لەسەر سەکۆکە ڕەق ڕاوەستا، ڕێک لەو دەمەدا ئاوڕی لای منی دایەوە، نیگام لە نیگای هەڵەنگوت، سەروچاویم بینی و لە هەموو شتێک حاڵی بووم... بەڵام چۆن ئەوەوەسف دەکرێت؟ بە چ زمانێ؟ خۆزگە تۆ یان - کەسێکی دی- دەتانتوانی، وێنەی ئەو دەموچاوە بکێشن! خۆزگە بە چاوی خۆت دەتبینی! ئەوسا، ڕێک لەو دەمەدا وام هات بە خەیاڵدا، کە ئەگەر ئەم دیمەنە بکرێت بەو تابلۆیەک، لەوەیە شتێکی باش و بەسوود




دەر بچێت، بەڵام دەبێ هەموو شتێکی پێش ئەو ساتەش، هەر هەموو شتێک، بێتە بەرجەستەکردن! ئەو پیاوە لە زنداندا بوو، وای تەسەور و وێنا دەکرد، بەلای کەمەوە یەک هەفتەی دی ماوە بۆ جێبەجێکردنی ئیعدامەکەی. حیسابی ئەوەی کردبوو کە تەشریفاتی ئاسایی ئەم کارە ماوەیەک دەخایەنێت، دیکۆمێنت و سەنەد و ئەوراقەکان بۆ شوێنی دی ڤرێ دەکرێت و دوای هەفتەیەک ئەمجا دەگەڕێتەوە، بەڵام لەبەر هەندێ هۆ، ئەو تەشریفاتە ماوەیەکی کەمتری خایاند. سەعات پێنجی بەرەبەیان بوو، کابرا لە غوراِبی خەودا بوو. ئاخرو ئۆخری مانگی ئۆکتۆبەر بوو. ئەو کاتانە، سەعات پێنج دنیا هێشتا هەر تاریک و ساردە. سەرۆکی زندانەوانەکان بە خۆ و مەفرەزەیەکەوە، بەبێ خشپە، خۆی بەژوورا کرد، بە ئەسپایی شانی تەکان دا. یارۆی زندانی، هەستایە سەر ئانیشکان، کە چاوی بە ڕووناکییەکە کەوت گوتی: "چییە؟ " پێیان گوت: "خۆت ئامادە بکە، دوای سەعات نۆ ئیعدامی". کابرا هێشتا چاوی بە خەوەوە بوو. باوەڕی بە گوێی خۆی نەدەکرد، کەوتە گەنگەشە و گوتی ئەوراقەکانم بە هەفتەیەکی دی تەواو نابن، بەڵام کە خەو بەری دا و بە تەواوەتی بێدار بووەوە، بێدەنگ بوو- وایان بۆ من گێڕایەوە - پاشان کابرا گوتی: "بەڵام ئەمە ڕەوای هەق نییە، ئا ئاوا و بەو کوتوپڕی و لە ناخافڵە!" دیسان بێدەنگ بوو و ئیتر ورتەی لێوە نەهات. سێ چوار سەعاتێک سەرفی ئامادەکاری وەک: هاتنی قەشە، قاوەڵتی کە بریتی بوو لە شەراب و قاوە و گۆشت (ئاخر ئەمە گاڵتەجاڕی نییە؟ ئەگەر جوان لەو شتە ورد بینەوە، بە ڕاستی جگە لە دڵڕەقی نا چێتە هیچ خانەیەکی ترەوە! کەچی! ئەوانە بەوپەڕی دڵسافی ئەو کارە ئەنجام دەدەن و بە میهر و دلۆڤانی مرۆڤانی دەزانن !) پاشان بردیان بۆ سەر پێشاو، (پێم وایە تۆ هۆی ئەم کارە نازانیت) ئەوسا بە ناوەندی شارا بۆ لای گیوتینەکەیان برد... پێم وایە کابرا تا ئەو کاتەش، کە گالیسکەکە بەرەو گیوتینەکە دەیبرد، هەر وایدەزانی هەتاهەتایە هەر دەژی. پێم وایە بە درێژایی ڕێگە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "هێشتا ژیانێکی زۆرم لە پێشە. هێشتا سێ شەقامم لەبەردەمە، ئەم شەقامە و پاشان ئەو شەقامەی کە بە دەستە ڕاستدا نانەواخانەکەی لێیە... هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە دوکانی نانەواخانەکە!" دەوروبەری لە خەڵکیدا جمەی دەهات!

یەکپارچە ژاوەژاو و هەراوهەنگامە بوو. دە هەزار دەموچاو و بیست هەزار چاو تەمەشای ئەویان دەکرد، وەرە تەحەمولی ئەمە بکە، بە تایبەتی کە بیری لەوە دەکردەوە: "ئەو هەزار بە هەزار خەڵکەی لەو ناوەن شتاقیان ئیعدام ناکرێن، بەڵام من ئیعدام دەکرێم!". بەهەرحاڵ ئەمە هەمووی بیر و خەیاڵی پێش دوا دەقیقەی ژیانی بوو.

ئەوەتا گەیشتە پای ئەو پەیژەیەی کە بۆ گیوتینەکە سەر دەکەوت، ئەوەتا لەوێندەر، لە پای پەیژەکەدا دەوەستێ، لەناکاو لە هۆڕژنی گریان دەدات. ئەو پیاوەی کە دەیانگووت، کەسێکی جەربەزە و عەگید و ورەبەرزە و چەتە و ڕێگر و تاوانبارێکی دڵڕەق بووە. لە هۆڕژنی گریانی دا. بە درێژایی ڕێگا، کابرای کەشیش لە گالیسکەکەدا لێ دوور نەکەوتبووەوە، بەردەوام قسەی بۆ کردبوو، بەڵام پێدەچێ، کابرا کەم و زۆر گوێی لێ نەبووبێ، هەر دوای یەک-دوو وشەی هەوەڵ، ئیدی نەیتوانیوە هیچی لێ حاڵی ببێت... دەبێ شتەکان بەو شێوەیە بووبێت.

ئەوەتا وا بە پەیژەکەدا سەردەکەوێت. لاقی بە کۆت و زنجیر بوو و ناچار هەنگاوی کورتی دەنا. کەشیشەکە کە دیار بوو پیاوێکی فامیدەیە، دەستبەرداری وێردخوانی بوو و نەیدەویست لەو کاتەدا خاچەکەی بۆ ڕاگرێت تا ماچی بکات. کابرا لەسەر پەیژەکە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو. بووبوو بە زەعفەرانی زەرد، بەڵام کە پێی نایە سەر مقصلەکە (گیوتین) ڕەنگی بوو بە جاوی سپی... لەوە دەچوو لاقەکانی وشک بووبن، دەتگوت داری وشکن، پێدەچوو هێڵنجی بێت و شتێک لە ئەوکی گیرا بێت. قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان کە ترسا بیت، یان لەو ساتە ترسناکانەدا کە پیاو هۆشی بە خۆیەتی و هیچ دەلاسەتێکی نییە، هەستت بە حاڵەتێکی لەو بابەتە کردووە؟ وا تەسەور و وێنا دەکەم کاتێ پیاو ڕووبەڕووی مەترسییەکی کوشندە دەبێتەوە و هیچ دەسەڵاتێکی نامێنێ، بۆ نموونە خانوویەکی بەسەرا بڕوخێت، هەنگێ بە دەستی خۆی نییە حەز دەکات لە جێی خۆی دانیشێت و چاو بنوقێنێ، چی دەبێ با ببێت!...

کاتێ ئەو حاڵەتی سستی و داروخانە بەسەر کابرای مەحکوومدا زاڵ دەبوو، یارۆی کەشیش، بێ هیچ قسەیەک، بەلەز خاچەکەی، لە دەمی نزیک

دەکردەوە تا ماچی بکات، خاچێکی چکۆلەی زیویی چوار لقە بوو، زووزوو، لە زاری نزیک دەخستەوە... هەر کاتێ خاچەکە بەر لێوی دەکەوت، کابرا چاوی دەکردنەوە، بۆ چەند ساتێکی کەم ژیانی تێدەگەڕایەوە، دەبوژایەوە و چەند هەنگاوێکی دەنا. زۆر بە تامەزرۆیی، زۆر بەپەلە، ناچەکەی ماچ دەکرد، لە تۆ وایە، دەترسێت شتێکی پێویست و زەرووری لەبیر بچێت، بەڵام من باوەڕ ناکەم لەو ساتەدا هیچ بیر و خولیایەکی ئایینی لە سەردا بووبێ. یان بتوانێ لەو ساتەدا هەست بە هیچ سۆزێکی ئایینی بکات.

ئیدی وەزعەکە بەو دەقەوە مایەوە، تا کابرا لەسەر لەوحە دارەکەی ژێر کێردی گیوتنەکە ڕاکشا... سەیر ئەوەیە تاوانباران بەدەگمەن لەو دوا دەمانەی دواییەدا. دەبورێنەوە و لە هۆش دەچن! بە پێچەوانەوە، مێشک لەو دەمانەدا زندووتر و خێراتر دەبێت، وەکو داینەمۆ کار دەکات. دەتوانم ئەو خەیاڵانەی لەو دەمەدا بە مێشکا دێن، بەرجەستە بکەم، هەڵبەتە هەر هەمووشیان بێ سەروبەر و غەریب و تەنانەت کۆمیدییشن، بۆ نموونە ئەو پیاوەی کە زەق زەق تەمەشای من دەکات... زیپکە بە ناوچەوانیەوەیە. کابرای جەلاد، یەکێک لە دوگمەکانی چاکەتەکەی ژەنگاوییە...

پیاو لەو دەمانەدا هەموو شتێک دەزانێ، هەموو شتێک دەبینێ، هەموو شتێکی بیر دەکەوێتەوە، بەڵام خاڵێکی تایبەتی هەیە، کە نە چاوپۆشی لێدەکرێت و نە لە بیردەچێتەوە. یانی خاڵی تەوەریە و هەموو شتەکان بە دەوری ئەو خاڵەدا دەسووڕێنەوە. جا تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت کە کابرا تا دوایەمین چارەکە سانییەی دوایی، تا ئەو کاتەی کە گەردنی دەخرێتە سەر تەختەکە و ڕێک لەژێر کێردەکەدا ڕادەگیرێ هەر چاوەڕوانە... سوور دەزانێ لەناکاودا و لە ئانوساتا گوێی لە خشەی داهاتنەوەی کێردەکە بۆ سەر ملی، دەبێت، هیچ چارێکی نییە و هەر گوێی لەو دەنگە دەبێت! ئەگەر من لەجیاتیی ئەو کەسە بام و بخرابامە ژێر کێردی گیوتن، بە دڵ و بە گیان، بە ئانقەست گوێم هەڵدەخست تا گوێم لەو دەنگە ببێ و هەڵبەتە گوێم لە دەنگی داهاتنەوەی کێردەکە دەبوو! ڕەنگە ئەمە تەنیا یەک دەیەمی سانیەیەک بخایەنێ، بەڵام هەر دەبیسترێ! تەسەور بکە، خەڵکانێک باسی ئەوە دەکەن، کاتێ سەرەکە لە جەستە جیا دەبێتەوە و دەکەوێت، لەوەیە هێشتاش بۆ

ماوەی سانییەیەک، هۆشی تیا بێ و بزانێت کە لە جەستە جیا کراوەتەوە! .. یەکو لەو هەستە!... تەسەور بکە ئەگەر ئەو هەستە پێنج سانییەیەک بخایەنێ چ دەبێ؟...

تۆ وێنەی گیوتنەکە بە جۆرێ بکێشە کە تەنیا دوا پلەی سەرکەوتنی کابرای تاوانبار بۆ سەر سەکۆکە، لە بینەرەوە دیار بێ، کابرا لەو دەمەدا کە پێ دەخاتە سەر ئەم دوا پلەیە وێنە بکێشە، ڕەنگی تەواو زەردا هەڵگەڕا بێ، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبێت و کەشیشەکە خاچەکەی بۆ بردبێتە پێشێ و کابرا لێوەشین هەڵگەڕاوەکانی لێی بردبێتە پێشێ و بەدەم تەمەشا کردنەوە هەموو شتێک بزانێت. یانی خاچ و کەللەسەرەکە بابەتی سەرەکیی تابلۆکەی تۆ دەبێت، بەڵام سەروچاوی کەشیشەکە و جەلادەکە و دوو یاریدەدەرەکەی و سەروچاوی کۆمەڵێک لە تەمەشاڤانانی خوارەوە، دەشێت وەکو باکڕاوندێکی دوور و تەماوی تابلۆکە بەکار ببرێت.. ئیدی تابلۆ هەی تابلۆ. من بە خەیاڵی خۆم تابلۆکە بەو جۆرە دەبینم.

میرزادە، بێدەنگ بوو، بەئارامی ڕوانییە گوێگرەکانی:

ئالکساندرا وەکو ئەوەی خۆی بدوێنێ گوتی:

– هەڵبەتە ئەم تابلۆیە هیچ جۆرە تەسەوفێکی تیا نییە!

ئادیلاید پێشنیازی کرد:

– هەنوکە، باسی ئەشق و ئاشقێنیی خۆتمان بۆ بکە!

میرزادە، بەسەرسامی تەمەشای کرد. ئادیلایدا بەپەلە گوتی:

– گوێ بگرە. دەبێ باسی ئەو تابلۆیەی شاری (بازل)مان بۆ بکەیت، ئەمەیان با بمێنێ بۆ دوایی، بەڵام ئێستا حەز دەکەم باسی ئاشقێنیەکەی خۆتمان بۆ بکەی. حاشای لێ نەکەیت، چونکە ماقوول نییە ئاشق نەبوبیت، ئەوەش بزانە کە دەستت بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی خۆت کرد، ئیدی فەیلەسووف نیت، یانی شتەکە مەفەلسەفێنە.

ئاگلایا، لەناکاو لێی پرسی:

– نازانم بۆچی کاتێ لە گێڕانەوەی هەر حیکایەت و سەربهوردێک دەبێتەوە، هەست بە جۆرە شەرمەزارییەک دەکەیت، وەک بڵێی لە قسەکانی خۆت ژێوان دەبیتەوە، نازانم بۆچی؟

خا یەپانچین، نیگایەکی سەرزەنش ئامێزی ئاگلایای کرد، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- دە گەوجە گەوج! ئەم قسانە چییە!

ئالکساندرا، قسەکەی دایکی سەلماند و گوتی:

- وەڵڵا ڕاست! ئەم گەوجە گەوجە چییە؟

خا جەنەراڵ، ئاوڕی بۆ لای میرزادە دایەوە و گوتی:

- میرزادە، لێی مەگرە ئەو قسەیەی بە ڕاست نییە، تەنیا بۆ هەوەسە و هیچی تر، دەیەوێ سەر بکاتە سەرت، دەنا ئەوەندە بێئەدەب نییە! کە دەبینی سەر دەکەنە سەرت، گوێیان مەدەیە، گومانی خراپ نەکەیت. ڕەنگە لە شتێک پەست بووبن، بەڵام تۆیان خۆش دەوێ، من دەیانناسم. دەموچاویان دەخوێنمەوە!

میرزادە، قسەکانی خا یەپانچینی سەلماند و گوتی:

- منیش دەموچاویان دەخوێنمەوە، سیمایان دیارە.

ئادیلاید، بە کونجکاوییەوە گوتی:

- چۆن؟

دوو کیژەکەی دی، بەتاسەوە پرسیان:

- چی لە دەموچاومانا دەخوێنیتەوە؟ چی بە سیمامانەوە دیارە؟

بەڵام میرزادە، بێدەنگ بوو، هەموو کیژەکان چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بوون.

ئەوجا میرزادە بە ئەسپایی و بە جیددی گوتی:

- دوایی باسی ئەمە دەکەم!

ئاگلایا هاواری کرد:

- تۆ دەتەوێ بمانخەیتە سەر کەڵکەڵە! بۆ خۆت وەک بەرزەکی بابان بۆی دەر بچیت! چەندیش بەجیددیتە!

ئادیلاید، دووبارە بەلەز گوتی:

- زۆر باشە، ئەگەر ڕاست دەکەیت و کەسێکی ئەوەندە سەرناسیت و سیمای خەڵک دەخوێنیتەوە، دیارە دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاشقێکی شەیداش بووبی. کەواتە مەزەندەکەم ڕاست دەر چوو. دەی بۆمانی بگێڕەوە!

میرزادە، بە هەمان دەنگی ئارام و بەویقار بەرسڤی دایەوە:

- من هەرگیز ئاشق نەبووم، بەڵام بە شێوەیەکی دی خۆشحاڵ و دڵخۆش بووم.

- چۆن؟ بە چ شێوەیەک؟

- دەی باشە. دەیگێڕمەوە بەڵام.

میرزادە، بەدەم مینگە مینگ و حەواس پەرتییەوە، ئەو قسەیەی کرد.

پەراوێز:

* - "وەسفی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لەمێژە کراوە، کۆنە": ئەمە لە قەسیدەیەکی لیرمانتۆفەوە، بە ناوونیشانی (ڕۆژنامەوان و خوێنەر و نووسەر) وەر گیراوە، بە دەستکارییەوە، وەر گیراوە.

* - " ئەمە پیاوێک بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی دیدا، بە تۆمەتی سیاسی، حوکمی تیرباران درابوو..." ئانا، بێوەژنەکەی دۆستۆیفسکی لە نووسینێکیدا دەڵێت: "دۆستویفسکی بە باسی بیرەوەریەکانی جێبەجێکردنی حوکمی ئیعدام بەسەر گروپی بتراشفکیدا، زۆر خەمبار دەبوو، ئازاری پێ دەخوارد، بۆیە زۆر بە کەمی دەیگێڕایەوە و باسی دەکرد، بەڵام من بە خۆم سێ جار گوێم لێ بووە، بە هەمان ئەو شێوانەی کە لە ڕۆمانی (گەمژە)دا هاتووە، گێڕاویێتیەوە.

* - "من ماوەیەک لەوە پێش، تابلۆیەکی لەو بابەتەم لە بازلدا بینی..." دۆستویفسکی، لە مانگی ئابی ١٨٦٧دا سەردانی موزەخانەی بازلی کردووە و هەندێ تابلۆ، زۆر کاریان تێ کردووە، لێرەدا ئاماژە بۆ تابلۆکەی هانس فریس (پەراندنی سەری قەشە یوحەنای مەعمەدان- ١٥١٤) دەکات. کە هێشتا بە زندوویەتی لەژێر شمشێری جەلادەکەدا، تەمسیلی پێغەمبەری دەکرد.

## فەسڵی شەشەم

میرزادە دەستی بە قسان کرد، گوتی:

- هێندە بە کونجکاوی و تامەزرۆیی دەڕوانن، پێم وایە ئەگەر ئەو تامەزرۆیی و تاسەیەتان پاراو و تێر نەکەم. ڕەنگە تووڕە ببن!

ئەوسا، بزەیەکی بۆ کرد و بەلەز گوتی:

- نا، نا، گاڵتە دەکەم. کۆمەڵێک منداڵیش لەوێندەر بوون. هەموو کاتێ هەر دەگەڵ منداڵەکاندا بووم، تەنیا دەگەڵ منداڵەکاندا، منداڵانی گوندەکەدا، کە هەموو مەکتەبلی بوون، وەختی خۆم بەسەر دەبرد. من مامۆستایان نەبووم، نا. مامۆستایەکیان هەبوو نێوی ژول تیبۆ بوو، من جارجار شتێکی کەم، شتۆکەیەکم فێر دەکردن، گرینگ ئەوە بوو زۆربەی کات دەگەڵ واندا بووم، هاوڕێیان بووم، هەموو چوار ساڵەکەی ئەوێندەرم دەگەڵ واندا ڕابوارد. جگە لەوە هیچ ئارەزوویەکی ترم نەبوو، پێویستم بە هیچ شتێکی دی نەبوو، هەموو قسەیەکم دەگەڵدا دەکردن، هیچم لێ نەدەشاردنەوە، وای لێ هات، لە ئەنجامدا، باب و داک و خزمەکانیان هەموو ڕقیان لێم بوو، چونکە منداڵەکان بە جۆرێ هۆگر و متووی من بووبوون کە بەبێ من هەڵیان نەدەکرد، هەمیشە بەدەوری منەوە بوون. خۆ مامۆستا و بەڕێوەبەرەکەیان هەر مەپرسە، بوو بە دژمنی هەرە گەورە و سەرسەختی





من. لەوێندەر و بە هۆی ئەو منداڵانەوە، دژمنێکی زۆرم بۆ خۆ پەیدا کرد. تەنانەت شنایدەریش سەرزەنشتی دەکردم. نازانم ئەوانە ئەو هەموو ترسەیان لە چی بوو؟ پیاو دەتوانێ هەموو شتێک بە منداڵ بڵێت، هەر هەموو شتێک، جڵەوی منداڵ بە هیچ شتێک ناگیرێت، هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووم کە خەڵکی گەورە چەند لە دنیای منداڵ بێخەبەر و غافڵن، تەنانەت داک و بابانیش هیچیان دەربارەی منداڵەکانی خۆشیان نەدەزانی. شاردنەوەی هەر شتێک لە منداڵان بەو بیانووەی کە هێشتا بچووکن. وەختی ئەوە نەهاتووە ئەو شتە بزانن، بە ڕاستی بیرۆکەیەکی نابەجێ و خەمناکە! منداڵان، زۆر بەئاسانی هەست بەوە دەکەن، کە داک و بابیان، لەوە بە بچووکتریان دەزانن کە بتوانن تێبگەن و شت بفامن، لە کاتێکا لە هەموو شتێک تێدەگەن! (جاری وایە لە ئاسیترین بابەتدا، شتی وا دەڵێن، کە بە ئەقڵی هیچ گەورەیەکدا نایەت.) سوبحانەڵڵا کاتێ ئەم باڵندە چکۆلە جوانە، بەوپەڕی خۆشحاڵی و متمانەوە تەمەشات دەکات، ئایا دەتوانی فێڵی لێ بکەیت و هەست بە تەریقی و شەرمەزاری نەکەیت؟ من بۆیە ناوم ناون باڵندە، چونکە، لەم دنیایەدا هیچ شتێک لە تەیر و باڵندە جوانترو موبارەکتر نییە!

بەڵێ، هەموو خەڵکی گوندەکە، لەبەر هۆیەکی تایبەتی و دیار، لێم بەقینا چووبوون، لێم بێزار بوون، بەڵام ڕقەکەی مامۆستا تیبو، بەغیلی و حەسوودی بوو. لە هەوەڵەوە کە دەیبینی، منداڵەکان زۆر بە هاسانی و بە ڕوونی، من هەرچییەک دەڵێم فێری دەبن و هیچ شتێک لەوەوە فێر نابن، بەسەرسامی سەرێکی با دەدا و هیچی نەدەگوت، بەڵام پاشان کە پێم گوت، ئێمە، نە من و نە ئەو، ناتوانین هیچ فێری ئەو منداڵانە بکەین، چونکە هیچمان پێ نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوان دەتوانن، ئێمە فێر بکەن. یانی ئەوان هیچ لە ئێمەوە فێر نابن، بەڵام ئێمە زۆر شت لەوانەوە فێر دەبین، هەنگی کەوتە گاڵتەپێکردنم. نازانم چۆن دەیتوانی بەغیلی بە من بەرێت و گاڵتەم پێ بکات، لە کاتێکا کە ئەو بە خۆیشی لە ناو منداڵەکان و دەگەڵ منداڵەکاندا دەژیا. پیاو کە دەگەڵ منداڵدا هەڵسووکەوت دەکات، دڵ و

دەروونی دەکرێتەوە، ڕوحی پاک دەبێتەوە!... لە ئاسایشتگەکەی شنایدەردا، نەخۆشێکی زۆر داماو هەبوو، ئیدی ئەمە زۆر کڵۆڵ و داماو بوو، وەزع و حاڵی بە ڕادەیەک خراپ بوو کە زەحمەت بوو وێنەی پەیدا ببێ. وەکو شێتێک لەوێندەر گل درابووەوە و چارەسەرو دەرمان دەکرا، بەڵام من پێم وایە نەخۆشییەکەی ئەو شێتی نەبوو، بەڵکو کەسێک بوو، بەدەم داخ و کەسەرێکی زۆر ترسناکەوە دەتلایەوە.. هەموو نەخۆشییەکەی ئەوە بوو. خۆزگە دەتان زانی ئەنجام منداڵەکان چ کارێکیان تێ کرد! با باسی ئەم نەخۆشە هەڵگرین بۆ دوایی. جارێ باسی ئەوەتان بۆ دەکەم، کە ئەم مەسەلەیە چۆن لە سەرەتاوە دەستی پێ کرد. منداڵەکان لە هەوەڵەوە خۆشیان نەدەویستم، چونکە هەم گەورە بووم و هەم بێدەسەڵات و بێ سەروبەر بووم. بە خۆیشم دەزانم کە جوان و قۆز نیم، لە هەموو ئەمەش خراتر بابایەکی بێگانە بووم. منداڵەکان لە هەوەڵەوە گاڵتەیان پێ دەکردم، نەک هەر گاڵتە، بەڵکو کە دیتیان ماری ماچ دەکەم، دەستیان بە بەردبارانم کرد. هەڵبەتە تەنیا یەک جارم ماچ کرد.

میرزادە، کە بینیی کیژەکان، خەریکە بزەی تەوسامێزیان دێتێ، بەپەلە و بۆ ئەوەی ڕێگە لە بزەکانیان بگرێت گوتی:

- نا، نا، پێ مەکەنن. مەسەلەکە هیچ پەیوەندییەکی بە ئەشق و خۆشەویستییەوە نەبوو، ئەگەر دەتانزانی چ بەشەرێکی کڵۆڵ و نەگبەتە وەکو من، دڵتان بە حاڵی دەسووتا. ماری خەڵکی گوندەکە بوو، پیرەژنێکی پیری دایکی هەبوو، بە ئیزنی کوێخای گوند، ڕێ درابوو، کە یەکێک لە پەنجەرەکانی کوختەکەی بکات بە دوکانوچکەیەک و لەوێندەرەوە دەرزی و داو و توتن و سابون و ئەوە جۆرە وردەواڵە هەرزانبەهایانە بە کڕیاران بفرۆشێت و بەو گیانە مەرگییە، بژێویی خۆی پەیدا بکات. ئەم پیرەژنە نەخۆش بوو، باداری دەگەڵدا بوو، لاقەکانی بە جۆرێ ئاوسا بوون کە نەیدەتوانی ڕێ بکات. بە درێژایی وەخت لە بەر پەنجەرەکەدا دانیشتبوو. ماری کچی بوو، لە تەمەنی بیستساڵیدا بوو، هێندە باریک و بنێس و لەڕولاواز بوو، فووت لێ کردبا، با دەیبرد. دەمێ بوو تووشی سیل

بووبوو، بە ڕاستی بە هۆی ئەو نەخۆشییەوە، تواببووەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش کارەکەری ماڵانی دەکرا، بۆ نموونە ژووری دەسڕی، جلشۆریی دەکرد، قاپوقاچاغی دەشت، ناو حەوشەی گسک دەدا، بە حەیوانات و ماڵاتی نێو گەوڕ و پشتیرانیش ڕادەگەیشت. چەرچییەکی فەرەنسی کە بە گوندەکەدا تێدەپەڕێ، فریوی دەدات و هەڵی دەگرێت، بەڵام دوای یەک هەفتە لە ناوەندی ڕێگادا بەرەڵلای دەکات و وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەر دەچێت. کیژەی بەستەزمان، بەدەم دەرۆزە و گەداییەوە، شەکەت و ماندوو، سەروپۆتەڵاک تۆزاوی، جلوبەرگ شڕۆڵە و پێڵاو دڕاو، دوای ئەوەی یەک هەفتەی تەواو بەڕێوە دەبێ، ئیدی لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا لە لاڕێ و دەشت و بیاباندا دەخەوێ، سەرمای دەبێت، هەر دوو پێی یەکپارچە دەبن بە زام و تلۆقە، دەستەکانی دەئاوسێن و دەقڵەشێن... ئا بەو ڕەوش و وەزع و حاڵەوە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە. هەڵبەتە ئەم کیژە پێشتریش جوان نەبوو، بەڵام دووچاری مەنگ و میهرەبان و بێگەردیی پێوە بوو. کیژێکی زۆر بێدەنگ بوو، لەڕادەبەدەر بێدەنگ بوو. کاتی خۆی، زوو، جارێک بەدەم کارکردنەوە، لەناکاوا هەڵی کردبووە گۆرانیچڕین و ئێستاش، لە بیرمە کە چۆن ئەو خەڵکە بەسەرسامی و حیرەتەوە کەوتنە گاڵتەپێکردنی: "ئاهـا! ماری گۆرانی دەڵێت؟ دە تەمەشا!". ماری، زۆر پەشۆکا، بە جۆرێ تەریق بووەوە کە لەو ڕۆژە بەدواوە کەس نە گوێی لە گۆرانیچڕینی بوو و نە لە قسەکردنی، ئەو سەردەمە هێشتا خەڵکی لەگەڵیا باش بوون، بەڵام پاش ئەوەی بەو حاڵە بێحاڵەوە، بەو نەخۆشی و شڕۆڵەییەوە، گەڕایەوە، کەس کەمترین بەزەیی پێدا نەدەهاتەوە. جا بڕوانە دڵڕەقیی ئەو خەڵکە لەو جۆرە بارودۆخەدا! ئەوەی سۆز و بەزەییە لە بیروبۆچوونە نەگۆڕ و پێشوەختەکانیاندا نەبوو! دایکی یەکەمین کەس بوو کە بەوپەڕی قار و غەزەبەوە پێشوازیی کرد. پێی گوت: "تۆ بوویتە مایەی سەرشۆڕیی من! ئابڕووت بردم!". ئەوەی ڕاستی بێ دایکی یەکەم کەس بوو کە کردی بە مەخسەرەی خەڵکی، دەمی خەڵکی لێ کردەوە، کردی بە گەپچاڕی ئاشنا و بێگانە. کاتێ خەڵکی گوندی زانییان کە ماری گەڕاوەتەوە، زۆربەیان

ڕێکەوتن کە لە کوختە پەڕپوتەکەی پیرەژندا خڕ ببنەوە: پیر و منداڵ، ژنان و کچان: ئاپۆڕایەکی شپرزە و کونجکاو کۆ بوونەوە! ماری، شڕۆ شەپرێو، برسی و چاو بە گریان، لە بەرپێی پیرەژندا، لە عاردی کەوتبوو. کە چاوی بە ئاپۆڕای ئەو خەڵکە کەوت، دەموچاوی لەنێو قژە پەخش و پەریشانەکەیدا شاردەوە و هێندەی دی خۆی قانگڵە کرد. هەموو بە جۆرێ سەیریان دەکرد وەکو ئەوەی حەیوانێکی گلاو بێت. پیرەژنان سەرکۆنەیان دەکرد و جنێویان دەدایە، گەنجان گاڵتەیان پێ دەکرد. ژنان، سەرکۆنەیان دەکرد و بە قێزوبێزەوە تەمەشایان دەکرد، وەک ئەوەی کرمی جاڵجاڵۆکە بێت. دایکەکەی نەک هەر ڕێگەی ئەم هەموو سەرزەنشت و بێزکاڵییەی دەدا، بەڵکو زۆریشی لە گیان خۆش بوو، سەری ڕەزامەندیی بۆ یەک بە یەکیان دەلەقاند. پیرەژن بە خۆی نەخۆش بوو، کە ئەو خەفەتەشی هاتە سەر، هێندەی دی دەردی گران بوو، گەیشتبووە حاڵی مردن. ئیدی دوای دوو دانە مانگان بەرگەی نەگرت و مرد. دەیزانی دەمرێت، بەڵام تا مردیش دەگەڵ کیژەکەیدا هەر ئاشت نەبووەوە و زاری لە زاری نەگەڕا. لە داڵانە ساردوسڕەکەدا دەیخەواند و هەر بۆ ئاهی سوێند خواردنی دەدایە. پیرەژن، هەمیشەی خوا پێویستی بەوە بوو لاقە نەخۆشەکانی لە ئاوی گەرم بنێ، ماری، هەموو ڕۆژێ ئەم کارەی بۆ دەکرد، پێی ڕادەگەیشت و بە هەموو پێویستییەکیدا ڕادەگەیشت. پیرەژن، بەبێدەنگی، ئەم کۆمەکەی ماریی قەبووڵ دەکرد و بەڵام قەت تاقە قسەیەکیشی دەگەڵ نەدەکرد.

ماری، هەر هەموو ئەمەی قەبووڵ دەکرد، پاشان کە زیاترم ناسی، دیقەتم دا کە خۆی ئەم مامەڵە و بەرخوردەی پێ خۆشەو، خۆی لە ناکەسترین کەس پێ کمتر و سووکتر بوو. کە پیرەژن، کەسیرە بوو و لە جێدا کەوت، پیرەژنانی گوند، بە پێی ڕەسم و دابونەریتی ناوچەیی خۆیان، یەک یەک و بەنۆرە چاودێری و ئاگادارییان دەکرد، ئیدی لەو کاتەوە کەس ڕووی بە ماری نەدەدا، پاڕووە نانێکیان نەدەدایە، ڕووی بکردایە هەر کەس و ماڵێکی گوند وەدەریان دەنا، ڕێک بە پێچەوانەی جارانەوە، نەک هیچ کارێکیان نەدەدایە، بەڵکو تفبارانیشیان دەکرد، لەوە دەچوو پیاوانیش

حیسابی ئافرەتی بۆ نەکەن و شەرماوەرترین قسەیان لە حوزوریدا دەکرد. هەندێ جار، هەڵبەتە زۆر بەدەگمەن، کاتێ ڕۆژانی یەک شەممە سەرخۆش دەبوون، هەر بۆ پێکەنین و ڕابواردن چەند قرۆشێکیان لە بەردەمیا فڕێ دەدایە عاردی، ماریش بەبێدەنگی، بێ ئەوەی فزەی لێوەبێت، سکەکانی هەڵدەگرتەوە. ئیدی لەو کاتەوە کەوتبووە کۆکە و خوێن هەڵێنان. ئەنجام جلەکانی بە جۆرێ شڕۆشەپڕێو بوو کە ڕووی نەدەهات لەنێو گوندیدا دەر بکەوێ، لەوساوە کە گەڕابووەوە، بە پێ خاوسی دەگەڕا. ئیدی هەر لەو سەروبەندەوە، منداڵە مەکتەبلی - کە ژمارەیان نزیکەی چل مەکتەبلییەک دەبوو- گێچەڵیان پێ دەکرد و لاساییان دەکردەوە و تەنانەت قوڕبارانیشیان دەکرد.

ماریا، داوای لەگاوانەکەی گوند کرد، کە ڕێی بدات چێڵەکانی بۆ بلەوەڕێنێ، لێ یارۆی گاوان دەری کرد. پاشان ماری، خۆبەخۆ و بێ ئیزنی یارۆی گاوان، هەموو بەیانییەک دووی گاگەلەکە دەکەوت و ڕۆژ تا ئێوارێ لەو دەشتودەرە بوو. یارۆی گاوان کە بینیی ئەمە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ وی، ئیدی نەک هەر دەری نەدەکرد، بەڵکو هەندێ جار، پاشماوەی نان و پەنیرەکەی خۆیشی دەدایە و بە خەیاڵی خۆی خێرێکی گەورەی دەکرد.

کاتێ دایکی مرد، ڕەبەنی گوندی، هیچ شەرمی نەکرد لەوەی کە بە بەرچاوی هەموو خەڵکییەوە، سەرزەنشت و سەرکۆنەی ماری بکات. ماری بە جلە شڕ و شەپڕێوەکانیەوە و بەدەم گرییە و ناڵینەوە بە دووی جەنازەکەدا ڕێی دەکرد. خەڵکێکی زۆریش دووی جەنازەکە کەوتبوون. یارۆی ڕەبەن، کە هێشتا گەنجبوو و هەموو ئاوات ئارەزوویەکی ئەوە بوو ببێ بە واعیزێکی ناودار و گەورە، ڕێک لەو دەمەدا کە قامکی بۆ ماری ڕاکێشابوو، ڕوو لە خەڵکەکە گوتی: "ئا ئەمە، سەبەبکاری مەرگی ئەو ژنە بەڕێزەیە – هەڵبەتە ڕاستی نەدەکرد، چونکە پیرەژنی تاین دوو ساڵ بوو نەخۆش بوو- ئا ئەوەتا لە بەردەمتانا وەستاوە و زات ناکات چاوان هەڵبڕێ، چونکە گوناهبار و ڕووڕەش و سەرشۆڕی بەردەم خوا و خەڵکە، ئەوەتا ڕووت و ڕەجاڵ، شڕوشەپڕێو، پێخاوس، تا ببێت بە پەند و عیبرەت

بۆ ئەوانەی حەیا و حورمەت لەدەست دەدەن، ئابڕووی خۆیان بە تکان دەدەن! کێ بێ باشە؟ کچیەتی، کچ! " زۆر قسەی قۆڕی دیکەی لەو بابەتە!...

تەسەور بکەن، کە ئەم گوتارەی کابرای ڕەبەن، ئەو هەموو سووکایەتییە، زۆربەی هەرە زۆری حەشاماتەکەی دڵخۆش کرد، بە دڵیان بوو، بەڵام لەو دەمەدا بویەرێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا، هەموو منداڵەکان لایەنگری مارییان کرد، چونکە لەو ماوەیەدا هەموو متووی من بووبوون و مارییان خۆش دەویست. بویەرەکە بەم جۆرە دەستی پێ کرد:

دەمویست فریای ماری بکەوم و شتێکی بۆ بکەم. ماری پێویستی بە تۆزێ پارە بوو، شنقڕی لە بەرکدا نەبوو، بەڵام منیش ئەو کاتەی لەوێندەر بووم، تاقە قرۆشێکم شک نەدەبرد. دەرزیلەیەکی چکۆلەی ئەڵماس نیشانم هەبوو، چەرچییەک هاتە گوندی و دەرزیلەکەم پێ فرۆشت. من بە هەشت فرانک پێم فرۆشت، بەڵام فرێت دابا چل فرانکی دێنا. ماوەیەکی زۆر بەدووی ماریدا گەڕام، دەمویست بە تەنیا بیدینم. ئەنجام لە دەرێی گوندا، لە نزیکی دارێکی سەر ئەو کوێرە ڕێگایەی کە بۆ کوێستانەکان دەچوو ماریم بینی. هەشت فرانکەکەم دایە، ئامۆژگاریم کرد کە دەستی پێوە بگرێ، چونکە پارەی دیکەم نییە بیدەمێ. ئەوسا ماچم کرد و پێم گوت وا زەن نەکات نیازم خراپە، لەبەر ئەوە ماچم نەکرد کە ئاشقی بووبم، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوە بوو زۆرم بەزەیی پێدا دەهاتەوە و پێم گوت کە هەرگیز، ڕۆژێ لە ڕۆژان بە تاوانبار و خەتابارم نەزانیوە، بەڵکو بە قەرەبەخت و نەگبەتم زانیوە، زۆرم حەز دەکرد دڵخۆشی بدەمەوە و قەناعەتی پێ بێنم کە نابێ خۆی لە هیچ کەسێک بە کەمتر بزانێت، نابێت لەهەنبەر کەسدا هەست بە شەرمەزاری و سەرشۆری بکات، بەڵام پێ نەدەچوو لە مەبەستم حاڵی بوو بێت، یەکسەر هەستم بەوە کرد، هەرچەندە بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر بێدەنگ بوو، چاوی بڕیبووە ئەرزەکە و یەجگار تەریق و شەرمەزار دیار دبوو، کە من لە قسەکانم بوومەوە، لەناکاو پەلاماری دەستی دام و ماچی کرد، منیش یەکسەر پەلاماری دەستیم دا کە ماچی بکەم، بەڵام دەستی لە

دەستم ڕاپسکاند و نەیهێشت ڕای مووسم.

ڕێک لەو کاتەدا منداڵەکان پەیدا بوون و ئێمەیان بینی. پاشان زانیم، تومەز ماوەیەکی ماوەیەکی زۆر بوو، تاقیبی منیان دەکرد. منداڵەکان کەوتنە فیکەکێشان و چەپڵەلێدان و هوراکێشان. ماری هەڵات. ویستم قسەیان بۆ بکەم، کەچی کەوتنە بەردبارانم. ئیدی هەر هەمان ڕۆژ هەموو گوند بە هەواڵەکەیان زانی. هەر هەموو ئەمە بەسەر ماریدا شکایەوە. هێندەی دی لێی چوون بەقینا و کەوتنە بوغزاندنی. تەنانەت بیستمەوە کە بە نیازن دادگایی بکەن و سزای بدەن، بەڵام شوکر بۆ خوا مەسەلەکە بەخێر گەڕا، لە سنووری قسان تێنەپەڕی! بەڵام منداڵەکان لەو ڕۆژە بەدواوە هەراسانیان لێ هەڵگرت، لە جاران زیاتر سەریان دەکردە سەری، ئەزیەتیان دەدا و قوڕبارانیان دەکرد. دوای دەکەوتن، ئەویش غاری دەدا، بەڵام زوو بە زوو بە هۆی سینەی نەخۆشییەوە، کە سیلی بوو، هانکەهانکی پێ دەکەوت و بڕستی لێدەبڕا. هەزار و یەک جنێوی سەر بە کوڵکەیان دەدایە. تەنانەت جارێکیش لەسەر ئەوە دەگەڵیاندا بەشەڕ هاتم. دوای ئەوە لەگەڵیاندا کەوتمە گفتوگۆ، هەموو ڕۆژێک کە دەرفەتم بۆ هەڵدەکەوت قسەم بۆ دەکردن. ئیدی دەوەستان تا گوێم لێ بگرن، کەچی وێڕای ئەوەش لە جنێو و سخێفان نەدەکەوتن، بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد و جوێنیان دەدامێ. باسی کڵۆڵی و داماوی و قەرەبەختی ماریم بۆ دەکردن، هەنگێ لە جنێودان دەکەوتن و بە بێدەنگی دەڕۆیشتن. بەرەبەرە کەوتینە گفتوگۆ. هیچ شتێکم لێ نەدەشاردنەوە، هەموو شتێکم بەڕاشکاوی پێ دەگوتن، بەوپەڕی کونجکاوی گوێیان لێ دەگرتم. زۆری نەبرد، وایان لێ هات دڵیان بە حاڵی ماری دەسووتا، بەزەییان پێدا دەهاتەوە. کار گەیشتە ئەوەی هەندێکیان، ئەگەر بەڕێکەوت لە ڕێگەوبانا مارییان دیتبا، بەوپەڕی مێریڤانی سڵاویان لێ دەکرد، لەوێ دابونەریت وایە، ئەگەر لە ڕێگەوبان تووشی هەر کەسێک ببن، چ بیناسن، چ نەیناسن، سڵاوی لێ دەکەن. جا خۆتان تەسەوری بکەن دەبێ ماری چەند لەم کارەی ئەم منداڵانە حایر مابێت.





جارێکیان دوو کچۆڵە، خواردنیان ئامادە کردبوو و بۆ مارییان بردبوو، پاشان هاتن بۆ منیان گێڕایەوە. گوتیان ماری، دەستی بە گریان کردووە، ئەمێستا نەک ڕقیان لێی نییە، بەڵکو زۆریانیش خۆش دەوێ. ئیدی وای لێ هات هەموو منداڵەکان نەک هەر ئەو، بگرە منیشیان خۆش دەویست. زۆر جار دەهاتنە نک من و داوایان لێ دەکردم چیرۆک و حیکایەتیان بۆ بگێڕمەوە. پێم وایە چیرۆکبێژێکی باش بووم، چونکە زۆریان حەز دەکرد گوێم لێ بگرن. ئیدی لەوە بەدوا خووم دایە خوێندنەوەی کتێبان و فێربوونی شت، هەر بەو مەبەستەی ئەوەی خوێندوومەتەوە و فێری بووم، بۆ منداڵەکانی بگێڕمەوە. ئیدی سێ دانە ساڵم بەو جۆرە لەوێندەر گوزەراند، پاشان، کاتێ خەڵکی گوندو، تەنانەت شنایدەریش، لێم کەوتنە گلەیی ئەوەی کە گوایە بە جۆرێ دەگەڵ منداڵاندا قسان دەکەم و هیچیان لێ ناشارمەوەوەک بڵێی خەڵکی گەورەبن، وەڵامم دەدانەوە کە زۆر شەرمە درۆ دەگەڵ منداڵاندا بکەین، چونکە منداڵان بە خۆیان، چەندیش هەوڵ بدەین شتەکانیان لێ بشارینەوە، خۆ بە خۆ هەموو شتێک تێدەگەن و دەزانن. بۆیە ئەو شتەی کە ئێمە لێیان بشارینەوە ڕەنگە بە لنگەوقووچی لێی بگەن، بە نادروستی تێی بگەن و فێری ببن، بەڵام من بەدروستی تێیان دەگەیەنم. پیاو کە بیر لە منداڵیەتیی خۆی بکاتەوە ئەوسا دروستیی ئەم قسانەی منی بۆ دەر دەکەوێ، بەڵام هەر چیم کرد و کۆشا نەمتوانی قەناعەتیان پێ بێنم...

من، ماریم پێش مردنی دایکی بە دوو هەفتە ماچ کرد، بەڵام ئەو کاتەی ڕەبەنەکە وەعزەکەی خۆی دادا، هەموو منداڵەکان لایەنگری من بوون، یەکسەر کەوتمە باسی ڕەفتاری وی بۆ منداڵەکان. هەر هەموویان لێی تورە بوون، هەندێکیان بە ڕادەیەک لێی تورە بوون، کە پەنجەرەی ماڵەکەیان بەر بەرد دا و شووشەکانیان شکاند. من ڕێم لێ گرتن و تێم گەیاندن کە ئەم کارەیان، کارێکی دزێو و خراپە، بەڵام خەڵکی گوندەکە، هەموو بەم واریقاتەیان زانی، بەوە تاوانباریان کردم کە منداڵەکان گومڕا دەکەم و لە ڕێگەی ڕاست دەریان دەکەم. پاشان کە زانییان، هەموو منداڵەکان بەلای

ماریدا بایان داوەتەوە و خۆشیان دەوێ، هێندەی دی شپرزە و نیگەران بوون، بەڵام ماری زۆر دڵی خۆش بوو.. بەهەرحاڵ نیگەرانی و شپرزەیی خەڵکی گوندەکە گەیشتە ڕادەیەک کە نەیاندەهێشت منداڵەکانیان، ماری بدینن، بەڵام منداڵەکان بە دزییەوە دەچوون بۆ لەوەڕگەی گاڕانەکە، کە هەڵبەتە نیو کیلۆمەترێک لە گوندەکەوە دوور بوو، تا کەمێک خواردنی بۆ ببەن. هەندێکیان تەنیا بۆ ئەوە دەچوون تا دەست لە ملی بکەن و ماچی بکەن و بڵێن: "خۆشمان دەوێی ماری"، ئەوسا بەهەشتاو و بە غاردان بۆ گوندەکە دەگەڕانەوە. جا ماری، هەر ئەوە بوو لە خۆشیا شێت نەدەبوو. ئەم کودەتا لەناکاوە چ بوو، لە خەویشا ئەمەی بە خۆوە دیتبا شێت دەبوو. هەم نیگەران و هەم خۆشحاڵ بوو. منداڵەکان، بە تایبەتی کیژەکان، خواخوایان بوو بەلەز خۆ بگەیەننە نک وی و پێی بڵێن کە من خۆشم دەوێ و زۆر باسی دەکەم. بۆیان گێڕابووەوە کە لە منەوە هەموو شتێکیان لەمەڕ وی زانیوە و هەنوکە خۆشیان دەوێ، دڵیان بە حاڵی دەسووتێ و بەزەییان پێدا دێتەوە، ئیدی هەر و هەر خۆشیان دەوێ. دوای ئەوە بە ڕاکردن، شاد و شەنگوڵ بە نک من دەهاتن و مژدەیان دەدامێ کە مارییان دیتووە و سڵاوی بۆ من ناردووە.

ئێواران، دەچووم بۆ تاڤگە و قەڵبەزەکە. لەوێ شوێنێکی لاچەپ هەبوو، لە گوندەکەوە دیار نەبوو، سپیدار دەوراندەوری دابوو، ئیدی منداڵەکان، هەرکە ئێوارەیان لێدەهات، بۆ دیتنی من، بۆ ئەوێندەر دەهاتن، بگرە هەندێکیان بە دزییەوە دەهاتن، پێم وایە، زۆر بەوە خۆشحاڵ بوون کە وایان دەزانی ماریم خۆش دەوێ. بە درێژایی مانەوەم لەوێ، لەو درۆیە زیاترم دەگەڵ نەکردن، ئەمە تاقە درۆی من بوو لەگەڵیاندا. هەڵبەتە بەئانقەست نەمدەویست لەو خەیاڵە خۆشەی خۆیان بکەم و بۆیان ڕوون بکەمەوە کە ئێوە خەیاڵتان خاوە، من ئاشق و دڵبەستەی ماری نیم، بەڵکو دڵم بە حاڵی دەسووتێ، بەزەییم پێیدا دێتەوە. هەستم دەکرد، حەزیان لەوەیە، خەیاڵ و وێناکەی خۆیان بە ڕاست بزانن. ئەوە حەزی ئەوان بوو. بۆیە هیچم نەدەگوت و وام نیشان دەدا کە مەزەندەکەیان دروستە و ئاو

لێڵ ناکات! تۆ تەماشا دڵی چکۆلەی پڕ میهر و سۆزی ئەو منداڵانە! وایان وێنا دەکرد، مادامێکی لیونی* دۆستیان ئەوەندە ماری خۆش دەوێ، نابێت ماری ئەوەندە شڕپۆش و شڕۆڵە بێت، نابێت بە پێی پەتی بسووڕێتەوە. باوەڕ بکەن، چۆنی دەڵێم خیلافی نییە، پێڵاو و گۆرەوییان بۆ هانی، هەندێ پارچە جلشیان بۆ هێنا، نازانم چۆن ئەمەیان کردبوو، بەڵام هەموویان بە هاودەستی یەکدی ئەمەیان کردبوو. بە کۆمەڵ کردبوویان. کە کەوتمە پرسوجۆ، هەموو وەڵامێکیان تەنیا پێکەنین بوو، کچۆڵەکان بەدەم چەپڵەلێدانەوە ماچیان کردم. منیش جارجار بە دزییەوە دەچوومە دیدەنی ماری. بەهەرحاڵ نەخۆشیی کەسیرەی کرد، بە زەحمەت دەیتوانی ڕێ بکات، وای لێ هات نەیدەتوانی کۆمەکی گاوانەکە بکات، کەچی بەو حاڵەشەوە هەموو بەیانییەک دووی گاڕانەکە دەکەوت و بۆ خۆی بەدیار گاگەلەکەوە، لە سووچێکدا کزکۆڵەی دەکرد. جا لەوێ هەڵدێرێکی ڕک هەبوو، لە ناوقەدیا لووتە شاخێک، عەینی سەکۆ هاتبووە دەرێ، ماری بۆ ئەوەی لە هیچ لایەکەوە دیار نەبێت، دەچوو لەوێندەر دادەنیشت. ئیدی لە بای بەیانییەوە، تا ئێوارێ کە کاتی گەڕانەوەی گاڕان بۆ گوند دەهات، کڕوکپ، بێ جووڵە لەوێندەر ڕۆدەنیشت. نەخۆشیی سیل بە جۆرێ زەیفی لێ سەندبوو کە زۆربەی کات بە چاوی نوقاوەوە پاڵی بە تاوێرەکەوە دەداو، زۆر بە زەحمەت هەناسەی دەدا. دەموچاوی هێندە لاواز بووبوو پێستی بەسەر ئێسقانیەوەوشک بووبوو، تەوێڵ و لاجانگەکانی دەنیشتنە سەر ئارەقە و تک تک ئارەقەی لێ دەچۆڕا.

هەموو کاتێ بەو جۆرەم دەبینی. بۆ ماوەیەکی زۆر کورت لای دەمامەوە، چونکە منیش خەمم بوو کە کەس نەمبینێ. هەر کە دەگەیشتمە لای، ڕادەپەڕی و چاوەکانی هەڵدێنا و خێرا پەلاماری دەدا و دەستی ماچ دەکردم. وام لێ هاتبوو کە دەستی ماچ دەکردم، دەستم ڕانەدەپسکاند، چونکە بە ڕامووسانی دەستم خۆشحاڵ دەبوو. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لای دەمامەوە ڕادەجفری، دەلەرزی، دەگریا و فرمێسکی دەڕشت. ڕاستە هەندێ جار هەوڵی دەدا قسان بکات، بەڵام زۆر زەحمەت بوو پیاو لێی

بگات و بزانێ چ دەڵێت. هەندێ جار وا دەهاتە بەرچاو کە شێت بووە، بە جۆرێکی زۆر ترسناک دەشێوا و هەڵدەچوو، هەندێ جار، هەندێ لە منداڵەکان دەگەڵمدا دەهاتن. جا لەو کاتانەدا، هەندێک دوور دەوەستان و ئێشکی ئێمەیان دەگرت تا نازانم لە چیمان بپارێزن! ئەم کارەیان لە گیان خۆش بووا کە ئێمە دەڕۆیشتین، ماری بە تاقی تەنیا دەمایەوە، بەو دەقەوە، بەبێ جووڵە، چاوی دەنوقاندن، سەری دەنا بە تاوێرەکەوە. کێ چوزانێ! لەگین بوو خەونیش بدینێ...

بەیانیەک، کە ئیدی توانای ئەوەی نەبوو دووی گاڕانەکە بکەوێ، لە کوختە چۆلوهۆلەکەیدا مایەوە. منداڵەکان زوو بەمەیان زانی و هەمان ڕۆژ زۆربەی هەرە زۆریان هاتنە دیدەنی. ماریی بێکەس و داماو، بە تاقی تەنیا، تەنیای تەنیا لەسەر جێگاکەی کەوتبوو. بۆ ماوەی دوو ڕۆژان، تەنیا منداڵەکان بە نۆرە دەهاتنە دیدەنی، بەلام پاشان، کاتێ خەڵکی زانییان، ماری بە ڕاستی لە گیانەللادایە، ئەوسا چەند پیرەژنێک هاتن و بەنۆرە کەوتنە چاودێری و پەرستاری. پێدەچوو، خەڵکی گوند لە دوا ئەنجامدا دڵیان نەرم بووبێت و بەزەییان بە ماریدا بێتەوە، چونکە وەکو جاران ڕێگەیان لە منداڵەکان نەدەگرت کە دیدەنی بکەن، وەکو جاران سەرزەنشتیان نەدەکردن کە بۆ ڕووی دەدەنێ.

ماری هەمیشە خەواڵو بوو. خەوەکەی پچڕپچڕ بوو، کۆکەی بەئازار، حەوانەوەی لێ هەڵگرتبوو. پیرەژنان، منداڵەکانیان دەردەکرد، کەچی منداڵەکان، دەچوونە بەر پەنجەرەکە و لەوێندەرەوە، ئەگەر بۆ ساتێکیش بووە، دەکەوتنە سەرەتاتکێ هەر بۆ ئەوەی بڵێن: "سلاو ماری گیان! ئێستا چۆنی!" مارییش هەر کە تارمایی وانی دەبینی یان گوێی لە دەنگیان دەبوو، دەبوژایەوە، هەوڵی دەدا هەستێتە سەر ئانیشکان و بێ ئەوەی بە گوێی پیرەژنەکان بکات، سەری سوپاس و ڕەزامەندییان بۆ بلەقێنێ. منداڵەکان، وەکو جاران شیرینی و خواردنیان بۆ دێنا، بەلام ئەو بەحاڵ دەمی تێوە دەدا..

دڵنیاتان دەکەم، کە ماری بە سایەی منداڵەکانەوە، بەشادی لە دنیا دەر

چوو. بە فەزڵی منداڵەکان و لە خۆشیی منداڵەکان، هەرچی دەرد و ئازاری خۆی هەیە، فەرامۆش کرد، وەکو ئەوە بوو لە گوناحەکانی پاک بووبێتەوە، گوناح و خەتاکانی هەڵوەریبن، چونکە هەمیشە و تا دەمی مەرگ هەر خۆی بە گوناحکارێکی ئاخرشەڕ دەزانی. منداڵەکان، دەقاودەق وەکو چۆلەکە و پاساری لەبەر پەنجەرەکەیدا خڕ دەبوونەوە و باڵە چکۆلەکانیان لە جامی پەنجەرەکەی دەسوو. هەموو بەیانیەک دەهاتن و تێکرا دەیانگوت: "ئێمە تۆمان خۆش دەوێ ماری!". ماری، دوای ماوەیەکی کەم مرد، من پێم وا بوو زیاتر دەژی. پێش ئەوەی بمرێت، دروست بەر لە خۆرئاوا، چوومە دیدەنی. وا بزانم ناسیمیەوە، بۆ دواجار تەوقەم دەگەڵ کرد. دەستی وشک بووبووەوە! بۆ بەیانی خەبەریان دامێ کە ماری مردووە! ئیدی کوڕم دەویست بتوانێ جلەوی منداڵەکان بگرێت. تابوتەکەیان بە گوڵ داپۆشی و چەپکە گوڵێکیشیان لەسەر سەری دانا. لە کڵێسادا، ئەم جارەیان یارۆی ڕەبەن لە عەلەیی ماری نەدوا و باسی گوناح و خراپییەکانی نەکرد، بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەم، ئەویش لە ڕووی فزوڵیەتەوە بەگەڵ جەنازەکەی کەوتن، کە وەختی هەڵگرتنی دارەمەیتەکە هات، منداڵەکان تێکڕا هێرشیان برد تا ئەوان ئەو کارە بکەن، بەڵام کە زانییان دەرەقەت نایەن، بە سووربوونەوە کەوتنە کۆمەکی گەورەکان، ئیدی لەوساوە گڵکۆکەی ماری بوو بە مەزار و منداڵەکان زیارەتیان دەکرد. هەموو ساڵێک بە چەپکە گوڵەوە دەچنە سەر قەبرەکەی و چوار دەوریان بە گوڵ و گوڵەباخ ڕواندووە.

بەڵام لەدوای مردنی مارییەوە، ئیدی خەڵکی گوند، گوایە بە هۆی پەیوەندیم دەگەڵ منداڵەکانیاندا، کەوتنە چەوساندنەوە و بوغزاندنم. قەشەکە و بەڕێوەبەری قوتابخانەکە هاندەری سەرەکیی چەوساندنەوە و بوغزاندنی من بوون. نەیاندەهێشت منداڵەکان، من بدینن، تەنانەت شنایدەریش لەم کارەدا بەشدار بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش دووراودوور یەکترمان دەبینی، بە هێما و ئاماژان یەکترمان دەدوان و پەیامی خۆمان لە یەکدی دەگەیاند. ئەنجام وەزع و ڕەوشەکە باشتر بوو. پێشتریش وەزع و حاڵێکی سەیر چێ





بووبوو. ئەو چەوسانەوە و بوغزاندنە، کردیە کارێک کە منداڵەکان پتر زەمووەدەم بن و زیاتر لێم نزیک ببنەوە و تەنانەت لە ماوەی دوا ساڵی مانەوەم لەوێندەر، دەگەڵ تیبۆ و قەشەکەدا ئاشت بوومەوە. شنایدەر زۆری قسە لەگەڵ دەکردم، موناقەشەی ئەو ڕەوش و ڕێبازە زیانبارەی دەگەڵ دەکردم کە دەگەڵ منداڵەکاندا گرتبوومە بەر. ئاخر من و ڕەوش و ڕێباز؟! ئاقیبەت، ڕێک پێش ئەوەی بەرە و ڕووسیا بکەومە ڕێ، شنایدەر، دڵی خۆی بۆ کردمەوە، ئەو بیرۆکە غەریبەی پێ گوتم کە سەبارەت بە من، بە مێشکیا هاتبوو. پێی گوتم قەناعەتی تەواوی بەوە هەیە کە من منداڵم، منداڵێکی تەواو، لە هەموو ڕوویەکەوە منداڵم، تەنیا بە قەد و قەلافات و سەروسیمادا پیاوی تەواوم، دەنا لە ڕووی دەروونی و تەبع و تەبیعەتەوە و بگرە لە ڕووی ئەقڵ و ئەقڵیەتیشەوە، گەورە نیم و هەر منداڵم و ئەگەر تەمەنم بگاتە شەست ساڵیش هەر بەو دەقەوە دەمێنمەوە. هەڵبەتە گاڵتەم بەو قسەیەی هات. دیارە هەڵە بوو، ئاخر لە چ شتێکدا منداڵ بووم؟ بەڵام لە یەک حاڵدا ڕاستی دەکرد، ئەویش ئەوە بوو کە حەزم لە هاوڕیاتی و تێکەڵاوی گەوران نەدەکرد. دەمێ بووم ئەم حاڵەتەم لە خۆمدا بەدی کردوو. تا ئێستاش حەزم بە تێکەڵاویی گەوران نییە، چونکە نازانم چۆن لەگەڵیاندا هەڵبکەم. ئیدی گرینگ نییە چەند دەگەڵما باش بن یان نا، گرینگ ئەوەیە من دەگەڵیاندا ئاسوودە نیم، کە لەوان دادەبڕێم و دەچم بۆ لای دۆستەکانم، دۆستە چکۆلەکانم زۆر خۆش حاڵ دەبم، دڵم دەکرێتەوە، نەک لەبەر ئەوەی کە بە خۆم منداڵم، نا، نەخێر. بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوەی دڵم پێیان دەکرێتەوە. ڕوحم پێیان شاد دەبێت!

من هەر لە هەوەڵەوە کاتێ لەو گوندە گیرسامەوە و ئاکنجی بووم، کاتێ بە تەنیا، خەمبار و دڵتەنگ بۆ پیاسە ڕووم دەکرد چیا و چۆڵان، کە هەندێ جار، بە تایبەتی نیوەڕوان، کاتی بەربوونی قوتابی لە قوتابخانە، چاوم بە منداڵــە مەکتــەبلی دەکەوت، دەکەوتنــە ژاوەژاو و هـــەراوزەنا، بەدەم ڕاکردنەوە، جانتاو کتێب بە کۆڵ، پێدەکەنین و شەڕەشەق و یارییان دەکرد، بە دەستەخۆم نەبوو ڕوحم بۆ لای ئەوان دەفڕی. نازانم چۆن ئەمە لێک

بدەمەوە، هۆیەکەی چی بوو! بەڵام هەر کاتێ ئەوانم دەبینی، هەستم بە شادییەکی زۆر دەکرد. دڵم پڕ دەبوو لە خۆشی. کە جووڵەی لاقە چکۆلەکانیانم دەبینی، کە ئەو کچ و کوڕانەم دەبینی غاریان دەدا، کە دەمبینین پێدەکەنن یان دەگرین (هەندێکیان کە ماڵیان لە قوتابخانەکەوە دوور بوو، بەدەم ڕێگاوە بە شەڕ دەهاتن و بە یەکیاندا دەدا و پاشان ئاشت دەبوونەوە و دەستیان بە گەمان دەکردەوە)، دەوەستام، لە کانگای دڵەوە پێدەکەنیم و هەموو خەم و پەژارەیەکی خۆمم لەبیر دەکرد.

پاشان، بە درێژایی ئەو سێ ساڵەی لەوێ بووم، چەند سەرم هێنا و سەرم برد، نەمزانی بۆچی خەڵکی گەورە بە دەستی خۆیان ژیانی خۆ تاڵ دەکەن، خەم لە چی دەخۆن و بێزاری و بێتاقەتییان لە چییە؟! چارەنووسی من بەو منداڵانەوە بەند بوو، هەرگیز ئەوەم بە بیرا نەهاتبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو گوندە جێ دێڵم، قەت ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆ ڕووسیا دەگەڕێمەوە. وام دەزانی بۆ هەمیشە لەوێندەر ئاکنجی دەبم. ئەنجام پەیم بەوە برد کە ناکرێ هەتاهەتایە هەر باربم بەسەر شنایدەرەوە، ئەویش ناتوانێ هەتا سەر خۆی لە من بکات بە خاوەن. پاشان، پێشهاتێکی تایبەتی هاتە پێشەوە، پێشهاتێکی ئەوەندە ترسناک بوو، کە شنایدەر بە خۆی دا وای لێ کردم بۆ ڕووسیا بگەڕێمەوە و نامەیەکی دەربارەی من بۆ ئێرە نووسی. جا هەنوکە دەبێ تاقیبێکی ئەوە بکەم و لەو بارەیەوە پرس و ڕاوێژ بە کەسێک بکەم، چونکە لەگینە بەوە چارەنووسم بە تەواوەتی بگۆڕێت، بەڵام ئەمە گرینگ نییە، مەسەلەکە، ئەوەیە کە ژیانم لە ئێستاوە بە تەواوەتی گۆڕاوە. بەهەرحاڵ زۆر یادگاری و بەسەرهاتم لەوێندەر جێ هێشت، ئەوەی ڕۆی ڕۆیشت، هەر هەموو بەسەر چوو. کاتێ لە قیتارا بووم بەرە و ئێرە، لە دڵی خۆدا دەمگوت: من هەنوکە بۆ ناو خەڵکی دەڕۆم، ڕەنگە زۆر شت نەزانم، بەڵام تازە ژیانێکی نوێ دەستی پێ کردووە. بڕیارم داوە ئابڕوومەندانە، ڕاستگۆیانە و پیاوانە بژیم. من دەزانم ژیانم لەنێو خەڵکیدا زەحمەت و دژوار دەبێت، لێبڕام دەگەڵ هەمووانیدا، بە ئەدەب و نەزاکەت، سەرڕاست و ڕاستگۆ بم. دیارە هیچ کەسێکیش لەوە





زیاتری لە من ناویٚ! ڕەنگە لێرەش هەر بە منداڵم بزانن، بەڵام چ قەیدیە؟ خۆش ئەوەیە هەموو خەڵکی بەگێل و ئەبلەم دەزانن! نازانم بۆچی بە ئەبلەم دەزانن؟ ڕاستە کاتی خۆی نەخۆش کەوتم، گەیشتمە حاڵێک لە گێل و دێوانە دەچووم، بەڵام هەنوکە گێلیەکەم لە چدایە، لە کاتێکا بە خۆم بزانم کە بە گێلم دەزانن؟ باشە گێل هەست بەوە دەکات کە بە گێلی دەزانن؟ کە دەچمە شوێنێک، لە دڵی خۆدا دەڵێم: دوا دەزانن من گێلم، بە گێلم دەزانن، حاڵبوکی من ئەقڵم بە هەموو شتێکدا دەشکێت و ئەوان تێناگەن." زۆر جار ئەو بیرەم بە مێشکا دێت.

کاتێ لە بەرلین بووم و چەند نامەیەکی کورتی منداڵەکانم پێگەیی، هەنگێ بۆم دەر کەوت کە چەند متووی من بوون، چەندیان خۆش ویستووم. یەکەمین نامەی دوای فیراق هەمیشە خەمناکە! بیرم کەوتەوە کە بۆ خودا حافیزی دەگەڵما بۆ وێستگەی قیتار هاتن چەند غەمگین بوون! یەک دانە مانگ بەر لەوەی بارگەم تێک بنەم و سەفەربکەم. بە خەم و پەژارەوە دەیانگوت و دەیانگوتەوە: "لیون دەڕوات! لیون بەیەکجاری دەڕوات". وەکو جاران هەموو ئێوارەیەک لای تاڤگەکە کۆ دەبووینەوە و باسی جیابوونەوەی چاوەڕوانکراوی خۆمان دەکرد. هەندێ جار وەکو جاران خۆشحاڵ دەبووین، بەڵام کە شەو درەنگ دەبوو و هەڵدەستان تا بڕۆنەوە بخەون، بەدەم شەوباشەوە بەو پەڕی سۆز و گودازەوە لە هەمێزیان دەگرتم و ماچیان دەکردم، جاران ئەم کارەیان نەدەکرد. هەندێکیان، بە تەنیا و تاک تاک، بە دزیی ئەوانی دیەوە دەهاتنە دیدەنیم، هەر بۆ ئەوەی، دوور لە چاوی خەڵکی دی، لە هەمێزم بگرن و ماچم بکەن. لە ڕۆژی سەفەرەکەمدا، بە کۆمەڵ، تا وێستگەی قیتارەکە، کە یەک فەرسەخ لە گوندەکەوە دوور بوو، بۆ بەڕێکردن و خودا حافیزی دەگەڵمدا هاتن. بە تۆبزی دەیانویست جڵەوی خۆ بگرن و نەگرین، بەڵام تیایاندا هەبوو بە خۆی نەدەوەستاو لە هۆڕژنی گریانی دەدا، بە تایبەتی کچۆڵەکان. دەبوایە پەلە بکەین تا دوانەکەوین و قیتارەکە جێم نەهێڵێ، بەڵام لەناکاوا یەکێکیان لەوانی دی جیا بووەوە، لە نیوەی ڕێگەدا، هاتە بەردەمم، باسکە چکۆلەکانی





لە گەردنم وەریناو کەوتە ڕامووسانم، ئیدی بە بۆنەی ئەوەوە، هەرچەندە کاتەکەش درەنگ بوو، هەموو کاروانەکەمان وەستا. کە سواری قیتار بووم و قیتارەکە کەوتە ڕێ، هەموو بە یەک دەنگ خوا حافیزیان لێ کردم، هەموو بەریز لەسەر سەکۆیەکەوەستابوون و تا قیتارەکەش لە چاو ون بوو لە جێی خۆیان نەجوولان، منیش تا لە چاوم ون بوون، هەر تەمەشام دەکردن... باوەڕ بکەن... کاتێ تۆزێ لەمە پێش هاتمە ئەم ژوورە و سیمای گەش و ڕووی خۆشی ئەنگۆم بینی- من ئێستا زۆر لە سیما و سەروچاوان ورد دەبمەوە-و گوێم لە یەکەمین وشەی ئێوە بوو، بۆ یەکەم جار، لەو ساوە تا ئێستا، دڵم ڕۆشن بووەوە و ئۆخژن لە دڵ و دەروونم گەڕا. لێتانی ناشارمەوە، لە دڵی خۆدا گوتم ڕەنگە بە ڕاستی مرۆڤێکی بە تالح و ئیغباڵ بم، چونکە دەزانم زۆر زەحمەتە پیاو، تووشی خەڵکانێک بێت، هەر لە یەکەم دیدارەوە مەحەبەتی بچێتە سەریان و خۆشی بوێن، شتی واهی زۆر کەمە. کەچی خۆم و بەختم هەرکە لە قیتارەکە دابەزیم، وا تووشم بوو بە تووشی ئێوەوە. من دەزانم، کە پیاو بەو ڕاشکاوی و بێ پەردەییە، هەستی خۆی دەر ببڕێت کارێکی پەسند و جوان نییە، مایەی شەرمەزارییە، بەڵام من ئەوەتا باسی هەستی خۆم بۆ ئێوە دەکەم و هیچیش هەست بە شەرم و شەرمەزاری ناکەم. من کەسێکی ئەڕباب و ئیجتماعی نیم، ڕەنگە بەو زووانە نەتان بینمەوە. تکا دەکەم ئەمەم لێمەگرن و لێکدانەوەی خراپی بۆ مەکەن، چونکە مەبەستم ئەوە نییە کە حیساب بۆ ئێوە نەکەم، لەبەر ئەوەشم نییە کە شتێکتان کردبێت و لێتان زویر بم. ئێوە داواتان لێ کردم باسی ئەوەتان بۆ بکەم کە چ شتێکم لە سیماتاندا خوێندووەتەوە. بە خۆشحاڵییەوە ئەوە دەکەم. جا سیمای تۆ ئادیلاید ئیڤانوڤنا، سیمایەکی بەختەوەرە، لە سیمای ئەوانی دی زیاتر دەچێتە دڵەوە. سەرباری ئەوەی کە سیما و دەموچاوت زۆر جوانە، پیاو کە تەمەشات دەکات لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "سیمای خوشکێکی میهرەبانی هەیە، ڕەفتارت دەگەڵ خەڵکیدا ڕاستگۆیانە و دۆستانە و سادەیە، زۆر زوو دەچیتە دڵەوە. ئەمە خوێندنەوەی منە بۆ دەموچاو و سیمای تۆ، ئەمە لە دەموچاوتا





دەبینم. تۆش ئالکساندرا ئیڤانوڤنا، دەموچاو و سیمای تۆش مەحبوب و لە بەر دڵانە، بەڵام دڵخۆش نیت، لەوە دەچێت خەمێکی پەنهانت لە دڵدا بێت. بێگومان نموونەی میهرەبانی و دلۆڤانیت، بەڵام شادیت لە دڵا کەمە. دەموچاوت، شتێکی تیایە کە دەموچاوی "مادونا"کەی هولباینی شاری درسدن، وەبیر دێنێتەوە. ئەمەش دەربارەی تۆ، دەی مەزەندەکەم دروستە؟ تۆ بە خۆت نەتگوت، گوایە من سەرناسم و دەموچاو دەخوێنمەوە؟ سەبارەت بە تۆش لیزاڤیتا پروکوفیڤنا (بەدەم ئەو قسەیەوە لەناکاوا ڕووی کردە خا جەنەراڵ و گوتی) نەک هەر هەست دەکەم، بەڵکو سەرباری تەمەنیشت، دڵنیای دڵنیام کە لە هەموو شتێکدا وەکو منداڵیت، لە چاکە و لە خراپەشدا هەر منداڵی. تکایە لێم زویر نەبیت. خۆ پێت ناخۆش نییە؟ بە خۆت دەزانی من چ هەست و سۆزێکم سەبارەت بە منداڵ هەیە. وا زەن نەبەن کە لە ڕووی ساویلکەیی ڕووتەوە، بەو ڕاشکاوییە ئەو قسانەتان بۆ دەکەم. نا، نا هەرگیز! کێ چوزانێ لەوەشە مەبەستێکی تایبەتیم هەبێت."

پەراوێز:

* - "مادامێکی لیونی دۆستیان..." لیون بە مانای شێر دێت، بەرانبەر بە وشەی (لو)ی ڕووسییە. جا منداڵە سویسرییەکان، میرزادە لو میشکین، بە زمانی منداڵانەی خۆیان بە (لیون= شێر) ناو دەبەن.

* - "مادوناکەی هولباین..." دۆستویفسکی لە ساڵی ١٨٦٧دا دەچێتە پیشانگای درسدن و زۆر دڵبەندی ئەو تابلۆیە دەبێت کە (هولباین)ی گەنج کێشابووی و ناوی نابوو "مادونا دەگەڵ ماڵباتی جان مایر- ١٥٢٥) تابلۆ ئەسڵیەکە لە مۆزەخانەی دارمشتات دەبێت، بەڵام لەو سەردەمەدا، وا دەزانرا کە تابلۆکەی درسدن، نوسخەی ئەسڵیی ئەو تابلۆیەیە کە هولباین، کێشابووی.

## فەسڵی حەوتەم

کاتێ میرزادە بێدەنگ بوو، هەر هەمووان دۆستانە و بە خۆشحاڵییەوە کەوتنە تەمەشاکردنی، تەنانەت ئاگلایاش، بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە هەمووان زیاتر شادی و خۆشحاڵیی پێوە دیار بوو. بۆیە هەڵی دایە و گوتی:

- زۆر چاکە، باش تاقیمان کردەوە. ئێوە کچینە پێتان وا بوو سەرپەرشتی گەنجێکی داماو دەکەن، کەچی ئەو بە کەرەمی خۆی ئاشنایەتیی ئێوەی قەبوڵ کرد و دڵنیای کردن کە زوو زوو نایەتە دەیدەنیتان. تومەز ئێمە گێل و گەوج دەر چووین. خۆمان خەڵەتاند بوو. من ئەوەم زۆر پێ خۆشە، بەڵام بابتان، فیدوروفیچ، لە هەمووومان پتر خۆی فریوداوە. ئافەرین میرزادە! قەدەرێ لەوە پێش ڕاسپێردرابووین، تاقیت بکەینەوە تا بزانین زانیاریت لە چ ئاستێکدایە... ئەوەی دەربارەی سیمای من گوتت، یانی ئەوەی لە تەمەشاکردنی سیمای منەوە هەڵت هێنجا، زۆر دروستە. من، ئەلهەقی منداڵم. بە خۆم ئەوە دەزانم. دەمێ بوو پەیم بەوە بردبوو، بەڵام تۆ زۆر بە کورتی و ڕوونی دەرت بڕی، پێم وایە تۆش هەمان تەبیعەت و سروشتی منت هەیە، لە هەموو ڕوویەکەوە لێکدی دەچین و من بەمە خۆشحاڵم، یانی دوو لەتی یەک سێوین، تاقە جیاوازیمان ئەوەیە تۆ پیاویت و من ژنم، من قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان لە سویسرا نەبووم.

هەموو جیاوازییەکەمان ئەوەیە و تەواو.

- زۆریش پەلە مەکە دایکە. میرزادە تۆزێ لەمەپێش گوتی کە ئەو قسانەی لە گۆترە نەکردووەو، مەبەستێکی تایبەتی هەبووە.

دوو خوشکەکەی دی بەدەم پێکەنینەوە گوتیان:

- بەڵێ، بەڵێ، وای گوت.

- گاڵتەی پێ مەکەن کچی خۆم، ڕەنگە لە هەر سێکتان پێکەوە، زیرەکتر و بەهۆشتر بێت. دەی بینن، بەڵام میرزادە بۆچی هیچت دەربارەی ئاگلایا نەگوت؟ ئاگلایا چاوەڕوانە. منیش چاوەڕوانم.

- جارێ هیچ ناڵێم. با بمێنێ بۆ دوایی.

- بۆچی؟ چما بەرچاوی نییە؟ پێم وایە بە تەواوەتی دیقەتت دا!

- با، بەرچاوییە و ئەولاتریش. لێشی ورد بوومەوە. ئاگلایا ئیڤانوفنا، تۆ نموونەی جوانیت. جوانیی دەموچاوت پیاو دەتاسێنێ.

خا یەپانچین بە پێداگیرییەوە گوتی:

- هەر ئەوەندە، تەواو؟ ئەدی تەبیعەت و تایبەتمەندییەکانی؟

- قەزاوەت دەربارەی جوانی زەحمەتە. هێشتا ئەو توانایەم لەلا نەخەملیوە. جوانیی مەتەڵە مەتەڵ.

ئادیلاید هەڵی دایە و گوتی:

- کەواتە تۆ مەتەڵت لە ئاگلایا داهێناوە! دەی ئاگلایا هەوڵ بدە هەڵی بێنە، باشە میرزادە، ئاگلایا زۆر جوان نییە؟

میرزادە، بە چاوی کڕیار دەڕوانێتە ئاگلایا و بە جۆشوخرۆشەوە، بە تاسەوە بەرسڤی دایەوە:

- بە ڕاستی جوانە، ئوباڵ بە ئەستۆم جوانە! جوانییەکەی شان لە شانی جوانی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەدات. ئەگەرچی دەموچاوی زۆر لە دەموچاوی ئەو جیاوازە...

هەر چوار خانمەکە، بەسەرسامی نیگای یەکیان کرد.

خا جەنەراڵ لێی پرسی:

- کێ؟ ناستاسیا فیلیپوڤنا؟ ناستاسیا فیلیپوڤنات لەکوێ دیتووە؟ کام

ناستاسیا فیلیپوڤنایە؟

– تۆزێ لەمەپێش کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، وێنەکەی پیشانی جەنەراڵ دەدا، من لەوێندەر بووم.

– چۆن؟ وێنەکەی بۆ ئیڤان فیدوروفیچ هێنابوو؟

– بۆ ئەوەی هێنابوو کە پیشانی بدات. ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەمڕۆ وێنەکەی خۆی بە دیاری دابوو بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ و ئەویش هێنابووی تا پیشانی جەنەراڵی بدات.

خا جەنەراڵ، هاواری کرد و گوتی:

– دەمەوێ ئەو وێنەیە بدینم! ئەو وێنەیە لەکوێ؟ ئەگەر ڕاستە و بە دیاری داویە بەو، دەبێ ئێستاش لەلای بێت و بێگومان هەنوکە لە ژووری نووسینگەکەدایە. ئەو هەموو چوارشەمموانێک بۆ کار دێت بۆ ئەوێ و تا سەعات چوار ناڕوات. خێرا بنێرین بە دوای گاڤریلا ئاردالیونوفیچ دا، بابێت! نا، با نەیەت! چارەگرانە! بە من بێت بمرم و چارەی ئەو نەبینم! میرزادەی ئازیز، ئەو پیاوەتییەم دەگەڵ بکە و بڕۆ بۆ ژووری نووسینگەکە، وێنەکەی لێ وەر بگرە و بۆ ئێرەی بێنە، پێی بڵێ من گەرەکمە ئەو وێنەیە بدینم! دەبڕۆ دەی!

ئادیلاید، دوای دەرچوونی میرزادە گوتی:

– پیاوێکی نەجیبە! بەڵام ساویلکەیە، کەمێک لە ئەندازە بەدەر ساویلکەیە.

ئالکساندرا، قسەکەی بۆ سەلماند:

– هەر کەمێک! خۆزیا هەر کەمێک بوایە، مایەی پێکەنینیشە!

پێدەچوو، هیچیان، نەیانەوێ هەموو قسەیەکی دڵی خۆیان بکەن، ئەوەی لە دڵیاندایە دەری ببڕن.

ئاگلایا گوتی:

– بەڵام قسەکانی دەربارەی سیما و دەموچاوی ئێمە زۆر زیرەکانە بوو. ستاییشی هەموومانی کرد و دڵی گشتمانی خۆش کرد، تەنانەت دڵی دایکەش!

خا جەنەراڵ هاواری کرد و گوتی:

- دوو زمانی مەکە! بە هیچ جۆرێ مەدحی منی نەکرد، بەڵام من هەستم دەکرد کە ستاییش و مەدح کراوم.

ئادیلاید پرسیی:

- یانی پێت وایە، زۆڵیەتیی دەکرد تا بگاتە مەبەستێک؟

ئالکساندرا گوتی:

- من باوەڕ ناکەم، ئەو ساویلکە و گێلە بێ، وەکو تەسەور دەکرێت.

خا جەنەراڵ بە تورەیی گوتی:

- دیسان دووبارەی کردەوە! توخوا ئەگەر نەیبرنەوە! باوەڕ بکەن ئێوە لەو زیاتر مایەی پێکەنینن! ئێوە هیی ئەوەن بەشەر پێتان پێبکەنێ! دروستە کەمێک ساویلکە و سا ئەقڵە، بەڵام بۆ حاڵی خۆی وریایە، دەزانێ چیی دەوێ. بە دڵ دەیڵێم کە کوتومت وەکو منە.

میرزادە، بەدەم ڕێکردنەوە بەرەو نووسینگەکە، لە دڵی خۆیدا، بە جۆرە پەشیمانییەکەوە، دەیگوت: کەرێتیم کرد کە باسی ئەو وێنەیەم کرد. دەی گوێ مەدەیە لەوەیە خێری پێوە بێ...

بیرۆکەیەکی غەریب، هەرچەند هێشتا ڕوون و دیار نەبوو، لە مێشکیدا بڵاچەی دەدا.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، هێشتا لە نووسینگەکە بوو و بە دیار کاغەز و ئەوراقەکانیەوە چەمابووەوە. دیار بوو بە مفت و خۆڕایی مووچەی لە کۆمپانیاکەوەرنەدەگرت. کاتێ میرزادە داوای وێنەکەی لێ کرد و بۆی گێڕایەوە کە چۆن خانمەکان پێیان زانیوە، تەواو پەشۆکا. تورە بوو و بەدەم هاوارەوە گوتی:

- شەیتان بە نەحلەت بی..! ئاخر تۆ چ کارێکت بەم کارەوە بوو؟

هەنگێ لە بن لێوانەوە گوتی:

- تۆ چوزانی مەسەلە چییە! هەقت چی بوو؟.. گێلەپیاو!

میرزادە گوتی:

- ببورە، بەداخەوەم. شتەکە خۆبەخۆ هات بە دەمما، دەنا هیچ نیازێکی خراپم نەبوو، بەدەم قسانەوە هات. تەنیا ئەوەندەم گوت کە ئاگلایا، شان لە

شانی جوانی و خشیکیی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەدات.

گانیـا، داوای لـێ کـرد بەوردی شـتەکەی بـۆ بگێـڕێتەوە. میـرزادە بـۆی گێڕایەوە. گانیا، نیگایەکی تەوسامێزی کرد و لە بن لێوانەوە گوتی:

- دیارە تۆ، حەزت لە ناستاسیا فیلپوفنا...

بـەڵام قسـەکەی تەواو نـەکرد، بیـری ڕۆیشـت. بەئاشـکرا دیـار بـوو کـە نیگەرانە. میرزادە بیری خستەوە کە خانم یەپانچین چاوەڕوانی وێنەکەیە.

گانیا، وەکو ئەوەی بیرۆکەیەکی کوتوپڕی بۆ هاتبێ، لەناکاودا گوتی:

- گوێ بگرە میرزادە. تکات لێ دەکەم، کارێکی گەورەم بە تۆ هەیە، وەرە ئەو پیاوەتییەم دەگەڵ بکە... بەڵام... هێشتا بە تەواوەتی نایزانم...

گانیـا پەشـۆکا، قسـەکەی تەواو نـەکرد. لەوە دەچـوو لـە کێشماکێشـێکی دەروونیدا بێت، دیار بوو کە دوو دڵ بوو لەوەی چ قەرارێک بدات.

میـرزادە، کڕوکـپ، چـاوەڕوان بـوو. گانیـا، جـارێکی دی چـاوی بڕینـە دوڕ چاوانی میرزادە و دیسان هاتەوە قسان و گوتی:

- میـرزادە... مـن هەنوکـە... لـە بـەر هۆیـەک... هۆیـەکی زۆر سـەیر... نـەک هـەر سـەیر، بگـرە کۆمیـدییش کـە هـیچ خەتایـەکی منـی تیـا نییـە... خۆڵاسـە پێویسـت ناکـا بچینـە ئەو باسـەوە... دەڵێم مـن، ئەوەنـدەی بیزانم، ئەوان (خـا جەنەراڵ و کچەکانی) کەمێک لـە مـن نارەحـەت و زویـرن.. بۆیـە حـەز ناکـەم تا ماوەیـەک بچـم بۆ ئەوێ، مەگـەر بنێـرن بـە شـوێنما، بـەڵام زۆر زەرورییـە چەنـد قسـەیەک دەگـەڵ ئاگلایـا ئیڤانوفنـادا بکـەم، بـەڵام چەنـد پـەیڤێکم بـۆ نووسیوە. (گانیا کاغـەزێکی قـەد و نوشـتکراوی بـە دەسـتەوەیە) نـازانم چۆن بیگەیەنمە دەستی. میرزادە تـۆ دەتوانی ئـەم کاغـەزەم بۆ بـەریت و بیدەیتـە دەستی ئاگلایا؟ ئاگلایا بە خۆی، یانی بێ ئەوەی کـەس بیدینێ و پێ بزانـێ؟ لە مەبەستم حاڵی هەی؟ شتەکە زۆریش نهێنی نییـە... هـیچ شـتێکی تیـا نییـە کە... ئەم کارەم بۆ دەکەیت؟

میرزادە، بەرسڤی دایەوە:

- حەزم لەم کارە نییە!

گانیا، بەدەم پاڕانەوەوە گوتی:

- ئاهـ... میرزادە... زۆر پێویستم بەوەیە... بەڵکو ئاگلایا وەڵامم بداتەوە. باوەڕ بکە، بۆیە پەنا بۆ تۆ دێنم، چونکە مەسەلەکە زۆر زەرووریيە... ئاخر ئەگەر تۆ نەبێ، بە کێی دیدا نامەکە بنێرم؟ باوەڕ بکە، زۆر زەرورييە، بۆ من لەڕادەبەدەر زەرووريیە.

ترسێکی گەورە بە سیمای گانیاوە دیار بوو، دەترسا میرزادە ڕازی نەبێت. میرزادە بە نیگای بەزەیی ئامێزەوە ڕوانییە گانیا و گوتی:

- زۆر باشە... بۆتی دەگەیەنم.

گانیا، کە ترسەکەی شکا، بەدەم پاڕانەوەوە گوتی:

- بەڵام ئاگادار بە کەس پێی نەزانێ... یانی باوەڕ بە قسەکەت بکەم، وا نییە؟

میرزادە گوتی:

- نامەکە پیشانی کەس نادەم.

گانیا لە پەلەپەلیدا، لە دەمی دەر چوو و گوتی:

- نامەکەم دانەخستووە، بەڵام...

هەنگێ وەکو یەکێک تەریق بووبێتەوە، قسەکەی خۆی بڕی. میرزادە، بەوپەڕی سادەیی و ڕاستگۆیی گوتی:

- خەمت نەبێ، نایخوێنمەوە.

وێنەکەی هەڵگرت و لە ژووری نووسینگەکە وەدەر کەوت.

گانیا، کە بە تەنیا مایەوە، سەری لەنێو هەر دوو دەستی ناو لەبەر خۆیەوە گوتی:

"تاقە وشەیەکی ئەو بەسە تا... ڕەنگە هەنگێ هەموو پەیوەندییەکم لەگەڵ... ببڕم".

لەو حاڵی چاوەڕوانی و پەریشانییەدا، ڕەوشتێکی وای هەبوو کە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە سەر کارەکانی، ناچار بە نێو ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ...

میرزادە، پەشێو و پەریشان ڕێی دەکرد. لەڕادەبەدەر، سەرسام و ناڕەحەت بوو لەوەی کە ئەو کارەی پێ سپێردرابوو. کە بیری لەوە

دەکردەوە چۆن نامەکەی گانیا بگەیەنێتە ئاگلایا هەستی بەوپەڕی ناڕەحەتی و نیگەرانی دەکرد. زۆری لەبەر گرانبوو. هێشتا دوو ژووری مابوو بگاتە هۆڵەکە، لەناکاوا، وەکو یەکێک شتێکی بیر کەوتبێتەوە، وەستا. چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، خۆی گەیاندە بەر پەنجەرەیەک و لە بەر ڕووناکیی پەنجەرەکەدا کەوتە تەمەشاکردنی وێنەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا. لە تۆ وایە دەیەوێ ئەو ڕازە لەم وێنەیەدا کەشف بکات کە تۆزێ لەمەپێش و لە یەکەمین نیگادا هەژاندبووی. هێشتا یەکەمین هەستی نەڕەوی بووبووەوە، بەڵام لەوە دەچوو، هەنوکە بیەوێ لەو هەستەی خۆی دڵنیا بێت و بگاتە جۆرە یەقینێک.

دەموچاوی ناستاسیا، جگە لەوەی یەجگار جوان بوو، جۆرە مەنگییەکی ئاڵۆزیشی لە خۆ گرتبوو، ئێستا زیاتر سەرنجی ڕادەکێشا. جۆرێک لە فەرناخی و ڕوحزلی و غروور، جۆرێک لە نەفرەت و بێزاری و، بگرە ڕق و بوغزێشی تێدا بەدی دەکرا، بەڵام لە هەمان کاتدا جۆرێک لە متمانە و بێگەردی و ساویلکەیی سەیری تێدا بوو. ئەم هەڤدژی و ناکۆکییە، جۆرە سۆزو بەزەییەکی لەلا هاڕوژاند. ئەم جوا نییە بێ ئەندازەیە لە تەحەمولی کەسدا نەبوو: دەموچاوێکی جوانی نەختێ کاڵ، گۆنای کەمێک چاڵ، چاوانی پرشنگدار... ئەم جوا نییە دڵڕفێنە سەیرە! میرزادە بۆ ساتێک بە قووڵی لێی ڕاما. لەناکاو بە خۆ هاتەوە، بەهەشتاو ڕوانییە دەوروبەری خۆی، وێنەکەی لە لێوانی نزیک کردەوە و بەپەلە ماچێکی کرد!

دوای کەمێک، کاتێ میرزادە خۆی بە هۆڵەکەدا کرد، دەموچاو و سیمای ئارام و ئاسوودە بوو.

بەڵام پێش ئەوە، کاتێ میرزادە گەیشتە ژووری نانخواردن، (واتە دوور ژوور پێش هۆڵەکە) لە ئاستانەی دەرگاکەدا تووشی ئاگلایا بوو، کە خەریک بوو دەهاتە ژوورەوە.

کیژێ بە تاقی تەنیا بوو.

نامەکەی بۆ درێژ کرد و گوتی:

- گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، تکای لێ کردم ئەمەت پێ بگەیەنم.

ئاگلایا وەستا، کاغەزەکەی وەر گرت، نیگایەکی غەریبی میرزادەی کرد. هیچ نیگەرانییەک یان شەرمێک بە سیمایەوە دیار نەبوو. تەنیا سووکە سەرسامییەکی پێوە دیار بوو، کە ئەویش زیاتر پەیوەندیی بە میرزادەوە هەبوو. وەکو ئەوە بوو ئاگلایا، بەو نیگایە داوا لە میرزادە بکات بۆی ڕوون بکاتەوە، چۆن لەم مەسەلەیەدا بووە بە هاودەستی گانیا، هەڵبەتە نیگایەکەی ئاسایی و ئامیرانە بوو. بۆ چەند ساتێکی کەم ڕووبەڕووی یەکدی وەستان. ئەنجام سووکە تەوس و تانەیەک نیشتە سەر سیمای ئاگلایا، بزەیەکی کاڵی بۆ کرد و بەلایا ڕەت بوو.

خا یەپانچین، ماوەیەک بەبێدەنگی، بە جۆرە ڕقێکەوە، لە دوورەوە ڕوانییە وێنەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەنجام لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ، خشکۆکە. زۆریش خشیکە. من دوو جارم دیتووە، بەڵام لە دوورەوە.

ئەوسا، لەپڕ ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- کەواتە تۆ حەزت لەم جۆرە جوانییەیە؟

میرزادە، وەکو یەکێک زۆر لە خۆی بکات، بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ... ئا...

- مەبەستم... دەقاودەق ئەمەیە؟

- بەڵێ... دەقاودەق.

- بۆچی؟

میرزادە، بێ ئختیار، وەکو یەکێک خۆی بدوێنێ، نەک بەرسڤی کەسێک بداتەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئەم دەموچاوە، ژانێکی گەورە و عەزابێکی مەزنی پێوە دیارە...

خا جەنەراڵ گوتی:

- ڕەنگە تووشی وڕێنە بووبیت...

بە فیزێکەوە، وێنەکەی تووڕ دایە سەر مێزەکە. ئالکساندرا، وێنەکەی هەڵگرت و ئادیلاید لێی نزیک بووەوە و بە جووتە کەوتنە تەمەشاکردنی وێنەکە. لەو دەمەدا ئاگلایا گەڕایەوە بۆ هۆڵەکە.

ئادیلاید کە لەسەر شانی خوشکەکەیەوە، تەمەشای وێنەکەی دەکرد، لەناکاوا هاواری کرد:

- ئەللا لەو قوەتە!

دایکی بە تورەیی پرسیی:

- کامە؟ کام قوەتە؟

ئادیلاید، بە دەنگێکی پڕ جۆشەوە گوتی:

- ئەم جوانییە خۆی لە خۆیدا قوەتە. یەکێکە لەو جوانییانەی کە دەشێت دنیا ژێر و ژوور بکات!.

بە حەواس پەرتی گەڕایەوە لای ستاندەکەی، ئاگلایا کە چاوانی تەنگ کردبوو و لێوی شۆڕ کردبووەوە، نیگایەکی سەرقەی سەرقەی وێنەکەی کرد و پاشان دوور کەوتەوە و هەر دوو دەستی لەسەر سینگی تێک ئالاند و چوو لە سووچێکەوە دانیشت.

خا یەپانچین، لە زەنگی دا، خزمەکارێک وەژوور کەوت.

خانم پێی گوت:

- گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)م بۆ بانگ بکە. لە ژووری نووسینگەکەیە.

ئالکساندرا بە دەنگی بەرز گوتی:

- دایکە!

دایکی بە توندی دەمکوتی کرد و گوتی:

- دەمەوێ، تەنیا دوو قسەی پێ بڵێم و هیچی تر!

دیار بوو، کە زۆر نیگەران و شپرزەیە. ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و گوتی:

- دەبینی میرزادە؟ ئێرە بووە بە نهێنیخانە، جگە لە نهێنی و پەنهانکاری هیچی تر لەئارادا نییە! لەوە دەچێ هیچ چارێکیش نەبێ... هەڵبەتە پەنهانکاری لە مەسەلەیەکدا کە ئەوپەڕی ڕاستگۆیی و سەرڕاستی و ڕاشکاوی بخوازێت، دەکاتە ئەو پەڕی گەوجێتی! هەندێ نەخشەی زەماوەند لەئارادایە، کە من هەرگیز بە دڵم نییە.

ئالکساندرا، کە دەیویست جڵەوی دایکی بگرێت، گوتی:

- دایکە! ئەوە چیتە؟ دەتەوێ چ بڵێی؟
- کیژە ئازیزەکەم، دەتەوێ چ بڵێی؟ تۆ بەم مەسەلەیە ڕازیت، پێت خۆشە؟ چ قەیدییە با میرزادەش گوێی لێ بێ... با بیزانێ چ قەیدییە، خۆ ئێمە دۆستین، خزمین، بە تایبەتی من و ئەو دۆستین... خواوەند یاوەری خەڵکانی باش و دڵپاکە، پێویستی بە خەڵکانی دڵڕەش و بێبار و هەوەسبازان نییە. بە تایبەتی ئەو بێبارو ڕاڕایانەی ئەمڕۆ شتێک دەڵێن و سبەینێ شتێکی تەواو پێچەوانە دەکەن. لە مەبەستم تێدەگەی ئالکساندرا ئیڤانوڤنا؟ تۆ تەمەشا میرزادە، هەموویان دەڵێن من کەسێکی هیچ نەزانم، لە کاتێکا من چاک و خراپ لێکدی جیا دەکەمەوە. هەر دڵ شەرتە، ئەوی دی هەمووی پەشمە! هەڵبەتە زیرەکی شتێکی باشە، ڕەنگە لە هەموو شتێک باشتر بێت... ئاگلایا، تیزم پێ مەکە! نە شێتم و نە ورێنەش دەکەم. خەیاڵ نەکەی، لە کۆنەوە گوتوویانە، نە ئەو ژنە گەوجەی کە دڵی هەیە و ئەقڵی نییە بەختەوەرە و نە ئەو ژنە گەوجەی کە ئەقڵی هەیە و دڵی نییە بەختەوەر دەبێت. جا من ئەو گەوجەم کە دڵی هەیە، بەڵام ئەقڵی نییە، تۆش ئەو گەوجەی کە ئەقڵی هەیە و دڵی نییە، بۆیە شتاقمان بەختەوەرنین، هەر دووکمان نەگبەتین، هەر دووکمان ئازار دەچێژین.

ئادیلاید، کە لە مەجلیس و کۆڕەکەدا لە هەمووان دڵخۆشتر و ئارامتر دەهاتە بەرچاو، خۆی پێنەگیرا و گوتی:

- نەگبەتی و کلۆڵیی تۆ لە چدایە دایکە؟

دایکی بەتوندی گوتی:

- یەکەم لە کچە فامیدە و فاما ئازیزەکانمدایە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا و بە تەنیا بەسە، بۆیە پێویست بەوە ناکات هیچی تر باس بکەم! زۆرمان گوت بەسە. دەی با بزانین ئێوە هەر دووکتان –ئاگلایا حیساب ناکەم- بە هەموو هۆشوگۆش و ئەقڵ و زماندرێژییەکتانەوە چ دەکەن و چ ڕێگەیەک دەگرنە بەر، باشە تۆ، ئەلکساندرا ئیڤانوڤنای بەڕێزم دەتوانی دەگەڵ ئەو نێرەوەزتدا بەختەوەر ببی، ها؟!...

لەو کاتەدا، گانیا وەژوور کەوت. خا جەنەراڵ گوتی:





- ئا... ئەمەش زاوایەکی دی...

گانیا ئیکلامێکی بۆ کرد. مەدام یەپانچین، بێ ئەوەی خوڵکی دانیشتنی بکات وەڵامی دایەوە:

- ڕۆژتان باش. ها... بەتەمای زەماوەندی؟

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بە سەرسامی و حەپەساوی کەوتە مینگەمینگ: زەماوەند؟ زەماوەندی چی؟

زۆر پەشۆکابوو.

- ئەگەر حەز دەکەی، پرسیارەکەم بەم جۆرە دەکەم: بەتەمای ژن بێنی؟

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ لە شەرما سوور هەڵگەڕا و بە درۆوە گوتی:

- ن... ن.. نا...

ژێراو ژێر، تەمەشایەکی ئاگلایای کرد کە لە سووچێکەوە دانیشتبوو، ئەوجا بەپەلە چاوی لەسەر گواستەوە، ئاگلایا بە کەماڵی ئارامی و ساردی، بێ ئەوەی چاوی لێ بگوازێتەوە، تەمەشای شڵەژانەکەی ئەوی دەکرد.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنای دڵڕەق، درێژەی بە پرسوجۆیەکەی خۆی دا:

- نا؟ گوتت نا؟ بەسە، زۆر باشە، ئەمە لە مێشکی خۆدا هەڵدەگرم کە بەیانییەکی چوارشەممە، لە وەڵامی پرسیارێکی مندا گوتت: "نا". ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ چوارشەممە نییە؟

ئادیلاید بەرسڤی دایەوە:

- وا بزانم چوارشەمەیە دایکە.

- کەس ڕۆژ و بەروار نازانێ. ئەمڕۆ چەندی مانگە؟

گانیا گوتی:

- بیست و حەوت.

- بیست و حەوت؟ ئەمە لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی، بەروارێکی باش و لەبارە. باشە، جارێ خواحافیزت بێ! پێم وایە کارت زۆرە، من دەبێ خۆم بگۆڕم تا دەر بچم. وێنەکەت هەڵگرەوە. سڵاوم بە دایکت، بە نینا ئالکساندروڤنای بەدبەخت بگەیەنە! بە هیوای دیدار میرزادە. زوو زوو سەرم لێ بدە، پێم لێ مەبڕە خزم. من دەڕۆم بۆ لای ئەو خانمە پیرە،

میرزادە خانم بیلوکونسکایا، تا دەربارەی تۆ قسەی دەگەڵ بکەم. گوێ بگرە برادەری ئازیز، من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە خوای گەورە، لەبەر خاتری من، تۆی لە سویسراوە بۆ پترسبۆرگ هێناوە. ڕەنگە کاری دیکەشت هەبێ، بەڵام، بە تایبەتی لەبەر خاتری من بۆ ئێرە نێردراوی، ئیدی ئەوە ویستی یەزدان بووە. بە هیوای دیدار کیژە ئازیزەکانم! ئالکساندرا، گیانەکەم هەتا ژوورەکەی من وەرە.

خا جەنەراڵ، لە هۆڵەکە وەدەر کەوت. گانیا، پەشێو پەشۆکاو، شپرزە و بێتاقەت، بە دڵێکی پڕ لە ڕقەوە، وێنەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت، ئەوسا ئاوڕێکی لە میرزادە دایەوە و بەدەم ژارخەنێکەوە گوتی:

– میرزادە من بۆ ماڵ دەڕۆمەوە. ئەگەر بەتەمای لەگەڵ ئێمەدا و لەلای ئێمە دانیشیت و ڕەئیت نەگۆڕیوە، لەگەڵ خۆما دەتبەم، چونکە تۆ ئەدەرسی ماڵەکەمان نازانی.

ئاگلایا، لەناکاو لەسەر کورسییەکەی هەستا و گوتی:

– میرزادە، دەققەیەک. شتێکم لە ئەلبومەکەما بۆ بنووسە. باوکە، دەڵێت تۆ خۆشنووسێکی تەواویت. بوەستە، دەچم ئەلبوومەکەم دێنم.

ئاگلایا، لە هۆڵەکە وەدەر کەوت.

ئادیلاید گوتی:

– میرزادە خودا حافیز. منیش دەبێ. بڕۆم.

بەدەم ئەو قسەیەوە تەوقەیەکی گەرمی دەگەڵ میرزادەدا کرد، بزەیەکی دۆستانەی پڕ لە لوتف و مەحەبەتی بە ڕوویدا داو، بێ ئەوەی تەمەشایەکی گانیا بکات، وەدەر کەوت. کە هەمووان دەر چوون، گانیا، دانەکانی چیڕ کردەوە و بەرەو میرزادە ڕۆیشت و گوتی:

– هەمووی خەتای تۆیە، بۆچی باسی زەماوەندی منت بۆ کردوون، چەنەبازی لاساری لاپرەسەن، بەکرێ گیرابووی؟

بەدەم ئەو قسانەوە، لە حەژمەتاندا سوور هەڵگەڕابوو، ئاگری ڕق و قین لە چاوانی دەباری.

میرزادە، بە هێمنی و بەوپەڕی نەزاکەتەوە بەرسڤی دایەوە:

- باوەڕ بکە تۆ سەهویت... کەمترین ئاگاداریم دەربارەی بڕیاری زەماوندی تۆ نەبووە.

- تۆ هەمووی سەعاتێ لەمە پێش گوێت لێ بوو کە ئیڤان فیدوروفیچ گوتی کە ئەمشەو، لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنادا، هەموو شتێک دەبڕێنینەوە. ئیدی بە ناخێرت چوویت ئەمەت بۆ گێڕاونەتەوە. تۆ درۆ دەکەی! دەنا لەکوێ بەم هەواڵەیان زانیوە. جگە لە تۆ کێ هەیە ئەم هەواڵەیان بۆ بگێڕێتەوە؟ مەگەر بە خۆت نەتبینی پیرەژن چ تانەوتەشەرێکی لێ دام؟

- تۆ بە خۆت دەزانی کێ هەواڵی داونەتێ. ئەگەر هەست بە تانەوتەشەر دەکەیت، ئەمە کێشەی خۆتە، بەڵام دڵنیا بە من لەو بارەیەوە تاقە وشەیەکم لە زار دەر نەچووە.

گانیا، بە پەستی، وەک ئەوەی تای لێ هاتبێ، قسەکەی پێ بڕی و پرسیی:

- نامەکەمت دایە؟ ئەدی وەڵامەکەی کوا؟

لێ ئاگلایا، لە هەمان ساتدا وەژوور کەوت، میرزادە فریای وەڵامدانەوە نەکەوت.

ئاگلایا، ئەلبوومەکەی لەسەر مێزەکە داناو گوتی:

- میرزادە، فەرموو ئەوە ئەلبوومەکەم. لاپەڕەیەکی لێ هەڵبژێرە و شتێکم بۆ بنووسە. ئەمەش قەڵەم، قەڵەمێکی تازە تازەیە، قەیناکات ئەگەر قەڵەمەکە مەعدەن بێ؟ بیستوومە گوایە خۆشنووسان، قەڵەمی مەعدەنی بەکار نایەنن.

کاتێ دەگەڵ میرزادەدا قسانی دەکرد، لەوە دەچوو بە هیچ جۆرێ ئاگای لە گانیا نەبێت، بەڵام کاتێ میرزادە خەریک بوو قەڵەمەکەی تاقی دەکردەوە و دەگەڕا لاپەڕەیەک بۆ نووسینەکەی هەڵبژێرێ، گانیا چوو بۆ نزیکی ئەو سۆپایەی کە ئاگلایا لە نزیکیا و لە دەستە ڕاستی میرزادەدا وەستابوو، بە شپرزەیی و بە پچڕ پچڕی بە گوێیدا چپاند و گوتی:

- یەک وشە، تەنیا یەک وشەی تۆ، ئیدی من نەجاتم دەبێ! میرزادە، بەلەز ئاوڕی دایەوە و نیگای هەر دووکیانی کرد.

داخ و نائومێدییەکی گەورە بە دەموچاوی گانیاوە دیار بوو. پێدەچوو، بێ هیچ بیرکردنەوەیەک، وەکو یەکێک خۆی هەڵداتە ئاوەوە، ئەو قسانە بکات. ئاگلایا، بۆ چەند ساتێک، بە هەمان حەپەساوی، کە تۆزێ لەوە پێش لەهەنبەر

میرزادە نیشانی دابوو، لە گانیا ڕاما. ئەو حەپەسانە کپە، ئەو نیگا گۆنگانەی ئاگلایا کەوای دەنواند کیژێ ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە، بۆ گانیا، لە هەر سووکایەتی و نەفرەتێک قورستر و کاریگەرتر بوو!

میرزادە پرسیی:

- چیت بۆ بنووسم؟

ئاگلایا، ئاوڕێکی لە میرزادە دایەوە و گوتی:

- ئێستا پێت دەڵێم. ئامادەیت؟ دەی بنووسە: "من ئەهلی سەودا نیم." دەی ئێستا ڕۆژ و بەروارەکەشی لێ بدە و کوا پیشانمی بدە.

میرزادە، ئەلبوومەکەی دایە. ئاگلایا تەمەشایەکی کرد و گوتی:

- دەست خۆش! یەجگار جوانە. دەستخەتت زۆر جوانە. سوپاس. بە هیوای دیدار میرزادە!

ئەوسا وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە گوتی:

- دەققەیەک. وەرە لەگەڵما، دەمەوێ شتێکت بە یادگاری بدەمێ.

میرزادە، دووی کەوت، بەڵام ئاگلایا کە گەیشتە ژووری نانخواردن وەستا. نامەکەی گانیای دایە و گوتی:

- ئەمە بخوێنەوە!

میرزادە، کە بەحەپەساوی دەیڕوانییە ئاگلایا، نامەکەی لێ وەر گرت.

ئاگلایا گوتی:

- من دڵنیام کە تۆ نەتخوێندووەتەوە و ناتوانی ببی بە ڕازگری ئەم پیاوە. بیخوێنەوە. من پێت دەڵێم بیخوێنەوە.

دیار بوو نامەکە بەپەلە نووسرابوو. میرزادە دەستی بە خوێندنەوە کرد:

" ئەمڕۆ چارەنووسی من دیاری دەکرێت، دەزانیت چۆن، دەبێ ئەمڕۆ دوا گفتی خۆم بدەم، گفتێک پەشیمانی و گەڕانەوەی تیا نەبێت. من هیچ هەقێکم بەسەر تۆوە نییە، نە شایستەی بەزەیی تۆم و نە بە ئومێدی هیچ شتێکم، بەڵام تۆ ڕۆژێک قسەیەکت کرد، تاقە یەک قسە، ئەو قسەیە شەوی تاریکی ژیانی منی ڕووناک کردەوە و بووە بە چرای ڕزگاریم. ئێستا تاقە وشەیەکی دی، وشەیەکی وەکو ئەوە بڵێ و – من لە فەوتان ڕزگار بکە- تەنیا بڵێ: "دەست لە هەمووشتێک بشۆ" لەمڕۆ زووتر نییە بە قسەت دەکەم. ئاهـ... ئاخر

وتنی ئەو قسەیە بۆ تۆچی تێدەچێت؟ من تەنیا خوازیاری هێمایەکی هاوخەمی و بەزەیی تۆم - و تەنیا ئەوە و هیچی دی! من حەدی ئەوەم نییە بەتەمای هیچی تر بم، چونکە شایستەی ئەوە نیم، بەڵام هەر کە تۆ ئەو وشەیەت گوت، ئەو قسەیەت کرد، جارێکی دی من بە هەژاری و بێنەوایی خۆم ڕازی دەبم و بەوپەڕی خۆشحاڵی دەگەڵ ڕەوشی پەریشانیی خۆمدا دەسازێمەوە. دەست بە تێکۆشان دەکەمەوە، بەمەش خۆشحاڵ دەبم، ئەو وشەیەی تۆ ژیانێکی تازەم پێ دەبەخشێت، تین و تاو و هێزێکی تازەم تێ دەگەڕێت.

دەیسا بەزەیی خۆتم بۆ بنوێنە – بە گیانی تۆ جگە لە بەزەیی هیچی ترم ناوێ! لێم مەگرە، لە پیاوێکی گۆساخی نائومێد، پیاوێک کە لە حاڵی خنکاندایە و دوا هەوڵ بۆ ڕزگاریی خۆی دەدا، تورە مەبە کە ئەم گۆساخییە لە ڕووی تۆدا دەکات. گ. ئا.

کاتێ میرزادە، لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، ئاگلایا بە زمانێکی زبر گوتی:

– ئەم پیاوە پێی وایە کە ئەم قسەیە "دەست لە هەموو شتێک بشۆ" بە هیچ جۆرێ لەسەر من ناکەوێ، بەڵام وەکو دەبینی ئەم نامەیە خۆی لە خۆیدا جۆرە جەختکردنەوەیەکی نووسراوە. تۆ تەمەشا چەند ساویلکانە و ناشیانە و بە پەلەپەل تاکیدی لەسەر هەندێ پەیڤان کردووە و خەتی بە ژێردا هێناون، بەو شێوە زبرە نیازە پەنهانەکانی خۆی دەر بڕیوە. هەڵبەتە زۆر چاک دەزانێت، ئەگەر بە خوایشتی خۆی، بێ ئەوەی چاوەڕوانی تاقە وشەیەکی من بوایە، یان بێ ئەوەی باسی ئەو بابەتەی لەگەڵ مندا کردباوە، بێ ئەوەی زەڕەیەک ئومێدی بە من بێ، بە خۆی دەستی لە هەموو شتێک شۆردبا، دوور نەبوو هاوسۆزیم دەگەڵ کردبا، لەوە بوو دۆستانە پشتیوانیی لێ بکەم، بەهەرحاڵ زۆر چاک ئەوە دەزانێت! بەڵام کەسێکی گڵاوە، ڕوحی پاک نییە. ئەوە دەزانێت، بەڵام زەمانەتی دەوێ. هیچ متمانە و باوەڕێکی بە خۆی نییە، دەیەوێ من هانی بدەم، تا من بە سەد هەزار ڕۆبڵ بگۆڕێتەوە.

سەبارەت بەو قسەیەش کە جارێک لە جاران من کردوومە، لە نامەکەیدا باسی کردووە، خۆی گوتەنی شەوی تاریکی ژیانی ڕووناک کردووەتەوە، ئەمە درۆیەکی ڕووتە و دەستهەڵبەستی گۆساخانەی خۆیەتی. ڕاستە من

جارێک، تەنیا جارێک، لە بۆنەیەکدا، بەزەییم پێیدا هاتەوە و جۆرە هاوسۆزیەکم دەگەڵدا کرد... تومەز ئەمەی بە جۆرێکی دی لێکداوەتەوە، چونکە بابایەکی بێ چاوورووە، وای لێکداوەتەوە کە ئەمە چرای کەسکە و دەتوانێت ئومێدی لەسەر بینا بکات. من یەکسەر لەوە حاڵی بووم، یەکسەری نیازەکەیم خوێندەوە. ئیدی لەو ڕۆژەوە تا هەنوکە لە هەوڵی ئەوەدایە بمخاتە داوەوە، بەڵام خەیاڵی خاوە، ئیتر بەسە. ئەوە نامەکەی، هەڵی بگرە، کە لە ماڵی ئێمە چوونە دەرێ، بیدەوە دەستی، لە بیرت نەچێ کە لە ماڵی ئێمە چوونە دەرێ ئەوسا بیدەوە.

- باشە چ وەڵامێکی بدەمێ؟

- هیچ، ئەمە باشترین وەڵامە. یانی تۆ بە نیازی لە ماڵی واندا بژیت؟

میرزادە گوتی:

- ئیڤان فیدوروفیچ، بە خۆی، پێشنیازی کرد کە بچمە ئەوێ.

- کەواتە ئاگات لە خۆبێت، مەحاڵە لەسەر بردنەوەی ئەم نامەیە لێت خۆش بێ! ئەمەت هەر پێ دەڕێژێ!

ئاگلایا، تەوقەیەکی ساردی دەگەڵ میرزادەدا کرد و وەدەر کەوت. سیمای گژرو مۆن بوو، تەنانەت لە کاتی خواحافیزییشدا، کاتێ بە ئاستەم سەری بۆ میرزادە دانەواند و دووعاخوازیی لێ کرد، بۆی پێکەنی.

میرزادە بە گانیای گوت:

- دەقەیەک، با بوخچەکەم بێنم، ئەوسا دەڕۆین.

گانیا، نیگەران و پەریشان ئەم پێ و ئەو پێی دەکرد. سیمای لە داخا ڕەش داگەڕابوو. ئەنجام بە دوو قۆڵی لە ماڵەکە وەدەر کەوتن و گەیشتنە سەر شەقامەکە. میرزادە بوخچەکەی بە دەستەوە بوو.

گانیا، پەریشان و شپرزە، چیوای نەمابوو پەلاماری بدات، پرسیی:

- دەی، کوا وەڵام؟ چیی پێ گوتی؟ نامەکەمت دایە؟

میرزادە، بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، نامەکەی دایە. گانیا لە جێی خۆی وشک بوو. هاواری کرد:

- ئەمە چییە؟ نامەکەی خۆمە؟ ئاهـ... نامەکەی نەداوەتێ! دەبوایە زوو ئەمەم زانیبا! دەک بە نەعلەتی خوا بی... ئێستا دەزانم، کە ئاگلایا بۆچی

ئەوەندە ساردوسڕ بوو، ئاگای لە هیچ نەبوو! تومەز نامەکەی نەداوەتێ! باشە بۆچی نامەکەت نەداوەتێ؟.. نەعلەتی خوا لە...

- ببورە، من نامەکەم دایە. دوای ئەوەی تۆ نامەکەت دامێ، ڕێکەوت وای هانی، یەکسەر نامەکەی بدەمێ، ڕێک بەو شێوەیە دامێ کە تۆ دەتویست. کە نامەکەم بۆ هێناویتەوە، مانای وا نییە کە نەمداوەتێ، ئاگلایا خۆی دایمێ کە بۆتی بێنمەوە.

- کەی، کەی پێتی دایەوە؟

- ئەو کاتەی کە لە نووسینی ناو ئەلبوومەکەی بوومەوە، داوای لێ کردم کە لەگەڵیا بڕۆم -بە خۆت گوێت لێ نەبوو! - کە گەیشتینە ژووری نانخواردن، ئەم نامەیەی دامێ، داوای لێ کردم بیخوێنمەوە و پاشان بۆتی بێنمەوە.

گانیا، بە دەنگی بەرز، بە نیمچە هاوارەوە گوتی:

- بیخوێنیتەوە؟ نامەکە بخوێنیتەوە؟ جا خوێندتەوە؟

گانیا، لە ناوەڕاستی شۆستەکەدا، هایم و حەیران، بزمارئاسا لە جێی خۆی چەقی، لە سەرسامیدا دەمی بستێ داچەقیبوو....

میرزادە گوتی:

- بەڵێ، خوێندمەوە.

- یانی خۆی دایتێ کە بیخوێنیتەوە؟ یانی خۆی خۆی؟

- بەڵێ، بە دەستی خۆی دایمێ. باوەڕ بکە، ئەگەر بە خۆی زۆری لێ نەکردبام، هەرگیز نەمدەخوێندەوە.

گانیا، بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، هەوڵی دەدا حەواسی خۆی جەم بکات و شتێک لەم مەتەڵە حاڵی بێت. لەناکاودا هاواری کرد:

- مەحاڵە! داوای لێ کردبێت نامەکە بخوێنیتەوە! تۆ درۆ دەکەی! تۆ خۆت، لە خۆتەوە، بەبێ پرس خوێندووتەوە.

میرزادە، بە هەمان نەرمی و ئارامی بەرسڤی دایەوە:

- باوەڕ بکە، درۆت دەگەڵ ناکەم، زۆریشم پێ ناخۆشە، کە ئەوەندە بەم ئیشە نیگەران و نارەحەتی.

- ئاخر هەی بەدبەختی نەگریس، خۆ بەلای کەمەوە کاتێ نامەکەی پێ

داویەتەوە، شتێکی هەر پێ گوتوویت. جوابێکی پێدا ناردوویەتەوە، وایە؟

- با، با!

- ئەدی بۆ قسە ناکەی! دەمت کرێی دەوێ!

گانیا، بۆ جاری دووەم، بەو حاڵەوە، لە ناوەندی شۆستەکەدا وەستا و پێی ڕاستی بە عاردیدا دەکێشا.

میرزادە گوتی:

- کە لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە، گوتی گوایە تۆ دەتەوێ بیخەیتە داوەوە و وەعد و بەڵێنێکی ئەوتۆی لێ وەر بگریت، کە بتوانی بەبێ ترس دەست لە هەموو شتێک بشۆیت و هیچ زەرەرێک نەکەیت، ئەو بە سەد هەزار ڕۆبڵ بگۆڕیتەوە. وتی ئەگەر خۆ بە خۆ و بەخوایشتی خۆت ئەوەت کردبا و داوای هیچ زەمانەتێکی پێشوەختەت لەو نەکردبا و دەستت لە هەموو شتێک شۆردبا، لەگین بوو بتوانی دۆستایەتیی وی بەدەست بێنی، لەوە بوو پشتیوانیی لێ کردبایت. پێم وایە ئەوە هەموو قسەکانی بوو. نا، شتێکی تریشی گوت. کاتێ نامەکەی دامێ، لێم پرسی ئەدی وەڵامەکەی، گوتی بێ وەڵامی باشترین وەڵامە. پێم وایە شتێکی لەو بابەتەی گوت: بمبوورە ئەگەر دەقی قسەکانی ویم بیر نەمابێ، من ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە کە خۆم تێی گەیشتووم.

گانیا، لەڕادەبەدەر تورە بوو، ڕقێکی وا دایگرتبوو، خۆی پێ جڵەو نەدەکرا، بەدەم دانەچیرێوە گوتی:

- ئاوها... بوو بەوەی نامەکانم لە پەنجەرەوە تورِ بدات! ئاوها.. ئەو ئەهلی سەودا نییە! چاکە... زۆر چاکە، بەڵام من ئەهلی سەودام و دەشیکەم... کەسێ نەمرێ دەیبینین! بزانە چۆنی نیشان دەدەم! من هێشتا هەموو شتێکم نەگوتووە... بە خۆی دەیبینێ!... خەبەری منی دەگاتێ!...

دەموچاوی گرژ دەبوو، ڕەنگی سپی تر دەبوو، کەفی دەپرژاند، کۆڵەمستی دەگوشی، قامکی ڕادەوەشاند و هەڕ و گیڤی دەکرد. بە جووتە، بەو حاڵەوە چەند هەنگاوێک ڕۆیشتن. گانیا، هیچ حیسابێکی بۆ میرزادە نەدەکرد، دەتگوت بە تاقی تەنیا لە ژوورەکەی خۆیدایە و کەسی لەلا نییە. لەناکاودا بیرۆکەیەکی بە مێشکا هات و لە میرزادەی پرسی:

- باشە تۆ چۆن توانیت (لە دڵی خۆیدا گوتی تۆی گێلۆکەی ئەبلە) چۆن

توانیت، بەم خێراییە، لە زەرفی دوو سەعاتدا، متمانەی ئەو بەدەست بێنی و ببی بە مەحرەمی ڕازی؟ ئاخر چۆن؟ بە چ ڕێگەیەک؟

هەر لەغیرەی کەم بوو، وا ئەویشی هاتە سەر، تیری غیرە دای لە جەرگی، نۆبەتی ئەو قەوانەیە، بە خۆی عەزابی کەم بوو، ئەوەشی هاتە سەرێ. میرزادە بەرسڤی دایەوە:

– ناتوانم، هۆی ئەمەت بۆ ڕوون بکەمەوە!

گانیا، نیگایەکی نامەردانەی شەڕانیی کرد و گوتی:

– باشە کە تۆی برد بۆ ژووری نانخواردن، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوە نەبوو کە متمانەی پێتە؟ ئەدی نەیگوت حەز دەکات یادگارییەکت بداتێ؟ وا نییە؟

– منیش هەر وا تێگەیشتم!

گانیا، زۆر شپرزە بوو. لە ناخەوە دەکولا، هەرچیی دەکرد نەیدەتوانی حەواسی جەم بکات... بە پەریشانی لەسەری ڕۆیشت:

– بەڵام بۆچی؟ بە ڕاستی سەیرە!... باشە لەوێ چیت کرد؟ چۆن توانیت، بەو خێراییە متمانەی ئەو بەدەست بێنی؟ گوێ بگرە... باشە نازانی چیتان وتووە، وەبیر خۆتی بێنیتەوە و وەکو خۆی بەڕیز، لە سیری تا پیازی بگێڕیتەوە؟ یانی شتێکتان نەگوت مایەی سەرنج بێ، ئێستا بیرت بێتەوە؟.

میرزادە، وەڵامی دایەوە:

– با، دەتوانم... هەوەڵ جار هەر کە وەژوور کەوتم و تەعارفومان کرد، کەوتینە باسی سویسرا.

– سویسرا نا، سویسرام بەقوڕێ گرت!...

– پاشان، باسی سزای ئیعدامان کرد...

– سزای ئیعدام؟

– بەڵێ، هەر وا بە شێوەیەکی لامسەرلایی باسی ئیعدامان کرد. پاشان باسی ئەوەم بۆ کردن کە چۆن سێ دانە ساڵم لەوێندەر بەسەر بردووە و ئەوسا باسی کیژە گوندییەکی داماو و بێنەوام بۆ کردن.

گانیا، بەوپەڕی بێتاقەتی گوتی:

– واز لە کیژە گوندی داماو بێنە، سەری بە قەبری بابی! دەی تەواوی بکە،

چی تر؟

گانیا، لە نیگەرانیدا، خۆی پێ نەدەگیرا. میرزادە لەسەری ڕۆیشت:

– ئەوسا، باسی ئەوەم بۆ کردن کە ڕەئی شنایدەر سەبارەت بە تەبیعەتی من چی و چۆن بووە، چۆن هانی دام کە...

– واز لە شنایدەر بێنە، ڕەئی ئەوم بۆ چییە! دەی چی تر؟

– ئەوسا نازانم چۆن بوو کە بابەتێکی دی هاتە پێشەوە و باسی دەموچاو و خوێندنەوەی دەموچاوم بۆ کردن... یانی حاڵەتی دەموچاو... بەدەم قسانەوە گوتم جوانیی ئاگلایا ئیڤانوڤنا، تەقریبەن شان لە شانی جوانی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەدات... ئیدی لەو کاتەدا، لە دەمم دەر چوو، بێ هیچ مەبەستێک، باسی وێنەکەیم کرد.

– خۆ باسی ئەو شتەت بۆ نەکردن کە لە نووسینگەکە گوێت لێ بوو، وا نییە؟ بۆت نەگێڕانەوە؟ هیوادارم نەتگێڕابێتەوە.

– دڵنیا بە، شتی وام نەکردووە. نەخێر بۆم نەگێڕانەوە...

– بەڵام... سەیرە... ئاگلایا نامەکەی بە دایکی نیشان دا؟

– دەتوانم سوێندت بۆ بخۆم کە نەخێر، پیشانی نەدا. من بۆ چاوتروکانێکیش جێم نەهێشتن، بۆیە ئەگەر بیویستایە نیشانیشی بدات، بۆی نەدەلوا.

– بەڵام ڕەنگە شتێک ڕووی دابێت و تۆ پێت نەزانیبێت...

ئەوسا گانیا، بە جارێ دەهری بوو، لە دین دەر چوو، هاواری کرد:

– ئاخ لەدەست تۆی گێلی دومۆر! گێژە تەنانەت ناتوانی شتەکانیش بەوردی بگێڕیتەوە!

گانیا، کە جنێوی یەکەمی داو ڕووبەڕووی هیچ کاردانەوەیەک نەبووەوە، وەکو چۆن هەندێ کەس لەو حاڵەتەدا چەشە دەبن، ئەویش بەو ئاوایە چەشە بوو و شووڵی لێ هەڵکێشا. بە ڕادەیەک تووڕە بووبوو، لەگین بوو بگاتە تفکردن، بەڵام هەمان تووڕەیی کوێری کردبوو. دەنا دەبوایە لە زووەوە سەرنجی ئەوەی دابا، کە ئەم گێلەی ئەو گاڵتەی پێ دەکات، هەندێ جار زۆر بەخێرایی لە شتان دەگات و بەباشییش دەتوانێ بگێڕێتەوە. لەناکاودا، بویەرێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا.

میرزادە لەناکاودا گوتی:

- گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، حەز دەکەم ئەوەت پێ بڵێم ئەگەرچی جاران، ئەوەندە نەخۆش بووم کە بە گێل و ئەبلەیان دەزانیم، بەڵام لەمێژە چاک بوومەتەوە، زۆرم پێ ناخۆشە خەڵکێک ڕووبەڕوو پێم بڵێ گێل یان ئەبلە. ڕاستە تۆ لە وەزع و حاڵێکی نالەباردایت و ڕەنگە پیاو پاکانەیەکت بۆ بکات و چاوپۆشیت لێ بکات، بەڵام تۆ لەوساوە تا ئێستا دوو-سێ جارت جنێو دامێ، کە هەرگیز ئەمەت لێ قەبووڵ ناکەم، بە تایبەتی کە هیچ هۆیەک نییە بۆ ئەمە. تۆ لە خوتوخۆڕایی شەڕ بە من دەفرۆشیت. جا ئێمە ئەگەر لە ئێستاوە ئاوا بین، باشتر وایە هەر لێرەوە، لەم سەر جادەیەوە لێکدی جیا بینەوە، تۆ دەستە ڕاست بگرە و بڕۆ بۆ ماڵەوە و منیش دەستە چەپ دەگرم و دەڕۆم، بیست و پێنج ڕۆبڵم پێیە و بۆ خۆم ئوتێلێک دەدۆزمەوە.

گانیا، کە سەراسیمە بووبوو. لە شەرمەزاریدا سوور بووەوە و بای دایەوە و کەوتە نەرمکێشی، کەوتە داوای بوردن و لە جنێوی ناشیرینەوە بای دایەوە بۆ ڕێز و حورمەت و بەگەرمی گوتی:

- میرزادە بمبورە، تۆ ئەو خوایە لێم ببورە... بە خۆت دەبینی لە چ وەزع و حاڵێکام، چۆن گیرۆدە بووم. تۆ هێشتا ئاگات لە هەموو مەسەلەکە نییە، هەموو شتێک نازانیت، ئەگەر زانیبات بێگومان، بەلای کەمەوە، تا ڕادەیەک دەتبەخشیم، هەرچەندە ئەم ڕەفتارەم هیی بەخشین نییە...

میرزادە، بەلەز بەرسڤی دایەوە:

- پێویست بەو هەموو عوزرخوازییە ناکات. من تێت دەگەم، دەزانم ئەم ڕەفتارە نالەبارەت، زادەی وەزع و حاڵە ناهەموارەکەتە. دەی گوێ مەدەیە، با بڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێوە، من لەلای خۆمەوە هیچم لە دڵا نەما.

گانیا، بەدەم ڕێوە، بە بوغزو کینەوە دەیڕوانییە میرزادە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "نا، مەحاڵە بێڵم، بەو جۆرە بەبێ ئارەق دەر بچێت. ئەم فێڵبازە، ئەم فریبۆکە، هەرچی ڕاز و نهێنیم هەیە، لێی دەر هێنام، ئێستاش ئەوەتا دەمامکەکەی لێ فڕێ داوەو... نا، ئەم ماستە موویەکی تێدایە، بەڵام پەلە مەکە. هەموو شتێک دەر دەکەوێت، هەموو شتەکان ئاوەڕۆی خۆ وەر دەگرن، هەموو شتێک، ئەمشەو هەموو شتێک یەک لایی دەبێتەوە!".




بەدەم ئەو قسانەوە گەیشتبوونە بەردەرگا.

**فەسلی هەشتەم**

خانووەکەی ماڵی گانیا لە قاتی دووەمدایە، بە قاڵدرمەیەکی پاکوخاوێنی بەرین و ڕووناک بۆی سەر دەکەویت، بریتییە لە شەش ژوور، بە پانتایی جیاواز. ئەگەرچی ئەم خانووە، خانوویەکی ئاسایی بوو، بەڵام کرێیەکەی لە توانای فەرمانبەرێکی بچووکدا نەبووکە ئەرکی بەخودانکردنی خێزانی بەسەرەوە بێ، با مووچەی ساڵانەی بگاتە دوو هەزار ڕۆبڵێکش، بەڵام ئەم خانووە وا دروست کرابوو کە دەشیا وەکو پانسیون بەکرێ بدرێ و سوودێکی لێ ببینرێ. هەمووی دوو مانگێک بوو، هەرچەندە گانیا پێی ناخۆش بوو، لە لایەن نینائالکساندروفنای دایکی و ڤارڤارای خۆشکییەوەوەکو پانسیۆن بەکرێ درابوو، چونکە ئەو دوو ئافرەتە سوور بوون لەسەر ئەوەی ئەوانیش کارێک بکەن و دەسکەوتێکیان هەبێ و سووکە بەشدارییەک لە دەرامەتی خانەوادەکەیاندا بکەن. گانیا، کە بەتەمای ئاییندەیەکی پرشنگدار بوو، ئەمەی زۆر لەبەر گران بوو، هێنانی کرێچی، بە جۆرە سووکایەتییەک دەزانی، بۆیە لەوەتای هاتبوونە ئەم خانووە، شەرمی دەکرد لە کۆڕ و کۆمەڵاندا دەر بکەوێت و ئەمە زامێکی قووڵی کردبووە دڵ و دەروونی. بۆیە، ماوەیەک بوو، بە بچووکترین شت نەک هەر تووڕە، بەڵکو دەهری دەبوو، لە دین دەر چوو، جا کە تەحەمولی ئەو وەزعەی

دەکرد، بەو ئومێدە بوو کە لێبڕابوو لە کورتترین ماوەدا تێکڕای ئەو وەزعە بگۆڕێت، بەڵام هەر ئەو گۆڕانەی کە ئەو بەتەمای بوو،و ئەو ڕێگەیەی ئەو بەو نیازە گرتبوویە بەر، ئەوەندە قورس و دژوار بوو کە نەک باری سەر شانی سووک نەدەکرد، نەک کێشە و گرفتەکانی کەم نەکردەوە، بەڵکو زۆر لە جاران دژوارتر و زۆرتر و بە ئازارتری کرد.

دالانێکی سەرانسەری، خانووەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم بریتی بوو لە سێ ژوور کە تەنیا بە کرێچیانی سفارشتی بە کرێ دەدران. هەر بەو دەستەدا، لە کۆتایی دالانەکەداو، لە نزیکی موبەقەکەدا، ژوورێکی چکۆلە، چکۆلەتر لە هەموو ژوورەکانی دیکە، هەبوو. تەختەخەوێکی گەورەی تیا بوو، سەرگەڤاری ماڵ، واتە جەنەراڵی خانەنشین ئیڤولگین، لەو ژوورەدا دەژیا و دەخەوت. ئەم پیاوەیان ناچار دەکرد، بە موبەقەکەدا و لە قاڵدرمەی خزمەکارەکانەوە هاتوچۆ بکات. (کولیا)*ش، برا چکۆلەکەی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، هەر لەو ژوورە چکۆلەیەدا، دەژیا، نیکولای (کولیا) قوتابی ناوەندی بوو، تەمەنی سیازدە ساڵان بوو، ئیدی ناچار بوو لەم ژوورە تەنگەدا دەرسەکانی دەور بکاتەوە، بخەوێت، کەتێکی شەقوشڕی، کورتی، باریکی هەبوو، نوێنەکانی کۆن و شڕ بوون. بەو حاڵەشەوە دەبوایە ئاگای لە بابی بێت و سەرپەرشتی بکات، چونکە جەنەراڵ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پێویستی بە یارمەتیی ئەو دەبوو.

ژووری ناوەڕاستیان دا بە میرزادە، ژوورەکەی لای ڕاستی ئەم ژوورە، فەردیش چینکۆی تیا بوو، ژووری سێیەم، واتە ئەوەی لای چەپی ژوورەکەی میرزادە هێشتا چۆڵ بوو، بەڵام گانیا، لە پێشا میرزادەی برد، بۆ ئەو بەشەی خانووەکە، کە ماڵی خۆیانی تیا بوو. ئەم بەشە بریتی بوو لە ژووری میوان و پێشوازی کە لە کاتی پێویستدا، دەکرا بە ژووری نانخواردنیش، ژووری دانیشتن کە لە ڕاستیا تەنیا بە ڕۆژەوە ژووری دانیشتن بوو، دەنا هەر کە شەو دادەهات ئیدی دەبوو بە ژووری کارو نووستنی گانیا، ژووری سێیەمیش، ژوورێکی بچکۆلە بوو، هەمیشە داخرا بوو، ئەمە ژووری نینا ئالکساندروڤناو ڤارڤارا ئاردالیوڤنا بوو. بە

کورتییەکەی هەموو شتێک لەم خانووەدا تێک ترنجا بوو، یەجگار تەنگەبەر و ناخۆش بوو. گانیا، لە حەژمەتاندا هەر دانی دەکرۆشت. هەرچەند، هەوڵی دەدا مدارای دایکی بکات و ڕێزی بگرێت، بەڵام هەر کەسێک دیتبای، یەکسەر هەستی دەکرد کە ئەو سەرگەڤار و فەرمانڕەوای خانەوادەکەیە.

نینا ئالکساندروڤنا بە تەنیا لە ژووری میوان (هۆڵەکە) نەبوو، بەڵکو ڤارڤارا ئاردالیونوڤناشی لەگەڵدا بوو. هەر دووکیان بەدەم چنینکارییەوە خەریکی گفتوگۆ بوون دەگەڵ ئیڤان پتروفیچ پتیتسندا کە میوانیان بوو. نینا ئالکسندروڤنا کە نزیکەی پەنجا ساڵێک دەبوو، ژنێکی دەموچاو لاوازی گۆنا قوپاو بوو، ژێر چاوانی بە ئاستەمێک شین دەچووەوە. نەخۆش و لەش بەبار دەهاتە بەرچاو، بەڵام سیماو نیگای جوان و دڵگیر بوو. پیاو لە یەکەم قسەیدا بۆی دەر دەکەوت کە ژنێکی بە تەبیعەت و جدی، سەلارو بەویقار، سەرڕاست و سەنگینە. ڕاستە بە ڕواڵەت و بە سیما خەمین و خەمبار بوو، بەڵام بە دڵ ئاوەدان و ورەبەرز بوو، جلوبەرگەکەی یەجگار خاکیانە و سادە بوو، مەیلەو ڕەش و پتر لە جلوبەرگی ژنانی پیرتر دەچوو، بەڵام هەڵس وکەوت و ڕەفتاری، دەمودوو و گفتولفتی، هەر هەمووی ئەوەی دەنواند کە لە ژینگە و کۆمەڵگەیەکی باڵاتر و باشتردا ژیاوە و پەروەردە بووە.

بەڵام ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، کچێک بوو لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا، دەستەباڵا، باریکەلە، ئەندامورديلە. هەرچەند دەموچاوی جوان نەبوو، بەڵام نهێنییەکی تیا بوو، بەبێ جوانی، ڕای دەکێشایت. زۆر لە دایکی دەچوو، جلوبەرگێکی ساکاری، تەقریبەن وەکو جلوبەرگەکەی دایکی، لەبەرا بوو، جلەکانی زۆر لێ دەهات. چاوەکەژاڵەکانی، هەندێ جار زۆر گەش و زیت بوو، بەڵام بە زۆری مەند و قوڵ و خەیاڵاوی بوون، بە تایبەتی لەو دواییانەدا. کە سەیرت کردبا، یەکسەر بۆت دەردەکەوت کە مرۆڤێکی مەند و سرڕقاییم و بەورەیە. تەنانەت بە دەموچاویا، لە دایکیشی مەندتر و بە شەخسیەت تر دیار بوو. ڤار ڤارا، خوو و تەبیعەتێکی ئاگرینی هەبوو، هەڵچوونەکەی لەوەدا نەبوو، تەنانەت براکەیەشی هەندێ جار لێی دەترسا.

ئەو میوانەش کە قسەیان دەگەڵا دەکرد، لە هەڵچوونەکانی وی دەترسا. میوانەکەیان (پتیتسن)، پیاوێکی هێشتا گەنج بوو، لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو، جلێکی ساکار، بەڵام جوانی لەبەر بوو. ڕەفتاری نەرم و نیان بوو، بەڵام برێک دەستکرد بوو. ڕدێنە کورتە سوورەکەی ئەوەی نیشان دەدا کە نە فەرمانبەری حکومەتیە و نە قەناعەتی بە وەزیفەی فەرمی هەیە. قسەکردنی زیرەکانە و مایەی سەرنج بوو، بەڵام زۆربەی کات بێدەنگ بوو. بە شێوەیەکی گشتی خۆشەویست بوو، دەچووە دڵەوە، بە زەقی دیار بوو کە دڵبەستەی ڤار ڤارا ئاردالیونوفنا بوو، هەوڵی نەدەدا ئەم دڵبەستەییە بشارێتەوە. ڤار ڤاراش دۆستانە ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد، بەڵام وێرای ئەوەش خۆی لە وەڵامی هەندێ پرسیاری وی دەبوارد و تەنانەت بە ساردیش بەرسڤی دەدایەوە. وێرای ئەوەش پتیتسن هەر کۆڵی نەدەدا. نینا ئالکسندروفنا، زۆری ڕوودەدایە و دەگەڵیا میهرەبان بوو، بگرە لەو دواییانەدا وای لێهاتبوو گرێی دڵی خۆی بۆ دەکردەوە. لە لایەکی تریشەوە وا باو بوو کە پتیتسن لە ڕێگەی سووتخۆرییەوە، پارەیەکی باش و مسۆگەر بەدەست دێنێ. ئەم پیاوە لە دۆستە نزیکەکانی گانیا بوو.

گانیا، بەپەلەپەل میرزادەی پێ ناساندن، زۆر بە تووڕەیی سڵاوی لە دایکی کرد، سڵاوی لە خوشکەکەی هەر نەکرد، ئەوسا خێرا پتیتسنی دەگەڵ خۆیدا بردە دەرێ.

نینائالکساندروفنا، خێرهاتنی میرزادەی کرد، ئەوجا بە کولیای، کە هاتبووە بەر دەرگاکە، گوت، میرزادە بەرێت بۆ ژووری ناوەڕاست. کولیا، کوڕێکی ڕووخۆش و سادە و متمانە بە خۆ بوو.

کولیا، کە میرزادەی بۆ ژوورەکە برد، پرسی:

– ئەدی کوا شتومەکەکانت؟

– هەر بوخچەیەکم هەیە، ئەویشم لە هۆڵەکە دانا.

– ئێستا خۆم بۆتی دێنم. ئێمە تەنیا ئاشپەزەکە و ماتریونای کارەکەرمان بەدەستەوەیە، خزمەتکاری دیمان نین، بۆیە دەبێ منیش یارمەتیان بدەم. ڤاریا (سووکەڵە ناوی ڤارڤارایە) ماڵ بەڕێوە دەبات و هەمیشە سەرقاڵە.

گانیا، گوتی: تۆ ئەمڕۆکە لە سویسراوە هاتوویت، وایە؟

- بەڵێ، دروستە.

- باشە سویسرا خۆشە؟

- زۆر.

- کوێستانە؟

- بەڵێ. شاخی زۆرە.

- زۆرباشە، دەچم بوخچەکەت بۆ دێنم.

لەم کاتەدا ڤارڤارا، خۆی بە ژوورا کرد و گوتی:

- ماتریونا، نوێنەکانت بۆ دێنێ و تەختەخەوەکەت بۆ چاک دەکات. جانتات پێیە؟

- نەخێر، تەنیا پریاسکەیەکم پێیە. براکەت چووە بیهێنێ، لە هۆڵەکە دامناوە.

کولیا، لەم کاتەدا، هاتەوە و گوتی:

- هەر ئەم بوخچە بچوکەی لێ بوو، ئەدی شتەکانی دیکەت لەکوێ داناوە؟

میرزادە، کە بوخچەکەی لە دەستی وەر دەگرت، بەرسڤی دایەوە:

- هەر ئەمەیە، هیچی ترم نییە.

- ئاوها... ترسام، فردیش چینکۆ، بردبێتی.

ڤارڤارا، بەتوڕەیی گوتی:

- قسەی بێمانا مەکە!

ڤارڤارا، زمانی زبر بوو، تەنانەت میرزادەشی بە زمانێکی زبر دواند. برایەکەی پێی گوت:

- ڤاریا گیان! دەتوانی بە زمانێکی نەرمتر قسەم دەگەڵ بکەیت. خۆ من پتیتسن نیم.

- کولیا، هەقە بەر شەلاقیشت بدەم، چونکە زۆر کەودەنی.

ئەوجا ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- هەرچییەکت پێویست بوو بە ماتریونا بڵێ. ئێمە سەعات چوار و نیو،





شێو دەخۆین، ئیدی تۆش سەرپشکی کە بێی دەگەڵ ئێمەدا نان بخۆیت، یان بۆت بێنن بۆ ژوورەکەی خۆت.

ئەوسا ڕووی کردە گانیا و گوتی:

- دەی گانیا وەرە دەرێ، میرزادە نارەحەت مەکە!

- بەڵێ، ئەمرە فەرمووی!

لەو دەمەدا کە دەر دەچوون، لووتیان تەقی بە لووتی گانیاوە.

گانیا، لە کولیای پرسی:

- باوکە لەماڵەوەیە؟

کە کولیا وەڵامی دایەوە باوکە لە ماڵەوەیە، چەند وشەیەکی بە گوێیدا چپاند. کولیا سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاند و وەدەر کەوت و دوای ڤارڤارا کەوت.

- میرزادە، دەمەوێ دوو قسەی ترت دەگەڵ بکەم... لەبەر جەنجاڵی بیرم چووبوو! تکایەکی دۆستانەم لێت هەیە، مەردی چا بەو ئەم چاکەیەم دەگەڵ بکە: تکایە ئەگەر زەحمەت نییە، لێرە باسی ئەو شتە مەکە کە لە بەینی من و ئاگلایادا ڕووی دا و لەوێش باسی ئەو شتانە مەکە کە لێرە دەیبینی. چونکە وەزع و ڕەوشی ئێرەش هەمووی هەر جوان و باش نییە، هەرچەندە زۆریش بەلامەوە گرینگ نییە... بەهەرحاڵ، هەوڵ بدە بەلای کەمەوە ئەمڕۆکە، هەر ئەمڕۆ زمانی خۆت بگرە.

میرزادە، لەم گلەییانەی گانیا پەست بوو، گوتی:

- دڵنیات دەکەم و باوەڕ بکە زۆر لەوە کەمتر قسەم کردووە کە تۆ تەسەوری دەکەیت.

بەزەقی دیار بوو کە پەیوەندیی نێوان ئەم دووە خراپ و خراپتر دەبوو.

گانیا گوتی:

- بەهەرحاڵ، ئەمڕۆکە بەسایەی تۆوە تووشی دەردەسەرییەکی زۆر بووم. بە کورتییەکەی ئەو تکایەم لێت هەیە.

میرزادە گوتی:

- گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، حەز دەکەم ئەوە بزانیت کە من ئەوساکە و

لەوێندەر هیچ مەوعیدێکم دەگەڵ تۆدا و دەگەڵ کەسی تردا نەبوو، هیچ قەول و بەڵێنێکیشم بە تۆ نەدابوو، تۆش هیچ داوایەکت لە من نەکردبوو، ئیدی بۆچی نەدەبوو باسی وێنەکە بکەم؟ تۆ بە منت نەگوتبوو باسی نەکەم.

گانیا، لە کاتێکا بە پەستی دەیڕوانییە دەوروبەری گوتی:

- ئۆف. کە ژوورێکی ناخۆشە! چەند تاریکە! خۆ پەنجەرەکەشی بەسەر حەوشەکەدا دەڕوانێ! ئەو وەختە بەختت خەوت کە ڕێت کەوتە ئەم شوێنە. بەهەرحاڵ، ئەمە پەیوەندیی بە منەوە نییە، نە لە دوور و نە لە نزیک پەیوەندیی بە منەوە نییە. من هەقم بەسەر ئەم کرێ و کرێدارییەوە نییە. ئەمە ئیشی من نییە!

لەم کاتەدا پتیتسن سەرێکی کێشایە ژوورەوە و گانیای گازکرد. گانیا، بەلەز میرزادەی بە جێهێشت و وەدەر کەوت، هەرچەندە دیار بوو هێشتا زۆر شتی دیکەی پێ مابوو بیڵێ، بەڵام نەیدەزانی چۆن و لەکوێوە دەست پێ بکات، شپرزە و پەشێو بوو، تەنانەت کە زەمی ژوورەکەشی دەکرد، زیاتر بۆ شاردنەوەی نیگەرانی و پەشێوییەکەی خۆی بوو.

میرزادە، هێشتا بە تەواوەتی لە دەست و چاو شۆردن نەبووبووەوە، کە جارێکی دی درزێک کەوتە دەرگای ژوورەکەی و دەموچاوێکی تازەی لێ پەیدا بوو. کابرایەک بوو، نزیکەی سی ساڵان، باڵابەرز، چوارشانە، سەرزلێکی قژلوولی، قژسوور، سوورەیەکی دەموچاوگۆشتن بوو، لێوی ئەستوور، کەپووی پان و فس، چاوەکانی چکۆلەو بە قووڵاچوو، لەتۆ وایە بەردەوام و بە شێوەیەکی کۆمیدی دەتروکێن. بە شێوەیەکی گشتی جۆرە لاساری و گوساخییەکی پێوە دیار بوو. جلوبەرگەکەی شڕ و شەپڕێو دیار بوو.

هەوەڵجار، دەرگاکەی بایی ئەوەندە کردەوە، کە سەری هێنایە ژوورێ. ئەم سەرە بۆ ماوەی چەند سایتێک چاوی بە ژوورەکەدا گێڕ دا، ئەوجا دەرگاکە بەرەبەرە و بە ئەسپایی کرایەوە. هەموو قەد و قەڵافەتی کابرا لە ئاستانەی دەرگاکەوە دەرکەوت، بەڵام وێڕای ئەوەش یارۆ نەچووە ناو

ژوورەکە، بەڵکو چاوەکانی چکۆلە کردنەوە و کەوتە نۆڕینی میرزادە. ئەنجام دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە داخست، نزیک بووەوە، کورسییەکی هەڵگرت و لەسەری دانیشت، دەستی میرزادەی توندگرت و لەسەر کەتەکە دانا، لە کاتێکا بەسەرسامی چاوی بڕیبووە چارەی میرزادە، خۆی پێ ناساند:

- من فردیش چینکۆم...

میرزادە، کە چیوای نەمابوو لە قاقای پێکەنین بدات، گوتی:

- باشە، مەبەستت؟

فردیش چینکۆ، کە حۆڵ حۆل و بێ هیچ مەبەست و ئامانجێک تەمەشای دەکرد، لەسەری ڕۆیشت:

- یەکێکم لە کرێچیانی ئێرە.

- دەتەوێ تەعاروف بکەین، یەکتر بناسین؟

- یانی!...

بەدەم ئەو وەڵامەوە، قامکی لە قژی خۆی ناو چاوی بڕییە سووچەکەی ئەوبەری ژوورەکە، ئاهێکی هەڵکێشا و ئەوجا ئاوڕی لای میرزادەی دایەوە و لەناکاوا لێی پرسی:

- هیچ پارەوپولێکت هەیە؟

- کەمێک

- یانی چەند؟

- بیست و پێنج ڕۆبڵ.

- کوا نیشانمی بدە.

میرزادە، ئەسکەناسێکی بیست و پێنج ڕۆبڵی لە بەرکی ئێلەکەکەی دەر هێنا و دایە دەست فردیش چینکۆ. ئەویش کردیەوە، تەمەشایەکی وردی کرد، ئەم دیو و ئەو دیوی کرد، دایە بەر ڕووناکییەکە و لە فکران ڕاچوو، ئەوجا گوتی:

- سەیرە! بۆچی ڕەنگی وا تۆخ دەبێت؟ ئەم بیست و پێنج ڕۆبڵیانە، هەندێکیان ڕەنگیان زۆر تۆخ دەبێت، کەچی هەندێکی تریان، بەتەواوەتی

ڕەنگیان دەگۆڕێت. فەرموو بیگرە.

میـــرزادە، ئەسکەناســـەکەی وەر گـــرتەوە. فـــردیش چینکـــۆ لەســـەر کورسییەکەی هەستاو بە میرزادەی گوت:

- مـن بۆیـە هـاتم تـا یەکـەم ئاگـادارت بکـەمەوە کـە نەخەڵـەتابی قـەرزم بدەیتێ، چونکە گومانی تیا نییە کە داوای قەرزت لێ دەکەم، جا نەکەی دڵت نەرم بێ و قەرزم بدەیتێ...

- بەڵێ، باشە.

- بەتەمای بە کرێ لێرە دانیشیت؟

- بەڵێ، بە نیازم.

- بـەڵام مـن کـرێ نـادەم. سـوپاس. ژوورەکـەم بـە تەنیشـت ژوورەکـەی تۆوەیـە، یەکـەم ژووری سـەمتی ڕاسـتی ژوورەکـەی تۆیـە. دیتووتـە؟ هەوڵ بـدە زوو زوو سـەردانم نەکـەیت، بـەڵام دڵنیـا بـە کـە مـن دێمـە دیدەنیت، ناڕەحەت نەبیت. باشە جەنەراڵت دیتووە؟

- نا.

- گوێت لە دەنگی بووە؟

- هێشتا، نە!

- خەمت نەبێ، کەسـێ نـەمرێ هـەم دەیبینی و هـەم گوێشـت لێـی دەبێت. شـووم و بەدفـەرێکی ئەوتۆیـە، تەنانـەت چـاوی لەوەیـە لاتێکـی وەکـو مـن قـەرزی بـداتێ. ئەوا پێم وتـی هـا، دوای نـەڵێی. "ئاگادارییەکە بۆ-خوێنەرا!"... خـودا حـافیز. وەرە پیـاو نـاوی فـردیش چینکۆ بێ و بتـوانێ بـژی، دەتـوانێ بژی؟ ها؟

- بۆ نا؟

- خواحافیز.

فـردیش چینکـۆ، بـەرە و دەرگاکـە ڕۆیشـت. پاشـان میـرزادە، بـۆی دەر کەوت کـە ئـەم بـەڕێزە، بـە شـۆخی و نوکتـەبازی و بـێ موبـالاتی و خەمسـاردییەکانی خـۆی، خـەڵکی ناڕەحـەت دەکـرد، بـەڵام لـەم دەورەدا زۆر سەرکەوتوو نەبوو، هەندێ جار خەڵکانێک زۆر لێی بێزار دەبوون و بەگژیا

دەچوونەوە، تەریقیان دەکردەوە، ڕاستە لە دڵەوە بەوە نارەحەت دەبوو، بەڵام ئەو خووەی تەرک نەدەکرد.

فردیش چینکۆ، لە ئاستانەی دەرگاکەدا، کە خەریک بوو دەر دەچوو، تووشی بوو بە تووشی میوانێکی تازەوە، خۆی لە ڕێگای لا دا تا ڕەت بێ. میرزادە، ئەم میوانە تازەیەی نەدەناسی. فردیش چینکۆ ڕوو لە میرزادە بە گۆشەی چاو ئاماژەی بۆ میوانە تازەکە کرد، میوانەکە ڕێی بۆ فردیش چینکۆ کردەوە، فردیش چینکۆ، بە حورمەت و متمانەوە وەدەر کەوت.

ئەم میوانە تازەیە، پیاوێک بوو باڵا بەرز، تەمەنی نزیکەی پەنجا و پێنج ساڵ یان زیاتر دەبوو، کەمێک قەڵەو و بەخۆوە بوو. سوورەیەکی دەموچاو قەڵەوی، دەموچاو پان بوو، ڕیش و سمێڵێکی بۆزی چڕوپڕی هەبوو، چاوانی درشت و کەمێک زەق بوون. ئەگەر جلوبەرگەکەی شڕ و شەپڕێو و چڵکن نەبوایە، سام و هەیبەتێکی تەواوی دەبوو. چاکەتێکی تاڵکێشی کۆنی لەبەردا بوو کە ئانیشکەکانی تەواو سوا بوون، کراسەکەشی چڵکن و پڕ پەڵە بوو، بە خۆیشی، بە ئاستەمێک بۆنی ڤۆدگای لێدەهات، لە نزیکەوە بە تەواوەتی هەستی پێ دەکرا. وێڕای ئەوەش، ڕەفتارو ئەتواری دەچووە دڵەوە. دیار بوو، بە ئانقەست و بە مەبەست هەوڵی دەدا بەویقار و سەنگینی سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشێت.

ئەو بەڕێزە، بەکاوەخۆ لە میرزادە نزیک بووەوە. بەبێدەنگی و بەدەم بزەیەکی دڵگیرەوە، دەستی گرت و لەنێو دەستی خۆیدا ڕایگرت، مودەتێک لە سەروسیمای ڕاما، وەک بڵێی سێ و دووی ئەوە بکات کە ئەم سیمایەی دیتووە و دەیناسێت.

ئەوسا بەوپەڕی هێمنی و لە بن لێوانەوە گوتی:

– بەڵێ، خۆیەتی، کۆپییەکی تەواوی ئەوە، هەر دەڵێی ئەوە و زندوو بووەتەوە. هەر کە گوێم لە شۆرەت و ناوی ئازیزی ئەمماڵباتە بوو، هەموو ڕابردووم لە ویژدانا زندوو بووەوە... تۆ میرزادە میشکینی؟

– بەڵێ.

– من جەنەراڵ ئیفولگین، خانەنشینی نەگبەتم. دەکرێت ناوی خۆت و

بابتم پێ بڵێی؟

– لیون نیکولایوفیچ.

– بەڵێ، بەڵێ، خۆیەتی، دروستە! تۆ کوڕی دۆستەکەی منی، کوڕی هاوڕێ و هاووازی منداڵیم، (نیکولای پتروفیچ)ی!

– ناوی بابم نیکولای لڤوڤیچ بوو.

– لڤوڤیچ، بەڵێ لڤوڤیچ...

جەنەراڵ، بەو جۆرەو، بەکاوەخۆ، بەوپەڕی متمانەوە، وەکو بڵێی هەرگیز ناوی بابی وی فەرامۆش نەکردبوو، بەڵکو تەنیا هەڵەی زمان بوو، ناوەکەی ڕاست کردەوە: "بەڵێ لڤوڤیچ". دانیشت، دەستی میرزادەی گرت و لە نزیکی خۆیەوە داینا.

– زۆر جار لە باوەشم دەگرتیت!

میرزادە گوتی:

– بە ڕاست؟ ئەوە بیست ساڵە بابم مردووە.

– بەڵێ، بیست ساڵە، بیست ساڵ و سێ مانگە. لە یەک قوتابخانە بووین. پاشان من چوومە سلکی سوپایی...

– بەڵێ، بابیشم لە سوپادا بوو، لە لیوای ڤاسیلکوڤسکی*دا، ملازمی دووەم بوو.

– نا، لە لیوای بیلامیرسکی بوو. پێش مردنی بە ماوەیەکی کەم بۆ لیوای بیلامیرسکی نەقڵ بوو. کە مرد من بە دیارییەوە بووم، گەردنم ئازا کرد، دووعای خێرم بۆ کرد. دایکی بەڕێزت...

جەنەراڵ، لێرەدا، بۆ ساتێک وەستا، وەک بڵێی یادگارییەکی خەمناک زمانی بەست.

میرزادە گوتی:

– شەش مانگ دوای بابم، ئەویش مرد، باپەڕ بوو و مرد.

– نا، بە باپەڕ نەمرد. ڕاستی لە منی پیرەمێرد بزانە. من لەوێندەر بووم، لە ڕێوڕەسمی کفن و دفنەکەیدا ئامادە بووم. مردنەکەی بە هۆی باپەڕەوە نەبوو، بەڵکو سوێی مێردەکەی بوو، لە سوێی مێردەکەیدا مرد. بەڵێ،





ئەویشم لە بیرە، ئێی گەنجیەتی، یادت بەخێر! من و بابت، وێڕای ئەوەی هاوڕێی منداڵی بووین، ئامادە بووین، لەسەر ئەو، لەسەر دایکت یەکدی بکوژین.

میرزادە، بە نەباوەڕی گوێی لە جەنەراڵ دەگرت.

- من شێت و شەیدای دایکت بووم، لە کاتێکا کە دەزگیرانی برادەرەکەی خۆم بوو. کاتێ بابت بەمەی زانی، کەللەیی بوو، بەیانییەک سەعات حەوت هەڵی کوتایە سەرم، بێداری کردمەوە، بە نیگەرانی و سەرسامیی خۆم گۆڕی، کڕوکپ، کەسمان ورتەمان لێوە نەهات!... لە فیکەی خۆم حاڵی بووم. بابت دوو دەمانچەی لە باخەڵی دەرهێنا. دوئێلە، لە ماوەی دوو بستەوە، بێ هیچ شایەدێک. شایەدی بۆچییە، مادامێکی هەر هەمووی پێنج دەقیقەی دییە و یەکدی ڕەوانەی ئەو دنیا دەکەین. دەمانچەکانمان سوار کرد، دەستسڕێکمان لە عاردی و لە بەینی هەر دووکماندا ڕاخست، یانی بەینمان تەنیا دەستەسڕێک بوو، هەر دووکمان نیشانەمان لە دڵی یەکدی گرتەوە، چاومان بڕییە دوڕ چاوی یەکدی، لەناکاو ڕوندک بە چاوی هەر دووکماندا هاتە خوارێ، دەستمان سست بوون و هاتنە خوارەوە، لە هەمان کاتدا ڕوندک بە چاوی هەر دووکماندا هاتە خوارێ، دوای تۆزێک هەر دووکمان باوەشمان بە یەکدا کرد. ئیدی دوئێل گۆڕا. بوو بە جوامێری و ئەمەکدرای... میرزادە (میرزادە لێرەدا دەکاتە بابی میرزادە میشکین. ح.ک.ع ) دەیگوت: "بڕۆ موبارەکی تۆ بێ" و من دەمگوت: "نەخێر، هیی تۆیە و موبارەکی تۆ بێ." بەهەرحاڵ، بەتەمای لەلای ئێمە ئاکنجی بیت، وا نییە؟

میرزادە، لە بن لێوانەوە و بەلەز گوتی:

- بەڵێ، ڕەنگە بۆ ماوەیەک...

کولیا، کە لەو کاتەدا هاتبووە بەردەرگا، لە دەرگاوە بانگی کرد:

- میرزادە، دایکم دەیەوێ بتبینێ.

میرزادە، هەستا، بەڵام جەنەراڵ، دەستی خستە سەرشانی و لەسەر تەختەکە داینایەوە و دۆستانە گوتی:

- من بە حوکمی ئەوەی کە دۆستی گیانی بە گیانی بابتان بووم، حەز

دەکەم لە هەندێ شت ئاگادار بی. وەکو دەبینی من بە هۆی زروفێکی نالەبارەوە تووشی کارەساتێکی گەورە بووم، هەر باش بوو حوکم نەدرام و تووشی دادگا و دادگایی نەبووم، نینا ئالکساندروڤنا ژنێکی زۆر چاک و دەگمەنە. ڤارڤارا ئاردالیونوڤنای کچم، کچێکی بێ وێنەیە! وەزع و حاڵی نالەبار ناچاری کردووین کرێچی ڕابگرین، پانسیۆنداری بکەین، ئەمە بۆ من کە قەرار بوو ببم بە ستاندار (پارێزگار)، سووکایەتیەکی، نازانم چیی ناو بنەم، زۆر ناخۆشە، زۆرم لە گیان ناخۆشە، بەهەرحاڵ بە هاتنی تۆ خۆشحاڵین، بەڵام لە ماڵی ئێمەدا، کارەساتێک بەڕێوەیە!

میرزادە، هایم و حەیران تەمەشای دەکرد.

جەنەراڵ، لەسەری ڕۆیشت:

- قەرارە، لێرەدا، لە ماڵی ئێمەدا، زەماوەندێکی سەیروسەمەرە ئەنجام بدرێت... زەماوەندێک لەنێوان ئافرەتێکی ناوزڕاوی گومانلێکراو و کوڕێکی گەنجدا، کە دەشێت ببێ بە یەکێک لە پیاوماقولانی دەرباری ئیمپراتۆریەت. قەرارە ئەو ئافرەت بێتە ئێرە، بێتە ناو ماڵ و منداڵەکەی من، دەگەڵ کیژ و ژنەکەمدا لە یەک ماڵا بژی، بەڵام تا هەناسەم لە بەر بێ، نایەڵم دوو پێی بەم ماڵەدا بێت! لە بەردەرگاکەدا ڕادەکشێم، مەگەر بەسەر جەنازەکەمدا ڕەت بێت. ئێستا قسە دەگەڵ گانیادا ناکەم، خۆمی لێ دەدزمەوە، نامەوێ بیدینم. من بەئانقەست ئەمە بۆ تۆ دەگێڕمەوە، چونکە بەتەمای لێرە بژیت، بێگومان بە چاوی خۆت هەموو شتێک دەبینی... لەبەرئەوەی کوڕی یەکێک لە دۆستە دێرینەکانمی، هەقی خۆمە ئومێدم...

نینا ئالکساندروفنا، کە ئەم جارەیان بە خۆی هاتبووە بەردەرگا، گوتی:

- میرزادە، بێزەحمەت، لە هۆڵەکە چاوەڕوانتم.

جەنەراڵ هەڵی دایە:

- نینا گیان، دەزانی من ئەم میرزادەیەم بە منداڵی لە باوەش کردووە!

نینا ئالکسندروفنا، نیگایەکی گلەیی ئامێزی جەنەراڵی کرد و ئەوجا تەمەشایەکی پرسیارئامێزی میرزادەی کرد و بێ ئەوەی هیچ بڵێت ڕۆیشت. میرزادە دووی کەوت. هەر کە گەیشتنە هۆڵەکە و دانیشتن و نینا

ئالکسندروفنا، بەپەلە شتێکی بەگوێی میرزادەدا چپاندو نە چپاند، جەنەراڵ، لەناکاوا خۆی گەیاندە هۆڵەکە. نینا ئالکسندروفنا بەپەلە بێدەنگ بوو و بە تورەییەکی ئاشکراوە خۆی بە چنینکارییەکەیەوە مژول کرد. پێدەچوو جەنەراڵ هەستی بە پەستی و تورەییەکەی ئەو کردبێ، بەڵام نەیبردە سەر خۆی و بەردەوام بوو لەسەر دەربڕینی خۆشیی خۆی، ڕووی کردە نینا ئالکساندروفنا و گوتی:

– کوڕی برادەرەکەمە! ڕێکەوتێکی سەیرە! بە خەویش بەتەمای شتی وا نەبووم. باشە گیانەکەم تۆ (نیکولا لڤوڤیچ)ی ڕەحمەتیت بە بیر نایەت؟ خۆ جارێک لە شاری (تفیر)*دا دیتت.

نینا ئالکساندروڤنا گوتی:

– نیکولا لڤوڤیچ! بیرم نایەت

ئەوجا ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

– بابی تۆ بوو؟

میرزادە گوتی:

– بەڵێ، بابی من بوو.

ئەوجا بە شەرمێکەوە، ڕوو لە جەنەراڵ گوتی:

– بەڵام، وا بزانم لە شاری تفیر نەمرد، بەڵکو لە شاری یەلیزاڤیتاگراد مرد. پاڤلیچیۆف، پێی گوتم...

جەنەراڵ، گوتی:

– نەخێر، لە تفیر ئەمری خوای کرد، کەمێک پێش مردنەکەی بۆ تفیر نەقڵ بوو، تەنانەت پێش ئەوەش بوو کە نەخۆشییەکەی بداتە زیادی. تۆ ئەوسا زۆر چکۆلە بوویت، ئەو شتانەت بیر نایەت. ڕەنگە پافلیچیوف سەهوی کردبێت، هەرچەندە پیاوێکی زۆر باش بوو.

– (پاڤلیچیوف)یشت دەناسی؟

– پیاوێکی نموونەیی بوو. من لەسەرە مەرگا بە دیار بابتەوە بووم، گەردنیم ئازا کرد، دووعای خێرم بۆ کرد.

میرزادە هەمدیس گوتی:

- بەڵام بابم، بە تۆمەتباری مرد، هەرچەندە تاکو ئێستاش هۆی ئەو تۆمەتبارییەم بۆ دەر نەکەوتووە. لە نەخۆشخانەدا مرد.

- ئا! بە هۆی کولباکوفەوە بوو، کولباکوف سەربازێکی سادە بوو، گومانی تیا نییە ئەگەر بابت مابا، لە دادگا تەبرێ دەبوو، بێتاوان دەر دەچوو.

میرزادە، بەوپەڕی فزوڵیەت و کونجکاوی لێی پرسی:

- بە ڕاست؟ مەسەلەکە وا بوو؟ تۆ دڵنیایت؟

جەنەراڵ گوتی:

- ئەی مەعنای چی، من لە خۆمەوە قسە ناکەم. دادگا نەیتوانی هیچ قەرارێک بدات، مەسەلەکە، مەسەلەیەکی زۆر دژوار و باوەڕ نەکردەنی بوو! مەسەلەیەک بوو دەشێت بگوترێ نهێنیئامێز بوو. فەرماندەی گروهانەکەمان، سەروان لاریونوڤ مرد، ئیدی میرزادە (مەبەست باوکی میرزادە میشکینە. ح.ک.ع ) بە شێوەیەکی کاتی بوو بە فەرماندە. لەو سەروبەندەدا کولباکوفی سەرباز، دزییەکی لێ سادر بوو، هەندێ چەرمی پێڵاوسازی لە یەکێک لە هاوڕێکانی خۆی دزی، فرۆشتی و پارەکەی خەرجی بادەنۆشی کرد. باشە. ئیدی میرزادە لەسەر ئەمە هەڕەشەی لێ کرد، بە ئامادەبوونی سەرگروبان و عەریفی گروهانەکە، لەسەر ڕەژووان پاڵی خست و بە شەلاقان تێی بەر بوو. باشە. کولباکوف، بۆ بارەگای گروهانەکە گەڕایەوە، لەسەر جێگەکەی خۆی پاڵ کەوت، دوای چارەکە سەعاتێک مرد. باشە، بەڵام ئەمە شتێکی سەیر بوو، قەت نەدەچووە ئەقڵەوە، بە هەر حاڵ، کالباکوف بە خاک سپێردرا. میرزادە ئەم ڕووداوەی کردە ڕاپۆر و بەرزی کردەوە، ناوی کالباکوف لە قەیدی گروهانەکە ڕەش کرایەوە. باشە. ئەمە ڕواڵەتی مەسەلەکە بوو، بەڵام دوای ئەوەی شەش مانگ بەسەر ئەم بویەرەدا تێپەڕی، دوای ئەوەی هەموو ڕۆژێ سەربازان نمایشیان دەکرد، ڕۆژێک کولباکوفی سەرباز، وەکو ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت، سەرلەنوێ لە سریەی ٣ی کەتیبەی دووی فەوجی تۆپخانەی نوفوزملیانسکدا* پەیدا بووەوە، ئەم فەوجە سەر بە هەمان لیوا

و هەمان فیرقە بوو!

میرزادە، بەوپەڕی سەرسامی هاواری کرد:

- شتی وا چۆن دەبێت؟

نینا ئالکسندروڤنا، کە بە خەمینی دەیڕوانییە میرزادە، لەپڕ هەڵی دایە و گوتی:

- نا، شتەکە وا نەبوو! ئەمە هەمووی درۆیە! مێردەکەم سەهوە!

- درۆ؟ گوتنی ئەو قسەیە ئاسانە، دەی وەرە ئەم مەتەڵە هەڵبێنە، کەس باوەڕی نەدەکرد. ئەگەر بە خۆم لەوێ نەبام و بە چاوی خۆم نەمدیبا، من یەکەم کەس دەمگوت درۆیە، بەڵام بۆ نەگبەتی بە چاوی خۆم دیتم، یەکێک بووم لە ئەندامانی لیژنەکە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان نیشان دا کە هەمان سەربازە، هەمان ئەو کولباکوفەیە کە شەش مانگێک لەوەپێش بە ڕێورەسم و تەپڵ و کەڕەنای سوپایی و... بە خاک سپێردرا. هەڵبەتە منیش دەڵێم کە ئەمە شتێکی نائاساییە، ناچێتە ئەقڵەوە، نیمچە مەحاڵە، بەڵام...

ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، لێرەدا وەژوور کەوت، بە بابی گوت:

- بابۆ، شێوەکەت ئامادەیە.

- ئا... زۆر چاکە... زۆرم برسییە، بەڵام ئەم مەسەلەیە، دەشێت بگوترێ کە مەسەلەیەکی سیکولۆژی و دەروونییە...

ڤارڤارا، گوتی:

- دیسان سوپەکەت سارد دەبێتەوە!

جەنەراڵ، کە لە ژوورەکە وەدەر دەکەوت، لە بن لێوانەوە گوتی:

- باشە، باشە، وا دێم... هەر ئێستا...

کە ڕارەوەکەی دەبڕی، گوێیان لێ بوو کە بەدەم ڕێوە قسەکەی تەواو دەکرد: "سەرباری هەموو تەحقیقەکان!

نینا ئالکسندروڤنا، بە میرزادەی گوت:

- ئەگەر بەتەمای لێرە بمێنی، دەبێ چاوپۆشی لە زۆر شت و هەڵەی (ئاردالیون ئەلکسندروفیچ)ی مێردم بکەیت، بەڵام دڵنیام زۆر ناڕەحەتت ناکات. کابرایەکی بێوەیە، تەنانەت خواردنەکەشی بە تەنیا دەخوات. پێم وایە

تۆش لەگەڵمای کە هەموو کەسێک، هەر هەموومان عەیب و کێماسی خۆمان هەیە، هەندێ خەسڵەت و تایبەتمەندیی سەیرمان هەیە، تەنانەت عەیب و کێماسی هەندێ کەس، زۆر زیاترە لە هی ئەوانەی کە پەنجە نمان و بە زەقی باس دەکرێن. بەهەرحاڵ من تکایەکم لە تۆ هەیە، هەر کاتێ مێردەکەم داوای کرێ ژووری لێ کردیت، پێی بڵێ کە داوتە بە من. هەڵبەتە هەرچەندێکی بدەیتێ لە حیسابەکەت دادەشکێنرێت، بەڵام تکایە پابەندی ئەو تەگبیرە بە کە پێم گوتیت. ها ڤاریا چییە؟

ڤاریا کە بۆ ژوورەکە گەڕابووەوە، بەبێدەنگی، بێ ئەوەی هیچ بڵێیت، وێنەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنایدا بە دایکی. نینا ئالکسندروڤنا، ڕاچڵەکی، هەوەڵ جار بە جۆرە ترسێکەوە ڕاچەنی ئەوجا بۆ ماوەیەک لەوێنەکە ورد بووەوە، جۆرە خەمینی و تاڵییەک نیشتە سەر سیمای. ئەوجا نیگایەکی پرسیارئامێزی ڤاریای کرد.

ڤاریا گوتی:

– ئەمە دیاریی خاتوونە، ئەمڕۆ بۆی ناردووە. ئەم شەو هەموو شتێک دەبڕێتەوە.

نینا ئالکسندروڤنا، بەوپەڕی نا ئومێدی و لە بن لێوانەوە، هەمان قسەی کیژەکەی دووبارە کردەوە:

– ئەمشەو! کەواتە شتەکە ڕاستە، هیچ گومانێکی تیا نییە، وێنەکە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە بڕیاری یەکجارەکیی خۆی داوە. باشە گانیا بە خۆی ئەم وێنەیەی نیشان دایت؟

نینا ئالکسندروڤنا، بەوپەڕی سەرسامی، ئەو پرسیارەی دوایی کرد.

کیژێ بەرسڤی دایەوە:

– بە خۆت دەزانی یەک مانگ دەبێت زارمان لە زاری یەکتر نەگەڕاوە. پتیتسن هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە. سەبارەت بەوێنەکە، لە نزیکی مێزەکەی، لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو و هەڵم گرت و هێنام.

نینا ئالکسندروڤنا، لەپڕ ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

– میرزادە، ئەوی ڕاستی بێ پرسیارێکم هەبوو، هەر بۆ ئەوەش زەحمەتم

دایت کە بێی بۆ ئێرە... پرسیارەکەم ئەوەیە:

دەمێکە کوڕەکەم دەناسیت؟ ئەوەندەی من بزانم گوتی گوایە ئەمڕۆ لە سویسراوە هاتوویت، وایە؟

میرزادە، بەکورتی و بەپوختی مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە، نیوەی ڕوودا و بەسەرهاتەکانی پەڕاند، نینا ئەلکسندروڤنا و ڤاریا، زۆر بەدیقەت گوێیان دەگرت.

نینا ئەلکسندروڤنا گوتی:

– کە ئەم پرسیارەت لێ دەکەم بەو مەبەستە نییە کە قسەت، دەربارەی گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ لێ دەر بێنم، تکایە خراپ لێم تێمەگە. شتێک کە خۆی نەیەوێ پێم بڵێ، نامەوێ لە پاشملەی خۆی و لە خەڵکانی دیکەی بژنەوم. بۆیە ئەم مەوزوعەم لەگەڵدا کردیتەوە، چونکە تۆزێ لەمەپێش هەم لە ڕووی خۆتا و هەم دوای ئەوەی ڕۆیشتی گوتی: "بە خۆی هەموو شتێک دەزانێ، ئاگای لە هەموو شتێکە، ئیدی پێویست بە هیچ تەکەلوفێک ناکات!" مەبەستی لەو قسەیە چی بوو؟ یانی... حەز دەکەم بزانم تا چ ڕادەیەک...

لەو ساتەدا، گانیا و پتیتسن، بە دوو قۆڵی وەژوور کەوتن و نینا ئالکسندروڤناش بەلەز بێدەنگ بوو. میرزادە لە تەنیشتییەوە ڕۆنیشتبوو، بەڵام ڤاریا کەمێک دوور کەوتەوە. وێنەکەی ناستاسیا، هێشتا لەسەر مێزەکەی نینا ئالکسندروڤنادا بوو، دەقاودەق بەرانبەری بوو. کاتێ گانیا وێنەکەی بینی، برۆکانی وێکهێنانەوە، چارەی گرژ بوو، بە تووڕەیی هەڵی گرت و، توڕی هەڵدایە سەر مێزەکەی خۆی کە لەوپەڕی ژوورەکەدا بوو.

نینا ئەلکسندروڤنا، لەناکاودا پرسیی:

– ئەمڕۆیە گانیا گیان؟

گانیا، ڕاجفری و بەتووڕەیی گوتی:

– چی ئەمڕۆیە؟

ئەوسا، لەپڕا، بە میرزادەدا هەڵشاخی و گوتی:

– ئا... ئێستا زانیم... ئەمە ئۆینی تۆیە! چییە، دەمی خۆت پێ ناگیرێ جەناب؟

پتیتسن، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– گانیا، ئەمەیان خەتای منە، خەتای کەسی تری تیا نییە.

گانیا، نیگایەکی پرسیارئامێزی کرد. پتیتسن بەدەم منجەمنجەوە گوتی:

– گانیا، واهی باشترە، بە تایبەتی کە مەسەلەکە بڕاوەتەوە.

بەدەم ئەو قسەیەوە، لە کۆمەڵەکە دوور کەوتەوە و چوو لەپشت مێزەکەوە دانیشت، پارچە کاغەزێکی لە بەرکی دەر هێنا کە بە قەڵەمی رەساس ژمارەرێژکرابوو، کەوتە بەرا وردکردن و تاوتوێ کردنیان، گانیا، بە گرژی و پەستی ڕاوەستابوو، دەموچاوی تێک ترشابوو، بە نیگەرانییەوە، چاوەڕوانی تەقینەوەی کێشەیەکی خانەوادەیی بوو، تەنانەت ئەوەشی لەبیر چوو کە غوزرخوایی لە میرزادە بکات.

نینا ئەلکسندروڤنا گوتی:

– مادامێکی هەموو شتێک بڕابێتەوە، مانای وایە. هەق بە ئیڤان پتروفیچە. تکایە گانیا بەسە، نە ڕووی خۆت گرژ بکە و نە تورە ببە. من نامەوێ بەتۆپزی قسەت لێ دەر بێنم. قسەیەک کە بە خوایشتی خۆت نەیکەیت دەبێ بایەخی چی بێ! بەڵام دڵنیات دەکەم من ئیدی کۆڵم داوە، هەقم نییە. هیچ خەمت نەبێ، نیگەران مەبە.

هەر هەموو ئەو قسانەی بەدەم کاری چنینکارییەوە کرد و وای دەنواند زۆر هێمنە و بە تەواوەتی بەسەر خۆیدا زاڵە. گانیا زۆری پێ سەیر بوو، بەڵام متەقی لەخۆ بڕیبوو و بە پارێزەوە چاوەڕوانی ئەوە بوو، دایکی زیاتر لەسەری بڕوات و بە ڕوونی و تێروتەسەلی ڕاوبۆچوونی خۆی دەر بڕێت. گانیا، خەمبار بوو، چونکە هەر خۆی دەیزانی ئاژاوە و کێشەی خانەوادەیی چەند گرانە و تا ئێستا چەند گران لەسەری کەوتووە. نینا ئالکسندروڤنا هەستی بەم خەمینییەی ئەو کرد. بەدەم بزەیەکی تاڵەوە لەسەری ڕۆیشت:

– تۆ هێشتا بەگومانیت و باوەڕم پێ ناکەیت. خەمت نەبێ. چیتر گریان و پاڕانەوە نابینی، بە تایبەتی هیی من نابینی. تاقە ئاواتم ئەوەیە کە تۆ بەختەوەر بیت. بە خۆتیش ئەوە دەزانیت. من خۆم داوەتە دەست قەدەرەوە، بەڵام هەمیشە بە دڵ لەگەڵتا دەبم، دڵم لەگەڵتا دەبێت چ لێرە





بمێنی و چ لێمان جیا بیتەوە. من تەنیا باسی خۆم دەکەم، هەر لە خۆم مەسئولم، تەنیا بە ناوی خۆمەوە قسان دەکەم، بەڵام سەبارەت بە خوشکەکەت، ناتوانی داوای هەمان هەڵوێستی لێ بکەیت. ناتوانی چاوەڕوانی هەمان شتی لێ بکەیت.

گانیا، کە بە نیمچە تەوس و بێزارییەکەوە دەیڕوانیە خوشکەکەی هاواری کرد:

- ئاە... دادوبێداد لەدەست خوشکەکەم! دایکە دووبارە بەڵێنت دەدەمێ، سوێندت بۆ دەخۆمەوە کە هەر لەسەر قەولەکەی جارانی خۆمم، تا من لێرە بم و لە ژیانا بم، هیچ کەسێک، حەدی نییە بێ حورمەتی بە تۆ بکات، ئیدی هەر کێیەک دەبێت، هەر بەنی بەشەرێک بێت و پێ بنێتە ئەم دیوی دەرگاکەمان، بە خۆم دەزانم چۆن وای لێ دەکەم ڕێز و حورمەتی ڕەهای تۆ بگرێت. ڕێزی تۆ بۆ من لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە.

گانیا، هەستی بەوپەڕی ئارامی و خۆشی دەکرد. زۆر دۆستانە و بە میهر و مەحەبەتەوە دەیڕوانییە دایکی.

- گانیا، تۆ بە خۆت چاک دەزانی کە من خەمی خۆمم نەبووە، شینی من بۆ خۆم نەبووە. بە درێژایی ئەو ماوەیەش کە ئەوەندە نیگەران و تورە بووم، خەمم خواردووە، تەنیا لەبەر خاتری تۆ بووە. جا ئێستا کە دەڵێن ئەمشەو هەموو شتێک دەبڕێتەوە، پێم ناڵێی چی دەبڕێتەوە؟

گانیا بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێنی داوە ئەمشەو. لە ماڵەکەی خۆیدا، ڕەئی یەکجارەکی خۆی بڵێ، یا ڕەزامەندی بدات یان ڕەفزی بکات.

- نزیکەی سێ هەفتەیەک بوو خۆمان لە باسی ئەم مەسەلەیە دزیبووەوە، پێم وایە باشمان کردووە، بەڵام هەنوکە کە هەموو شتێک تەواو بووە، ڕێگەی یەک پرسیار بە خۆ دەدەم: باشە چۆن توانی ڕەزامەندی بدات یان وێنەکەی خۆیت پێشکەش بکات، لە حاڵێکا کە گوایە تۆ خۆشت ناوێ؟ باشە دەشێت ئافرەتێکی وا... وا...

- وا حەشەری، مەبەستت ئەوە بوو وا بڵێی؟

– نا، مەبەستم ئەوە نەبوو. تۆ چۆن توانیت، بەم ڕادەیە فریوی بدەیت؟

لە پڕ ڕقوکینەیەکی ترسناک بەگەڵ ئەو پرسیارە کەوت. گانیا حەپەسا، بۆ ساتێک چووە ژێری، ئەوجا بێ ئەوەی تووڕەیی و بێزاریی خۆی وەشێرێ، گوتی:

– دایکە تۆ، دیسان تورە بوویت، گەڕاینەوە سەر سفر! تۆ تا ئێستاش نەت توانیوە خۆت زەوت بکەیت و هەستەکانت جڵە و بکەیت، هەمیشە شەڕ و ئاژاوەکانی ماڵی ئێمە بەو شێوەیە دەستی پێ کردووە. بەو شێوەیە بەنزین کراوە بە ئاگردا. خۆ تۆ بەڵێنت دا هەقت بەسەر هیچیەوە نەبێت، نە پرسیار بکەیت و نەگلەیی، کەچی ئەوەتا پرسیار و گلەییەکانت دەست پێ کردەوە! با واز لەمەبێنین، وا چاکترە. تۆ چاکەی خۆت کرد. هەر ئەوەندەت لەسەرە. دڵنیابە کە بە هیچ کلۆجێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان جێت ناهێڵم، پشتت تێ ناکەم! بەڵام هەر کەسێکی دیکەش لە جێی من بوایە، خۆی لە خوشکی واهی دەدزییەوە، لێی دەتۆرا. تەمەشا چۆن مۆڕەم لێ دەکات! با لەوەی پتر لەسەری نەڕۆین! ڕاستە خۆشحاڵ بووم، هێشتا زوو بوو بۆ ئەو خۆشحاڵییە، بەڵام چۆنت زانی من هەوڵ دەدەم ناستاسیا فیلیپوڤنا فریو بدەم؟ بەڵام سەبارەت بە ڤاریا، کەیفی خۆیەتی، چی دەکات با بیکات. تا ئێرەمان هێناوە، ئیتر بەسە!

گانیا، دەگەڵ هەر وشەیەکی تازەدا پتر گەرم و تورە دەبوو، بێهودە بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. هەمیشە ئەو جۆرە گەنگەشانە، دەبوو بە مایەی ئاژاوە و بشێوێنی هەموو ئەندامانی خێزانەکە.

ڤاریا گوتی:

– من گوتوومە و دەیڵێمەوە، ئەگەر ئەو بێتە ئەم ماڵە، من لێرە دەڕۆم، قسەیەکە کردوومە و لێی ژێوان نابمەوە.

گانیا، هاواری کرد:

– بەسە، ئەم عینادییە چییە! عینادی لەسەر عینادی! هەر لە عینادیدایە کە شووش ناکەیت! پێویست ناکات بەم جۆرە مۆڕەم لێ بکەی، لێوم لێ بکرۆژی! ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، من بێ منەتم، گوێم لە هیچ نییە... بڕۆ چێت

لەدەست دێ بیکە... کام کێوە سەختە بیگرە، مردم بەدەست تۆوە!

گانیا، کە بینیی میرزادە هەستا، هاواری کرد:

- ها میرزادە، ئاخری بڕیارت دا بڕۆی، لە کۆڵمان ببیتەوە؟

جۆرە توڕەییەکی ئەوتۆ بە دەنگی گانیاوە دیار بوو لەوە دەچوو لەزەت لە توڕەییەکەی خۆی ببینێ. ئیدی جڵەوی بۆ خۆی شل کردبوو، هەرچی بە دەما دەهات نەیدەگێڕاوە، بەڵکو بەلەزەتەوە لەسەری دەڕۆیشت، گرینگ نییە، چ دەبێ با ببێ!

میرزادە، لە بەردەرگاوە ئاوڕێکی دایەوە تا بەرسڤی بداتەوە، بەڵام کە سیمای نیگەران و گرژی گانیای بینی و هەستی کرد گەیشتووەتە لووتی، بە پێویستی نەزانی وەڵامی بداتەوە، ڕووی وەر گێڕا و ڕۆیشت. دوای چەند ساتێک، بەو دەنگدانەدا کە لە هۆڵەکەوە دەهاتن، زانیی کە بە ڕۆیشتنی ئەو، دەمەقاڵەکە، زیاتر بووە.

میرزادە بەرەو ژووری پێشەوە ڕۆیشت، تا لەوێندەرەوە و بە داڵانەکەدا بۆ ژوورەکەی خۆی بڕوات. کە گەیشتە ئاستی دەرگای هاتنە ژوورەوە. هەستی کرد یەکێک لە دەرەوە، لە بەردەرگاکە وەستاوە و بێهودە لە زەنگی دەرگا دەدات، پێدەچوو زەنگەکە لە کار کەوتبێ، چونکە بە ئاستەم، بێ ئەوەی هیچ دەنگێکی لێوە بێت، دەجووڵا. میرزادە، سورگی دەرگاکەی ڕاکێشا، دەرگاکەی کردەوە، هەر کە دەرگا کرایەوە، هۆپێکی لە خۆما، بەسەرسامی هەنگاوێک کشایەوە: ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕێک لە بەردەمیا وەستابوو، یەکسەر بە وێنەکەیدا ناسییەوە. ناستاسیا، هەرکە چاوی بە میرزادە کەوت، لە ڕقا چاوی پەڕینە تەوقی سەری. بەپەلە خۆی بە مەدخەلەکەدا کرد، کە وەژوور کەوت، شانێکی لە میرزادە دا و لەسەر ڕێگای خۆی لای دا، پاڵتۆ فەرووەکەی لە شانی داخزی، بە توڕەیی گوتی:

- کە لەبەر تەمەڵیی خۆت، زەنگەکەت پێ چاک ناکرێتەوە، بەلای کەمەوە لە مەدەخەلەکەدا بوەستە تا ئەگەر یەکێک لە دەرگای دا، دەرگای لێ بکەیتەوە! بزانە پاڵتۆکەت خستم، بێتەربێت!

پاڵتۆکەی لە عاردی کەوتبوو. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بێ ئەوەی چاوەڕوانی

میرزادە بکات یارمەتیی بدات کە پاڵتۆکەی داکەنێت، یان هەر تەماشای بکات، وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، بە جووڵەیەکی شان، بۆی هەڵدا و میرزادە، فریا نەکەوت بیگرێتەوە.

- دەبوایە بە شاپان وەدەریان نابای. هەرو لە هاتنی من ئاگاداریان بکە.

میرزادە، ویستی شتێک بڵێت، بەڵام هێندە پەشۆکابوو کە زمانی چووە کلیلە و تاقە وشەیەکی بۆ نەهات. پاڵتۆکەی لە عاردی هەڵگرتەوە، دای بەسەر دەستیا و بەرە و هۆڵەکە ڕۆیشت.

- دە تەمەشا! تۆ بۆچی ئەو پاڵتۆیە دەگەڵ خۆتا دەبەی؟ ا ها ها! ئەرێ تۆ تەواوی؟ یانی هەندێ گێلۆکەنیت؟

میرزادە، زڤڕییەوە، هایم و حەیران، گێژ و حۆل چاوی تێبڕی. ناستاسیا بە دەنگی بەرز پێکەنی، میرزادەش بزەیەکی بۆ کرد، بەڵام دەمی بووبوو بە تەڵەی تەقیو. یەکەم جار، کە دەرگای لێ کردەوە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بەڵام هەنوکە لەناکاوا خوێن زاییە دەموچاوی.

ناستاسیا، کە لە تورەییدا، پێی بە عاردیدا دەکوتا، هاواری کرد.

- ئەم کەودەنە چییە؟ بۆ کوێ دەڕۆی؟ دەڵێی کێ هاتووە؟

میرزادە، لە بن لێوانەوە، بە منجە منج گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا.

ناستاسیا بەتوندی پرسیی:

- چوزانی؟ من قەت تۆم نەدیتووە! دەی بڕۆ پێیان بڵێ! ئەم دەنگەدەنگ و هەراوهەنگامەیە چییە؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- دەمەقاڵەیانە.

هەنگێ بەرە و هۆڵەکە ڕۆیشت. میرزادە، لە کاتێکی هەستیاردا چوو بە سەریاندا. نینا ئالکسندروڤنا، بە تەواوەتی ئەوەی لەبیر کردبوو کە ملی بۆ قەدەر داوە و هەقی هیچی نییە. بە ڕاستی شەڕی ڤاریای دەکرد، داکۆکیی لەو دەکرد. پتیتسن کە کاغەزە، پڕ نووسراوەکانی، دانابوو، لەلای ڤاریاوە وەستابوو. ڤاریا، ترس و نیگەرانییەکی ئەوتۆی پێوە دیار نەبوو. ئەم

خانمە، لە ئافرەتە ترسنۆکەکان نەبوو. دەیتوانی داکۆکی لە خۆی بکات، بەلام براکەی دەم بەدەم و دەگەڵ هەر وشەیەکدا، زیاتر هەڵدەچوو، تورە دەبوو و هەزار و یەک جنێوی سەر بە کوڵکەکەی دەدا، قسەی وا ناشیرینی دەکرد کە لە تەحەمولی کەسدا نەبێت. ڤاریا، عادەتی وا بوو لە کاتی وادا، وازی لە هەر گەنگەشەیەک دێنا، بە چاوانی تەوساوییەوە، زەق زەق تەماشای براکەی دەکرد، بۆ ساتێک چاوی لێ نەدەگواستەوە. تا بڵێی لەم تاکتیکەدا وەستا و پشوودرێژ بوو. تاکتیکێک بوو، گانیای دەگەیاندە ئەوپەری تورەیی. رێک لەم کاتەدا، میرزادە خۆی وەژوورا کرد و پێی گوتن:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا!

پەراوێز:

* – "کولیا" سووکەڵە ناوی نیکولایە.

* – ".لە لیوای ڤاسیلکوڤسکی..." هەر لێوایەکی سوپای رووسیا، جگە لە ناوە فەرمیەکەی، بە ناوی ئەو شارەوە ناو دەبرێ کە یەکەم جار تیایدا دروست کراوە... ئیدی بەو شێوەیە دەگوترێ: لێوای ڤاسیکلۆڤسکی یان لیوای بیلامیرسکی.

* – "شاری تفیر..." شارێکە لە باکووری رووسیا، لەسەر رێگای مۆسکۆ – پترسبۆرگە. "یەلیزاڤیتاگراد" شارێکە لە باشوور و لە دەشتاییدایە و لە سەردەمی ئیمپراتۆر یەلیزاڤیتا (ئیلزابت)دا دروست کراوە.

* – "فەوجی تۆپخانەی نوفوزملیانسک..." لە راستیدا ئەم فەوجە بوونی نییە. ئەمە خەڵقەندەی خەیاڵی شانۆنامەنووس (گریبویدیف)ـە لە مەنەلۆگێکی کۆلونیل سکالوزوپدا، لە شانۆنامەی "زیرەکیی زۆر، زەرەری هەیە" ناوی هاتووە. ئەم ناوە خەیاڵییە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە قسەکانی جەنەراڵ ئیڤولگین، زیاتر خەیاڵ و درۆن.

## فەسڵی نۆیەم

بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا. هەموو چاویان بڕییە میرزادە، لە تۆ وایە نە باوەڕ بە قسەکە دەکەن و نە دەیانەوێ باوەڕ بکەن. گانیا، ترسی لێ نیشت.

سەردانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە تایبەتی لەم کات و وەختەدا، بەلای هەر هەموویانەوە، بویەرێکی سەیر و باوەڕنەکردەنی بوو، مایەی حیرەت و پەشۆکان بوو، بەلای کەمەوە لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەم جاری بوو دەچوو بۆ ئەوێ و تا ئێستا دەعییەی نەهاتبوو، لە کاتی قسەکردنیا دەگەڵ گانیادا، کەمترین مەیل بەلای دیدار و ناسینی کەسوکاری ئەودا نیشان بدات، کەم و زۆر، وەکو ئەوەی هەر نەبن، ناوی نەدەبردن. هەرچەند گانیا، لە دڵی خۆیدا تا ڕادەیەک پێی خۆش بوو کە تا ئێستا، باسی ئەو مەسەلەیە نەهاتبووە ئاراوە، بەڵام لە ناخی خۆیدا، لەسەر ئەمە ڕقی لە ناستاسیا بوو... بەهەرحاڵ زیاتر چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرد کە گاڵتە بە کەسوکارەکەی بکات و تەشەریان لێ بدات، تا بێتە دیدەنی و سەردانیان. زۆر چاک دەیزانی کە ناستاسیا لە هەموو کەین و بەینێکی ماڵی وان، دەربارەی شووکردنەکەی خۆی، ئاگادارە. ڕەئی هەموو کەسوکارەکەی دەربارەی خۆی دەزانێ. ئەم سەردانەی ئەو لەم کاتەدا، دوای

پێشکەشکردنی وێنەکەی، لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەیدا، لەو ڕۆژەدا کە بەڵێنی دابوو، چارەنووسی خۆی یەکلایی بکاتەوە، خۆی لەخۆیدا بەڵگە و نیشانەی ڕەزامەندیی وی بوو.

ئەم حیرەت و سەرسامییە زۆری نەخایاند، ناستاسیا فیلیپوڤنا یەکسەر هاتە ناو ئاستانەی دەرگاکە، ئەوجا خۆی بە ژووری نانخواردندا کرد، هەمدیس شانێکی سووکی لە میرزادە داو خستیە لاوە و خۆی بە هۆڵەکەدا کرد. گانیا، یەکسەر چووە پیرییەوە، ناستاسیا، بەگەرمی تەوقەی دەگەڵ گانیادا کرد و بە خۆشییەوە گوتی:

- ئاقیبەت هاتم. بۆچی زەنگی دەرگاکەتان ئیش ناکات. ئەدی چییە، بۆچی عاجز دیاری؟ بێزەحمەت بە جماعەتم بناسێنە.

گانیا، کە بە تەواوەتی پەشۆکا بوو، یەکەم جار بە ڤارڤارای خوشکی ناساند، ئەم جووتە ئافرەتە بەر لەوەی تەوقە لەگەڵ یەکدیدا بکەن، بە شێوەیەکی سەیر و غەریب ڕوانییانە یەکدی. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە درۆوە پێکەنی، بەڵام ڤاریا خۆی شێلو نەکرد، هەوڵی شاردنەوەی هیچ شتێکی نەدا، نیگای هەمان نیگای تاریک و نەگۆڕ بوو، کەمترین وێڵ و ماریفەتی جڤاکی نەنواند، تەنانەت بزەیەکی کاڵیشی پێ ڕەوا نەبینی. گانیا زۆر تووڕە بوو، دڵی گیرا، بەڵام تازە چی لەدەست دەهات، کار لە کار ترازا بوو، تەنیا ئەوەندەی بۆ کرا نیگایەکی پڕ لە هەڕەشەوگوڕەشەی بکات، ئیدی ڤارڤارا، پەی بە گرینگی و بایەخی ئەو ساتە بۆ براکەی، برد. بۆیە کەمێک نەرم بوو و سووکە بزەیەکی کاڵی مردەڵەی بە ڕووی ناستاسیا فیلیپوڤنادا دا – گوایە ئەندامانی ئەم خانەوادەیە یەکیان زۆر خۆش دەویست-.

هەڵبەتە گانیا، لە شپرزەیی و پەشۆکاوی خۆیدا، لە پێشاو یەکەم جار ناستاسیا فیلیپوڤنای بە خوشکەکەی ناساند. ئەوسا نۆرەی نینا ئالکسندروڤنا هات. ویستی وەزع و ڕەوشەکە کەمێک چاک بکاتەوە، ئەم جارەیان قوڕەکەی خەستتر کردەوە، ناوی دایکی لەپێش ناوی ناستاسیادا گوت، بەڵام هەر کە نینا ئالکسندروڤنا زاری هەڵێنا و گوتی: "زۆر خۆشحاڵم کە..." ناستاسیا فیلیپوڤنا بێ ئەوەی گوێی لێ بگرێ، یان چاوەڕوان بکات

قسـەکەی تەواو بکـات، بەپەلـە ئـاوڕی لـە گانیـا دایەوە، بـێ ئەوەی خولْـک بکرێ، لەسەر قەنەفەیەکی چکۆلە، لەلای پەنجەرەکەوە ڕۆنیشت و گوتی:

- نووسـینگەی کارەکـەت کامەیـە؟ و... کرێچییـەکانتان لـەکوێن؟ ئێـوە پانسیونتان داناوە؟ کرێچیتان هەن، وا نییە؟.

گانیـا، سـوور بـووەوە، ویسـتی هـەرچۆنێ بـووەوەلامێکی بـداتەوە، لـێ ناستاسیا فیلیپوڤنا، بواری نەدا و لەسەری ڕۆیشت:

- باشـە کرێچـی لـەکوێ دادەنـەن؟ ژووری کرێچییـەکان لەکوێیـە؟ یـانی ژووری کاریشت نییە!

ئەوسا، لەپڕ ڕووی کردە نینا ئالکسندروڤناو گوتی:

- باشە ئەم پانسیوندارییە خێرێکی هەیە؟

نینا ئالکسندروڤنا گوتی:

- هەڵبەتە، سەریەشـەی زۆرە، بـەلام هەڵبەتـە قازانجیشـی دەبێت، ئەزقـەزا ئێمە...

بـەلام ناستاسـیا فیلیپوڤنـا، لەوە زیـاتر گـوێی لـێ نـەگرت. تەمەشـایەکی گانیای کرد و بە پێکەنینێکی تەوسامێزەوە گوتی:

- دەموچاوت بۆ وا گۆڕاوە! خودایا چەند کۆمیدییە! خۆزگە دەموچاوی خۆت دەبینی!

ئەو پێکەنینـە چەنـد سـاتێکی خایانـد، دوای ئەوە بـە ڕاسـتی سـەروچاوی گانیـا تێـک چـوو، لـە لێبـۆک دەچـوو. لـەناکاودا ئەو گێـژی و پەریشـانییە پێکەنیناوییـەی هەوەڵ جـار بـەری دا، یـانی ئەو ترسـەی یەکـەم جـاری ڕەوییەوە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لێوەکانی کەوتنە تـەتەڵـە، هیچـی نـەگوت، بـەلام نیگـا ئەهریمەنییـەکانی بڕیبـووە دەموچـاوی ناستاسـیا کـە هێشـتا هـەر پێدەکەنی.

بـەلام تەمەشـاڤانێکی دیکـەش لەوێ بـوو، تەمەشـاڤانێک کـە ئەویـش بـە دیتنـی ناستاسـیا فیلیپوڤنـا، دەمـی چووبـووە کلیلە و هێشـتا زمـانی نـەکرا بـووەوە. هەرچەنـد وەکـو سنگێک لـە ئاسـتانەی دەرگـای ژووری پێشـوازیدا (میوان) چەقی بوو، بەلام هەستی بە شپرزەیی گانیا کردبوو، هەستی بەوە





کردبــوو کــە دەموچــاوی گــۆڕاوە و شــەڕی لێــدەبارێت. ئەو تەمەشــاڤانە میرزادە بوو. خۆ بەخۆ، وەکو ئەوەی ئامێرێکی ئوتوماتیکی بێ، بە جۆرە ترس و نیگەرانییەکەوە، چووە پێشێ و بەئەسپایی بە گانیای گوت:

- تۆزێ ئـاو بخـۆرەوە، خـۆت هێـور بـکەوە، بەسـە، بەو جـۆرە تەمەشـا مەکە...

هەڵبەتـە میـرزادە، ئەو قسـانەی لـە پاکیی خـۆیەوە کـرد، هـیچ مەبەسـت و مەرامێکی تایبەتی نەبوو، لـە دڵسـۆزی خـۆی کردبوونی، بـەڵام ئـەم قسـانەی باندۆرو کاریگەرییەکی نائاساییان هەبوو، وەکو ئەوە بـوو هـەرچی کـەرب و کـین و داخ و ڕقـی دڵـی گانیـا هــەبوو، هــەر هــەمووی بــەجارێ بەســەر میرزادەدا دابڕژێت، شانەکانی گرت، چاوی پڕ کـەرب و کین و تۆڵـەی، بـەبێ ئەوەی بتوانێ تاقە وشەیەک بدرکێنێ، بڕییە دوڕ چاوانی وی، جماعـەت هـەر هـەموو حەپەسـان، تەنانـەت نینـا ئەلکسـندروڤنا هـاوارێکی سووکیشـی کـرد، پتیتسـن، بـە مەبەسـتی نـاوبژی هــەنگاوێک چـووە پێشـێ. کولیـاو فـردیش چینکۆ، هاتنـە بـەردەرگاکە و هـایم و حـەیران ڕاوەسـتان. تـەنیا ڤاریـا کـە سـەری داخسـتبوو، ژێـراو ژێـر و بـە دیقـەت تەمەشـای وەزعەکـەی دەکـرد. دەستان لەسەر سینگ، لەپاڵ دایکیا وەستابوو.

بــەڵام گانیــا، یەکســەر وەخــۆ هــاتەوە، قاقایــەکی تــوڕەی لێــدا، ئەوســا بەتەواوەتی وەهۆش هاتەوە و ئەوەندەی لە توانایدا بـوو، بـە خوێنسـاردی و هێمنی و بە شێوەیەکی ئاسایی گوتی:

- میرزادە، چییە؟ پێت وایە پزیشکی؟ بە ڕاستی ترساندمت.

ئەوسا ئاوڕێکی لای ناستاسیا فیلیپوڤنای دایەوە و لەسەری ڕۆیشت:

- ناسـتاسـیا فیلیپوڤنـا، بـە یارمـەتیت بـا ئـەم پیـاوە هـەرە بـەڕێزەت پـێ بناسێنم، هەرچەندە بە خۆیشم ئەم بەیانییە تەعاروفم دەگەڵی کردووە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەسەرسامی ڕوانییە میرزادە و گوتی:

- میــرزادە؟ چمــا میرزادەیــە؟ دەزانـــی مـــن تـــۆزێ لەمـــەپێش کـــە لەمەدخەلەکەدا دیتم، وام زانـی خزمـەتکارە، ناردم تـا خەبـەری هـاتنی منتـان بداتێ! ها ها ها!





فردیش چینکۆ، کە بەپەلە دەهاتە ژووری و خۆشحاڵ بوو بەوەی کە ئەوان دەستیان بە پێکەنین کردووەتەوە و بارگرژییەکە ڕەویوەتەوە، هەڵی دایە:

- قەیدی نییە! گوێ مەدەیە! کەس نازانێ خێر لە چدایە!

- میرزادە بمبورە، نەمزانی، هاواریشم بەسەرا کردیت! فردیش چینکۆ، تۆ بەم بەیانییە چ دەکەی لێرە؟ تەسەورم نەدەکرد تۆ لێرە بدینم.

گانیا، کە هێشتا شانی میرزادەی گرتبوو و بە ناستاسیای دەناساند، ناستاسیا فیلیپوڤنا، دووبارە لە گانیای پرسی:

- گوتت کێ؟ میرزادە کێ؟ میرزادە میشکین؟

گانیا گوتی:

- یەکێکە لە کرێچییەکانی ئێمە.

میرزادە، وەکو کەسێتییەکی ماقوڵ و – وەکو فریارەسێک کە لەو وەزعە نالەبارەیان دەربێنێ- بە ناستاسیا فیلیپوڤنا، ناسێنرا. لەو کاتەدا کە لە ناستاسیایان دەبردە پێشێ، میرزادە بە ئاشکرا گوێی لێ بوو یەکێک لە دوایەوە وشەی "گەمژەی"ی بەکار برد، پێدەچوو فردیش چینکۆ بێ بۆ ڕابواردن و خۆشی ناستاسیا ئەو قسەیەی کردبێت.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بێ ڕەچاوکردنی هیچ ئەتەکێتێک، سەراپای میرزادەی بە نیگا دادەبێژت، لەسەری ڕۆیشت و بێ هیچ لە ڕووداماندێک گوتی:

- باشە کە ئەو هەڵە گەورەیەم دەربارەت کرد، بۆ پێت نەگوتم؟

ناستاسیا بە پەرۆشەوە چاوەڕانی وەڵامی وی بوو، لەوە دەچوو دڵنیا بێت کە وەڵامەکەی هێندە گەوجانە دەبێت کە سەر بە قوڕ پێی دێتە پێکەنین.

میرزادە لە بن لێوانەوە گوتی:

- کە لەناکاوا تۆم لە بەردەمی خۆمدا بینی، حەپەسام...

- بەڵام چۆنت ناسیم، چۆن زانیت منم؟ تۆ منت لەکوێ دیتووە؟ سەیرە... هەست دەکەم لە شوێنێکم دیتووە!... دەی باشە بۆچی کە منت بینی لە جێی

خۆت وشک بوویت... چ سیحرێکت لە منا بینی کە بەو ڕادەیە بەنج بوویت. جوانی؟

فردیش چینکۆ، لێبوک ئاسا، گوتی:

- دە شتێ بڵێ... بۆ وەڵامی نادەیەوە؟ خۆزگە من لە جێی تۆ بام بزانە هەنگێ چ وەڵامێکم دەدایەوە!... دەی میرزادە... بە ڕاستی کەسێکی دەستوپێ سپیت!...

میرزادە، بەدەم پێکەنینەوە بە فردیش چینکۆی گوت:

- ئەگەر منیش لە جێی تۆ بام زۆر شتم دەگوت.

ئەوسا، ڕوو لە ناستاسیا فیلیپوڤنا گوتی:

- ئەم بەیانییە وێنەکەت سەرنجی ڕاکێشام، پاشان لەگەڵ ماڵباتی یەپانچیندا باسی تۆم کرد و... هەروەها ئەم بەیانییە زوو، کاتێ لە قیتارا بووم، پێش ئەوەی بگەمە پترسبۆرگ، بارڤیون ڕوگوژن، لە قیتارەکەدا زۆر باسی تۆی بۆ کردم. جا ئەو دەمەی کە دەرگاکەم بۆ کردیتەوە، لە بیرو لە خەیاڵما بوویت، کەچی کوتوپڕ لە بەردەمما قوت بوویتەوە.

- بەڵام چۆن ناسیتمەوە...؟

- بە وێنەکەتا ناسیمیتەوە... و...

- بە چیی دیدا؟

- بەوەیا کە ڕێک، دەقاودەق، ئەو کەسە بوویت کە لە خەیاڵی خۆما بەرجەستەم کردبوویت... منیش وا وێنا دەکەم کە لە شوێنێکدا تۆم دیتبێ.

- لەکوێ؟ کەی؟

- وا تەسەور دەکەم ئەم چاوانەم دیتوو، بەڵام مەحاڵە!... من پێشتر هەرگیز لێرە نەبووم... لێرە نەژیاوم. ڕەنگە لە خەوا دیتبمن...

فردیش چینکۆ هاواری کرد:

- دەست خۆش میرزادە! نا، نا نیشانەی خۆت ئەنگاوت، منیش لەو قسەیەی کە کردم، ژێوان دەبمەوە... دەم خۆش... ئەوسا لەسەری ڕۆیشت:

- بزانە چەند پاک و بەستەزمان و سادە و ساویلکەیە!

میرزادە، ئەو چەند وشە کەمەی بە دەنگێکی شپرزە و بە پچڕپچڕ ئەدا

کردبوو. تەنانەت بەدەم قسەکردنەوە، دەوەستا تا نەفەس تازە بکاتەوە. بەئاشکرا هەڵچوونی پێوە دیار بوو. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە کونجکاوی تەمەشای دەکرد، بەڵام لە پێکەنین کەوتبوو.

لەو کاتەدا، دەنگێکی تازە و بەرز، لەپشت ئەو خەڵکەوە بەرز بووەوە کە دەوری میرزادە و ناستاسیا فیلیپوڤنایان دابوو، قەرەباڵغییەکەی کرد بە دوو بەشەوە. ئەمە سەرگەڤاری خێزانەکە، جەنەراڵ ئیڤولگین بوو، ڕێک لە بەردەم ناستاسیا فیلیپوڤنادا وەستا، جلکی فەرمیی لەبەر بوو، لە ژێرەوە کراسێکی پاکوخاوێنی لەبەر کردبوو، ڕۆنی لە سمێڵی دابوو. ئیدی گانیا، ئەمەی پێ قوت نەدەچوو.

گانیا گەنجێکی لەخۆبایی بوو، زۆری حەز لە خۆدەرخستن و خۆنوێنی دەکرد، لە ماوەی ئەم دوو مانگەی دواییدا، هەموو ڕێگەیەکی گرتبووەبەر، تا هەیبەت و سامێک بە خۆی ببەخشێت و شەخسیەتێک پەیدا بکات و خۆی لەوە زیاتر بنوێنێ کە هەبوو، بەڵام دەیزانی هێشتا ناشیە و پیاوی ئەو ڕێگایە نییە کە هەڵی بژاردبوو، لە خۆی ڕانەدەبینی ئەم بارە بگەیەنێتە جێ، بۆیە لێبڕا، بەوپەڕی بێپەروایی، خۆی بکات بە سەرگەورەی ماڵ، ئیدی لە ماڵەوە دکتاتۆرێک بوو لەوە گۆڕە، بەڵام لە ئاستی ناستاسیا فیلیپوڤنادا وەکو کەوی بەزیوو بوو، مووی نەدەپساند، ناستاسیا، کارێکی کردبوو، کە هەمیشە لەنێوان ترس و ئومێدا بێ، زۆر بە سەریا زاڵ بوو، تەنانەت ناوی "گەدای بێسەبر"ی لێ نابوو. ئەم قسەیە گەیشتبووە گانیا، ئەویش لە دڵی خۆیدا سوێندی خواردبوو کە لە ئاییندەدا تۆڵەی ئەمە لە ناستاسیا بکاتەوە و بە خەیاڵی خاوی خۆی، بە ئومێدی ئەوەش بوو هەموو کێشە و گرفتەکان چارەسەر بکات.

ئێستا ئەو شتەی کە دوو مانگ بوو، شەوو ڕۆژ وەکو مۆتەکە، چۆکی بەسەر سینگیا دادابوو، دڵی دەگوشی و عەزابی ڕوحی دەدا بەردەرکەی پێ گرتبوو، جا وەرە پیاو لە بەر چاوی کەسوکارەکەی و لە ماڵەکەی خۆیدا، ئیحراج بکرێت و هیچ دەسەڵاتێکی نەبێت، تەنیا ئەوەی لەدەست بێ لە تەریقی و شەرمەزاریدا سوور هەڵگەڕێت، تەحا لەو عەزابە قورسە، کە





ئەمە بەلای ئینسانی بودەڵە و مەغرورەوە، عەزابێکی زۆر قورسە. ئەو شەڕەی هەنوکە بەردەرکەی پێ گرتبوو، دیداری خانەوادەیی نێوان بابی و ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو، کە بە خەیاڵیش پێی قوت نەدەچوو. هەندێ جار لە ماوەی ئەم دوو مانگەی دواییدا، بە خەیاڵ ئامادەبوونی جەنەراڵی لە ئاهەنگی زەماوەندەکەیدا دەهێنایە بەرچاوی خۆی، زۆری عەزاب بەوەوە دەخوارد، بەڵام نەیتوانیبوو، ئەم دیمەنە ترسناکە، لە خەیاڵی خۆیدا تەواو بکات و بەلەز لە زەینی خۆی دەیسڕییەوە. زۆر جار، ئەم کێشە و بەڵایەی لە خەیاڵی خۆیدا زۆر گەورە دەکردەوە، بەڵام ئەوە پیشەی هەر خەڵکێکی فشەکەرو بودەڵەیە. لە ماوەی ئەم دوو مانگەدا، فریای ئەوە کەوت کە بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە و قەراری خۆی بدات، لە دڵی خۆیدا بڕیاری دابوو، هەر کارێکی، بۆ دوورخستنەوەی باوکی، لەدەست بێت، تەخسیر نەکات، ئەگەر پێویست بکات، تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورت، ئیدی دایکی بەمە ڕازی بێ یان نا، بۆ پترسبۆرگی دوور بخاتەوە. کاتێ ناستاسیا فیلیپوڤنا، چەند دەقیقەیەک لەمەپێش وەژوور کەوت، گانیا بە جۆرێ پەشۆکا بوو، بە جۆرێ حەپەسا بوو، کەم و زۆر، بە خەویش ئەوەی بە بیرا نەدەهات، کە لەگینە ئاردالیون ئالکسندروفیچ، لەناکاوا پەیدا ببێت، بۆیە هیچ تەگبیرو حیسابێکی بۆ ئەم بەڵای ناگەهانە نەکردبوو!

کەچی هەنووکە، جەنەراڵ، بە بەرچاوی هەمووانەوە لەوێ ئامادە بوو. جا چۆن ئامادەبوونێ، دەتگوت خۆی بۆ زەماوەند ئامادە کردووە، جلکی فەرمیی لەبەرە، کەیش؟ لە کاتێکا کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە بیانوو و هەنجەتێک دەگەڕا تا گاڵتە و سووکایەتی بە خۆی و بە خانەوادەکەی بکات (گانیا هیچ گومانێکی لەمە نەبوو). دەنا ئەم دیدارە کوتوپڕەی ئەمڕۆی بۆچی و لە پای چی بوو؟ ئایا بۆ ئەوە هاتبوو دۆستایەتیی دایکی و خوشکەکەی بەدەست بێنێ، یان لە ماڵەکەی خۆیاندا سووکایەتییان پێ بکات؟

بەڵام کە تەماشای هەڵوێست و ڕەفتاری هەر دوو لات دەکرد، هیچ گومانێک نەدەما و هەموو شتێک ئاشکرا دەبوو. دایکی و خوشکەکەی بە کزی





و مەلولی، وەکو خەڵکێکی سووکایەتیپێکراو، دووراو دوور لە سووچێکی ژوورەکەدا کزکۆڵەیان کردبوو، بەڵام ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەوە دەچوو، هەر بیریشی نەمابێ کە ئەوان لە ژوورەوەن!... دیارە ئەم ڕەوش و ڕەفتارەی خۆی لە خۆیدا بەڵگەی بێ چەند و چوونی ئەوە بوو کە شتێکی تایبەتی لەژێر سەردایە!

فردیش چینکۆ، باسکی جەنەراڵی گرت و بۆ لای ناستاسیای برد. جەنەراڵ، بە ڕێز و حورمەتەوە، بە ڕووخۆشی و ویقارەوە کڕنۆشی برد و خۆی ناساند:

- ئاردالیون ئالکسندروفیچ ئیڤولگین. سەربازی پیر و دێرین و بەدبەخت و سەرگەڤاری خانەوادەیەکی بەختەوەر کە ئومێدەوار و خۆشحاڵە، بەو زووانە خانمێکی وەها خشیک و شەنگوڵ بێتە ڕیزییەوە...

جەنەراڵ نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات. فردیش چینکۆ، خێرا کورسییەکی فریاخست. جەنەراڵ، بە تایبەتی پاش نانخواردن، نەیدەتوانی بە باشی خۆی بە پێوە بگرێت، بۆیە لەسەر کورسییەکە ڕۆنیشت، تۆ بڵێی بەسەر کورسییەکەدا داڕوخا، بەڵام خۆی تێک نەدا، نە نیگەران بوو و نە تەریق بووەوە. ڕێک ڕووبەڕووی ناستاسیا فیلیپوڤنا دانیشت، دەستی گرت، بەئەسپایی و بە جۆرە لوتف و نەزاکەتێکی نماییشییەوە، قامکەکانی بۆ دەمی برد. جەنەراڵ، بە شێوەیەکی گشتی بەئاسانی شێلو نەدەبوو. جۆرە ئیهمالییەک بە جلەکانیەوە دەبینرا، دەنا بە ڕواڵەت، پیاوێکی بە سەروسیما و بە سام و هەیبەت بوو، بە خۆیشی بەمەی دەزانی. ئەم پیاوە کاتی خۆی پیاوی ناو مەجلیس و ئەنجوومەنانی باڵای کۆمەڵگە بوو، لەم یەک دوو ساڵەی دواییەدا، لێکەوت و ڕووی ئەو مەجلیس و ئەنجوومەنانەی نەما. ئیدی لەوە بە دواوە بەرەبەرە ئەو هەیبەت و سامەی جارانی نەما تا ڕادەیەک دەستی لە خۆی بەردا، بەڵام بەو حاڵەشەوە، گەرموگوڕی و خۆشمەشرەبییەکەی هەر پاراستبوو. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە ئامادەبوونی ئاردالیون ئالکسندروفیچ، کە دیار بوو، پێشتر زۆر شتی دەربارە بیستبوو، زۆر خۆشحاڵ بوو.

جەنەراڵ ویستی قسان بکات، گوتی:

- دەزانم کە کوڕەکەم...




- ئا... بەڵێ... کوڕەکەت!... بە ڕاستی تۆش باوکێکی باشیت! باشە بۆچی قەت نایەی بۆ لای من؟ تۆ خۆت گۆشەگیریت پێ خۆشە یان کوڕەکەت نایەوێ دەر بکەوی؟ تۆ دەتوانی هەرکاتێ خۆت بتەوێ سەرم بدەیت، چونکە تۆ هیچ قسەیەکت لێ ناوەشێتەوە و کەس ناتوانێ ناو و ناتۆرەت دوا بخات...

جەنەراڵ، دەستی بە قسان کردەوە:

- کوڕانی سەدەی نۆزدەیەم و باوکانیان...

نینا ئەلکسندروڤنا، بە دەنگی بەرز گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا، بێزەحمەت ئاردالیون ئەلکسندروفیچ بۆ ساتێ ئیزن بدە، کاریان پێیەتی...

- ئیزنی بدەم؟ ئاخر چۆن، تکا دەکەم... من زۆر شتم دەربارەی بیستووە، لەمێژە حەز دەکەم بیناسم! باشە کاری چی هەیە؟ ئەدی خانەنشین نییە؟ هەڵبەتە جەنەراڵ تۆ ناتەوێ بڕۆیت، من جێ ناهێڵێ، وا نییە؟

- من بەڵێنت دەدەمێ، کە دێتە دیدەنیت، بەڵام هەنوکە پێویستی بە ئیسراحەتە.

ناستایسا فیلیپوڤنا، وەکو منداڵێکی بە ناز کە بۆکەڵەکەیان لێ سەندبێ، زیز و تۆراو، لچی دا بە یەکا و گوتی:

- ئاردالیون ئالکسندروفیچ، دەڵێن گوایە پێویستت بە ئیسراحەتە...

جەنەراڵ، بۆ ئەوەی، وەزعێکی پێکەنیناوی دروست بکات، دەستێکی نایە سەر دڵی خۆی و بە دەنگێکی گلەیی ئامێزەوە گوتی:

- گیانەکەم، گیانەکەم...

ڤاریا، بە دەنگی بەرز گوتی:

- دایکە، ئەگەر تۆ بڕۆی، باشتر نییە؟

دایکی بەرسڤی دایەوە:

- نا ڤاریا، تا کوتایی دەمێنمەوە!

هەڵبەتە ناستاسیا فیلیپوڤنا، گوێی لەو پرسیار و وەڵامە بووبوو، بەڵام نەک هەر سارد نەبووەوە، بەڵکو زیاتر گەرم بوو، دیسان جەنەراڵی دایە بەر دەمرێژی پرسیاران. لە زەرفی پێنج دەقیقەیەکدا، جەنەراڵ، کەوتە هەوای خۆی و بەدەم وڕێنەوە هەموو جەماعەتی هێنایە پێکەنین.

کولیا، بە دزییەوە قۆڵی چاکەتەکەی میرزادەی ڕاکێشا و پێی گوت:
- باشە، ناتوانی هەر چۆنێ بووە بیبەیتە دەرەوە؟ ناتوانی؟ تکات لێ دەکەم...
ڕوندکی بێچارەی لە چاوانی کوڕیژگەی داماودا قەتیس مابوو، بەئەسپایی و لەبەر خۆیەوە گوتی:
- نەعلەتی خوات لێ بێت گانیا!
جەنەراڵ، بەدەم وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ناستاسیا فیلیپوڤناوە، شانی لێ قاییم کرد و گوتی:
- بەڵێ لە ڕاستیدا، من دۆستی گیانی بە گیانی ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین بووم، دۆستایەتیمان زۆر خۆش بوو. من و ڕەحمەتی میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین، کە خۆشبەختانە ئەمڕۆکە، دوای بیست ساڵ دابڕان، کوڕەکەیم لە ئامێزگرت، سێ دۆستی گیانی بە گیانی بووین، هەمیشە پێکەوە بووین. وەکو سێ تفەنگدارەکە بووین: ئاتوس، بورتوس و، ئارامیس، بەڵام بەداخەوە!... یەکێکمان حاڵی حازر لەژێر گڵدایە، بوو بە قوربانی بوختان و دوو زمانی و گوللەی غەدر و نامەردی، دووەممان ئەوەتا لە بەردەمتدایە و تا ئێستاش دژی دوو زمانی و گوللە... دەخەبتێ...
ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەسەرسامی پرسیی:
- گوللە؟
- لێرەدایە، لە سینگی مندایە، لە کاتی گەمارۆی قارس*دا پێم کەوت، ئێستاش لە سەرمادا، ناڕەحەتم دەکات. ئیدی لە شتەکانی دیدا، وەکو فەیلەسووفان دەژیم. پیاسە دەکەم، لە چاخانەدا وەکو بورژوایەکی خانەنشین وەرەقبازی دەکەم، ڕۆژنامەی "خۆیبوون*" دەخوێنمەوە، بەڵام سەبارەت بە (بورتوس)ی هاوڕێمان - یانی یەپانچین، سێ دانە ساڵی خشتە، پەیوەندیم لەگەڵی بڕیوە، لەسەر ئەو سەگە چکۆلەیەی ناو قیتارەکە...
ناستاسیا بەوپەڕی کونجکاوی پرسیی:
- سەگی چکۆڵە؟ ئەو چیرۆکە چییە؟ سەگی چکۆلە؟ لەناو قیتار؟...
لە تۆ وایە دەیەوێ شتێک وەبیر خۆی بێنێتەوە.
- ئا! چیرۆکێکی قۆڕ بوو، شایستەی گێڕانەوە نییە: پەیوەندیی بە (مسز

سمیت)ی هاوڕێی شازادە خانم (بیلوکونسکایا)وە هەیە... بە ڕاستی شایستەی گێڕانەوە نییە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەتاسەوە گوتی:

- نا، بیگێڕەوە، دەبێ بۆ منی بگێڕیتەوە!

فردیش چینکۆ گوتی:

- منیش نایزانم. تا ئێستا نەمبیستووە، ئەمە تازەیە.

دەنگی تووڕەی نینا ئالکسندروڤنا بەرز بووەوە:

- ئاردالیون ئالکسندروفیچ!

کولیا، بانگی کرد:

- باوکە، تۆیان دەوێ...

جەنەراڵ بەخۆشحاڵییەوە کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکەکە و گوتی:

- بەکورتی، ڕووداوێکی کۆمیدی بوو. نزیکەی دوو، دوو ساڵ، دوو ساڵ کەمێ زیاتر، ڕێک دوای کردنەوەی هێڵی ئاسنی نێوان... بۆ کارێکی پێویست، زۆر پێویست، بۆ کاری خانەنشینی یەکەم چووم بۆ وێستگەی قیتار، (جلکی مەدەنیم لەبەر کردبوو) بلیتی نمرە یەکم بڕی. سواری قیتار بووم، فارگۆنەکەی خۆم دۆزییەوە، دانیشتم و دەستم بە جگەرەکێشان کرد، نا لەسەر جگەرەکێشان بەردەوام بووم، چونکە پێش سواربوونی قیتارەکە جگەرەکەم داگیراندبوو، لە فارگۆنەکەدا بە تەنیا بووم. هەرچەند جگەرەکێشان قەدەغە نەبوو، بەڵام زۆریش ڕێگە پێدراو نەبوو، عادەت وا بوو کە چاوپۆشی لێ دەکرا، ئیدی وەستابووە سەر کەسەکە خۆی. جامی پەنجەرەکە کرا بووەوە. لەناکاوا، ڕێک بەر لەوەی قیتارەکە شووتی حەرەکەت لێ بدات، دوو خانم وەژوور کەوتن، چیوای نەمابوو بە جێ بمێنن، سەگێکی چکۆلەیان پێبوو، ڕێک بەرانبەر بە من دانیشتن. یەکێکیان دەستێک جلکی، شینی ئاسمانی، یەجگار شیکی لەبەردا بوو. دووەمیان دەستی جلی حەریری ڕەشی یەخە فەرووی سادەتری لەبەر بوو. هەر دوو خانم، تا ڕادەیەک جوان بوون، بەڵام بە عینوان بوون. بە ئینگلیزی دەئاخاوتن. من گوێم نەدانێ و لەسەر جگەرەکێشانی خۆ بەردەوام بووم. ڕاستت گەرەکە بیرم لە کوژانەوەی جگەرەکە کردەوە، بەڵام دوایی بڕیارم دا، سیگاری خۆ بکێشم و دوو

کەڵەکەی، لە پەنجەرەکەوە، کە هێشتا هەر کراوە بوو، بکەمە دەرەوە، سەگەکە بە باوەشی ژنە شینپۆشەکەوە بوو – سەگێکی زۆر زۆر بچووک بوو- هەر بە ئەندازەی لەپی دەستێک دەبوو، خۆی ڕەش و چوارپەلی سپی بوو... سەگێکی زۆر دەگمەن بوو. قرێتەیەکی زیوی لە مل بوو کە ناوی خۆی لەسەر نەخشێنرا بوو. من هەر بەو دەقەوە، کڕوکپ، بێ ئەوەی گوێ بەوان بدەم، لە جێی خۆ دانیشتبووم، بەڵام هەستم کرد جووتە خانم، پەست و بێزارن، هەڵبەتە بە دووکەڵە جگەرەکەی من قەڵس بوون. یەکێکیان لەپشت عەینەکەکەیەوە تەمەشای دەکردم. دیسان گوێم نەدایە و خۆم کرد بە کەڕەی شەرەبەت. نە ئەوان قسەیان دەکرد و نە من، خۆ دەبوایە قسەیەک بکەن، ئاگادارم بکەنەوە، داوایەکیان کردبا، ئەدی بەشەر زمانی بۆچییە، بەڵام بەرد وەدەنگ هات، جووتە خانم وەدەنگ نەهاتن، قوڕو قەپ!... خانمە شین پۆشەکە، لەناکاودا، بێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەک... باوەڕبکە بێ هیچ ئاگادار کردنەوەیەک، وەکو ئەوەی ئەقڵی لە دەست دابێ، سیگارەکەی لە دەستم ڕاپسکاند و لە پەنجەرەکەوە فڕێی دا. قیتار، بەدەم فیشک و هۆڕەوە، دەڕۆیشت. منیش سەرسام و حەپەساو، لە جێی خۆمەوە تەمەشام دەکرد. ژنێکی کێوی بوو، کێوی تەواو. ئەگەر بڵێی ژنێکی جوانیش بوو، تەڕوبڕ، بەژنوباڵا کەڵەگەت، زەرییەکی گوناڵ، زۆر ئاڵ بوو. ڕێک چاوانی بڕیبوونە دوڕ چاوانی من و نەیدەگواستنەوە. منیش نەمکردە نامەردی بێ ئەوەی تاقە قسەیەک بکەم، بەوپەڕی ئەدەبەوە، زۆر بە نەزاکەتەوە، بەوپەڕی ناسکی، دەستم برد قڵادەکەی ملی سەگەکەم گرت و دوابەدوای جگەرەکەم تورم دایە دەرێ. هەر ئەوەندە فریا کەوت قروسکەیەکی کرد و قیتار تێپەڕی.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە قاقای پێکەنینی دا، وەکو منداڵ کەوتە چەپڵەلێدان و هاواری کرد:

– تۆ شێری شێر!

فردیش چینکۆ هاواری کرد:

– ئەی ئافەرین! وەللا بابە ئافەرین!

پتیتسن، هەرچەندە، بە هاتنی جەنەراڵ، پەست و قەڵس بوو، کەچی ئەویش پێکەنی، تەنانەت کولیاش کەوتە پێکەنین و هاواری کرد:

- ئافەرین! دەست خۆش!

جەنەراڵ، بە شەوق و زەوقی تەواوەوە بەردەوام بوو:

- هەقی خۆم بوو، هەق بە من بوو، زۆریش هەقم بوو. خۆ ئەگەر جگەرە لە قیتاردا قەدەغە بێ، هەقە سەگ لە جگەرەکێشان قەدەغەتر بێ.

کولیا، هاواری کرد:

- دەست خۆش باوکە! کارێکی باشت کردووە! ئەگەر منیش لەجیاتیی تۆبام هەر وام دەکرد.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەتاسەوە پرسیی:

- ئەدی ئەو خانمە چیکرد؟

جەنەراڵ، برۆکانی وێک هێنانەوە و گوتی:

- ئەو خانمە؟ کێشەکە لێرەوە دەستی پێ کرد، بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات، بێ هیچ پێشەکییەک، تا توانیی زللەیەکی بە بنا گوێما کێشا. پێم گوتیت ژنێکی کێوی بوو، کێوی بە هەموو مانایەک!

- ئەدی تۆ چیت کرد؟

جەنەراڵ، چاوی داخست، بڕۆی هەڵبڕین، لێوی کرۆشت، دەستی بڵاو کردنەوە، بۆ چەند ساتێک بێدەنگ بوو، ئەوسا لەپڕ گوتی:

- جڵەوی خۆم لەدەست دا.

- یانی، زۆر بەتوندی لێت دا؟

- نە بەو زاتی خوا! زۆر بەنەرمی ڕەفتارم کرد، بەڵام بوو بە هەراوهەنگامەیەک ئەوسەری دیار نەبێت، بەڵام باوەڕ بکە لێم نەدا، تەنیا سووکە پاڵێکم پێوە نا، ئەویش هەر بۆ ئەوەی لە خۆمی دوور بخەمەوە. خانمە شینپۆشەکە، بۆ نەگبەتیی من نەک هەر ئینگلیز دەر چوو، بەڵکو هاودەم و بگرە دۆستی شازادەخانم بیلوکونسکایا دەر چوو. خانمی دووەم کە جلی ڕەشی لەبەر بوو کچە گەورەی بیلوکونسکایا دەر چوو، پیرە کچێکی سی و پێنج ساڵە بوو. هەموو دەزانن کە دۆستایەتیی نێوان خانم یەپانچین و ماڵباتی بیلوکونسکایا، زۆر خۆش بوو. ئیدی هەر شەش خانمەکە لەگەڵ خانمە ئینگلیزەکەدا، کردیان بە گرییە و شیوەنێک ئەوسەری دیار نەبێ، لە ڕاستیدا پرسەیان بۆ سەگە نازدارەکەیان گرتبوو. هەڵبەتە پاشان ویستم بچم

تەوازۆیان بۆ بێنمەوە، تەنانەت عوزرنامەیەکیشم نووسی، بەڵام نەخۆمیان قەبووڵ کرد و نەعوزرنامەکەم. ئیدی لەوەوە ساردی کەوتە بەینی من و خانەوادەی یەپانچینەوە، لێم زیزبوون و ئیدی نەچووینەوە بەلای یەکدا.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەناکاودا پرسیی:

- بە یارمەتیت، شتی وا چۆن دەبێ؟ من هەمووی پێنج شەش رۆژێک لەمە پێش، ئەم چیرۆکەم لە رۆژنامەی (خۆیبوون)دا خوێندەوەتەوە. هەر دەقاودەق ئەم چیرۆکە بوو کە تۆ گێڕاتەوە! رووداوەکە لە هێڵی ئاسنی رۆخی رووباری رایندا، لەنێوان پیاوێکی فەرەنسی و ژنێکی ئینگلیزدا رووی داوە: ژنەکە بە هەمان شێوە جگەرەکەی لە دەستی کابرا راپسکاندووە و لە پەنجەرەکەوە توڕی داوە و کابراش رێک بە هەمان شێوە سەگە قەزەمەکەی ئەوی لە پەنجەرەکەوە توڕ داوە. دەقا و دەق وەکو ئەمە بووە کە تۆ گێڕاتەوە، تەنانەت جلوبەرگی ژنەکەش شینی ئاسمانی بووە!

جەنەراڵ، لە تەریقیدا سوور هەڵگەڕا. کولیاش سوور بووەوە و سەری لەنێو هەر دوو دەستی نا. پتیتسن بەلەز رووی وەر گێڕا. تەنیا فردیش چینکو، هێشتا بە قاقا پێدەکەنی. سەبارەت بە گانیا، هەر باسی مەکە، بە درێژایی ئەم ماوەیە لەوێندەر وەستابوو، کڕوکپ، خۆی دەخواردەوە. کەس حاڵی بە حاڵی نەبێت!

جەنەراڵ، بەدەم مینجەمینجەوە گوتی:

- باوەڕ بکە، ئەوەی بۆم گێڕایەوە، دەقاودەق بەو شێوەیە لە خۆم رووی داوە...

کولیا گوتی:

- بابم راست دەکات، منیش لە بیرمە کە کێشە و سەریەشەیەکی زۆری لەگەڵ (خاسمیت)ی هاودەمی شازادەخانم بیلوکونسکایادا بۆ دروست بوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنای بێحەیا هەر کۆڵی نەدەدا:

- ئاخر شتی وا چۆن دەبێ؟ سەیرە، رووداوێک لە دوو شوێنی جیای ئەوروپادا، بە هەمان شێوە، بێ هیچ جیاوازییەک روو بدات! تەنانەت کراسە شینە ئاسمانیەکەش، هەر هەمان شێوە بێت! نا، دەبێ ئەو ژمارەیەی رۆژنامەی "خۆیبوونی بەلچیکی"ت بۆ بنێرم.

جەنەراڵ، گوتی:
- بەڵام ئاگادار بە، ئەوەی لە من ڕووی داوە، هیی دوو ساڵ لەمە پێشە!
- مەگەر تەنیا لەمەدا جیاواز بن..
ناستاسیا فیلیپوفنا، وەکو یەکێک تووشی نۆرە هیستریایەک بووبێ، بەدەم قاقای پێکەنینەوە، ئەو قسەیەی کرد.
گانیا، لە کاتێکا شانی بابی گرتبوو، بە دەنگێکی شەکەت و لەرزۆک گوتی:
- بابۆ، تکایە بەڵکو لەگەڵما بێیتە دەرێ... دەمەوێ دوو قسەت دەگەڵ بکەم.
ڕق و کینە لە چاوانی دەبووەوە.
لەو دەمەدا، زەنگی دەرگا بە جۆرێ لە مەدەخەلەکەدا دەنگی دایەوە، لە تۆ وایە هەر ئێستا هەڵدەکەنرێ. دیارە ئەم زەنگە، نیشانەی دیدەنییەکی نائاسایی بوو. کولیا ڕای کرد تا دەرگا بکاتەوە.

پەراوێز:
* - "گەمارۆی قارس.." گەمارۆی قەڵای قارسی تورکی لە ساڵی ١٨٥٥دا بوو، ئیدی دوای ئەوەی گەمارۆدراوەکان ئازووقەیان تەواو بوو، لە ١٨٥٥/١١/٦، ڕادەستی جەنەراڵ موراڤییڤ بوون.
* -"ڕۆژنامەی خۆیبوون..." مەبەست لە ڕۆژنامەی خۆیبوونی بەلچیکییە کە لە ساڵی ١٨٣٠وە لە برۆکسل دەر دەچوو. دۆستویفسکی زۆر جار ئەم ڕۆژنامە پڕ زانیارییەی دەخوێندەوە، بە تایبەتی بەشە سیاسییەکەی.

## فەسڵی دەیەم

لەپڕ، مەدەخەلەکە پڕ بوو لە هەراوزەنای کۆمەڵە خەڵکێک. ئەوانەی کە لە هۆڵەکەدا بوون، بە دەنگە دەنگەکەدا زانییان کە چەند کەسێک وەژوور کەوتوون و چەند کەسێکی دیکەش خەریکە دێنە ژوورەوە. دەستەیەک پێکەوە و لە یەک کاتدا قسانیان دەکرد، هاواریان دەکرد. چەند کەسێکی دیکە لە بەر قاڵدرمەکاندا قسەیان دەکرد و هاواریان دەکرد، دەرگای ماڵەکە کرابووەوە. دیار بوو ئەمانە میوانی سەیر و غەریب و عەجیب، میوانی ناوەخت بوون. ئەوانەی لە هۆڵەکەدا بوون، هەموو کەوتنە تەمەشاکردنی یەکدی. گانیا بەهەشتاو چوو بۆ هۆڵە گەورەکە، کۆمەڵێک خەڵکی لەوێندەر بینی.

دەنگێک، کە بە گوێی میرزادە ئاشنا بوو، بەرز بووەوە و گوتی:

– ئەها، ئەوە تۆی یەهودا*! هەی خایەن! سڵاو گانیا، هەی زۆڵ، هەی بیژی!

دەنگێکی دی هەڵی دایە:

– بەڵێ، ئەوە، خۆیەتی!

میرزادە، هیچ گومانێکی نەما کە یەکێک لە دەنگەکان، دەنگی ڕوگوژین و ئەوی تر دەنگی لیبیدیف بوو.





گانیا، ورِوکاس لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستابوو. کرِوکپ تەمەشای دەکرد، هیچ هەوڵێکی نەدەدا رِێگە لە هاتنەژوورەوەی ئەو دە-دوازدە کەسە بگرێت کە دووی بارفیون رِوگوژین کەوتبوون. ئەم گروپە تێکەڵەیەکی سەیروسەمەرە بوو، هەر یەکەیان لە رِەنگێ بوون، هەر هەموو بێسەروبەر، فەوزایەک بوو ئەوسەری دیار نەبوو. هەندێکیان زۆر بە شرِ و شەپرِێوی و بە فەروە و پاڵتۆکانیانەوە وەژوور کەوتبوون، پێدەچوو، سەرو شتێکیان خواردبێتەوە، بەڵام کەسیان سیامەست نەبوون. لەوە دەچوو، هەر یەکێکیان پێویستی بەوی دی بێ بۆ ئەوەی غیرەت بیانگرێت و بێنە ژوورەوە، کەسیان بە تەنیا زاتی هاتنەژوورەوەی نەدەکرد. تەنانەت "رِوگوژین"یش کە سەردەستە و پێشرِەویان بوو، بە پارێزەوە هەنگاوی دەنا، گرژومۆن و پەست و خەمین و تورِە دیار بوو. دیار بوو بە نیازی شتێک بوو. ئەوانی دی تەنیا دەوری کۆرسیان دەبینی، دەبوا لە کاتی پێویستدا یارمەتیی ئەو بدەن. گروپەکە جگە لە لیبدیف، (زالیوجیف)شیان لەگەڵدا بوو، کە قژی ڤێرو، نیگرۆ کردبوو، پاڵتۆ فەروەکەی لە مەدەخەلەکەدا دانا، خۆی بە ژوورا کرد، بێ خەم و خەیاڵ رِەفتاری دەکرد. دوو-سێ کەسی دیکەی هاوتەرازی خۆی لەگەڵدا بوون، کە دیار بوو کورِە بازرگانن. ئەوانی دی خەڵکی هەمەجۆر بوون. یەکێکیان دەگەڵ بوو کە پاڵتۆیەکی سوپایی لەبەر بوو، یەکێکی تریان دەگەڵ بوو، کە کورتەبنەیەکی یەجگار قەڵەوی هەمیشە خەنۆل بوو، پیاوی سێیەم، درێژێکی، بە داروبار بوو، ئەویش یەجگار قەڵەو بوو، باڵای نزیکەی دوو مەتر دەبوو. کابرایەکی عەبوس و مەنگ و بێدەنگ بوو، دیار بوو کە زۆر بە هێزی بازووی خۆی دەنازی.

لەگەڵ خوێنکارێکی زانکۆی پزیشکی و چەکلێکی مشەخۆری پۆلاندیدا. دوو ژنیش لەبەر قالدرمەکانەوە تەمەشای ناو ژوورەکەیان دەکرد و نەدەوێران بێنە ژوورەوە. کولیا دەرگاکەی بە رِوویاندا داخست و سورگی دا.

کاتێ بارفیون رِوگوژین، گەیشتە بەر دەرگای هۆڵەکە، لەهەنبەر گانیادا

وەستا و گوتی:

- سڵاو گانیای خوێڕی! تەسەوری ئەوەت نەدەکرد بارفیون ڕوگوژین ببینی، وا نییە؟

بەڵام لە هەمان ساتدا، لە هۆڵەکەدا و ڕێک لەبەرانبەریا، لەناکاودا، چاوی بە ناستاسیا فیلیپوڤنا کەوت. هەڵبەتە قەت تەسەوری ئەوەی نەکردبوو کە لەو شوێنەدا بیدینێ. کە ئەوی لەوێدا بینی، بە ڕادەیەک پەشۆکا و شپرزە بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و لێوەکانی شین بوونەوە، بە دەنگێکی نزم و وەکو ئەوەی خۆی بدوێنێ گوتی:

- کەواتە، ڕاستە! کارەکە بڕاوەتەوە!...

ئەوسا بەدەم ددانجیڕکردنەوە، بەوپەڕی پشم و غەزەبەوە ڕوانییە گانیا و گوتی:

- باشە... پاشان هەق و حیساب دەکەین!... ئەمەت لێ بەسەر ناچێت!...

ڕوگوژین، هانکەهانکی پێکەوتبوو، زۆر بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا، هەتا ئەو دوو وشەیەی بە پچڕ پچڕی گوت، قیڕ گوتی چەق. بەبێ ویستی خۆی بەرەو ناوەندی هۆڵەکە دەڕۆیشت، بەڵام کە لەناکاوا، چاوی بە نینا ئالکسەندروڤنا و ڤاریا کەوت، یەکسەر ڕاوەستا، هەرچەندە ئاشوفتە و پەشۆکابوو، بەڵام تا ڕادەیەک سڵەمییەوە. لیبدیف، دوابەدوای ئەو، وەژوورکەوت، وەکو سێبەری دووی کەوت، زۆری خواردبووەوە، ئەوسا خوێندکارەکە، پاشان یارۆی درێژ ی بە شان و باهۆ وەژوور کەوتن، لە دوای ئەوانیشەوە زالیوجیف وەژوور کەوت، بە ڕاست و بە چەپدا سڵاوی دەکرد، ئەوجا کابرای کورتەبنەی قەڵە و کە هەوڵی دەدا ڕێگە بۆ خۆی بکاتەوە، وەژوور کەوت. کەمێک شەرمیان لە ژنەکان دەکرد، بوونی ژنەکان جۆرە پارێز و سڵکردنەوەیەکی لا دروست کردبوون، بەڵام پیاو هەستی دەکرد ئەم شەرم و حەیا کاتییە، هەر ئەوەندە بڕ دەکات تا دەست پێ دەکەن، ئیدی خۆ بەخۆ دەڕەوێتەوە. هەر کە ئیشارەتی دەست پێکردنیان درایە، حیساب بۆ بوونی ژنەکان ناکەن.

ڕوگوژین، کە چاوی بە میرزادە میشکین کەوت، حەپەسا، لەناکاودا

پرسیی:

- چی؟ میرزادە تۆش لێرەیت؟ هێشتا پێڵاوە شڕەکانت لە پێدایە؟

هەناسـەیەکی هەڵکێشـا، یەکسـەر میـرزادەی لـەبیر چـووەوە و دووبـارە ڕوانییـە ناستاسـیا فیلیپوڤنـا، وەکـو موگناتیسـێک ڕای بکێشـێت، بەرەبـەرە بەرەو ئەو دەچوو.

ناستاسیا فیلیپوڤناش، بە کونجاوی و نیگەرانی دەیڕوانییە ئەو گروپە.

ئەنجام گانیا وەخۆ هـاتەوە، لـە کاتێکا بـە تـوڕەیی دەیڕوانییـە ئـەم گروپـە، ڕوو لە ڕوگوژین، بە دەنگی بەرز گوتی:

- بـە یارمـەتیتان! ئـەرێ پـێم نـاڵێن ئـەم کـەربازاڕە چییـە؟ چمـا ئێـرە تەویلەیە! دایک و خوشکەکەم نابینن!

ڕوگوژین، لە بن لێوانەوە پرتاندی:

- دایک و خوشکەکەت دەبینین.

لیبدیف، کە دیار بوو، مەرایی بۆ ڕوگوژین دەکات، هەڵی دایە و گوتی:

- هەڵبەتە دەیانبینین.

ئەوسـا یـارۆی درێـژ ی شـەقاوە، کـە دیـار بـوو پێـی وایە وەختـی دەستبەکاربوون هاتووە، کەوتە قسەی قۆڕ و بێسەروبەر.

گانیا، تاهێز لە گەرویدا بوو، دەنگی لێ هەڵبڕی و گوتی:

- بەسە! تکاتان لـێ دەکـەم، بچنـە ژوورەکـەی دی، یـانی بـە ڕاسـتی ئەمـە پیاوەتی نییە...

ڕوگـوژین، بـێ ئەوەی لـە جێـی خـۆی بجوولێـت، لـە قاقـای پێکـەنینێکی شەڕانی دا.

- سەیرە! جەنابی من ناناسێت! باشە تۆ ڕوگوژین ناناسیت؟

- وا هەست دەکەم لە جێیەک تۆم دیتوە، بەڵام...

- ها، لە جێیەک منت دیتووە! لـەبیرت چووەوە کە پـێش سـێ مانگێـک لـە قومارا، بە فێڵ دوو سـەد ڕۆبڵـت لـێ بردمەوە؟ کە پارەی بـابم بـوو؟ بـاش بـوو کـە ئەو پیرەمێـرە، پـێش ئەوەی بەمـە بزانـێ مـرد. تـۆ ڕات کێشـام بـۆ قومارەکـە (کنیـف)ی هـاوڕێتیش فێڵـی لـێ کـردم. ئیـدی چـۆن نامناسـیت؟

پتیتسن، شایەدە. هەر کە گوێچکەی ئەسکەناسێکی سێ ڕۆبڵیت نیشان بدەم، ئامادەی بە چوار چنگۆڵە تا فاسیلفسکی بە دوایا ڕابکەیت، تۆ ئەوەیت! ئەوە تەبیعەتی پیسکەی تۆیە! هەنوکەش هاتووم تۆ بکڕم! مەڕوانە پێڵاوەکانم، پارەیەکی زۆرم پێیە، دەتوانم خۆت و هەرچی کەسوکارت هەیە بکڕم، ئەگەر بمەوێ هەر هەمووتان دەکڕم، هەمووتان!...

ڕوگوژین، شێت ئاسا هاواری دەکرد و دەم بەدەم سەرخۆشتر دەبوو. هاواری کرد:

– ئاهـ ناستاسیا فیلیپوڤنا، لێم مەگرە! تەنیا یەک وشەم لە تۆ دەوێ، یەک وشە و بەس! گەرەکتە شووی پێ بکەی یان نا؟

ڕوگوژین، وەکو یەکێک هەست بکات، کاری کراوە، ئەو پرسیارەی کرد، وەکو چۆن کەسێک لەبەر خوای خۆی بپاڕێتەوە، بەو ئاوایە ناستاسیا فیلیپوڤنای دواند، بەڵام وێڕای ئەوەش جورئەتێک لە دەمودویدا هەبوو، ڕێک لە جورئەتی نائومێدانەی کەسێک دەچوو حوکمی ئیعدام درابێ و باکی بە هیچ نەبێ و ترسی لەدەستدانی هیچ شتێکی نەبێت. بەوپەڕی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ، چاوەنۆڕی وەڵام بوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەوپەڕی لووتبەرزی و بەتەوس و تـوانجەوە، سەراپای بە نیگا دابێژت، بەڵام کە ڕوانییە ڤاریا و نینا ئەلکسندروڤنا و ئەوجا گانیا، هەڵوێستی خۆی گۆڕی، بە زمانێکی ئارام و جیددی و بە جۆرە سەرسامییەکەوە گوتی:

– هەڵبەتە نا! بە تۆچی؟ چۆن ئەم پرسیارەت هات بە خەیاڵا؟

ڕوگوژین، خەریک بوو لە خۆشیا باڵ بگرێت، بۆیە هاواری کرد:

– هەڵبەتە نا؟ یانی شووی پێ ناکەیت؟ خۆ پێیان گوتم گوایە بەتەمای شووی پێ بکەیت... ئا... زۆر چاکە. ناستاسیا فیلیپوڤنا! گوتیان قەولت بە گانیا داوە کە شووی پێ بکەیت... پێم گوتن، کەسی نەدۆزیوەتەوە شووی پێ بکات ئەمە نەبێ؟ ئەم... شتی وا دەبێ! من دەتوانم بە سەد ڕۆبڵ بیکڕم. ئەگەر هەزار ڕۆبڵی بدەمێ، تۆ بڵێ سێ هەزار ڕۆبڵی بدەمێ، ئامادەیە لە شەوی زاوایەتیدا پاشەکشە بکات و بووکەکەی بۆ من جێ بێڵێ.

وا نییە گانیای نامەرد؟ بە سێ هەزار ڕۆبڵ ڕازی نابیت؟ پارەکە حازرە! جا ئێستا هاتووم تا بەڵێننامەم بۆ پڕ بکەیتەوە کە دەستبەرداری ئەم زەماوەندە ببیت. بەڵێنم بە خۆ داوە کە بتکڕم، هەر دەشتکڕم! بشفرێت هەر دەتکڕم!

گانیا، کە پەیتاپەیتا ڕەنگی دێنا و ڕەنگی دەبرد، هاواری کرد:

- بۆ دەرەوە! تۆ سەرخۆشی!

ئەم هاوارەی گانیا، دارودەستەکەی ڕوگوژینی هاڕوژاند، ئەم بێزکاڵییەیان لە خوا دەویست، خواخوای شتێکی وایان بوو. لیبدیف خۆی گەیاندە ڕوگوژین و خەمخۆرانە چەند وشەیەکی بە گوێیدا چپاند.

ڕوگوژین، بەرسڤی دایەوە:

- هەق بە تۆیە، ڕاست دەکەی میرزا! ڕاست دەکەی هەی عەرەقخۆری سەرخۆش؟ بۆ نا، چ دەبێ با ببێ؟

ئەوسا شێتئاسا کەوتە ڕوانینی ناستاسیا فیلیپوڤنا، جارێ شەرمنانە و جارێ گوساخانە، لێی دەڕوانی، گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا، فەرموو ئەمە هەژدە هەزار ڕۆبڵ بۆ تۆ! پێشکەشت بێ! هیی دیکەش ماوە.. هیی دیکەشی بەدوادا دێت! بەدەم ئەو قسەیەوە، بەستەیەکی لەسەر مێزە چکۆلەکەی بەردەمی دانا. بەستەکە لە کاغەزێکی سپییەوە پێچرابوو و بە مەچیر بەسترابوو.

زاتی نەدەکرد، هەموو ئەوەی لە دڵیایەتی بیڵێ.

لیبدیف، کە زۆر نیگەران و هەراسان دیار بوو، هەمدیس بە گوێیدا چپاند:

- نا، نا، نا...

دیار بوو، ئەو پارەیەی پێ زۆر بوو و پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکرد، کە بە برە پارەیەکی کەمتر تاقی بکاتەوە.

ڕوگوژین گوتی:

- نە، برادەر نا! نە گەوجە گیان! تۆ سەر لەم شتانە دەرناکەی. ئەمە ئیشی تۆ نییە... تۆ گەوجیت.

کە بینی ناستاسیا فیلیپوڤنا مۆڕەی لێ دەکات، خێرا ژێوان بووەوە.

کەوتە لەرزین و گوتی:

- ئێمە هەر دووکمان گەوجین، تۆش و منیش.. منیش بەش بە حاڵی خۆم گەوجم، خەتام کرد، کەر بووم کە گوێم لێ گرتی. کە بە قسەم کردیت.

ڕوگوژین، ئەو قسانەی دوایی، بە جۆرە پەشیمانییەکی قووڵەوە کرد.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بینی سەروچاوی ڕوگوژین، بەو شێوەیە گۆڕاو پەژمردە و پەریشان بوو، کوتوپڕ لە قاقای پێکەنینی دا، ئەوسا وەک ئەوەی بە نیازی ڕۆیشتن بێ، لەسەر قەنەفەکە هەستا، بەتەوس و توانجەوە گوتی:

- هەژدە هەزار ڕۆبڵ بۆ من؟ ئاخر لێرەدا سەرسواڵکەری و ئاڵچاخی دەر دەکەوێ!

گانیا، بە دڵێکی پڕ لە خوێنەوە، تەمەشای دیمەنەکەی دەکرد.

ڕوگوژین، هاواری کرد:

- چل هەزار، چل هەزار، نەک هەژدە! .. پتیتسن و بیسکۆپ قەولیان داومەتێ تا سەعات حەوت چل هەزار ڕۆبڵم بۆ تەرتیب بکەن، چل هەزار ڕۆبڵی کاش!...

دیمەنەکە بە تەواوەتی بێتام بووبوو، بەڵام ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەسەر پێکەنینی خۆی بەردەوام بوو، لە ژوورەکە دەرنەدەکەوت، لەوە دەچوو پەلەی نەبێت و بە ئانقەست بییەوێ درێژە بە دیمەنەکە بدات. ڤاریا و نینا ئالکسندروڤناش هەستابوونە سەر پێ، بێدەنگ و نیگەران و هەراسان چاوەڕوانی کۆتایی دیمەنەکە بوون. چاوانی ڤاریا دەبریسکانەوە، بەڵام دایکی یەجگار ئەفسوردە بوو، وەکو بیی ناو ئاو دەلەرزی، دیمەنەکە خراپ کاری تێ کردبوو، چیوای نەمابوو ببورێتەوە.

- مادام مەسەلەکەوای لێ هات، زیادی دەکەم، دەیکەم بەسەد هەزار. بەڵێ، هەر ئەمڕۆ، بۆتی دەکەم بە سەد هەزار! پتیتسن فریام کەوە، بۆمی پەیدا بکە و قازانج و سووتی مۆڵ و زەحفی خۆت وەر بگرە!

پتیتسن، بەپەلە بەرەو ڕوگوژین چوو، بە توندی باسکی گرت و بە گوێیدا چپاند:

- ئەوە تۆ شێت بووی! تۆ مەستی! پێت وایە لەکوێی؟ پۆلیست بۆ بانگ

دەکەن ها.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بەئاشکرا دەیویست هانی بدات گوتی:

– ئەم هەموو لاف و گەزافەی هیی مەستییە.

ڕوگوژین، کە لەوپەڕی هەڵچووندا بوو، هاواری کرد:

– نا، لاف و گەزاف نییە، فشە ناکەم! تا شەوێ پارەکە حازر دەبێت! ئەمشەو سەد هەزار ڕۆبڵی خۆت وەر دەگریت! دەبێ بیسەلمێنم کە پیاو قسە دەکات، قسەی پیاو یەکە و نابێ بە دوو!

لەم کاتەدا، ئاردالیون ئالکسندروفیچ، پەیدا بوو، بەپەلە بەرەو ڕوگوژین ڕۆیشت و لەپڕ نەڕاندنی بەسەریا:

– ئەم مەخسەرەبازییە چییە؟

ئەم هەڵچوونە کوتوپڕەی یارۆی پیرەمێرد، کە تا ئەو دەمە بێدەنگ بوو، شەقڵێکی کۆمیدی بە دیمەنەکە بەخشی. ئیدی هەندێ لە ئامادەبووان، لێرە و لەوێ کەوتنە پێکەنین.

ڕوگوژین، بەدەم تەوسخەنەوە گوتی:

– ئەم وانێکە لەکوێوە پەیدا بوو؟ پیرەمێر، لەگەڵ مەدا وەرە با مەستت بکەین!

کولیا، کە ڕوندکی شەرمەزاری و تورەیی دەباراند گوتی:

– کە شتێکی پیسی! بە ڕاستی ئەمە ئەوپەڕی سووکایەتییە!

ڤاریا، کە لە تورەییدا ئازای دەلەرزی، لەناکاودا هاواری کرد:

– ئەرێ کەسێک نییە، ئەم ژنە هەرزەیە بە پاڵ وەدەر نێت؟ ماقوولە!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەوەلامی ئەم سووکایەتیدا، بەتەوسەوە گوتی:

– خوا ئەو خوایەیە بە من بگوترێ هەرزە! من کەرم کە هاتووم ئەمانە بۆ شەو ئاهەنگەکەم دەعوەت بکەم! تەمەشا گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بزانە خوشکەکەت چ سووکایەتییەکم پێ دەکات!.

گانیا، کە لەو هەڵچوونەی خوشکەکەی حەپەسابوو، بۆ ماوەیەک مات بوو، بەڵام کە بینی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەم جارە بە ڕاستی لێبڕاوە بڕوات، شێتئاسا پەلاماری ڤاریای داو بە تورەیی بازووی گرت. بە جۆرێ چاوی

بڕییە چاوانی، لە تۆ وایە دەیەوێ دەمودەست و هەر لەوێدا بیکوژێت. هاواری کرد:

- بینیت! بینیت چیت کرد؟

بە جۆرێ دەهری بووبوو، بە خۆیشی نەیدەزانی چ بکات. ڤاریا، کە بەوپەڕی متمانە و غرووڕەوە، چاوی بڕیبووە دوڕ چاوانی براکەی، گوتی:

- چیم کرد؟ بۆ کوێم دەبەی؟ بۆ کوێم ڕادەکێشی؟ ناشێ بمبەی تەوازۆی بۆ بێنمەوە؟ چونکە سووکایەتی بە دایکت کردووە و هاتووەتە ئێرە تا حەیا و حورمەتی خانەوادەکەت بەرێ، هەی ناپیاو؟

بۆ چەند ساتێک، بەو دەقەوە، ڕوو بە ڕووی یەکتر مانەوە. گانیا، هێشتا بازووی خوشکەکەی گرتبوو. ڤاریا یەک دوو جار، بە هەموو هێز و قوەتێکی خۆیەوە، دەستی ڕاپسکاند تا خۆی لەدەستی ڕزگار بکات، بەڵام دەرەقەت نەهات. ئیدی جڵەوی خۆی لەدەست دا و تا زاری گرتی تفێکی کردە چارەی براکەی.

ناستاسیا فیلیپوڤنا هاواری کرد:

- پەح! ئەمەیە کچ، دەک بتڕەژم! ئەی ئافەرین، پتیتسن پیرۆزباییت لێ دەکەم!

گانیا لە حەژمەتاندا بەرچاوی تاریک بوو، ئاگای لە خۆ نەما، دەستی بەرزکردەوە، تا یەکێک بە سەروچاوی خوشکەکەیدا بکێشێت، ڕێک لەو کاتەدا، دەستێکی دی بەلەز هات و دەستی ئەوی توند گرت. میرزادە لەنێوان هەر دوو خوشک و براکەدا وەستا. لە کاتێکدا، ئەویش، لە حەژمەتاندا سەراپای دەلەرزی، بەتوندی گوتی:

- ئەمە چییە؟ بەس نییە؟

گانیا، لە کاتێکا دەستی ڤاریای بەر دەدا، بەتوڕەیی گوتی:

- تۆ هەمیشە دەبێ لە من ببی بە مووی لووت؟

گانیا، کە لە توڕەییدا ئاگای لە خۆی نەمابوو، تا توانیی زللەیەکی بە پەنا گوێی میرزادەدا، کێشا.

کولیا هاواری کرد:

- وای... خودایا!...

هەر کەسە و شتێکی دەگوت. ڕەنگ لە ڕووی میرزادەدا نەما. بە نیگایەکی سەیر و پڕ بێزاری و گازاندە، ڕاستەوخۆ دەیڕوانییە گانیا. زەردەخەنەیەکی سەیرو نا ئاسایی نیشتە سەر لێوەکانی، لێوەکانی کەوتبوونە تەتەڵە و هەرچی دەکرد هیچ قسەیەکی بۆ نەدەهات. ئەنجام بە دەنگێکی نزم و هێواش گوتی:

- قەیدی نییە، با من لەجیاتیی ئەو لێدان بخۆم... گرینگ نییە، بەڵام مەحاڵە بێڵم لەو بدەیت!...

ئەوسا، لەپڕێکا، دڵی پڕ بوو، ڕووی لە گانیا وەر گێڕا، ڕووی کردە دیوارەکە و بە دەنگێکی پچڕپچڕ گوتی:

- بە ڕاستی شەرمە بۆ تۆ، بزانە چۆن تەریق دەبیتەوە! چۆن پەشیمان دەبیتەوە!

گانیا، دەتگوت سایمەل لێی داوە.

کولیا، بەهەشتاو بەرە و میرزادە چوو، تا ماچی بکات و دڵخۆشی بداتەوە. ڕوگوژین، ڤاریا، پتیتسن، نینا ئەلکسندروڤنا و هەموو ئەوانی دیکەش، تەنانەت ئاردالیون ئالکسندروڤیچی پیرش، گشتیان لە دەوری خڕ بوونەوە.

میرزادە، بە هەمان زەردەخەنەی نائاساییەوە، ڕووو لە هەموویان گوتی:

- هیچ نییە! گوێ مەدەنێ!

ڕوگوژین، هاواری کرد:

- تۆ ڕاست دەکەی، ژێوان دەبێتەوە. گانیا تۆ تەریق نابیتەوە دەست لەم مەڕی پێغەمەرە دەکەیتەوە (وشەیەکی لەوە لەبارتری نەدۆزییەوە). میرزادە، هاوڕێی ئازیز، واز لەمانە بێنە، وەرە لەگەڵ منا... هەنگێ بۆت بەدیار دەکەوێ کە ڕوگوژین چ دۆستێکی بە ئەمەکە!

ناستاسیا فیلیپوڤناش، لە کاریگەری و باندۆری کارەکەی گانیا و هەڵویست و کاردانەوەی میرزادە بەدەر نەبوو. ڕەنگ و ڕووی بە تەواوەتی شێواو و خەمناک بوو، هەرگیز دەگەڵ ئەو ژنە خەندەران و شەنگوڵ و دەم

بە پێکەنینەی تۆزێ لەوەپێشدا تێکی نەدەکردەوە، هەرچەند دەیویست ئەم حاڵەتە وەشێرێ و حاڵەتە گەپجاڕییەکەی پێشووی بپارێزێت، بەڵام بە عالەمی ئاشکرا پێوەی دیار بوو.

ناستاسیا، کە دوا پرسیاری میرزادەی وەبیر خۆی هێنایەوە، لەناکاوا و لە بەر خۆیەوە گوتی:

– ڕاستە، من ئەم دەموچاوەم لە شوێنێکا دیتووە!

میرزادە، لەپڕ هەڵی دایە و بە گلەییەکی زۆرەوە، بەڵام گلەییەکی دۆستانە و ڕاستگۆیانە، گوتی:

– ئەدی تۆ، ئێستا هەست بە شەرمەزاری ناکەیت، لە خۆت تەریق نابیتەوە؟ تۆ لە ڕواڵەتا شتێکی و لە ناخا شتێکی تری! تۆ ئەو ژنەنیت کە باسیان دەکردیت...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، حەپەسا، زەردەخەنەیەکی کاڵی بۆ کرد، وەکو ئەوە بوو بیەوێ شتێک بشارێتەوە. بە نیمچە پەژارە و نیگەرانییەکەوە ڕوانییە گانیا و بەرەو دەرگای هۆڵەکە ڕۆیی تا وەدەربکەوێ، بەڵام بەر لەوەی بگاتە ژووری مەدخەلەکە، لەپڕ گەڕایەوە، بەهەشتاو بەرە و لای نینا ئالکسندروڤنا ڕۆیشت، دەستی گرت و بۆ لێوی خۆی برد. ئەوجا بەپەلەپەل و بە هەڵچوونەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:

– هەق بەوە، ڕاست دەکات، من بە هیچ جۆرێ وا نیم، باشی بۆچووە... ئەوە نیم...

ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، جارێکی دیکە گەڕایەوە و لە هۆڵەکە وەدەر کەوت، بەڵام هێندە بەلەز ڕۆیشت کە هیچ یەکێک لە ئامادەبووان فریا نەکەوت کە بزانێ بۆچی گەڕایەوە، تاقە شتێک کە دیتیان ئەوە بوو کە چەند وشەیەکی بە گوێی نینا ئالکسندروڤنادا چپاندبوو، بە ئاشکرا دەستی ماچ کردبوو، بەڵام ڤاریا هەموو شتێکی بینی و هەموو شتێکی گوێ لێ بوو، کە ڕۆیی لە پاشەوە، سەراسیمە تەمەشای دەکرد.

گانیا، وەخۆ هاتەوە، بەغار ڕۆیی تا ناستاسیا فیلیپوڤنا بەڕێ بکات، بەڵام تازە ڕۆیشتبوو، لەژێر پلیکانەکاندا گرتیەوە. ناستاسیا هاواری کرد:



گەمژە

- لەگەڵما مەیە! جاریّ ئەمشەو خواحافیز! بێی ها! گوێت لیّ بوو؟

گانیا، پەست و نیگەران و خەمبار، گەڕایەوە. هەستی دەکرد بارێکی قورس، قورستر لە جاران نیشتووەتە سەر دڵی، بەدەست لەگەز و مەتەڵێکی دژوارەوە گیرۆدەیە. کە ڕەفتارەکەی خۆی دەگەڵ میرزادەدا دەهاتەوە بەرچاو، دەست دەست ئارەقەی شەرمەزاریی دەر دەدا، دڵی دەگوشرا.. بە جۆریّ لە فکران ڕاچووبوو، بە شێوەیە چووبووە ژێری و پەشێوو پەریشان بووبوو، ئاگای لەوە نەبوو کە ڕوگوژین و دارودەستەکەی یەک لە دوای یەک بە تەنیشتیا، ڕەت دەبوون و لە مەدخەلەکەدا شانیان بەر شانی دەکەوت و پەلەیان بوو، لە سەرۆکەکەیان (ڕوگوژین) کە لە ماڵەکە وەدەر کەوتبوو، بەجیّ نەمێنن. هەر هەموویان پێکەوە و بە دەنگی بەرز، باسی مەسەلەیەکیان دەکرد، ڕوگوژین بە خۆی شان بە شانی پتیتسن ڕێی دەکرد و بە جدی باسی مەسەلەیەکی لەگەڵ دەکرد، پێدەچوو زۆر گرینگ و زەروری بێت.

ڕوگوژین، کە بەلای گانیادا تێپەڕی گوتی:

- گانیا دۆڕاندت!

گانیا، نیگەران و پەشێو، تا لە چاو ون بوون هەر سەیری دەکردن.

پەراوێز:

* "ئەوەتۆی یەهودا..." ئاماژەیە بۆ یەهودای ئەسخەریوتی، کە یەکێک بوو لە شاگردان و یارانی مەسیح کە بە تەماحی بەرتیل، خەبەری لیّ دا. لە کەلتووری دنیای مەسیحیەتدا، ڕەمز و نیشانەی خیانەتکاری و نامەردییە.

## فەسڵی یازدەیەم

میرزادە، هۆڵەکەی جێ هێشت و چوو بۆ ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست. کولیا، بەلەز چوو بۆ نک وی تا دڵخۆشیی بداتەوە. ئەم کوریژگە بەستەزمانە بە جۆرێ ڕمووودەی میرزادە بووبوو، کە نەیدەتوانی لیی دوور بکەوێتەوە.

کولیا، بە میرزادەی گوت:

- زۆر باشت کرد کە لەوێندەر ڕۆیشتی. شەڕەکە لەوێ گەرمتر دەبێت. هەموو ڕۆژێک هەمان تاس و هەمان حەمامە، هەمووشی بە هۆی ناستاسیا فیلیپوڤناوەیە.

میرزادە گوتی:

- کولیا، لەوە دەچێت، ئێوە کێشە و ئاریشەتان زۆر بێ.

- بەڵێ، دروستە. ئیدی ئەوەوەزع و حاڵی ئێمەیە، هیچ هەقی گلەییشمان نییە، چونکە هەمووی خەتای خۆمانە، بەڵام من برادەرێکم هەیە، زۆر لە ئێمە بەدبەخت ترە. حەز دەکەی پێتی بناسێنم؟

- زۆریش حەز دەکەم. برادەری گیانی بە گیانی تۆیە؟

- بەڵێ، تەقریبەن. پاشان بۆتی باس دەکەم. ناستاسیا فیلیپوڤنا جوانە، وانیە؟ من، هەرچەندە زۆرم هەوڵ دابوو کە بیدینم، بەڵام ئەمە یەکەم جارم بوو کە بیبینم. بە ڕاستی ئەمڕۆکە یەجگار خشیک بوو! ئەگەر گانیای برام

بە خۆشەویستی و لەپێناوی خۆشەویستیدا بیخواستبایە، هیچ گلەیەکم لێ نەدەکرد و نەهەقم نەدەگرت، بەڵام بەو مەبەستەی پارەی لێ بکێشێتەوە، بە ڕاستی شورەییە!

- نا، من براکەتم بە دڵ نییە، بە شایستەی خۆشەویستیی نازانم.

- تێدەگەم، نەهەقت ناگرم، بە تایبەتی دوای ئەو شتەی کە بەرانبەرت کردی... حەز دەکەی ڕەئیی من لەو بارەیەوە بزانی؟ هەندێ دابونەریتی کۆمەڵایەتیی باو هەن، کە من هەرگیز بۆم هەرس ناکرێن. بۆ نموونە جاری وا هەیە شێتێ، یان سێبەندییەکی شەڕانی، یان گوساخێکی شەلاتی، زللەیەک لە کەسێک دەدات، ئیدی ئەو کەسەی زللەکەی لێ دەدرێ بۆ هەتا هەتایە دەبێ بەن گەپچاڕی خەڵکی، ئابرووی دەچێت، لەناو خەڵکیدا دەبێ بە بەڵمەبرنج، مەگەر بە خوێن ئابرووی خۆی بکڕێتەوە، یان بچن کڕنۆشی بۆ بەرن، خۆ لە بەر پێیانی باوێژن و تەوازی بۆ بێننەوە و داوای بووردنی لێ بکەن. من پێم وایە ئەمە عادەتێکی سەخیفە، زاڵمانەیە. ئەمە ڕێک بیرۆکە و تیمەی (دەمامک*)ەکەی لیرمانتۆفە، کە من بە شتێکی قۆڕ و گەوجانەی دەزانم و، دەگەڵ تەبیعەتدا تێک ناکاتەوە، هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە لیرمانتوف ئەو درامایەی لە تەمەنی هەرزەکاریدا نووسیوە...

- هەڵوێستی خۆشکەکەتم زۆر بە دڵ بوو، زۆرم خۆش ویست.

- بینیت چ تفێکی کردە چارەی گانیا؟ ڤاریا ئازایە! بەڵام تۆ ئەم کارەت نەکرد، پێم وا نییە لەبەر ئەوە بووبێ کە ئازانیت. ئەوەتا وا بۆ ئێرە دێ. وەک دەڵێن بەسەر باس و پەسنی خۆیدا هات. دەمزانی هەر دێت! بە ڕاستی کچێکی بە وێڵ و ماریفەتە، هەرچەندە عەیبیشی هەیە.

ڤاریا، بەتەشەرەوە بە کولیای گوت:

- ئێرە جێی تۆ نییە. بڕۆ بۆ لای باوکە! میرزادە خۆ بێزاری نەکردیت؟

- نەخێر، بە پێچەوانەوە.

- دیسان خوشکی گەورە، هەڵچوو! ئەوە عەیبەکەیەتی. وام تەسەور دەکرد بابمان بەگەڵ ڕوگوژین بکەوێت، ڕەنگە هەنوکە ژێوان بێت کە بۆ ئەو کارەی نەکرد.

کولیا، بەدەم دەرچوونەوە، لەسەری ڕۆیشت:

- باشتر وایە بڕۆم بزانم بەتەمای چییە!

ڤاریا گوتی:

- شوکر بۆ خوا! دایکم برد و خەواندم. هیچ بەزمێکی دیکە دروست نەبوو. گانیا، زۆر تەریق و شەرمەزارە. هۆیەکەشی ڕوون و دیارە!... دەرسێکی باشی وەر گرت! من هاتووم تا هەم سوپاست بکەم و هەم لێت بپرسم ئایا پێشتر قەت ناستاسیا فیلیپوڤنات ناسیبوو؟

- نا، نە دیتبووم و نە ناسیبووم.

- ئەدی چۆن بەرەو ڕوو پێت گوت کە ئەو ژنە نییە؟ ڕواڵەتی شتێکە و ناخی شتێکی دییە؟ واتە تەسەور دەکەم زۆر باشی بۆ چوویت، حەقیقەتت نایە مستی!... بەهەرحاڵ، گێژ و کاس بووبووم، سەرم لە کاری وی دەر نەدەکرد! هەڵبەتە دیار بوو کە هاتبوو سووکایەتیمان پێ بکات. پێشتر زۆر چیرۆکی سەیروسەمەرەم دەربارەی بیستبوو. ئەگەر، خۆی گوتەنی بۆ ئەوە هاتبوو، من و دایکە دەعوەت بکات، بۆچی ئەو ڕەفتار و مامەڵە غەریبەی دەگەڵ دایکەدا کرد؟ پتیتسن زۆر چاکی دەناسێت. دەڵێت ئەمڕۆکە زۆر گۆڕابوو، سەری لە ڕەفتارەکانی دەر نەدەکرد، بەتایبەتی ئەو هەڵوێستەی لەهەنبەر ڕوگوژیندا نواندی؟ ئەوەی زەڕەیەک حورمەتی خۆی لە لابێ، لە ماڵی خەڵکیدا بەو جۆرە قسە ناکات... دایکم زۆر خەمی تۆیەتی.

میرزادە، بەبێ موبالاتییەوە گوتی:

- گرینگ نییە!

- سەیر ئەوە بوو بە گوێی کردیت...

- چۆن... بە گوێی کردم؟

- کاتێ پێت گوت، دەبێ شەرم لە خۆی بکات، یەکسەر گۆڕا.

ئەوجا ڤاریا، بەدەم سووکە بزەیەکەوە لە سەری ڕۆیشت:

- میرزادە، وا دیارە کاریگەریت بەسەریەوە هەیە!

لەناکاو دەرگا کرایەوە، گانیا، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو وەژوور کەوت، تەنانەت کە (ڤاریا)شی لەوێ بینی، هەر نەگەڕایەوە. چەند ساتێک لە

ئاستانەی دەرگاکەدا وەستاو ئەوجا لەپڕ و بێ هیچ دوو دڵیەک، لە میرزادە نزیک بووەوە و بە سۆز و گودازێکی قووڵەوە گوتی:

- میرزادە، من نامەردیم بەرانبەر کردیت، بمبورە گیانەکەم!

نیگەرانی و عەزابێکی قووڵ بە سیمایەوە دیار بوو. میرزادە، کەمێک لێی ڕاما، بە تەواوەتی حەپەسابوو، یەکسەری وەڵامی نەدایەوە. گانیا، دیسان، بە شپرزەیی لێی دووپات کردەوە:

- بمبورە، تکات لێ دەکەم بمبورە. بێنە با دەستت ماچ بکەم!

میرزادە، کە زۆر بەزەیی پێیدا هاتەوە، یەکسەر و بێ هیچ قسەیەک دەستی لە ملی وەری نا و هەر دووکیان بە دڵ و ڕاستگۆیانە یەکتریان ڕامووسی.

ئەنجام میرزادە، پاش ئەوەی پشوویەکی وەبەر هاتەوە، گوتی:

- هەرگیز وێنام نەدەکرد تۆ وا بیت. تەسەورم نەدەکرد، کاری وات لێ بوەشێتەوە... بتوانی کاری وا بکەیت...

- بتوانم تەوازۆ بۆ تۆ بێنمەوە؟ من لە خۆم دەپرسم، بەچ ئەقڵێکەوە تۆم بەگێل دەزانی؟ لە کاتێکا ئەوەی تۆ هەستت پێ دەکرد، ئەوانی دی هەستیان پێ نەدەکرد، تۆ پیاوێکی، هەقە پرس و ڕاوێژت پێ بکرێت، بەڵام وا چاکە، جارێ هیچ نەڵێم!

میرزادە، بەدەم ئاماژەوە بۆ لای ڤاریا، گوتی:

- ئەمەش مرۆڤێکی دییە، کە هەقە داوای بوردنی لێبکەی!

گانیا، ڕووی لە خوشکەکەی وەر گێڕا و بە دەنگی بەرز گوتی:

- نا، نا، ئەوانە هەموویان دژمنی منن. باوەڕ بکە میرزادە من زۆرم هەوڵدا، بەڵام بێفایدە بوو، تەوازی لای ئەمانە بێسوودە، بە دڵ گەردنت ئازا ناکەن، قەت دڵیان پاک نابێتەوە!

ڤاریا، لەناکاودا گوتی:

- بەڵام من تۆ دەبورم!

- ئەمشەو دەچیت بۆ ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

- ئەگەر تۆ ئەمر بکەی دەڕۆم، بەڵام هەر خۆت داوەر بە، ئایا دەشێت

من ئێستا بۆ ئەوێ بڕۆم؟ دەکرێت لەوێدا ببینرێم؟

– هەڵبەتە ئەو ژنە نییە کە تۆ تەسەوری دەکەیت. خۆ بە چاوی خۆت دیتت چ چاو و ڕاوێکی کرد؟ چ بە زمێکی نایەوە؟ بەڵام وەستای نماییشە!...

گانیا، بەدەم ئەو قسانەوە، پێکەنینێکی ئەهریمەنانەی بۆ کرد.

– من دەزانم کە ڕواڵەت و ناخی یەک نین، هەزار و یەک ئۆینی تری لەژێر سەردایە، ئۆین ئەمما ئۆین! خوا دەزانێ چ داوێکی دیکەی بەدەستەوەیە؟ جا گانیا تۆ وریا بە، ئاگات لە خۆ بێ، تۆ دەزانی ڕەئی بەرانبەر بە تۆ چییە؟ من باوەڕ ناکەم! دروستە دەستی دایکەی ماچ کرد، بەڵام ئەمەش یەکێکە لە ئۆینەکانی ئەو! گریمان هەر هەموو ئەمە نماییش (تمپیل) بوو، بەڵام دڵنیا بە تۆی گەوجاندووە، پێت ڕادەبوێرێ! باوەڕ بکە برام، پارە، هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ، ئەم هەموو زەلیلی و سەر شۆڕییە ناهێنێ! تۆ هێشتا پاکیت، نەلەوتاوی، باوەڕم پێ بکە پاکیت، بە گوێی من بکە و تۆش ئەمشەو مەڕۆ! نەکەی بڕۆیت! ئاگادار بە ئەم کارەی تۆ دەستت داوەتێ، ئاقیبەتی باش نابێت!.

ڤاریا، کە تەواو شپرزە و پەریشان بووبوو، ئەو قسانەی کرد و بەلەز لە ژوورەکەوە دەر کەوت.

گانیا بەدەم پۆزخەنێکەوە گوتی:

– هەر هەموویان، هەمان قەوان لێ دەدەنەوە، تۆ بڵێی وا تەسەور بکەن کە خۆم نایزانم؟ هەڵبەتە من لەوان باشتری دەزانم! ئەوەی من دەیزانم، ئەوان نایزانن!

گانیا، لەسەر کەتەکە دانیشت. دیار بوو کە دەیویست زیاتر بمێنێتەوە.

میرزادە، زاتی وەبەر خۆنا و بە شەرمێکەوە گوتی:

– ئەگەر دەیزانی، بۆچی ئەم هەموو عەزابەی خۆت دەدەی، لە کاتێکا سوور دەزانی کە هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ، ئەم هەموو عەزابە نایەنێت؟

گانیا، لەژێر لێوانەوە گوتی:

– مەبەستم ئەمە نییە، بەڵام کە هەنوکە هاتووینەتە سەر مەسەلەکە، حەز دەکەم، ڕای تۆ لەو بارەیەوە بزانم، بڵێ بزانم ئایا هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ

ئەم هەموو دەرد و عەزابە دێنیّ یان نا؟

- بە باوەڕی من نایهێنیّ!

- دەمزانی، ئەم قسەیە دەکەیت. ئەدی ئەم جۆرە ژنهێنانە عەیبە؟

- زۆریش عەیبە!

- زۆر چاکە... دەنا وێڕای ئەوەش هەر دەستبەرداری نابم، بڕیارێکە و داومە و هەر دەیخوازم، هەنوکە لە جاران سوورترم لەسەر هێنانی، تۆزیّ لەمەپێش هێشتا دوو دڵ بووم، لیّ هەنوکە تەواو، بڕیاری یەکجارەکیم داوە! هیچ مەڵیّ، خۆت ماندوو مەکە، دەزانم چیت لە دڵدایە و دەتەویّ چی بڵێی...

- ئەوە ناڵێم کە تۆ تەسەووری دەکەیت بیڵێم. سەرم لەم هەموو متمانە و دڵنیاییەی تۆ سووڕ ماوە.

- لە چی؟ لە متمانە و دڵنیایی من؟

- لەوەی کە دڵنیایت، ناستاسیا فیلیپوڤنا شوو بە تۆ دەکات و بڕاوەتەوە، لەوەی کە دڵنیایت ئەم هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵە یەکسەر و کاش دەخرێتە گیرفانتەوە. هەڵبەتە من کە ئەم قسەیە دەکەم، زۆر شتی دیکەش هەیە کە نایزانم.

گانیا، بە ڕووی میرزادەدا هەڵشاخی و گوتی:

- هەڵبەتە تۆ هەموو شتێک نازانی. ئەگەر وا نەبووایە بۆچی ئەم هەموو دەردەسەرەم قەبووڵ دەکرد؟

- پێم وایە، زۆر جار پیاو بە تەماعی پارە وماڵی دنیا ژن دێنیّ، بەڵام لە دوا ئەنجاما، هەر ژنەکە دەست بەسەر پارەکەدا دەگرێت و بۆ ئەو دەبێت!

گانیا، لە فکران ڕاچوو، نیگەران و پەریشان کەوتە مینگەمینگ:

- نا، نا! زەماوەندی ئێمە وا نابێت... کۆمەڵێک هەلومەرجی تایبەتی لەئارادایە...

ئەوسا، بەلەز لە سەری ڕۆیشت:

- سەبارەت بە وەڵامی ئەو، هیچ گومانێکی تیا نییە! بە چ قەرینەیەک پێت وایە لەوەیە ڕەفزم بکات؟

- من جگە لەو شتانەی کە بە چاوی خۆم دیتم، هیچ شتێکی دیکە نازانم، خوشکەکەشت، تۆزێ لەمەپێش هەمان ڕەئی هەبوو. هەمان قسەی دەکرد...

- ئەمانە، عادەتیانە، هەر دەبێ قسەیەک بکەن، دەمیشیان بگری، هەر قسە دەکەن، بەڵام ناستاسیا، عەجەب بە ڕوگوژینی ڕابوارد، من بە خۆم هەستم پێ کرد، باوەڕ بکە، بەئاشکرا دیار بوو کە پێی ڕادەبوارد. تۆزێ لەمە پێش هەندێک بەگومان بووم، بەڵام هەنوکە لێم عەیانە کە مەسەلە چییە، ڕەنگە مەزەندەکەی تۆ زادەی ڕەفتاری ناستاسیا، دەگەڵ دایکم و باوکم و ڤاریادا بێت!.

- هەروەها ڕەفتاری دەگەڵ تۆشدا.

- گریمان سەرنجەکەی تۆ دروستە، بەڵام هۆیەکەی تەنیا گیانی تۆڵە ئەستێنی ژنانەی ئەوە. ناستاسیا فیلیپوڤنا، ژنێکی زۆر هەستیارە، زۆر تورەیە، تابڵێی دڵی ناسک و خۆپەرست و لەخۆباییە. ڕێک وەکو فەرمانبەرێکە کە تەرفیعیان پێ نەکردبێت. بۆیە دەیویست خۆی بنوێنێ و، قوەت و کەسێتی خۆی نیشانی ئەوان بدات، سووکایەتیی بەوان... و بە منیش بکات. ئەمە دروستە. من نکۆڵیی لێ ناکەم، بەڵام وێڕای ئەمەش، هەر شووم پێ دەکات... تۆ نازانی غرووری بەشەری چ بەزمورەزمێکی لێ دەکەوێتەوە. ئەم ژنە من بە پیاوێکی بودەڵە و سووک دەزانێ، چونکە لای عەیانە کە من سوور دەزانم سووتلی و قەپاتمەی پیاوێکی دیکەیە، کەچی بەو حاڵەشەوە ئامادەم لەپێناوی پارەدا بیخوازم. من ڕێک و ڕاست و بەئاشکرا بە تەماحی پارەکەی بووم، بەڵام غافڵە لەوەی کە کابراکەی دیکە، زۆر نامەردانەتر فریوی دەدات، دەکەوێتە خشت و پای، ڕووپامایی لەبەر دەکات، بە جۆرەها قسەی ژن پەسندی وەکو لیبرالیزم، پێشکەوتنخوازی و ڕزگاری ئافرەت و بەو جۆرە قسانە، سووک و ئاسان دەیهێنێتە ڕەدا و قەناعەتی پێ دەکات، کە بۆیە خۆشی دەوێ و گەرەکیەتی بیخوازێت، چونکە ئافرەتێکی پاک و دڵپاک و مەینەتبارە، دەنا هیچ تەماعێکی تری بەو نییە، حاڵبوکی ژێراو ژێر، مرخی لە پارەکەی خۆش کردووە و تەنیا بە تەماعی پارەکەی دەیخوازێت، بەڵام بۆیە منی بە دڵ نییە، چونکە حەز لەو

چاووڕاوە ناکەم، نامەوێ ڕواڵەتبازی دەگەڵ بکەم... بەڵام لە ڕاستیدا دەبوایە ئەو کارە بکەم! باشە لێرەدا پرسیار ئەوەیە: باشە ئەو چی دەکات؟ ئەویش هەر وا ناکات؟ ئیدی بۆچی دەبێ سووکایەتیم پێ بکات، گاڵتەم پێ بکات؟ و ئەم هەموو نمایشبازیەم دەگەڵدا بکات؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسانە: لەبەر ئەوەیە من ملکەچ نابم، ڕادەستی وی نابم... بەهەرحاڵ، دەیبینین...

– باشە، پێشتر خۆشت دەویست؟

– لە سەرەتاوە، بەڵێ، بەڵام تۆبە، بەسە! هەندێ ژن تەنیا بۆ ئەوە باشن دەگەڵیان ڕابوێری، بیانکەی بە سووتلی خۆت. ئەم قسەیەم بۆ ئەوە نییە بڵێم ماشقەی من بووە. ئەگەر ئاقڵ بێت و بیەوێ بەئارامی بژی، منیش پێی ڕازی دەبم، بەڵام ئەگەر ناسازگار و نەکلۆک بێت، شەرم پێ بفرۆشێت، ئەوا منیش یەکسەر وێڵی دەکەم، پارەکەی دەبەم و دەڕۆم. نامەوێ ببم بە گەپجاڕی خەڵکی، ئەوەم لە هەموو شتێک لەلا گرینگترە!

میرزادە، بە پارێزەوە گوتی:

– وێڕای هەموو ئەمەش، پێم وایە ناستاسیا فیلیپوڤنا ژنێکی زیرەکە، ئەگەر پێشوەختە ئەو ترسەی هەبێ، چۆن بەو ئاسانییە دەکەوێتە داوەوە؟ خۆ دەتوانێ شوو بە پیاوێکی دی بکات. من سەرم لەم شتە سووڕ ماوە...

– ئا، هەموو سڕەکە لێرەدایە! تۆ هەموو شتێک نازانی میرزادە... سڕەکە لێرەدایە.. ئەو دڵنیایە کە من تا ڕادەی شەیدایی خۆشم دەوێ، سوێندت بۆ دەخۆم کە ئەوە قەناعەتیەتی... دەزانی چییە؟ پێم وایە ئەویش بە شێوازی خۆی خۆشی دەوێم. وەک دەڵێن: سزای شەیدایان زۆر قورسە. ئیدی بەو پێودانگە، بە خەیاڵی خۆی بە درێژایی تەمەنی بە ئەسیر و دیلی خۆیم دەزانێ و عەزابی ڕوحم دەدات (ڕەنگە پێویستی بە کەسێکی وا بێت)، بەڵام لە هەمان کاتا بە شێوازی خۆی هەر خۆشی دەوێم. خۆی بۆ ئەمە ئامادە دەکات، ئیدی تەبیعەتی وایە، تەبیعەت دەرمانی نییە. باوەڕ بکە ژنێکی ڕووسی تەواو عەیارە. باشە، منیش براتم، دەزانم چی دەکەم، حیسابی خۆم کردووە. ئەو بەرخوردەی من دەگەڵ ڤاریادا ڕێکەوتەکی و ڕەوتەنی بوو، بەڵام بە ڤازانجی من شکایەوە. ناستاسیا بە چاوی خۆی بینیی کە

چەنــد پابەنــدی ئەوم و چــۆن ئامــادەم لەبــەر خــاتری ئەو هــەموو پەیوەندییەکانی دیکەم ببڕم. کەواتە بۆت دەر کەوت کە منیش بەو ڕادەیە ساویلکە نیم کە بەئاسانی کەر بکرێم، باوەڕ بکە کەس گەوجی نەکردووم. ڕەنگەوا بزانی زۆر چەنەبازم. میرزادەی ئازیز، ڕەنگە من هەڵە بم کە ئەم هەموو متمانەیەم بە تۆ هەیە و بەم جۆرە گرێی دڵی خۆمت بۆ دەکەمەوە... لەبەر ئەوەیە تۆ یەکەم مرۆڤی بێ غەلوغەش، بێ شێلەوبێلەی کە لە ژیانما دیتوومیت! بۆیە داوای بوردن دەکەم کە پێتا هەڵشاخیم، تکایە لێم مەگرە! هیوادارم لێم زیز نەبووبیت و لە دڵی نەگریت. بۆ دوو ساڵ دەچێت، کە ئەمە یەکەم جارمە بەو جۆرە، گرێی دڵم کردووەتەوە، بەبێ پەردە قسەم کردووە. خەڵکی مەردانە و ئابڕوومەند لێرە کەمن، پێتیسن شەریف تریننیانە. لەوە دەچێ پێکەنینت بێ؟ پێکەنینت نایە؟ چما نازانی خەڵکی شەلاتی و سەرسەری، پیاوی شەریفیان زۆر خۆش دەوێ؟ تو ویژدانت، بودەڵەیی و چروکی من لە چدایە کە هەمووان بە چاولێکەری ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە بودەڵە و چروکم دەزانن؟ تەسەور بکە، ئەوەندەیان ئەو وشانە بە گوێدا داوم، خەریکە لێم دەبن بە ڕاست و بە خۆیشم خۆم بە بودەڵە و چروک بزانم، لە ڕاستیدا ئەوە سووکییە. ئەوە چروکییە!

میرزادە گوتی:

– من یەک لە باری خۆم چیتر بە سووک و چروکت نازانم. ئەلهەقی تۆزێ لەمەپێش، بە سووکی سووکم دەزانیت، بەڵام باش بوو ئەو گومانەت لا سڕیمەوە، خۆشحاڵت کردم. ئەمە دەرسێکی باش بوو بۆ من، کە لە ئاییندەدا بە خۆڕایی و پێشوەختە و بە نەشارەزایی حوکم لەسەر خەڵکی نەدەم، ئێستا بۆم دەر کەوت کە تۆ نە سووک و چروکیت و نە بودەڵە و خوێڕیت، بە بۆچوونی من تۆ مرۆڤێکی زۆر ئاساییت، بەڵام هەندێک بێئیرادەیت.

گانیا، بزەیەکی تاڵی بۆ کرد، بەڵام هیچی نەگوت. میرزادە هەستی کرد، بۆچوونەکەی بە دڵی گانیا نەبوو. تۆزێک بە خۆیا شکایەوە و ئەویش بێدەنگی لێ کرد.



گەمژە

گانیا، لەپڕ پرسیی:

- بابم تا ئێستا داوای پارەی لێ کردوویت؟

- نەخێر.

- هەڵبەتە داوات لێ دەکات، بەڵام مەیدەیە. لەبیرمە کاتی خۆی پیاوێکی ماقوڵ بوو، پیاوی ناو پیاوان بوو، پیاوی کۆڕو مەجلیسی پیاوماقوڵان بوو. سەیرە! ئەم پیاوە ماقوڵانە چەند زوو، چەند بەخێرایی لێ دەکەون. هەرکە بە ئاستەم تووشی کێشەیەک بوون و هەلومەرجی ژیانیان گۆڕا، ئیدی دەکەون و لێ دەبنەوە، دەبن بە دووکەڵ و با دەیانبات! باوەڕ بکە کاتی خۆی پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، وەکو ئێستا درۆزن نەبوو! تۆ تەمەشا ڕۆژی بە چ ڕۆژگارێ گەیشتووە! هەڵبەتە هۆیەکەشی مەیخۆریە. دەزانی ماشقەیەکیشی هەیە؟ هەنوکە، درۆزنێکی ئاسایی و بێوەی نییە. من نازانم دایکم چۆن تەحەمولی دەکات! باسی گەمارۆی (قارس)ی بۆ تۆ کردووە؟ ئەی باسی ئەسپە شێیەکەی بۆ کردوویت کە وەکو مرۆڤ کەوتووەتە قسە و هاتووەتە زمان؟ یانی کاری گەیشتووەتە ئەو ورێنانە.

گانیا، بەدەم ئەو قسانەوە لە قاقای پێکەنینی دا، ئەوجا لە میرزادەی پرسیی:

- بۆچی ئاوا تەمەشام دەکەیت؟

- سەرم لە پێکەنینە بە کوڵ و بە دڵەکەی تۆ دەسوورمێ، هێشتا دەتوانیت وەکو منداڵێک پێبکەنی، بە هەمان پاکی و بێگەردی منداڵێک پێبکەنی. تۆزێ لەمە پێش کە هاتیە ژوورەوە تائاشتم بکەیتەوە، گوتت: "بێم دەست ماچ بکەم؟" منداڵیش کە داوای بوردن دەکات، ڕێک وا دەکات. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕوحی تۆ هێشتا پاکە، نە لەوتاوە، ئەو کار و قسانە تەنیا لە خەڵکی ڕوح پاک دەوەشێتەوە! کە ئەوە حاڵتە، ئیدی بۆچی خۆت لەو چیرۆکە گومانلێکراوەوە گلاندووە، چیرۆکی هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ. بە ڕاستی کارێکی پووچە، هەرچی بیری لێ دەکەمەوە نە باوەڕ دەکەم و نە ئەقڵم دەیبڕێت.

- باشە، تۆ مەبەستت چییە؟





- پرسیاری من ئەمەیە ئایا تۆ پەلە ناکەیت؟ باشتر نییە، پێشتر بیری لێ بکەیتەوە؟ لەگینە هەق بە ڤارڤارا ئاردالیونوڤنای خوشکت بێ...

گانیا، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ها... دەرسی ئەخلاقم دادەدەی!... من دەزانم هێشتا منداڵم. ڕەفتارم منداڵانەیە... باشترین بەڵگەش ئەمەیە کە من ئەم باسەم لەگەڵ تۆدا کردەوە

.

ئەوجا، گانیا، وەکو گەنجێک کە غرووری بریندار کرابێ و بیەوێ پاکانە بۆ خۆی بکات، لەسەری ڕۆیشت:

- بەڵام میرزادە، من تەنیا بە تەماحی پارەوپول، مل بۆ ئەم زەماوەندە نادەم. ئەگەر وا بوایە حیساباتەکەم هەڵە دەردەچوو، چونکە من هێشتا لە ڕووی ئەقڵی و کەسێتییەوە ماومە، پوختە و کارامە نیم. من هاندەرێکی دەروونی گەورە بۆ ئەم کارەم هان دەدا، ئارەزوویەکی هەوسار پچڕیو هانم دەدا، چونکە ئامانجێکی گەورە و ستراتیژیم داوەتە چاو. ڕەنگەوا زەن ببەی هەر کە هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکەم وەر گرت، یەکسەر گالیسکەیەک بۆ خۆم بکڕم، ئەم پاڵتۆ کۆنە کە سێ دانە ساڵە لەبەرمایە فڕێ بدەم و یەکێکی تازە بکڕم، چیتر هاتوچۆی یانە نەکەم و پەیوەندیی دەگەڵ دۆستانی یانەم ببڕم. نا شتی وا ناکەم. خەڵکی پشوودرێژ و کۆڵنەدەر لە وڵاتی ئێمەدا زۆر کەمن، هەرچەندە زۆربەیان، ڕوحیان، ڕوحی سووتخۆرانە! بەڵام من کۆڵنادەم، ڕێگایەکە و تا نەگەمە ئامانج بەری نادەم، گرینگ ئەوەیە پیاو ڕێگەیەکی گرتە بەر کۆڵ نەدات تا دەگاتە ئامانج. ئەمە فەلسەفە و بۆچوونی منە! پتیتسن، تا هەڤدە ساڵیش، لە شەقام و کۆڵانان دەنووست، قەڵەمبڕ و چەقۆی دەفرۆشت. بە دەستمایەیەکی چەند کوپیکییەوە دەستبەکار بوو، ئەمڕۆکە خاوەنی شەست هەزار ڕۆبڵە، بەڵام دوای ڕەنجێکی زۆر، مەگەر خوا بزانێ چەند لەو پێناوەدا ماندوو بووە، چەندی زەحمەت کێشاوە! من دەتوانم بەبێ زەحمەت و ڕەنج، یەکسەر، بە دەستمایەیەکی گەورەوە بێمە مەیدان و دەستبەکار ببم. هەمووی پازدە ساڵ نابات، کە خەڵکی لە دوورەوە بمبینن، ئاماژەم بۆ دەکەن: "ئەم

ئیڤولگینە، بەقەد پاشایەکی جوولەکەی هەیە!" تۆ دەڵێی من بێئیرادەم، ڕەسەنایەتیم تیا نییە، دوورم لە هەر بەهرە و توانایەکی تایبەتی، بەڵام میرزادەی ئازیز، ئەوە بزانە کە لەم سەردەم و ڕۆژگارەی ئێمەدا ناخۆشترین شت ئەوەیە بە کەسێک بڵێی، بێئیرادە، دەستوپێ سپی، بێ بەهرە و توانای تایبەتی، پێی بڵێی پیاوێکی ئاساییە. تۆ تەنانەت ئەوە شت پێ ڕەوا نەبینیم کە بە تاوانکارێکی ماقولیشم بژمێری. بۆیە، خوام نەما، چیوای نەما، پەلامارت بدەم. پڕ بە دڵ حەزم دەکرد حەسیرمەیانێکی چاکت بکەم. تۆ زۆر لە یەپانچین، زیاتر ئەزیەتت دام. ئەو یەپانچینەی کە (بێ ئەوەی دەری ببڕێ، بەڵام لە دڵی خۆیدا بەتەمایە، هەڵبەتە ئەمەشی لە ساویلکەییە، بێ ئەوەی هەوڵ بدات ناخی من بخوێنێتەوە) من ژنەکەمی پێ بفرۆشم، تۆ لەوەش زیاتر ئەزیەتت دام، جا هاوڕێ گیان من لەمێژە بەمەوە دەتلێمەوە، بۆیە من پێویستیم بە پارەیە. هەموو ئاوات و ئامانجێکم بووە بە پارە. هەر کاتێ بووم بە خاوەن پارە، باوەڕ بکە دەبم بە کوڕێکی دی، قەدر و حورمەتێکی دی پەیدا دەکەم! قۆڕی پارە لەوەدایە تەنانەت تواناو بەهرە و ڕەسەنایەتییشت بۆ پەیدا دەکات! تا دنیاش دنیایە ئەمە هەر وا دەبێ و وا دەمێنێ. ڕەنگە بڵێی ئەمە قسەیەکی منداڵانەیە، خەیاڵی شاعیرانەیە. کێشە نییە، ئەگەر پارەیەک، ببێتە مایەی بەختەوەریم، عەیبی چییە؟ تازە من ئەم ڕێگەیەم گرتووە، خۆم تاقی دەکەمەوە و دەیگەیەنمە سەر. وەکو دەڵێن ئەوەی لە دواییا پێبکەنێ، زیاتر پێدەکەنێ. باشە یەپانچین بۆچی ئەو ڕەفتارە ناشیرینە دەگەڵ مندا دەکات؟ دژمنمە؟ نەخێر، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە هیچ حیسابێک بۆ ڕووتەیەکی وەکو من ناکات، کێ حیساب بۆ خەڵکی نەدار و بێ پارە دەکات! هەر ئەوەندەم زەحمەتە تا دەبم بە خاوەن پارە، ئیدی ڕۆژی منیش دێت... وا دیارە درەنگە، کولیا دوو جاران سەری کێشا، ڕەنگە بیەوێ بۆ نانخواردنت بانگ بکات. من ئیدی دەڕۆم... جار جار سەرت لێ دەدەم. خەمت نەبێ لێرە، لە ماڵی ئێمە بێتاقەت نابیت، دەبی بە کوڕی ماڵەکە، لە ئێستاوە بوویت بە ئەندامێکی خێزانەکە. ئاگات لێبێ زیزم نەکەیت، پێم وایە یا دەبین بە دۆست یان بە دژمن. میرزادەوای دابنێ،

وەکو بە دڵ پێشنیازم کرد کە دەستت ماچ بکەم، دەستم ماچ کردبای، لەسەر ئەوە دەبوویت بە دژمنم؟

میرزادە، پاش ڕامانێکی کورت، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- بێگومان! بەڵام نەک بۆ هەمیشە، بەڵکو بۆ ماوەیەک، چونکە نەتدەتوانی درێژە بە دژمنایەتیی خۆت بدەی، بێگومان دەتبەخشیم.

گانیا گوتی:

- ها... ها!... پیاو لەگەڵ تۆدا، دەبێ زۆر ئاگای لە خۆ بێ. لێرەشا، پەلاری خۆت وەشاند. کێ چوزانێ! لەوەیە دژمنی من بیت! ئەرێ بە ڕاست، ها، ها، ها لە بیرم چوو: تۆزێ لەمە پێش وام بە خەیاڵا هات کە ناستاسیا فیلیپوڤنات زۆر بە دڵ بوو، وایە؟

- بە... لێ!

- حەزت لێیەتی؟

- نـ... نا!

- کەچی سوور بوویتەوە، نارەحەت دەتبینم. دەی گوێ مەدەیە. نامەوێ پێت ڕابوێرم. ئایا دەزانی ئافرەتێکی داوێنپاکە؟ باوەڕ دەکەی؟ ڕەنگە پێت وا بێ قەپاتمەی یارۆ، توتسکی بێت؟ هەرگیز شتی وا نییە! تا ئێستا وا نەبووە. نەتدەبینی هەندێ جار دەپەشۆکا و شەرمی دەکرد، ئەوە حەقیقەتەکەیەتی. ئیدی ئەو جۆرە کەسە زاڵ تەبیعەتن. دەی باشە. خودا حافیز.

گانیا، زۆر بەپەلە و گورجی وەدەر کەوت، کە دەر چوو خۆشحاڵتر بوو لەوسای کە هاتبووە ژوورەوە.

لێ میرزا، نزیکەی دە دەقیقەیەک، بێ جووڵە لە فکران ڕاچوو، کولیا، دیسان، لە دەرگاکەوە سەری کێشا. میرزادە گوتی:

- کولیا گیان من شێو ناخۆم، نیوەڕۆ نانێکی باشم لە ماڵی یەپانچین خوارد.

کولیا، وەژوورکەوت. نامەیەکی دایە دەست میرزادە، نامەیەکی قەد و نوشتکراو بوو بە ئیمزای جەنەراڵەوە. سیمای کولیا، بەئاشکرا ئەوەی

نیشان دەدا کە چەند ئەم نامە گەیاندنەی لەبەر گرانە. میرزادە نامەکەی خوێندەوە، هەستا و کڵاوەکەی هەڵگرت.

کولیا، بە نیگەرانی و شەرمەزاری گوتی:

– نزیکە، دوور نییە. باوکە لەسەر مێزێک دانیشتووە و قاپێ مەیی لەبەردەم خۆی داناوە. نازانم چۆن توانیویەتی قەناعەتیان پێ بکات کە بە قەرز مەشروبی بدەنێ. میرزادە گیان تکایە با کەس بەم نامەیە، با دایک و خوشکەکەم نەزانن کە من بۆم هێناویت. هەزار و یەک سوێندم خواردووە کە قەت نامەی ئەو نەگەیەنم، بەڵام چ بکەم دڵم بە حاڵی دەسووتێ. بەزەییم پێیدا دێتەوە. تکات لێ دەکەم ڕووی مەدەیە، هەر تۆزێ پارەی بدەیە و وازی لێ بێنە، بەتەمای وەرگرتنەوەشی مەبە.

– کولیا گیان، من خۆشم هەر وام نیاز بوو، پێویستە بۆ ئیشێکی تایبەتی بابت بدینم... فەرموو بابڕۆین!...

پەراوێز:

* – دەمامک: شانۆنامەیەکی لیرمانتوفە کە لە تەمەنی هەرزەکاریدا نووسیویەتی.

## فەسڵی دوازدەیەم

کولیا، میرزادەی برد بۆ "گازینۆ- بلیارد" کە نزیکی ماڵەکەیان بوو، پێش ئەوەی بگەیتە شەقامی لیتانیایا، لەژێر خانێکدا بوو لە سەر ڕێگاکە. بە دەستە ڕاستا، لە ژوورێکی چکۆڵەی تایبەتیدا، ئاردالیون ئالکسدروفیچ، لەپشت مێزێکەوە وەکو مشتەرییەکی هەمیشەیی، دانیشتبوو و قاپێ مەشروبی لەبەردەما دانرابوو. نوسخەیەکی ڕۆژنامەی "خۆیبوونی بەلچیکی"ی بە دەستەوە بوو، خەریک بوو دەیخۆێندەوە. چاوەڕوانی میرزادەی دەکرد. هەر کە ئەوی بینی، ڕۆژنامەکەی لە لایەکەوە دانا و سەری قسە و باسێکی دوورودرێژی دامەزراند، کە میرزادەی شتێکی ئەوتۆی لێ حاڵی نەبوو، چونکە جەنەراڵ، لە ڕاستیا مەستی مەست بوو. میرزادە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ئەسکەناسی دە ڕۆبڵیم پێ نییە، بەڵام دانەیەکی بیست و پێنج ڕۆبڵیم پێیە، دەتدەمێ، وردی بکەوە و پازدە ڕۆبڵم پێ بدەوە، دەنا پەکم دەکەوێ، چونکە یەک ڕۆبڵی دی شک نابەم!

- ئا... بێگومان.. بێگومان، خەمت نەبێ هەر ئێستا وردی دەکەمەوە.. هەر ئێستا!...

- باشە جەنەراڵ، شتێک هەیە حەز دەکەم لێتی بپرسم. قەت هاتوچۆی ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنات کردووە؟

جەنەراڵ، بەوپەڕی خۆنوێنی و خۆهەڵکێشان و بەخۆفشینەوە گوتی:

- من؟ من و نەچوو بم؟ ئەمە چ پرسیارێکە؟جارە های جار گیانی من، جارە های جار! بەڵام ئەنجام هاتوچۆم لەگەڵی بڕی، چونکە حەز ناکەم بە هۆی هاتوچۆی منەوە، زەماوەندێکی نابەجێ و ناپەسند دروست ببێ. تۆ بە خۆت بینیت، لەوێ بووی کە ئەمڕۆکە ئەوەی لەسەر بابێک بوو- هەڵبەتە بابێکی نەرمونیان و لیبرال- کردم، بەڵام لەمەودا و بابێکی دیکە دێتە مەیدان، هەنگێ دەر دەکەوێ کە خوا بە کێی دەدا، ئایا جەنگاوەرێکی دێرینی تەواو عەیار، سەر دەکەوێ و ئەم پیلانە پووچەڵ دەکاتەوە، یان ژنێکی ئەهلی ڕابواردنی بێحەیا و حورمەت، تێکەڵاوی خانەوادەیەکی ڕەسەن و نەجیب دەبێت!

- دەمویست بپرسم. ئایا تۆ بەو حیسابەی دەیناسیت و هاتوچۆت لەگەڵی هەبووە، دەتوانی ئەمشەو من بگەیەنیتە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا؟ زۆر زەرورییە ئەمشەو لەوێ بم، چونکە هەر دەبێ بیدینم، بەڵام نازانم چۆن بۆ ئەوێ بچم. دروستە ئەمڕۆ تەعاروفم دەگەڵی کرد، بەڵام دەعوەتی ئاهەنگەکەی ئەمشەوی نەکراوم. ئامادەم، هەر بەو مەرجەی بتوانم، بە هەر شێوەیەک بووە بگەمە ئەوێندەر، ئەگەر بووم بە گەپجارییش، هەندێ ئەتەکێت و دابونەریتان لە بن پێیان بنەم.

جەنەراڵ، زۆر بەگەرمی گوتی:

- دۆستی گەنجم، تۆش ڕێک وەکو من بیر دەکەیەوە، هەر دەڵێی لە دڵی مندایت.

ئەوسا، پارەکەی هەڵگرت، لە بەرکی ناو لەسەری ڕۆیشت:

- من کە ناردم بە شوێنتا زەحمەت بکێشیت و بێی بۆ ئێرە، لەبەر ئەم تۆزە پارەیە نەبوو! بەڵکو بۆیە بە شوێنما ناردیت، تا بە دوو قۆڵی، هێرش بکەینە سەر ناستاسیا فیلیپوڤنا، یان بە گوتەیەکی دی بە دوو قۆڵی ڕووبەڕووی ببینەوە! جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین! ئەوجا بزانە ئەم هەڤپەیمانییەی ئێمە چ کاریگەرییەکی دەبێت! بە ناوی ئەوەوە کە بە بۆنەی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایکبوونیەوە، سەری دەدەم، بزانە چۆن ویستی

خۆم، هەڵبەتە ڕاستەوخۆ نا، بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، دەسەپێنم. هەنگێ گانیا دەکەوێتە سەر دوو ڕیانێک: یان دەبێ بابە بەڕێز و حورمەتەکەی هەڵبژێرێ یان... یارۆ... ئیدی چ دەبێ با ببێ! بیرکردنەوەکەت زۆر باشە. سەعات نۆ دەکەوینە ڕێ، هێشتا زووە.

- باشەماڵی ناستاسیا لەکوێیە؟

- لێرەوە دوورە، نزیکی ئۆپرای گەورەیە، لە ئەپارتمانەکەی میتوفسوفە، ئەوەی دەڕوانێتە سەر مەیدانەکە، لە قاتی یەکەمدایە... هەرچەندە ئەمشەو جەژنی لەدایکبوونیەتی، بەڵام میوانی زۆر نابێت، زۆر زوو دەڕۆن.

بەتڵێکی شەو بوری، میرزادە هێشتا دانیشتبوو و بەدەم چاوەڕوانییەوە گوێی لە جەنەراڵ دەگرت. کە لێکدا لێکدا سەری حیکایەتێکی تازەی دەکردەوە و هیچیانی تەواو نەدەکرد. کە میرزادە گەیشتبووە ئەوێندەر، جەنەراڵ قاپێکی تازەی داواکردبوو، دوای یەک دانە سەعات ئەوجا تەواوی کرد... دوای ئەوە داوای قاپێکی دی کرد، هەڵبەتە ئەویش سەعاتێکی بردووە، جا وەرە بیهێنە بەرچاوی خۆت، چۆن جەنەراڵ، بەدەم خواردنەوەوە، هەموو سەربهووردی خۆی بۆ میرزادە گێڕاوەتەوە. ئەنجام میرزادە ڕابوو و گوتی ناتوانێ لەوەی پتر چاوەڕوان بکات... هەنگێ جەنەراڵ، دوا چۆڕی قاپەکەی هەڵدا، هەستا و بە لارەلار بەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیشت. میرزادە بە ڕادەیەک پەست و بێزار بووبوو، لە داخا کەوتە لۆمەی خۆی کە چ گەوجانە ڕیشی خۆی داوەتە دەست جەنەراڵ و باوەڕی پێ کردووە، هەرچەندە قەت نە باوەڕی بە جەنەراڵ هەبوو و نە ڕیشی خۆی دابووە دەستی، تەنیا دەیویست لە ڕێگەی ئەوەوە خۆی بگەیەنێتە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئیدی چ بزانێ جەنەراڵ تووشی ئەم بەزمەی دەکات. جەنەراڵ فول سەرخۆش بوو، ئیدی زمانی پژابوو ئەمما پژان، لە یەکبینە، بێ وەستان، بە دەنگێکی گریان ئامێزەوە، قسەی دەکرد، گلەیی ئەوەی دەکرد کە سەرچاوەی هەموو بەدبەختییەکی خۆی و خانەوادەکەی، بەد ڕەفتاری ماڵ و منداڵەکەیەتی و کاتی ئەوە هاتووە، سنوورێک بۆ ئەم هەرەس و داڕوخانە دابنێت.

ئەنجام، بە دوو قۆڵی گەیشتنە شەقامی لیتانیا. هێشتا دنیا نەی بەستبوو. بایەکی ساردی شێداری ناخۆش بە گڤ و هۆڕ خۆی بە شەقامەکاندا دەکرد. گالیسکان بەدەم ڕێوە قوڕیان دەپرژاند، تەقەی سمی ئەسپەلات، لەسەر شەقامەکان دەنگیان دەدایەوە. ڕێبواران، بە جلی تەڕەوە، بە پارێزەوە بەسەر شۆستەکاندا تێدەپەڕین. جارجاریش ڕێبوارێکی مەست تێدەپەڕی.

جەنەراڵ گوتی:

– ئەو پەنجەرە ڕووناکانەی قاتی یەکەمی ئەم ئەپارتمانە دەبینی؟. هەموو کۆنە هاوڕێ و هاوپیشەکانی من لەوێدا دەژین، من کە لەوان خزمەتم زۆرترە و لەوان پتر ڕەنجم داوە، دەبێ بە هەزار گیانە مەرگی و بە پای پیادە، بەرەو ئۆپرای گەورە، بۆ ماڵی ئافرەتێکی بەدناوی گومانلێکراو بڕۆم! پیاوێک کە سیازدە گوللەی بە سینگەوەیە!... باوەڕ ناکەیت؟ بیروگوف* لەبەر خاتری من بروسکەیەکی بۆ پاریس نارد، بۆ ماوەیەک سیڤاستوبولی ئابلوقەدراوی جێ هێشت، ئەوجا (نیلاتون)ی پزیشک باشی، پزیشکانی دەربار پاریس، بە ناوی زانستەوە، مۆڵەتی وەر گرت، کە بێت بۆ سیڤاستوبۆلی گەمارۆدراو تا معایەنەی من بکات. هەڵبەتە سەرکردایەتیی باڵا، هەموو ئاگایان لەم مەسەلەیە هەبوو: "ئاهـ ئەمە ئەو ئیڤولگینەیە کە سیازدە گوللە بە سینگیەوەیە!..." بەو جۆرە باسیان دەکردم. میرزادە، ئەو خانووەی ئەوێندەرێ دەبینی؟ جەنەراڵ، (سووکولوفیچ)ی هاوقەتاری من دەگەڵ بنەماڵە زۆر ڕەسەن و نەجیبەکەیدا، کە زۆرپەتێکی زۆری هەیە لەو خانووەدا، لە قاتی یەکەمدا، دەژی. ئەو ماڵە و سێ ماڵی دیکە لە شەقامی نفسکی و دوو ماڵی دیکە لە شەقامی مورسکایادا، سنوور و ئاقاری پەیوەندییە شەخسییەکانی منە.

نینا ئەلکسندروڤنا دەمێکە ملی بۆ ئەمری واقیع داوە، دەستی لە هەموو شتێک شۆردووە، بەڵام من هێشتا دەگەڵ بیرەوەرییەکانما دەژیم... یانی پرکێشی ئەوە دەکەم بڵێم، دەگەڵ کۆنە هاوقەتار و ژێر و دەستەکانمدا، کە هێشتا، لێم نەبێ بە درۆ، بە پەرستن دەمپەرستن، هەست بە ئاسوودەیی

دەکــەم. بــۆ نموونــە ئــەم جەنەراڵــە ســـووکولوفیچە، ماوەیــەکی زۆرە نەچوومەتــە دیــدەنی و ژنــە مێریڤانەکــەیم، ئانافیــدوروڤنام نــەدیتووە... میرزادەی ئازیز، هەڵبەتە بە خۆت دەزانی، هەر کەسێ دەرگای ماڵەکەی لە ڕووی خـەڵکی داخرابێت، نـەتوانێ پێشـوازیی خـەڵکی بکـات، ناچـار دەبێت هـاتوچۆی خـەڵکی نـەکات... بەهـەرحاڵ پێدەچێ بـاوەڕم پـێ نەکـەیت. دەڵـێم بۆچی کوڕی باشترین دۆست و هـاوڕێی منداڵیم، یـانی تۆ، بـەم خـانەوادە بــەختەوەرە نەناســێنم؟ جەنــەراڵ ئیڤــولگین و میــرزادە میشــکین!... لەوێ کچێکی یەجگار خشیک و دڵڕفێن دەبینی، نا، نا یەک کـچ نـا، بـەڵکو دووان، نـا سیان دەبینـی، کـە بـە ڕاسـتی زینـەتی کۆمـەڵگە و پایەختەکـەمانن: جـوانی، ڕۆشنبیری، مەسەلەی ژنان، شـیعر و هـۆنراوە و هـەر هـەموو ئەو شـتانەیان بـە زیـادە و تیـا دەبینـی... ئەمـە جگـە لەوەی، بـەلای کـەمەوە، هەشـتا هـەزار ڕۆبڵی کاش بۆ جیازیی هەر یەکێکیان دانـراوە... بـە هـەر حـاڵ، قسـە هـەزارە دوانی بەکارە، هـەر دەبـێ بەو ماڵـەت بناسـێنم، ئەمـە ئـەرکی سەرشـانی منـە! جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین!.

میرزادە پرسیی:

- ئا ئێستا؟ یانی بیرت چوو کە...

- نا، لـە بیرم نـەچووە، نـەخێر هـیچ شـتێکم بیر نـەچووە. فـەرموو لێرەوە وەژوور بکەوە! بەم قاڵدرمـە جوانانـەدا سـەر بکەوە. سـەیرە کـە دەرگـاوانی لـێ نییـە، یـارۆی سویسـری گـۆڕی گومـە. ئـا ئـەمڕۆ پشـووە و ئەویـش قوچاندوویـەتی. نـازانم بۆ تـا ئێسـتا ئەو هەمیشـە مەسـتەیان دەر نـەکردووە. ئــەم ســـووکولوفیچە، بــە هــەموو شــتێکی، بــە ســەروەت و ســـامان و بـەختەوەری ژیـانیەوە، بـە سـەرکەوتنی خزمـەتی سـوپاییەوە، قـەرزارباری منە، تەنیا قەرزارباری منە، بەڵام فەرموو ئەوە گەیشتین.

میرزادە، دەستی لە هەموو ئیعترازێک هـەڵگرت. ملکـەچ و گوێڕایـەڵ دووی جەنـەراڵ دەکەوت، لـە ترسـی ئەوەی نـەبا بڕەنجـێ و لێـی تـوڕە ببێـت، لـە خەیاڵی خۆیدا بە ئومێدی ئەوە بـوو کـە بەرەبـەرە جەنـەراڵ سـووکولوفیچ و خانەوادەکـەی لـە بیـر دەچێت و دەر دەکەوێ کـە ئـەم جەنەراڵـە ڕۆژێ لـە

ڕۆژان نەبووە و نییە، هەنگێ دەتوانن بە دوو قۆڵی، بەکاوەخۆ، بە قالدرمەکاندا داگەڕێن و بێنە خوارێ و ملی ڕێگای خۆیان بگرن، بەڵام کە دیقەتی دا، خەریکە ئەو چاوە ڕەشەی کاڵ دەبێتەوە زۆر نیگەران و شپرزە بوو: جەنەراڵ، وەکو کەسێک کە بە ڕاستی دۆستانی زۆری لەوێندەر هەبن، زۆر بە متمانەوە میرزادەی بە سەر قالدرمەکاندا سەر دەخست و، لە هەر هەنگاوێکدا زۆر بەوردی و بەدیقەت و ڕوونییەکی ماتماتیکانەوە، لە ژیان و وەزع و حاڵی هەر یەکێکیان دەدوا. کە گەیشتنە قاتی یەکەم، لە دەستی ڕاستدا، لە بەر دەرگای شوقەیەکی نایابدا وەستان، جەنەراڵ دەستی بۆ زەنگی دەرگاکە برد، میرزادە کەوتە بیری ئەوەی هەڵێت، بەڵام لەبەر کونجکاویی خۆی، هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی: جەنەراڵ، تۆ هەڵەی، تابلۆی سەر دەرگاکە ناوی (کولاکوف)ی لەسەرە، بەڵام قەرار بوو تۆ دیدەنی سووکولوفیچ ناوێک بکەیت.

جەنەراڵ گوتی:

- کولاکوف؟... کولاکوف هیچ مانایەکی نییە. من کولاکوف هەر بە بەشەریش نازانم. ئەمە ماڵی سووکولوفیچە و من لە زەنگی ماڵی سووکولوفیچ دەدەم... ئا ئەوەتا وا هاتن دەرگا بکەنەوە.

بە ڕاستی دەرگا کرایەوە، پێشخزمەتێک لە دەرگاوە سەری کێشا و گوتی خاوەن ماڵ، بە خێزانی چوونەتە دەرەوە.

ئاردالیون ئالکسندروفیچ، بە خەمبارییەکی زۆرەوە چەند جارێک دووبارەی کردەوە:

- حەیفێ، بە ڕاستی حەیف کە لەم ڕۆژەدا چوونەتە دەرێ! لە بەدبەختیی منە!

ئەوجا ڕووی کردە پێشخزمەتەکە و گوتی:

- گیانە، ئەگەر هاتنەوە، بڵێ جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین هاتبوون بۆ دیدەنی و ئەحواڵپرسی، ڕێز و حورمەتی زۆریان هەبوو، زۆریان پێ ناخۆش بوو کە لە ماڵ نەبوون...

ڕێک لەو دەمەدا، کەسێکی دی، لەپشت دەرگا کراوەکەوە دەر کەوت، کە

پێدەچوو کارەکەر یان مامۆستای تایبەتی بێ، خانمێک بوو لە تەمەنی دەوروبەری چل ساڵیدا، جلێکی ڕەشی ڕەشی لەبەردا بوو، کە گوێی لە ناوی جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین بوو، بە دوو دڵی و کونجکاوییەوە هاتە پێشەوە، بەدەم تەمەشاکردنی جەنەراڵەوە گوتی:

– ماریا ئەلکسندروڤنا لە ماڵ نییە، دەگەڵ ئەو کچە گەنجەدا، دەگەڵ خانم ئالکسندرا میخائیلوڤنادا چووە بۆ ماڵی داپیرەی.

– یانی ئەلکسندرا میخائیلوڤناش ڕۆیشتووە؟ تەمەشا، لەو بەدبەختیە! تکایە بە ئەرک نەبێ، ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتم بگەیەنە خزمەتی ئالکسندرا میخائیلوڤنا، هیوادارم بیرت نەچێت... پێی بڵێ من پڕ بەدڵ، لە کانگای دڵمەوە هیواخوازم ئەو ئاواتانەی بێنە دی کە شەوی پێنجشەممە بەدەم گوێگرتنەوە لە مۆزیکی چۆپان، بە ئاواتی دەخواست. بیرت ناچێ!... ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی پێ بگەیەنە! جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین!

خانمە ڕەشپۆشەکە، کە هێور بووبووەوە گوتی:

– نا بیرم ناچێت، پێی دەڵێم!

لە کاتێکا کە بە قاڵدرمەکاندا دادەگەڕان، جەنەراڵ کە هێشتا جۆشوخرۆشی دانە مردبووەوە، داخ و کەسەری ئەوەی دەخوارد کە کەس لە ماڵ نەبووە و میرزادە، لە دیدار و ناسینی ئەو خەڵکە میهرەبانە بێبەش بووە.

– دەزانی، من بە تەبیعەت کەمێ شاعیرم؟ هەستت بەوە کردووە؟

ئەوجا، لەپڕ و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوتی:

– بەڵام، بەڵام وا بزانم لێمان تێک چووبوو. ئێستا بیرم دەکەوێتەوە کە خانەوادەی سووکولوفیچ لە ئەپارتمانێکی دیدا دەژین، پێم وایە هەنوکە لە مۆسکۆ بن. بەڵێ من بەهەڵە چووبووم، بەڵام دەی... گرینگ نییە!

میرزادە، مات و حەیران گوتی:

– من دەمەوێ یەک شت بزانم. ئایا دەبێت بە تەواوەتی واز لە تۆ بێنم؟ باشتر نییە خۆم بە تەنێ بڕۆم؟

- واز بێنی؟ باشتر؟ بە تەنێ؟ بەڵام بۆچی لە کاتێکا شتەکە بەلای منەوە زۆر گرینگە، چارەنووسی خانەوادەکەمی پێوە بەندە، تۆ ئەو کارە بکەیت؟ نا، برادر! تۆ (ئیڤولگین)ت باش نەناسیوە. هەر کەسێک پاڵ بە ئیڤولگینەوە بدات وەکو ئەوەیە پاڵی بە کێوەوە دابێت. "کە پاڵت دا بە ئیڤولگینەوە یانی پاڵت داوە بە کێوەوە" کە یەکەم جار پەیوەندیم بە سوپاوە کرد و چوومە فەسیلی سوارە، وایان دەگوت، بەڵام دەبێ، پێش ئەوەی بۆ ئەوێندەر بڕۆین، لەسەر ڕێگای خۆمانەوە سەری ماڵێک بدەم کە چەند ساڵێکە، لە دوای دادگایی و بوختانەکانەوە، هەر کاتێ گیرۆدەی مەینەتی و تەنگانەیەک دەبم، ڕوحم لەوێ دەهێورێ و ئارام دەگرێت...

- دەتەوێ سەری ماڵی خۆتان بدەیت؟

- نا، دەمەوێ سەری خانم تیرنتیف بدەم، کە بێوەژنی کاپتن تیرنتیف بوو، کاپتن تیرنتیف، کاتی خۆی ژێر دەست و بگرە دۆستم بوو. لەوێ، لە ماڵەکەی خانم تیرنتیفدا، ڕوحم تازە دەبێتەوە، لەوێ هەرچی خەم و پەژارەی ڕۆژانە و خانەوادەییم هەیە، فڕێی دەدەم، لە بیری دەکەم. جا چونکە ئەمڕۆ بارێکی دەروونی قورسم بەسەر شانەوەیە، ڕوحم ئۆقرەی لێبڕاوە، من...

میرزادە، لە بن لێوانەوە پرتاندی:

- وا بزانم، کەرێتییەکی گەورەم کرد، کە بێزارم کردیت... جا تۆ ئێستا... بەهەرحاڵ خودا حافیز!

جەنەراڵ هاواری کرد:

- مەحاڵە، کوڕی باش، چۆن دێڵم هەر وا سووک و ئاسان بڕۆیت! ئەم بێوەژنە، ئەم سەرگەورەی خێزانە، دەزانێ چۆن بۆم دەبێ بە مۆسیقا و سەرانسەری بوونم، بە ئاواز ئاوەدان دەکاتەوە! زۆرم پێناچێت، هەر پێنج دەقیقەم پێدەچێت. ئیدی ئەوێ بۆ من وەکو ماڵی خۆم وایە. پشوویەک دەدەم، دەستێک بە خۆمدا دێنم و ئەوسا دەتوانین بە گالیسکە بۆ مەیدان ( ئۆپرای گەورە) بڕۆین. باوەڕ بکە، من بە درێژایی (شەوبێری)یەکە پێویستم بە تۆیە. تەمەشا. ئەوە گەیشتین. ئەمە ماڵەکەیە. ئا... کولیا، تۆش لێرەی؟





مارتا بوریسوڤنا لە ماڵە، یان تۆش تازە گەیشتووی؟ کولیا، کە لای دەرگای حەوشە و لەنێو حەوشەکەدا تووشیان بووبوو، گوتی:

- نا! من! دەمێکە لێرەم. لای ئیپولیت بووم، حاڵی خراتر بووە، ئەم بەیانییە لە جێگا نەهاتوەتە دەرێ، دابەزی بووم تا دەسێ وەرەق بکڕم.

کولیا، کە دیقەتی وەستان و ڕێکردنی بابی دا و بینیی حاڵی بێ حاڵە، هاواری کرد:

- باوکە ئەوە چییە! وەزع و حاڵێکی سەیرت هەیە! بەهەرحاڵ فەرموو با سەر بکەوین!

ئەم دیتنەی کولیا، میرزادەی ناچار کرد بەگەڵ جەنەراڵ بکەوێت و سەرێکی ماڵی بوریسوڤنا بدات، بەڵام لە یەک-دوو دەقیقە پتر لەوێ ماتەڵ نەبێت. میرزادە پێویستی بە کولیا بوو. لێبڕا بوو بە هەر نرخێ بووە جەنەراڵ جێ بێڵێ. زۆر پەشیمان بوو لەوەی پشتی بە جەنەراڵ بەستبوو. ماوەیەکیان پێ چوو تا بەدەم سەرکەوتنەوە گەیشتنە قاتی سێیەم.

کولیا، بەدەم سەرکەوتنەوە لە باوکی پرسیی:

- دەتەوێ میرزادەیان پێ بناسێنی؟

- بەڵێ، گیانەکەم، دەمەوێ بیناسێنم: جەنەراڵ ئیڤولگین و میرزادە میشکین... ئەدی مارتا بوریسوڤنا چۆنە؟

- دەزانی باوکە؟ باشتر وایە نەچی بۆ لای. بەرد بە با دەکات!

سێ دانە ڕۆژە خۆتت نیشان نەداوە و ئەویش چاوەڕوانی پارە دەکات. بۆچی بەڵێنی پارەت داوەتێ؟ تۆ هەمیشە هەر وایت، بەهەرحاڵ، فریای خۆت بکەوە و تەگبیری حاڵی خۆت بکە!

لە قاتی سێیەمدا، لە بەر دەرگایەکی نزم وەستان. جەنەراڵ کە بە ئاشکرا هەراسان بووبوو، میرزادەی خستە پێش خۆی و لە بن لێوانەوە گوتی:

- من خۆم دەدەمە پاڵ تۆ، دەمەوێ غافڵگیری بکەم!

کولیا، یەکەم جار وەژوورکەوت. ئافرەتێک کە سوراوسپیاوێکی تۆخ تۆخی کردبوو، بە جووتێ نەعلی کۆن و چاکەتێکی یەخە فەرووی دەڵبەوە، کە قژی لە شێوەی وردە پرچدا بادا بوو، تەمەنی نزیکەی چل ساڵێک دەبوو هاتە بەردەرگا. هەرکە چاوی بە جەنەراڵ کەوت، دایە بەر دەمڕێژی جنێو:





- خۆیەتی، هەمان مێردەکی نەگریس و بێفەڕە! دڵم خەبەری دابوو کە دێت...

جەنەراڵ، بەدەم بزەیەکی دەستکردەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:

- بابچینە ژوورەوە، گوێ مەدەیە، ئەمە هیچ نییە!

بەڵام وا نەبوو، هەر کە مەدخەلە تاریک و نزمەکەیان بڕی، چوونە ژوورێکی تەنگی باریکەوە، نیو تاقم کورسیی حەسیری و دوو مێزی قوماری تیا بوو، کەیبانۆی ماڵ بەدەم پەڵمەگریانەوە کەوتە گلەیی و گازاندە و گوتی:

- شەرم ناکەی؟ لەخۆت تەریق نابیتەوە، هەی زاڵمی غەداری بێرەحم؟ دارونەدارت بە تالان بردم، خوێنت مژیم، خستمتە سەر ساجی عەلی، بەس نییە؟ ئاخر تاکەی تەحەمولت بکەم هەی بێشەرەفی بێ شەرم و حەیا؟

جەنەراڵ، پەشۆکاو و شپرزە، سەرسام و حەپەساو، بەدەم لەرزینەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

- مارتا بوریسوڤنا، مارتا بوریسوڤنا! ئەمە... ئەمە میرزادە میشکینە. جەنەراڵ ئیڤۆلگین و میرزادە میشکین!

خات تیرنتیف، لەناکاو ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- باوەڕ دەکەی؟ باوەڕدەکەی ئەم مێردەکە، ئەم بۆرە پیاوە، ئەم گۆساخە، غەدری لە منداڵە هەتیوەکانیشم کردووە؟

هەرچیم هەیە تالانی کردووە، دزیویەتی، بردوویەتی فرۆشتوویەتی یان لە بارمتەی داناوە. خستوومانیەتێ سەر ساجی عەلی. ئاخر من چی لەم پسوولانەی تۆ بکەم، بە کەڵکی چی دێت، هەی خاپینۆکی بێئینساف؟ وەڵامم بدەوە، هەی خوێڕی، خوێنمژ! وەڵامم بدەوە، هەی مشەخۆری بێفەڕ، پێم بڵێ چی دەرخواردی منداڵە هەتیوەکانم بدەم؟ هەمیشە بەم حاڵەوە دێت، ئەوەندە مەستە خۆی بە پێوە ناگرێت! ئاخر نازانم چ خەتایەکم کردووە کە خوا ئەم غەزەبەی لێ گرتووم؟ هەی نەگریسی بێفەڕ، دزی خوێڕیی نەفسنزم! وەڵامم بدەوە.

جەنەراڵ، وەکو کە و چوو، بە زەبوونی گوتی:

- مارتا بوریسوڤنا، بگرە... هانێ ئەمە بیست و پێنج ڕۆبڵە، هەمووی بۆ تۆ، حاڵی حازر، هەر ئەوەندەم لێ هەڵدەوەرێ، ئەویش بە فەزڵ و لوتفی ئەم

دۆستە دڵاوا جوامێرەمەوە، دووعـای خێـر بـۆ ئەو بکە! میـرزادە، مـن هەڵـە بووم! زۆریش هەڵە بووم! ئیدی ئەوە ژیانە...

جەنـەراڵ کە لـە ناوەنـدی ژوورەکـەدا وەسـتابوو، وەکـو مێژەڵـۆک بـە هـەر چواردەوری خۆیدا هەڵدەلەرزی، وەکو ئاگرێ کوژابێتەوە، بە زەحمەتێکی زۆر گوتی:

- بـەڵام... بمبـورە... بێتاقـەتم... تکایـە لـێم ببـورە! لینوتشـکا، گیانەکـەم... سەرینێکم بۆ بێنە!

لینوتشکا* کە کچۆڵەیەکی هەشت ساڵان بوو، بەلـەز ڕۆیشـت و سـەرینێکی هێنـا. لەسـەر تـەختێکی شەقوشـڕی، مشـەماتێگیراو دای نـا. جەنـەراڵ دانیشـت، دیـار بـوو هێشـتا زۆر شـتی دیکـەی پـێ بـوو کـە بیڵـێ، بـەڵام هـەر کـە لەسـەر تەختـە خەوەکـە دانیشـت و دانەنیشـت، یەکسـەر بـەلایا هـات، ڕووی کـردە دیـوارەکە و خەوێکی قـووڵ بردیەوە. مارتـا بوریسـوڤنا، بـە داخ و کەسـەرێکی زۆرەوە، میـرزادەی خوڵـک کـرد، ئامـاژەی بـۆلای کورسـییەکی نزیکـی مێـزی قومارەکـە کـرد کـە لەسـەری دانیشـێت. میـرزادە لەسـەری دانیشـت، ژنەکـەش بەرانبـەری دانیشـت، ڕوومـەتی ڕاسـتی لـەنێو لـەپی نـاو بـەبێ دەنگـی کەوتـە نیگـاکردنی میـرزادە. سـێ منـداڵ، دوو کـچ و کوڕێـک، کـە هـەرە گەورەکـەیان لینوتشکا بـوو لـەدەوری مێزەکـە خڕ بـوونەوە، دەسـتیان نایـە سـەر مێزەکە و چاویان بڕییە میرزادە. کولیا، لە ژوورێکی دیکەوە وەدەر کەوت.

میرزادە گوتی:

- کولیا، زۆر باش بوو کە لێرە بووی. دەتوانی یارمەتیم بدەی؟ حەز دەکەم بچـم بـۆ مـاڵی ناستاسـیا فیلیپوڤنـا، زۆر زەرووریـە. قـەرار بـوو ئـاردالیون ئالکسـندروڤیچ بـۆ ئەوێنـدەرم ببـات، بـەڵام وا خـەوی لێکەوتـووە. دەتـوانی بـۆ ئەوێـم بـەری، چونکـە بـە خـۆم شـارەزانیم و جـادە و شـەقامەکان بەڵـەد نـیم؟ بـەڵام ئەدرەسـەکەی دەزانـم، نزیکـی مەیـدانی "ئۆپێرای گەورە" ئـەپارتمانی خـا میتوڤزیڤا.

- ناستاسـیا فیلیپوڤنـا؟ هـەرگیز لـە مەیـدانی ئـۆپرای گەورە نـەژیاوە. قـەت ڕۆژێ لـە ڕۆژان مـاڵی لەو نـاوە نـەبووە. ئەگـەر ڕاسـتت دەوێ، بـابم قـەت نەچووەتـە مـاڵی وی. بـە ڕاسـتی غـەدرت کـردووە کـە پشـتت بەو بەسـتووە.

سەیرە کە باوەڕت بەو کردووە! ناستاسیا فیلیپوڤنا، حاڵی حازر، لە نزیکی فلادیمیر سکایا، لە شەقامی پێنج قورنەدا دەژی، کە زۆر لە ئۆپرای گەورە نزیکترە. گەرەکتە یەکسەر بۆ ئەوێندەر بڕۆیت؟ هەنوکە سەعات نۆ و نیوە. زۆرم پێ خۆشە لەگەڵتا بێم وماڵەکەیت پێ نیشان بدەم.

میرزادە و کولیا، یەکسەر وەدەر کەوتن. مخابن میرزادە کرێی گالیسکەی پێ نەبوو، بۆیە ناچار بوون بە پێیان بڕۆن!

کولیا گوتی:

- حەزم دەکرد بە (هیپولیت)ت بناسێنم. کوڕی گەورەی ئەم ژنە چاکەت فشەیە. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە بوو. نەخۆشە، لە بەیانییەوە لە جێدا کەوتووە، بەڵام گەنجێکی سەیرە. زۆر هەستیارە، پێم وایە هاتنی تۆ لەم وەخت و ساتەدا زۆری ئیحراج کرد، شەرمی بە خۆی هات... من وەکو ئەو نیم، لەو کەمتر ئیحراج دەبم، کەمتر شەرمم بە خۆ دێ، چونکە ئیحراجی من بە هۆی بابمەوەیە، بەڵام هی ئەو بە هۆی دایکی و ڕەفتارەکانی دایکیەوەیە، دیارە لەم ڕووەوە کۆمەڵگە زیاتر دژی ئافرەتە، ئەوەی لە ئافرەت بەعەیبە دەگیرێ، لە پیاو بە عەیبە ناگیرێ، ئەمە یەکێکە لە داوەرییە هەڵەکانی کۆمەڵگە کە لایەنگری لە جێندەرێک دەکات لەسەر حیسابی جێندەرێکی دیکە، دێ بەناهەق ئەوەی بە پیاوی ڕەوا دەبینێ، بە ژنی ڕەوا نابینێ. هیپولیت، کوڕێکی نموونەییە، بەڵام حەیفێ ئەسیر و دیلی هەندێ بیروبۆچوون و دابونەریتی باوی کۆمەڵایەتییە.

- گوتت سیلیەتی؟

- بەڵێ، تا زووتر بمرێ درەنگە، چونکە مردن بۆ ئەو بەختەوەرییە، ئەگەر من لەجیاتی ئەو بام، خۆزیام دەخواست بمرم. خەمی گەورەی ئەو خەمی برا و خوشکەکانیەتی، ئەو منداڵە چکۆلانانەی کە دیتن. نیگەرانی ئەوانە، بەزەیی بە حاڵیاندا دێتەوە. من و ئەو، ئەگەر پارەمان هەبوایە بۆ خۆمان پێکەوە، شوقەیەکمان بەکرێ دەگرت و لە خێزانەکانمان جیا دەبووینەوە. ئەوە ئاواتمانە. دەزانی کە باسی تۆ و حاڵی تۆم بۆ کرد، زۆر توڕە بوو؟ دەیگوت، ئەوەی زللەیەک بخوات و حەریفەکەی بۆ دوئێل بانگ نەکات، ترسنۆک و هیچوپووچە. ئەوەندە توڕە بوو، ناچار بووم بۆی نەگێڕمەوە. یانی ناستاسیا

فیلیپوڤنا تۆشی بۆ ماڵەوە دەعوەت کردووە؟

- نەخێر، دەعوەتی نەکردووم.

کولیا، کە لەناکاو لە ناوەندەی شۆستەکەدا وەستا، هاواری کرد:

- ئەدی چۆن بۆ ئەوێ دەڕۆی؟ بە تایبەتی و... تۆ... بەم جلانەوە، بۆ ئاهەنگ و بۆنەیەکی وا گەورە و گران؟

- بە ڕاستی نازانم چۆن دەتوانم بچمە ژوورەوە. ئەگەر ڕێم بدەن ئەوا باشە و ئەگەر ڕێم نەدەن گرینگ نییە، بەڵام سەبارەت بە جلەکانم هیچ چارێکم نییە.

- باشە، بە کاری تایبەتی بۆ ئەوێندەر دەچی؟ یان هەر دەتەوێ لە کۆڕێکی ئەرستۆکراتیدا ماوەیەک بەسەر بەریت*

- نا... بە ڕاستی... مەبەستم... دەشێت بڵێم بە ئیشی تایبەتی دەچم. نازانم چۆنت بۆ باس بکەم، بەڵام...

- ئیشەکەت چییە و بۆچی دەچیت، ئەمە پەیوەندیی بەخۆتەوە هەیە و من هەقم نییە، بەڵام ئەوەی بۆ من و بەلای منەوە گرینگە ئەوەیە کە بەبێ هۆ خۆت بۆ ئاهەنگێک دەعوەت نەکەیت و نەچیت بۆ ئاهەنگ و کۆڕێک کە ئەو هەموو ژنە هەرزە، جەنەراڵ و سووتخۆرانەی لەخۆ گرتووە. میرزادە ئەگەر چوونەکەت زەروری نەبوایە، بمبورە کە ئەم قسەیە دەکەم، گاڵتەم پێ دەکردیت، ڕقم لێت دەبووەوە! خەڵکی شەریف و سەنگین یەجگار کەمن، کەم کەس شایستەی ڕێزو قەدرن، پیاو ناچارە بە چاوی سووک سەیریان بکات، وێڕای ئەوەش هەر هەموویان، لە سەرووی گشتیانەوە ڤاریا، لاف و گەزافی ئابڕومەندی و قەدر و حورمەت لێ دەدەن. میرزادە، هەستت بەوە کردووە کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، بە تایبەتی لەنک مە، لە وڵاتی ئازیزی مەدا، لە ڕووسیادا هەموو خەڵکی، بوون بە خەڵکانی سەرکێش و ڕیسکباز؟ چەند سەر دێنم و سەر دەبەم نازانم ئەمە چۆن ڕووی داوە! جاران هەموو شتێک جێگیر و پایەدار بوو، بەڵام هەنوکە دنیا گۆڕاوە، ئەو جێگیریەی جاران نەماوە، نازانم کێوە چووە؟ هەموو خەڵکی باسی ئەم دیاردەیە دەکەن، گلەیی دەکەن، لە سەری دەنووسن. کەس بە کەس نییە، پاشاگەردانیەکە ئەو سەری دیار نییە. داک و بابان، لە پاشەکشەدان، شەرم لە دابونەریتی کۆنی خۆیان دەکەن. بۆ

نموونە دەگێڕنەوە بابێک لە شاری مۆسکۆ ئامۆژگاریی کوڕەکەی کردووە کە لەپێناوی وەدەستهێنانی پارەدا*، کۆ لە هیچ کارێک نەکاتەوە. ئەمە لە ڕۆژنامانددا بڵاو کراوەتەوە. تۆ تەمەشای جەنەراڵەکەی خۆمان، باوکم بکە! بزانە چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە، حاڵی گەیشتووەتە چ حاڵێک! بەڵام وێڕای ئەوەش پێم وایە جەنەراڵ هێشتا پیاوێکی ئابڕوومەندە، باوەڕ بکە، سوێندت بۆ دەخۆم، کە هەموو ئەم حاڵەی زادەی پەریشانی و مەیخۆرییە! باوەڕبکە من دڵم بە حاڵی دەسووتێ، ناوێرم ئەمە قسەیە لای کەس بکەم، چونکە، هەموو گاڵتەی پێدەکەن. نازانم ئەوانەی گاڵتەی پێ دەکەن، خۆ بە زیرەک دەزانن چییان لەو زیاترە؟ هەر هەموویان خرِ سووتخۆرن! هیپولیت، نەهەقی سووتخۆران ناگرێ، گلەییان لێ نکات، پێی وایە سووتخۆری زەرورییە، باسی هەڵکشان و داکشانی باری ئابووری و ئەو شتانە دەکات! ئەو قسانەی هیپولتم پێ ناخۆشە، بەڵام هیپولت گۆڕاوە، مجێزی توند بووە، تەوسەر بکە دایکی پارە لە جەنەراڵ وەر دەگرێت و هەر ئەو پارەیەی بۆ ماوەی هەفتەیەک بە سووت، سووتێکی زۆر بە قەرز دەداتێ! بە ڕاستی حەیاچوونە! ئایا دەزانی دایکە، دایکی من، مەبەستم نینا ئالکسندروڤنایە، پارەوپول و جلوبەرگ بۆ هیپولت دەنێرێت و لە ڕێگەی ئەوەوە یارمەتیی خۆشک و برا چکۆلەکانیشی دەدات؟ چونکە دایکیان پێیان ڕا ناگات. ڤاریاش هەمان کار دەکات.

– کولیا ئەوەتا تۆ بە چاوی خۆت دەبینی! بە خۆت دەڵێی خەڵکی ئابڕوومەند و ڕەوشتبەرز نەماوە، ئەوەی ماوە خرِ سووتخۆرن. ئەدی دەربارەی خەڵکی وەکو دایکت و ڤاریای خوشکت چ دەڵێی؟ ئەوان ئابڕوومەند نین؟ باشە یارمەتیدان و کۆمەککردنی خەڵکی لەم ڕۆژگارەدا خۆی لە خۆیدا نیشانە و بەڵگەی ڕەوشتبەرزی و ئابڕوومەندی نییە؟

– ڤاریا، تەنیا بۆ خۆ نواندن ئەوە دەکات، لاسایی دایکی دەکاتەوە، نایەوێ لە دایکی کەمتر بێت، بەڵام سەبارەت بە دایکم... قسەی تۆیە... من حورمەتی دەگرم، ستاییشی دەکەم و هەقی دەدەمێ. تەنانەت (هیپولیت)یش هەمان هەستی لەهەنبەر وی هەیە، هەرچەندە زۆر بەدمجێزە. هەوەڵ جار گاڵتەی بە دایکم دەکرد و دەیگوت مەبەستێکی هەیە، بەڵام ماوەیەکە پەی بە حەقیقەتی

مەسەلەکە بردووە. هم... کەواتە تۆ ئەمە بە نیشانەی ڕەوشتبەرزی دەزانی؟ دەبێ ئەم قسەیە لای خۆم هەڵگرم. گانیا بەمە نازانێ... ئەگەر بشیزانێ، بە جۆرە بێ موبالاتییەکی لەقەڵەم دەدات.

میرزادە، لە فکران ڕاچوو، بەدەم خەیاڵەوە، هەر هات بە دەمیا و گوتی:

- ها... گانیا نایزانێ؟ پێم وایە گانیا زۆر شتی دیکەش نازانێ!

کولیا گوتی:

- میرزادە دەزانی تۆم زۆر خۆش دەوێ؟ دەزانی ئەو ڕووداوەم، کە لە ماڵی ئێمەدا ڕووی دا، قەت لەبیر ناچێتەوە.

- کولیا، منیش تۆم زۆر خۆش دەوێ، زۆر بە دڵمی.

- گوێ بگرە: تۆ دەتەوێ چۆن لێرە بژیت؟ من بۆ خۆم دوای ماوەیەکی دی کارێک دەدۆزمەوە و پارەوپولێک پەیدا دەکەم. وەرە با پێکەوە، تۆ و هیپولیت و من، شوقەیەک بەکرێ بگرین و جارجار ڕێگەی جەنەراڵیش دەدەین بێتە لامان، ڕەئیت چییە؟

- من زۆرم پێ خۆشە، بەڵام با جارێ بزانین چۆن دەبێ.

من جارێ زۆر پەست و خەمگینم. ئەوە چییە؟ گەیشتین؟ لەم ماڵەدایە؟ چ مەدخەلێکی بەشکۆی هەیە! دەرگاوانیشی هەیە! باشە!... کولیا، من نازانم چ دەبێ.

میرزادە، هایم و حەیران لەوێندەر وەستا.

کولیا، بەدەم هاندانیەوە گوتی:

- سبەینێ هەموو شتێکم بۆ دەگێڕیتەوە. شەرم مەکە! بڕۆ بە ئومێدی خوا، خوا پشتیوانت بێ. بڕۆ خوات لەگەڵ. من دەگەڕێمەوە بۆ ئەوێندەرو هەموو ئەمە بۆ هیپولیت دەگێڕمەوە. من دڵنیام کە پێشوازیت دەکەم، هیچ خەمت نەبێ، مەترسە! ناستاسیا ژنێکی سەیرە، تەبیعەتێکی غەریبی هەیە! بەم قاڵدرمەیەدا سەربکەوە، ماڵەکەی لە قاتی یەکەمە. دەرگاوانەکە ڕێنوێنیت دەکات.




پەراوێز:

* - "بیرۆگوف لەبەر خاتری من بروسکەیەکی بۆ پاریس نارد...": نیکولا بیروگوف (١٨١٠- ١٨٨١)، بە ناوبانگترین نەشتەرگەری ئەو سەردەمە بوو. سەرۆکی بەشی پزیشکەوانی بوو لە کاتی ئابلۆقەی سیڤاستوبوڵدا (١٨٥٤- ١٨٥٥). ئوگوست نیلاتون (١٨٠٧- ١٨٧٣)ی جەڕاحی گاریباڵدی و ناپولیونی سێیەم، ناوبانگێکی جیهانی هەبوو.

* - " لینوتشکا: سووکەڵە ناوی هیلینایە.

* - "ماوەیەک بەسەر بەرێت...": لە ئەسڵا بە فەرەنسییە.

* - "بابێک لە شاری مۆسکۆ ئامۆژگاری کوڕەکەی کردووە کە لەپێناوی پارەدا، کۆ لە هیچ کارێک نەکاتەوە..." لە مانگی /ک٢/ ساڵی ١٨٦٦دا خوێندکارێک بە ناوی دانیلوف لە مۆسکۆدا بوبوفی سووتخۆر و کارەکەرەکەی لەپێناوی پارەدا دەکوژێت. ڕۆژنامانی ئەو سەردەمە ئاماژەیان بۆ لێکچوونی نێوان ڕاسکولینکوفی شاقارەمانی ڕۆمانی (تاوان و سزا)ی دۆستویفسکی کە پێشتر بڵاوی کردبووەوە و ئەم تاوانەی بوبوف کردبوو. لە مانگی /ت٢/ ١٨٦٧دا، کەسێک بە ناوی گلاسکوف، کە دەگەڵ بکوژەکەدا دەزاندن دەبێ، شایەدی دابوو کە دانیلوف بۆی گێڕاوەتەوە کە بابی هانی داوە بۆ پیاوکوشتن. بابەکە لە ڕاستیدا بە کوڕەکەی گوتبوو، بۆ ئەوەی بگات بە ئاواتی خۆی (کە زەماوەندێکی چاوەڕوانکراو دەبێ) کۆ لە هیچ نەکاتەوە و ئەگەر لە ڕێگەی پیاوکوژییشەوە بووە پارە پەیدا بکات. ئیدی دۆستویفسکی بایەخێکی زۆر بەم دادگاییە دەدات و لەم ڕۆمانەشیدا (گەمژە) باسی کردووەتەوە.

## فەسڵی سیازدەیەم

میرزادە، کاتێ بە قاڵدرمەکاندا سەر دەکەوت، هەستی بە نیگەرانییەکی زۆر دەکرد، بە هەموو هێز و توانایەکی خۆیەوە هەوڵی دەدا زات وەبەر خۆی بنێ و ئاسایی ببێتەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەوپەڕەکەی ڕێگەم نادەن بچمە ژوورەوە، فکرۆکەیەکی خراپم لێ وەر دەگرن، یان ڕێگەم دەدەن و بەئاشکرا و ڕووبەڕوو پێم ڕادەبوێرن، گاڵتەم پێ دەکەن... چش.. کێشە نییە!"

لە ڕاستیدا ئەمە ترسی هەرە گەورەی وی نەبوو، بەڵام هەرچیی دەکرد و دەکۆشا وەڵامێکی قەناعەتبەخشی ئەم پرسیارەی بۆ نەدەدۆزرایەوە: "چیی دەکرد لێرە، بۆچی هاتووە؟" گریمان تەنانەت دەرفەتی بۆ هەڵکەوت و ناستاسیا فیلیپوڤناشی بینی و توانیی پێی بڵێ: "شوو بەم پیاوە مەکە، ژیانی خۆت بەفیڕۆ مەدە، چاوی بڕیوەتە پارەکەت، پارەکەتی خۆش دەوێ نەک خۆت، بە خۆی ئەوەی پێ گوتم، لە زاری خۆیم بیستووە و (ئاگلایا یەپانچین )ش هەمان شتی پێ گوتم و، جا من هاتووم ئەم ڕاستییەت پێ بڵێم." ڕەنگە ئەمە زۆر ڕاست نەبێت، بەڵام پرسیارێکی بێ وەڵامی دیکە بەرۆکی هزری میرزادەی گرتبوو و لێی نەدەبووەوە، پرسیارێک، کە هێندە بەلایەوە قورس بوو، تەنانەت نەدەوێرا بیریشی لێ بکاتەوە. نەیدەتوانی چۆنی بکات و چۆنی دابڕێژێت. بەهەرحاڵ بە هەر ترس و نیگەرانییەک بوو وەژوور کەوت و سۆراخی ناستاسیا فیلیپوڤنای کرد.



گەمژە

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە شوقەیەکی مامناوەندیدا، کە زۆر پۆشتە و بەشکۆ بوو، دەژیا. لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لە پترسبۆرگ ئاکنجی بوو، توتسکی، بە تایبەتی لە هەوەڵەوە، زۆر سەخاوەتمەندانە، مەسرەفی کێشابوو، لە هیچ شتێکدا دریغی لێنەکردبوو. دەیویست دڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا ڕابگرێت و بە ئانقەست هەوڵیدەدا ڕمووەدەی ژیانی ڕەحەت و خۆشی بکات، چونکە دەیزانی ئینسان زۆر بەئاسانی دەگەڵ ژیانی ئورستوکراتیانەدا ڕادێت و هەر کە فێری بوو، ئیدی ناتوانێ بەئاسانی دەستبەرداری ببێت. ئەم بۆچوونەی توتسکی لە ڕوانگەی دابونەریتی کۆنەوە دروست بوو، بۆیە بە موو لێی لا نەدەدا. دەیزانی چۆن مدارای هەست و سۆز دەکات. ناستاسیا فیلیپوڤنا خۆشگوزەرانی، پێ ناخۆش نەبوو، بەڵکو پێشی خۆش بوو، بەڵام —سەیر ئەوە بوو- نەبووبوو بە کۆیلەی ئەو ژیانە، دەیتوانی لە هەر ساتێکا گەرەکی بێ، ئەو ژیانە تەرک بکات و بەوپەڕی ئاسانی و سادەیی بژی. تەنانەت چەند جارێکیش ئەوەی بە گوێی توتسکیدا دابوو، توتسکی بەوە قەڵس و بێتاقەت بووبوو. زۆر شت لە ناستاسیا فیلیپوڤنادا هەبوو کە ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی هەندێ جار دڵی پێ خۆش دەبوو و هەندێ جار پێی پەست دەبوو. سەرباری ئەو دۆستە عەوامە گیانی بە گیانیانەی هەندێ جار لەدەوری خۆی خڕی دەکردنەوە و کە خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی مەیل و ئارەزووی ئاسایی خۆی بوو، هەندێ مەیل و ئارەزووی زۆر غەریبیشی دەنواند، ئەمەش تێکەڵەیەک بوو لە جۆرەها زەوقی ناکۆک و هەڤدژ، بۆ نموونە شتی وای بەکار دێنا و حەزی لێ دەکرد، هیچ خەڵکێکی مەدەنی و ڕۆشنبیر بەکاری نەدەهێنا و نەدەچوو بە لایدا. بۆ نموونە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، زۆر ئەمەی لە گیان خۆش بوو کە ناستاسیا هەندێ جار، وای دەنواند کە نازانێ بۆچی ژنانی گوندی ناتوانن وەکو ئەو ژێرپۆشی حەریر لەبەر بکەن.

هەر هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللایەی کە ئافاناسی ئیڤانوڤیچ لە سەرەتاوە، دابووی بۆ پەروەردەکردنی ناستاسیا، کە لەو بوارەدا بە پیاوێکی کارامە و پڕ ئەزموون دەژمێردرا، بۆ ئەوە بگاتە ئەو ئەنجامە، لێ ئەفسووس! وا دەر

نەچوو، ئەوەی لای ئافاناسی ئیڤانوڤیچ خەیاڵ بوو، لای ناستاسیا بەتاڵ بوو! بەڵام ویڕای هەموو ئەمەش، ناستاسیا فیلیپوڤنا هێشتا ئەفسوونێکی تیا بوو کە خۆبەخۆ ئافاناسی ئیڤانوڤیچی ئەفسوون و کەمەندکێش دەکرد، تەنانەت دوای ئەوەی هەموو هیواو ئاواتێکی سەبارەت بەم ژنە گەنجە هەرەسی هێنا، هێشتا هەر نەیدەتوانی مەیلی دابنێ.

کارەکەرێک پێشوازیی میرزادەی کرد، (ناستاسیا فیلیپوڤنا تەنیا کارەکەرانی ڕادەگرت، یانی خزمەتکاری ڕانەدەگرت.) میرزادە داوای لێ کرد کە هاتنی بە ناستاسیا فیلیپوڤنا ڕابگەیەنێت. کارەکەرەکە زۆر خاکییانە گوێی لێ گرت. هیچ گرژییەکی نەنواند. میرزادە زۆر سەری لەمە سووڕ ما، نە چەکمە پیسەکانی، نە شەپقە زلەکەی و نە پالتۆ بێ قۆڵەکەی، نە سەر و سەکوتی شەپرێوی، نە پەیدابوونی ناوەختی، هیچ یەکێک لەوانە کەمترین دوو دڵی لەلای کارەکەرەکە چێ نەکرد. یارمەتی دا کە پالتۆکەی دابکەنێت و، تکای لێ کرد لە ژووری مەدخەلەکەدا چاوەڕوان بکات، بە خۆیشی بەلەز چوو ناستاسیا لە هاتنی میرزادە ئاگادار بکاتەوە.

ئەوانەی لە ماڵەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا خڕ بووبوونەوە بریتی بوون لە دۆست و ئاشنا هەمیشەییەکانی خۆی، بەڵام ژمارەی ئامادەبووانی ئەم جەژنی لەدایکبوونەی لە چاو ژمارەی ئامادەبووانی جەژنەکانی پار و ساڵانی پێشووتردا کەمتر بوون. ئافاناسی ئیڤانوڤیچ توتسکی و ئیڤان فیدوروڤیچ یەپانچین لەپێش هەمووانا ئامادە بووبوون. هەر دووکیان خۆشحاڵ و شاد دەهاتنە بەرچاو، یانی بە ڕواڵەت شاد و خۆشحاڵ بوون، لێ لە ناخدا زۆر نیگەران بوون، نیگەرانی ئەوە بوون کە جوابی ناستاسیا فیلیپوڤنا بۆ گانیا چییە و چی دەبێت. هەڵبەتە گانیاش لەوێ بوو، ئەویش دڵتەنگ و غەمگین و تەنانەت گرژ و پەست، زۆربەی کات بێدەنگ و گۆشەگیر بوو زاتی نەکردبوو ڤاریا دەگەڵ خۆیدا بێنێ. ناستاسیا فیلیپوڤناش ناوی ئەوی نەهێنابوو، بەڵام کە پێشوازیی گانیای کردبوو، ئەو دەمبۆڵەیەی بیر خستبووەوە کە دەگەڵ میرزادەدا بووبووی. جەنەراڵ کە هیچی لەو بارەیەوە نەژنەوتبوو، کەوتە پرسوجۆ و گانیاش زۆر بەوشکی

و بە پارێزەوە، بەڵام بەوپەڕی راستگۆیی و راشکاوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، تەنانەت ئەوەشی بۆ گێڕایەوە کە چۆن عوزرخوایی لە میرزادە کردووە، هەر بەو بۆنەیەوە زۆر بە گەرمی و بە جۆشەوە، ئەوەشی دەر بڕی، کە بە نەهەق میرزادە بە گێلۆکە و کەودەن دانراوە، ڕەئی ئەو تەواو پێچەوانەیە، لە کانگای دڵەوە باوەڕی وایە کە میرزادە "پیاوێکە دەزانێ چیی دەوێ". ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە گوێی لەو ڕەئیە بوو، بەوردی و سەرسامی ڕوانیە گانیا، بەڵام باسەکە زوو بە زوو هاتە سەر ڕوگوژین کە لەو ڕووداوەدا، رۆڵی هەرە سەرەکیی هەبووبوو، ئەویش فزوڵیەتی توتسکی و یەپانچینی هاروژاند، ئیدی پتیتسن کە تا سەعات نۆی ئەو شەوە لە خزمەتی ڕوگوژیندا دەبێ و هەوڵ دەدا لێرە و لەوێ پارەی بۆ کۆ بکاتەوە، گێڕابوویەوە کە چۆن ڕوگوژین پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە هەر ئەو شەوە بڕی سەد هەزار رۆبلی بۆ پەیدا بکەن.

پتیتسن بەدەم ئەو قسانەوە گوتی:

- راستە، سەرخۆشە، بەڵام پێم وایە، هەرچۆنێ بووە، سەد هەزار رۆبڵەکەی بۆ کۆ دەکرێتەوە، بەڵام نازانم ئاخۆ ئەمڕۆکە ئەو بڕە پارەیەی بۆ کۆ دەبێتەوە یان نا. هەرچەند ژمارەیەکی زۆر خەریکن و کاری بۆ دەکەن لەوانە: کیندر، تریبالوف، بیسکۆپ...

پتیتسن لە کۆتایی قسەکانیا گوتی:

- ڕوگوژین، ئامادەیە بە هەر سووتێک قایل ببێت، چونکە یەکەم مەستی مەیە و دووەم مەستی ئەشقێکی بێ غەلوغەشە.

ئامادەبووان ئەم هەواڵانەیان، بە جۆرە پەستی و ڕووگرژییەکەوە وەر گرت. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بێدەنگ بوو، دیار بوو نەیدەویست هیچ ڕەئیەک دەببڕێت. گانیاش هەمان حاڵ و هەڵوێستی ئەوی هەبوو. جەنەراڵ یەپانچین، لە دڵەوە، لە هەر میوانێکی دیکەی ئەو کۆڕو ئاهەنگە پەریشانتر و نیگەرانتر بوو. ئەو مرواریيانەی کە هەمان ڕۆژ پێشکەشی کردبوون، بە نەزاکەتێکی ساردەوە، نەزاکەتێک کە بۆنی قەشمەری و گاڵتەپێکردنی لێ دەهات. لەنێو تێکڕای میوانەکاندا تەنیا فردیش چینکۆ بە کەیف و بە دەماخ

و خۆش مجێز بوو، قاقا پێدەکەنی، پێکەنینێک کە شایستەی ئەو جۆرە بۆنانە بێت. هەندێ جار بێ هیچ هۆیەکی دیار پێدەکەنی، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بووبێ کە ڕۆڵی لیبۆکی دەستۆ گرتبوو. ( ئافاناسی ئیڤانوڤیچ) کە بە زمان پاراوی و دەماوەری بە نێوبانگ بوو، بە زۆری لەم جۆرە بۆنانەدا ئەو جڵەوی قسانی دەگرتە دەست، نەک هەر کەیفی قنج نەبوو، بەڵکو بە ڕادەیەک گرژ و پەست بوو کە لەو نەدەوەشایەوە.

بەڵام میوانەکانی دی کە ژمارەیان کەم بوو، بریتی بوون لە: مامۆستایەکی پیری داماو کە مەگەر هەر خوا بزانێ بۆچی بۆ ئەم ئاهەنگە دەعوەت کرابوو. کوڕێکی زۆر گەنج، تا بڵێی شەرمن و کەم ڕوو و بێدەنگ، لەوە نەدەچوو هیچ کەسێک لە ئامادەبووان بیناسن. خانمێکی لە خۆرازی و ڕوودار کە نزیکەی چل ساڵێک دەبوو و جاران ئەکتەر بوو. خانمێکی گەنجی یەجگار شەنگوڵ و خشکۆک و لەبار، کە جلێکی بێئەندازە جوان و شیک و گرانبەهای لەبەر بوو، بەڵام یەجگار بێدەگ و کەمدوو بوو. جا ئەمانە نەک هەر نەیاندەتوانی ئاهەنگەکە گەرم بکەن، بەڵکو نەشیاندەزانی، بابەتێک بدۆزنەوە و قسەی لەسەر بکەن.

بۆیە هاتنەکەی میرزادە، لەم کاتەدا، لە جێگەی خۆیدا بوو. هەرچەندە، هاتنە کوتوپڕەکەی جۆرە حیرەت و سەرسامییەکی دروستکرد، بووە مایەی هەندێک زەردەخەنەی تەوسامێز، بەڵام میوانەکان، توانییان ئەوە لە نیگا و سیمای ناستاسیا فیلیپوڤنادا بخوێننەوە کە بە هیچ جۆرێ نە میرزادەی دەعوەت کردووە و نە ئەوی لەبیر بووە. بەهەرحاڵ ناستاسیا فیلیپوڤنا، دوای ئەوەی، بە هێما و ئاماژە سەرسامیی خۆی لەو هاتنە کوتوپڕەی میرزادە ڕاگەیاند، لەناکاودا خۆشحاڵییەکی ئەوتۆی نواند و دەر بڕی کە زۆربەی ئامادەبووان بە خۆشی و شادییەوە پێشوازیی ئەم میوانی ناوەختە بکەن.

ئیڤان فیدوروڤیچ گوتی:

- دیارە ئەمەی لە سادەیی و ساکاریی خۆیەوە کردووە. هەرچەندە هاندانی ئەم جۆرە ڕەفتارە کارێکی ترسناکە، بەڵام وا هاتووە و ڕەنگە

هاتنەکەشی خراپ نەبێت، ئەوەندەی من بیناسم، لەوەشە ببێتە مایەی سەرگەرمیمان.

فردیش چینکۆ هەڵی دایە:

- بە تایبەتی کە خۆی خۆی دەعوەت کردووە.

جەنەراڵ، چونکە ڕقی لە فردیش چینکۆ بوو، بە تووڕەیی گوتی:

- مەبەستت؟

فردیش چینکۆ، بەرسڤی دایەوە:

- دەبێ، پارەی هاتنەژوورەوە بدات!

جەنەراڵ، کە ئەوەی پێ قووت نەدەچوو، لە مەجلیسێکدا ببێ بە هاونشینی فردیش چینکۆ، خۆی پێ نەگیرا و گوتی:

- بەڵام میرزادە میشکین هاوتای فردیش چینکۆ نییە!

فردیش چینکۆ، بە تەوسخەنەوە، بەرسڤی دایەوە:

- ببورە جەنەراڵ! پێویستە مدارای فردیش چینکۆ بکەیت. من لێرەدا، هەق و هقوقی تایبەتیم هەیە.

- ئەو هەق و هقوقە تایبەتیە چییە؟

- جاری پێشوو شانازی ئەوەم پێبڕا کە بە دووروودرێژی بۆ هەموو ئاهەنگێڕانی شرۆڤە بکەم. ئێستاش پێم خۆشە بۆ جەنابی با سەعادەتی تۆی دووبارە بکەمەوە. هەموو ئەوانەی لێرەن وەکو بە خۆت دەبینی، خاوەن هەست و ئەقڵن، بەڵام من کەسێکی بێ ئەقڵ و هەستم، وەک دەڵێن ئەو ڕۆژەی ئەقڵ دابەش کرا من لەوێ نەبووم. جا لەجیاتی ئەوە داوام کرد دەرفەتی حەقیقەتگۆییم بدرێتێ، چونکە هەموو کەسێک دەزانێ، کە تەنیا بێ ئەقڵان حەقیقەت دەڵێن، حەقیقەت و ڕاستی لە شێت یان لە منداڵ بزانە. جگە لەوەش، من کابرایەکی ڕکونی و کینەکێشم، ئەمەشم لە بێئەقڵی و بێئاوەزیە. من بە ناچاری هەموو سووکایەتی و حەقارەتێک قەبووڵ دەکەم، تا ئەو ڕۆژەی خەنیمەکەم، ئەو کەسەی سووکایەتییەکەی پێ کردووم، لێ نەکەوتبێ، بەڵام هەر کە بەئاستەم لێکەوت و دەوری نەما، یەکسەر ئەو سووکایەتییە وەبیر خۆ دێنمەوە و ئیدی بێ سێ و دوو تۆڵەی خۆم

دەســـتێنمەوە- پتیتســـن گوتـــەنی جووتـــە دەوەشـــێنم و دەکەومـــە لوشکەوەشاندن، بەڵام خوا هەڵناگرێ ئەو قەت لوشکە ناوەشێنێ، لوشکە لـە کـەس نـادات. دیارە جـەنابی باسـەعادەتت دەبێ حیکایەتەکـەی کیرلـوڤ(* )، "شێر و کەر"ت بیستبێ؟ ڕێک دەڵێی بۆ ئێمە، تۆ من نووسراوە جەناب!

جەنەراڵ بە تورەیی گوتی:

- فردیش چنکۆ، دیسان خەریکە پەت دەپچڕی!

فـردیش چینکـۆ، کـە خـوا خـوای قسـەیەکی وای بـوو، تـا درێـژە بـە حیکایەتەکـەی بـدات و هێـوەتر بـڕوات و جەنـەراڵ تـورە بکـات، لەسـەری ڕۆیشت و گوتی:

- ئەوە چییە پایە بەرز؟ نیگەران مەبە! من شوێنی خۆم دەزانم. کە گوتم ئێمە، تۆ و من، ئەو شێر و کەرەین، شێر و کـەری نـاو حیکایەتەکـەین، دیـارە مەبەسـتم ئەوە بـوو مـن کەرەکـەم و جـەنابی باسەعادەتیشـت شـێرەکەی، وەکو حیکایەتەکەی کریلوڤ دەڵێت: شێر کە پیر بوو، سامی جـارانی نـامێنێ. جا جەناب، کەرەکە منم

جەنەراڵ، بەبێ بیرکردنەوە و ڕامان گوتی:

- لە مەیاندا ڕاست دەکەی، دەقاودەق وایە!

هەڵبەتـە هـەر هـەموو ئـەم گفتوگۆیانـە، قسـەی بـە توێکل و مشـتەی نـاو هەمبانان بوو. هەموو دەیانزانی کە فردیش چینکۆ، بابایەکی لێبوکەو، زمـانی لێبۆکان لە کۆت و زنجیران نادرێت. بۆیـە فردیش چینکـۆ لـەپڕ هـەڵی دایـە: " من بۆ ئەم مەبەستە لێرەم، بۆیە دەعوەت کراوم، تا ئەو جۆرە قسـانە بکـەم، دەنـا چۆن ڕێگـەیان بـە کەسـێکی وەکـو مـن دەدا، مـن و ئـەم شـوێنانە کوجـا مەرحەبا؟ من خۆم باش ئەمە دەزانـم، لـە فیکـەی خـۆم حـاڵیم.. ئایـا ماقووڵـە، ڕەوایــە مــن، فــردیش چینکــۆ. لــە هاوشــانی پیــاوێکی بــەڕێزی، خانــەدانی، ئەقڵمەندی، بـە ئـاوەزی وەکـو ئافاناسـی ئیڤـانوڤیچ توتسـکی دابنـەن؟ هەڵبەتـە ئەمە تەنیا یەک لێکدانەوە هەڵدەگرێت، ئەویش ئەوەیـە بۆیـە بـۆم هەیـە شـان بە شانی وی دانیشم چونکە نە ماقوولەو نە ڕەوا و پەسندە! "

فـردیش چینکـۆ، هەرچەنـدە کەسـێکی عەوام و بـازاڕی بـوو، بـەڵام تیغـی





زمانی زۆر تیژ و، نوکتەکانی بە نێش و ئێش بوون، بە تایبەتی ئەگەر بە دڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا بوایەن، بە جارێ شوڵی لێهەڵدەکێشا، بۆیە ئەوانەی کە مایل بە دیداری ناستاسیا بوون، دەبوا تەحەمولی فردیش چینکۆ بکەن. (فردیش چینکۆ)ش هەر لە هەوەڵەوە پەی بەوە بردبوو کە ناستاسیا فیلپوڤنا، بۆیە ڕووی دەدایە و پێشوازی دەکرد، چونکە دەیتوانی سەر بکاتە سەر توتسکی و قەڵس و بێتاقەت و نارەحەتی بکات، (گانیا)ش بەدەست فردیش چینکۆوە زوخاوەزگ بووبوو. ئیدی فردیش چینکۆ کەوتبووە سەر بارەکەی و دەیزانی لەم ڕووەوە قازانجێکی زۆری بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا هەیە.

فردیش چینکۆ، کە بە گۆشەی چاو دەیڕوانییە ناستاسیا فیلیپوڤنا تا کاریگەریی قسەکانی خۆی لە سیمایدا بخوێنێتەوە، گوتی:

- سەبارەت بە میرزادە، من کارێکی وەها دەکەم تازەترین گۆرانیمان بۆ بڵێت.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە تورەیی گوتی:

- نا، من باوەڕ ناکەم. شتی وانەکەیت، ئاگات لە خۆ بێت زۆر نەڕۆی.

- ئا... ئەگەر تۆی لەپشت بێ، چارم ناچارە، ژێوان ببمەوەو...

لێ ناستاسیا فیلیپوڤنا، بێ ئەوەی گوێ لە قسەکانی بگرێت، هەستا و بەرەو پیری میرزادە ڕۆیشت. هەر کە لەپڕ گەیشتە بەردەم میرزادە گوتی:

- ببورە کە لەبەر پەلەپەلی خۆم، بیرم چوو کە دەعوەتت بکەم. خۆشحاڵم کە بە پێی خۆت هاتوویت و دەرفەتی ئەوەت بۆ ڕەخساندووم کە سوپاست بکەم و ستاییشی جورئەت و پایەداریت بکەم.

بەدەم ئەو قسانەوە، بەوردی لە میرزادەی دەڕوانی، بەو ئومێدەی کە پەی بە هۆی ئەم هاتنە کوتوپڕەی ببات.

دەشیا میرزادە، چەند وشەیەکی گونجاو لەهەنبەر ئەم مجامەلە ناسکەی ئەودا بدۆزێتەوە، بەلام بە جۆرێ حەپەسابوو کە نەیتوانی زار هەڵێنێ.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە هەستی بەوە کرد. ئەو شەوە جوانترین جلوبەرگی پۆشیبوو، پیاو لە تەمەشای تێر نەدەبوو، هەموو

ئامادەبووانی ئەفسوونی خۆی کردبوو. دەستی میرزادەی گرت و بۆ لای میوانەکانی برد. میرزادە، بە ساتێک بەر لەوەی بگەنە هۆڵی میوان، لەناکاودا وەستا، بەوپەڕی شپرزەیی و بەپەلەپەل و بە هەڵچوونەوە بە گوێیدا چپاند:

- زۆر جوانیت، هەموو شتێکت جوانە، لە جوانیدا بەشی کەست نەهێشتووەتەوە.. تەنانەت باریکی و ڕەنگە زەردەکەشت لێ بووە بە نەخش. مەگەر خوا بزانێ چەند تاسەمەندی دیدارت بووم، بۆیە بە خۆم نەوەستام و هاتم. من.. ببورە...

ناستاسیا فیلیوڤنا بە پێکەنینەوە گوتی:

- تەوازی مەیەنەوە، دەنا سیحر و ئەفسوون و غەریبی دیدارەکەت بە تاڵ دەبێتەوە. تومەز ڕاستە کە دەڵێن، جۆرە غوربەت و تایبەتمەندییەکی دەگمەنت تیایە. یانی هەنوکە تۆ من بە ڕەمزی کەماڵی جوانی دەزانیت؟

- بەڵێ.

- نا، تۆ هەڵەیت، ڕەنگە بتوانی بیری خەڵکی بخوێنیتەوە، مەزەندەی دروست لێ بدەی، پێشبینی بکەیت، بەڵام سەبارەت بە من هەڵەیت. ئەمشەو پێتی نیشان دەدەم...

ئەوسا میرزادەی بە میوانەکان ناساند، کە پتر لە نیوەیان پێشتر دەیانناسی. توتسکی یەکسەر کەوتە مجامەلەی و ئاهەنگەکە کەمێک بوژایەوە و خەڵکەکە جموجووڵێکیان تێکەوت و کەوتنە پێکەنین و گفتوگۆ. ناستاسیا فیلیپوڤنا، میرزادەی لە لای خۆیەوە دانیشاند.

فردیش چینکۆ، بە دەنگێکی بەرزتر لە دەنگی هەمووان هاواری کرد:

- بۆچی هاتنی میرزادەتان پێ سەیرە؟ ئاخر سەیرەکەی لە چیدایە؟ مەسەلەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

گانیا، کە تا ئەو دەمە، دەتگوت لاڵە، گوتی:

- بەڵێ، مەسەلەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، هاتنەکەی خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی نیاز و نیەتی ئەوە. من بە درێژایی ئەمڕۆکە دوور و نزیک هەر چاوم لە میرزادە بووە، یانی لەو کاتەوە کەوێنەکەی ناستاسیا





فیلیپوڤنای، لەسەر مێزەکەی ئیڤان فیودوروفیچ بینی، ئیدی کەوتمە چاودێری وی.. ئەوسا کە شتێکم بە خەیاڵدا هات، کە هەنوکە لەلام بووە بە یەقین، تەنانەت میرزادە بە خۆی لەلای من دانی پێدا نا..

گانیا، ئەو قسانەی زۆر بەجدی و بێ هیچ شۆخی و سوعبەتێک و تەنانەت بە پەستییەوە کرد، ئەو قسانە جۆرە سەرسامیەکیان لێکەوتەوە.

میرزادە، دەموچاوی سوور هەڵگەڕا و، گوتی:

- من هیچ ئیعترافێکم لای تۆ نەکردووە، تەنیا وەڵامی پرسیارەکانم داویتەوە.

فردیش چینکۆ، هاواری کرد:

- ئافەرین! ئافەرین! بۆ خۆت و قسەت، هەم ڕاستگۆیانە و هەم زیرەکانە بوو!

هەموو ئامادەبووان دەستیان بە پێکەنین کرد. پتیتسن، بە ئەسپایی و بێزاری گوتی:

- فردیش چینکۆ، بەسە، بەس هاوار بکە!

ئیڤان فیدوروفیچ گوتی:

- میرزادە، تەسەوری شتی وام لێ نەدەکریت.. باوەڕم نەدەکرد شتی وات لێ بوەشێتەوە.. من تۆم بە بابایەکی فەیلەسووف دەزانی و هیچی تر.! ڕاستیان گوتووە لە ئاوی خوڕ مەترسە، لە ئاوی مەنگ بترسە!

مامۆستا پیرە هەفتا ساڵە بێ ددانەکە کە تا ئەو دەمە زاری هەڵنەهێنابوو و چاوەڕوانی ئەوەشی لێ نەدەکرا هیچ بڵێت، لەناکاودا، کەوتە مینگەمینگ و گوتی:

- کە دیتم میرزادە، بە نوکتەیەکی سادەوەکو چۆن کیژێکی پاکیزە و بە حەیا و حورمەت بە سوعبەتێک سوور دەبێتەوە و شەرم دای دەگرێت، بەو ئاوایە سوور هەڵگەڕا، ئیدی بۆم بە دیار کەوت کە ئەم گەنجە نەجیب و خانەدانە، شەریفترین نیازو جوانترین هەستی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتووە!

میوانەکان کە گوێیان لەو قسانە بوو، لە قاقای پێکەنینان دا و گەرموگوڕییەکی زۆریان تێ کەوت. پیرەمێردی بەستەزمان کەوای دەزانی

خەڵکەکە بە قسە خۆش و نوکتە ئامێزەکەی ئەو پێدەکەنن، تەمەشایەکی کردن و گوێ بە گوێی ئەوان دەستی بە قاقای پێکەنین کرد. ئەوەندە پێکەنی کۆکەکۆکی پێکەوت. ناستاسیا فیلیپوڤنا کە ئەم جۆرە پیرەمێر و پیرەژنە، زورهان و قسە قوت و ڕووخۆشانە و تەنانەت خەڵکانی سائەقڵی خۆش دەویست، خێرا چوو بەلایەوە و کەوتە مجامەلەو مدارای و تەنانەت ماچیشی کرد و ڕای سپارد کوپێ چای گەرمی دیکەی بۆ بێنن. بە کارەکەرەکەی خۆی گوت، کە کۆڵوانەکەی بۆ بێنێ و دای بە شانیا و فەرمانی دا برێ داری تازە بە موغەیریەکەوە بنەن.

کە پرسیاری وەختی لە کارەکەرەکە کرد، بەرسڤی دایەوە کە سەعات دە و نیوە. هەنگێ ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕوو لە میوانەکان گوتی:

- میوانانی بەڕێز، شامپانیا مەیل نافەرموون؟ ئامادەیە. لەوەیە کەیف و زەوقێکتان بداتێ، تکایە کەس شەرم نەکات، بە کەیفی خۆتان بخۆنەوە. بێ هیچ تەشریفاتێک بخۆنەوە.

ئەم خوڵق کردنە سادە و ساکارە، لەلایەن ناستاسیا فیلیپوڤناوە، زۆر سەیرو نائاسایی بوو، چونکە هەمووان ئاگادار بوون کە لە میوانداری و ئاهەنگ و بۆنە و شەوکۆڕەکانی پێشوویدا، چ ڕێو ڕەسم و تەشریفات و ئەتەکێتێکی مکوم پەیڕە و دەکرا، بە شێوەیەکی گشتی شەوکۆڕەکە ڕەونەقێکی پەیدا کرد. هیچ کەسێک شامپانیای ڕەفز نەکرد! جەنەراڵ یەکەم کەس بوو کە قەبووڵی کرد، ئەوجا خانمە لەخۆڕازییەکە، پیرەمێرە داماوەکە، ئەوجا فردیش چینکۆو ئەوجا هەموو ئەوانی دی. (توتسکی)یش بەو ئومێدەی هاماجێکی تازە و شۆخیئامێز بە ئاهەنگەکە ببەخشێت، پێکێ شامپانیای هەڵدا. تەنیا گانیا هیچی نەخواردەوە، بەڵام ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەویش پێکێکی خواردەوە و ڕای گەیاند کە ئەو شەوە بەلای کەمەوە سێ پێک دەخواتەوە، زۆر زەحمەت بوو پیاو سەر لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتە زۆر زبر و شەڕانی و کوتوپڕەکانی دەربکات، یان سەر لە پێکەنینە هیسترپاییەی کە بە کڕی و کپی و خامۆشییەکی خەمناک دەشکایەوە دەر بکات. هەندێ لە ئامادەبووان، پێیان وا بوو ڕەنگە تای لێهاتبێ، بەڵام پاشان هەستیان کرد





کە چاوەڕوانی شتێکە، ناو بە ناو تەمەشای سەعاتە دیوارییەکەی دەکرد و بێتاقەتی و حەواس پەرتی پێوە دیار بوو.

خانمە لەخۆڕازییەکە گوتی:

- پێدەچێ تات لێهاتبێ!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بە ڕاستی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بەدەم لەرزەوە، بەرسڤی دایەوە:

- تایەکی زۆر توندیش، هەر بۆیە خۆم لەم کۆڵوانەیەوە پێچاوە.

میوانەکان، هەموو شڵەژان، جموجۆڵیان تێکەوت.

توتسکی تەمەشایەکی ئیڤان فیودوروفیچی کرد و گوتی:

- چ دەڵێی بڕۆین تا خانەخوێیەکەمان ئیسراحەت بکات؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەناکاودا و بەوپەڕی جیددی گوتی:

- نەخێر بەڕێزینە! نا، تکایە مەڕۆن! مانەوەتان، بە تایبەتی ئەمشەو، بۆ من زەرورییە.

جا چونکە هەموو میوانەکان، پێشوەختە دەیانزانی، کە ئەمشەو و لەم ئاهەنگەدا قەرارێکی زۆر گرینگ دەدرێت، ئەو قسانەیان، کە زۆر مانایان لە خۆ گرتبوو، بە هەند وەرگرت، جەنەراڵ و توتسکی تەمەشایەکی تری یەکدیان کردەوە، گانیا تەزوویەکی پێدا هات.

خانمە لەخۆڕازییەکە گوتی:

- وا چاکە، یارییەکی چکۆلە بۆ خۆمان ڕێک بخەین.

فردیش چینکۆ، گوتی:

- من یارییەکی تازەی زۆر خۆش دەزانم. یانی یارییەکە کە تەنیا یەکجار جەڕبێنراوە و سەرکەوتووش نەبووە!

خانمە لەخۆڕازییەکە پرسیی:

- ئەمە چ یارییەکە؟ چۆنە؟

- ڕۆژێک کۆمەڵێک برادەر کۆ بووینەوە. کە تۆزێکمان خواردەوە، هەڵبەتە خواردنەوە مشە بوو. یەکێک پێشنیازی کرد کە هەر یەکەمان، بێ ئەوەی لەسەر مێزەکە هەستێت، چیرۆک و سەرگوزشتەیەکی خۆی

بگێڕێتەوە، بە مەرجێ لە ناخ و نیهادی خۆیدا قەناعەتی تەواوی هەبێ کە ئەو چیرۆکەی دەیگێڕێتەوە خراپترین و دزێوترین کارە، کە لە تەمەنی خۆیدا کردوویەتی، بە مەرجێ بەوپەڕی ڕاستگۆیی، بێکەم و زیاد بیگێڕێتەوە، کەم و زۆر پەردەپۆشی نەکات!

جەنەراڵ گوتی:

- بیرۆکەیەکی زۆر سەیرە!

- بەڵێ، عالی جەناب، جوانییەکەی لەوەدایە.

توتسکی گوتی:

- شتێکی کۆمیدییە، بەڵام خراپ نییە، جۆرە خۆنوێنییەکی ئاوەژووە!

- لەوەیە مەبەست لە يارييەكە ئەوە بوو بێ ئافاناسی ئیڤانوڤیچ.

خانمە لە خۆرازیەکە گوتی:

- ئەم جۆرە یارییە زیاتر تراجیدییە تا کۆمیدی!

پتیتسن گوتی:

- یارییەکی قۆڕ و بێمانایە!

ناستاسیا فیلیپوڤنا گوتی:

- باشە سەرکەوتوو بوو؟

فردیش چینکۆ گوتی:

- نا، سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا! خراپ شکایەوە! ڕاستە هەر کەسە و چیرۆکێکی گێڕایەوە. زۆر شتی ڕاست هاتنە گێڕانەوە و تەنانەت هەندێکیان بە لەزەتەوە سەربووری خۆیان گێڕایەوە، بەڵام پاشان هەموو هەستیان بە شەرمەزاری دەکرد، نەیان توانی تا کۆتایی بەردەوام بن! دەتوانین بڵێین یارییەکە بە شێوەیەکی گشتی خۆش بوو، یانی لە ڕووی سەرگەرمییەوە باش بوو! .

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەناکاو گەرم بوو، گوتی:

- دەشێت یارییەکی خۆش بێت. دەیسا با تاقی بکەینەوە. هەستدەکەم مەجلیسی ئەمشەومان گەرم نییە، خۆزگە هەر کەسەمان شتێکمان دەگێڕایەوە، هەڵبەتە بە خوایشتی خۆی، بە حوسن و ڕەزای خۆی، ها چ

دەڵـێن؟ بـەڵکو بتـوانین لـە عۆیـەی ئـەم گەمەیـە بێـین و بیگەیەنینـە سـەر؟ بەهەرحاڵ، گەمەیەکی زۆر خۆش و تازەیە!...

فردیش چینکۆ، هەڵی دایە و گوتی:

- بیرۆکەیەکی بلیمەتانەیە! هەڵبەتـە ئافرەتـان نـاگرێتەوە... تـەنیا پیاوەکـان هەر یەکە و بەسەرهاتێکی خۆی دەگێڕێتەوە! بە تیرو پشک نۆرەی هەر کەسێک دیاری دەکەین، ڕێک وەکو ئەو جارەی دی دەکەین، تیروپشک زەرورییە! هەڵبەتە ئەوەی نایەوێ چیرۆکێک بگێڕێتەوە دەتوانێ بەشداری نەکات، بەڵام دیارە و لای هەمووتان عەیانە کە ئەمە کارێکی جوان نییە و بگرە عەیبە! دەی با دەست پێبکەین، با هەر کەسە و ناوی خۆی لەسەر پارچە کاغەزێک بنووسێت و بیخاتە ئەم کڵاوەوە و میرزادە کاغەزەکان یەک یەک ڕادەکێشێت... یارییەکی زۆر سادە و ئاسانە. هەر کەسە و خراپترین و قۆڕترین کردەوەی تەمەنی خۆی دەگێڕێتەوە. هەڵبەتە ئەمە زۆر ئاسانە! دەی بینن! ئەگەر هەر کەسێکیش لە شوێنێکا پەکی کەوت و شتێکی لەبیر چوو، من بیری دەخەمەوە!

دیارە ئەم پێشنیازە بە دڵی کەس نەبوو، هەندێک ڕوویان کرژ کرد، هەندێ کەوتنە تەوسخەن، هەندێکی دی کەوتنە خوردە ئیرادان، هەندێکی دی دوو دڵ بوون. بۆ نموونە ئیڤان فیدوروفیچ، کە حەزی نەدەکرد بێ دڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا بکات کە لەڕادەبەدەر دڵبەندی ئەم بیرۆکە غەریبە بووبوو. ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئافرەتێک بوو ئەگەر کەڵکەڵەی شتێکی کەوتبایە سەر، ئەگەر نائاسایی و بێفایدەش بوایە، هەر دەبوایە بیکات، بە هیچ کلۆجێ دەستبەردار نەدەبوو. جا ئێستاش لە حاڵەتێکی هیستریاییدا بوو، بێ ئۆقرە بوو، لە خۆڕا پێدەکەنی، بە تایبەتی بە توتسکی پێدەکەنی کە سەراسیمە و پەشێو کەوتبووە ئیرادگیری. چاوە ڕەشەکانی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەبریسکانەوە، دوو پەڵەی سووری کاڵ بە گۆنا زەردەکانیەوە دەرکەوت. لەوە دەچوو گرژی و پەستی و بێزاری و بێتاقەتیی هەندێ لە میوانەکان، بوو بێتە باعیسی ئەوە کە بەو جۆرە بهاڕوژێت و بیەوێ پێیان ڕابوێرێ و بێزاریان بکات، ناستاسیا فیلیپوڤنا، بۆیە پێشنیازەکەی فردیش





چینکۆی پێ خۆش بوو و لەزەتی لێدەبینی، چونکە جۆرە پەردە لە ڕووداماڵینێکی تێدا بوو. هەندێ لە میوانەکان دڵنیا بوون کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بۆیە سووره لەسەر ئەنجامدانی ئەو یاریە، چونکە مەبەستێکی لە دڵی خۆیدا حەشار داوە، بەهەرحاڵ، لە ئەنجامدا، پێشنیازەکە پەسند کرا، هەندێک لە ڕووی کونجکاوی و هەندێکی دی لەو ڕووەوە کە یارییەکی خۆش دەبێت، پەسندیان کرد. فردیش چینکۆ لە هەمووان بە جۆشوخرۆشتر بوو.

گەنجە کەمدووەکە، بە شەرمێکەوە پرسیی:

- باشە ئەگەر چیرۆکەکە جۆرێک بێت کە ڕووی مەجلیسی خانمانی نەبێت و لە حوزوری واندا نەگوترێت؟

فردیش چینکۆ بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- لەو حاڵەتەدا دەتوانی نەیگێڕیتەوە. خۆ چی زۆرە کار و کردەوەی خراپ و دزێو زۆرە، یەکێک هەڵبژێرە کە ڕووی مەجلیسی هەبێت. نەهەقت نییە، لێت ناگیرێ، گەنجیت.

خانمە لەخۆڕازییەکە هەڵی دایە:

- من نازانم لەنێو کارە خراپ و دزێوەکانمدا، کامیان هەڵبژێرم! کامیان لە هەموویان خراپترە!.

فردیش چینکۆ دووبارەی کردەوە:

- ئافرەتان مەعافن، تەنیا لەو حاڵەدا کە خۆیان نەیانەوێ هیچ بگێڕنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێک بە ویست و ئارەزووی خۆی بیەوێ بەسەرهاتێک بگێڕێتەوە، هەنگێ مەمنوونیشی دەبین. ئەو پیاوانەش کە لە ڕوو دادەمێنن و بە گەمەکە بێتاقەت دەبن، هەر مەعافن، دەتوانن هیچ نەگێڕنەوە.

گانیا پرسیی:

- بەڵام بە چیا دەر دەکەوێ کە من درۆ ناکەم؟ کە درۆشم کرد یارییەکە تامی نامێنێ. کێ هەیە درۆ نەکات؟ کەس ڕاستی لە خۆی ناڵێت!

فردیش چینکۆ، بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە گوتی:

- درۆ کردنی پیاو، خۆی لە خۆیدا شتێکی عەنتیکە و خۆشە، بەڵام گانیا

تۆ لە چی دەترسیت؟ دزێوترین کاری تەمەنی تۆ، لە ئێستاوە لای هەموو خەڵکی دیارە.

ئەوسا فردیش چینکۆ، بە جۆشوخرۆشێکی ناگەهانییەوە گوتی:

- جا گەلۆ تەسەوربکەن، بیهێننە بەرچاوی خۆتان، دوای ئەوەی هەموومان، هەر کەسە و چیرۆک و سەرهاتی خۆمان گێڕایەوە، سبەینێ بە چ چاوێکەوە سەیری یەکتر دەکەین!

توتسکی، بە ویقارەوە گوتی:

- شتی وا دەبێت؟ ئەوە بە ڕاستیتانە ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا بە تەشەرەوە گوتی:

- ئەوەی لە گورگ بترسێت ناچێتە جەنگەڵان*

توتسکی کە دەم بەدەم نارەحەت تر دەبوو، لە سەری ڕۆیشت:

- باشە فردیش چینکۆ، چۆن دەکرێت ئەم گەمەیە بکرێت بە گەمەی کۆمەڵ؟ گەمەیەکی عەمەلی نییە. من دڵنیات دەکەم کە ئەم جۆرە گەمەیە هەرگیز سەرکەوتوو نابێت. تۆ بە خۆتیش گوتت کە ئەم گەمەیە جاری پێشووش سەرکەوتوو نەبووە.

- چۆن سەرکەوتوو نەبووە؟ ئەدی بۆم نەگێڕایتەوە کە چۆن سێ ڕۆبڵم دزیوە؟ بۆم نەگێڕایتەوە؟

- ڕاستە، بەڵام بە جۆرێکت نەگێڕایەوە کە ڕاست بنوێنێ، لە ڕاستی بچێت و گوێگر باوەڕت پێ بکات، وا نییە؟ گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ، - زۆر ڕاستی دەکرد - کە تۆزێ لەمەپێش گوتی، هەر کە گوێگر بەئاستەم بۆنی درۆی کرد، ئیدی چیرۆکەکە و سیحری چیرۆکەکە بە تاڵ دەبێتەوە و تامی تیا نامێنێ. ڕاستی و حەقیقەت مەگەر بە ڕێکەوت لێرە دەربکەوێت، دەنا دەبێ بە جۆرە لاف و گەزاف و خۆهەڵکێشانێکی درۆ کە بۆ ئێرە و لێرەدا نەک هەر قابیلی قبووڵ نییە، بەڵکو جۆرە بێئەدەبییەکیشە.

فردیش چینکۆ، گوتی:

- ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، بە ڕاستی تۆ پیاوێکی بەئاوەز و هەست ناسک و ئاداب پەروەری! جماعەت ئێوە تەمەشا بکەن، کاتێ گلەیی ئەوەی لێ کردم

کە من نەمتوانیوە چیرۆکی دزییەکەم بە جۆرێ بگێڕمەوە کە لە ڕاستی بچێت و گوێگر باوەڕ بکات، ویستی بە ناسکترین شێواز ئەوەمان تێبگەیەنێ کە من لە ڕاستیدا ناتوانم دزی بکەم (چونکە لە ڕاستیدا پیاو عەیبە لەناو خەڵکیدا باسی ئەو جۆرە شتانە بکات) هەرچەندە ئەگەری ئەوەش هەیە لە دڵی خۆیدا قەناعەتی تەواوی بەوە هەبێت کە فردیش چینکۆ زۆر چاک دەتوانێ دەست بداتە دزی! بەڵام دەی با بێینە سەر کارەکەی خۆمان، ناوەکان هان لەناو کڵاوەکەدا، یەکێکیان ناوی تۆیە ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، کەواتە هەموو قاییلن. دەی میرزادە، دەستی پێدا بکە و ناو دەر بێنە!

میرزادە، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دەستی بە کڵاوەکەدا کرد، ناوەکانی دەر هێنا، ناوی یەکەم هیی فردیش چینکۆ بوو، دووەم، پتیتسن و سێیەم، ناوی جەنەراڵ و چوارەم، ناوی ئافاناسی ئیڤانوڤیچ و پێنجەم، میرزادە خۆی و شەشەم، ناوی گانیا دەر چوو. ئافرەتەکان بەشدارییان نەکردبوو.

فردیش چینکۆ گوتی:

– ئا، خوایا چ بەختێکی خراپم هەیە! بەتەما بووم یەکەم ناو، ناوی میرزادە بێت و پاش ئەو ناوی جەنەراڵ دەر بچێت، بەڵام شوکر ناوی ئیڤان پتروڤیچ پتیتسن لە دوای منە، کە ئەمە بۆ من خەڵاتە. کەواتە جماعەت من وەستا و بەگی ئەم یارییەم، کەواتە دەبێ نموونە و سەر مەشقێکی باش پێشکەش بکەم، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک پتر مایەی داخە بۆ من، ئەمەیە کە من کابرایەکی ڕووتە و گومناوی ئەوتۆم کە هیچ قەپانێک نامخوێنێتەوە، تەنانەت پایە ئیداریەکەشم زۆر نزمە، ئیدی ئەگەر فردیش چینکۆیەکی ئاوها، کارێکی دزێو و قۆڕیشی کردبێ، چ بایەخێکی هەیە؟ دەبێ قۆڕترین و دزێوترین کاری من چ بێ؟ بە ڕاستی هەڵبژاردنی ئەمە قورسە! مەگەر هەر هەمان سەرهاتی دزییەکەم بگێڕمەوە، تا بۆ ئافاناسی ئیڤانوڤیچی بسەلمێنم دەشێت پیاو، بەبێ ئەوەی دز بێ، دزی بکات.

– ئاغای فردیش چینکۆ، تۆ توانیت ئەوەشم پێ بسەلمێنی کە دەشێت پیاو لەزەت لە گێڕانەوەی کاری دزێو ببینێ، بێ ئەوەی داوای لێبکەن بیگێڕێتەوە

. بەهەرحاڵ... ببورە ئاغای فردیش چینکۆ!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە تورەیی و بێتاقەتی گوتی:

– دەست پێ بکە فردیش چینکۆ! بەسە، لەوەی پتر درێژەی مەدەیە، پەکو کە بە تانی قساندا دەچیت! زۆر دەڵێی زۆر!.

هەموو هەستیان کرد کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە دوای نۆرە هیستریاکەی ئەم دواییەوە، خەم و بێدەنگی دای گرتووە و هەر لە خۆوە هەڵدەچێت، بەڵام هێشتا سوورە لەسەر کەڵکەڵە و ئارەزووەکەی. ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، لە عەزابێکی ئەوتۆدا بوو کە عەزابی دۆزەخی پێڕا نەدەگەیی، ئەمە جگە لەوەی کە زۆر لە (ئیڤان ڤیودوروڤیچ)ش پەست و تورە بوو، کە بە کاوەخۆی شامپانیای دەخواردەوە و بێخەم و خەیاڵ دانیشتبوو و پێدەچوو لێبڕابێ هەر کە نۆرەی هات، چیرۆکی خۆی بگێڕێتەوە و تەواو.

پەراوێز:

* – "ئیڤان کیرلوف.." نووسەرێکی بەناوبانگی ڕووسە، زۆر چیرۆکی هەیە کە قارەمانەکانیان، گیانلەبەرن، لەسەر هەمان شێوەی لافونتین نووسیوونی. حیکایەتی "شێر و کەر" کە لێرەدا ناوی هاتووە و لەو چیرۆکانەیە، کەرەکە، شێرەکە بەر لوشکان دەدات.

* – "ئەوەی لە گورگ بترسێت ناچێتە جەنگەڵان" پەندێکی باوی ڕووسییە.

## فەسڵی چواردەیەم

فردیش چینکۆ گوتی:

- من بۆیە زۆر دەڵێم و بە تانی قساندا دەچم، چونکە بێئەقڵم. منیش ئەگەر ئەقڵ و ئاوەزی ئافاناسی ئیڤانوڤیچ یان (ئیڤان فیودوروڤیچ)م هەبوایە، لەوە بوو وەکو ئەوان بە درێژایی ئاهەنگە قڕوقەپ، ئاقڵ و ئاغر بۆ خۆم لە سووچێکدا دابنشتایەم. میرزادە، نازانم تۆش باوەڕت وایە یان نا، من لەو باوەڕەدام کە ژمارەی دزان لە دنیادا زۆر زیاترە لە ژمارەی دەستپاکان و هیچ پیاوێکی دروستکار و دەستپاک نییە کە بەلای کەمەوە لە عەمراتیا جارێک دزی نەکردبێت. شتێکی نە دزی بێت. ئەمە بۆچوونی خودی منە، بەڵام وێڕای ئەوەش، ئەمە بەو مانایە نییە کە تێکڕای بەشەر خڕدزن، هەرچەندە زۆر جار، بەینی خۆمان بێ، حەز دەکەم ئەو باوەڕە بدرکێنم. تۆ چ دەڵێی؟

داریا ئەلکسیڤنا (خانمە لەخۆڕازییەکە) هەڵی دایە و گوتی:

- بە ڕاستی قسەی قۆڕ و بێمانا دەکەی! ئەم گەوجە گەوجە چییە! قەت ئەمە ڕاست نییە، هەموو کەسێک لە ژیانیا، ئەگەر بۆ جارێکیش بووە، دزی یان سووکە دزییەکی هەر کردووە. بۆ نموونە، من یەک لە باری خۆم، قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان شتێکم نەدزیوە.

- داریا ئالکسیڤنا خانم، تۆ قەت دزیت نەکردووە، بەڵام با بزانین میرزادە، کە سوور هەڵگەڕاوە، چ دەڵێت؟

میرزادە، کە بە ڕاستی سوور بووبووەوە، گوتی:
- پێم وایە ڕاست دەکەیت، لێ زۆر زێدەڕۆیی دەکەیت.
- باشە میرزادە، تۆ بە خۆت قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان شتۆکەیەکت نەدزیوە؟
جەنەراڵ، هەڵی دایە و گوتی:
- پیف لەو قسەیە! بە ڕاستی قسەیەکی سەخیفە! باشە ئاغای فردیش چینکۆ، تۆ بیرت لەوە کردووەتەوە کە چی دەڵێی؟
داریا ئالکسیڤنا بە توندی گوتی:
- تۆ کە سەر هاتووەتە سەر ڕاستی، شەرم دەکەی هیچ شتێک بگێڕیتەوە، بۆیە لێبڕاوی بەوە خۆت بپەڕێنیتەوە کە سەر بکەیتە سەر پیاوێکی نەجیبی شەرمنی وەکو میرزادە.
ناستاسیا فیلیپوڤنا بە توندی و پەستی گوتی:
- فردیش چینکۆ! یان چیرۆکەکەت بگێڕەوە یان بێدەنگ بە و خەریکی کاری خۆت بە. بە ڕاستی لە تامی دەر دەکەی!
- زۆر چاکە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەڵام هاتوو میرزادە ئیعترافی کرد ( قسەکەی ئەو بە ئیعتراف دەزانم ) ئاخۆ ئەو کەسەی دی ( نامەوێ ناوی بێنم ) ئەگەر بیەوێ حەقیقەت بڵێ، دەبێ چاوەڕوانی چی لێ بکرێت؟ مەگەر خوا بزانێ چ بگێڕێتەوە! بەڵام گەلۆ، سەبارەت بە خۆم، ئەوەی کە بۆتانی دەگێڕمەوە، شتێکی زۆر سادە، گەوجانە و دزێوە، بەڵام وێڕای ئەوەش دڵنیاتان دەکەم کە من دز نیم، خۆیشم نازانم بۆ ئەو دزییەم کرد! ئەمەی دەیگێڕمەوە پێرار ڕووی دا، لە ماڵی برادەرێک بووین بە نێوی سیمون ئیڤانوڤیچ یەشچینکۆ، یەکشەممە بوو، میوانی هەبوون. کە میوانەکان لە شێوخوارن بوونەوە، بە خۆ و پێکەکانیانەوە، بەدەم قسانەوە لەسەر مێزەکەمانەوە، کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتە سەر کە بە ماریا ئیڤانوڤنای کیژی خانەخوێیەکەمان بڵێم، کەمێک پیانۆمان بۆ لێ بدات. کە بە یەکێک لە ژوورەکاندا ڕەتبووم، ئەسکەناسێکی کەسکی سێ ڕۆبڵێیم لەسەر مێزی کارەکەی ماریا ئیڤانوڤنا بینیی، دیار بوو بۆ کڕینی پێویستییەکی ماڵەکە دەری هێنابوو. هیچ کەسێک لەو ژوورەدا نەبوو. ئەسکەناسەکەم هەڵگرت و لە بەرکم نا، بۆچی؟ نازانم! نازانم بۆچی ئەوەم بە بیردا هات. بەلەز گەڕامەوە و





دووباره چوومەوە سەر مێزەکە و دانیشتم. ئیدی نیگەران و سەراسیمە، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی شتێک بم، دانیشتم. کەوتمە قسان، دەتگوت ئستۆپی چەناگەم پچڕاوە، نوکتە لەسەر نوکتەم دەگوت و پێدەکەنیم. ئەوجا چوومە لای ئافرەتەکانەوە. دوای نزیکەی نیو سەعاتێک، مقۆ مقۆی گوم بوونی پارەکە، دەستی پێ کرد، کارەکەرەکان پرسیارپێچ کران، گومان کەوتە سەر داریای کارەکەری ماڵەکە. بەندە زۆر بە پەرۆشەوە خۆم لە مەسەلەکە هەڵقورتاند، تەنانەت لە پرسوجۆیەکانیشدا بەشداریم کرد، لە بیرمە کاتێ داریا بە تەواوەتی پەشۆکا، من کەوتمە خشت و پای تا قەناعەتی پێ بکەم، کە ئیعتراف بکات، سوێندم بەسەر خۆم بۆ خوارد کە کارێکی وا دەکەم ماریا ئیڤانوڤنا لێی ببورێت، هەر هەموو ئەمە بە بەرچاوی میوانەکانەوە و لە حوزوری ئەواندا بوو. هەموویان تەمەشای منیان دەکرد، منیش کە ئەسکەناسەکە لە گیرفانما بوو، بەدەم ئامۆژگاری و پەندو قسەی زلەوە، بسکەی سمێڵم دەهات و هێندەم کەیف بە خۆ دەهات، شام بە سەپان ڕانەدەگرت! هەر ئەو شەوە خۆم بە ڕیستورانێکدا کرد و سێ ڕۆبڵەکەم خەرجی مەینۆشی کرد. چوومە ژوورەوە، داوای یەک قاپ (لافیت)م کرد، بە بێ مەزە! کە پێشتر قەت شتی وام نەکردبوو، کە بە جارێ قاپێ داوا بکەم و هیچ خواردن و مەزەیەکی لەگەڵدا نەخۆم. خوا خوام بوو، هەرچی زووترە لە شەڕی ئەو پارەیە ڕزگار بم. کەچی نە ئەوسا و نە دواتر هەستم بە پەشیمانی و عەزابی ویژدان نەکرد. باوەڕ ناکەم قەت بتوانم جارێکی دی ئەو کارە دووبارە بکەمەوە، باوەڕ دەکەن یان نا، بەلامەوە گرینگ نییە، کەیفی خۆتانە. تەواو، ئەمە هەموو چیرۆکەکە بوو.

داریا ئالکسیڤنا، بە نەفرەتەوە گوتی:

- بێگومان، ئەمە خراپترین و دزێوترین کاری تەمەنت نەبووە!

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ هەڵی دایە:

- ئەمە کار نییە، بەڵکو حاڵەتێکی نەخۆشیی دەروونییە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بێ ئەوەی نەفرەت و بێزاریی خۆی وەشێرێ پرسیی:

- ئەدی کارەکەرەکە چیی بەسەر هات؟

- بۆ بەیانی یەکسەر دەریان کرد، ئەو ماڵە، لەو ڕووانەوە زۆر سەختگیر

بوون!

- تۆش خۆت لێ نەکرد بە خاوەن، وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەر چوویت؟

فردیش چینکۆ، کە سەری لە کاریگەریی سەلبی چیرۆکەکەی بەسەر ئامادەبووانەوە سوور مابوو، گوتی:

- سەیرە! یانی دەتانویست بچم، خەبەر لە خۆ بدەم و دان بە کارە دزێوەکەی خۆمدا بنەم!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، گوتی:

- کە کارێکی ناشیرینە!

- حەی! دەتانەوێ یەکێک بێت خراترین و قۆڕترین کاری خۆی بگێڕێتەوە و ئەنجام بە قۆڕی نەزانن؟ دیارە خراترین کار هەمیشە هەر نا شیرین و قێزەونە. دوای تۆزێکی دی ئیڤان پتروفیچ پتیتسن ئەمەمان بۆ دەسەلمێنێ، زۆر کەس بە ڕواڵەت جوان دەنوێنن، وا دەنوێنن کە نموونەی دروستکارین، چونکە دەوڵەمەندن و خودان سەروەت و سامانن! بەڵام لەم ڕۆژگارەدا چی زۆرە دەوڵەمەندو خودان سەروەت و سامان زۆرن! بەڵام خۆزگە دەمانزانی چۆنیان ئەو سەروەت و سامانە کۆ کردووەتەوە... بێگومان ئەوانە لە هیچ شتێک ناپرینگێنەوە، بە هیچ کلۆجێ ئیحراج نابن و لە ڕوو دانامێنن!

بەهەرحاڵ فردیش چینکۆ، پەتی پچڕیبوو، زمانی بەرەڵلا کردبوو، هەموو سنوورێکی بەزاندبوو. لەپڕ چارەی گرژ بوو. لەوەدەچوو چاوەڕوانی ئەوە بێ کە چیرۆکەکەی کاریگەرییەکی پێچەوانەی ئەم کاریگەرییەی ئێستای لەسەر میوانەکان هەبێ، کە هەڵبەتە چاوەڕوانییەکی سەیر و غەریب بوو! هەڵبەتە ئەم جۆرە پێشبینی و چاوەڕوانیە کە زادەی بێ ئەقڵی و توتسکی گوتەنی جۆرە خۆ نوێنییەکی تایبەتی بوو، شتێکی باو بوو لای فردیش چینکۆ و دەگەڵ سروشت و تەبیعەتی ویدا تەواو دەگونجا.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، زۆر تورە بوو، نیگایەکی غەزەبناکی فردیش چینکۆی کرد کە وەکو کەو چوو، ترس لە سەراپای نیشت، لە جێی خۆی بەنج بوو، هەستی کرد سنووری بەزاندووە و کەمێک زیاد ڕۆییوە.

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ توتسکی بەدەم پێشنیازێکی تەشەر ئامێزەوە گوتی:

- ئەرێ، باشتر نییەواز لەم یاریە بێنین؟





پتیتسن گوتی:

- هەنوکە نۆرەی منە، بەڵام من کە هەقی ڤیتۆم هەیە، بەگوێری هەقی ناڤبری، هیچ شتێک ناگێڕمەوە.

- هیچ ناگێڕیتەوە؟

- ناتوانم ناستاسیا فیلیپوڤنا. من ئەمە بە کەربازاڕ دەزانم نەک بە یاری!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕووی کردە جەنەراڵ یەپانچین و گوتی:

- جەنەراڵ، پێم وایە هەنوکە نۆرەی تۆیە. ئەگەر تۆش ڤیتۆ بەکار بێنی، یانی یارییەکەمان بە تەواوەتی هەڵدەوەشێتەوە، کە هەڵبەتە من ئەمەم زۆر پێ ناخۆشە، چونکە بە نیاز بووم بەگێڕانەوەی کارێکی تایبەتی ژیانی خۆم، کۆتایی بە یارییەکە بێنم، بەڵام دەمویست دوای ئێوە، تۆ و ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، بیگێڕمەوە.

ئەوسا بە پێکەنینەوە لە سەری ڕۆیشت:

- بۆیە دەبێ هانم بدەن.

جەنەراڵ، بە جۆشوخرۆشەوە گوتی:

- ئا، ئەگەر تۆ بەڵێن بدەی، من ئامادەم سەرپاکی چیرۆکی ژیانم بگێڕمەوە. حەز دەکەم ئەوەشت پێ بڵێم کە چیرۆکێکم ئامادە کردبوو هەر کە نۆرەم هات، بیگێڕمەوە..

فردیش چینکۆ، کە هێشتا مەلول و خەمین بوو، کەمێک بوژایەوە و بەدەم ژارخەنێکەوە گوتی:

- پایە بەرز، پیاو هەر بە سیماتا، دەزانێ کە بە چ ئاوو تاوێک و، بە چ شێوازێکی ئەدیبانە چیرۆکەکەت، ڕازاندووەتەوە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، نیگایەکی سەرڤەسەرڤەی جەنەراڵی کرد و بزەیەکی بە ڕوویادا. وێرای ئەوەش دیار بوو کە دەم بەدەم گژرتر دەبوو، پتر نیگەران و شپرزە دەبوو. (توتسکی)یش لەوساوە، کە زانیی ناستاسیاش، بەڵێی داوە چیرۆکێکی بگێڕیتەوە، هەستی بە نیگەرانییەکی زۆر دەکرد.

جەنەراڵ، دەستی پێکرد، گوتی:

- گەلۆ، منیش وەکو هەر مرۆڤێکی دیکە، لە ماوەی ژیانما، ڕێک کەوتووە کە کاری خراپ بکەم، کارێک کە پەشیمانی لەدوا بێت، بەڵام خراپترن کارم





بەڕای خۆم ئەمەیە کە هەنوکە بۆتانی دەگێڕمەوە. دروستە نزیکەی سی و پێنج ساڵ بەسەر ئەم چیرۆکەدا بوریوە، بەڵام هەر کاتێ بیرم دەکەوێتەوە، دڵم دەگوشرێت، بەهەرحاڵ گەوجێتیەک بوو و کردم. ئەوسا هێشتا لە سوپادا، تازە ئەفسەر بووم، بە خۆتان دەزانن تازە ئەفسەر یانی چی: خوێنگەرمی گیرفانسارد، لووتبەرزی، لات پاڵەوانی خوا. خزمەتکارێکم هەبوو بە نێوی نیکیفۆر، ئەم پیاوە زۆر دڵسۆزی من و بە تەنگمەوە بوو. هەموو ئەرکێکی ماڵی لە ئەستۆ گرتبوو، پینەوپەڕۆی دەکرد، ماڵی پاک دەکردەوە، ژوورەکانی دەسڕی، تەنانەت لەپێناوی ئاسوودەیی مندا، لە هەر شوێنێکدا شتێکی بەردەست کەوتبا دەیدزی، بە ڕاستی کەسێکی بەئەمەک و دروستکار و سەرڕاست و مەردانە بوو. منیش دەرهەق بەوی ئاغایەکی سەختگیر بەڵام بە ئینساف و دادپەروەر بووم. ئەوسا لە شارێکی چکۆلەدا جێگیر بووین، ماوەیەک لە سەربازخانەدا ماینەوە، پاشان، کارتی نیشتەجی بوونیان دامێ، لە گەڕەکێکی قەراخ شاردا، لە ماڵی بێوەژنی، ملازمێکی خانەنشین، ئاکنجی بووم. ئەم داماوە، ژنێکی کورتە باڵای، نزیکەی هەشتا ساڵ دەبوو. لە خانوویەکی دارینی لە خۆی وێرانتر و داڕوخاوتردا دەژیا، ئەوەندە دەستکورت و نەدارا بوو، تەنانەت کارەکەرێکی نەبوو لە کاروباری ماڵدا، یارمەتیی بدات، بەڵام کاتی خۆی کەسوکارێکی زۆری هەبووبوو، ئیدی بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار هەندێکیان مرد بوون و هەندێکیان لەو شارە باریان کردبوو، هەندێکیانیش فەرامۆشیان کردبوو. مێردەکەی چل و پێنج ساڵ لەوە پێش مردبوو و هەر لەوێندەر بە خاکی سپاردبوو. ماوەیەکی زۆر کچە خوشکێکی هێنابووە لای خۆی، ئەم خوشکەزایەی ئافرەتێکی قەموور بوو، دەیانگوت، شڕندە و ئەهریمەن سیفەتێکی، جادوگەر ئاسا بووە و جارێک قامکی میمکی گەستبوو، بەڵام ئەویش بەر لە سێ ساڵێک مردبوو، ئیدی پیرەژن بە تەنیا مابووەوە و سێ دانە ساڵ بوو بە خۆی و بە تەنیا کاروباری ماڵەکەی بەڕێوە دەبرد. پیاو ڕاست بڵێ لەو ماڵەدا زۆر بێتاقەت و بێزار بووم، هەستم دەکرد لە دۆزەخام. بە تایبەتی کە ئەو لەوە پیرتر بوو، کە بتوانم وەکو هاودەم و هاونشین بەرخوردی دەگەڵ بکەم. ئەمە درێژەی کێشا تا ڕۆژێک لەنێو ڕەوە مریشکەکانما، کەڵەشێرێکیان لێ دزیم. ئیدی تا ئەمڕۆش نەمزانی کێ ئەو





دزییەی لێ کردم، بەڵام هەر شکم لەو بوو. شەڕێکی گەورەمان لەسەر ئەم کەڵەشێرە کرد. ئیدی دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم توانیم لەسەر داوای خۆم ئیزنی گۆڕینی شوێنەکەم وەر بگرم، ئیدی گواستمەوە بۆ گەڕەکێکی دی، چوومە ماڵی کابرایەکی بازرگانی ڕدێندرێژی خێزاندار، ئەوەندە جوان لە بیرمەوا دەزانم ئێستایە. نیکیفۆرو من، پیرەژنمان جێ هێشت و گواستمانەوە، هەر دووکمان زۆر خۆشحاڵ بووین.

دوای سێ ڕۆژ، کە لە مەیدانی مەشق و ڕاهێنان گەڕامەوە، نیکیفۆر بە پیرمەوە هات و گوتی: "جەنابی سەروان، نە دەبوو قاپی شۆرباکەمان بۆ پیرەژن بەجێ بێڵی، ئێستا قاپ نیە شۆربای تێ بکەم." هەڵبەتە لە سەرسامیدا وشک بووم و گوتم: "بۆچی جێمان هێشتووە؟" هەنگێ نیکیفۆر لە سیری تا پیازی بۆ گێڕامەوە، تومەز وەختێ کە بارمان کردووە، پیرەژن قاپەکەی نەداوەتێ و گوتوویەتی کە گوایە من کاسەیەکی ئەوم شکاندووە`و ئەویش ئەم قاپەی لەجیاتی کاسەکەی خۆی هەڵگرتۆتەوە و گوایە من خۆم ئەو پێشنیازەم بۆ کردووە. کە نیکیفۆر ئەوەی بۆ گێڕامەوە، خوێنم هاتە جۆش، لە داخانا گڕم گرت و بەرە و ماڵی پیرەژن وەڕێ کەوتم. کە گەیشتمە ئەوێندەر، ئیمانم لە کەلەدا نەمابوو، سەیرم کرد پیرەژن بە تاقی تەنیا لە گۆشەیەکی دالانەکە دانیشتووە و ڕوومەتی ناوەتە ناولەپی و لە تۆ وایە خۆی لە تیشکی هەتاوەکە دەپارێزێت. یەکسەر دەمم لێکردەوە و بەر دەمرێژی جنێو و سخێفانم دا: "هەی پیرە دەعەجانی ناشیرین! ..." ئیدی دەمم لێ بەرەڵلا کرد و بە شێوازی کۆنی ڕووسی، هەرچیم لە جنێو و قسەی ناشیرین دەزانی، هەمووم بەسەریا هەڵڕشت، بەڵام شتێکی زۆر سەیرم لێ بینی: بەو دەقەوە کە دانیشتبوو، ڕووی تێ کردم و زەق زەق، چاوە ئەبڵەقەکانی تێبڕیم و تاقە وشەیەکی لە زار نەهاتە دەر، بەرد وەجواب هات، پیرەژن وەجواب نەهات. بە جۆرێکی سەیر تەمەشای دەکردم. وا دەهاتە بەرچاو بەدەم دانیشتنەوە کەمێک بهەژێ. ئەنجام هێور بوومەوە. بەوردی تەمەشام کرد، چەند پرسیارێکم لێ کرد، بەڵام بە تاقە وشەیەکیش وەڵامی نەدامەوە. سەرم لەم بێدەنگییەی سووڕ ما، بە تایبەتی لەو جەوەدا کە مێشان بە گیزە گیز دەسووڕانەوە و هەتاو بەرە و ئاوا بوون دەچوو. بەتەواوەتی سەراسیمە بووبووم، ئەنجام بە شپرزەیی بەرەو ماڵ پەل بوومەوە. بەر لەوەی بگەمەوە ماڵ، سەرگورد ناردی بە





شوێنماو ناچار ڕۆیشتم بۆ پەلەکەی خۆم، بۆیە دێرکەوتم و شەوێ بۆ ماڵ گەڕامەوە، یەکەم قسەی نیکیفۆر ئەوە بوو: "دەزانی قوربان، خاوەن خانووەکەی پێشوومان قەزاوبەلای تۆی بردووە؟ پرسیم: کەی؟ گوتی ئەمشەو، نزیکەی سەعات و نیوێک دەبێت. دیارە ئەو کاتانەی کە من جنێوبارانم دەکرد، لە حاڵی مردندا بووە! باوەڕبکەن بە جۆرێ تاسام، تا ماوەیەکی زۆر ئەوجا وەخۆ هاتمەوە. ئیدی پیرەژن و تاپۆی پیرەژن بوو بە نوسنەک و بە بەرۆکی هزر و بیرمەوە نووسا، لێم نەدەبووەوە، تەنانەت شەویش هاتە خەونم. دروستە من کەسێکی خورافاتی نیم، بەڵام بۆ ڕێوەرەسمی بەڕێکردن و ناشتنەکەی، کە سێ ڕۆژ دوای مردنەکەی ئەنجام درا، چووم. وام لێهات ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بیرم لەو ڕێکەوتە دەکردەوە. هەڵبەتە ناڵێم ئەم چیرۆکە هەموو هۆشوگۆشی داگیر کردبووم، بەڵام لەناکاوا بیرم دەکەوتەوە و هەستم بە بێزاری و نیگەرانییەکی زۆر دەکرد. شپرزە دەبووم و دەپەشۆکام. ئەنجام تێگەیشتم ئەوەی لە هەموو شتێک پتر خەمباری دەکردم ئەوەیە کە: ئەم ژنە، یان بە زمانی ئەم سەردەمە، ئەم بوونەوەرە بەشەرییە، ماوەیەکی زۆر زۆر ژیابوو، لە بیری مردن چووبووەوە ! کاتی خۆی منداڵ، مێرد، خێزان، خزم و خۆێشی هەبووە، دەور و بەری پڕ لە جم و جۆڵ و هاتوچۆ و، بزە و پێکەنین بووە، پاشان، لەناکاودا، هەموو شتێک لە بەین چووە و هەڵم ئاسا چووە بە ئاسمانا و بە تاقی تەنیا وەکو مێشێکی پایز گێژوویژ ماوەتەوە، دواجار خواوەند کۆتایی بە ژیانی هێنا، پیرەژنش لە زەردەپەڕی هاوینە ئێوارانێکی ئارامدا، گیانی سپارد و چووە ڕیزی نەبووانەوە. هەڵبەتە دەشێت پەند و عیبرەت لەم دیاردەیە وەر بگیرێت. جا وەرە بیهێنە بەرچاوی خۆت، یارۆی تازە ئەفسەر، گەنجی بادیهەوا، لەو ساتەدا لەجیاتیی دووعای خێر و فرمێسکی ماڵاوایی، دەست بخاتە کەلەکەی، خۆی پڕ با بکات و لە دوا سەفەری پیرەژندا، لە سەر قاپێک، بە دەمڕێژی پیسترین جنێو بە ڕێی بکات! گومانی تیا نیە کە من تاوانباربووم، ئەمە هیچ چەند و چون و گەنگەشەیەک هەڵناگرێت. هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو کارەدا تێپەڕیوە و تەبع و تەبیعەتی من گۆڕاوە و وا تەسەور دەکەم من و ئەو کارە بە یەکدی نامۆین، کەچی تا ئیستاش هەست بەداخ و کەسەر دەکەم، پێم سەیرە کە بۆچی لە دڵم دەرناچێت! لە کاتێکا ئەگەر گوناهکاریش

بووبم، هەموو گوناهـ و خەتایەکە هی من و لە ئەستۆی مندا نەبووە، ئاخر بۆچی دەبێ لە هەمان ساتدا بمرێت؟ ئەمە تەنیا یەک لێکدانەوە هەڵدەگرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کارە خراپ و قێزەونەی من، زادەی حاڵەتێکی سایکولوژی بووە. کەچی وێڕای ئەوەش، هەر دڵم ئاسوودە نەبوو تا نزیکەی پازدە ساڵێک لەمەوبەر بڕیارم دا کە خەرجی دوو پیرەژنی کەترەخانەیەک لە ئەستۆ بگرم، تا دوا ساڵەکانی تەمەنی دنیای فانیان بە ئاسوودەیی و بێخەمی بەرنە سەر و بە نیازم ئەم یارمەتییە بە وەسیەتنامەیەک بکەم بە دایمی و لە دوای خۆیشم هەر بمێنێ. ئەمە هەموو چیرۆکەکەی من بوو. دووبارەی دەکەمەوە کە ڕەنگە لە ژیانی مندا زۆر کاری خراپ و تاوانی دیکە هەبن، بەڵام ئەم کارەی کە هەنوکە بۆم گێڕانەوە، بەلای خۆمەوە، خراپترین کارە کە لە ژیانما کردبێتم.

هەر کە جەنەراڵ، لە قسەکانی بووەوە، فردیش چینکو هەڵی دایە و گوتی:

– قوربان، تۆ لەجیاتیی چیرۆکی خراترین کاری تەمەنت بگێڕیتەوە چیرۆکی باشترین کاری تەمەنی خۆت بۆ گێڕاینەوە، ئەزت تێدا شەرمەزار کرد.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە هێوری و خەمساردی و نەباوەڕییەوە گوتی:

– جەنەراڵ، بە ڕاستی وێنام نەدەکرد، ئەوەندە دەست و دڵ باش بی! حەیفێ... خەجاڵەت خۆم...

جەنەراڵ، بەدەم پێکەنینێکی مەحەبەت ئامێزەوە گوتی:

– خەجاڵەت؟ بۆچی؟

هەنگێ بە کەشوفش و لەزەتەوە قومێکی لە شامپانیاکەی دا. هەنوکە نۆرە ئافاناسی ئیڤانوفیچ بوو کە ئەویش خۆی ئامادە کردبوو، سەربردەیەک بگێڕێتەوە. هەموو ئامادەبووان، پێشبینیی ئەوەیان دەکرد کە ئەو بە پێچەوانەی پتیتسنەوە ڤیتۆ بەکار ناهێنێ، هەندێکیان، لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی، بە تاسەوە چاوەڕوانی چیرۆکەکەی ئەو بوون و ژێراوژێریش تەمەشای ناستاسیا فیلیپوڤنایان دەکرد. ئافاناسی ئیڤانوفیچ، بەوپەڕی ویقار و بە دەنگێکی نەرم و خۆش، دەستی بە گێڕانەوەی یەکێک لە "سەربردە خۆشەکانی خۆی" کرد. (پێویستە بەلەز ئەوە بڵێین کە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، پیاوێکی میانساڵی، بالابەرزی، بەهەیبەتی، کەمێک سەرتاسی، قژ ماشوبرنج بوو، تا ڕادەیەک قەڵەو، گۆناکانی خڕ و کەمێک ئاڵ، دانەکانی عەمەلی بوون.

جلەکانی دەڵب و گرانبەها بوون، کراسێکی هێندە سپی لەبەر بوو، چاوی دەخستە رێشکەوپێشکە. دەستەکانی خڕین و سپی بوون، موستیلەیەکی ئەڵماسی گرانبەها، لە قامکی براتوتەی دەستی راستیا دەدرەوشایەوە.) بە درێژایی ماوەی چیرۆک گێڕانەوەکەی ئەو، ناستاسیا فیلیپوڤنا چاوی بڕیبووە، ئەو تۆڕ و قەیتانانەی سەری قۆڵی کراسەکەی رازاندبووەوە و بە دوو قامکی دەستی چەپی یاریی پێ دەکردن و بە جۆرێ خۆی خافڵاند کە فریا نەکەوت بۆ تاقە جارێکیش نیگایەکی یارۆی چیرۆکبێژ بکات.

ئافاناسی ئیڤانوفیچ، دەستی بە حیکایەتەکەی کرد و گوتی:

– ئەوەی ئەرکەکەی منی سووک کردووە، ئەوەیە کە ناچاری ناچارم، دزێوترین و خراپترین کارێک بگێڕمەوە کە لە ژیانما کردوومە. جا لەم حاڵەتەدا، جێگەی هیچ دوو دڵیەک نامێنێتەوە، ویژدان و بانگەواز و گازی دڵ، خۆ بەخۆ ئەو شتە دەسەپێنن کە پێویستە ئاشکرا ببێت و بێتەزانین. پێویستە، هەڵبەتە زۆر بەداخەوە، دان بەوەدا بنەم کە لەنێو هەموو کارە شێتانە و بێ ماناکانما، یەکێکیان لە هەموویان زیاتر لە ناخما نەخشی بەستووە و قەت لە بیرم ناچێتەوە. ئەم بویەرەی باسی دەکەم هیی نزیکەی بیست ساڵ لەمە بەرە، چووبوومە گوندی بۆ سەردانی ئەفلاتوون ئوردنتسیوڤ کە تازە بۆ پۆستی مارشالی چینی ئەشرافان هەڵبژێردرابوو و دەگەڵ ژنە گەنجەکەیدا هاتبوو کە پشووەکانی کۆتایی ساڵ لە ناو زەویوزار و موڵکەکانی خۆیدا بەسەر بەرێت. ئیدی ساڵیادی لەدایکبوونی (ئانفسیا ئەلکسیڤنا)ش کەوتبووە هەمان ماوەوە، ئیدی دوو کەرنەڤاڵ و ئاهەنگی سەما سازدرا بوو. لەو سەرو بەندەدا رۆمانەکەی ئەلکسندەر دۆمای کوڕ (شۆخەکەی کامیلیا) تازە لەنێو کۆمەڵگەی ئەشرافدا رەواجی پەیدا کردبوو، هەرایەکی زۆری لەو ناوەندەدا نابووەوە. ئەم بەرهەمە، بە بۆچوونی من کارێکی ئەدەبی نەمرە و پیرش نابێت. هەموو خانمانی شارە دێ و شارۆچکەکان، بە تایبەتی ئەوانەی خوێندبوویانەوە، زۆریان بەدڵ بوو. جوانیی چیرۆکەکە، ناسکیی هەڵوێستەکان، رەفتاری رەسەنی شا قارەمانی رۆمانەکە، وەسفی ناسکیی ژینگە دڵگیرەکان و هەرهەموو ئەو ناسککاری و هونەر کاری و شیکردنەوە بەرزەی لە سەرانسەری رۆمانەکەدا بەدی دەکرا ( وەکو بەکارهێنانی چەپکە گوڵە کامیلیای سپی و سوور بە نۆرە.) بە کورتییەکەی رۆمانەکە بە شێوەیەکی

گشتی کارێکی زۆری لە دڵ و دەروونی خەڵکەکە کردبوو. ئیدی گوڵی کامیلیا بووبوو بە مۆدی ڕۆژ و خەڵکی بە پەرۆشەوە بەدوایدا دەگەڕان و بە هەر نرخێ بوایە دەیان کڕی. جا من ناڵێم، ئێوە خۆتان بڵێن چۆن لە شارۆچکەیەکی بچووکدا، لە حاڵێکا هەموو خەڵکی بیانەوێ گوڵی کامیلیا بۆ کۆڕ و ئاهەنگی سەما بکڕن، با ئاهەنگەکان زۆرش نەبن، چۆن ئەو هەموو گوڵە دەست دەکەوێ؟ جا لەو سەرو بەندەدا پتروس فورخوفسکی شێت و شەیدای ئانفسیا ئەلکسیڤنا بوو، تاکو ئێستاش نازانم ئاخۆ ڕاز و نیازێکیان لەنێواندا هەبوو یان نا- مەبەستم ئەوەیە کە نازانم بە ڕاستی بە ئومێدی شتێک هەبوو یان نا؟ ئەو گەنجە داماوە، وەکو سەگی پێ سووتاو، لێرە و لەوێ کەوتبووە تاقیبی گوڵی کامیلیا تا بۆ ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونی ئانفیسا ئەلکسیڤنای بکڕێت.. دەنگۆی ئەوەش داکەوتبوو کە کۆنتیسە سووتسکی دەستە خوشکی هاوسەری فەرماندار و سۆفیا پسپالوڤا لە پترسبۆرگەوە دێن و بە چەپکە گوڵی کامیلیای سپییەوە دێن. ئانفیسا ئەلکسیڤناش حەزی دەکرد کەسێک هەبێت و چەپکە گوڵی کامیلیای سووری بۆ بێنێ و ڕەونەقێکی ئەفسووناوی پەیدا بکات. ئیدی ئەفلاتوونی بێچارە، وێڵ و سەرگەردان، بێهودە عەودالی ئەم گوڵە بوو. ئاخر یارۆ مێردی ئانفسیا بوو و بەڵێنی پێ دابوو کە چەپکە کامیلیایەکی سووری بۆ پەیدا بکات. دەی چار چییە؟ کاترین ئەلکسندرفنا میتشیفا، کە لە هەموو شتێکا ڕەقیبی سەر سەختی ئانفسیا ئەلکسیڤنا بوو، هەڤڕکییەکەیان بەڕادەیەک بوو کە سێبەری یەکتریان بە تیر دەنگاوت، ئەم ئافرەتە، ڕۆژێک بەر لە دەستپێکردنی ئاهەنگەکە، هەرچی گوڵە کامیلیای سووری دەڤەرەکە هەبوو، کۆی کردبووەوە. دەزانن چی قەوما؟ ئانفسیا ئالکسیڤنا. شێت ئاسا سەری کردە گریان، لە داخا بورایەوە... ئەفلاتون، بە تەواوەتی شپرزە بوو! هەڵبەتە ئەگەر پتروس بیتوانیبا لەم ساتە هەستیارەدا چەپکە گوڵی دڵخوازی خۆی پەیدا بکات، بۆ خۆی خەنی دەبوو، چونکە لەم جۆرە حاڵەتانەدا پێزانین و منەتباری ژن لەڕادەبەدەرە و سنووری نیە. ئیدی پتروس، شێت ئاسا، سەری بە هەموو کونێکا دەکرد و لە هەر دەرگایەکی دەدا، بەڵام بێهودە، زۆرانبازی دەگەڵ مەحاڵدا دەکرد. ئیدی واقیعەکە وا بوو!

ئێوارەی پێش ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونەکەی ئانفسیا و ئاهەنگی

سەماکە، چووم بۆ ماڵی زوبکوف کە دراوسێی ماڵی ئۆردنتسیڤ بوو. سەعات دەی شەو بوو، لەوێ بەڕێکەوت (پتروس)م بینی، لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری. پرسیم:

- خێرە، چی ڕووی داوە؟

- ئۆریکا(*) (دۆزیمەوە)!

گوتم:

- سەیرە! بە ڕاست؟ چۆن دۆزیتەوە؟ لەکوێ؟

- لە شارۆچکەی یکسایسک (شارۆچکەیەکی چکۆلەیە، بیست فەرسەخێک لەوێوە دوور بوو) بازرگانێکی پیری ڕیشنی دەوڵەمەندی لێیە، ناوی تریبالوفە. هەر خۆی و ژنەکەیەتی. منداڵیان نییە، لەجیاتیی منداڵ، کەناری بەخێو دەکەن، زۆر ئاشقی گوڵن و کامیلیایان هەیە.

- باشە خۆ ئەمە مسۆگەر نییە، تەقو نەیاندایتێ؟

- خۆمی لە بەرپێیان دەهاوێژم و بشمکوژێ هەڵناستمەوە تا گوڵم نەداتێ!

- کەنگێ دەچیت بۆ لای؟

- سارەزی، سەعات پێنج.

- چاکە. دووعای خێرت بۆ دەکەم!

بە ڕاستی هەستم بە شادیەکی زۆر کرد. گەڕامەوە بۆ ماڵی ئۆردنتسیڤ. شەو درەنگ بوو، لەو کاتەدا کە دەچووم بچمە جێوە تا بخەوم، لەناکاودا خەیاڵێکی سەیرم بە مێشکا هات. بەلەز چووم بۆ موبەقەکە، ساڤیلی گالیسکەڕانم بێدار کردەوە، پێم گوت لە زەرفی نیو سەعاتدا گالیسکەکە ئامادە بکات، بەڵێنم دایە کە هەقی ئەوە پازدە ڕۆبڵ بەخشیشی دەدەمێ، لە ماوەی نیو سەعاتدا، ئەسپ و عەرەبانەی حازر کرد و لە بەردەگا چاوەڕوانی من بوو. پێیان گوتبووم کە ئانفسیا ئالکسیڤنا، تووشی سەریەشە بووە و تای لێهاتووە و وڕێنە دەکات و دەبزڕکێنێ.

سواری گالیسکە بووم، بۆی دەر چووین، یکسایسک خۆت بگرەوا هاتم. پێش سەعات پێنج گەیشتمە قەراخ شار، لەوێ وەستام و چاوەڕوانی هەڵاتنی ڕۆژم کرد. کە ڕۆژ هەڵات کەوتمەوە ڕێ، سەعات حەوت خۆم گەیاندە ماڵی تریبالوف، حاڵ و حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتم:

- گوڵی کامیلیات هەیە؟ وەرە پیاوی چابە، وەکو بابێکی دلۆڤان فریام بکەوە

و ڕزگارم بکە، خۆم لەبەر پێیانت داوێم و بە مەمنوونییەوە لێت دەپاڕێمەوە. کابرا، پیرەمێرێکی بالآبەرزی، پۆڕسپی، بەگوڕ و بە هەیبەت و ترسناک بوو. وەڵامی دایەوە:

– نا.. نا.. نا! نابێ، ناتدەمێ، بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەکە، مەحاڵە ناتدەمێ!

خۆم هاویشتە بەرپێیانی، کەوتمە سەر چۆکان. کابرا ترسا، هاواری کرد.

– ئەوە چ دەکەی کوڕم؟ خودایا، بۆچی وا دەکەی؟

هاوارم کرد:

– مەسەلەکە، ژیان و مەرگی ئینسانێکە!

گوتی:

– ئەگەر مەسەلەکەوایە... بڕۆ گوڵە کامیلیاکان بچنە، لە ڕای خوا بیانبە.

هەستام، چی کامیلیای سوور لە باخچەکەیدا هەبوو، هەموویم چنی. گوڵ بوون ئەمما گوڵ! تا حەزکەی دڵگیر و جوان! پیرەمێر ئاهێکی هەڵکێشا. ئەسکەناسێکی سەد ڕۆبڵیم دەر هێنا و بۆم درێژ کرد.

گوتی:

– نا،کوڕم نا، جنێوی وام پێم مەدە!

گوتم:

– باشە مادام وایە، تکا دەکەم پارەکەم لێ وەر بگرە و بیدە بە نەخۆشخانەکەی ئێرە، تا بیکەنە مەسرەفی نەخۆشەکان.

گوتی:

– ئەمەیان شتێکی دیکەیە گیانە! ئەمە کاری خێرە، خواش پێی خۆشە. من لەجیاتیی تۆ ئەم بەخشییە پێشکەش بە خەستەخانەکە دەکەم.

خۆشم لەو پیرەمێردە هات، ڕووسی ئەسڵ بوو، تاسەر مۆخ، ڕووسی بوو، ڕەسەنایەتیی لێدەچۆڕا، دیار بوو لە بنەماڵەیەکی خانەدانە.

من کە بە ئاواتی خۆم گەیشتبووم، بەوپەڕی خۆشحاڵی گەڕامەوە، بەڵام لا ڕێم گرت تا لە ڕێگە تووشی پتروس نەبم. کە گەیشتمەوە یەکسەر چەپکە گوڵەکەم نارد، تا هەرکە ئانفیسا ئالکسیڤنا لە خەوا ڕابوو، پێشکەشی بکەن... ئیدی خۆتان تەسەوری سەرسامی، منەتباری و فرمێسکی هەقناسی ئەو ژنە بکەن! ئەفلاتوونی مێردی، کە دوێنێ خەریک بوو لە داخانا دەمرد، سەری

خستە سەر شانم و ما بگری. ئەفسووس هەموو مێردێک لەو ڕۆژەوە کە زەوجینی شەرعی پەیدا بووە، تاکو ئەمڕۆکە هەر وا بوون! ئەوەی ڕاستی بێ زات ناکەم هیچی تر لەو بارەیەوە بڵێم، جگە لەوەی کە هەموو ئاواتێکی ئەو پتروسە بەستەزمانە بە تەواوەتی هەرەسی هێنا. هەوەڵ جار وام خەیاڵ دەکرد ئەگەر بە حەقیقەتی ئەم کارەی من بزانێت لەوەیە گۆشاوگۆش سەرم ببڕێت و تەنانەت خۆیشم بۆ شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە کرد، بەڵام شتێک ڕووی دا کە هەرگیز تەسەورم نەدەکرد، باوەڕم نەدەکرد شتی وا ڕوو بدات: پتروس بورایەوە، شەوێ کەوتەورێنە و دەی بزڕکاند، بۆ بەیانی تایەکی توندی لێهات، وەکو منداڵ، بەدەم هەنسک هەڵدانەوە زۆڕ زۆڕ دەگریا. دوای مانگێک، پاش ئەوەی چاک بووەوە، داوای کرد بۆ دەڤەری قۆقاز* نەقڵ بکرێت. ئەم کارەی لە چیرۆکی خەیاڵی دەچوو! ئەنجام لە شەڕی قرمدا کوژرا. جا هەر لەو سەروبەندەدا بوو کە ستیفان فورخوفسکی-ی برای، لەو دەڤەرەدا کە فەرماندەی کەتیبەیەکی سوپا بوو، ناوبانگی دەر کرد.

لیتانی ناشارمەوە تا ساڵانێکی زۆر لەوەدوا، بەدەم عەزابی ویژدانەوە دەتلامەوە: بۆچی و بە چ مەبەستێک ئەو جەزرەبەیەم لێ دا، ئەو غەدرەم لە پای چیی لێ کرد؟ جا خۆزیا منیش وەکو ئەو شەیدای ئانفیسا ئالکسیڤنا بوایەم و بە ڕەقیب و هەڤڕکی خۆمم زانیبا تا بەوە کەمێک دڵی خۆم داباوە، بەڵام شتەکەوانەبوو! تەنیا جۆرە موزیری و گوساخیەکی ڕووت بوو و هیچی تر. ئەگەر من ئەو چەپکە گوڵەم لە کیسی نەدابا، لەوە بوو تا ئێستاش ژیابا و زۆریش بەختەوەر بوایە و هەرگیز بیری لەوە نەکردباوە کە بچێتە شەڕی تورکان.

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، وەکو چۆن بە هێوری و ئارامی دەستی بە چیرۆکەکەی کردبوو، بەو ئاوایەش کۆتایی پێ هێنا. ئامادەبووان کە سەرنجی ناستاسیا فیلیپوڤنایان دا، دیتیان گڕ لە چاوانی دەبێتەوە، تەنانەت کە ئافاناسی ئیڤانوڤیچ لە چیرۆکەکەی بووەوە، لێوانی لەرزین. هەموو ئامادەبووان، بەکونجکاوی دەیانڕوانییە ئەو جووتە.

فردیش چینکۆ، کە زانیی قافی قسە هاتووە، بە ئەوکی پڕ لە گریانەوە گوتی:

- فردیش چینکۆیان هەڵخەڵەتاند! پێیان ڕابواردا! دەسخەڕۆیان کرد! ئەوە پێی دەگوترێ خاپاندن و خەڵەتاندن!





داریا ئەلکسیڤنا کە لە دۆستانی دێرین و شەریک و هاودەستی هەمیشەیی توتسکی بوو، بە کەشوفشەوە گوتی:

- کێ زۆری لێکردبوویت! تۆ کە کاری خۆت نازانی، بۆ گلەیی لە خەڵکی دەکەیت؟ دەبوایە لە هەوەڵەوە لە گەمەکە بگەیت. دەبوایە لە خەڵکانی فامیدە و زیرەکەوە فێری بیت.

ناستاسیبا فیلیپوڤنا، بە ساردی و بێموبالاتییەوە گوتی:

- ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، هەق بە تۆیە، ئەم گەمەیە زۆر ناخۆشە، ئینسان بێزار دەکات، با وازی لێ بێنین. منیش بەڵێنی ئەوەم دابوونێ کە چیرۆکێک بگێڕمەوە، من ئەوەی خۆم دەگێڕمەوە و پاشان بە کۆمەڵ دەکەوینە وەرقبازی.

جەنەراڵ، لە خۆشیا، بە گەرمی گوتی:

- بەڵام با جارێ گوێمان لە چیرۆکەکەی تۆ بێت!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەناکاوا، بە دەنگێکی ڕوون و ڕەوان، بێ ئەوەی لە جێی خۆی بجووڵێت، ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- میرزادە، ئەم دوو دۆستە ئازیزەی من دەبینی: جەنەراڵ و ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، ئەمانە دەیانەوێ بە شووم بدەن، حەز دەکەن شوو بکەم، حەز دەکەم ڕەئی تۆ بزانم، چ دەڵێی: شوو بکەم یان نا؟ تۆ چی بڵێی وا دەکەم.

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، جەنەراڵ لە جێی خۆی وشک بوو، هەموو ئەوانی دی ملیان قووت کردبووەوە و تەمەشای میرزادەیان دەکرد. گانیا لەسەرسامیا لە جێی خۆی وشک بوو. میرزادە، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

- شوو بکەیت... بە کێ؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە هەمان پایەداری و ڕەوانی، بەرسڤی دایەوە:

- بە گاڤریلا ئاردالیوفیچ ئیڤولگین.

بێدەنگی، بۆ چەند ساتێک باڵی بەسەردا کێشان. میرزادە، کە پێدەچوو، بیەوێ قسان بکات و بۆی نەدەهات، وەکو ئەوەی بارێکی قورس بەسەر دڵیەوە بێ، ئەنجام دوای ئەوەی بە هەزار زەحمەت هەناسەی وەبەر هاتەوە، بە چپە گوتی:

- نـ... نا... شووی پێ مەکە؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا. ڕووی کردە گاڤریلا و بە دەنگێکی زولاڵ و پڕ هەیبەت و متمانەوە گوتی:

- بە قسەت دەکەم، تەواو! گاڤریلا ئاردالیونوفیچ خۆ گوێت لە بڕیاری میرزادە بوو؟ ئەوە بڕیاری منیشە. با ئیدی ئەم مەسەلەیە بە یەکجارەکی لێرەدا ببڕێتەوە!

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ توتسکی، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا!

جەنەراڵیش، بە دەنگێکی کاریگەر، بەڵام نیگەران، گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا!

ژاوەژاوێک کەوتە نێو میوانەکان، سەرسامی و حیرەت باڵی بەسەردا کێشان.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە سەرسامی چاوی بڕییە میوانەکانی و گوتی:

- چیتانە بەڕێزینە؟ بۆچی حەپەسان؟ بۆ وا شپرزە بوون؟

توتسکی، کەوتە مینگەمینگ و بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- بەڵام... ناستاسیا فیلیپوڤنا، تۆ بەڵێنت دا... بە خوایشتی خۆت بەڵێنت دا، کەس زۆری لێ نەکردبووی... دەتتوانی... تاڕادەیەک... مدارا... من ناتوانم... لەوەیە... بەڵام.. بەهەرحاڵ: هەنوکە.. لەم کاتە ناسکەدا.. لەبەردەم ئەم هەموو خەڵکە، بەم شێوەیە.. کۆتایی، وەکو "گەمەیەکی بچووک" کۆتایی بەم مەسەلە جیددییە بێنین، ئاخر ئەمە مەسەلەی ئابڕووە، مەسەلەی دڵ و دڵدارییە.. مەسەلەیەکە، زۆر شتی پێوە بەندە...

- ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، بە ڕاستی لە مەبەستتان ناگەم. تۆ زۆر پەریشانی، خۆتیش نازانی چ دەڵێی! جارێ پێم بڵێ بزانم مەبەستت لەم قسەیە: " لەبەردەم ئەم هەموو خەڵکە..." چییە؟ چما ئێمە کۆمەڵێک دۆست و ئاشنای دڵسۆز نین؟ پاشان پێم بڵێ ئیعترازت لەسەر ئەم "گەمە بچووکە" چییە؟ من بڕیارم دابوو چیرۆکێک بگێڕمەوە، ئەوەتا گێڕامەوە. تۆ بەدڵت نییە؟ جوان نییە؟ ئیدی بۆچی بە گەمەی دەزانی و بە جیددی وەری ناگریت؟ باشە بە خۆت گوێت لێ نەبوو کە بە میرزادەم گوت: "تۆ چ بڕیارێک بدەی من هەمان بڕیار دەدەم؟" خۆ ئەگەر بیگوتایە: بیکە، یەکسەر قاییل دەبووم، بەڵام گوتی مەیکە، بۆیە منیش ڕەفزم کرد. لەم ساتەدا، هەموو ژیانی من بە داوە

موویەکەوە بەند بوو، ئیدی چ شتێک لەمە جیددیتر دەبێت.

جەنەراڵ، کە زۆری پێناخۆش بوو، ئەو هەموو بایەخە بە میرزادە درابوو، کەوتە پرتاندن:

– بەڵام بۆچی میرزادە؟ چ پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە؟ چ شتێ ئەوی گەیاندووەتە ئێرە؟ لێرە چ دەکات؟.

– من بۆیە ڕاوێژم بەمیرزادە کرد، چونکە لە هەموو تەمەنما، یەکەم پیاو بووە کە بتوانم لە دڵسۆزیی وی دڵنیا ببم، ئەو لە یەکەم نیگاوە متمانەی بە من کرد و منیش باوەڕ و متمانەم بەوی هەیە.

سەرەنجام گانیا، بە دەنگی لەرزۆک و ڕەنگی زەرد و لێوە لەرزێوە، گوتی:

– من تەنیا ئەوەم بۆ ماوەتەوە کە سوپاسی لوتف و میهری بێپایان و ڕەفتاری مەحەبەت ئامێزی دەرهەق بە خۆم، بکەم... هەڵبەتە چاوەڕوانی ئەمەی لێ دەکرا. بەڵام... میرزادە... میرزادە و ئەم مەسەلەیە... دیارە...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەپڕ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– مەبەستت ئەوەیە، مرخی لە هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکە خۆش کردووە؟ چاوی لەو هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەیە، وا نییە؟ حاشا مەکە، خۆت مەدزەوە، دەقاودەق دەتویست ئەوە بڵێی! ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، من شتێکم بیرچوو بیڵێم، ئەویش ئەمەیە: هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکەت وەر بگرەوە و بە خۆڕایی، بێ هیچ داوایەک ئازادت دەکەم! ئیتر بەسە! تۆش پێویستت بە ئازادیە! نۆ ساڵ و سێ مانگ! بەسە! لە سبەیەوە، ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکات، بەڵام ئەمرۆ ئاهەنگیساڵیادی لەدایکبوونی من دەگێڕین، ئەمە یەکەم جارە کە لە تەمەنما، موڵکی خۆم بم، خاوەنی خۆم بم، لە هەر کەسێکی دی، ئازادی ئازاد بم! جەنەراڵ، تۆش مرواریییەکانت وەر بگرەوە، پێشکەشی ژنەکەتی بکە! فەرموو ئەوە مرواریەکانت، بیگرە! لە سبەیەوە ئەم شوقەیە جێ دێڵم، گەلۆ لەمرۆ بەدواوە هیچ شەوکۆڕێک نابێت!

ئەو قسانەی کرد و هەستا، وەکو ئەوەی لێبڕابێ مەجلیسەکە جێ بێڵێ. لە هەموو لایەکەوە دەنگ بەرز بووەوە:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا! ناستاسیا فیلیپوڤنا!

هەموو پەشۆکان، لە جێی خۆ هەستان، لە دەوری وی خڕ بوونەوە و بەوپەڕی نیگەرانی گوێیان لە قسە پچڕ پچڕو وڕێنە ئاساکانی دەگرت. هەموو

هەستیان دەکرد ئەم ماستە موویەکی تێدایە، بەڵام تێی نەدەگەیشتن، نەیاندەتوانی سەری لێ دەر بکەن و بۆ خۆیان لێکی بدەنەوە.

لەو دەمەدا، لەپڕ دەنگی بەرز و زبری زەنگی دەرگا بەرز بووەوە، ڕێک وەکو لێدانی زەنگی دەرگاکەی ئەو ئێوارەیەی ماڵی گانیا بوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا هاواری کرد:

- ئەها... ئیدی تەواو، هەموو شتێک کۆتایی هات! هەنوکە سەعات یازدە و نیوە! گەلۆ، تکایە دانیشن. ئیدی وەختی کۆتایی مەسەلەکەیە!

ئەو قسانەی کرد و دانیشت. بزەیەکی سەیر و غەریب کەوتە سەر لێوی. بێدەنگ بوو و بەدەم چاوەڕوانییەکی تامەزرۆوە دەیڕوانییە دەرگاکە.

پتیتسن، لە بنە لێوانەوە بە خۆی دەگوت:

- بێگومان، ڕوگوژینە، بە خۆ و سەد هەزار ڕۆبڵەکەیەوە هاتووە!

پەراوێز:

* - ".. ئۆریکا..." وشەیەکی یونانیی کۆنە بە مانای "دۆزیمەوە" دێت. گوایە ئەرخەمیدس کاتێ لە گەرماوا دەبێ و بەدەم بیرکردنەوەوە یاسایەکی فیزیایی دەدۆزێتەوە، لە خۆشیا لە گەرماوەکە دەر دەپەڕێتە دەرەوە و هاوار دەکات: "ئوریکا... ئوریکا..." واتە دۆزیمەوە... دۆزیمەوە.

* - "داوای کردبوو بۆ دەڤەری قۆقاز نەقڵ بکرێت..." دەڤەری قۆقاز لەو ڕۆژگارەدا ناوچەیەکی نائارام بووە، شەڕی تیا بووە، بۆیە بە نیمچە تاراوگەیەکی فەرمیی سەربازان و فەرمانبەران لەقەڵەم دراوە، هەروەها شوێنێ بووە کە خەڵکانی ڕەشبین و نامراد و شاعیران، سەری خۆیان بۆ ئەوێندەر هەڵگرتووە.

## فەسڵی پازدەیەم

کاتیای* کارەکە شپرزە و هەراسان وەژوور کەوت و گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا، مەگەر خوا بە خۆی بزانێ چ قەوماوە! نزیکەی دە-دوازدە پیاو ڕژاونەتە مەدەخەلەکە، هەموویان مەست و سەرخۆشن، دەیانەوێ تۆ بدینن، دەڵێن پێی بڵێ ڕوگوژین هاتووە و گوایە تۆ بە هاتنەکەیان دەزانی.

- دروستە کاتیا، یەکسەر بیانهێنە ژوورەوە!

- بە ڕاست؟ هەر هەموویان بێنمە ژوورەوە خانم؟ ئاخر وەزعیان تەواو نییە، فوول سەرخۆشن، لالا موو دەکەن! پیاو لێیان دەترسێت!.

- بەڵێ هەر هەموویان کاتیا گیان، ترست نەبێ! دوا بە یەکیان بێنە ژوورەوە، دەنا خۆیان بەتۆبزی وەژووردەکەون. گوێت لێنییە لە ئێستاوە چ هەرا و زەنایەکیان ناوەتەوە؟ هەمان هەرا و هەنگامەیە کە ئەم پاش نیوەڕۆیە نابوویانەوە.

هەنگی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئاوڕی لە میوانەکانی دایەوە و گوتی:

- خانمان، ئاغایان، ڕەنگە پێتان ناخۆش بێ، کە لە حوزوری ئێوەدا، پێشوازی لەم گروپە دەکەم، زۆر بە داخەوەم، بمبورن، بەڵام چار نییە و دەبێ وابێت. من یەک لە باری خۆم، زۆرم پێ خۆشە هەمووتان شایەدی ئەم کۆتاییە بن، بەچاوی خۆتان بیدینن. هەڵبەتە ئازادن لەوەی چی بە باش دەزانن، وا بکەن!

میوانەکان سەرسام و حەپەساو، تەمەشای یەکتریان دەکرد. ئیدی دەر

کەوت کە ئەمە سیناریۆیەکە و پێشوەختە ئامادە کراوە و نەخشەی بۆ دانراوە، مەحاڵە بشێت ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە فکرەکەی ژێوان بکرێتەوە، با فکرەیەکی شێتانەش بێ! هەرکەسە و لەلای خۆیەوە دەیویست بچێتە بنجوبناوانی مەسەلەکە و بزانێ چییە. بەهەرحاڵ کەسیان نەبوو، زۆر بترسێت. تەنیا دوو ئافرەتیان لەناودا بوو: یەکەمیان داریا ئەلکسیڤنا بوو کە ژنێکی کارامە و زیرەک و دنیا دیدە بوو. بەئاسانی کۆڵی نەدەدا و ترساندنی ئاسان نەبوو. دووەمیان ژنێکی بێگانەی بێدەنگ بوو، لەوە نەدەچوو هیچ سەرەدەرێک لە مەسەلەکە بکات، چونکە ژنێکی ئەڵمانی بوو بە رێبواری رێی کەوتبووە پترسبۆرگ و یەک وشە رووسیی نەدەزانی. چەند دڵرفێن و جوان بوو، ئەوەندەش کەللەپووت دیاربوو. هەرچەندە لە مێژ نەبوو هاتبوو، بەڵام بۆ هەندێ کۆڕ و ئاهەنگان دەعوەت دەکرا. تا بڵێی تەرپۆش و ئاڵوواڵا جل بوو، قژی بە جۆرێ ئارایش دابوو دەتگوت بۆ پێشبرکێ خۆی ئامادە کردووە، خەڵکی بۆ ئاهەنگان دەعوەتیان دەکرد، تا وەکو تابلۆیەکی دڵگیر دای بنەن و رەونەق و جوانی بە کۆڕ و مەجلیسەکەیان ببەخشێت، رێک وەکو ئەوانەی تابلۆیەک یان گوڵدانێک، یان پەیکەرێک یان دیمەن و نیگارێکی گرانبەها، لە دۆست و ئاشنایان بە ئەمانەت وەر دەگرن و ماڵەکەیانی پێ دەڕازێننەوە و میوانی و بۆنەیەکی پێ دەبەنە سەر.

سەبارەت بە پیاوەکان، بۆ نموونە پتیتسن دۆستی ڕوگوژین بوو. فردیش چینکو، لە هەوای خۆیدا بوو. گانیا کە هێشتا هەر وڕوکاس بوو، بەتەواوەتی وەخۆ نەهاتبووەوە، هەستی دەکرد، هەستێکی ئاڵۆز، کە پێویستە تا کۆتایی لەوێ و لەبەردەم خەڵکەکەدا بمێنێتەوە. مامۆستا پیرەکە کە شتێکی ئەوتۆی لە مەسەلەکە هەڵنەدەکراند، کە چاوی بە نیگەرانی خەڵکەکە، بە تایبەتی ناستاسیا فیلیپوڤنا کەوت لە زگ بوو دەست بە گریان بکات، لە ترسانا بە ئاشکرا دەلەرزی، چونکە ناستاسیا فیلیپوڤنای بە رادەیەک خۆش دەویست، لە تۆ وایە یەکێکە لە نەوەکانی خۆی. بەڵێ، مردنی بەلاوە خۆشتر بوو، کە لەو ساتە دژوارەدا ناستاسیا بە تەنیا جێ

بێڵێ. سەبارەت بە ئافاناسی ئیڤانوفیچ، هەڵبەتە ئەو وەزع و حاڵە نا هەموارەی پێ خۆش نەبوو، بەڵام لەسەر ئاستی شەخسی، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەکەوە هەبوو و نەیدەتوانی دەستبەرداری بێت، ئەگەرچی مەسەلەکە ئاوەڕۆ و ئاڕاستەیەکی شەیتانەی وەر گرتبوو! بۆیە بڕیاری دا وەکو شایەتێکی بێدەنگ، بە حورمەت و ویقارەوە تا کۆتایی بمێنێتەوە! جەنەراڵ (یەپانچین)یش کە تۆزێ لەوەپێش، بەو شێوازە ناشیرینە، دیارییەکەی بەسەردا درابووەوە، تەنیا کەس بوو، کە هەقی خۆی بوو بەو وەزع و حاڵە ناهەموارە، قەڵس و تۆڕە ببێت، بۆ نموونە لە هاتنی خەڵکی وەکو ڕوگوژین پەست بێ، کە بۆ ئەو نەک هەر ناخۆش، بەڵکو جۆرە سووکایەتییەک بوو، ببێ بە هاونشین و هاو مەجلیسی ئەو جۆرە خەڵکە. یان ببێ بە هاونشینی خەڵکی وەکو پتیتسن یان فردیش چینکۆ. ئەمە بۆ کەسێکی وەکو ئەو شکستێکی ئاشکرا بوو، بەڵام سەرەنجام هەستکردن بە واجب و حیسابکردن بۆ پێگە و پایەی کۆمەڵایەتیی خۆی و ڕێزگرتنی خودی خۆی، بەسەریا زاڵ بوو، وای لێ هات تەحەمولی هاتنی ڕۆگۆژین و داروەدەستەکەی نەکات، بۆیە ئاوڕی لە ناستاسیا فیلیپوڤنا دایەوە تا تێی بگەیەنێت کە بە نیازی ڕۆیشتنە، بەڵام هەر کە زاری هەڵێنا و ویستی قسان بکات، ناستاسیا فیلیپوڤنا، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– ئا... جەنەراڵ... لەبیرم چووبوویت! بەڵام باوەڕ بکە پێشبینیی نارەزایی تۆم کردبوو. ئەگەر زۆر بەم وەزعە قەڵسی، من بە زۆر گلت نادەمەوە، هەرچەندە زۆر حەز دەکەم لەم کات و ساتەدا لێرە بمێنیتەوە. بەهەرحاڵ زۆر منەتباری ناسین و دۆستایەتی، چاکە و پیاوەتی تۆم و شانازیی پێوە دەکەم، بەڵام ئەگەر دەترسیت کە...

هەستی خۆبەگەورەبینی و جوامێری لەلای جەنەراڵ هاڕوژا و گوتی:

– بە یارمەتیت ناستاسیا فیلیپوڤنا! ئەوە تۆ لەگەڵ کێتە؟ وام دەناسیت، حەیفت نەکردا! من تەنیا لە ڕووی هەستکردن بە مەسئولیەتەوە، لە ڕووی دڵسۆزییەوە دەمێنمەوە، من ئامادەم لەپێناوی تۆدا هەر کارێک بکەم، بە تایبەتی ئەگەر مەترسی و خەتەرێک لەئارادا بێت، بەڵام لێتی ناشارمەوە کە

زۆر نیگەرانم، مەبەستم ئەوەیە لەگینە مافورەکان بلەوتێنن، بیان دڕن یان شتێک بشکێنن... بە قەناعەتی من نەدەبوو ڕێیان بدەیت بێنە ژوورەوە ناستاسیا فیلیپوڤنا!

فردیش چینکۆ هەڵی دایە:

- ئەوە ڕوگوژین خۆیەتی!

جەنەراڵ، دەرفەتی هێنا و بەلەز بە گوێی (ئافاناسی ئیڤانوڤیچ)یدا چپاند و پرسیی:

- تۆ دەڵێی چی؟ هەست ناکەی شێت بووبێ؟ شێتی بە مانا مەجازییەکەی نا، بەڵکو بە مانا پزیشکییەکەی..

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ توتسکی، بە ئەسپایی وەڵامی دایەوە:

- پێشتریش پێم گوتبووی کە ئامادەیی شێتبوونی تیایە...

- جا ئێستا ئەم هەڵچوون و هاڕوژانەشی هاتووەتە سەر...

گروپەکەی ڕوگوژین، تەقریبەن هەمان ئەو کەسانەی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بوون، تەنیا دوو کەسی تازەیان بەگەڵ کەوتبوون. یەکێکیان پیرەمێرێکی، فەڕتوس بوو کاتی خۆی سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی پەرپووت بوو، کە لە ترسی ناوزڕاندن و جنێوان بەرتیلی دەدرایە، دەڵێن جارێک ددانە زێڕەکانی دەخاتە بارمتەوە و پارەکەی خەرجی بادەنۆشی کردبوو. ئەوی تریان مەلازم دووەمێکی خانەنشین بوو، لە ڕووی ئەرک وپیشەوە بەهەڤڕک و ڕەقیبی سەرسەختی سەرۆکی گروپەکە، کە کەتەیەکی دەس و مەچەک ئەستوور بوو، دەژمێردرا. هیچ یەکێک لە ئەندامانی گروپەکەی ڕوگوژین نەیاندەناسی، لە ڕێگا، لەسەر شۆستەی شەقامی نوفسکی پراسپکتدا، لە گۆشەیەکی هەتاوگیردا تووشی بووبن، کە لەوێدا ڕێی بە ڕێبواران دەگرت و بە شێوازی ئەدیبانەی مارلینسکی* نووسەر، سواڵ و سەدەقەی لێ وەر دەگرتن و وای لێ دەگەیاندن کە جاران، وەختێ بووە، هەر کەسێک داوای کۆمەکی لێ کردبایە، بە جارێ، لە یەک شوێن، دە- پازدە ڕۆبڵی داوەتێ. زۆری پێنەچوو کە ئەم دوو ڕەقیبە بە چاوی دژمنایەتی سەیری یەکیان دەکرد. یارۆی دەست و مەچەک

ئەستوور (سەرۆکی گروپەکە) زۆری لە بەر گران بوو کە ئەم (سوالّکەرە) هاتبووە ناو گروپەکەیان و ئەمەی بە سووکایەتی بۆ خۆی دەزانی، چونکە بە تەبیعەت شەڕانی بوو، هەندێ جار ورچ ئاسا، لە بەر خۆیەوە دەیپرتاند و دەیبۆلاند و بەوپەڕی بێزارییەوە دەیڕوانیە پێشکەوتن و پێشڤەچوونی ئەم "سوالّکەرە"وە کە لەوە دەچوو کابرایەکی کارامە و بە سیاسەت و لێزان بێت. ئاشکرا بوو ئەم ملازم دووەمە، یەکێک بوو لەوانەی حەز دەکەن بە سیاسەت و ئەقڵ بگەنە مەبەست و مەرام، نەک بە هێز و زەبری بازوو. ئەمە جگە لەوەی قەلافات و بالاشی، بە ئەندازەی قەد و بالای ئاغای سەرۆکی گروپەکە نەبوو. چەند جارێک، بە شێوازێکی نەرم و ناڕاستەوخۆ، بێ ئەوەی بچێتە ناو گەنگەشەیەکی ڕاستەوخۆوە، بەلام بە هەندێک لاف و گەزافەوە، باسی شێوەی بۆکسێنی ئینگلیزی کردبوو، لایەنگری خۆی لەو شێوە بۆکسێنە دەر بڕیبوو. بە کورتییەکەی ئەوەی پیشان دابوو کە پیاوێکی ئەوروپیی تەبع و بیروباوەڕە. یارۆی دەس و مەچەک ئەستوور (سەرۆکی گروپ) کە گوێی لە وشەی "بۆکسێن" دەبوو، ژارخەنێکی بۆ دەکرد، چونکە حەزی لە هیچ گەنگەشە و مجادەلەیەک نەدەکرد، ناوبەناو، بە بێدەنگی و، وەک بڵێی ڕێکەوت وای هانی بێ، ئەو شتە نایابە ڕووسییەی نیشان دەدا، واتە مست و مەچەکی ئەستوور، درشت و پڕ ماسوولکەی، موو سووری، توکنی خۆی دەنواند و نیشان دەدا. هەنگێ هەموو ئەوانەی کە ئەم شتە نایابەیان دەبینی، بۆیان دەر دەکەوت کە ئەم بۆکس و مەچەکە بەر هەر کەسێک بکەوێ، تەختی دەکات، یەک هەفتە لە جێدا دەیخات. ئەو شەوە بە هۆی ڕوگوژینەوە، کە بە درێژایی ڕۆژەکە بەتەمای ئەوە بووبوو، بچێتە سەردانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، هیچ یەکێک لە دارو دەستەکەی، مەستی مەست نەبوو، ڕوگوژین بە خۆیشی، مەستی بەری دابوو و بە تەواوەتی وەخۆ هاتبووەوە، بەلام چونکە ئەو ڕۆژە زۆر نیگەران بوو، زۆر ماندوو بووبوو، ڕۆژێکی سەیر و نائاسایی بوو، بە عەمراتی ڕۆژی وای بە خۆوە نەبینیبوو، بڕێک شەکەت و گێژ بوو. تەنیا یەک مەبەست و ئامانجی لە بەر چاوو لە دڵ و لە هۆش و بیرا بوو و بۆ یەک دەقیقە و سات لێی

نەدەبووەوە، سەرانسەری ڕۆژەکەی، لە سەعات پێنجی دوا نیوەڕۆوە تا یازدەی شەوێ بەو کارە و لەپێناوی ئەو کارەدا بردبووە سەر، هەموو وەختەکەی، بە شپرزەیی و نیگەرانی، بە گفتوگۆ دەگەڵ خەڵکانی وەکو کیندر و بیسکوپدا بردبووە سەر، کە ئەوانیش لەپێناوی وەدیهێنانی پێویستییەکەی ڕوگوژیندا، لە زگ بوو شێت بن، لە هەر دەرگایەکیان دابوو تا توانیبوویان ئەو سەد هەزار ڕۆبڵەی کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە گاڵتە و تەشەرەوە داوای کردبوو، کاش پەیدا بکەن، بەڵام بە قازانج و سووتێکی هێندە زۆر و خەیاڵی، ئەوتۆ کە بیسکوپ بە خۆیشی شەرمی دەکرد بە دەنگی بەرز دەگەڵ کیندردا باسی بکات.

ڕوگوژین، دەقاودەق وەکو کەڕەتی پێشوو، چەند شەقاوێک کەوتبووە پێش دارودەستەکەیەوە. پیاوەکانی، بەوریایی و بە ئەدەبەوە، لە دوایەوە دەڕۆیشتن، هەرچەندە سەرکەوتوو بوون و کاری خۆیان تەواو کردبوو، بەڵام هەستیان بە جۆرە ترسێک دەکرد، لە ناستاسیا فیلیپوڤنا دەترسان، مەگەر هەر خوا بیزانیایە بۆچی لێی دەترسان! تەنانەت هەندێکیان وایان وێنا دەکرد، کە بە پەڕۆیەکی پیس کلکیان دەگرێت و "لە قاڵدرمەکانەوە فرێیان دەداتە خوارەوە." یەکێک لەوانە "زالیوگیف"ی فشەکەری تۆلاز بوو، بەڵام خەڵکی دیکەشیان تیا بوو، بە تایبەتی، یارۆی دەس و مەچەک قەوی، کە دڵی خۆیاندا، زۆریان ڕق لە ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو و حەزیان لە چارەی نەدەکردو دەیان بوغزاند، بەو نەفەسەوە هاتبوون بۆ ماڵەکەی وەکو ئەوەی چووبن بۆ شارێکی ئابڵوقەدراو، بەڵام ئەو شکۆ و جەلالەی لە هەوەڵین دوو ژوورا دیتیان، ئەو شتانەی کە لە عەمراتیاندا بە خەویش نەیان دیتبوو، ئەو کەلوپەلە دەگمەن و ئەو تابلۆ جوانە دەستچنانە و پەیکەرە گەورەکەی ڤینۆس، هەر هەموو ئەمانە کردیانە کارێک کە جۆرە ڕێز و حورمەتێکیان بکەوێتە دڵ و دەروون، هەست بە جۆرە سامێک بکەن، بەڵام وێڕای ئەو ترسەش، هێواش هێواش و، بە کونجاویەکی ئاشکراوە، یەک، بە یەک و دوابەدوای ڕوگوژین، خۆیان بە هۆڵەکەدا کرد، بەڵام کاتێ یارۆی دەس و مەچەک ئەستوورو "سواڵکەر"ەکەی لەمەڕ

خۆمان، لە ژوورەوە و لەنێو میوانەکانی ناستاسیا فیلیپوڤنادا، چاویان بە جەنەراڵ یەپانچین کەوت، بە جۆرێ نەترەیان بەرداو قەڵەمی دەست و پێیان شکا، بەرەبەرە کەوتنە خۆدزینەوەو، بۆ ژوورێکی دیکە پاشەکشەیان کرد. لەنێو هەموویاندا تەنیا لیبدیف ورەی بەرنەداو، بگرە شان بە شانی ڕوگوژین دەڕۆیشت، چونکە بایەخی ئەو ملیون و چوار سەد هەزار ڕۆبڵەی دەزانی، کە لەو کاتەدا یەک ملیونی کاشی، بە ڕوگوژین بوو. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ، کە هەموو ئەندامانی گروپەکە، بە لیبدیفی کارامە و یاساناسیشەوە، بە تەواوەتی سنووری دەسەڵاتی خۆیان نەدەزانی، نەیاندەزانی بۆیان هەیە هەر کارێک بکەن یان نا. هەندێ جار لیبدیف دەهاتە سەر ئەوەی سوێند بخوات بۆیان هەیە بە کەیفی دڵی خۆیان، هەر کارێکیان بوێ بیکەن و هەندێ جاریش تووشی نیگەرانی دەبوو، لە فکران ڕادەچوو، تا هەندێ ماددەی قانوونی مەدەنی دڵخۆشکەرە و قەناعەتبەخشی وەبیر بێتەوە و لە – کاتی تەنگانەدا – سوودی لێ ببینێ.

ئەو کاریگەرییەی کە، هۆڵی میوانەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە دڵ و دەروونی ڕوگوژینی، دروست کرد، زۆر جیاواز بوو لەوەی کە لە دڵ و دەروونی دارودەستەکەی، دروستی کرد. هەرکە پەردەکە لە بەردەمی لابراو چاوی بە ناستاسیا فیلیپوڤنا کەوت، ئیدی ڕێک وەکو دیدارەکەی هەمان ئێوارەو، بەجۆشوخرۆشێکی زیاتریشەوە، جگە لەو هەموو شتێکی تری لە بەرچاو سڕدرایەوە. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو بۆ ساتێک لە جێی خۆی وشک بوو. لەزگ بوو گوێت لە لێدان و ترپە ترپی دڵی ببێت. بۆ چەند ساتێکی بەردەوام، سەراسیمە و شەرمنانە چاوی برینە ناستاسیا فیلیپوڤناو بە ئامان و زامان نیگای لێ نەدەگواستەوە. ئەوسا لەپڕ وەکو ئەوەی بە خۆ هاتبێتەوە، بەهەشتاو بەرە و مێزەکە چوو، بەدەم ڕێوە بەر کورسییەکەی پتیتسن کەوت، پێڵاوە قوڕاوییەکانی نا بە داوێنی گوڵدۆزی کراوی کراسە شینە گرانبەهاکەی خانمە ئەڵمانیە بێدەنگە هەرە جوانەکەدا. نەک هەر عوزرخوایی لێ نەکرد، بەڵکو هەر هەستیشی پێ نەکرد. کە گەیشتە ئاستی مێزەکە، ئەو شتە غەریبەی، کە لەگەڵ خۆیدا هێنابوویە ژوورەوە و بە هەر

دوو دەست گرتبووی، لەسەر مێزەکە دانا. سەفتەیەکی کاغەزین بوو بە ئەستووری نزیکەی دوازدە و درێژی شازدە سانتی مەتر، لە نوسخەیەکی رۆژنامەی "هەواڵی بۆرسە*"وە پێچرابوو و بە مەچیرێکی قایم بە سترابوو. ڕوگوژین، سەفتەکەی لەسەر مێزەکە دانا، هەنگێ بەبێ ئەوەی تاقە قسەیەک بکات، ڕەق لە جێ خۆی وەستا، هەر دوو دەستی شۆڕ کردبوونەوە، لە تۆ وایە تاوانبارێکەوە چاوەڕوانی خوێندنەوەی قەراری دادگایە.

جلەکانی هەمان ئەو جلانە بوو کە ئێوارێ لەبەری بوو، ئەوەی گۆڕا بوو، ئەوە بوو کە دەسماڵێکی ئاوریشمی کەسک و سووری، لە ملی ئاڵاندبوو، بە دەرزیلەیەکی درشتی ئەڵماسی پەپولەیی قاییمی کردبوو، هەروەها موستیلەیەکی ئەڵماسی گەورەشی لە قامکێکی پیسی دەستی ڕاستی کردبوو.

لیبدیف، لە دووری دوو سێ شەقاوی، مێزەکەوەستا، بەڵام ئەوانی دی، وەکو پێشتر گوتمان، یەک بە یەک خۆیان دزیبووەوە و لە هۆڵەکە وەدەر کەوتبوون. (کاتیاو پاشا*)ی کارەکەرێن ناستاسیا فیلیپوڤنا، هاتبوون و لەپشت پەردەکانەوە، نیگەران و هەراسان تەمەشایان دەکرد.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بەوردی و کونجکاوی چاوی بڕیبوونە ڕوگوژین، بە گۆشەی چاو ئاماژەیەکی بۆ شتەکە کرد و گوتی:

- ئەمە چییە؟

ڕوگوژین، بە نیمچە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- سەد هەزارەکەیە!

- یانی بەو حاڵەشەوە وەعدەکەی خۆی بەجێ هێناوە؟ چەند پیاوێکی سەرڕاستە! فەرموو، لێرە، لەسەر ئەم کورسیە دانیشە. شتێک هەیە حەز دەکەم پێتی بڵێم. ئەوانە کێن دەگەڵ خۆتت هێناون؟ ئەو جماعەتەن کە ئێوارە لەگەڵت بوون؟ هەمان دارو دەستەن؟ باشە، با بێنە ژوورەوە، دەتوانن لەسەر ئەم تەختە و ئەو تەختەی دیکە و ئەو دوو کورسییە دانیشن... چاوەڕوانی چین؟ بۆچی نایەنە ژوورەوە؟ نایانەوێ بێنە ئەم

ژوورە؟

هەڵبەتە، هەندێکیان کە بە ڕاستی پەشۆکابوون، چوون لە ژوورێکی دی دانیشتن و چاوەڕوانی ئەنجامیان دەکرد، بەڵام هەندێکی دی مانەوە و لەو شوێنانە دانیشتن کە بۆیان دەست نیشان کرا، بەڵام بەگوێرەی توانا، دوور لە مێزەکە و لە سووچ و گۆشەکانی ژوورەکەدا دانیشتن. هەندێکی تریان هێشتا هەر حەزیان دەکرد لە بەرچاو نەبن، هەندێکی دی بەرەبەرە زاتیان وەبەر هاتەوە.

(ڕوگوژین)یش لەسەر هەمان کورسی کە بۆی دیاری کرا، دانیشت، بەڵام زۆر دا نە نیشت. خێرا هەستا و ئیدی دانەنیشتەوە. بەرەبەرە کەوتە ناسینەوە و تەمەشاکردنی میوانەکان. کە چاوی بە گانیا کەوت ژارخەنێکی بۆ کرد و لەبەر خۆیەوە کەوتە ورتەورت: "دەتەمەشا! کێ لێرەیە!" کە چاوی بە جەنەراڵ و ئافاناسی ئیڤانوڤیچ کەوت، نە شڵەژا و نە هەستی بە هیچ سەرسامییەک کرد، بەڵام کە میرزادەی لە کەنار ناستاسیا فیلیپوڤنادا بینیی، تا ماوەیەک بە حەپەساوی لێی ڕاماو نەیدەتوانی چاوی لێ بگوازێتەوە و هۆی ئەم هاتنەی وی لە بنجوبناوان بکات. هەر کەسێک بیدیتبایە، هەندێ جار وای هەست دەکرد، وڕێنە دەکات، وێڕای هەڵچوون و ماندووبوونی سەرانسەری ئەو ڕۆژە، دوێ شەویشی لە قیتاردا بەسەر بردبوو، یانی لە ماوەی چل و هەشت سەعاتی ڕابردوودا، بۆ ساتێکیش چاوێکی لێک نەنابوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕووی کردە میوانەکانی، بە هەڤرکییەکی زەقەوە گوتی:

- بەڕێزینە، ئەمەی دەیبینن سەد هەزار ڕۆبڵە! ئا ئەمەی لەم پریاسکە پیسەدایە! ئەم پیاوەی لەبەر چاوتانە، ئەم دوا نیوەڕۆیە، شێت ئاسا، کردبووی بە ڕۆژی خۆی و هاواری دەکرد کە ئەمشەو سەد هەزار ڕۆبڵم بۆ دێنێ، منیش چاوەڕوانم کرد. هاتووە بە پارە بمکڕێت، خستوومیەتێ مزایەدەوە، لە هەژدە هەزارەوە دەستی پێ کرد، پاشان یەکسەر بازی دا بۆ چل هەزار، دواتر هەڵی بوارد بۆ سەد هەزار، کە ئەوەتا بە چاوی خۆتان





دەیبینن. بەهەرحاڵ، قسەی خۆی بردۆتە سەر! خودایا، ڕەنگی چەند زەرد بووە! .. هەر هەموو ئەم بەزمە لە ماڵی گانیتشکا (گانیا)دا ڕووی دا. چووبووم بۆ لای ئەو خانەوادەیەی کە بەتەما بووم ببێ بە خانەوادەی ئاییندەم، چووبووم سەری دایکی بدەم، کەچی خوشکەکەی، بەرە و ڕووی خۆم، هاواری کرد: "ئەرێ کەسێک نییە ئەم بەرەڵڵا و هەرزەیە بکاتە دەرەوە؟" ئەوجا تا دەمی گرتی تفێکی کردە چارەی براکەی. بەمە دەڵێن کیژی بەشەخسیەت!

جەنەراڵ، کە خەریک بوو، بە شێوازی تایبەتی خۆی، وردەوردە سەر لە مەسەلەکە دەر بکات، بە گلەییەوە گوتی:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا!

ناستاسیا گوتی:

– چییە جەنەراڵ؟ ئایا خراپم گوتووە، قسەکەم خراپە؟ نابەجێیە؟ ئیتر بەسە، تاکەی تەمسیل بکەم! من کە بە درێژایی پێنج ساڵی ڕابردوو، لە شانۆی فەرەنسیدا، لە لۆجەکەی خۆمدا وەکو پەیکەری پاکی و بێگەردی دادەنیشتم و کێویانە لە هەموو ئەوانەی لە دووم بوون، هەڵدەهاتم و وام دەنواند کە نموونەی پاکی و بێگەردیم، ئەوەم لە گەوجێتی بووە. تەمەشا، ئێستا پیاوێک هاتووە، وێڕای ئەو پێنج ساڵەی کە من بە ناوی پاکییەوە بە سەرم بردوون، بە بەرچاوی هەمووتانەوە، سەد هەزار ڕۆبڵی خستووەتە سەر مێزەکەم. لەوەیە گالیسکەیەکیش لە بەردەرگادا چاوەڕوانم بێ و لە خزمەتما بێ. سەد هەزار ڕۆبڵی لە قەبەڵم کردووە! گانیا، ئایا هێشتا لێم زویری؟ هەڵبەتە ناتەوێ من بەریتە ناو خانەوادەکەت و تێکەڵی ئەوان ببم، منێک کە بۆ "خەڵکانی وەکو ڕوگوژین باشم"! گوێت لێ نەبوو میرزادە، تۆزێ لەمەپێش چیی گوت؟

میرزادە، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

– من هەرگیز نەمگوتووە بۆ ڕوگوژین باشیت. تۆ لە خەڵکی وەکو ڕوگوژین، خەساری.

داریا ئەلکسیڤنا لەپڕ هاواری کرد:




– ناستاسیا فیلیپوڤنا! بەسە ئازیزەکەم! بەسە کۆترەکەم! ئەگەر لەمانە بێزاریت، ئەگەر نارەحەتت دەکەن، بۆچی مدارایان دەکەی، بۆچی هاونشینیان دەکەیت؟ باشە ماقوولە دەگەڵ ئەم پیاوەدا بڕۆیت، با سەد هەزار ڕۆبڵیشت بداتێ؟ ڕاستە سەد هەزار ڕۆبڵ کەم نییە! سەد هەزار ڕۆبڵەکە هەڵگرە و پاشان دەستی پێوە بنێ و لە کۆڵ خۆتی بکەوە. دەبێ بەم جۆرە مامەڵە لەتەک ئەو کەسانەدا بکرێت. ئەگەر من لەجیاتیی تۆ بام، دەمودەست خۆم لە شەڕی هەموویان ڕزگار دەکرد... هەر بە ڕاستی وام دەکرد.

داریا ئەلکسیڤنا، گەیشتبووە تینی. ڕوحێکی میهرەبان و هەستیاری هەبوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەدەم بزەیەکی تاڵەوە گوتی:

– تورە مەبە داریا ئەلکسیڤنا، من بەتوڕەیی قسەم دەگەڵ گانیادا نەکرد. هیچ گلەیەکم لێکرد؟ ئەوەی ڕاستی بێ نازانم چ حەماقەت و گەوجێتییەک گرتبوومی کە دەمویست تێکەڵاوی خانەوادەیەکی شەریف و ئابڕوومەند ببم. دایکیم بینی و دەستیم ماچ کرد. گانیا، کە لە ماڵەکەی خۆتاندا گاڵتەم پێ کردیت، بەئانقەست ئەو کارەم کرد، بۆ تاقیکردنەوەی تۆ بوو، دەمویست بزانم تۆ تا کوێ دەڕۆیت، تا چەند ئامادەی لە زەلکاوا ڕۆ بچی. بە ڕاستی لێتی ناشارمەوە کە سەرم لێت سوورِ ما. چاوەڕوانی زۆر شتم لێدەکردیت، بەڵام بەم ئەندازەیە نا! ئاخر تۆ چۆن دەتوانی من بخوازیت، لە کاتێکا سوور دەتزانی ئەم پیاوە مرواری پێشکەش کردووم و منیش، تۆزێ پێش ئەوەی خوازبێنیم بکەیت، لێم وەر گرتووە؟ ئەدی دەربارەی ڕوگوژین چ دەڵێی؟ لە ماڵەکەی خۆتا، بە بەرچاوی دایک و خوشکەکەتەوە، مزایەدەی لەسەر کردم. وێڕای ئەوەش هاتیتە خوازبێنیم؟ هەر باش بوو خوشکەکەت لەگەڵ خۆتا نەهێناوە. وا دیارە ڕوگوژین ڕاستی دەکرد کە دەیگوت، تۆ ئامادەیت، بۆ سێ ڕۆبڵان، تا دوڕگەی ڤاسیلیفسکی* بە چوار چنگۆڵان بڕۆیت!

ڕوگوژین، لەناکاو، بەئەسپایی، بەڵام بە متمانەی تەواوەوە گوتی:

- ئا، ئامادەیە، دەڕوات و ئەولاتریش!

ناستاسیا فیلیپوڤنا لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- ئەگەر برسی بوایەی هەر نەیسە، دەمگوت نەهەقی نییە، برسێتی زەحمەتە، بەڵام وەکو بیستوومە، مووچەیەکی باش وەر دەگریت! ئەوجاش، تۆ سەرباری نەنگ و عارەکەش، ئامادەی ژنێک بخوازیت کە ڕقت لێیەتی (من چاک دەزانم کە خۆشت ناویم، دەمکورهێنی) نا، نا، ئێستا قەناعەتی تەواوم هەیە کە پیاوی وەکو تۆ ئامادەیە لەپێناوی پارەدا پیاو بکوژێت! خەڵکی ئەم زەمانە هەموو وان. تەماع و چاوچنۆکی کوێری کردوون، عەقڵی بردوون! تەنانەت منداڵانیش خەون بەوەوە دەبینن کە ببن بە سووتخۆر، یان چەقۆیەک لە پارچەیەکی ئاوریشمەوە دەپێچن و بەدزییەوە و هێدی هێدی دوای هاوڕێیەکی خۆیان دەکەون، تا وەکو بەرخە* کۆرپە گۆشاوگۆش سەری ببڕن، ڕێک وەکو ئەو هەواڵەی کە لەم ڕۆژانەدا خوێندمەوە. تۆ پیاوێکی بێحەیاو حورمەتی. منیش ژنێکی بێحەیام، بەڵام تۆ خراتری، بەڵام سەبارەت بەو پیاوە، بەو دەستە گوڵە بۆنخۆشە، با جارێ باسی نەکەم...

جەنەراڵ، کە ئەو قسانەی زۆر لە بەر گران بوو، بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە، هەڵی دایە:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەوە تۆی ئەو قسانە دەکەی، باوەڕ بەگوێی خۆم ناکەم؟! تۆ بەو هەموو هەستناسکی و بیرە پاکەتەوە ئەو جۆرە قسەیە دەکەی؟ ئەم زمانە زبرە، ئەم قسە ڕەقانە، قەت لە تۆ ناوەشێتەوە!

ناستاسیا فیلیپوڤنا لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی:

- جەنەراڵ، من هەنوکە مەستم، پێویستم بە تەشەرانە، پێویستم بەوەیە بە خەڵکێک ڕابوێرم، ئەمڕۆ ڕۆژی منە، ساڵیادی لەدایکبوونی منە، ئەو ڕۆژە خۆشەیە کە لەمێژە چاوەڕوانیم. داریا ئەلکسیڤنا، دەیبینی، ئەو ئاغایە، ئەو دەستە گوڵە بۆنخۆشە دەبینی؟ ئەو چەپکە کامیلیایە دەبینی کە لەوێندەر دانیشتووە و بە ئێمە پێدەکەنێ..

توتسکی، بەویقارەوە بەرسڤی دایەوە:





– ناستاسیا فیلیپوڤنا، من پێناکەنم. من تەنیا بەوپەڕی هوشیارییەوە گوێ دەگرم.

ناستاسیا، لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

– دەی بینی. بۆچی بە درێژایی پێنج ساڵ ئەزیەتم دەدا و نەمدەهێشت بڕوات؟ ئاخۆ شایستەی ئەو هەموو عەزابە بوو؟ هەڵبەتە بەڵێ، بێ زیاد و بێ کەم... هێشتا ئەو پێی وایە من دەرهەق بەو خەتابارم، غەدرم لێ کردووە. ئاخر ئەو وەبەر خوێندنی ناوم و پەروەردەی کردووم، وەکو دۆتمیرێک سەرپەرشتی و بەخێوی کردووم.. بە ئارەزووی خۆم مەسرەفی کێشاوم، هەرگیز پارەی بۆ من لە چاو نەبووە و لەو ڕووەوە درێغی لێنەکردووم! تەنانەت لە خەمی ئەوەشدا بووە کە مێردێکی پیاوانە و ئابڕوومەندم بۆ پەیدا بکات و ئەم گانیایەی بۆ دۆزیومەتەوە. کەچی بەو حاڵەشەوە، باوەڕ دەکەی کە لە زەرفی ئەم پێنج ساڵەدا لەگەڵی نەژیاوم، بەڵام پارەشم لێی وەر دەگرت و بە هەقی خۆمم دەزانی؟ بەو ڕادەیە شتەکان لە ئەقڵ و بیرکردنەوەمدا تێکەڵ بووبوون! تۆ دەڵێی ئەگەر نارەحەتم، سەد هەزار ڕۆبڵەکە هەڵگرم و ئەو کوڕە گەنجەی کە پێشکەشی کردووم، لە ماڵەکەم وەدەرنێم... دروستە ناپەسندە، بە دڵم نییە... ئەگەر لە شووکردن بوومایە، لەمێژبوو دەمتوانی شوو بکەم... دەمتوانی شوو بە کەسێکی زۆر باشتر لە گانیا، بکەم، بەڵام ئەوەشم بە کارێکی ناپەسند دەزانی. کەواتە بۆچی تێکڕای ئەم پێنج ساڵەم بە ڕقوکینە بردە سەر؟ باوەڕ دەکەی هەندێ جار، بەر لە چوار ساڵ، بیرم لەوە دەکردەوە و لە خۆم دەپرسی: "باشە بۆچی شوو بە ئافاناسی ئیڤانوڤیچی هاوڕێم نەکەم؟" ئەو بیرکردنەوەیەشم زادەی ڕقوکینە بوو. مەگەر هەر خوا بزانێ ئەو دەمانە چیم بە مێشکا دەهات! هەڵبەتە دەمتوانی ناچاری بکەم بمخوازێت! باوەڕدەکەی، بە خۆی داوای ئەوەی لێ دەکردم، ئاوی بە کەوشەکانما دەکرد؟ ڕاستە درۆی دەکرد، بەڵام تاوی بەری دابووی لە سەری، بەڵام شوکر بۆ خوا، ئەوساکە بیرم کردەوە و گەیمە ئەو قەناعەتەی کە ئەو هەموو قینە نایەنێ کە من لێم هەڵگرتووە! پاشان لەناکاوا ئەوەندە ڕقم

لێیهەستا کە ئەگەر خوازگاری بکردمایە، جوابم دەکرد. ئیدی ئەو شانۆییە پێنج ساڵی خایاند! نا، نا، بکەومە سەر شەقامان باشترە، شوێنی ڕاستەقینەی من شەقامانە! یان ماوەیەک دەگەڵ ڕوگوژێندا ڕابوێرم، یان لە سبەیەوە بکەومە جلشۆری مالآن! ئاخر من بە خۆم هیچم نییە، خاوەنی هیچ شتێک نیم، ئەگەر بڕۆم، هەموو شتەکانی بۆ فڕێی دەدەم، هەموو شتێک، تەنانەت سیپاڵەکانیشم، هەنگێ کە هیچم نەبێ، کێ ئامادەیە بیەوێم؟ لە گانیا بپرسە: ئایا بەو حاڵەوە دەیەوێم؟ تەنانەت فردیش چینکۆش پێم قایل نابێت!...

فردیش چینکۆ، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

– ڕەنگە فردیش چینکۆ پێت ڕازی نەبێ! من کەسێکی ڕاستگۆ و قسەلەڕووم، بەلآم لەوەیە میرزادە بەو حاڵەوە بیەوێی. تۆ گلەیی لە بەختی خۆت دەکەی، شین بۆ خۆت دەگێڕی، دە تەمەشایەکی میرزادە بکە! ماوەیەکی زۆرە من چاودێریی دەکەم...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە کونجکاوی ئاوڕی لای میرزادەی دایەوە و پرسیی:

– ڕاست دەکات؟

میرزادە، لە بن لێوانەوە گوتی:

– ڕاست دەکات.

– یانی، هەر ئاوها، بە بێ هیچ شتێک، دەمخوازیت؟

– بەڵێ، ناستاسیا فیلیپوڤنا!...

جەنەراڵ، لە بن لێوانەوە گوتی:

– سەودا و مامەڵەیەکی باشە! ئەمە شتێکی تازەیە!... دەبوایە پێشبینیی ئەوە بکەین!

میرزادە، بە نیگایەکی خەمناک، وردو جدی، تەمەشای ناستاسیا فیلیپوڤنای دەکرد، کە هێشتا چاوی بڕیبووە ئەو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، سەرلەنوێ ڕووی کردەوە داریا ئالکسیڤنا و گوتی:

– ئەمەش یەکێکی دی! بە ڕاستیەتی، لە دڵپاکیی خۆیەوە ڕازییە، ئاخری یەکێکی دروستکاری خێرەومەندم دۆزییەوە، ئەگەرچی ڕەنگە ئەو قسانەی

دەربارەی وی دەکرێن ڕاست بن، کە گوایە تۆزێک!... ئەمە زۆر گرینگ نییە. جا میرزادە تۆ کە بەو ڕادەیە دڵبەستەم بوویت کە ئامادە بیت بمخوازیت، لە کاتێکا من ماشقەی (ڕوگوژین)م مەگەر هەر بەکەڵکی خەڵکی وەکو ڕوگوژین بێم، باشە بەتەمای بە چ پارەوپولێک، بە چ سەروەت و سامانێک بژیت؟

میرزادە گوتی:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا، من تۆ بە ژنێکی دروستکار و ئابڕوومەند دەزانم، نەک بە ماشقە و قەپاتمەی ڕوگوژین.

– من؟ من ژنێکی دروستکار و ئابڕوومەندم؟ من؟

– بەڵێ تۆ.

– ئەمانە قسەی خەیاڵین، شیعرن، کۆن بوون، باویان نەماوە میرزادە... خەڵکی ئێستا لەوە چاوکراوەترن بەو دووعایانە بڵێن ئامین، ئەوەی تۆ دەیڵێی قسەی هەلەقومەلەقە! ئاخر تۆ و مێردایەتی کوجا مەرحەبا، تۆ خۆت پێویستت بە یەکێکە خزمەتت بکات. یانی تۆ پێویستت بە پەرستارە نەک بە هاوسەر؟

میرزادە هەستا، بە دەنگێکی لەرزۆک و شەرمنانە، بەڵام لە هەمان کاتدا پڕ باوەڕ و متمانە، گوتی:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا، من هیچ نازانم.. هیچم نەدیتووە.. لەم ڕووەوە تۆ ڕاست دەکەی، هەق بە تۆیە، بەڵام من، من وا وێنا دەکەم کە تۆ شانازی بە من دەبەخشیت، نەک من بە تۆ، من هیچ نیم، بەڵام تۆ بەو هەموو ڕەنج و ئازارەوە، سەربەرز و ڕووسوور، لە بۆتەی تاقیکردنەوە دەر چوویت، کە پاک و بێگەرد لە دۆزەخێکی ئاوها دەر چوویت. ئەمە کەم نییە. ئیدی بۆچی دەبێ هەست بە نەنگی و شەرمەزاری بکەیت، سەری خۆت هەڵگریت و ڕەدووی ڕوگوژین بکەویت؟ پێدەچێ ئاگات لە خۆ نەبێ.. تۆ هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکەت دایەوە بەسەر جەنابی توتسکیدا، تۆ دەڵێی دەست لەم خانووە و هەرچییەکی تێدایە، هەڵدەگریت و بۆ ئەوی جێ دێڵی. لێرەدا هیچ کەسێک ناتوانێ ئەو کارەی تۆ بکات. من... ناستاسیا گیان.. من خۆشم

دەوێی. ئامادەم گیانم فیدای تۆ بکەم. ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕێگە نادەم هیچ کەسێک لە عەلەیی تۆ بڵێ ناستاسیا فیلیپوڤنا. ئەگەر هەژار بین، من کار دەکەم ناستاسیا فیلیپوڤنا، گیان گیان...

کە فردیش چینکۆ و لیبدیف گوێیان لەو قسانەی میرزادە بوو، کەوتنە تەوسخەن. تەنانەت جەنەڕاڵیش پەست بوو و لە جێی خۆیەوە پیشی دەخواردەوە و داخی هەڵدەکێشا! پتیتسن و توتسکی- ش خۆیان پێ نەگیرا و بزەیان هاتێ، بەڵام باش بوو زوو جڵەوی خۆیان گرت. هەموو میوانەکانی دیکەش لە سەرسامیدا دەمیان داچەقاندبوو.

میرزادە، بە هەمان دەنگی شەرمنانە لە سەری ڕۆیشت:

– کێ دەڵێ هەژار دەبین، لەوەیە هەژار نەبین، بەڵکو زۆریش دەوڵەمەند ببین ناستاسیا گیان، من لە هیچ شتێک دڵنیا نیم و بەداخەوە تاکو ئەمڕۆش هەر هەوڵێکم بۆ دڵنیا بوون داوە، بێئاکام بووە، بەڵام کە لە سویسرا بووم، نامەیەکم لە مۆسکووە، لە پیاوێکەوە بە ناوی سالازکین، پێ گەیشت، ئاگادارم دەکاتەوە کە داوای هەقی خۆم بکەم و پێدەچێت میراتێکی زۆر زۆرم بەر بکەوێت. فەرموو ئەمە نامەکەیە...

میرزادە، بە ڕاستی، نامەیەکی لە بەرکی دەر هێنا.

جەنەراڵ لەبەر خۆیەوە پرتاندی:

– توخوا ئەمە قسەی هەڵەقومەلەق نییە؟ ڕەنگە شێت بووبێ! چما ئێرە شێتخانەیە؟

بێدەنگی بۆ ساتێ باڵی بەسەردا کێشان.

پتیتسن گوتی:

– میرزادە، گوتت سالازگین ئەو نامەیەی بۆ ناردوویت؟ ئەو پیاوە، بزنسمانێکی زۆر بەناوبانگ و ناسراوە، لە کاری خۆیدا، زۆر کارامەیە، ئەگەر بە ڕاستی ئەو نامەکەی بۆ ناردبیت، ئەوا خاترجەم بە، دڵنیای دڵنیابە. خۆشبەختانە من دەستخەتی دەناسمەوە، ئیمزاکەی دەناسمەوە، چونکە لەو دواییانەدا کارێکم کەوتبووە لای ئەو. ئەگەر یارمەتیم بدەی، تەمەشایەکی نامەکە بکەم، لەوەیە بتوانم ئەم گرێ کوێرەیەت بۆ بکەمەوە.

میرزادە، بە بێدەنگی، بە دەستێکی لە ڕزۆک نامەکەی بۆ درێژ کرد.
جەنەراڵ، ڕاچڵەکی، بە سەرسامی ڕوانییە ئامادەبووان و گوتی:
- چی؟ چییە؟ بە ڕاستی باسی بەشە میراتە؟

کە پتیتسن نامەکەی دەخوێندەوە، تێکڕای ئامادەبووان چاویان بڕیبووە ئەو، هێندەی دی حەپەسان. فردیش چینکۆ، ئۆقرەی لێبڕابوو، جێی بە خۆی نەدەگرت، ڕوگوژین شۆک بووبوو، هایم و حەیران، پەریشان و نیگەران، جارێ تەمەشای میرزادەی دەکرد و جارێ دەیڕوانییە پتیتسن.

داریا ئالکسیڤناش، دەتگوت لەسەر ئاو و ئاگرە، تەنانەت (لیبدیف)یش سەبری سوا، لە جێگاکەی خۆی هەستا، چووە پشتی پتیتسنەوە، دوو لۆخۆی کۆماندەوە تا لەسەر شانی ئەوەوە نامەکە بخوێنێتەوە، لە یەکێک دەچوو ترسی ئەوەی هەبێ لە سەر ئەم فزولیەتەی، لەناکاودا زللەیەکی مزری لە پەناگوێ بسرەوێن.

پەراوێز:

* - "کاتیای...": سووکەڵە ناوی "کاترین"ە.

* - "مارلینسکی...": ناوی ئەدەبی نووسەری دیسامبەری ئا. ئا. بستوگیف (١٨٠٧-١٨٣٧) کە وەکو سەربازێکی سادە بۆ قوقاز نەفی کرا، لەوێ زنجیرە ڕۆمانێکی مێژوویی بە شێوازێکی گۆنگ و ئاڵۆز نووسی.

* - "ڕۆژنامەی هەواڵی بۆرسە..": ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بووە کە لەو ڕۆژگارەدا لە پترسبۆرگ دەر چووە.

* - "پاشا...": سووکەڵە ناوی (بیلاگیا ئوباراسیڤا)یە.

* - "فاسیلیفسکی...": (یان فاسیلی ئوستروف)، گەڕەکێکی پایتەخت بووە، کەوتبووە دوورگەیەکەوە.

* - "چەقۆیەک لە پارچەیەکی ئاوریشمەوە دەپێچن": لە ساڵی ١٨٦٦دا بازرگانێکی گەنجی خەڵکی مۆسکۆ بە نێوی مازورین، هاوڕێیەکی جەواهێرفرۆشی خۆی بە نێوی کالمیکوف، بۆ ماڵەوە دەعوەت دەکات و دەیکوژێت. ئەم بازرگانە گەنجە کەچڕەوە، دوو ملێون بەشە میراتی پێدەبرێت، هەر هەمووی بەفیڕۆ دەدات. دۆستویفسکی وەکو نموونەیەک، هەندێ خەسڵەتی ئەوی، لە ڕوگوژیندا بەرجەستە کردووەتەوە.

## فەسڵی شازدەیەم

پتیتسن، ئەنجام نامەکەی قەد کرد و دایەوە دەست میرزادە و گوتی:

- ئـەم مەسـەلەیە تەواوە، هـیچ چەنـد و چوونێـک هـەڵناگرێت. زۆر بەئاسانی، بەگوێرەی وەسیەتی ئارەزوومەندانە و بنجبڕی پوورت، دەبیت بە خاوەنی سەروەت و سامانێکی یەجگار زۆر.

جەنەراڵ، هاواری کرد:

- ماقووڵ نییە؟

هاوارەکەی جەنەراڵ، هاوار نەبوو! وەکو بۆمبا تەقییەوە.

هەموو ئەوانی دی، هایم و حەیران، لە سەرسامیدا دەمیان داچەقاندبوو.

هـەنگێ. پتیتسـن، کـە بـە ئانقەسـت، زیـاتر ڕووی دەمـی کردبـووە ئیڤـان فیدرورڤیچ، کەوتە باسکردنی مەسەلەکە و گوتی: میرزادە پوورێکی هـەبووە کـە پێـنج مانـگ لەمـەپێش مـردووە، هـەر چەنـدە خوشـکی گەورەی دایکـی میرزادە بووە، لێ میرزادە نـە ناسـیویەتی و نـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان دیتوویـەتی. لـە بنەماڵـەی پاپوشـین بـووە، بـابی بازرگـانێکی نمـرە سـێی مۆسـکۆ بـووە، نـابووت بـووە و بـە نـەداری و هـەژاری مـردووە، بـەڵام بـرا گەورەکـەی ئـەم پیـاوە، کـە لـەم دواییانـەدا مـردووە، بازرگـانێکی یـەجگار دەوڵەمـەند و بـەنێو بانگ بووە. دوو کوڕی دەبن کە ساڵێ لەمەپێش هـەر دووکیـان، لـە زەرفـی یەک مانگدا دەمرن، ئیدی کـابرا لـە سـووی کوڕەکـانی نـەخۆش دەکەوێت و دەمرێت. ئەمـە بێـوە پیـاو بـووە، هـیچ میراتگرێکـی نـەبووە، جگـە لـە کیـژی

برایەکەی، کە دەکاتە پووری میرزادە، ئەم ئافرەتە، ئافرەتێکی زۆر بێنەوا دەبێ و لە ماڵان دەژی. وەختێ بوو بە خاوەنی ئەو میراتییە، نەخۆش بوو، تووشی نەخۆشیی ئاوبەند (ئیسقایی) بووبوو، پێی بە لێو قەبرەوە بوو. ئیدی ڕوو لە سالازکین دەنێت کە تاقیبی میرزادەی بۆ بکات و سالازکینی کرد بە سەر وەسیێتی خۆی و فریاکەوت وەسیێتنامەیەکی پێ بنووسێت. وا دیارە نە میرزادە و نە ئەو دکتۆرەی لە سویسرا پەرستاری دەکرد، چاوەڕوانی یەک لاییبوونەوەی فەرمیی مەسەلەکەیان نەکردووە و میرزادە نامەکەی سالازکینی لە بەرکی ناوە و یەکراست بۆ ڕووسیا گەڕاوەتەوە…

پتیتسن، ڕووی لە میرزادە کرد و بەمە کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنا:

- من ئەوەندە دەزانم کە هیچ گومانێک لەسەر یاساییبوونی ئەم مەسەلەیە نییە، بۆیە نامەکەی سالازکین، سەبارەت بە هەقی تۆ، شتێکی حاشاهەڵنەگرە، ئەو قسانەی ئەو وەکو ئەوەیە حاڵی حازر پارەکەت لە تەنکەی باخەڵدا بێت. پیرۆزباییت لێ دەکەم میرزادە. لەوەیە ملیۆن و نیوێک یان زیاترت پێ ببڕێت، پاپۆشین پیاوێکی یەجگار زەنگین و دارا بوو

فردیش چینکۆ هاواری کرد:

- بژی میرزادە میشکین، دوا پاشماوەی ماڵباتی میرانی میشکین.

لیبدیف، بە دەنگێکی گڕی مەستانە هاواری کرد:

- با بژی!

جەنەراڵ، حایر و حەپەسا و گوتی:

- خودایا! خۆ ئەمڕۆکە من بیست و پێنج ڕۆبڵم بە قەرزدایە، بەزەییم پێیدا هاتەوە!… ها. ها. ها. شتێکی سەیرە، لە خەیاڵ سەیرترە! دەی لێت دا، پیرۆزە گیانە!

جەنەراڵ، بەدەم ئەو قسانەوە هەستا، بەرەو پیری میرزادە چوو، تا ماچی بکات. ئەوانی دیکەش بە چاولێکەری ئەو هەستان، چوون تەوقەیان دەگەڵ میرزادە کرد و پیرۆزباییان لێکرد. تەنانەت ئەوانەیش کە چووبوونە ژوورەکەی تەنیشتەوە، سەرلەنوێ هاتنەوە نێو هۆڵەکە. ئیدی بوو بە هەراو زەنایەک ئەوسەری دیار نەبێت، هەرکەسە و لە ئاوازێکی دەخوێند، لەنێو

هەراوزەناکەوە، کۆمەڵێک دەنگ بەرز بووەوە کە داوای شامپانیایان دەکرد. جەنجاڵی و هەراوهوریایەکی ئەوتۆ بوو، کە بۆ چەند ساتێک کەس ناستاسیا فیلیپۆڤنای لە بیر نەما. پاشان وردەوردە ئەوەیان بیر کەوتەوە کە میرزادە تۆزێ لەوە پێش پێشنیازی بۆ کردبوو کە شووی پێ بکات، ئیدی خەڵکەکە زیاتر هاڕوژان. توتسکی سەرسام و حیرەت زەدە، هەر ئەوەندەی پێ کرا شانەکانی هەڵتەکێنێ، لەنێو هەمووانا، تاقە کەس بوو کە هێشتا لە جێی خۆی دانیشتبوو. ئەوانەی دی هەموو سەرقاڵ و جەنجاڵ بەدەوری مێزەکەدا دەهاتن و دەچوون، پاشان هەموان ئەوەیان دووپات کردەوە کە ناستاسیا فیلیپۆڤنا، لەو دەمەدا سەراسیمە بووبوو.

ناستاسیا فیلیپۆڤنا، لە جێی خۆی دانیشتبوو، بۆ ماوەیەک سەرسام و حەپەساو، کەوتە تەمەشای دەوروبەر و میوانەکانی، وەکو ئەوەی بیەوێ سەر لەم مەسەلەیە دەربکات. ئەوجا لەناکاودا ئاوڕی لە میرزادە دایەوە، بە دیقەت زەینی دایە و برۆکانی وێک هێنانەوە، بەڵام ئەم حاڵەتە تەنیا یەک ساتی خایاند، وەک ئەوەی لە پڕێکا، خەیاڵێک پێی بڵێ، ئەمە بەشێکە لە گاڵتەجاڕییەک و هیچی تر، بەڵام کە میرزادەی بینی، بەلەز لەو خەیاڵە خەلەسی، جارێکی دی لە فکران ڕاچوو و بە تەواوەتی نەیدەزانی بۆچی بزەیەکی گونگ و نامەفهووم لەسەر لێوی نیشتەوە...

ناستاسیا، لە بەر خۆیەوە و بە تەوسەوە گوتی:

– یانی بەم پێیە دەبم بە میرزادەژن!

هەنگێ، بەبێ ویستی خۆی، نیگایەکی داریا ئەلکسیڤنای کرد، لە قاقای پێکەنینی دا. لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت و گوتی:

– وەک دەڵێن هەندی بمێنی، دەیبینی! ئەمەم هەر لە بیر و خەیاڵ نەبوو. مردنم لە بیر بوو، ئەمەم لە بیر نەبوو... گەلۆ بۆچی وەستاون؟ خانمان، ئاغایان فەرموو دانیشن، پیرۆزبایی لە من و میرزادە بکەن! ئەرێ پێم وایە یەکێک داوای شامپانیای کرد. ئادەی فردیش چینکۆ، هەڕو بڵێ شامپانیا بێنن! ناستاسیا فیلیپۆڤنا کە چاوی بە هەر دوو کارەکەرەکەی، کاتیا و پاشا، کەوت لە بەردەرگا وەستاون گوتی: "کاتیا، پاشا، وەرنە ئێرە!

بیستتان کە شوو دەکەم؟ شوو بە میرزادە دەکەم، ئێستا خاوەنی یەک ملیۆن و نیوە، میرزادە میشکینە و داوام لێ دەکات شووی پێ بکەم!

داریا ئەلکسیڤنا، کە ئەم ڕووداوانە بە تەواوەتی هەژاندبوویان هاواری کرد:

- گیانەکەم، ئەمە شتێکە خوا بۆی ناردوویت، ڕەفزی مەکە. ڕێوی بە پیرتەوە هاتووە، ئەم دەرفەتە لەکیس خۆت مەدە...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە سەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

- میرزادە وەرە لای منەوە دانیشە، ئالێرەدا، بەڵێ ڕێک لێرەدا، فەرموو ئەوەش شامپانیا. دەی بەڕێزینە، دەی بە خۆشی و بە سەلامەتیی ئێمە، پێک هەڵدەن، بخۆنەوە.

چەند دەنگێک کەوتنە هوراکێشان:

- پیرۆزە!

ئیدی هەموو بەکۆمەڵ، بەسەر قاپە شامپانیاکاندا دابارین، بە تایبەتی دارودەستەکەی ڕوگوژین، بەڵام گەلێک لە ئامادەبووان، سەرباری ئاڵۆزی وەزعەکە و ئەو جەنجاڵی و هەراوهوریایەی لەئارادا بوو، هەستیان دەکرد جەوەکە خەریکە دەگۆڕێ، سەرسام و حەپەساو چاوەڕوانی ئەنجام و ئاکامی ڕووداوەکان بوون. هەندێکیان بە گوێی یەکیانا دەچپاند کە ئەم جۆرە ڕێکەوت و حاڵەتانە زۆر ئاساییە: میرزادان زۆر جار هەر ئافرەتێکیان بۆ ڕێکەوتبێ خواستوویانە و تەنانەت کچە قەرەجیشیان ڕەدوو خستووە و خواستوویانە، بەڵام ڕوگوژین، ڕەق ڕاوەستابوو و تەمەشای دیمەنەکەی دەکردو، دەموچاوی گرژومۆن، تروسکەی ڕووناکی لێ بەدی نەدەکرا.

جەنەراڵ، بە دزییەوە خۆی گەیاندە لای میرزادە، بەئەسپایی بە گوێیدا چپاند:

- میرزادە، دۆستی ئازیز، پیاوی چابە، کەمێک وەهۆش بێرەوە!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بینیی، گوێی لە قسەکانی بوو، لە قاقای پێکەنینی دا، گوتی:

- نا، نا جەنەراڵ! من هەنوکە میرزادە خانمم، ئەدی بەخۆت گوێت لێ نەبوو؟ تازە تەواو، میرزادە هەنوکە ڕێگە بە کەس نادات بێحورمەتیم بەرانبەر بکرێت! ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، بۆچی پیرۆزباییم لێ ناکەیت؟ لە ئێستا بە دواوە دەتوانم لە هەر کۆڕ و مەجلیسێکدا، شان بە شانی ژنەکەی تۆ دانیشم. چ دەڵێی؟ پێت وا نییە لە سایەی ئەم جۆرە مێردەوە زۆر شت بەدەست بێت؟ یەک ملیون و نیو... سەروەتێکی یەک ملیۆن و نیوی... ناو و شۆرەت و نێوبانگ، میر و میرزادە... وێڕای هەموو ئەوەش وەک هەندێک دەڵێن گەمژەشە... ئیدی چی لەوە باشتر دەبێ؟ ژیانی خۆشیی من لە ئێستاوە دەست پێ دەکات! ڕوگوژین، فریا نەکەوتی، زۆر دێر کەوتی! پریاسکەکەت هەڵگرەوە. من شوو بە میرزادە دەکەم، من لە تۆ دەوڵەمەندترم!

بەڵام ڕوگوژین، کە بۆی دەر کەوتبوو، وەزع و حاڵەکە بەرەو کوێ دەڕوات، داخ و کەسەرێکی لە بن نەهاتوو، لەسەر سیمای نەخشی بەست. دەستەکانی لێک بڵاو کردەوە، ناڵەیەکی بەژانی کرد، ڕوو لە میرزادە هاواری کرد:

- دەستی لێ هەڵگرە!

ئامادەبووان، لە قاقای پێکەنینیان دا.

داریا ئەلکسیڤنا، هەڵی دایە و گوتی:

- لەبەر خاتری تۆ دەستی لێ هەڵگرێ، وانا؟ ئێوە تەمەشا، ئەم کابرایە، چۆن وەکو دێهاتی پارەکەی دەخاتە سەر مێزەکە! میرزادە دەیخوازێت، دەیکات بە هاوسەری خۆی، بەڵام تۆ هاتووی بەم ڕەفتارە نەنگینە خۆت بنوێنی، ئەمە چ حەیاچوونێکە!

- منیش دەیخوازام! یەکسەر، هەر ئێستا دەیخوازم. هەرچییەکی بوێ، بۆی دەکەم...

داریا ئەلکسیڤنا، بە پەستی لە سەری ڕۆیشت:

- دەتۆ تەمەشای ئەم مەستە بێهۆشە! تۆ پێویستە بە پاڵ لێرە وەدەر بنرێی!

قاقای پێکەنین بەرزتر بووەوە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- گوێت لێیە میرزادە؟ بڕوانە ئەم دێهاتییە بزانە چۆن مزایەدە لەسەر دەزگیرانەکەی تۆ دەکات؟

میرزادە گوتی:

- مەستە، بەڵام زۆری خۆش دەوێ.

- یانی پاشان، کە بیرت بکەوێتەوە، لەزگ بوو دەزگیرانەکەت بەگەڵ ڕوگوڕژین بکەوێ، هەست بە شەرمەزاری ناکەی؟

- ئاخر تۆ ئاسایی نەبوویت، ئاگات لە خۆ نەبوو، هێشتاش هەروایت، لەوە دەچوو وڕێنە بکەی.

- باشە ئەگەر سبەی، خەڵکی پێت بڵێن توتسکی ژنەکەی بەخێو دەکردیت و ژنەکەت قەپاتمەی ئەو بوو، هەست بە نەنگی و شەرمەزاری ناکەیت؟

- نا، نەخێر، هەست بە شەرمەزاری ناکەم! چونکە ئەوە بەخوایشتی خۆت نەبووە!

- یانی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوەم بە چاوا نادەیتەوە؟

- نا، هەرگیز!

- ئاخر ئاگادار بە! بە دەستی خۆت بۆ هەتاهەتایە خۆت تووش مەکە! ئەمە کارێکی زەحمەتە ها!

میرزادە، بە هێمنی و بە جۆرە سۆزێکی بەزەیی ئامێزەوە گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا، تۆزێ لەمەپێش گوتم ڕەزامەندیی تۆ بۆ من شانازییە، گوتم تۆ شانازی بە من دەبەخشیت، نەک بە پێچەوانەوە! تۆ گاڵتەت بەو قسانەم هات، پێکەنینت بەو قسانەم هات، هەروەها گوێم لە پێکەنینی ئەوانەی دەوروبەریشم بوو. لەگینە دەربڕینی مەبەستەکەم هەندێ کۆمیدی بووبێ، دیمەنی خۆیشم مایەی پێکەنین بووبێ، بەڵام وێڕای هەموو ئەمەش دڵنیام کە لە مانای شەرەف دەگەم و دڵنیام کە حەقیقەتم گوتووە، درۆم نەکردووە. چیوای نەمابوو کە بە دەستی خۆت ژیانت بەیەکجارەکی وێران بکەی، خۆت بفەوتێنی، ئەگەر شتی وات کردبا، هەرگیزاو هەرگیز لە

لۆمەی خۆت دەر نەدەچوویت و قەت لە خۆت خۆش نەدەبووی، جا چونکە پاک و بێ گوناهیت، نەدەبوو ژیانت بە یەکجارەکی بەفیرۆ بچێت. چی تیایە ئەگەر ڕوگـوژین هەولـی بـۆ دابیـت، تـەماحی تێکردبیـت یـان گـاڤریلا ئاردالیونوڤیچ ویستبی فریـوت بـدات؟ بـۆچی ئەوەنـدە ئەمـە دەڵێیتەوە، بۆ کردووتـە بەخـەم؟ دووبـارە دەکـەمەوە، ئەوەی تـۆ کردووتـە بـە کـەم کـەس دەکرێت، بەڵام مەسەلەی بڕیاری ڕۆیشتنت دەگەڵ ڕوگوژینـدا، بڕیـارێکی نـا ئاسـایی بـوو، تـۆ لـە خـۆش بوویـت، ئاگـات لـە خـۆ نـەبوو، هێشـتاش هـەر نەخۆشـیت تـات لێیـە، باشـتر وایـە بچـی بخەویت. ئەگەر دەگەڵ ڕوگوژینـدا بڕۆیشـتبای، بـۆ سـبەینێکەی جێـت دەهێشـت و دەکەوتیتـە جلشـۆری مـاڵان. ناسـتاسـیا فیلیپوڤنـا تـۆ کەسـێکی زۆر بـەغرور و نەفسـبەرزی، بـەڵام ئەوەندەت بەدبەختی کێشاوە کە خۆ بە خۆ هەستی گوناهباری لە خۆت بـار دەکـەی، تـۆ پێویسـتت بـە چـاودێری و مداراییـە، بـەڵام خـەمت نـەبێ، ئەمـە لێگەڕە بۆ من. ئەمڕۆکە بەیانی، کە یەکـەم جـار وێنەکـەتم بینـی، هەستم کرد ئەم دەموچاوەم دیتووە، دەیناسم. یەکسەر هەستم کرد کـە بـانگم دەکـەیت... من.. من زۆر حورمەتت دەگرم ناستاسیا فیلیپوڤنا.

میرزادە، کە گەیشتە ئێرە، لـەناکاودا، بێدەنگ بـوو. کاتێ کەوەئاگا هـاتەوە کە لە حوزوری چ جۆرە خەڵکانێکدا قسان دەکات، لە شەرما سـوور بـووەوە

پتیتسن، لە شەرما سـەری داخستبوو و دەیڕوانییە ئەرزەکە. توتسکی لـە دڵـی خۆیـدا گـوتی: "ڕەنگـە گـەمژە بێـت، بـەڵام دەزانـی هـیچ چـەکێک ناگاتـە چـەکی ڕوپامـایی و سـتاییش و پێداهەڵـدان. بـاش و خـراپ لێکـدی جیـا دەکاتەوە، خۆڕسک ئەمە دەزانێ!" لەم کاتەدا میرزادە، نیگـای لـەنیگای گانیـا، کە گریـانی لێڤـدەباری، هەڵـەنگوت، بـە ڕقێکـی ئەوتـۆوە تەمەشـای میـرزادەی دەکرد، بەو بوایە هەر لەوێدا، بیکات بە قەرەبرووت.

داریا ئـەلکسـیڤنا کـە سـۆزو میهری لـێ دەبـاری، بەدەم سـۆز و گـودازەوە گـوتی:

– ئەمەش ئەو پیاوە دڵپاکەی کە لێی دەگەڕای!

جەنەراڵ، لە بن لێوانەوە گوتی:

- پیاوێکی پاک و ڕۆشنبیر، بەڵام لێ بووەتەوە!

توتسکی کڵاوەکەی هەڵگرت و خۆی ئامادە کرد تا بەخشکەیی و بێ ئەوەی کەس پێی بحەسێت بۆی دەر بچێت. خۆی و جەنەراڵ، بە تیلەی چاو قەراری ڕۆیشتنیان دا.

ناستاسیا فیلیپوڤنا گوتی:

- سوپاس* میرزادە، تاکو ئێستا هیچ کەسێک بەم جۆرە قسەی دەگەڵ نەکردووم، ئەمە یەکەم جارە گوێم لە قسەی وا ببێت. دەیان خستمە مزایدەوە، مزایەدەیان لەسەر دەکردم، بە پارە دەیانقەبڵاندم، بەڵام هیچ پیاوێکی ئابڕوومەند و پیاوانە، ڕۆژێ لە ڕۆژان بە مەبەستی خواستن لێم نەهاتووەتە پێشەوە. ئافاناسی ئیڤانوڤیچ گوێت لێ بوو؟ قسەکانی میرزادەت بەلاوە چۆنە؟ ڕەنگە بەلای تووە جۆرە گوساخییەک بێ؟ ڕوگوژین، پەلەی ڕۆیشتنت نەبێ، توزێ بوەستە! هەر چەندە پێناچێ نیازی ڕۆیشتنت هەبێ، لەگینە هێشتا ئەگەری ئەوە مابێ بەگەڵ تۆ بکەوم. ئەگەر بەگەڵت بکەوم بۆ کوێم دەبەی؟

لیبدیف، لە جێی خۆیەوە گوتی:

- بۆ یەکاتیرنهوف* .

ڕوگوژین، لەم کاتەدا، ئەبڵەق و حەپەساو، پڕ بە هەر دوو چاو تەمەشای دەکرد، لە تۆ وایە باوەڕ بە گوێی خۆی ناکات. وەکو یەکێک لەناکاوا، یەکێکیان بەسەریا کێشابێ، شۆک بووبوو.

داریا ئەلکسیڤنا، بە ترسەوە هاواری کرد:

- ئەوە تۆ چ دەڵێی گیانە؟ مەگەر شێت بووی؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەدەم قاقای پێکەنینەوە، لە کورسییەکەی هاتە خوارەوە و گوتی:

- لێت بووە بە ڕاست؟ تۆ پێت وایە بتوانم ژیانی ئەم پەپوولە بێگەردە، وێران بکەم؟ ئەمە لە ئافاناسی ئیڤانوڤیچ دەوەشێتەوە، نەک من، ئەو فێرە ژیان لە خەڵکی بێگەرد و بەستەزمان حەرام بکات، دەی ڕوگوژین خۆت

ئامادە بکە، سەفتە پارەکە حازر بکە! گرینگ نییە بمخوازیت، گرینگ ئەوەیە پارەکەم بدەیتێ. لەگینە ڕازی نەبم شووت پێ بکەم. چما وات دەزانی ئەگەر باسی خواستن بکەی، ئیدی پارەکە بۆ خۆت هەڵدەگریتەوە؟ بیرکردنەوە یەکی قۆڕە! بەو ڕادەیەش دەبەنگ نیم. تا حەزکەی بێحەیا و بێ چاووڕووم، من ماشقەی توتسکی بووم، بە ئاشکرا لەگەڵیم ڕادەبوارد!... میرزادە، تۆ پێویستت بە ئاگلایا یەپانچینە نەک بە ناستاسیا فیلیپوڤنا. ئەگەر ئەم گەوجاتیەت کردبا دەبووی بە داستان و دەکەوتیتە سەرزاران، دەبووی بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانان، تەنانەت پیاوێکی وەکو (فردیش چینکۆ)ش، لێی دەخوێندی! ڕەنگە تۆ باکت بەمە نەبێ، دەربەست نەیەی! بەڵام من دەبمە مایەی ماڵوێرانی و تیاچوونی تۆ، دەترسم لەو سونگەیەوە گلەییم لێ بکەی.

سەبارەت بەو قسەیەش کە گوتت شانازی بە خواستنی منەوە دەکەیت، بە خواستنم سەربەرز دەبیت، شانازیم پێوە دەکەیت، ئەمەیان لە توتسکی بپرسە، ئەو ئاگای لە هەموو شتێکە! سەبارەت بە تۆش گانیا، دەزانی، بە خۆڕایی ئاگلایا یەپانچینت لەکیس خۆت دا؟ ئەگەر سەودا و مامەڵەت لەگەڵ نەکردبا، بێگومان شووی پێ دەکردیت. ئێوە هەمووتان وەکو یەکن: دەبێ لەنێوان ژنێکی داوێنتەڕی بەدناو و ژنێکی ئابڕوومەندی داوێنپاکدا یەکێکیان هەڵبژێرن، جگە لەم ڕێگەیە هیچ ڕێگەیەکی تر نییە! دەنا سەرتان لێ دەشێوێت... تەمەشای جەنەراڵ بکەن بزانە چۆن هێشتا زاری بەش کردووەتەوە!

جەنەراڵ، شانەکانی هەڵتەکاند و گوتی:

- ئێرە شاری سەدومە، ئەمە شاری سەدومە*!...

جەنەراڵیش هەستا. هەنوکە هەموو هەر وەستابوون. ناستاسیا فیلیپوڤنا وەکو یەکێک دەهاتە بەرچاو کە حاڵی لێ هاتبێ.

میرزادە، کە بەداخ و کەسەرەوە دەستەکانی هەڵدەگلۆفت، بەدەم ناڵینەوە گوتی:

- ئەوە بە ڕاستتە؟ شتی وا دەبێ؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا گوتی:

- چما پێت وا بوو شووت پێ دەکەم! جا من چەند بەدناو و بێشەرم و حەیاش بم، ڕەنگە بۆ خۆم و لە پێستی خۆمدا جۆرە کبریا و نەفسبەرزییەکم هەبێ! تۆ تۆزێ لەمە پێش هەڵت کێشام کە ژنێکی سەلار و سەنگین و بەکەماڵم. پیف لەو ژنە سەنگینەی کە خۆی دەخاتە زەلکاوەوە هەر لەبەر ئەوەی شانازی بەوەوە بکات کە یەک ملیۆن ڕۆبڵ و عینوانێکی ئەشرافی، ناوەتە ژێر کەوشەکانی! ئاخر منێک کە ئەوە ڕەفتارم بێ، چۆن بە کەڵکی تۆ دێم؟ ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، خۆ بە چاوی خۆت دیتت کە یەک ملیۆن ڕۆبڵم لە پەنجەرەکەوە تورِدا؟ ئیدی بە چ ئەقڵێکەوە وا تەسەور دەکەیت من بە مەمنوونییەوە شوو بە گانیا بکەم، بە تەماحی ئەو هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەی کە گوایە تۆ دەیدەی؟ ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، هەڵی بگرەوە، هەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵەکە بۆ خۆت هەڵبگرەوە – تەنانەت نەتتوانی بیگەیەنیتە سەد هەزار ڕۆبڵیش، بە قەد (ڕوگوژین)یشت تیا نەبوو! - سەبارەت بە گانیاش، حەز دەکەم خەیاڵی تەخت بێ و خاترجەم بێت، کە من دەمەوێ بۆ خۆم خۆش بژیم، بە کەیفی خۆم ڕابوێرم، من ژنێکی هەرزە و سووک نیم؟ دە دانە ساڵ لە زنداندا بووم. هەنوکە کاتی ئەوە هاتووە بۆ خۆم ئازاد بم، بژیم، ڕابوێرم. دەی ڕوگوژین چاوەڕێی چیت؟ هەستە خۆت ئامادە بکە با بڕۆین!

ڕوگوژین، کە خەریک بوو لە خۆشیا شێت بێت، هاواری کرد:

- با بڕۆین! ئەهای! تۆ... شەراب بۆ جەماعەت بێنە... شەراب بۆ منیش بێنە. ئەدی موسیقا؟ موسیقاش لێ بدەن.

ڕوگوژین، بەدەم ئەو قسانەوە، کە بینیی داریا ئەلکسیڤنا، بەرەو ناستاسیا فیلیپوڤنا دەڕوات، نەڕاندی:

- لاکەوە! لێی نزیک نەبیتەوە! هیی منە! تەنیا هی منە! شابانۆی خۆمە! تەواو، بڕایەوە!

لە خۆشیاندا، لە پێستی خۆی نەدەهێوری، بە دەوری ناستاسیا فیلیپوڤنادا دەخولایەوە و هاواری دەکرد: "لاکەون!" هەر هەموو جماعەتەکە، لە

هۆڵەکەدا، خرش بووبوونەوە. هەندێک دەیانخواردەوە، هەندێک پێدەکەنین، ئیدی هەر کەسە و بە جۆرێ شادی خۆی دەردەبڕی. ئیدی فردیش چینکۆ، لەو ساتەوە، خەریک بوو، لەنێو ئەواندا جێی خۆی دەکردەوە.

جەنەراڵ و توتسکی جارێکی دی خۆیان ئامادە کرد کە بڕۆن. گانیاش شەپقەکەی بە دەستەوە گرتبوو و لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستابوو، لەوە دەچوو پێی ڕێ دانەگرێت، ئەو دیمەنە جێ بێڵێ.

ڕوگوژین، هەر هاواری بوو:

- لاکەوە! نزیک نەبیتەوە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- هاوار هاواری چیتە، ئەم هاتوهاوارەت لە چییە؟ من هێشتا لەماڵەکەی خۆمدام و خانمی خۆمم. خۆم خاوەنی خۆمم. ئەگەر بمەوێ، بە ئاماژەیەک، دەتکەمە دەرەوە، من هێشتا پارەکەم وەر نەگرتوویت. هێشتا لەوێیە، لە جێی خۆی. بۆم بێنە بۆ ئێرە. هەموو سەفتەکە بدە دەستم. ئەم سەفتەیە سەد هەزار ڕۆبڵە؟ پیف! داریا ئەلکسیڤنا چیتە؟ یانی دەتویست قوڕی بۆ بگرمەوە، ژیانی لێ حەرام بکەم؟ (بەدەم ئەو پرسیارەوە ئاماژەی بۆ لای میرزادە کرد). کەسێک کە خۆی پێویستی بە دایەن و پەرستار بێ، چۆن دەتوانێ ئیدارەی ژن بدات؟ جەنەراڵ، جێی دایەنی بۆ دەگرێتەوە، دەیگرێتە خۆی، دەیخاتە ژێر باڵی خۆیەوە. بڕوانە چۆن بەدەوریا دێت و نازی دەکێشێت! تەمەشا میرزادە: دەزگیرانەکەت، چونکە، سۆزانییە، بزانە چۆن پارەکەی وەر گرت، ئەمە ئەو ژنە شەریفە بوو کە تۆ دەتویست بیخوازیت! بۆچی دەگریت؟ ئەمەت لە بەر گرانە؟ گوێ مەدەیە، وەکو من پێبکەنە...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە دوو دڵۆپە فرمێسکی گەش بەسەر گۆناکانیەوە دەدرەوشایەوە، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

- وەکو من پێبکەنە. ئەم مەسەلەیە بە ڕۆژگار بسپێرە. هەموو شتێک دەبڕێتەوە و تەواو دەبێ. ئینسان ئێستا پەشیمان بێتەوە باشترە لەوەی سبەینێ پەشیمان ببێتەوە... ئەوە بۆ هەمووتان دەگرین؟ کاتیاش خەریکە دەگری، کاتیا، گیانەکەم بۆچی دەگریت؟ بیرم لە تۆ و پاشا کردووەتەوە،

زۆر شتتان بۆ جێ دێڵم. تەگبیری هەموو شتێکم بۆ کردوون. جارێ خودا حافیز! ئاخر من کچێکی ڕووسووری وەکو تۆم ناچار کرد خزمەتی منی ناوزڕاوی، بەدناوی سۆزانی بکەیت! میرزادە، ئەمە باشترە، بە ڕاستی ئەمە باشترە! ئەگینا لە ئاییندەدا لێم بێزار دەبوویت و هەرگیز خێرمان لە یەکدی نەدەبینی و بە خۆشی و شادی نەدەژیاین. هیچ بیانوویەکم بۆ مەیەنەوە، چونکە باوەڕ ناکەم! گەوجانەترین کار ئەوە بوو کە شووت پێ بکەم!...

باشترین شت ئەوەیە بە خۆشی و دۆستانە لێکدی جیا ببینەوە، چونکە من کەسێکی خەیاڵاوی و ڕۆمانتیکیم، دڵنیام ئەگەر زەماوەندمان بکردایە، هیچ خێرێکمان لێکدی نەدەبینی! مەگەر من خەونم بە پیاوێکی وەکو تۆوە نەدەبینی؟ تۆ ڕاستت دەکرد، من زۆر زۆر لەمێژبوو کەسێکی وەکو تۆم لە خەونا دەبینی – بە درێژایی ئەو پێنج ساڵەی کە بە تاقی تەنیا لە گوندیدا دەژیام، هەر بیرم دەکردەوە، لەم بیرەوە دەچوومە سەر ئەو بیر، لەم خەیاڵەوە بۆ ئەو خەیاڵ، ئەم خەونەم بەو خەونە دەسپارد، تا پیاوێکی وەکو تۆ - میهرەبان، شەریف، ناسک، خۆشخوو، کاڵفام و کەمێک گەمشەک، لەناکاودا دێتە خەونم و پێم دەڵێت: "تۆ گوناحبارنیت ناستاسیا فیلیپوڤنا. من تۆم خۆش دەوێ دەتپەرستم!". بەڵێ ئەوەندەم خەون دەبینی هەندێ جار لەزگ بوو شێت بم! کەچی پاشان ئەم پیاوە دەهات، ساڵی یەک-دوو مانگ لەوێ دەمایەوە، تا تێر دەبوو، فەساتی دەکردم، ئەوسا بە سووک و ڕیسوایی، بە ئابڕووتکاوی جێی دەهێشتم. هەزار جار ویستوومە خۆم فڕێدەمە حەوزەکەوە، خۆم بخنکێنم، بەڵام ترسنۆک بووم، نەمدەتوانی زات وەبەر خۆ بنەم... ئێستاش – ڕوگوژین ئامادەیت؟

– هەموو شتێک ئامادەیە!

چەند دەنگێک دووبارەیان کردەوە:

– هەموو شتێک ئامادەیە!

– گالیسکەکان، بە خۆ و زەنگەکانیانەوە، لە خوارەوە چاوەڕوانن

ناستاسیا فیلیپوڤنا، سەفتە پارەکەی بە هەر دوو دەستان گرت. گوتی:

– گانیا، خەیاڵێکم بە مێشکا هاتووە، دەمەوێ قەرەبووی بکەمەوە، بۆچی

هەموو شتێک بدۆڕێنی؟ هەموو شتێک لە دەست بدەیت؟ ئەرێ ڕوگوژین، تۆ لەو باوەڕەدای بۆ سێ ڕۆبڵان تا ئەوپەڕی شاری فاسیلیفسکی بە چوار چنگۆڵە بڕوات؟

- بەڵێ، ئامادەیە بە سکەخشکێ بڕوات.

- کەواتە گوێ بگرە گانیا. دەمەوێ بۆ دواجار نەفسیەتت تاقی بکەمەوە. تۆ سێ دانە مانگە عەزابی ڕوحی من دەدەی. ئێستا ئیدی نۆرەی منە، دنیا دەوران دەورانە. ئەم پریاسکەیە دەبینی؟ سەد هەزار ڕۆبڵی تیایە! باشە، من دەیخەمە ئاگردانەکەوە، دەیخەمە ناو ئاگرەکەوە، بە شایەتی هەموو ئەمانەی لێرەن، هەر کە لە هەموو لایەکەوە گڕی گرت، تۆ خۆت بگەیەنە ئاگردانەکە، بەبێ دەستکێش، قۆڵی لێ هەڵماڵە و بە دەستی ڕووت پریاسکەکە دەر بێنە و پارەکە هەڵگرە بۆ خۆت - سەد هەزار ڕۆبڵە، هەمووی بۆ خۆت! باش بیری لێ بکەوە! ئەوپەڕی پەنجەکانت تۆزێ دەسووتێن! دەرهێنانەوەی زۆری پێدەچێ؟ نا... تا لەو ماوەیەدا تەمەشات بکەم و هیمەت و بوێری و نەفس بەرێزی تۆم بۆ دەر بکەوێ. ئەگەر پارەکەت لە ئاگرەکە دەر هێنایەوە، ئەوا بە شایەدی ئەمانە، وەکو شیری بەر دایکت حەڵاڵی تۆیە! بەڵام ئەگەر بۆت دەرنەهاتەوە، با بۆ خۆی بسووتێ، قەبوڵ ناکەم کەس دەری بێنێتەوە! هەمووتان بچنە دواوە، بۆ دواوە! پارە پارەی خۆمە و بابسووتێ! پارەی شەوێکمە لەگەڵ ڕوگوژیندا! ڕوگوژین، ئەم پارەیە، پارەی من نییە؟

- بۆ نا گیانەکەم! هیی تۆیە شابانۆیەکەم!

- کەواتە بۆ دواوە، هەمووتان بچنە دواوە، من بە کەیفی دڵی خۆم دەکەم، کەس هەقی بەسەرمەوە نەبێت! ئادەی فردیش چینکۆ، ئەو کوورەیە نێڵ بدە!

فردیش چینکۆ، سەرسام و حەپەساو گوتی:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا ناتوانم، دەستم تێی ناچێت!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، گوتی:

- باوەڕ ناکەم.





هەنگێ دەستی دایە مەقاشەکە، پشکۆکانی جوولاند، بڵێسەی ئاگر بەرز بووەوە، بەستەکەی فڕێ دایە ناو ئاگرەکەوە.

هاواری ئامادەبووان بەرز بووەوە، تەنانەت ژمارەیەکیان ئاماژەی خاچیان کێشا.. چەند دەنگێک هاواریان کرد:

- شێت بووە، بەتەواوەتی شێت بووە.

جەنەراڵ، بە گوێی (پتیتسن)یدا چپاند:

- باشە نەچین، دەست و پێی ببەستینەوە یان کارێک بکەین؟ یا نەنێرین بە دوای... ئاخر شێت بووە، بە تەواوەتی شێت بووە. وا نییە؟

پتیتسن، کە ڕەنگی بووبوو بە زەعفەرانی زەرد، ئازای دەڵەرزی، نەیدەتوانی چاوی لە بەستەکە، کە بەرەبەرە گڕی دەگرت، بگوازێتەوە، بە چپە گوتی:

- نا... نا، ئەمە شێتێتیی تەواو نییە.

هەنگێ جەنەراڵ، ڕووی کردە توتسکی و پرسیی:

- وا دیارە شێتە، وا نییە؟

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، کە ئەویش ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئەدی پێم نەگوتیت ژنێکی سەیرە؟

- سەد هەزار ڕۆبڵ!

لە هەموو لایەکەوە دەنگ بەرز بووەوە

- خودایا!

هەموو ئامادەبووان، لەدەوری ئاگردانەکە خڕ بوونەوە، تا باشتر دیمەنەکە بدینن، هەر کەسە و بە جۆرێ سەرسامیی خۆی دەر دەبڕی... تەنانەت هەندێکیان چوونە سەر کورسییەکانیان تا لەسەر شانی ئەوانی دیکەوە تەمەشای دیمەنەکە بکەن. داریا ئەلکسیڤنا، شپرزە و هەراسان خۆی بە ژوورەکەی تەنیشتا کرد و دەگەڵ کاتیا و پاشادا کەوتە چپەدوو. شۆخە جوانە ئەڵمانییەکە ڕۆیشتبوو.

لیبدیف، کە لەسەر چۆکان بەرەو ناستاسیا فیلیپوڤنا دەچوو و دەستی

بەرەو ئاگردانەکە درێژ کردبوو، هاواری کرد:

- ئەی شابانۆ! خاوەن کەرەم! ئەی کەرەمکاری کەرەمدار. ئەمە سەد هەزار رۆبڵە! سەد هەزار! بە چاوانی خۆم دیتم، لە بەرچاوی خۆم پێچایانەوە، ئەی ناستاسیای میهرەبان! تۆ بەس ئەمر بفەرموو، خۆم بە ئاگردانەکەدا دەکەم، سەری سپیم لە ناوەندی ئاگرەکە دەنەم!... ژنێکی داماوی نەخۆش، گۆد و ئیفلیجم هەیە، سیازدە منداڵی سەروپێچکەم بەسەرا کەوتوون... هەموو لە برسا لاکەی سەریان دێت.. هەفتەی ڕابردوو باوکم لە گۆڕنا، لە برسا مرد، ناستاسیا فیلپوڤنا!

لیبدیف، بەدەم لالانەوە و پاڕانەوەوە، بەرەو ئاگردانەکە خزی.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە دەیدایە دواوە، هاواری کرد:

- بۆ دواوە: هەموو دوور بکەونەوە! بۆ دواوە: گانیا بۆ وەستاوی، چاوەڕوانی چیت؟ شەرمێ مەکە، دەی خێراکە، ئەمە فرسەتە، دووبارە نابێتەوە، لەکیسی خۆتی مەدە!

بەڵام گانیا، کە ئەو ڕۆژ و شەوە عەزابێکی زۆری کێشابوو، خۆی بۆ ئەم تاقیکردنەوە قورسە چاوەڕواننەکراوە، ئامادە نەکردبوو! خەڵکەکەی بەردەمی بوون بە دوو بەشەوە، گانیا، ڕێک کەوتە بەرانبەر ناستاسیا، تەنیا سێ شەقاو لەوەوە دوور بوو. ناستاسیا لە دیار ئاگردانەکە وەستابوو و چاوەڕوانی دەکرد، نیگا ئاگرینەکانی لە گانیا نەدەگواستەوە. گانیا بە خۆی و پاڵتۆ بێ قۆڵەکەیەوە وەستابوو، کڵاوەکەی بە دەستەوە گرتبوو، پەست و خەمین نە قسەی دەکرد و نە لە جێی خۆی دەجووڵا، دەستەکانی لە سەر سینگی تێک ئالاند بوو و چاوی بڕیبووە، بڵێسەی ئاگرەکە. بزەیەکی وێڵ، بە سیمای مردوو ئاسایەوە، دەر دەکەوت و زوو ئاوا دەبوو.

ڕاستە نەیدەتوانی، نیگای حیرەتباری لە ئاگرەکە و لە بەستە پارەکە، کە خەریک بوو دەسووتا، بگوازێتەوە، بەڵام لەوە دەچوو شتێکی تازە لە ڕوح و دڵ و دەروونیا پەیدا بووبێ. لە تۆ وایە سوێندی خواردووە کە تا کۆتایی خۆی لەبەر ئەم عەزابە بگرێت. لە جێی خۆی بزمارئاسا چەقیبوو. دوای چەند سائێک هەموو قەناعەتیان هێنا کە پریاسکەکە دەر ناهێنێ و نیازی





شتی وای نییە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، هاواری لێ کرد و گوتی:

- خێراکە، هەمووی دەسووتێ، هەنگێ خەڵکی گاڵتەت پێ دەکەن، دەڵێن گەوج بوو. ئیدی گلەییت لەسەر خۆتە، پەشیمان دەبیتەوە ها، باوەڕ بکە پاشان لە داخا خۆت هەڵدەواسی. بە ڕاستمە ها! گاڵتەت لەگەڵ ناکەم!

ئەو گڕەی لەنێوان دوو ئێزنگەوە بەرز بووبووەوە، کاتێ پریاسکەکە خرایە ئاگرەکەوە، دامرکایەوە و خەفە بوو، بەڵام هێشتا وردە بڵێسەیەکی شینباو بە کۆتایی ئێزنگەکەی ژێرەوە مابوو. ئەنجام بڵێسەیەکی درێژکۆلە خۆی گەیاندە پریاسکەکە، کاغەزەکەی کە بەستە پارەکەی تێوە پێچرابوو، لە سووچەکانیەوە گڕی گرت، لەناکاوا هەموو بەستەکە گڕی گرت و ئاگر بڵێسەی سەند. ئامادەبووان، جموجۆڵیان تێ کەوت و کەوتنە ورتەورت!

لیبدیف، دووبارە، کەوتە سەر چۆکان و بەدەم پاڕانەوەوە بەرەو ئاگردانەکە خزی:

- ناستاسیا فیلپوڤنا!

لێ ڕوگوژین، ڕێی نەدا و دایە دواوە. ڕوگوژین، سەراپا بووبوو بە نیگا. نەیدەتوانی چاو لە ناستاسیا فیلپوڤنا بگوازێتەوە، نەشئەیەکی وا گرتبووی، ئاگای لە دنیا نەمابوو، لە ئاسمانی حەوتەمدا دەسووڕایەوە، خەریک بوو بە نیگا، ناستاسیای دەخوارد.

ڕوگوژین، مەستی مەست، ڕوو لە ئامادەبووان هاواری دەکرد:

- ئەمە شابانۆیە! شابانۆی وڵاتە! ڕێک بە دڵی منە، کێ لە ئێوەی گەجەر و گوجەر، دەیتوانی کاری وا بکات، ها؟

میرزادە، خامۆش و خەمین، تەمەشای دیمەنەکەی دەکرد. فردیش چینکۆ، گوتی:

- من، ئەگەر تەنیا هەزار ڕۆبڵم بدەنێ، بە ددان بەستەکە دەر دێنمەوە.

کابرای دەست و مەچەک ئەستوور، کە لە دوای دواوە وەستابوو و لە حەژمەتاندا لێوی دەکرۆشت، هاواری کرد:

- منیش، ئامادەم، بە ددان دەری بێنمەوە.

کە چاوی بە گڕ و بڵێسەی تازە کەوت هاواری کرد:

- شەیتان بە نەعلەت بێ! کورە سووتا! هەمووی دەسووتێ!

هەموو، تێکڕا هاواریان کرد:

- خەریکە دەسووتێ! گڕی گرت!

و زۆربەیان، بەرەو ئاگردانەکە هوڕوژمیان هێنا. ناستاسیا گوتی:

- گانیا! لە ڕوو دامەمێنە! شەرم مەکە! بۆ دواجار پێت دەڵێم، لە کەری شەیتان وەرە خوارەوە!.

فردیش چینکۆ، وەکو شێت و هار، شاڵاوی بۆ گانیا برد، قۆڵی کراسەکەی ڕاتەکاند و هاواری کرد:

- لاساری کەللەڕەق فریاکەوە! دەسووتێ، پارەکە دەسووتێ! هەی شوومی بەدفەڕ، عەمرت نەمێنێ!

گانیا، بە هەموو هێز و قوەتی خۆیەوە، فردیش چینکوی دەڵەک دا. سووڕایەوە و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، بەڵام هەر کە دوو شەقاو ڕۆیشت، یەکسەر بەلادا هات و کەوتە سەر زەوی.

دەنگی هاوار بەرز بووەوە:

- بورایەوە!

لیبدیف، جارێکی دی، بەدەم پاڕانەوەوە هاواری کرد:

- ناستاسیا فیلیپوڤنا! بۆ خاتری خوا دەسووتێ!

خەڵکەکە هاواریان کرد:

- حەیفە، بە خوتوخۆڕایی دەسووتێ!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بانگی کرد:

- ئەهای کاتیا، پاشا، ئاوی بۆ بێنن، شەرابی بۆ بێنن!

ئەوسا دەستی دایە مەقاشەکە و پارەکەی لەنێو ئاگرەکە دەر هێنا. ئەو کۆنە ڕۆژنامەیەی لە دەوری پارەکە پێچرابوو، هەر هەمووی سووتا بوو، بەڵام دیار بوو کە ناواخنی پریاسکەکە هیچی لێ نەهاتبوو. سێ قەد ڕۆژنامە لە پارەکە پێچرابوو، بۆیە پارەکە هیچی لێ نەهاتبوو. هەموو ئامادەبووان، هەناسەی ئۆخەیان هەڵکێشا. لیبدیف، بە سۆزەوە گوتی:

- ئەو پەڕەکەی، ئەسکە ناسێکی هەزار ڕۆبڵی ئاسیوی دیتوە، باقییەکەی ساغ و سەلامەتە.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بەستە پارەکەی لای گانیاوە دادەنا، گوتی:

- هەر هەموو ئەم پارەیە هیی ئەوە! بەستەکە هەمووی! گوێتان لێیە گەلۆ؟ خۆی گرت و نەچوو بەلای پارەکەوە، مانای وایە هێشتا ئەوەندەی غیرەت و پیاوەتی تیاماوە بەسەر تەماع و چاوچنۆکییەکەیدا زاڵ بێ. قەیدی نییە، خەمتان نەبێ هەنوکە وەخۆ دێتەوە! ئەگەر نەبورایەتەوە لەگین بوو بمکوژێ!... ئەها، نەمگوت، ئەوەتا وا هەڵدەستێتەوە! جەنەراڵ، ئیڤان بتروفیچ، داریا ئەلکسیڤنا، کاتیا گیان، پاشا گیان، ڕوگوژین، هەموو گوێتان لێم بوو؟ بەستەکە هەمووی، بۆ ئەوە، هیی گانیایە! دەیدەمێ بۆ خۆی، بە گەردنئازایی دەیدەمێ، وەکو قەرەبوو دەیدەمێ.. قەربووی چی، نازانم، گرینگ نییە! وای پێ بڵێن! با ئەم پارەیەی لەلاوە بێ. ڕوگوژین، وەرە با بڕۆین! بە دووعا میرزادە، ئەمە یەکەم جارە لە عەمراتما، پیاوێکی مرۆڤانی، مرۆڤدۆست بدینم! بە دووعا ئافاناسی ئیڤانوفیچ! و مێرسی.

جماعەتەکەی ڕوگوژین، هەموو بەدەم هەراوزەناوە، بەرەو دەرگای دەرەوە، دووی ڕوگوژین و ناستاسیا فیلیپوڤنا کەوتن و بێخەم و خەیاڵ لە ژوورەکان وەدەر کەوتن.

کارەکەرەکان، کاتیا و پاشا، لە هۆڵەکەدا یارمەتیی خانمی خۆیان دا کە پاڵتوکەی لە بەر کرد. مارتای ئاشپەزیش بەلەز لە موبەقەکە هاتە دەرێ و خۆی گەیاندێ. ناستاسیا فیلیپوڤنا هەر سێکیانی ڕامووسی. کارەکەرەکان، بە سێ قۆڵی، لەو کاتەدا کە دەستیان ماچ دەکرد، بەدەم گریانەوە، پرسییان:

- خانم گیان، بە ڕاستی دەڕۆیت، بۆ هەتاهەتایە جێمان دێڵیت؟ ئاخر کێوە دەچیت، بۆ دەڕۆیت؟ لە ڕۆژێکی ئاوهاشدا، ڕۆژی ساڵیادی لەدایکبوونت؟

- دەکەومە سەر جادە و شەقامان کاتیا گیان. بە خۆت گوێت لێ بوو کە وام گوت. ئەوێ شوێنی منە. یان جلشۆری ماڵان دەکەم. بە ڕاستی لەوەی پتر منەتی ئافاناسی ئیڤانوفیچ هەڵناگرم. بەسە بێزار بووم. سڵاوی منی پێ

بگەیەنن. گەردنم ئازاکەن، یادی بەخێرم بکەنەوە...

میرزادە، بەهەشتاو بەرەو دەرگای دەرەوە چوو. جماعەتەکەی ڕوگوژین، هەموو سواری چوار گالیسەکە بوون. زەنگی ملی ئەسپەکان بە جارێ لێیان دەدا. جەنەڕاڵ، لە سەر قاڵدرمەکان، گەیشتە میرزادە، قۆڵی گرت و گوتی:

– میرزادە ئەمە چییە؟ بۆ دوای کەوتووی، تۆزێ بە هۆش وەرەوە، وازی لێ بێنە! خۆ بە چاوی خۆت دیتت کە چۆن ژنێکە، من بەرژەوەندیی تۆم دەوێ، وەکو باوکێک قسەت دەگەڵ دەکەم...

میرزادە، تەمەشایەکی کرد، هیچ قسەیەکی نەکرد، ئەوسا قۆڵی لە دەستی دەر هێنا، بەغار لە قاڵدرمەکانەوە دابەزی. کاروانی گالیسکەکانی ڕوگوژین تۆزێ بوو کەوتبوونە ڕێ. جەنەڕاڵ کە لە بەردەرگای دەرەوە وەستابوو، میرزادەی بینی، کە بەهەشتاو خۆی بە یەکەم گالیسکەدا کرد و بە پەرۆشەوە بە گالیسکەچییەکەی گوت: "باژۆ، یەکڕێ بۆ یەکاتیرنهۆف! دوای ئەو ڕیزە گالیسکەیە بکەوە!" ئەوسا، گالیسکە گەورە و کەشخەکەی جەنەڕاڵ، هات و لە بەردەرگا وەستا. جەنەڕاڵ سوار بوو، بە کۆمەڵێک هیوا و ئومێد و حیساباتی تازەوە، بە ملوانکە مراورییەکەیەوە، کە زۆر بەخەمەوە بوو لە بیری نەچێت، بەرەو ماڵ بووەوە! بەدەم ئەو خەیاڵ و حیساباتانەوە، یەک-دوو جاران، وێنەی دڵڕفێن و هەرە جوانی ناستاسیا فیلیپوڤنای هاتە بەرچاو، ئاهێکی هەڵکێشا و لە بەر خۆیەوە گوتی: "حەیفێ! حەیف و سەد مخابن! ئەم ژنە لەدەست دەر چووە، شێتی شێتە! بەڵێ، بەڵام ژنی وەکو ناستاسیا فیلیپوڤنا، بۆ میرزادە دەست نادات... خێری پێوە بوو کە مەسەلەکە وا کەوتەوە..."

لەم حاڵ و هەوایەدا بوو، کە دووانی دیکە لە میوانەکانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، قەراریان دابوو پێکەوە کەمێک پیاسە بکەن، بەر لەوەی لێکدی جیا ببنەوە، سووکە گفتوگۆیەکیان کەوتە نێوان.. ئیڤان پتروفیچ پتیتسن ڕووی کردە ئافاناسی ئیڤانوفیچ و گوتی:

– دەزانی ئافاناسی ئیڤانوفیچ، ئەم جۆرە نەریتە لەنێو ژاپۆنییەکاندا هەیە؟

دەڵێن، کەسی سووکایەتیپێکراو، دەچێت بۆ لای ڕەقیبەکەی، واتا بۆ لای ئەو کەسەی سووکایەتییەکەی پێ کردووە و پێی دەڵێت: فلانی تۆ سووکایەتیت پێ کردووم، ناوت زڕاندووم، بۆیە هاتووم لەبەردەم تۆدا ورگی خۆم هەڵدڕم." ئەوسا بە بەرچاوی ڕەقیبەکەیەوە، ڕێک ورگی خۆی هەڵدەدڕێ. بەم کارە هەست بە ئاسوودەییەکی بێئەندازە دەکات و وەکو ئەوەی بە ڕاستی تۆڵەی خۆی سەندبێتەوە. چەند تەبیعەت و خووخدە و نەریتی سەیروسەمەرە لەم دنیایەدا هەیە ئافاناسی ئیڤانوڤیچ!

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ، بەدەم بزەیەکەوە گوتی:

- جا تۆ پێت وایە ئەوەی ڕووی دا، شتێکی لەو بابەتە بوو؟ هم!... بەراوردێکی خۆشە... تەشبیهێکی جوانت هێناوەتەوە! بەڵام برادەری ئازیز، تۆ بە خۆت ئاگاداری، من هیچ درێغیەکم نەکرد، ئەوەی لە توانامدا بوو کردم. بە خۆت دەزانی پیاو ناتوانێ کاری مەحاڵ بکات! هەڵبەتە ئەوەش دەزانی کە ئەم ژنە چەند بەکەشم و نەشم بوو، چەند ئارەزووبزوێن بوو! ئەگەر تۆزێ لەمەپێش، بمتوانیبا لەم شاری سەدومەدا، گرێی دڵی خۆم بکەمەوە، ئەوا لەوەڵامی ئەو هەموو تۆمەتەدا کە دایە پاڵ من، دەمگوت، خەتا لە خودی ئەوە، من هیچم گوناحێکم نییە! من نایڵێم، تۆ بیڵێ، کێ هەیە شیفتەی ئەم شۆخە ژنە نەبێت، کێ هەیە لە ئاستی ئەم شۆخەدا ئەقڵ و هۆشی لەدەست نەدا؟ تۆ بروانە تەنانەت ئەو دێهاتیە بلحە، ڕوگوژین، سەد هەزار ڕۆبڵی بۆ هانی! ڕاستە هەموو ڕووداوەکانی ئەمشەو، کوتوپڕ، ڕۆمانسی و نابەجێ بوون، بەڵام پیاو هەق بڵێ دیمەنی هەمەڕەنگ و زۆر دەگمەن و کەموێنەشی تیا بوو. ئیدی ئەم تەبیعەت و ئەم جوا نییە، ئەو جۆرە ئاشووب و ئاژاوەیەشی لێ دەکەوێتەوە! بەهەرحاڵ من گرتمە خۆ، من پەروەردەم کرد، من فێری خوێنەواریم کرد... هەر هەوڵێکم لەگەڵی دا بە باچوو! وەکو زۆر جاری تریش گوتوومە، ئەم ژنە ئەڵماسێک بوو، سیقاڵ نەکر.

ئافاناسی ئیڤانوڤیچ بەدەم ئەو قسەیەوە ئاهێکی قووڵ قووڵی هەڵکێشا.

پەراوێز:

* - "سوپاس..." لە دەقەکەدا بە فەڕەنسییە.

* - "بۆ یەکاتیرنهوف..." گوندێکە دەکەوێتە دەرەوەی پترسبۆرگ، لەگەڵ کۆشکێکی هاوینەی یەکاترینی دووەمی ئیمپراتۆری ڕووسیادا. خەڵکی بە شەوان بۆ گەشت و گەڕان و پیاسە بۆ ئەوێندەر دەچوون.

* - "شارانی سەدوم و عامورا، کە غەرقی گوناح بوون و ملیان بۆ پێغەمبەرایەتیی لووت پێغەمبەر نەدەدا، لە ئاگری غەزەبی خوادا سووتان. لێرەدا مەبەستی جەنەراڵ، ئەو بێ سەروبەرییە بوو کە باڵی بەسەر مەجلیسەکەدا کێشابوو.

## بەشی دووەم

## فەسڵی یەکەم

دوای دوو ڕۆژ، لەو ڕووداوانەی کە لە میوانداری و ئاهەنگەکەی ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنادا دیتمان و بەشی یەکەمی چیرۆکەکەمان بە باسی ئەو ڕووداوانە کۆتایی هێنا. میرزادە، بە مەبەستی تاقیبکردنی بەشە میراتە چاوەڕواننەکراوەکەی، بەهەشتاو پترسبۆرگی جێ هێشت و بەرەو مۆسکۆ سەفەری کرد. لەو کاتانەدا هەندێک پێیان وا بوو کە لەگێنە سەفەرەکەی میرزادە هۆی دیکەشی هەبن، بەڵام ئێمە هیچ شتێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوە نازانین، بە تەواوی نازانین لە مۆسکۆ و بە شێوەیەکی گشتی لە ماوەی ئەو سەفەرەیدا چیی بەسەر میرزادە هاتووە و چیی بۆ پێشهاتووە. میرزادە شەش دانە مانگی خشتی پێ چوو. تەنانەت ئەوانەش کە لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی سۆراخیان دەکرد، بە درێژایی ئەم ماوەیە، نەیانتوانیبوو جگە لە هەندێ زانیاری کەم، هیچی تری لە بارەوە بزانن. هەڵبەتە، جار بە جار، ئەویش زۆر بەکەمی، هەندێ دەنگوباس و دەنگۆیان بەرگوێ دەکەوتن، بەڵام زۆربەی ئەو دەنگۆیانە سەیروسەمەرە و باوەڕنەکردەنی و زۆر جار هەڤدژ و ناکۆک بوون.

دیارە، خانەوادەی یەپانچین، کە میرزادە فریا نەکەوتبوو ماڵاواییان لێ بکات، لە هەموو کەسێک پتر بە خەمی چارەنووسی میرزادە و عەوداڵی

هەواڵــی بــوون. جەنــەراڵ، دوو-ســێ جــاری دیتبــوو و ســەبارەت بــە مەسەلەیەک، گفتوگۆی جیددیی دەگەڵ کردبوو، بەڵام جەنەراڵ، لەم ڕووەوە هیچــی بــۆ خانەوادەکــەی بــاس نــەکردبوو و نــەگێڕابووەوە. کــە میــرزادە سەفەری کردبوو. نزیکەی یەک مانگی تەواو کەس لـە خانەوادەی یەپانچیندا باسی میرزادەی نەکردبوو. تەنیا خانم یـەپانچین لـە سـەرەتاوە گوتبووی کە " سـەبارەت بـە میـرزادە یـەجگار هەڵـە بـووە." دوای دوو سـێ هـەیڤان، بـێ ئەوەی نـاوی میـرزادە بێنـێ، دووبـارەی کـردەوە کـە: "دیـارترین خەسـڵەتی ژیانی ئەم، ئەوەیە کە سەرناس نییە، لە ناسینی خەڵکیدا هەمیشە بە هەڵـەدا دەچێــت."، ســـەرەنجام دوای دە ڕۆژێــک، لــە کیژەکــانی تــوڕە بووبــوو، گوتبووی: "بەسە، لە ئێستا بەدواوە ئەم هەڵانە دووبارە ناکەمەوە!"

جا لێرەدا و بەم بۆنەیەوە پێویستە ئەوە بڵێین بۆ ماوەیـەکی دوورودرێژ، جــۆرەوەرزی و بێتاقەتیــەک، جــۆرە دڕدۆنگــی و پەشــێوییەکی قــورس، کەشوهەوایەکی ئـاوس بـە شتی پـەنهان و نـاکۆکی ئـامێز بـاڵی بەسـەر مـاڵی یەپانچینـدا کێشـا بـوو. هــەموو ئەنـدامانی خێزانەکـە، پەسـت و خــەمبار و بێتاقـەت و بـێحەواس بـوون. جەنـەراڵ، زۆر مـژول و سـەرقاڵ بـوو، شـەوو ڕۆژ مژولی کار بوو، لە ژیانیا هێندەی ئەم ماوەیە بە کـارەوە، بـە تایبـەتی لە وەزیفەکەی خۆیدا، سەرقاڵ نەبووبوو.

خانەوادەکـەی بەزەحمـەت دەیـانبینی. هەڵبەتـە کیژەکانی یـەپانچین، گرێـی دڵـی خۆیـان بۆ خـەڵکی نـەدەکردەوە. تەنانـەت لـە بـەینی خۆشیاندا، زۆر بـە کـەمی قسـانیان دەکـرد. ئەلهـەقی کچـانی بـە فیـز و دەعیـە بـوون و بگـرە بـە شەرم و حەیاش بوون و تەنانـەت لـە بەینی خۆیشیاندا کەمدوو و شـەرمن بوون، بەڵام نەک بە یەکەم وشـە، بەڵکو بە یەکەم نیگا لێکدی حـاڵی دەبـوون و مەبەستی یـەکتریان دەخوێندەوە. بۆیـە زۆر جار پێویسـتیان بـە گفتوگۆی یەکتر نەدەبوو.

دیارە ئەوەی غەوارەیەک، گەر ڕێی بکەوتبایە ئەو ماڵـە، بیتوانیایـە هەسـتی پێ بکات، ئەوە بوو کە میرزادە، بـەگوێرەی هـەندێ قـەرینە و نیشـانانی کـەم، توانیبووی کاریگەرییەکی تایبەتی بەسـەر ئەو مـاڵەوە بـە جێبێڵـێ، هەرچەندە

تـەنیا یـەک جـار و بـۆ ماوەیـەکی کـەم و بـە شـێوەیەکی ڕەوتـەنی ڕێـی کەوتبـووە ئەو ماڵـە. ڕەنگـە ئـەم کاریگەرییـە زادەی ڕەفتـاری غـەریب و عەجیبی میرزادەو، ئەو ڕیسکانە بووبێ، کە بەسـەری هـاتبوون. بەهـەرحاڵ، ئەم کاریگەرییە زەق و حاشاهەڵنەگربوو.

بەرەبـەرە ئەو دەنگۆیانـەی کـە لـە هەوەڵەوە، لـە شـاردا بـڵاو بـوونەوە، دامرکانەوە و نەمان، ڕاستە هەندێ کەس باسی میرێکی چکۆلـەی ساڤیلکەی نیمچە شێتیان دەکرد – کە کەس نـاوی ڕاستەقینەی وی نـەدەزانی- کە لـە کوتوپڕێکـدا میراتێکـی یـەجگار مـۆڵی پێبـڕاوەو، ئـافرەتێکی فەرەنسـایی، خواستووە کە بە ڕێبواری ڕێی کەوتووەتە ڕووسیا، ئەم ئافرەتـە یەکێکە لـە سەماکارە بەنێوبانگەکانی تیپی (کانکانی فەرەنسی) کە لە (کۆشکی گوڵان)ی پاریسـدا کـار دەکـات. خـەڵکانێکی دی دەیـانگوت ئەو سـەروەت و سـامان و میراتییە زۆر و زەبەندەیە بە جەنـەراڵێک بڕاوە و گوایە بازرگـانێکی گـەنجی ڕووسـی، یـەجگار دارا و دەوڵەمەنـد، ئەو سـەماکارەی کانکـانی فەرەنسـی خواستووە و گوایـە ئـەم گەنجـە، هـەر بۆ فشـە و خۆ نوانـدن، هـەفتا هـەزار ڕۆبڵی ناوە بە گڕی مۆمێکەوە و سووتاندوویەتی، هەفتا هەزاری خشت.

بـەڵام ئـەم دەنگۆیانـە، بـەهۆی هەنـدێ زروفـی تایبـەتییەوە، زوو بـە زوو بڕانەوە و لەبیر چوونەوە. ڕوگوژین و جماعەتەکـەی یـەک هەفتـەی تەواو لـە باخـەکانی یەکاتیرنیهوفـدا مـابوونەوە، بـە درێژایـی ئەو هەفتەیـە سـەریان کردبووە عەیش و نۆش و ڕابواردن، گوایە ناستاسیا فیلیپوڤناش بەشداریی لەوعـەیش و نۆشـەدا کردبـوو. دوای ئەو هەفتەیـە ڕوگـوژین و گروپەکـەی بـەرەو مۆسـکۆ چووبـوون. ئیـدی خـەڵکانێکی کـەم لەوانـەی کـە پـەیگیری و تاقیبی ئەمجۆرە مەسەلە و ڕووداوانە دەکەن، هەندێ دەنگۆیـان بیسـتبووەوە کە گوایە ناستاسیا فیلیپوڤنـا، هەرکە گەیشـتبوونە یـەکاتیرنیهوف، بۆ ڕۆژی دوایی دیار نەمابوو و دوای تاقیب و سۆراخ دەر کەوتبوو کە گوایـە بـەرەو مۆسـکۆ ڕۆیشـتووە. ئیـدی خـەڵکی زانیبوویـان سـەفەرەکەی ڕوگـوژین، پەیوەندیی بە ڕاکردنەکەی، ناستاسیا فیلیپوڤناوە هەبووە.

سەبارەت بـە (گـاڤریلا ئـاردالیونوفیچ)یش کـە بەشـی خـۆی و لـە ژینگـەی





خۆیدا ناسراو بوو، مقۆمقۆ و دەنگۆیەکی زۆر بڵاو بووەوە، بەڵام گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، تووشی وەزع و حاڵێکی وەها بوو، کە زوو بە زوو ئەم دەنگۆیانە بنیان نایەوە و ئەو قسە و قسەڵۆکانەی دەربارەی ئەو کەوتبوونە سەر زاران، کۆتاییان هات: گاڤریلا تووشی نەخۆشییەکی ئەوەندە گران بووبوو کە نەک هەر نەیدەتوانی بێتە ناو خەڵکی، بەڵکو نەیدەتوانی بچێتە سەر کارەکەشی، گانیا پاش مانگێک چاک بووەوە، بەڵام لەبەر هۆیەکی تایبەتی وازی لە کارەکەی هێنا، کۆمپانیاکە، فەرمانبەرێکی دیکەی لە جێی ئەو دانا. وازی لە سکرتێری جەنەراڵ (یەپانچین)یش هێنا. ئیدی جەنەراڵ، ناچار بوو سکرتێرێکی دی بۆ خۆی رابگرێت.

ناحەزانی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، وایان بڵاودەکردەوە، ئەوەندە شەرمەزارە و تەریقی ئەو ڕووداوەیە کە بەسەری هات، ڕووی نایەت بێتە ناو خەڵکی و ڕووی مەجلیسی نییە، بەڵام لە ڕاستیدا نەخۆش بوو و نەخۆشی لە پەلوپۆی خستبوو: زۆر جار واز وازی دەیگرت، خەم دای دەگرت و لە فکران ڕادەچوو، تا بڵێی نائومێد و ڕەشبین بووبوو، زوو هەڵدەچوو.

زستانی ئەو ساڵە ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا شووی بە پتیتسن کرد. هەموو ناسیاوەکانیان، ئەم زەماوەندەیان دەبەستەوە بە بڕیاری وازهێنانی گانیا لە کارەکەی، چونکە گانیا هەنوکە نەک هەر نەیدەتوانی یارمەتیی خانەوادەکەیان بدات، بەڵکو بە خۆی پێویستی بە کۆمەک و یارمەتی بوو، پێویستی بەوە بوو مدارا بکرێت.

جا، لێرەدا پێویستە هەر بۆ زانیاری، ئەوەش بڵێین کە لەوە بەدوا، کەم و زۆر لە ماڵی یەپانچیندا ناوی گاڤریلا ئاردالیونیچ نەدەبرا، وەکو ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان کەسێک بەو ناوەوە لەم دنیایەدا نەبووبێ، چ جای لە ماڵی وان. کەچی وێڕای ئەوەش، هەر هەموویان، واتە هەموو ئەندامانی خێزانەکە، زۆر زوو شتێکی هەستیار و گرنگیان لەمەڕ ئەو زانیی: ئەو شەوەی کە لەماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەو ڕووداوەی لێقەوما بوو، کە گەڕابووەوە بۆ ماڵ، خەوی لێنەکەوتبوو، بەڵکو وەکو ژانگرتوو چاوەنۆڕی

گەڕانەوەی میرزادەی کردبوو. میرزادە کە سەفەری یەکاتیرنیهوفی کردبوو، دوای سەعات پێنجی بە یانی گەڕابووەوە. هەنگێ گانیا خۆی بە ژوورەکەی ئەودا کردبوو، ئەو سەفتە پارەیەی، کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە کاتی بورانەوەکەیدا بۆی دانابوو، کە بە هۆی گڕی ئاگردانەکەوە قەراخەکانی هەڵکوڕوزا بوو، لەسەر مێزەکە و لەبەردەمیا دانا. تکای لە میرزادە کرد کە ئەو دیاریە لە نزیکترین دەرفەتدا بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا بگێڕێتەوە. گانیا، بە نەفەسێکی دژمنانەی تووڕە خۆی بە ژوورەکەی میرزادەدا کردبوو، بەڵام دوای ئەوەی قسەیان دەگەڵ یەکدیدا کردبوو، گانیا دوو سەعاتێک لەلای وی دەمێنێتەوە و بە درێژایی ئەو ماوەیە، لە یەکبینە هەر دەگری و هەنسک هەڵدەدات و داخ هەڵدەکێشێت، بەڵام سەرەنجام بە ئاشتی و دۆستانە لێکدی جیا بووبوونەوە.

پاشان دەر کەوت کە ئەم خەبەرەی گەیشتبووە یەک بە یەکی ئەندامانی خێزانەکەی یەپانچین، زۆر ڕاست و دروست بوو. سەیر ئەوە بوو کە ئەو هەواڵانە چۆن بەو خێراییە بڵاو دەبوونەوە و دەگەیشتنە خەڵکی دی. بۆ نموونە هەر شتێک لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنادا ڕووی دابوو، بۆ سبەی وەکو خۆی، بێکەم و زیاد گەیشتبووە ماڵی یەپانچین. سەبارەت بەو هەواڵانەی کە پەیوەندییان بە (گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)ـەوە هەبوو، وا گوتمان ڕەنگە لە ڕێگەی ڤارڤارا ئاردالیونوڤناوە گەیی بێت بە ماڵی یەپانچین، چونکە ڤارڤارا هاتوچۆی دەکردن و دۆستایەتی لەگەڵ کچەکانیانا خۆش بوو، هەرچەندە دایکیان ئەمەی پێ سەیر بوو. بەڵام، لە لایەکی دیکەوە، هەرچەندە ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، ئەو دۆستایەتییەی – نازانین لەبەر چی؟- لەگەڵ ئەو کچانەدا بە مەسڵەحەت دەزانی، مەحاڵ بوو باسی براکەی خۆی بۆ ئەوان بکات. ئەویش، لە پێستی خۆیدا، هەڵبەتە بە شێوازی تایبەتی خۆی، خۆی بە شت دەزانی و کبریای خۆی هەبوو، ئەگەرچی بە دۆستایەتی ئەوانەش قایل بوو کە تەقریبەن بە دەرکردن براکەیان دەرکردبوو. ڤارڤارا جارانیش ئاشنایەتیی دەگەڵ کیژانی یەپانچیندا هەبوو، بەڵام زۆر بە کەمی و بە ڕێکەوت دەی بینین. ڤارڤارا تا ئێستاش کەمتر





دەهاتە هۆڵەکە، زیاتر لە دەرگای پشتەوە زۆر ڕەوتەونی خۆی بە ژوورا دەکرد. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا حەزی لە چارەی نەدەکرد، پێی قەڵس بوو، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان، نە جاران و نە ئێستا ڕوویەکی خۆشی نەدابویە، هەرچەندە ڕێز و حورمەتی زۆری نینا ئەلکسندروڤنای دایکی دەگرت. لیزاڤیتا بەم دۆستایەتیە قەڵس و ناڕەحەت بوو، ئەم دۆستایەتییە تازەیەی نێوان کیژەکانی و ڤارڤارای بە زادەی مجێزە گۆڕکێی کیژەکانی دەزانی، کە خۆی گوتەنی "هەمیشە بۆ شێوازێکی تازە دەگەڕان تا ئەوی پێقەڵس بکەن.". کەچی ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا دوای شووکردنیش، هەر درێژەی بەم هاتوچۆیە دا.

دوای سەفەرەکەی میرزادە، بە مانگێک شتێک زیاتر، خا یەپانچین نامەیەکی لە پیرە دۆتمیر بیلوکونسکایاوە، پێگەیشت. دۆتمیری پیر پازدە ڕۆژێک لەوە پێش چووبوو بۆ مۆسکۆ بۆ سەردانی کیژە گەورەکەی کە لەوێ بە شوو بوو. ئەو نامەیە لە ڕووی دەروونییەوە کارێکی زۆری لە خا یەپانچین کرد، هەرچەندە، نێوەڕۆکی ئەم نامەیەی نە بۆ کیژەکانی و نە بۆ مێردەکەی نەگێڕابووەوە، بەڵام کەس و کارەکەی نیشانەی، نیگەرانی و پەریشانییەکی زۆریان لە سیمادا بەدی دەکرد، بەڵگەشیان ئەوە بوو، بە شێوەیەکی سەیر، دەربارەی هەندێ بابەتێن نائاسایی قسەی دەگەڵ دەکردن، دیار بوو گەرەکیەتی گرێی دڵی بکاتەوە و ئەوەی لە دڵیدایە هەڵیرێژێ، بەڵام لەبەر هەندێ هۆ زمانی خۆی دەگرێت. ئەو ڕۆژەی نامەکەی پێگەیی، بە جارێ ڕەحمی تلیسابووەوە، دەگەڵ کیژەکانیا، زۆر دلۆڤان و میهرەبان بووبوو. تەنانەت ئاگلایا و ئادیلایدی ماچ کردبوو و دانی بە هەڵە و عەیبەکانی خۆیدا نابوو، بەڵام شتاقیان هۆی ئەم گۆڕانەیان نەدەزانی، نەیاندەزانی هەڵە و عەیبەکانی چین. ئیدی پیرەژن لەپڕێکا گۆڕا بوو، میهرو لێبووردەیی لێ دەباری، تەنانەت دەرهەق بە (ئیڤان فیدوروفیچ)ش، کە یەک مانگ بوو لێی چووبوو بە قینا، میهرەبان بووبوو. هەڵبەتە لیزاڤیتا بۆ سبەینێ دیسان گۆڕا، ئەو نەرم و نیانی ومیهرو دلۆڤانیەی دوێنێ، لە حەوت کێوان ئاوابوو، ئیدی کەوتە بیانوو گرتن و بەر

لە شێو، دەگەڵ هەموویاندا بە شەڕ هات، بەڵام بۆ شەوێ هەوری پەشێوی ڕەوییەوە، خا جەنەراڵ (خانم یەپانچین) بۆ ماوەی هەفتەیەک بوو بە ماستی مەییو، گوڵ لە ڕووی دەباری، کە زۆر لەمێژبوو بەم حاڵەوە نەبینرابوو.

بەڵام خانم یەپانچین، دوای هەفتەیەک نامەیەکی دیکەی لە دۆتمیر بیلوکونسکایاوە پێگەیشت، بڕیاری دا ئەم جارەیان قسە بکات، بۆیە گوتی: "پیرێژن"، (خانم یەپانچین لە پاشملە هەر بە پیرێژن ناوی دۆتمیر بیلوکونسکایای دەبرد) خەبەری ئەسەحی دەربارەی ئەو "گەنجە فەقیرحاڵە... یارۆ... میرزادە". بۆ ناردووە. پیرێژن، بە پرسیار شوێنەکەی، لە مۆسکۆ دۆزیوەتەوە و شتی باشی لەبارەوە بیستووە. میرزادە، سەری لێ داوە و پیرەژن پێی خۆش بووە و میرزادەی چووەتە دڵەوە و وەک دەڵێن خوێنی بۆی جووڵاوە و... بەینیان زۆر خۆشە. "هەر بەوەیا بزانە کە بەینیان زۆر خۆشە، پیرێژن داوای لێ کردووە هەموو ڕۆژێ سەعاتێ دووان سەری بدات، میرزادەش بە بەردەوامی سەری دەدات و پیرێژن تا ئێستا لێی بێزار نەبووە." ئەوجا گوتی "پیرێژن" میرزادەی بە دوو-سێ ماڵباتی ئورستۆکراتیی زۆر بە ناوبانگ ناساندووە." بەوەی باشە کە وەکو تەرکە دنیایان خۆی دوور ناگرێت، ئەوەندەش گەمشەک نییە شەرم بکات."

کاتێ کچەکان گوێیان لەو قسانە بوو، یەکسەر پەیان بەوە برد کە دایکی میهرەبانیان، بەشێکی تەواوی نیوەڕۆکی نامەکەیان لێدەشارێتەوە. ڕەنگە ئەمەیان لە ڤارڤارا ئاردالیونوڤناوە زانیبێ، کە ئاساییە دەیتوانی هەر خەبەرێک کە پتیتسن دەربارەی میرزادە و سەفەری وی بۆ مۆسکۆ دەیزانی، لەلای ئەویش هەبێت. هەڵبەتە پتیتسن، لە هەر کەسێکی دی زیاتر ئاگای لە خەبەر و باسی میرزادە هەبوو، بەڵام لە کاروباری خۆیدا زۆر سڕ قایم بوو، هەرچەندە هەندێ شتی بۆ ڤارڤارا دەگێڕایەوە و لە هەندێ شتی ئاگادار دەکردەوە. ئەمەوای کرد خانم یەپانچین زیاتر لە ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا بچێت بە قینا.

بەهەرحاڵ، هەنوکە دیواری بێدەنگییەکە شکابوو، دەکرا بە ئاشکرا و

ڕاستەوخۆ ناوی میرزادە بهێنێ، جارێکی دیکە کاریگەریی بێئەندازەی میرزادە بەسەر خانەوادەی یەپانچینەوە ئاشکرا بوو. تەنانەت خا جەنەراڵ، باوەڕی نەدەکرد ئەو هەواڵانەی لە مۆسکۆوە دەهاتن بەو ئەندازەیە کار لە کیژەکانی بکات، پێی سەیر بوو! کچەکانیش کە زۆر جار گوێیان لە دایکیان بووە کە گلەیی لە خۆی کردووە و گوتوویەتی: "دیارترین خەسڵەتی ژیانی ئەم ئەوەیە کە سەر ناس نییە، هەمیشە لە ناسینی خەڵکیدا بە هەڵە دەچێت." کەچی وێڕای ئەوەش ڕووی لە شازادە خانمی دەسترۆ، بیلوکونسکای ناوە، کە داڵدەی میرزادە بدات و مدارای بکات، بێگومان دەبێ تکای لێ کردبێ، لێی پاڕابێتەوە کە مدارای میرزادە بکات. کیژەکان سەریان لەم هەڵوێستەی دایکیان سووڕ مابوو، چونکە "پیرێژن" کەسێک نەبوو بەئاسانی بێتە ڕەدایە.

بەڵێ، هەرکە سەهۆڵبەندانەکە توایەوە و دیواری بێدەنگی شکا و ئاراستەی بایەکە گۆڕا، جەنەراڵیش، زاری کرایەوە و کەوتە دەربڕینی ڕاوبۆچوونی خۆی، دیار بوو ئەویش مەسەلەکەی بەلاوە گرینگ بوو، بەڵام باس و خواسەکانی وی تەنیا "لایەنی کاسبانەی" مەسەلەکەیان لە خۆ گرتبوو. دەر کەوت، کە لەپێناوی بەرژەوەندیی میرزادەدا، دوو کەسی مۆسکۆیی، باوەڕپێکراو دەسترۆی زۆر گەورەی ڕاسپاردبوو کە ئاگایان لە میرزادە، بە تایبەتی لە (سالازکین)ی وەکیلی وی بێت. هەرچییەک دەربارەی میراتییەکەیان واقیعیەتی میراتییەکە گوترابوو، هەر هەموو ڕاست دەرچووبوو، بەڵام بڕی میراتیەکە زۆر لەوە کەمتر بوو کە لە سەرەتاوە دەیانگوت. لە لایەکەوە موڵک و ماڵ و سەروەت و سامانەکە لەژێر باری قورسی قەرزدا بوو و لە لایەکی ترەوە کۆمەڵێک حەقدار پەیدا بووبوون و داوای بەشە میراتیان دەکرد، میرزادە بە خۆیشی، وێڕای هەموو ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەک کە دەکرا، ئاقڵانە و وەکو بزنسمانێک ڕەفتاری نەدەکرد. هەڵبەتە جەنەراڵ لە کانگای دڵەوە هیوای بەختەوەریی بۆ دەخواست. ئێستاش کە "دیواری بێدەنگییەکە" هەرەسی هێنابوو، زۆری پێ خۆش بوو، بێپەردە، قسەی ناخی دڵی بکات و بەڕاشکاوی بڵێ کە ئەم گەنجە، هەرچەندە "کەمێک گێلۆکەیە" بەڵام گەنجێکی شایستەیە. وێڕای

ئەوەش میرزادە هەندێ کاری گەوجانەی کردبوو، بۆ نموونە چەند کەسێک بە خۆ و هەندێ بەڵگەنامەی* گومانلێکراو و تەنانەت دەستکاریکراوەوە کە دەشیا هیچ حیسابێکیان لەسەر نەکرێ و فەرامۆش بکرێن، هاتبوون و ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە بازرگانی ڕەحمەتی قەرداریان بووە، هەندێ کە پەیان بە ماهیەتی میرزادە بردبوو، تەبیعەتیان خوێندبووەوە، بە بێ هیچ سەنەدبو بەڵگەیەک هاتبوون و داوای بەشە میراتیان دەکرد. باوەڕبدەکەن چی ڕووی دا؟ میرزادە، وێڕای ئامۆژگاری و ڕێنوێنیی دۆستەکانی، کە بۆیان سەلماند بوو ئەوانە هیچ هەقێکی یاساییان بەسەریەوە نییە، تەقریبەن هەموویانی ڕازی کردبوو، گوایە دەر کەوتبوو هەندێک لەوانە بە ڕاستی زەرەروزیانیان لێ کەوتبوو.

خانم یەپانچینش، دووپاتی کردەوە کە دۆتمیر بیلوکونسکایا شتێکی بەو نێوەڕۆکە بۆ نووسیوە، دیارە ئەوە "گێلێتییە، گێلێتیی تەواو، پیاوی گێلیش دەرمانی نییە". خانم یەپانچین ئەو ڕستەیەی زۆر بە جیددی گوت، بەڵام دەموچاوی بەئاشکرا پێوەی دیار بوو کە لە ڕەفتاری بە ناو "گێلە" نەک نارازی نییە، بەڵکو پێشی خۆشە. بە کورتییەکەی جەنەراڵ دیقەتی دا کە هاوسەرەکەی لە لایەکەوە بە جۆرێ بە خەمی میرزادەوەیە وەک ئەوەی کوڕی خۆی بێت، لە لایەکی دیکەشەوە دەرهەق بە ئاگلایای کیژیشی زۆر میهرەبان بووبوو. کە ئەوەی بینی، ئەویش هەڵوێستێکی پڕ بە پێستی ئەو حاڵەتەی وەر گرت.

بەڵام ئەم ڕەوشە باشە و ئەم بارە دەروونییە لەبارەش زۆری نەخایاند. هەمووی دوو هەفتەی پێنەچوو کە گۆڕانێکی لەناکاو و کوتوپڕ ڕووی دا. خانم یەپانچین، دیسان چارەیدا بە یەکا، لێ جەنەراڵ، دوای ئەوەی دوو سێ جاران شانەکانی هەڵتەکاند، دیسان خۆی لەهەنبەر "دیواری بێدەنگی"دا دیتەوە. مەسەلەکە ئەمە بوو کە جەنابی جەنەراڵ، بەر لە دوو هەفتە هەواڵێکی نهێنیی زۆر کورتی، بەڵام ئەسەحی زانیبوو، گوایە ناستاسیا فیلیپوڤنا کە بۆ مۆسکۆ هەڵاتبوو، ڕوگوژین لەوێ دۆزیبوویەوە، جاری دووەمیش هەڵاتبوو و دیسان لەلایەن ڕوگوژینەوە دۆزرابووەوە، ئیدی

بەڵێنی بە ڕوگوژین دابوو کە شووی پێ بکات، بەڵام ئەوەتا دوای ئەوە بە کەمتر لە دوو هەفتە، جەنەراڵ هەواڵی زانیوە کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بۆ جاری سێیەم لە کڵێسادا، پێش ئەوەی لەگەڵ ڕوگوژیندا بگەنە بەردەم قەشە تا مارەیان بکات، هەڵاتووە و کەس نازانێ لە چ شارۆچکەیەکا خۆی شاردۆتەوە. ئیدی میرزادە (میشکین)یش لە هەمان ماوەدا دیار نەمابوو، ڕۆیشتبوو و هەموو کارەکانی بەسەر وەکیلەکەیدا، سالازکین، جێ هێشتووە. ئیدی دیار نەبوو ئاخۆ لەگەڵیا ڕۆیی بوو یان چووبوو سۆراخ و تاقیبی بکات، بەڵام جەنەراڵ گەیشتبووە ئەو ئەنجامگیرییەی کە دیارنەمانی ئەو دووە لە هەمان کاتدا، دەبێ پەیوەندییەکی بە یەکەوە هەبێ. لیزاڤیتا پروکوفیڤنای هاوسەری جەنەراڵیش لەلای خۆیەوە کۆمەڵێک هەواڵ و دەنگوباسی ناخۆشی بیستبوو. بەهەرحاڵ، دوو مانگێک پاش ڕۆیشتنی میرزادە لە مۆسکۆ، ئیدی خەڵکی لە شاری پترسبۆرگدا ئەوەندە باسیان نەدەکرد و دەنگۆکان بە تەواوەتی نیشتنەوە، بەڵام لە ماڵی یەپانچیندا "دیواری بێدەنگی" نەشکا و کەس باسی نەدەکرد، بەڵام ڤارڤارا، هێشتا هەر هاتوچۆی کچانی جەنەراڵی دەکرد.

ئەگەر، خۆ لە هەموو ئەو دەنگۆ و هەواڵانەش ببوێرین، ئەوا دەبێ باسی ئەوە بکەین کە لە دەمەدەمی بەهارا زنجیرە گۆڕان و هەڵکشان و داکشانێک بەسەر خانەوادەکەی یەپانچیندا هاتبوو کە نەدەپەرژانە سەر ئەوەی بیر لە میرزادە بکەنەوە، بە تایبەتی کە خۆی هیچ هەواڵێکی بۆ نەدەناردن و پێدەچوو حەزنەکات بە شوێن و مەکانی بزانن.

خانەوادەی یەپانچین، لە زستاندا تەگبیریان کرد کە بە خێزانی هاوینەکەیان لە هەندەران بەسەر بەرن، مەبەست لە بەخێزانی، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و کیژەکانیەتی، چونکە جەنەراڵ، ڕێی بە خۆی نەدەدا، کاتی خۆی بە "سەفەر و سیاحەتی" بێهودە. بەسەر بەرێت. ئەم بڕیارە بە پێداگری و مکوڕبوونی کیژەکان درا کە دڵنیا بوون دایک و باوکیان، بۆیە ڕێگەی سەفەری هەندەرانیان نەدەدان، چونکە ژێراوژێر بەتەمای بە شوودانیان بوون و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە مێردی گەنج و شایستەیان

بۆ بدۆزنەوە.

لەوە دەچوو دایک و باوکەکە گەیی بنە ئەو قەناعەتەی کە بەختی کیژەکانیان لە کرانەوە بێ، لە هەندەرانیش بن هەر دەکرێتەوە، بۆیە سەفەرێکی هاوینە نەک هیچ زیانێکی نابێ، بەڵکو لەوەیە دەرفەتی لەباریشیان بۆ بڕەخسێنێ. جا لێرەدا پێویستە باسی ئەوەش بکەین کە ئەو زەماوەندەی قەرار بوو لەنێوان ئافاناسی ئیڤانوفیچ توتسکی و کیژە گەورەکەی یەپانچیندا ساز بکرێت، خۆ بە خۆ هەڵوەشایەوە، چونکە بەفەرمی لەلایەن توتسکییەوە خوازگاری نەکرا. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە، بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی و، بێ ئەوەی مشت و مڕ و گەنگەشەیەکی زۆری لێ بکەوێتەوە، یان پەشێوی و ناکۆکیی خێزانی لێ بکەوێتەوە، کۆتایی هات. مەسەلەکە، لە پاش سەفەرەکەی میرزادە، لە هەر دوو سەرەوە بەردێکی نرایە سەر و بێدەنگیی لێ کرا. بێگومان دەبێ ئەم مەسەلەیە یەکێک بووبێ لە هۆکارەکانی ئەو جەوە ناخۆشەی کە باڵی بەسەر ماڵی یەپانچیندا کێشابوو، ئەگەرچی خانم یەپانچین لە هەوەڵەوە گوتبووی کە زۆر مەمنون و شوکرانە بژێری خوایە کە ئەو مەسەلەیە سەری نەگرتووە و ئامادەیە نەک بە دەستێ بەڵکو بە "هەر دوو دەستان، ئاماژەی خاچ بکێشێت"، بەڵام جەنەراڵ، هەرچەندە گلەیی هاوسەرەکەی قەبووڵ بوو، دانی بە کەمتەرخەمی، خۆیدا نابوو، تا ماوەیەکی زۆر بێحەواس و بێتاقەت بوو، بە ڕاستی خەفەتی بۆ ئافاناسی ئیڤانوفیچ دەخوارد: "ئەو هەموو سەروەت و سامانە، پیاوێک بەو هەموو زرینگی و چالاکییە!". جەنەراڵ، دوای ماوەیەکی کەم زانیی، کە ئافاناسی ئیڤانوفیچ کەوتووەتە داوی جوانیی ئافرەتێکی فەرەنسایی سەر بە چینی ئەشرافەوە کە بە سەفەر هاتووە بۆ ڕووسیا، ئەم خانمە، مارکیزێکی سەڵتەنەت خوازە و گوایە دەگەڵ توتسکیدا هەموو شتێکیان بڕانوەتەوە و قەرارە مارکیز، ئافاناسی ئیڤانوفیچ دەگەڵ خۆیدا بۆ پاریس ببات و پاش ئەوە بۆ دەڤەرێکی بروتانیای ببات، جەنەراڵ گوتی: " ژنی فەرەنسی؟ تازە ڕۆیشت، توتسکی فەوتا!".

بەم جۆرە ماڵباتی یەپانچین خۆیان بۆ سەفەرەکەی هاوین ئامادە دەکرد،

بەڵام لەم کاتەدا ڕووداوێکی ناگەهانی دیکەیان هاتە پێش و هەموو شتەکان گۆڕان و جارێکی دی سەفەرەکەیان دوا کەوت. جەنەراڵ و هاوسەرەکەی ئەمەیان زۆر پێ خۆش بوو.

میرزادەیەک بە نێوی (س)* لە مۆسکۆوە بۆ پترسبۆرگ، هاتبوو، ئەمە پیاوێکی بەنێوبانگ و تا حەز بکەی بە باشی باس دەکرا. یەکێک بوو لەو پیاوە زۆر ڕۆشنبیر و مودێرن و چالاک و، شەریف و خاکی و بێفیزانەی کە لە ناخی دڵەوە حەز بە خزمەتکردن دەکەن، لەپەستاو بێ بڕانەوە کار دەکەن و لە دەرفەتێک دەگەڕێن، بەهرە و توانای خۆ بخەنە خزمەتی خەڵکەوە. هەرگیز هەوڵی نەدەدا خۆی بخاتە پێش خەڵکەوە و خۆی لە خەڵکی بە زیاتر بزانێ، گوێی بە بانگەشە و کێشماکێش و ململانێی بێسوودی حیزبان نەدەدا، لە خۆنوێنی و خۆهەڵکێشان و دەرکەوتن بێزار بوو، بەڵام زۆر بەوردی ئاگای لە دیاردە و ڕووداوە تازەکان هەبوو، واقیعییانە لێکی دەدانەوە و شیی دەکردنەوە و لە بنجوبناوانی دەکردن. ئەم پیاوە لە هەوەڵەوە فەرمانبەری دەوڵەت بووبوو، پاشان لە حکومەت و ئیدارەی محەلیدا (زمتوف)* کاری کردبوو. ئەندام و پەیامنێری چەندین کۆمەڵەی زانستی ڕووسی بوو و لەو بوارەدا دەورێکی گرینگی هەبوو. دەگەڵ، ئەندازیارێکی هاوڕێیدا، بە شەریکی نەخشەی یەکێک لە گرینگترین هێڵی ئاسنی ئەو ڕۆژگارەی دانا بوو، کە قەرار بوو لەو سەردەمەدا جێبەجێ بکرێت. تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو، بە ئورستۆکرات دەژمێردرا، ئەمە جگە لەوەی جەنەراڵ گوتەنی خاوەنی " سەروەت و سامانێکی زۆرو پاک و پوختە بوو". جەنەراڵ بە هۆی هەندێ کار و سەودا و مامەڵەی گرینگەوە، لە ماڵی بەرپرسەکەی خۆیدا، واتە لە ماڵی جەنابی کۆنتدا، ئاشنایەتیی دەگەڵ میرزادە (س)دا پەیدا کردبوو.

میرزادە، بە تەبیعەت حەزی دەکرد تێکەڵی "ئەهلی کاروکاسبی" ڕووس ببێت و قەت خۆی لە بزنسمانانی ڕووس دوور نەدەگرت. بەڕێکەوت ناسیاوی دەگەڵ خانەوادەی جەنەراڵدا پەیدا کرد. ئادیلاید ئیڤانوڤنای کیژی ناوەنجی جەنەراڵ، بە جارێ دڵی برد. ئیدی میرزادە (س)، دەگەڵ هەوەڵی

بەهاردا خوازبێنیی کرد. ئادیلاید و دایکی کوڕەیان بە دڵ بوو و بەگەنیان کردبوو. هەڵبەتە بەو بۆنەیەوە، دیسان سەفەرەکەیان دوا کەوت، چونکە زەماوەندەکەیان خستە بەهار.

هەڵبەتە خانم یەپانچین و دوو کیژەکەی دیکەی، دەیانتوانی لە ناوەڕاست یان کۆتایی هاویندا بچنە سەفەر و بای باڵێکی خۆ بدەن، بەڵام دیسان پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا: لە کۆتایی بەهارا (زەماوەندەکەی ئادیلاید ئەنجام نەدرا و بۆ ناوەندی هاوین دواخرا). میرزادە (س) یەکێک لە دۆستە نزیکەکانی خۆی، کە خزمایەتییەکی دووری دەگەڵیا هەبوو، لەگەڵ خۆدا هێنا بۆ ماڵی یەپانچین و بە یەکتری ناساندن. گەنجێک بوو بە نێوی یوگین پاڤلوفیچ*، تەمەنی بیست و هەشت ساڵێک دەبوو، یەکێک بوو لە ئەفسەرانی* گاردی تزار، لەڕادەبەدەر قۆز بوو، لە بنەماڵەیەکی ناودار بوو. جگە لەوەی کە کەسێکی زیرەک، خۆشخوو، ڕووخۆش، کراوە، مودێرن و زۆر ڕۆشنبیر بوو، یەجگار دەوڵەمەند و داراش بوو، بەڵام جەنەراڵ کە پیاوێکی هەمیشە بەگومان و دووربین بوو، بە تایبەتی سەبارەت بە دەوڵەمەندی و سەروەت و سامان، کەوتە تاقیب و سۆراخ، گەیشتە ئەو ئەنجامەی "پێدەچێ بە ڕاستی دەوڵەمەند بێ، بەڵام دەبێ تاقیبی زیاتر بکات و بەتەواوەتی شتەکە لە بنجوبناوان بکات و دڵنیا ببێت".

بیلوکونسکایای پیرەژن، لە مۆسکۆوە جوابی ناردبوو کە ئاگایان لەم کوڕە بێت و زۆری ستاییش کردبوو، ئیدی ئەم ئەفسەرە گەنجە کە ئاییندەیەکی پرشنگداری لەپێش بوو، هێندەی دی لە ماڵی یەپانچیندا شیرین بوو. ئەم گەنجە تەنیا یەک عەیبی هەبوو، کە مێباز بوو و پەیوەندیی ئاشقێنی دەگەڵ ژناندا هەبوو و وەک دەڵێن فاتیحی دڵی، دلبەران بوو.

کە چاوی بە ئاگلایا کەوت، بە دڵێ نا، بە سەد دڵ حەیرانی بوو، نەیدەتوانی لە ماڵی یەپانچین دوور بکەوێتەوە. هەرچەندە هێشتا هیچ قسەیەک چ ڕاستەوخۆ و چ ناڕاستەوخۆ لەو بارەیەوە نەکرابوو، داک و بابە کە وایان بە مەسڵەحەت زانیی کە جارێ بیری سەفەری هەندەران لە مێشکی خۆ دەر بکەن، بەڵام ئاگلایا، لەوە دەچوو ڕاوبۆچوونێکی دیکەی

هەبێت.

هەر هەموو ئەم پێشهاتانە، بەر لە گەڕانەوەی شا قارەمانی چیرۆکەکەمان بۆ سەر شانۆ، ڕوویان دا. ئەم جارەیان لەوە دەچوو خەڵکی پترسبۆرگ، میرزادە میشکینی بەستەزمانیان هەر لەبیریش نەمابێ، بە جۆرێ لە بیریان چووبووەوە، ئەگەر لەپڕێکا، لەناو ئەو کەسانەدا کە دەیانناسی، دەر کەوتبایەوە، ئەوەندە غەریب دەهاتە بەرچاو وەکو بڵێی لە ئاسمانەوە هاتبێ و خەڵکی سەر زەوی نەبێت.

جا لێرەدا، پێویستە بەر لەوەی لەم پێشەکییە ببینەوە، یەک ڕووداوی دیکەش بگێڕینەوە.

کولیا ئیڤولگین، دوای ڕۆیشتنەکەی میرزادە، وەکو جاری جاران دەژیا. دەچوو بۆ قوتابخانە، هاتوچۆی (هیپولیت)ی برادەری دەکرد، خزمەتی بابی دەکرد، یارمەتی ڤاریای دەداو ئیشی بازاڕی بۆ دەکرد. هەموو کرێچییەکانیان ڕۆیی بوون: فردیش چینکۆ، دوای ڕووداوەکانی شەوی ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە سێ ڕۆژان، ئیدی گۆڕی گوم بوو و کەس نەیزانی کێوە چوو. دەیانگوت، هەڵبەتە ئەویش هەر گوتن بوو، سەری کردووەتە بادەنۆشی. میرزادەش ڕۆیشتبوو بۆ مۆسکۆ، ئیدی یەک کرێچییان نەما. کە ڤاریا شووی کرد، هەنگێ نینا ئەلکسندروڤنا و گانیاش چوون بۆ ئەوێ و لە ماڵی پتیتسن، لە گەڕەکی ئیسماعیلوفسکی* ئاکنجی بوون. سەبارەت بە جەنەراڵ ئیڤولگین، تەقریبەن هەر لەو ڕۆژانەدا، پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراوی بۆ پێشهات، بە هۆی قەرزارییەوە زیندانی کرابوو. دۆستەکەی، واتە بێوەژنی یارۆی کاپتن، بە سەنەد و بەڵگە، داوای نزیکەی دوو هەزار ڕۆبڵی لێ دەکرد، کۆمەڵێک بەڵگە و سەنەد بوون کە جەنەراڵ، لە ماوەی جیاجیادا بۆی ئیمزا کردبوو. ئەم شتە بەلای جەنەراڵەوە، سەیر و باوەڕنەکردەنی بوو، لەم ڕووەوە جەنەراڵی داماوی بەستەزمان "لە دڵپاکیی خۆی ئەمەی بەسەر هاتبوو، باوەڕی تەواوی بە مرۆڤ و بە دڵپاکی مرۆڤانی هەبوو." ئیدی عادەتی وا بوو، زۆر بە دڵنیاییەوە هەر سەندو قەواڵەیەکی ئیمزا دەکرد، بە بێ ئەوەی بیر لەوە

بکاتەوە، کە ڕەنگە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو قەوالانە، دژی خۆی بەکار بێت. بۆیە ئیمزاکردنی ئەو قەواڵە و کاغەزانەی بەلاوە گرینگ نەبوو، بەڵام ئەم ڕووداوە بۆی سەلماند مەسەلەکە ئەوەندەش سادە نییە. ئیدی جەنەراڵ ئیڤولگین، لە کاتێکا لە شوێنە تازەکەیدا، لە زیندانی تاراسوفدا، بەدیار قاپێ مەیەوە دانیشتبوو، چیرۆکە دڵخوازەکانی خۆی، یانی ئابلۆقەی قارس و ئەو سەربازە مردووەی کە زندوو بووبووەوە، بۆ دۆست و هاوڕێ تازەکانی دەگێڕایەوە و دەیگوت: "وێڕای ئەمەش باوەڕ بە هەموو کەسێک بکەن، متمانەی بێ چەند و چوونتان بە خەڵکی هەبێت!".

ئەلهەقی، لە زینداندا خۆش دەژیا. تەنانەت پتیتسن و ڤاریاش دەیانگوت، شوێنی ڕاستەقینەی خۆی پەیدا کرد. ئەوێ شوێنی ئەوە. گانیاش هەمان بۆچوونی ئەوانی هەبوو. تەنیا نینا ئەلکسندروڤنای بەستەزمان بەزەیی پێیدا دەهاتەوە و بەدزییەوە بۆی دەگریا. (ماڵ و منداڵەکەی ئەمەیان پێ سەیر بوو)، هەرچەندە هەمیشە نەخۆش و لەشبەبار بوو، بە پێی توانا، خۆی بکێش دەکرد و بەلەقەلەق لە گەڕەکی ئیسماعیلوفسکی دەر دەچوو، دەچوو بۆ دیدەنی مێردەکەی.

بەڵام لە دوای ئەم ڕووداوەوە، یان کولیا گوتەنی "ڕووداوەکەی جەنەراڵ" و پاش شووکردنی ڤاریا، ئیدی ئەم کوڕێژگەیە، یانی کولیا، بە تەواوەتی بەرەڵڵا بوو، تەنانەت زۆر شەوانی لە دەرەوە ڕۆژ دەکردەوە، بۆ خەوتنیش بۆ ماڵ نەدەگەڕایەوە. دەیانگوت زۆر پەیوەندیی تازەی پەیدا کردووە، هەروەها لە زیندانی قەرزدارانیشدا ناوبانگی دەر کردبوو، نینا ئەلکسندروڤنای دایکی نەیدەتوانی بەبێ ئەو بچێ بۆ زیندان، ئیدی کەسوکارەکەی لێیان نەدەپێچایەوە. تەنانەت ڤاریاش کە جاران زۆر دەگەڵیا سەختگیر بوو و دەرفەتی هیچ بەرەڵڵاییەکی پێ نەدەدا، ئێستا وای لێهاتبوو، خۆی لێ بە ساحێب نەدەکرد و لێی نە دەپرسی لەکوێیە و لەکوێ نییە، بەڵام گانیا، هەندێ جار، وێڕای خەفەتباری و ڕەشبینیی خۆی، زۆر دۆستانە و بە میهرەوە دەیدواند و ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد (کەسوکارەکەی ئەمەیان زۆر پێ سەیر بوو)، چونکە پێشتر قەت شتی وای لێ نەبینرابوو. ئەم گۆڕانە،

زۆر تـازە بـوو، چونکـە گانیـای تەمـەن بیسـت و حەوت سـاڵ، کـەمترین بایـەخی بـە برایـە پازدە سـاڵانەکەی خۆی نـەدەدا و بەوپـەڕی نـا میهرەبـانی مامەڵـەی لـە تەکدا دەکـرد و تەنانـەت ئەنـدامانی خێزانەکەشـی گـاڵ دەدا کـە دەگەڵیا توند و سەختگیر بن، هەمیشە هەڕەشەی گوێ ڕاکێشانی لێ دەکرد و کولیـاش بـەم هەڕەشـەیە دەهـری دەبـوو و "کاسـەی سـەبری سـەر ڕێـژ دەبوو"، بەڵام ئێستا وەک دەڵێن ئاسمان کۆڵەکەی دەویست، دەتـوانین بڵێین بوونی کۆلیا، هەندێ جار بۆ گانیـای بـرای لـە زەروری زەرورتـر بـوو. کۆلیا کـە زانیـی گانیـای بـرای پارەکـەی ڕەت کـردووەتەوە و بـۆ خاوەنەکـەی ناردووەتەوە، زۆری پێ سـەیر بـوو، ئەوەنـدە ئـەم کـارەی پـێ خـۆش بـوو، ئامـادە بـوو لـە زۆربـەی کەموکوڕییـەکانی ببـورێ و فیـداکاری گەورەی لەپێناودا بکات.

دوای سـەفەری میـرزادە بـە سـێ هـەیڤان، خانەوانـدەی ئیڤـولگین بیسـتیان کـە کولیـا لـەپڕ ناسـیاوی دەگـەڵ ماڵبـاتی یەپانچینـدا پەیـدا کـردووە و کیژەکانیـان زۆری ڕێـز دەگـرن و ڕووی دەدەنـێ، ڤاریـا، یەکسـەر بـەم مەسەلەیەی زانیی. هەڵبەتە کۆلیا لە ڕێگەی ڤاریاوە ئاشنایەتیی دەگەڵ ماڵی یەپانچیندا پەیدا نـەکردبوو، بـەڵکو خـۆی، خـۆی پێناسـاند بـوون. بەرەبـەرە خانمـانی یـەپانچین مەحەبـەتیان چـووە سـەری، سـەرەتا دایکیـان حـەزی لـە چارەی نەدەکرد، مۆڕەی لێ دەکرد، بـەڵام پاشـان کە زانیـی کـوڕێکی "سـادە و پـاک و ڕاسـتگۆ و دوورە لـە هـەر ڕووبینییـەک" ئیـدی ئەویـش مەحەبـەتی چووە سەری و خۆشی ویست. کۆلیا، بە ڕاستی ڕووبین نـەبوو، ڕووپـامایی بۆ کەس نەدەکرد. دەیزانی چۆن قەدری خۆی دەگرێت و وەکو هاوتـای وان ڕەفتاری دەکرد. هەرچەند جار بە جـار ڕۆمـان و گۆڤـارانی بـۆ خـا جەنـەراڵ دەخوێندەوە، بـەڵام ئەوەی بۆ هیچ مەبەسـتێک نـەدەکرد، بـەڵکو بـە تەبیعـەت کەسـێکی خۆشـخزمەت بـوو، حـەزی دەکـرد خزمـەتی خـەڵکی بکـات. یـەک دووجار زۆر خراپ دەگەڵ لیزاڤیتا پروکوفیڤنـادا بـە شـەڕ هـات و لێیـان بـوو بە مشتومڕ،و پێی گوت ژنێکی دکتاتۆرە و جارێکی دی پێ نانێتـە ماڵەکـەیان. شـەڕی یەکـەمیان لەسـەر "مەسـەلەی ژنـان" و هیـی دووەمیـان لەسـەر ئەمـە

بـوو کـە: کـام وەرز باشـترین وەرزی ڕاوی بولبولانـە. ئەگـەرچی لەوەیـە بـاوەڕ نەکـەن و شـتەکەتان بـەلاوە سـەیر بێ، بـەڵام خـانم یـەپانچین دوای شەڕی دووەم، بۆ سبەی نۆکەرێکی بە نامەیەکەوە بۆ لای کۆلیا ناردبوو و داوای لێکردبـوو یەکسـەر بچـێ بـۆ مـاڵی ئەوان. (کۆلیـا)ش بـێ ئەوەی هـیچ منجڕیـەک بکات، یەکسـەر چووبـوو بۆ لای. ئاگلایـا، تـەنیا کەسـی خێزانەکە بوو کە خۆشی بە چارەی کۆلیادا- کەس نەیدەزانی بـۆ؟- نـەدەهات و خـۆی لە ئاستیا بە گەورە دەزانی. بۆیـە کۆلیـا لێبڕا بـوو لـە ناخـافڵا جەزرەبەیـەکی لێبدات. ئەم دەرفەتەی لە هەفتەی جەژنی پاکدا بۆ هـەڵکەوت، کۆلیا کـە بینی ئاگلایا بە تەنیایە و کەس دیـار نییـە، نامەیـەکی دایە و تـەنیا ئەوەنـدەی گـوت کە داوایان لێ کردووە، ئەم نامەیە ڕاستەوخۆو بـە دەسـتی خـۆی بگەیەنێتـە ئەو. ئاگلایـا، خێسـەیەکی لێکـرد، بـەڵام کۆلیـا بـێ ئەوەی چـاوەڕوانی هـیچ قسەیەک بکات، ڕۆیشت. ئاگلایا نامەکەی کردەوە و ئەمەی خوێندەوە:

" تۆ جارێک شەرەف و شانازی ئەوەت پێ بەخشیم کە متمانـە و بـاوەڕی خۆت دامێ. لەگینە هەنوکە منت هەر لەبیر نەمابێ، بـە تەواوەتـی فەرامۆشـت کردبم. نـازانم چۆن زاتـم نایـە بـەرخۆم و ئـەم نامەیـەم بۆ نووسـیت؟ بـەڵام هەست دەکەم ئارەزوویەکی یاخی، هەوسـار و پچڕیو، زۆرم لـێ دەکـات کـە خۆم وەبیر تۆ، شەخسی تۆ بێنمەوە. زۆر جار پێویستم بە هەر سێکتان، تۆ و هـەر دوو خوشـکەکەت بـووە، بـەڵام تـەنیا تـۆ بـە چـاوی دڵ دەبیـنم، زۆر زۆر پێویستم بە تۆیە. هیچ داوایەکم لە تـۆ نییـە و هـیچ شتێکیشـم دەربـارەی خۆم نییە کە بۆ تۆی باس بکەم، ئارەزووی ئەم کارەشم نییە، ئەمـەش هـانی نەداوم بۆ نووسـینی ئـەم نامەیـە. هـەموو ئـاواتێکم ئەوەیـە کـە تـۆ بـەختەوەر بیت، ئایا بەختەوەریت؟ ئەمە هەموو ئەو شتە بوو کەویستم پێتی بڵێم.
پسمامی تۆ: میرزادە ل. میشکین "

ئاگلایا، کە ئەم نامە کورت و بێ سەروبەرەی خوێندەوە، یەکسـەر سـوور هەڵگەڕا و لە فکران ڕاچوو. هەڵبەتە زۆر زەحمەتـە بتـوانین پـەیگیری ڕەوتـی بیرەکـانی ئەو بکـەین و بـزانین چیـی بـە مێشـکیدا دەهـات و دەچـوو، بـەڵام

یەکێک لەو پرسیارانەی کە لە خۆی کرد ئەمە بوو: باشە ئەم نامەیە پیشانی یەکێک بدەم؟ هەڵبەتە دوو دڵ بوو لە کردنی ئەو کارە، کەمێک شەرمی دەکرد. بۆیە لێوەکانی هەڵقورتاند و بە تەوس خەنێکەوە نامەکەی هەڵدایە ناو چەکمەجەی مێزەکەیەوە.

بۆ سبەینێ نامەکەی دەر هێنا و خستیە دوو توێی کتێبێکی قەبەی بەرگئەستوورەوە. هەمیشە ئەو کاغەز و نامانەی، کە بیویستبا لە کاتی پێویستدا بەئاسانی بیاندۆزێتەوە، دەیخستنە دوو توێی کتێبێکی دیارەوە. دوای یەک هەفتە ئەوجا بە بیریا هات کە سەیری سەرناوی کتێبەکە بکات:

" دۆنکیشۆت دولامانچا"* کە چاوی بە سەر ناوی کتێبەکە کەوت، لە قاقای پێکەنینی دا، بەڵام نازانین بۆچی ئەم سەرناوە بووە باعیسی ئەو پێکەنینە. ناشزانین ئاخۆ ئەم نامەیەی پیشانی یەکێک لە خوشکەکانی دا یان نا؟

بەڵام کە بۆ جاری دووەم نامەکەی خوێندەوە، پرسیارێکی بروسکەئاسای بە مێشکدا هات: باشە ماقوولە میرزادە ئەم کوریژگە لاسارە لەخۆباییەی کردبێت بە قاسید و تەتەری خۆی، چما قاتی پیاوە، پیاو بڕانە؟ بە کەشوفشێکی زۆر و لە ڕووی ناچارییەوە کەوتە داپشکنینی کۆلیا، کۆلیا هەرچەندە کوڕیژگەیەکی دڵناسک و تۆرینۆک بوو، هیچ گوێی بەو فیز و ئیفادەیە نەدا کە نیشتبووە سەر سیمای ئاگلایا. زۆر بە کورتی و بە جۆرەوشکی و زبرییەکەوە بۆ ئاگلایای باس کرد کە پێش ئەوەی میرزادە پترسبۆرگ جێ بێڵێ، ئەم ئەدرەسی خۆی داوەتێ و ئامادەیی خۆی دەر بڕیوە کە ئەگەر کارێکی بوو، ئەم لە خزمەتیدایە، بەڵام ئەمە یەکەم کارە کە میرزادە داوای لێ کردووە و ئەمە یەکەم نامەی میرزادەیە کە پێی گەیشتووە. ئەوسا بۆ سەلماندنی دروستیی قسەکەی خۆی، نامەیەکی نیشان دا کە میرزادە بۆی ناردبوو. ئاگلایا، بێ هیچ لەڕوودامانێک نامەکەی خوێندەوە کە بەم دەقە بوو:

" کۆلیا گیان، تکایە ئەم نامە داخراوە بگەیەنە دەستی ئاگلایا ئیڤانوڤنا، هیوای ساغ و سەلامەتیت بۆ دەخوازم. هەر ساغ بیت.



گەمژە

لەگەڵ ئەوپەڕی سۆز و خۆشەویستیی

دۆستی خۆت:

میرزادە ل. میشکین *

ئاگلایـــا، نامەکـــەی دایەوە دەســـتی کۆلیـــا بەوپـــەڕی کەشـــوفش و خۆپەسندییەوە گوتی:

" سـەیرە، بە ڕاستی ئەو هـەموو متمانەیـە بـە منداڵێکی وەکو تۆ، مایـەی پێکەنینە.

بـە ڕق و نـەفرەتەوە ڕووی لـە کۆلیا وەر گێڕا و ڕۆیشـت. ئەو قسـانە بـۆ کوڕیژگەیـەکی وەکـو کۆلیـا کـە بـە بۆنـەی ئەو دیـدارەوە، ملپێچـە تـازە کەسـکەکەی لـە گانیـا بـە ئەمانـەت وەر گرتبـوو، زۆر قـورس بـوون، لـە تەحەمولی ئەودا نەبوون، بۆیە هەستی بە سووکایەتییەکی زۆر قورس کرد.

پەراوێز:

* - "بۆ نموونە چەند کەسێک بە خۆو هەندێ بەڵگەنامـەی گومـانلێکراو و تەنانەت دەسـتکاری کراوەوە کە دەشـیا هـیچ حیسـابێکیان لەسـەر نـەکرێ و فـــەرامۆش بکـــرێن..." ژنەکـــەی دۆستویفســـکی دەیگێـــڕێتەوە و دەڵێـــت دۆستویفسکی بە خـۆی پارەی دا بـە کۆمـەڵێک، گوایـە خـاوەن قـەرز، کـە بـە بەڵگەنامـەی سـاختە و تەنانـەت بـەبێ بەڵگەنامـەش، دوای مردنـی برایەکـەی هاتبوون و داوای قەرزیان دەکرد.

* - میـرزادە بـە نێـوی (س): ئەمـە تاقـە کاراکتـەرە کـە نووسـەر نـاوە تەواوەکەی ناڵێت و تەنیا پیتی یەکەمی ناوەکەی (س) بەکار دێنێ.

* - زمتـوف: ئەو یاسـا ڕیفورمیسـتییانەی لـە ١/ک٢/ ١٨٦٤دا دەر چـوو، جـۆرە سیسـتمێکی حـوکمی محـەلی لـە هەرێمەکانـدا داهێنـا. بـەگوێرەی ئەو

سیستەمە ئاغا و موڵکدار و جووتیاران نوێنەریان هەڵدەبژێرا و ئەو نوێنەرانە (زمتوف)یان پێک دێنا، کە بودجەی تایبەتی خۆی هەبوو، بایەخی بە خوێندن و خزمەتگوزاریی گشتی و کاروباری دیکەی هەرێمەکە دەدا.

* - یوگین پافلوفیچ: ئەم پیاوە پاشان بە ناوی یوگین بافلوفیچ ڕادومسکی ناوی دێت.

* - ئەفسەرانی گاردی تزار: ئەمە نازناوێکی فەخرییە، بەو ئەفسەرانە دەدرێ کە تزار بە ناسین دەیانناسێت.

* - گەڕەکی ئیسماعیلوفسکی: گەڕەکێکە لە ناوەڕاستی پترسبۆرگدا بە ناوی سەربازگەکانی سەر بە لیوای پاسدارانی ئیسماعیلوفسکییەوە ناو نراوە.

* -" دۆنکیشۆت دو لامانچا.": دۆستویفسکی ئەم کتێبەی نووسەری مەزنی ئەسپانی، سیرڤانتسی یەجگار بەلاوە گەورە و گرینگ بوو. لە "ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا " لە ئازاری ١٨٧٦دا نووسیویەتی و دەڵێت: "لە دنیادا هیچ کتێبێک لەم کتێبە قووڵترو سەنگینتر نییە. تا ئێستا گەورەترین چیرۆکە کە هزری بەشەری هەڵی هێنابێت، توندترین ساتیری تاڵە کە مرۆڤێک توانیویە گوزارشتی لێ بکات. تەنانەت هەندێک پێیان وایە لێکچوونێک لەنێوان کەسێتیی دۆنکیشۆتی سوارچاکی خەمین و کەسێتیی میرزادە میشکیندا هەیە.

## فەسڵی دووەم

هەنوکە لە سەرەتای مانگی حوزەیراندایین، کەشوهەوای پترسبۆرگ، دوو ڕۆژە زۆر خۆشە. ماڵی یەپانچین لە پافلوفسک* ی، نزیکی پترسبۆرگ ڤێللایەکی زۆر بە شکۆ و جەلالیان هەبوو، کە هەموو پێویستییەکی ماڵی تیا بوو. لەسەر بڕیاری کوتوپڕی خانم یەپانچین، بە دوو ڕۆژان ماڵیان بۆ ئەوێندەر گواستەوە.

دوای یەک دوو ڕۆژ، میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین بە قیتاری بەیانی لە مۆسکۆوە گەیشتە جێ. هیچ کەسێک نە چووبووە پێشوازی، بەڵام کە لە فارگۆنەکە دابەزی، وای بە خەیاڵدا هات کە دوو چاوی ئاگرین لەنێو ئەو خەڵکەدا کە هاتبوونە پێشوازیی دۆست و کەسوکاری خۆ، زۆر غەریب لێیان دەڕوانی. ویستی بگاتە سەرچاوەی ئەو نیگایە، بەڵام هیچی بۆ نەدۆزرایەوە. لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆ چوو کە ئەمە خەیاڵە و هیچی دی. هەڵبەتە ئەم وەهمە زۆری نارەحەت کرد. ئەمە جگە لەوەی میرزادە،بە خۆی خەمین و لێوبەبار بوو، پێدەچوو مێشکی بە شتێکەوە مژول بێت.

سواری گالیسکەیەک بوو و چوو بۆ ئوتێلێکی نزیکی شەقامی لیتانیایا، کە ئوتێلێکی نمرە دوو بوو، دوو ژووری نیمچە تاریک و کەم بەرگ و باری بە کرێ گرت. بەپەلە خۆی شت، جلەکانی گۆڕی و بەلەز وەکو یەکێک ژوانێکی هەبێ و نەیەوێ لە دەستی بچێت، لە ئوتێلەکە وەدەر کەوت.

ئەگەر یەکێک لەو کەسانەی، کە بەر لە شەش مانگ میرزادەیان دیتبوو، هەنوکە دیتبای یەکسەر هەستی دەکرد ڕواڵەتی زۆر گۆڕاوە، لەو میرزادەیە ناچێت کە یەکەم جار گەیشتبووە پترسبۆرگ، بەڵام ئەمە تەنیا ڕواڵەت بوو، تەنیا جلەکانی گۆڕا بوون. پاڵتۆکەی و جلەکانی دەستدرووی باشترین خەیاتی مۆسکۆ بوو. تاقە عەیبی پاڵتۆکەی ئەوە بوو، کە لەڕادەبەدەر تازە مۆد بوو (ئەمە هەمیشە عادەتی خەیاتانی شارەزا، بەڵام کەم زەوق و سەلیقەیە)، بە تایبەتی بۆ کەسێک کە گوێی بە ڕواڵەت نەدەدا. خۆ ئەگەر کەسێکی قۆشمە و سوعبەتچی دیتبای و کەمێک سەرنجی میرزادەی دابا، یەکسەر بابەتی پێکەنین و سوعبەتی خۆی دەدۆزییەوە. چ قەیدییە، چی زۆرە لە دنیادا بابەتی شۆخی و پێکەنین زۆرە! .

میرزادە، سواری گالیسکەیەک بوو و داوای لە گالیسکەچییەکە کرد بۆ گەڕەکی پسکی* (الرمال) بەرێ. لەوێ لە یەکێک لە کوچەکانی ڕودجستفنسکی دا، ئەو شوێنەی دۆزییەوە کە بۆی دەگەڕا: ماڵێکی چکۆلەی دارین بوو، ماڵێکی دڵگیر و پاکوخاوێن بوو، زۆری بە دڵ بوو. باخچەیەکی پڕ گوڵ و گوڵزاری بەدەورەوە بوو، پەنجەرەکانی کە دەیانڕوانییە سەر جادەکە کرابوونەوە، لەو پەنجەرانەوە دەنگی پیاوێک دەهاتە گوێ، زیاتر لە هاوار دەچوو، پێدەچوو کتێبێک بخوێنێتەوە یان وتار بدات. ناو بە ناو قاقای پێکەنینی کۆمەڵێک ئەو دەنگەی دەبڕی. میرزادە خۆی بە حەوشەدا کرد. بە قالدرمەکانا سەر کەوت، لە دەرگای دا، دەرگای لێ کرایەوە، لە ئاغای لیبدیفی پرسی.

ژنێکی ئاشچی کە هەر دوو قۆڵی تا ئانیشکان هەڵکردبوو، بە دەست ئاماژەی بۆ هۆڵی پێشوازی کرد و گوتی:

– لەوێیە!

ئەم هۆڵە، بە کاغەزێکی شینی تۆخ ڕووپۆش کرابوو، یەجگار پاکوخاوێن بوو، زۆر پۆشتە و پڕ کەل و پەل و بە تفاق بوو، کە بریتی بوو لە: مێزێکی خڕ لە ناوەندی هۆڵەکە، قەنەفەیەک، سەعاتێکی برونزی لەنێو سەندوقۆکەیەکی شووشەدا، ئاوێنەیەکی باڵانمای درێژکۆلە، ئاوێزەیەکی

چکۆلەیەکی بە پلپلەی کریستاڵ، کە بە زنجیرێکی برۆنزی بەمیچەکەوە هەڵواسرا بوو. لیبدیف، لە ناوەندی هۆڵەکەیا، پشت لە دەرگاکەوەستابوو، لەبەر گەرمای هاوین، کراسێکی نیوقۆڵی لەبەر کردبوو، بەدەم قسەکردنێکی گەرم و گوڕەوە بە سینگی خۆیدا دەکێشا. گوێگرەکانی بریتی بوون لە: کوڕێژگەیەکی پازدە ساڵانی زیتەڵەی سەروسیما وریای پڕ هۆشوگۆش و کتێبێکی بە دەستەوە بوو، ئافرەتێکی گەنجی نزیکەی بیست ساڵان کە جلکی تازیەباری لەبەر بوو و منداڵێکی چکۆڵەی بە هەمێزەوە بوو، کیژێکی سیازدە ساڵان کە ئەویش جلکی تازیەباری لەبەر بوو، پڕ بە زار پێدەکەنی، کەسێکی دیکەی سەیر کە لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا بوو: ئەمە گەنجێکی نزیکەی بیست ساڵان، گەنم ڕەنگێکی زۆر قۆز بوو، قژی پڕو درێژ، چاوی درشت و ڕەش، تەنکە ڕیشێکی هەبوو. هەر ئەو بوو کە لێکدا لێکدا قسەکەی بە لیبدیف دەبڕی و بە پرسیاری عەنتیکە عەنتیکە، گوێگرەکانی دێنایە پێکەنین. چێشتکەرەکە گوتی:

- لوکیان تیموفیچ! لوکیان تیموفیچ! دەگەڵ تۆمە! تەمەشای ئێرە بکە!... ئاە... دە کەیفی خۆتە! ...

چێشتکەرەکە، لە توڕەییدا سوور هەڵگەڕا، بەدەم قۆڵ بادانەوە ڕۆیشت.

ئەنجام لیبدیف ئاوڕی دایەوە، کە چاوی بە میرزادە کەوت، بۆ چەند ساتێک هایم و حەیران وەکو بزمار لە جێی خۆی چەقی. ئەوسا، بەدەم بزەیەکی ڕیا ئامێزەوە بەلەز بەرەو پیری چوو، بەڵام دیسان لە ئاستانەی دەرگاکەدا، سەرسام و حەپەساو وەستا، لەبن لێوانەوە گوتی:

- جەنا... جەنابی میرزادەی پایەبەرز! * .

لەناکاودا، وەکو ئەوەی هێشتا نەیتوانیبێ خۆی کۆنترۆڵ بکات، گەڕایەوە و بە بێ هیچ هۆیەک بەرە و ئافرەتە ڕەشپۆشە منداڵ لە باوەشەکە هێرشی برد، ئەم هێرشە ئەوەندە کوتوپڕو چاوەڕوان نەکرا بوو، کە ئافرەتەکە پاشە و پاش کشایەوە، بەڵام لیبدیف زوو وازی لەو هێناو، بەرە و کچۆڵە سیازدە ساڵەکە هێرشی برد کە هێشتا هەر پێدەکەنی. کچۆڵەکە کە خۆی لە بەر هاتوهاواری لیبدیف نەگرت، یەکسەرو بە بازێک خۆی گەیاندە

مووبەقەکە. لیبدیف پێیەکی بە عاردیدا کوتا تا بیترسێنێ، بەڵام کە نیگای لە نیگای حەپەساوی میرزادە هەڵەنگوت، بە دەمەڵاکێ گوتی:

- بۆ ئەوەی تەمێیان بکەم! هـ هـ ها!

میرزادە، گوتی:

- تۆ هەڵەیت، پێویست بەمە ناکات...

بەڵام لیبدیف، دەرفەتی نەدا قسەکەی تەواوبکات، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- یەک دەقیقە، بە چاو تروکانێک دەگەڕێمەوە...

لیبدیف، بەهەشتاو لە هۆڵەکە وەدەر کەوت.

میرزادە، بەسەرسامی کەوتە تەمەشای کچەکە و کوڕیژگەکە و ئەو یارۆیەی لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابوو. هەموویان پێدەکەنین، ئەویش گوێ بە گوێی وان کەوتە پێکەنین.

کوڕیژگەکە گوتی:

- چوو پاڵتۆکەی لەبەر بکات.

میرزادە گوتی:

- ئەمە چ حاڵێکە، زۆرم پێ ناخۆشە! من وام تەسەور دەکرد کە... بەڵام تۆ پێم بڵێ: ئایا ئەو...

دەنگێک لە لای قەنەفەکەوە هەڵی دایە:

- مەستە؟ دەتەوێ بپرسیت ئایا مەستە؟ نەخێر، سەرخۆش نییە! هەمووی هەمووی سێ، چوار، تۆ بڵێ پێنج پێکی هەڵداوە... یانی ئاگای لە خۆیەتی!.

میرزادە، ویستی وەڵامی ئەو دەنگە بداتەوە کە لە لای قەنەفەکەوە هات، بەڵام ئافرەتە گەنجەکە، کە سیمای جوانی، ئەوپەڕی ڕاستگۆیی و ڕاشکاویی لێ دەباری، هەڵی دایە و گوتی:

- قەت بەیانیان زۆر ناخواتەوە. ئەگەر دەتەوێ باسی کارێکی دەگەڵ بکەی، یان کارێکت پێی هەیە، هەر ئێستا باسی بکە، ئێستا لە بارترین کاتە، چونکە کە شەوان بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە مەستی مەستە. شەوان هەر خەریکی





گریە و زارییە، بەدەم گریانەوە، بە دەنگی بەرز، کتێبی پیرۆزمان بۆ دەخوێنێتەوە، چونکە دایکمان پێنج هەفتەیەک لەمە پێش کۆچی دوایی کرد.

ئەو کوڕە گەنجەی لەسەر قەنەفەکە پاڵ کەوتبوو گوتی:

– هەڵات، چونکە وەڵامی تۆی پێ نەبوو. من گریۆ دەکەم دەیەوێ فریوت بدات، هەنوکە بیر لەوە دەکاتەوە، چۆن باشترین فێڵ بدۆزێتەوە و لە خشتەت بەرێت.

لیبدیف، پاڵتۆکەی لەبەر کردبوو و بەدەم چاوتروکانەوە گەڕایەوە و گوتی:

– پێنج هەفتە لەمە پێش، تەنیا پێنج هەفتە....

هەنگێ، دەستسڕەکەی لە بەرکی دەر هێنا و بەدەم سڕینی فرمێسکەکانیەوە گوتی:

– ئەم هەتیوانە! ئەم هەموو هەتیوە داماوانە!

کیژەکە گوتی:

– ئەمە چییە بابۆ؟ بۆچی ئەم پاڵتۆ شڕە کون کونەت لەبەر کردووە؟ پاڵتۆیەکی نفت و نوێت هەیە، لەپشت دەرگاکەوە هەڵواسراوە. مەگەر نەتبینی؟

لیبدیف بۆ ئەوەی بیترسێنیت تا توانی پێیەکی کوتا بە عاردیدا و گوتی:

– چەڵتە چەڵت کچە تیوە! ئەمە تۆی؟

کیژەکە، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

– دەتەوێ بمترسێنی؟ فایدەی نییە، من تانیا* نیم و کۆڵ نادەم. گوێ بگرە. لیوبوتشکای چکۆلە خەبەر دەکەیتەوە و دیسان نارەحەت دەبێت. ئاخر ئەم نەڕە نەڕەت لە چییە؟

لیبدیف، لەناکاودا، بە ترسێکی سەیرەوە گوتی:

– دەمت داخەو زارت لێک بنێ!

ئەوجا بەلەز بەرە و منداڵەکە، کە بە باوەشی ئافرەتەکەوە نووستبوو، چوو، دوو-سێ جار بەپەرۆشەوە، ئاماژەی خاچی بەسەریا کێشاو گوتی:

– خودایا ئاگات لێبێ! خودایا بیپارێزە! خودایا ڕاوەستاوی بکە!

ئەوجا ڕووو لە میرزادە، لەسەری ڕۆیشت:

– ئەم منداڵە لیوبوفە، کچی منە. لە ژنە شەرعیەکەمە، لە هیلینای ژنمە، کە بەسەر ئەم منداڵەوە چوو. ئا ئەوەش، ئەو کچۆڵەیەش کە لە لەقلەق دەچێت و، جلکی تازیەباری لەبەرە، ڤیرای کچمە... بەڵام ئەمە، ئەم یارۆیە...

کوڕە گەنجەکە گوتی:

– ئەوە بۆ لاڵ بوویت؟ قسەکەت تەواو بکە! لە من مەترسە!

لیبدیف، بە جۆرە هەڵچوونێکەوە گوتی:

– جەناب، پایە بەرز، تۆ لە ڕۆژنامانەدا، هەواڵی قەتڵ و عامەکەی خانەوادەی ژیمارینت بەرچاو کەوتووە؟

میرزادە، بە جۆرە سەرسامیەکەوەوەڵامی دایەوە:

– بەڵێ.

– ئێ ئەمە، بکوژەکەی خانەوادەی ژیمارینە*! هەمان ئەو کەسەیە، کە تاوانی ناوبراوی کردووە!

میرزادە گوتی:

– مەبەستت چییە؟

لیبدیف، بەرسڤی دایەوە:

– جا با پێت بڵێم چۆن: من بە هێماو کینایە قسان دەکەم. ئەمە بکوژی ئایندەی خانەوادەیەکی "ژیمارین"ی دیکەیە، ئەگەر خانەوادەیەکی وا بێتە ئاراوە. خەریکە خۆی بۆ ئەو تاوانە ئامادە دەکات...

هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد، میرزادە، وای وێنا دەکرد کە لیبدیف، بە ئانقەست، بە تانی ئەم لیبۆکبازیەدا دەچێت، تا خۆی لە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدزێتەوە، کە تەسەوری دەکرد میرزادە لێی بکات و ئەویش نازانێ چ وەڵامێکی بداتەوە. بۆیە دەیەوێ بەو جۆرە خۆی بدزێتەوە.

لیبدیف، وەکو کەسێک کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دابێت، هاواری کرد: ئەم گەنجە یاغییە، پیلانگێڕە! ڕەوایە ئەم ئەژدیهایە، ئەم داوێن پیسە، ئەم مێبازە، ئەم ئەهریمەنە نەفرەتیە، بە خوشکەزای خۆم، بە کوڕی (ئایینسیا)ی خوشکم، بە تاقانەکەی ئایینسیای بزانم؟

- دەمت لێکنێ، سەرخۆشی بەدمەست! میرزادە باوەڕدەکەی داویە لەسەری کە ببێت بە پارێزەرو کاری پارێزەری بکات، دەیەوێ فێری گەنگەشە و موناقەشە ببێت، مەشقی دەماوەری و زمان پاراوی دەکات. تەنانەت کە قسە دەگەڵ منداڵەکانی خۆشیدا دەکات، بە زمانی خوتبەو وتاربێژی دەیاندوێنێ! پێنج ڕۆژ لەمەبەر لە نووسینگەی قازی سولح* دا ئامادە بوو و کەوتە بەرەڤانی و داکۆکی. بڵێ داکۆکی لەکێ؟ پیرەژنێکی بەستەزمان، تکای لێکردبوو، ببێ بە پارێزەری و بەرگری لێ بکات، پیاوێکی سووتخۆری بێشەرەف، پێنج سەد ڕۆبڵی ئەم پیرەژنەی خواردبوو، یانی هەموو دارو نەداری پیرەژنی خوارد بوو. پێت وایە بەرگری لە پیرەژنەکە کردبوو؟ نا... نەخێر.. بەرگری لە ستووتخۆرەکە کردبوو، کە کابرایەکی جولەکە بوو بە نێوی زایلدر، ئەم سووتخۆرە بەڵێنی پەنجا ڕۆبڵی دابویە...
لیبدیف، وەک بڵێی لیبدیفە هاوارکەرەکەی تۆزێ لەوەپێش نەبێت، بەهێمنی، قسەکەی خۆشکەکەزاکەی ڕاست کردەوە:
- پەنجا ڕۆبڵ ئەگەر دۆزەکەم بردەوە و ئەگەر دۆڕاندم تەنیا پێنج ڕۆبڵ!

- هەڵبەتە دۆڕاندی! ڕەوشی دادگاکان گۆڕاوە، وەکو جاران نەماوە. گاڵتەیان پێ کردبوو، پێیان ڕابواردبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش زۆر بە خۆی نازی بوو. جا گوێ بگرە بزانە لە مرافەعەکەدا چیی گوتبوو: "بەڕێزان قازیانی دادپەروەر! تەسەوربکەن، ئەم پیرەمێردە کە منی بە وەکیل گرتووە، دەیەوێ ئابڕوومەندانە بژی، کەچی داماوە بەرەو ئەوە دەچێت دوا پارووی نانی لەدەست بدات. ئەو حیکمەت و قسە نەستەقە وەبیر خۆ بێننەوە کە یاسادانەر گوتوویەتی: " واحکموا بین الناس بالرحمه "* باوەڕ دەکەی هەموو بەیانییەک ئەم مرافەعەیەمان، وەکو خۆی، چۆن لەوێ ئەنجامی داوە، بە گوێدا دەداتەوە؟ ئەمڕۆکە، تا پێش هاتنی تۆ، پێنج جاری بە گوێماندا داوەتەوە. بەو ڕادەیە خۆشی بەو مرافەعەیەی خۆیدا چووە. جا ئێستا خۆی بۆ مرافەعەیەکی دیکەی لەو بابەتە ئامادە دەکات. لێم بە درۆ نەبێ تۆ میرزادە میشکینی؟ کۆلیا زۆر باسی تۆی بۆ کردووم، دەڵێ لە

ژیانیا کەسی لە تۆ ئاقڵترو زیرەکتری نەدیتووە.

خاڵی، دەم و دەست قسەکەی بۆ سەلماند:

- بەڵێ، بە ڕاستی وایە، لە دنیادا کەس لەو ئاقڵتر نییە!

- ئەمە درۆ دەکات. کۆلیا بە ڕاستی، بەدڵ خۆشی دەوێ، بەلام ئەم بۆیە هەڵت دەکێشێت و مەراییت دەکات، چونکە تەماحی پێت هەیە. من بەش بە حاڵی خۆم بە نیازی ڕووپامایی نیم، باوەڕ بکە شتی وام لە خەیاڵدا نییە. پێدەچێ تۆ هەست و توانای داوەریت هەبێ، بۆیە حەز دەکەم تۆ ناوبژیمان بکەیت، داوەریمان لەنێواندا بکەیت.

هەنگێ هەستاو بەرە و لای خاڵی چوو و پرسی:

- ها... چ دەڵێی میرزادە داوەری نێوانمان بکات؟ و لەسەری ڕۆیشت: میرزادە زۆر خۆشحاڵم کە ڕێت کەوتە ئێرە!

لیبدیف، بە شێوەیەکی بنجبڕ گوتی: "قاییلم"، بەلام بە بێزاری ڕوا نییە ئەوانەی کە دیسان لەدەوری خڕ بووبوونەوە.

میرزادە، بە ڕووگرژی گوتی:

- مەسەلەکەتان چییە؟

میرزادە، سەری دەیشاو دەم بەدەم زیاتر بۆی دەر دەکەوت کە لیبدیف، هەڵی دەخەڵەتێنێ و دەیەوێ خۆی لێ بدزێتەوە و کات بەسەر بەرێت.

خوشکەزاکەی گوتی:

- با من پێت بڵێم مەسەلەکە چیە و چۆنە. من خوشکەزایم. هەرچەندە پیاوێکی درۆزنە، بەلام لەم خاڵەدا ڕاست دەکات و من خوشکەزایم. من خوێندنم تەواو نەکردووە، بەلام بە نیازم تەواوی بکەم، تەواویشی دەکەم، چونکە خۆم دەناسم و متمانەم بە خۆم هەیە. حاڵی حازر دەرهەق بە ڕۆژ بەتەمای کارێکم لە هێڵی ئاسن، مانگی بە بیست و پێنج ڕۆبڵ، ئیدی ژیان دەیەوێ. هەڵبەتە من دان بەوەدا دەنەم کە دوو-سێ جاران یارمەتیی داوم. بیست ڕۆبڵم پێبوو، لە قوماردا دۆڕاندم. بەڵێ میرزادە، حاڵی عەرزم هەی؟ بەڵێ ئەوەندە دەنی و بودەڵە بووم، بە قومار پارەکەم دۆڕاند!

لیبدیف، هاواری کرد و گوتی:

- بە ناکەسبەچەیەکت دۆڕاندووە کە نەدەبوایە هەر یاریی دەگەڵ بکەی، نەدەبوایە قرۆشێکت دابایە.

کوڕە گەنجەکە لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت و گوتی:

- ڕاستە ناکەس بەچەیە، نەدەبوایە یاری دەگەڵ بکەم، بەڵام نەمدەتوانی پارەکەی نەدەمێ. ڕاستە بەرەڵڵایەکی خۆێڕییە، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی لە تۆی داوە، بەڵکو لەبەر زۆر هۆی دیکە. میرزادە، ئەم کابرایە، ئەفسەرێکە لە سوپا دەر کراوە، مولازمێکی خانەنشینە، یەکێک بووە لە شەقاوەکانی ڕوگوژین و ڕاهێنەری بۆکسێنە. لەوەتای ڕوگوژین دەری کردوون، هەموو بەرەڵڵا بوون، لە هەموو شت خراتر ئەوەیە کە دەمزانی هەتیوچەیە، بێ شەرەفە، کەسێکی کم و دەنییە، بەرەڵڵایەکی نامەردە، تورە هاتێکە بەکەڵکی هیچ نایەت، کەچی سەرباری ئەوەش هەر قومارم دەگەڵ کرد "یاریی بالکی*"مان کرد، لە دڵی خۆدا گوتم: ئەگەر دۆڕام، دەچم بۆ لای خاڵۆ لوکیان و تکای لێ دەکەم یارمەتیم بدات، هەرچەندە ئەمە کارێکی دزێوە، ئەوپەڕی کمییە، ئەوپەڕی سووکییە، بەڵام دەست بە ڕوومەوە نانێ.

لیبدیف دووبارەی کردەوە:

- بەڵێ ئەوپەڕی سووکییە، ئەوپەڕی بێشەرەفییە!

خوشکەزا، بەرسڤی دایەوە:

- پەلە مەکە، مەیکە بە قاڵە قاڵ! زۆری پێ خۆشە! میرزادە من هاتم بۆ لای خاڵم، ئیعترافم بە کارە دزێوەکەی خۆم کرد، نە درۆم لەگەڵی کرد و نەهیچ پاکانەیەکم بۆ هەڵەکەی خۆم کرد. بە پێچەوانەوە، لەڕادەبەدەر خۆم سەرزەنشت کرد، هەزار نەفرەتم لە خۆ کرد و بە توندترین شێوە خۆم سەرکۆنە کرد. لە هەموو ئەوانەی لێرەن بپرسە، بزانەوایە یان نا؟ من کە بەتەمای ئەو کارەم کە بۆم باس کردی، خۆ دەبێ دەستێ جلی ئەوتۆم لەبەربێ کە ڕووی مەجلیسی هەبێت، چونکە جلەکانم زۆر شڕوشەپڕێون، ناتوانم بەم جلە شڕانەوە بۆ ئەوێندەر بڕۆم. تۆ تەمەشایەکی ئەم چەکمانەی پێم بکە! بەم سەروسیما و وەزع و حاڵەوە ناتوانم بچمە سەر ئیشە تازەکەم و ئەگەر نەشچم، بێگومان یەکێکی دیکەم لە شوێن دادەنەن.

هـەنگێ بێکـار و کاسـبی دەمێـنمەوە و خـوا دەزانـی کـەی کـارێکی دیکـە دەدۆزمەوە! من تـەنیا پـازدە ڕۆبڵـم لێی دەوێ و سوێندی بۆ دەخۆم کە قەت جارێکی دی داوای پارەی لێنەکەم و وەعد بێ لـە زەرفی سێ مانگدا، دوا قرۆشی بدەمەوە، شەرتم، شەرتی پیاو بێ. من دەتوانم بە نانی ڕووت و کفاس* بژیم، دەتوانم بە مانگان بە نان و کفاس بژیم، هەرچەندە ئەمە کارێکی قورسە، بەڵام خۆم دەناسم و لە عۆیـەی ئەو کارە دێم. لە ماوەی سێ مانگاندا هـەفتا و پێنج ڕۆبڵ وەر دەگرم. هـەموو قـەرزێکی کۆنی، بـەم قـەرزە تازەیەشـەوە کـە داوای دەکـەم، دەکاتـە سـی و پێـنج ڕۆبـڵ. یـانی ئەوەندەم پول دێتـە دەسـت کە بە نیوەی، قەرزەکەی خۆم پاک بکەمەوە. چەندیش سوودی دەخاتـە سـەر با بیخـات، چش! چما نامناسـێت؟ میرزادە لێی بپرسە: ئایا ئەو پارەیەی کە داومیەتێ بۆم گێڕاوەتەوە یـان نـا؟ ڕەنگە لەبـەر ئەوە لـێم تـوڕەبێ کـە ئەو پارەیـەم بەو مولازمـە دۆڕاندووە. مـن لەو هۆیـە زیـاتر هـیچ هۆیـەکی دی شـک نابـەم. ئەمـە هـیچ پەیوەندییـەکی بەوەوە نییە، بەڵام ئیدی عادەتی وایە، کاری خێرو چاکەی لەدەست نایەت!

لیبدیف هاواری کرد:

- نـاڕوات، یەخـەم بـەر نـادات، ئەوەتـا بـەخۆت دەبینـی لێـرە پـاڵی لـێ داوەتەوە، نایەوێ لە جێی خۆی ببزوێ!

- پێم گوتیت: ناڕۆم تا ئەو پولـەم نـەدەیتێ. میرزادە بـە چـی پێدەکـەنی؟ لەوە دەچێ بە خەتابارم بزانی؟

میرزادە، بەجۆرە پەستیەکەوە گوتی:

- من پێناکەنم، بەڵام بە بۆچوونی من کەمێک خەتاباریت.

- بە ئاشکرا بڵێ خەتابارم، لە ڕوودامـانی نـاوێ، ئیدی وشـەی (کـەمێک)ی بۆ چییە؟

- ئەگەر وات پێباشـە، دەڵێم زۆر خەتاباری، زۆریش هەڵەیت.

- ئەگـەر وام پێباشـە! سـەیرە! تـۆ پێت وایـە مـن نـازانم ئـەم ڕەفتـارەم بێئەقڵانەیە؟ من دەزانم ماڵ، ماڵی خۆیەتی، بۆی هەیـە بـە کـەیفی دڵـی خـۆی تەسـەڕوفی پێوە بکات، بەم پێیە من گەڕی پێ دەکـەم، دەمەوێ دای بدۆشـم،

بەلام میرزادە، تۆ نازانی ژیان یانی چی؟ ئەم جۆرە خەلکانە ئەگەر دەرسیان نەدەی، نابێ چاوەڕوانی هیچیان لێ بکرێت. بۆیە دەبێ دەرسیان بدەی، تەمێ خواردوویان بکەیت. من ویژدانم پاکە، ئاسوودەیە: باوەڕم پێبکە، لە ناخی دڵەوە دەیڵێم کە هیچ زیانێکی لێنادەم، هیچ ئاسیوێکی پێناگەیەنم، قەرزەکەی بە سووتەکەیەوە دەدەمەوە. لەوەی پتر چی گەرەکە؟ باشە ئەگەر یارمەتیی هیچ کەسێک نەدات، بە کەڵکی چی دێت؟ دەزانی خۆی چی دەکات؟ لە خۆی بپرسە، ڕەفتاری دەگەڵ خەڵکیدا چۆنە، بە چ شێوازێک خەڵکی دەخەڵەتێنێ. بە چ فێڵ و دەهۆیەک پارەی ئەم خانووەی پەیدا کردووە؟ من دڵنیام کە تۆشی خەڵەتاندووە، ئامادەم گرە و بکەم کە خەڵەتاندووتی، گرە و لەسەر ئەم سەرەم بکەم. ئێستاش لە بیری ئەوەدایە چۆن دووبارە فریوت بدات، ئیدی بۆ پێدەکەنی؟ باوەڕ بە قسەکەی من ناکەیت؟

میرزادە گوتی:

- باوەڕ ناکەم ئەمە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە مەسەلەکەی تۆوە هەبێت.

کوڕەی گەنج، بێ ئەوەی گوێ لە قسەکەی میرزادە بگرێ هەڵی دایە وگوتی:

- من سێ دانە ڕۆژە لێرە پاڵکەوتووم، لەم ماوەیەدا زۆر شتم بینی، من دەزانم چ باسە.

بەدەم ئەو قسانەوە، لەسەری ڕۆیشت:

- دەزانی لەم کچۆڵەیەی خۆی، لەم فریشتەیە، لەم خاڵۆزا هەتیوەی من، کە کیژی خۆیەتی بەگومانە؟ هەموو شەوێک ژوورەکەی دەگەڕێت، نەبا ئەڤینداری هەبێ و لە ژوورەکەی خۆیدا شاردبێتیەوە. تەنانەت بە دزییەوە و گورگ ئاسا سەر دەکێشێت و تەمەشای بن ئەم قەنەفەیە دەکات کە منی لەسەر پاڵ کەوتووم، ئێ بەڵکو شتێک ببینێ. دڵپیسی و گومان، هۆشوگۆشیان لەلا نەهێشتووە. لە هەر سووچ و قوڕنەیەک دزێک دەبینێ. شەوان هەر سا ناساتێ لە خەو ڕادەپەڕێ، هەڵدەستێ، دەڕوات سەیری دەرگا و پەنجەرەکان دەکات تا بزانێ بە مکوومی داخراون یان نا، تەنانەت

ناو موغەیریەکەش دەگەڕێ. هەموو شەوێک شەش-حەوت جار ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە. لە دادگادا، داکۆکی لە بەرەڵلا و کەڵەکبازان دەکات. لێرەش، لە ماڵەوە، شەوی سێ کەڕەت بۆ نوێژ و دووعا و نزایان هەڵدەستێ. ئا لێرەدا، لەم هۆڵەدا بە چۆکا دێت و هەر جارەی نیو دانە سەعات سەر دەباتە سوجدە. پێت وایە ئەم نوێژ و نزا مەستانەیەی بۆ خودایە؟ نا، هەر هەمووی نزایە بۆ ڕوحی کونتیسس دوباری* . بەم گوێیانەی خۆم گوێم لێی بووە. کۆلیاش گوێی لێ بووە. بە کورتییەکەی: شێت بووە و بە تەواوەتی ئاوەزی لەدەست داوە.

لیبدیف کە لە حەژمەتاندا سوور بووبووەوە، خۆ بە خۆ هاواری کرد:

- میرزادە گوێت لێیە، دەبینی چۆن گاڵتەم پێ دەکات، چۆن کردوومی بە گەپجاڕی خۆی. ڕەنگە من بابایەکی مەیخۆر بم، دزبم، مێبازو داوێن پیس بم، لە هەموو ڕوویەکەوە کەسێکی بەدخوا و خراپ بم، بەڵام بەلای کەمەوە دەبێ ئەوە بزانێ کاتێ ئەو – ئەم پیاوەی کە هەنوکە گاڵتەم پێ دەکات- لەدایک بوو، من شۆردم، من پاکم دەکردەوە، قوماتم دەکرد، شەوەهای شەو، دەگەڵ دایکیا، ئایینسیای خوشکم دا، لە ماڵە پڕ نەگبەتی و هەژاریەکەی ئەودا، کە تازە مێردەکەی مردبوو، شەونخونیم بە دیارییەوە کردووە. لە کاتێکا من لەوان هەژارترو دەسکورتتر بووم. هەر دووکیان نەخۆش بوون و من خزمەتم دەکردن، دەچووم لە پاسەوان و دەرگاوانان، چیلکە و دارم دەدزی تا ماڵەکەیان گەرم بکەم. لای لایەم بۆ دەکرد، هەر کاتێ برسی بوایە، قامکم لە زاری دەنا تا ژێر ببێتەوە، لە کاتێکا خۆم لە برسا قۆڕەی زگم دەهات. من بەو جۆرە ئەوم بەخێو دەکرد و سەرپەرشتیم دەکرد، ئەویش ئەوەتا پێم پێدەکەنێ و گاڵتەم پێ دەکات. باشە تۆ چ زەرەرێک دەکەی ئەگەر من نوێژ و نزا و دووعای خێر بۆ ڕوحی کۆنتیسس دووباری بکەم؟ میرزادە من سێ ڕۆژ بەر لە ئێستا، ژینامەی ئەو خانمەم، بۆ یەکەم جار لە ژیانما، لە ئینسایکلوپیدیایەکدا خوێندەتەوە. ئاخر ئەم بەرەڵلایە چوزانێ کۆنتێسس کێ بووە؟ هەنگێ ڕووی کردە خوشکەزاکەی:

- ئەهای، یارۆ، بڵێ بزانم — دەزانی یان نا؟

کوڕە گەنجەکە، لە بن لێوانەوە و بە زمانێکی تەوسامێزەوە گوتی:

- کەسێ نەزانێ دەڵێ هەر تۆ هەموو شتێک دەزانی!

لیبدیف بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- کۆنتێسسێک بوو، لە ناو جەرگەی چڵپاوی شەرمەزارییەوە هەستایەوە و بوو بە نیمچە دۆتمیرێک (شابانۆ)، تەنانەت ئیمپراتوریسێکی مەزن لە نامەیەکا، بەدەست خەتی خۆی بە (دۆتمامی من*) ناوی بردووە. لە کاتی تاجگوزاری پاشادا (دەزانی تاجگوزاری پاشا دەکاتە چی؟) کاردینالێک کە نوێنەری پاپا بوو، داوای کرد ڕێی بدات، گۆرەوییە ئاوریشمەکانی بۆ لە پێیان بکات: سەرباری بەرزی پایەکەی و پیرۆزی پۆستەکەی، ئەو کارەی بە مایەی شانازی دەزانی! ئەمەت زانیوە؟ بە چاوتا وا دیارە نەتزانیوە! دەزانی ئەم کۆنتێسسە چۆن مرد؟ ئەگەر دەیزانی بیڵێ!

- وازم لێ بێنە! مێشکی سەرت بردم!

- دەی گوێ بگرە بزانە چۆن مرد. پاش ئەو هەموو شانازییە، دوای ئەوەی بوو بە نیمچە شابانۆیەک. سامسۆنی میرغەزەب، لە پیلی نەوی و، هەرچەندە بێتاوان بوو، بەرە و گیوتین (مقصلە) بکێشی کرد، تا بیکات بە گەپجاڕو مایەی پێکەنینی ژنانی پەتەڕی پاریسی. بە ئەندازەیەک ترسا بوو، کە نەیدەزانی دەیانەوێ چ بەڵایەکی بەسەرا بێنن و سەری بە چ گۆمێکدا بکەن. هەرکە هەستی کرد یارۆی میر غەزەب ملی گرتووە و دەیەوێ بیخاتە بەر کێردی کیوتینەکە و بەسەری ئەژنۆ بۆ بەر گیوتینەکەی دەڵەک دەدات، لە کاتێکا ئەو خەڵکەی دەوروبەری هەموو پێی پێدەکەنین، کۆنتێسە هاواری کرد: "جەنابی جەلاد لەحزەیەک سەبرکە، یەک لەحزەی دی! *" بەڵێ لەوەیە یەزدان لەبەر ئەو یەک لەحزەیە لە هەر هەموو گوناهەکانی ببوورێ، ڕەنگە ئەو ساتە شەفاعەتی بۆ بکات و هەموو گوناهەکانی بشواتەوە، چونکە هیچ کەسێک ناتوانێ، ئەشکەنجە و عەزابێکی دەروونی لەوە مەزنتر بۆ ڕوحی بەشەر وێنا بکات! هیچ ئەشکەنجەیەکی دەروونی ناگات بەو ئەشکەنجەیەیا! دەزانی وشەی "ئەشکەنجە، عەزاب*" مانای

چییە؟ بەڵێ ئەشکەنجە مانای خۆی بە خۆیەوەیە. کە ئەو پەرەگرافەم خوێندەوە کە باسی پاڕانەوەی کۆنتێس دەکات و داوادەکات مۆڵەتی یەک ساتی دیکەی بدات، دڵم بە جۆرێ گوشرا وەکو ئەوەی یەکێک بە مەقاش بیگرێت. ئاخر تۆ چ زەرەرێک دەکەیت، هەی خوێڕی، ئەگەر من بەر لەوەی بخەوم، لە نوێژو نزایەکانما دووعایەکی خێر بۆ ئەو گوناهکارە گەورەیە بکەم؟ من کە ئەو کارە دەکەم، لەبەر ئەوەیە ڕەنگە تا هەنوکە هیچ کەسێک بیری لەوە نەکردبێتەوە کە نوێژێ، نزایەک، دووعایەکی خێر بۆ ڕوحی ئەو بکات، یان تەنانەت، خاچێکی بۆ بکێشێت. هەڵبەتە ڕەنگە لەو دنیا ڕوحی شاد بێ، ئەگەر هەست بکات لەم دنیایەدا گوناهبارێکی وەکو خۆی، جارێک لە جاران دووعایەکی خێری بۆ کردبێت! درودێکی بۆ ڕوحی ناردبێ! ئەم تەوسخەنەت لە چییە! باوەڕت بەمە نییە هەی خوانەناس؟ تۆ ئەم شتانە چوزانی؟ تۆ بە ناخێرت گوێت بۆ قسەکانی من هەڵخستووە و بە نیوەچڵی و شێواوی گێڕاوتەوە: من درووودم تەنیا بۆ ڕوحی کۆنتێس دووباری نە ناردووە، من گوتوومە: "خودایا لە گوناهی گوناهکاری گەورە کۆنتێس دووباری و هەموو هاوگوناهەکانی وی خۆش بە!". ئەم قسەیە زۆر جیاوازە لەوەی تۆ گێڕاتەوە، چونکە لەو دنیا، ژنانێکی زۆر هەن کە گوناهی گەورەیان کردووە و بەختیان ڕەش بووە و تاڵاوی ژیانیان چەشتووە و بەدەم گیانەڵا و چاوەڕوانییەوە عەزابیان چەشتووە، بەڵام من هەمیشە دووعا بۆ تۆ و خەڵکانی وەکو تۆ گۆساخ و بێ چاو ورووش دەکەم، کە گوێ بۆ وێرد و درووودی من دەگرێت!

خوشکەزاکەی لیبدیف، قسەکەی بە خاڵی بڕی و گوتی:

– باشە باش... بەسە، بیبڕەوە! بە کەیفی خۆت درووود بنێرە، وێرد بخوێنە، بۆ کێت دەوێ نوێژ و نزا بکە، خوا بتباتەوە! مردووت مرێ ئەم هات و هاوارەت لە چییە؟

هەنگێ ئاوڕێکی لە میرزادە دایەوەو، بە تەوسخەنێکی سێ بەندیانەوە، گوتی:

– میرزادە، خوێنەوارو زانای ئێمە ئەم خاڵەی منە! نەتدەزانی؟ ئێستا

هـەموو وەختـی خـۆی بـۆ خوێنـدنەوەی ئـەمجۆرە کتێـب و بیرەوەرییانـە تەرخان کردووە. ڕۆشنبیرە ئەمما ڕۆشنبیر!

میرزادە، کە بەرەبەرە لە گەنجەکە پەست دەبوو، گوتی:

- بەهەرحاڵ، خاڵت پیاوێکە لە سۆز خاڵی نییە!

گەنجەکە بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- ئەگەر لەسەر ئەم مەدح و ستاییشـەی بڕۆیت، لـە خـۆی بایی دەبـێ، لـە خۆشیا ئەقڵ لە کەللەی نامێنێ. تۆ تەمەشـا بزانـە چـۆن لـە ئێسـتاوە دەسـتی خستووەتە سەر دڵی و لە کەیفان دەمی نایەتەوە یەک! دروسـتە لـە سـۆزو سۆزداری خاڵی نییە! بەڵام پیاوێکی کمـە، فریبـۆک و خاپینۆکـە، لـە هـەموو ئەمەش خراتر ئەوەیە کە کابرایەکی مەی ئالوودەیە کە ئەمـە بـەڵای بەڵایانـە! ئیدی وەکو هـەموو ئەوانـەی ماوەیـەکی زۆر لەسـەر مـەی نۆشـی بـەردەوام دەبن و ئالوودەی دەبن، ئەقڵی تێکچووە. بۆیـە دەبینـی هـەر هاتوهـاوارێتی و دەرب و داغـان بـووە. مـن دەگـەڵتام کـە منداڵـەکانی خـۆش دەوێ، دەگـەڵ خـاڵۆژنی ڕەحمەتیمـدا زۆربـاش بـوو، ڕێـزو حورمـەتی دەگـرت... تەنانـەت منیشـی خـۆش دەوێ، زۆر شـوکر بـۆ خـوا کـە لە وەسـێتنامەکەیدا نـاوی منیشی بردووە و فەرامۆشی نەکردووم.

لیبدیف، بە تووڕەیی هاواری کرد:

- تاقە قرۆشێکت نادەمێ! یەک پولت بۆ دانانەم!

میرزادە، ڕووی لە کوڕە گەنجـەکەوەرگێڕاو، ڕوو لـە لیبـدیف بـە دەنگێکی بنجبڕ گوتی:

- گـوێ بگـرە لیبـدیف، مـن بـە تەجروبـە بـۆم دەر کەوتـووە کـە هـەرکاتێ بتەوێ دەتوانێ کابرایەکی جیددی بیت... مـن هەنوکـە پەلەمـە. بۆیـە، بمبـورە، ناوی شۆرەتی خۆت و بابت چی بوو؟ لە بیرم چووە.

- تی... تی.... تیموفی

- ئیتر؟

- لوکیانوفیچ.

هەموو، لە قاقای پێکەنینیان دایەوە. خوشکەزاکەی لیبدیف گوتی:

- درۆ دەکات! تەنانەت لە ناوەکەی خۆشیا درۆ دەکات. میرزادە، ناوی تیموفی لوکیانوفیچ نییە، بەڵکو ناوی لوکیان تیموفیچە! بۆچی ئەو درۆیەت کرد؟ بۆ میرزادە چ فەرقێک دەکات لوکیان بی یان تیموفی؟ باوەڕ بکە خووی بە درۆوە گرتووە... درۆ لەپێناوی درۆدا دەکات، چونکە خووی چێوە گرتووە!

میرزادە، کە سەبری سوا، گوتی:

- ڕاست دەکات؟

- ڕاستە، نێوم لوکیان تیموفیچە.

لیبدیف، تەریق و سەرشۆڕ چاوی بڕییە عاردی و دیسان دەستی نایە سەر دڵی.

- باشە تۆ ئەو خوایە بۆچی ئەو درۆیەت کرد؟

لیبدیف، زیاتر سەری شۆڕ کرد و لە بن لێوانەوە گوتی:

- لە تەوازوع و خۆشکێنییە!

- هیچ تەوازوع و خۆشکێنیەک لەم درۆیەدا نابینم!... ئاه... کاشکێ دەمزانی کۆلیا لەکوێیە.

میرزادە، بەدەم ئەو قسەیەوە، گەڕایەوە و پێدەچوو لێبڕابێت بڕوات.

گەنجەکە گوتی:

- من پێت دەڵێم کۆلیا لەکوێیە.

لیبدیف، بەلەز قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- نا، نا!

گەنجەکە لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

- کۆلیا، شەوێ لێرە بوو. ئەمڕۆ، بەیانی چوو بۆ لای بابی، بۆلای ئەو جەنەراڵەی کە تۆ لە زندانی قەرداران ڕزگارت کرد، مەگەر هەر خوا بزانێ، تۆ بۆچی قەرزەکەت بۆ دایەوە. دوێنێ جەنەراڵ، قەولی دابوو بێت بۆ ئێرە، بەڵام نەهات. پێدەچێ چووبێ بۆ "ئوتێلی ڤیسی" کە زۆر لێرەوە نزیکە، هەرچەند هەنگاوێک لێرەوە دوورە. ڕەنگە کۆلیا لەوێندەر بێ، ئەگەر لەوێندەر نەبێت ئەوا چووە بۆ باڤلوڤسک، بۆ سەردانی ماڵی یەپانچین. لە

دوێنێوە بەتەمای ئەوێ بوو، هەندێ پارەشی پێ بوو. ئیدی یا لە ئوتێلەکە یان لە پاڤلوڤسک دەی بینی.

لیبدیف هەڵی دایە:

- لە پاڤلوڤسکە، بەڵێ لە پاڤلوڤسک! با جارێ لێرەوە بچین بۆ باخچەکە... بچین قاوەیەک بخۆینەوە..

لیبدیف، بەدەم ئەو قسەیەوە، قۆڵی میرزادەی گرت و چوونە دەرەوە. بە نێو حەوشەیەکی بچووکدا ڕۆیشتن و لە دەرگایەکی تەسکەوە وەدەر کەوتن و چوون بۆ باخچەکە. باخچەکە بچووک بوو، بەڵام جوان و دڵگیر بوو. دار و درەختەکان بە هۆی خۆشی کەشوهەواوە هەموو گەش و بە بەرگ و بار بوون.

لیبدیف میرزادەی لەسەر تەختێکی کەسک، لە بەردەم مێزێکی کەسکدا، کە قاچەکانی لە عاردی چەقێنرا بوون، داناو، خۆشی لە بەرانبەریدا دانیشت. دوای کەمێک قاوەیان هێنا و میرزادە خواردییەوە. لیبدیف، چڵێسانە دەیڕوانیە دوڕ چاوانی میرزادە و بزەی پڕ ڕیاو ڕووبینی بە ڕوویدا دەدا.

میرزادە، وەکو یەکێک بیری لە شوێنێکی دی بێت، بەدەم حەواسپەرتیەوە گوتی:

- باوەڕم نەدەکرد ئەم ماڵ و حاڵەت هەبێت.

لیبدیف، بە چارەی خەمناک و لێوانی بە بارەوە گوتی:

- هەتیوە داماوەکانم!

بەڵام زوو بە زوو وازی لەو باسە هێنا، چونکە میرزادە چووبووە ژێری و دەیڕوانییە ڕووبە ڕووی خۆی، دیار بوو ئەو قسەیەی لە بیر چووبوو کە تۆزێ لەوەپێش کردبووی. دەقیقەیەکی دی تێپەڕی، لیبدیف، بەدەم چاوەڕوانی قسەی زیاترەوە، هێشتا هەر چاوی بڕیبووە میرزادە.

میرزادە، وەک ئەوەی وەخۆ هاتبێتەوە، گوتی:

- ئێ؟ بەڵێ... لیبدیف تۆ بە خۆت چاک دەزانیت من بۆچی هاتووم بۆ ئێرە، من ئەمڕۆ دوای ئەوەی نامەکەی تۆم پێگەیشت، هاتم بۆ ئێرە. دەی

قسان بکە! .

لیبدیف، کە کەمێک پەشۆکا بوو، ویستی شتێک بڵێت، بەڵام تەنیا چەند بڵمە بڵمێکی نامەفهوومی لە زار هاتە دەر. میرزادە، سەبرۆکەیەکی گرت و بەدەم بزەیەکی خەمینەوە گوتی:

– لوکیان تیموفیچ، پێم وایە من باشت دەناسم. هەڵبەتە بەتەمای هاتنی من نەبوویت. چونکە وات دەکرد کە لەگەڵ یەکەم نامەی تۆدا، واز لە گۆشەگیری خۆ نایەنم و نایەم بۆ لات، بۆیە نامەکەت تەنیا بەو مەبەستە بووە کە ویژدانی خۆت ئاسوودە بکەیت و گلەیی لەسەر خۆت نەیەڵیت، بەڵام وەکو دەبینی، ئەوەتا هاتووم. دەیسا ئیدی بەسە! .. هەوڵمەدە فریوم بدەیت! ناکرێ لە یەک کاتدا خزمەتی دوو ئاغا (سید) بکەیت. واز لەو کارە بێنە! نزیکەی سێ هەفتەیە ڕوگوژین لێرەیە. بەوردی ئاگام لەوە هەیە. ئایا توانیت ناستاسیا فیلیپوڤنای وەکو جاری یەکەم پێ بفرۆشیت یان نا؟ ڕاست بڵێ.

– نا، ئەم دێوە بە خۆی هەموو شتێکی کەشف کرد!

– جنێوی پێمەدە: دیارە بەد ڕەفتاری دەگەڵ کردوویت.

لیبدیف، بەوپەڕی تووڕەیی گوتی:

– هەر بەد ڕەفتاری، پڕ شەقی کردم، تا جووڵاوم جووڵاندوومی. لە ناوجەرگەی مۆسکۆدا، سەگە دڕەکەی، سەگە ترسناکەکەی تێبەردام، ئەم سەگە لەم سەرەوە تا ئەو سەری شەقامەکە ڕاوی نام.

– لیبدیف، لەوە دەچێ بە منداڵم بزانیت. ڕاستم پێ بڵێ: ئایا ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە مۆسکۆ، لە دەستی ئەو هەڵات؟

– بەڵێ، هەڵات و ئەولاتریش. دیسان بەر لە ئاهەنگی مارەبڕین خۆی دزییەوە.. ڕوگوژین، دەتگوت لەسەر ئاو و ئاگرە، بە تاسە و پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئاهەنگی زەماوەند و مارەبڕینەکەی دەکرد، بەڵام ناستاسیا فیلیپوڤنا ڕێک لەو کاتەدا لە مۆسکۆوە هەڵات بۆ پترسبۆرگ، یەکسەر هاتەماڵی من و گوتی: " لوکیان، فریام بکەوە، ڕزگارم بکە، هیچیش بە میرزادە مەڵێ!" چونکە لە تۆ زیاتر دەترسێت تا لە ڕوگوژین، ئەوە ڕازی

مەسەلەکەیە!

لیبدیف، بەدەم ئەو قسەیەوە، وەکو ئەوەی بیربکاتەوە بە درۆوە، قامکی بە تەوێڵی خۆیدا کێشا. میرزادە گوتی:

– تۆش کەوتیتە ناوبژیان، نا؟

– جا میرزادەی پایەبەرز، دەمتوانی چ بکەم؟ چما دەمتوانی ناو بژیان نەکەم؟

– زۆر چاکە. من بیرێک لە حاڵی خۆم دەکەمەوە. تۆ تەنیا ئەوەم پێ بڵێ ناستاسیا هەنوکە لەکوێیە؟ لەلای ڕوگوژینە؟

– نا، نا، تا ئێستا بە تەنیا دەژی. دەڵێت: "من هێشتا ئازادم" میرزادە، دڵنیابە کە زۆر جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە. بەردەوام دەیڵێ و دەیڵێتەوە: "من هێشتا ئازادی ئازادم!".

هێشتا لە ماڵی ژن خوشکەکەی منە لە شەقامی پترسبۆرگسکایا، لە نامەکەما ئەمەم بۆ باس کردبوویت.

– یانی ئێستا لەوێندەرە؟

– بەڵێ لەوێیە، مەگەر بە هۆی خۆشی کەشوهەواوە چووبێ بۆ بافلوڤسک، بۆ لای داریا ئالکسیڤنا، هەمیشە دەڵێت " من حوری نەفسی خۆمم، ئازادی ئازادم ". دوێنێ بە شانازییەوە باسی ئازادی خۆی بۆ کۆلیا دەکرد. ئەمە نیشانەیەکی خراپە.

هەنگێ لیبدیف، تیزخەنێکی بۆ کرد.

– باشە کۆلیا، زوو زوو دەچێ بۆ لای؟

– کوڕێکی سەرەڕۆیە، لێی تێناگەم. بە ڕاستی نهێنی پارێز نیە.

– دەمێکە نەچوویت بۆ لای؟

– هەموو ڕۆژێ دەچم بۆ لای، ڕۆژ بوێری ناکەم!

– دوێنێ چوویت بۆ لای؟

– نا، نا، پەستریپێرێ لەوێ بووم.

– لیبدیف، حەیفێ، کەمێک سەرخۆشی! وا نەبوایە پرسیارێکی دیکەم لێ دەکردیت.

لیبدیف، گوێی قوڵاغ کردەوە و گوتی:

- نا، نا، هیچم نەخواردۆتەوە.

- باشە کە ئەوت جێ هێشت، وەزعی چۆن بوو؟

- یانی... لە حاڵی گەڕان و تاقیبدا بوو

- گەڕان و تاقیب؟

- بەڵێ، لەوە دەچوو لە شتێک بگەڕێت، شتێکی ون کردبێت و لێی بگەڕێت. هیچ دڵی بە زەماوەندە چاوەڕوانکراوەکەی خۆش نییە، کە بیری لێ دەکاتەوە دڵی تێکهەڵدێ. ئەگەر باس بکرێت تورە دەبێت، هیچ حیسابێک بۆ ڕوگوزین ناکات، سڵی لێ دەکاتەوە. نایەڵێت کەس ناوی بێنێ، مەگەر ئەو کەسە زۆر ناچار بێ... لە حاڵەتی زۆر پێویستدا نەبێت یەکدی نابینن. ڕوگوزین بەمە زۆر قەڵس و نارەحەتە، زۆر چاکیش هەستی پێ دەکات.، بەلام چاری نییە. ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە دەزانێ، چاری ناچارە و دەبێ لە ئەنجامدا مل بدات، زۆر نیگەران و بێزار و سەرکێش و بە تەشەر و توانجە.

- سەرکێش و بە تەشەرە؟

- بەڵێ، سەرکێشە، زوو هەڵدەچێ. ئاخیر جار کە سەرم دا، خەریک بوو لەسەر قسەیەک، قژم دەربێنێ.

میرزادە، وەکو ئەوەی بە باشی قسەکەی لیبدیفی نەبیستبێ، پرسیی:

- چۆن، لە سەر چی؟

- با پێت بڵێم. من کەشف و کەراماتەکانی یوحەنام بۆ دەخوێندەوە. ئەم خانمە هەندێک خەیاڵاوییە، خەیاڵدانێکی بەهێزی هەیە. هە هە! هەستم کرد، حەزی لە بابەت و گەنگەشەی جدیشە. حەز لە بابەتی جیددی دەکات، تەنانەت کە باسی ئەو بابەتانەی لەگەڵ دەکەی، ئەمە بە نیشانەی ڕێزی تایبەتی بۆ خۆی لەقەڵەم دەدات. بەڵێ ئەمە تەبیعەتیەتی. من لە ڕاڤە و شرۆڤەی کەشف و کەراماتەکانی قەدیس یوحەنادا زۆر شارەزام و نزیکەی پازدە ساڵە خەریکی ئەم کارەم، ناستاسیا لەوەدا هاوڕای من بوو کە ئەم ڕۆژگارەی ئێمە سەردەم و ڕۆژگاری ئەسپی سێیەمە، یانی ئەو ئەسپە





ڕەشەی کە سوارەکەی تەرازوویەکی بەدەستەوەیە، چونکە لەم سەردەم و ڕۆژگارەی ئێمەدا هەموو شتێک، گشت مامەڵە و قەراردادێک بە تەرازووە، هەر کەسە و لە خەمی هەقی خۆیدایە و لە هەوڵی وەرگرتنی هەقی خۆیدایە: یەک، هەشت یەک گەنم بە دینارێک، سێ هەشتەیەک جۆ بە دینارێک *." وێڕای ئەوەش هەر هەمووان دەیانەوێ خاوەنی ئازادی بیرو پاکی دڵ و لەشی ساغ و هەموو نیعمەتێکی خوا بن، بەڵام تەنیا لە ڕێگەی ڕەواوە نایگەنێ، ئیدی ئەمە بەردەوام نابێت، لەناکاو ئەسپە زەردەکە بە خۆ و سوارەکەیەوە کە ناوی "مەرگە" پەیدا دەبێ و ئیدی ڕۆژی پەسلان و "دۆزەخی*" بەدوا دێت. کە یەکتر دەبینین باسی ئەم شتانە دەکەین، کە زۆر کاری تێ دەکات.

میرزادە، کە بە سەرسامی دەیڕوانییە لیبدیف، لێی پرسی:

- جاخۆت باوەڕت بە هەموو ئەم شتانە هەیە؟

- هەم باوەڕم پێیەتی و هەم ڕاڤە و شرۆڤەشی دەکەم، چونکە هەژارێکی، ڕووتەو، ڕووت و ڕەجاڵی وەکو من، گەردیلەیەکم لەنێو ئاپۆڕاو حەشاماتی بێسەر و بنی تیرەی بەشەرا. کێ ڕێزی لیبدیف دەگرێت؟ هەمووان گاڵتەی پێدەکەن، پێی ڕادەبوێرن و هەر کەسێک دەیگاتێ شاپێکی تێ هەڵدەدات، بەڵام لە مەسەلەی شرۆڤە و ڕاڤەی کەشف و کەراماتدا هاوتای هەر ئەشرافزادەیەکم. توانای ئەقڵ و هۆش و زیرەکی لەمەدایە. جارێکیان، پیاوێکی زۆر گەورە کە لە حوزروما دانیشتبوو، کە پەی بە زیرەکی و هۆشوگۆشم برد، ترسی لێ نیشت و لە شوێنەکەی خۆیەوە کەوتە لەرزین. ئەمەی باسی دەکەم، پێرار، پێش جەژنی پاک ڕووی دا. جا کە جەنابی نیل ئالکسیفیچ، کە ئەو کاتانە من لەوەزارەتدا، یەکێک بووم لە کارمەندانی ژێر دەستی وی، کەوەسفی منیان بۆ کردبوو، لە ڕێگەی پیوتەر زاخاروفیچەوە فەرمانی بە سکرتاریەتی گشتی دابوو کە من بە تەنیا بۆ نووسینگەی تایبەتیی ئەو بڕۆم، کە چووم، پرسیی: "ئەرێ ڕاستە دەڵێن تۆ لە شرۆڤە و ڕاڤەی پێشبینییانی هاتنی دەجالدا شارەزا و مامۆستای؟" نکۆڵیم نەکرد، کەوتمە ڕاڤە و شرۆڤەی دەقی پیرۆز، بەڵام هیچ هەوڵێکم





نەدا هەرەشەکانی نێو دەقەکە بشارمەوە یان بە سووکی باسیان بکەم، بەڵکو بە پێچەوانەوە، زۆر بە قووڵی کەوتمە راڤەی رەمزەکانی و چوومە قووڵایی مانای ژمارەکانەوە. هەوەڵ جار گاڵتەی پێم دەهات، بەڵام کە گەیشتینەوردی ژمارەکان و روونی بەراوردەکان، ترسی لێ نیشت و کەوتە لەرزین، تکای لێ کردم کە کتێبەکە دابخەم و برۆم. ئەمری کرد ناوم تۆمار بکەن و لە جەژنی پاکدا جەژنانە و پاداشتم بدەنێ، بەڵام هەفتەیەک دوای ئەوە قەزاوبەڵای تۆی برد و چووە بەر دلۆڤانی یەزدان.

- ئەوە بە راستتە لیبدیف؟

- باوەڕبکە، چۆنت پێدەڵێم وایە. دوای شێو لە گالیسکەکەی بەر بووەوە، لاجانگی کەوت بە قەراخ شۆستەی شەقامەکەدا و دەمودەست مرد. بەگوێرەی تۆماری وەزیفەکەی، تەمەنی هەفتا و سێ ساڵ بوو. سوورەیەکی قژ سپی بوو، هەمیشە عەتری لە خۆ دەدا، وەکو منداڵ بزە و پێکەنین لە لێوی نەدەبڕا. پیوتەر زاخاروفیچ، سەردانەکەی منی بۆ لای وی بیر کەوتەوە و گوتی: " تۆ پێشبینی ئەمەت بۆ کردبوو."

میرزادە هەستا، تا بڕوات. لیبدیف نەک هەر پێی سەیر بوو، بەڵکو پێشی ناخۆش بوو کە میوانەکەی بەو رادەیە پەلەی رۆیشتنیەتی. ئیدی زاتی وەبەر خۆناو، بەوپەڕی ریاو رووبینییەوە گوتی: "هەست دەکەم، زۆر بێموبالات و خەمسار بوویت!

میرزادە، بە گرژو پەستی بەرسڤی دایەوە:

- ئەلهەقی بێتاقەتم. سەرم قورسە، رەنگە هیی سەفەرەکەم بێ. لیبدیف، بە شەرمێکەوە گوتی:

- باشترین شت ئەوەیە هاوینەوارێ پەیدا بکەیت و بچی لەوێندەر ئیسراحەت بکەیت.

میرزادە، بەدەم خەیاڵەوە لە جێی خۆی وەستابوو. لیبدیف لەسەری رۆیشت و گوتی:

- من، دوای دوو سێ رۆژی دی بە ماڵ و منداڵەوە بۆ هاوینەوار دەڕۆم. هەڵبەتە ئەمە هەم بۆ تەندروستیی منداڵە ساواکە باشە و هەم

دەستێک بە ماڵەکەی ئەوێدا دێنن. دەچین بۆ پاڤلوڤسک.

میرزادە لەپڕ پرسیی:

– ئێوەش بۆ پاڤلوڤسک دەڕۆن؟ ها... پێدەچێ هەموو خەڵکی ئێرە بۆ پاڤلوڤسک بڕۆن! گوتت لەوێ خانووی خۆت هەیە؟

– هەموو خەڵکی بۆ پاڤلوڤسک ناچن. ئیڤان پتروڤیچ پتیتسن، ڤیلایەکی لەوێ داوەتێ کە کاتی خۆی زۆر هەرزان کڕیویەتی. پاڤلوڤسک، شوێنێکی جوان، بەرزو سەوزەزارە. ژیانیش لەوێ قورس نییە، خەڵکی ئەرستۆکرات و شارستانی ڕوودەکەنە ئەوێ، بۆ خۆمان لەزەت لە موسیقا و ئاهەنگێن موسیقا* وەر دەگرین. لەبەر ئەمەیە کە خەڵکێکی زۆر ڕوو دەکەنە ئەوێندەر. جا من تەنیا بەشێکی بچووکی خانووەکە بەکار دێنم، بەڵام ڤێلاکە...

– بە کرێت داوە؟

– نا، نە نا، بە تەواوی بە کرێم نەداوە.

میرزادە، لەپڕ گوتی:

– باشە بە کرێ بیدە بە من.

لیبدیف، هەمان نەخشەی لە مێشکا بوو، هەمووی سێ دەقیقەیەک بوو ئەو بیرەی لە مێشکی خۆیدا تاوتوێ دەکرد. هەڵبەتە لە کرێچی نە دەگەڕا، پێشتر کابرایەک پێی گوتبوو، کە ڕەنگە هاوین، ڤێلاکەی لێبەکرێ بگرێت. ڕاستە کابرا گوتبووی "ڕەنگە" بەڵام لیبدیف دەیزانی کابرا بە ڕاستییەتی، بۆیە بێخەم بوو لە بەکرێدانی ڤێلاکەی، بەڵام لە پڕێکا، ئەوەی بە مێشکا هات، مادامێکی کابرای یەکەم جوابی ئەسەحی لێنەگێڕاوەتەوە، باشترین شت ئەوەیە بە میرزادەی بدا بە کرێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم کارە ململانێ و بەرخوردی تازەی بە دوودا دێت و ڕەوتی ڕووداوەکان دەگۆڕێت!" بۆیە بە نیمچە خۆشحاڵییەکەوە، پێشنیازەکەی میرزادەی قەبوڵ کرد. تەنانەت کە میرزادە پرسیاری کرێیەکەی لێ کرد، دەستی بە جۆرێ بەرز کردەوە وەک ئەوەی بڵێ کرێ گرینگ نییە و تەماح ناکاتە ئەو.

میرزادە گوتی:





- زۆر باشە، مەغدورت ناکەم. بە خۆم پرسیاری کرێ دەکەم. دڵنیا بە نایەڵم زەرەر بکەی.

لە کاتێکا خەریک بوون بە دوو قۆڵی لە باخچەکە وەدەر دەکەوتن، لیبدیف کە بە خۆشحاڵییەوە بەدەوری میرزادەدا دەهات، بەدەم منجەمنجەوە گوتی:

- میرزادە، میرزادەی بەڕێز، ئەگەر ڕێم بدەی، حەز دەکەم شتێکی گرینگت دەربارەی هەمان مەسەلە پێ بڵێم...

میرزادە، وەستا. لیبدیف، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- داریا ئەلکسیڤناش لە پاڤلوڤسک ڤێلایەکی هەیە...

- ئێ؟

- داریا، خانمێکی دۆستی هەیە، وادیارە بەتەمایە زوو زوو هاتوچۆی بکات. هەڵبەتە بە مەبەست و ئامانجێکی تایبەتی.

- مەبەست و ئامانجی چی؟

- ئاگلایا ئیڤانوڤنا...

میرزادە، وەکو یەکێک کۆنە برینێکی هاتبێتە کولاندنەوە، بەوپەڕی بێزاری، قسەکەی بە لیبدیف بڕی و گوتی:

- بەسە لیبدیف، باسی شتی وا بۆ من مەکە!... ئەمە، ئەمە ئەسڵی مەسەلەکەمان نییە. باشتر وایە پێم بڵێی بەتەمای کەی سەفەر بکەی. تا زووتر سەفەر بکەی بۆ من باشترە، چونکە حاڵی حازر لە ئوتێلدام...

بەدەم گفتوگۆوە لە باخچەکە وەدەر کەوتن. نەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، بە حەوشەکەدا تێپەڕین و گەیشتنە دەرگا باریکەکەی حەوشە.

لیبدیف، دوای بیرکردنەوەیەکی کەم گوتی:

- پێم باشە هەر ئەمڕۆ ئوتێل بەجێ بێڵی و بێی بۆ ئێرە، تا دوو بەیانی لێرەوە پێکەوە بڕۆین بۆ پاڤلوڤسک.

میرزادە، بەدەم خەیاڵ پەرتییەوە گوتی:

- با بزانم.

هەنگێ لە دەرگا وەدەر کەوت و گەیشتە سەر شەقامەکە. لیبدیف، لە

دواوە تەمەشـای دەکـرد. سـەری لەو خـەیاڵ پەرتییـە کوتـوپڕەی میـرزادە سوور مابوو کە بیری چوو لـە کاتی دەرچوونا خوداحـافیزی لێ بکات یان بەلای کەمەوە سەرێکی بۆ بلەقێنێ. ئەوەندەی لیبدیف، میرزادەی دەناسی ئـەم ڕەفتـارە دەگـەڵ نەزاکـەت و ئەتەکێتپـەروەری و خۆشـڕەفتاری ئەودا تێکی نەدەکردەوە.

پەراوێز:

* - پاڤلوڤسک: گوندێکە لـە باشـووری پترسبۆرگ، ئەمـە هاوینـەهەواری خـەڵکانی دەوڵەمەند و ئەرسـتۆکراتە، ژمارەیـەکی زۆری ڤێلاوو فۆکسـهۆڵی تیایە کە ئاهەنگی سەمفۆنیای تیا دەگێڕدرێت و خەڵکی زۆریان لا پەسندە.

* - گەڕەکی پسکی (حی الرمـال): گەڕەکێکە لـە شـارۆچکەیەکی ئاسـایی ڕۆژهەلاتی پایتەخت، کۆمەڵێک شەقامی پێدا دەڕوات.

* - پایەبـەرز: نازناوێکـە، زیـاتر بـۆ میرانـی بنەماڵـەی دەسـەلاتدار بـەکار دێت.

* - تانیا: سووکەڵە ناوی "تاتیانا"یە.

* - بکـوژی خـانەوادەی ژیمـارین: لـە یـەکی / ئـازار/١٨٦٨دا قوتابییـەکی قۆنـاغی خوێـندنی ناوەنـدی، بـە نـاوی فیتولـد گورسـکی، کـە هۆڵەنـدی نـەژاد بوو، لە شاری تامبوفدا، بە جارێ شەش کەسی کوشت کە بریتی بوون لـە ژیمارینی بازرگان و دایکی و کوڕەکەی و ژنێکی خزمـی و دوو خزمـەتکار. دۆستۆیفسـکی گرینگییـەکی زۆری بەو تاوانـە داوە و هۆیەکـەی گەڕاندووەتەوە بۆ باندۆرو کاریگەریی بۆچوون و تیۆریانی نەهلیستی.

* - قازی سوڵح: دۆزو خەتا بچووکەکان چ مـەدەنی بـان و چ جـەزایی، دادگای سوڵحی گەڕەکەکان، لێی دەپێچیەوە (بـەگوێرەی یاسـای ١٨٦٤) خـۆ ئەگەر تەمیز بکرایەوە ئەوا هەواڵـەی مەڵبەندی قازیـانی سـوڵحی هەرێمـەکان دەکرا.





* - "واحکموا بین الناس بالرحمە": ئەم دەستەواژە باوە، لە قەراری ئیمپراتۆری /٢٤/ت٢دا وەکو پێشەکییەک بۆ تەشریعاتی دادڤانی هاتووە. ئەم دەستەواژەیە بە پیتی زێڕ لەسەر بەردەنووسێکی مەڕمەڕ نەخشێنراوە و لە یەکێک لە هۆڵەکانی کۆشکی داد لە شاری پترسبۆرگ دانراوە.

* - "یاری بالکی": گەمەیەکی کۆنی یاریی وەرەقە.

* - کفاس: شەرابێکی هەرزان بەهایە لە نانی جۆ یان لە میوە دروست دەکرێت.

* - کۆنتێس دووباری: ئەمە کۆنتێس جان ماری دی باری (١٧٤٣-١٨٩٣)، خۆشەویستی لویسی پازدەیەمە. لە سەردەمی تیرورو توندوتیژییەکەدا، بە گیوتین ئیعدام کرا. ئەو یاداشتنامە ساختەیەی بە ناوی ئەوەوە لە ساڵی ١٨٢٩- ١٨٣٠دا بڵاو کرایەوە، دۆستویفسکی لێرەدا بۆ ڕوون کردنەوەی هەندێ ڕووداوی ژیانی ئەو سوودی لێوەرگرتووە.

* - "دۆتمامی من": لە دەقە ئەسڵەکەدا، بە فەرەنسییە.

* -"جەنابی جەلاد لەحزەیەک سەبر بکە... یەک لەحزەی دی": ئەم ڕستەیە، لە دەقە ئەسڵەکە بە فەرەنسییە. ئەم وشانەی کە کۆنتێس دووباری لەبەر گیوتنەکەدا وتوونی، لە بەرگی سیازدەی "فەرهەنگی ئینسایکلوپیدی" ڕووسیدا هاتووە کە بلوشار لە ساڵی ١٨٤٤دا لە پترسبۆرگ بڵاوی کردووەتەوە و دۆستویفسکی دەی خوێندەوە.

* - عەزاب: نووسەر وشەی Misere فەرەنسی بەکار هێناوە ئیدی بە مانای عەزاب کەوتووەتە سەر زاری خەڵکی ڕووسیا.

* - "یەک هەشت یەک گەنم...": بڕوانە ڕۆیا القدیس یوحنا "الاصحاح السادس، ٦".

* - دۆزەخی: بڕوانە ڕۆیا القدیس یوحنا "الاصحاح السادس، ٨".

* - ئەو ئاهەنگە مۆسیقاییانەی لە باخچەکانی وێستگەی پاڤلوڤسک دەهاتنە گێڕان، یەجگار بەناوبانگ بوون و بووبوو بە مەڵبەندی دیدار و دیدارگەی کوڕە دەوڵەمەند و ئەرستۆکراتان.

## فەسڵی سێیەم

سەعات نزیکی دوازدەی نیوەڕۆ بوو. میرزادە دەیزانی ئەگەر بیەوێ بۆ ماڵی یەپانچین بڕوات، زەحمەتە کەسیان ببینێ، چونکە لەم وەرزەدا دەچوونە دەرێی شار، تەنیا ئەگەری ئەوە هەبوو خودی جەنەراڵ، ئەویش لەبەر کاروکاسبی و سەرقاڵی، لە شارا مابێ. هەڵبەتە ئەوەش ئەگەرێکی مسۆگەر نەبوو.

میرزادە، دڵنیا بوو کە جەنەراڵ بەپەلە بۆ پاڤلوفسکی دەبات، بەڵام میرزادە ماڵێکی دی بەدەستەوە بوو، بۆیە لێبڕا، بەر لەوەی بۆ پاڤلوفسک، بڕوات، بچێ لە ماڵی ناڤبری بگەڕێت و هەرچەندە ئەو کارە دەبێتە هۆی ئەوەی درەنگانێ بۆ ماڵی یەپانچین بگەڕێتەوە و سەفەرەکەی بۆ پاڤلوفسک بکەوێتە سبەینێ.

هەڵبەتە ئەم هەوڵەی میرزادە، لە چەند ڕوویەکەوە، مەترسیدار بوو. بۆیە بڕێک دوو دڵ و ڕاڕا بوو. دەیزانی ئەو ماڵەی ئەو بۆی دەگەڕا کەوتووەتە شەقامی کوروخوڤیای نزیکی جادەی سادوڤایا. بڕیاری دا بەو ئومێدەی کە بە درێژایی ڕێگا، کاتی ئەوەی دەبێ بەوردی بیر بکاتەوە و بڕیاری بنج بڕ بدات، بەرە و ئەوێندەر بە ڕێ کەوت.

کە لە یەکتربڕی هەر دوو شەقامەکە نزیک بووەوە، نیگەرانی و شپرزەییەکی ئەوتۆ باڵی بەسەریا کێشا، کە خۆیشی سەری لە خۆی سووڕ ما. هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبوو دڵی بەو شێوەیە بکەوێتە ترپە ترپ.

دیمەنی خانوویەک لە دوورەوە سەرنجی ڕاکێشا. زیاتر دیمەنی غەریبی ئەم خانووە سەرنجی ڕاکێشابوو.

میرزادە، دوایی بیری کەوتەوە کە لە دڵی خۆیدا گوتبووی: "دەبێ ئەمە ئەو ماڵە بێ کە من بۆی دەگەڕێم." بەوپەڕی کونجکاوی بەرە و ماڵەکە چوو تا بزانێ مەزەندەکەی ڕاست بووە یان نا. بە خۆیشی نەیدەزانی بۆ حەزی دەکرد مەزەندەکەی ڕاست دەر نەچێت، پێی ناخۆش بوو مەزەندەکەی ڕاست دەر بچێت. ئەم ماڵە ئەپارتمانێکی گەورە و تاریکی، سێ نهۆمی بوو، کەمترین هونەرکاری و جوانیی تەلارکاریی پێوە دیار نەبوو، ڕووکارەکەی سەوزێکی چڵکن بوو. ژمارەیەکی یەجگار کەم لەم جۆرە خانووانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ کۆتایی سەدەی ڕابردوو (مەبەست لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەە. وەرگێر ) تا ئێستا لە پترسبۆرگ دا – ئەو شارەی کە گۆڕانکاریی خێرای بەسەردا دێت- ماون. هەموو ئەو خانووانە، خانووی مکوم و بتەون، دیوارەکانیان ئەستوورە، پەنجەرەکانیان زۆر گەورەیە و لە دیوی دەرەوەڕا کەتیبەی شیشیان بۆ کراوە.

نهۆمی خواری خوارەوە زیاتر بۆ دوکانی سەڕافی تەرخان کرابوون کە خاوەنەکانیان بە شێوەیەکی گشتی ئەندامی فیرقەی Scopets* بوون، ئەم دوکاندارانە لە قاتی سەرووی دوکانەکانیان بەکرێ دادەنیشتن. ئەم خانووانە چ لە دەرەوە و چ لە ناوەوە زۆر قەبز بوون، پیاو کە تەمەشایان دەکات هەست دەکات ساردوسڕن، داخراون، پڕ ڕازن، بە بێ ئەوەی بتوانێ هۆی سەرهەڵدانی ئەو هەستە لێک بداتەوە. هەڵبەتە شێوەی تەلارکاری و یەکانگیری هێڵە گشتیەکانی ئەم خانووانە، جۆرە ڕازو نهێنییەکیان لە خۆ گرتووە. زۆربەی ئاکنجیانی ئەم خانووانە، مەگەر بەدەگمەن، دەنا هەموویان هەر بازرگان و سەوداگەرن.

میرزادە کە گەیشتە بەر دەرگای حەوشە، تابلۆی قەد دیوارەکەی خوێندەوە: "ماڵی ڕوگوژین، بۆرژوای فەخری بە میرات *" میرزادە، بەسەر دوو دڵییەکەی خۆیدا زاڵ بوو، دەرگایەکی شووشەداری دەڵەکدا، وەژوور کەوت، دەگاکە بە تەقەتەق لە دوایەوە داخرا. بە قاڵدرمەکاندا بۆ نهۆمی

یەکەم سەرکەوت. قالدرمەکان بە بەردی گەورە و قایم دروست کرابوون، لەنێو تاریکی دیوارەکاندا کە بۆیەیەکی سووری مات کرابوون، نقوم بووبوو. میرزادە دەیزانی کە هەموو نهۆمی یەکەمی ئەم خانووە تەنگ و تاریکە، بەدەست ڕوگوژین و دایکی و براکەیەوەیە. خزمەتکارێک دەرگای بۆ کردەوە، بێ ئەوەی ناوی بپرسێت، بە نێو چەند ژوورێکدا بردی: یەکەم جار چوونە هۆڵی میوانەوە، دیوارەکانی مەڕ مەڕنماو ئەرزەکەی تەختە پۆش کرابوو، کەل و پەلەکانی ناوی قەرەباڵغ و ناقۆلا، مۆدی سالانی بیستی سەدەی نۆزدە بوون. ئەوسا بە ناو چەند ژوورێکی یەک لە ناو یەکدا، بە ڕاڕەوێکی پێچاو پێچدا ڕەت بوون، بە دوو سێ پلەکاندا سەرکەوتن، پاشان بە دوو-سێ پلەکانی دیدا داگەڕان، ئەنجام گەیشتنە بەر دەرگایەک، یارۆی خزمەتکار لە دەرگای دا. پارفیون سیمیونوفیچ ڕوگوژین بە خۆی دەرگاکەی کرەوە، کە چاوی بە میرزادە کەوت حەپەسا، لە جێی خۆی وشک بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لە چەند ساتێکی تیژ تێپەڕدا بوو بە پەیکەرێکی بەردینی بێگیان. نیگای پڕ ترسی بڕییە میرزادە، چاوی نەدەتروکان، بزەیەکی هەراسان نیشتە سەر لێوی. پێدەچوو هاتنی میرزادە بە مەحاڵ یان نیمچە پەرجوویەک بزانێ، بۆیە باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد. میرزادە، ئەگەرچی وێنای ئەو جۆرە کاردانەوەیەی دەکرد، سەری سووڕ ما، بۆیە بە ناڕەحەتی گوتی:

- پارفیون، ڕەنگە لە ناوەختا هاتبم و ناڕەحەتم کردبێت. ئەگەر وایە دەگەڕێمەوە.

پارفیون، ئەنجام وەخۆ هاتەوە و گوتی:

- نا، نا، هەرگیز ناوەخت نییە! فەرموو وەرە ژووری!

زۆر خۆیی و بە ناوی خۆیانەوە یەکتریان دەدواند، چونکە لە مۆسکۆ زۆر جار یەکتریان دیتبوو، پێکەوە دانیشتبوون و تەنانەت یادگار و بیرەوەریشیان کەوتبووە نێوان، بەڵام پتر لە سێ مانگ بوو کە یەکتریان نەبینیبوو.

هێشتا، ڕەنگ زەردی و شپرزەیی و سووکە پەشێوی و گرژییەک بە

چارەی ڕوگـوژینەوە دیـار بـوو، هەرچەنـدە میوانەکـەی خولْـق کردبـوو، بردبوویە ژوورەوە، خێر هاتنی کردبوو، بەڵام بە دەستی خۆی نەبوو هەر شپرزە بوو، شپرزەیەکەی نەدەڕەوییەوە. لە کاتێکا ڕوگوژین، میرزادەی بۆ سەر کورسییەکی کەنار مێزێک دەبرد، میرزادە بە ڕێکەوت ئاوڕی دایەوە، کە نیگای سەیر و غەریب و شپرزەی ئەوی بینی لە جێی خۆی وشک بوو، هـەر خـەریک بـوو بـە نیگـا دیـواودەر کـونی بکـات. میـرزادە یەکسـەر ڕووداوێکی، ناخۆش و پڕ ئازاری وەبیر هاتەوە کە تازە بۆیان پێشهاتبوو، لـەبریی ئەوەی دانیشـێت، بـەبێ جوولـە لـە جێـی خـۆی وەسـتا، یەکڕاسـت چـاوی بڕییـە دورِ چـاوانی ڕوگـوژین. چـاوانی ڕوگـوژین، زیـاتر کەوتنـە درەوشانەوە. ئەنجام ڕوگوژین بزەیەکی بۆ کرد، بـەڵام نیگـەرانی و خـەمینی بە بزەکەیەوە دیار بوو. لە بن لێوانەوە بە میرزادەی گوت:

- بۆچی بەو ئاوایە سەیرم دەکەیت؟ دانیشە.

میرزادە دانیشت، گوتی:

- پارڤیون، ڕاستم پێ بڵێ: دەتزانی ئەمڕۆ بۆ پترسبۆرگ دێم؟

ڕوگوژین، بەدەم تەوسخەنێکەوە بەرسڤی دایەوە:

- هـزرم دەکـرد کـە بێـی، وا هاتیـت و بـە چـاوی خـۆت بینیـت کـە مەزەندەکەم دروست بووە، بەڵام لەکوێ بزانم کە ئەمڕۆ دێی؟

ئەو تونـدی و تورەییـەی کـە لـەم پرسـیار و لـە هـەمان کاتـدا وەڵامـەی ڕوگوژیندا ئاشکرا بوو، هێندەی دی میرزادەی حایر کرد.

میـرزادە، لـە کاتێکـا نیگـەرانی نـاخی فـەتح دەکـرد، بـە نـەرمی و ناسـکی پرسیی:

- گریمـان ئەگـەر بشـتزانیبا ئەمڕۆکـە دێـم، ئـەم هـەموو تورەییـەت لـەپای چییە؟

- ئەدی تۆ، بۆچی ئەو پرسیارەم لێ دەکەی؟

- چونکـە ئـەم بەیانییـە کـە لـە قیتـار دادەبـەزیم، لـە نـاو جەرگـەی ئاپۆڕای خەڵکەکەوە دوو چـاوم بینـی زەق زەق تەمەشـای منیـان دەکـرد، دەقـاودەق وەکو چاوانی تۆ کە تۆزێ لەمە پێش لە پشتەوە، تەمەشات دەکردم.





ڕوگوژین، بە گومانەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

- بە ڕاست؟ تۆ بڵێی چاوانی کێ بێ؟

میرزادەوای هاتە بەرخەیاڵ کە ڕوگوژین ڕاجفری. گوتی:

- نازانم، لەنێو حەشاماتەکەوە بوو. لەوەشـەوام خـەیاڵ کردبێ. ماوەیەکـە ئەو جۆرە خەیاڵانـەم بـە مێشـکا دێت پـارفیونی بـرام، حـەز دەکـەم ئەوەت پێبڵێم کە ڕێک وەکو پێنج ساڵ لەمەوبەرم لـێ هـاتووەتەوە، دەقاودەق وەکو ئەو ڕۆژگارەی کە فێم لێ دەهات.

پارفیون، لە بن لێوانەوە گوتی:

- دەشێت خەیاڵات بووبێ، نازانم...

لەو ساتەدا، بزەیەکی میهرئامێزی بەسـەر لێوەوە بوو کە دەگەڵ مجێزی ئەودا تێکی نـەدەکردەوە، لـە تۆ وایـە ئەو بزەیـە لـەپڕ کـەلێنێکی تێکەوت کـە هەرچی دەکردو دەکۆشا بۆی پڕ نەدەکرایەوە.

ڕوگوژین پرسیی:

- باشە، بەتەمای بڕۆیتەوە بۆ هەندەران؟

هەنگێ لە پڕ، لە سەری ڕۆیشت:

- لە بیرتـە لـە پایزی ڕابـردوودا، چۆن لـە قیتـاری بسـکوف- پترسـبۆرگدا یەکمان بینی... پاڵتۆ و پێڵاوەکانی خۆت لە بیر ماوە؟

ڕوگـوژین، بەدەم ئەو قسـانەوە دەسـتی بـە پێکـەنین کـرد، وا دیـار بـوو لەزەتی لەو تەوسخەنەی خۆی وەر دەگرت.

میرزادە، کە چاوی بە نێو ژوورەکەدا دەگێڕا، پرسیی:

- بە یەکجارەکی لێرە گیرساویتەوە؟

- بەڵێ، ئەمە ماڵی خۆمە، دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆم؟

- دەمێکە یەکترمان نەدیتووە. هەندێ شـتم سـەبارەت بـە تـۆ بیسـتووە کـە باوەڕیان پێ ناکەم.

ڕوگوژین، بەوشکی بەرسڤی دایەوە:

- خەڵکی هەموو جۆرە قسەیەک دەکەن! دەمی خـەڵکی کونـە دیـوار نییـە، چەپکێ قوڕی پێوە دەیت و بیگریت! .

- تۆ هەموو گروپەکەی خۆت دەر کردووە. لە ماڵی کەسوکارەکەتدا دەژیت، وەکو جاران نیت. ئەمە شتێکی زۆر باشە. باشە ئەم خانووە هیی خودی خۆتە یان هیی هەموو ماڵباتەکەتە؟

- هیی دایکمە، ژوورەکانی ئەو لەوبەری ڕاڕەوەکەدایە.

- ئەدی براکەت لەکوێ دادەنیشێت؟

- سیمیون سیمیونوفیچ، لەو خانووەی تەنیشتمان دەژی.

- ژن و منداڵی هەیە؟

- ژنەکەی تەڵاق داوە. ئەمانە بۆ دەپرسیت؟

میرزادە، بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، چاوی تێبڕی. لەپڕ خەم سیمای داگرت، خەیاڵی ڕۆیشت، لەوە دەچوو گوێی لە پرسیارەکە نەبووبێ. (ڕوگوژین)یش پێداگریی نەکرد. بەڵکو بە بێدەنگی چاوەڕوانی دەکرد. هەر دووکیان بۆ ساتێ بێدەنگ بوون.

میرزادە گوتی:

- ئێستا کە بۆ ئێرە دەهاتم، لە دوورەوە، لە دووری سەد مەترەوە، بە مەزەندە ماڵەکەتم دۆزییەوە!.

- چۆن؟

- نازانم چۆنت بۆ باس بکەم. هەستدەکەم نیشانە و شەقڵی هەموو ماڵباتەکەت و جۆری ژیانی خۆت بە خانووەکەوە دیارە، بەڵام ئەگەر لێم بپرسیت هۆی ئەو هەستەت بۆ ڕوون بکەمەوە، ناتوانم ڕوونی بکەمەوە. پێم وایە ئەمە جۆرە خەیاڵاتێکە و دەترسم سەریەشەم بۆ دروست بکات. قەت پێشتر بە بیرما نەهاتبوو کە ڕەنگە لە خانوویەکی وەهادا بژیت، بەڵام هەرکە لە دوورەوە چاوم پێی کەوت، لە دڵی خۆمدا گوتم: "هەبێ و نەبێ ئەمە ماڵی ئەوە!".

ڕوگوژین، کە سەری لەو قسانەی میرزادە دەر نەدەکرد، بەدەم بزەیەکی گۆنگ و ئاڵۆزەوە گوتی:

- باپیرەم ئەم خانووەی دروست کردووە، هەمیشە ماڵباتی (خلودیاکوف)ی سەر بە فیرقە و تەریقەتی (Scopetsi) تیا بوون و بە

کرێیان گرتووە. ئێستاش هەندێکیان کرێچیی ئێمەن.

میرزادە، کە دەیڕوانیە دەوروبەری خۆی گوتی:

- چەند تاریکە! تۆ لە ژوورێکی زۆر تاریکدا دەژیت!

ژوورەکەی گەورە بوو، میچەکەی بەرز، بەڵام زۆر تاریک بوو، پڕ بوو لە کەلوپەلی وەکو: مێزی نووسین، مێزی خڕ، دۆڵابی پڕ لە تۆمارو دەفتەرو کاغەزان. تەختێکی پانی تێدا بوو کە بە چەرمێکی سوور ڕووکەش کرابوو، دیار بوو کە ڕوگوژین وەکو تەختەخەو بەکاری دێنا.

میرزادە، دوو سێ کتێبی لەسەر ئەو مێزەی بەردەم خۆی بەدی کرد کە یەکێکیان (کتێبی مێژوو)ی ڕووسیاکەی سولوڤیێف* بوو. کتێبەکە کرابووەوە و شریتێکی باریکی لە بەینا دانرا بوو. چەند تابلۆیەکی زەیتی چوارچێوە زێڕین بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، تابلۆکان ئەوەندە تاریک و دووکەڵاوی بوون کە پیاو وێنەکانی بۆ جیا نەدەکرایەوە. یەکێک لە تابلۆکان کە سەرنجی میرزادەی ڕاکێشا وێنەی پیاوێک بوو بە قەوارەی ئاسایی. وێنەی پیاوێکی نزیکەی پەنجا ساڵ بوو کە پاڵتۆیەکی دەستدروی فەرەنگی لەبەرا بوو، دوو میداڵ بەگەردنیا هاتبوونە خوارەوە، تەنکە ڕدێنێکی ماش و برنجی هەبوو. دەموچاوی چرچولۆچ و ڕەنگ و ڕووی زەردەلە و سیسەڵە، نیگای پڕ گومان و ڕازئامێزو خەمین بوو.

میرزادە پرسیی:

- ئەمەوێنەی باوکتە؟

ڕوگوژین، بەدەم زەردەخەنەیەکی تاڵەوە، وەکو ئەوەی خۆی بۆ تانە و تەشەرێکی ناخۆش دەرهەق بە بابی ڕەحمەتی ئامادە بکات گوتی:

- بەڵێ، خۆیەتی!

- باشە لە موریدانی "تەریقەت و ئایینی کۆن*" بوو؟

- نەخێر، هاتوچۆی کڵێسای دەکرد، بەڵام تەریقەت و مەزەبی کۆنی پێدروستتر بوو. زۆریش ڕێزی تەریقەتی Scopetsi دەگرت. ئۆفیسەکەشی ئەم ژوورە بوو کە هەنوکە ئێمەی تیاین. مەبەستت لە پرسیاری ئایینیی کۆن چی بوو؟





- لێرە ئاهەنگی زەماوەند دەگێڕن؟

ڕوگوژین، کە بەم پرسیارە کوتوپڕە، شڵەژا، گوتی:

- بە... لێ...

- بەم زووانە؟

- ئەگەر بەدەستی من بێ، ئا، بەڵام بەخۆت دەزانی ئەوە بە دەستی من نییە.

- پارفیون، من دژمنت نیم، بەتەماش نیم ببمە کۆسپی سەر ڕێگات. پێشتریش ئەمەم پێ گوتوویت، ئێستاش دووپاتی دەکەمەوە. تۆ بەخۆت دەزانی کاتێ لە مۆسکۆ بەتەمای زەماوەند بوویت، من کەم و زۆر دەستم لە تێکدانیا نەبوو. ئەو بە خۆی، لە بەرەبەری مارەکردنەکەدا، خۆی گەیاندمێ و تکای لێ کردم کە فریای بکەوم ولە دەستی تۆی ڕزگار بکەم. ئەمە قسەی ئەوە بۆتی دەگێڕمەوە. پاشان لەلای منیش هەڵات. ئەوە بوو تۆ کەوتیتە سۆراخی و دۆزیتەوە و جارێکی دی بردتەوە بۆ کڵێسا تا مارەی بکەیت. ئێستاش بیستوومە کە جارێکی دی هەڵاتووە و هاتووە بۆ پترسبۆرگ، ئایا ئەمە ڕاستە؟ لیبدیف، ئەوەی بۆ گێڕامەوە. پیاو ڕاست بڵێ لەبەر ئەوە هاتم بۆ ئێرە. دوێنێ لە قیتاردا، لە یەکێک لە کۆنە هاوڕێکانی خۆتم بیست کە گوایە تۆ و ناستاسیا فیلیپوڤنا ئاشت بوونەتەوە، - ئەگەر حەز دەکەی بزانی ئەو کۆنە هاوڕێیەت کێ بوو، زالیوگیف بوو- من تەنیا بە یەک مەبەست بۆ پترسبۆرگ گەڕاومەتەوە: ئەویش ئەوەیە کە قەناعەتی پێ بکەم بۆ چارەسەر بڕوات بۆ هەندەران، چونکە چ وەکو جەستە و چ وەکو دەروون، بە تایبەتی لە رووی دەروونییەوە وەزعی زۆر خراپە و پێویستی بە چاودێری و چارەسەرە. من بە نیازنیم دەگەڵیا بڕۆم، بەڵام حەز دەکەم یارمەتیی بدەم و کاری سەفەرەکەی بۆ ڕێک بخەم. ئەمە قسەی ناخی دڵمە و درۆت دەگەڵ ناکەم، بەڵام ئەگەر ڕاست بێت و ئاشت بووبنەوە، ئەوا قەت خۆمی نیشان نادەم و نایەمەماڵی تۆش. تۆ بە خۆت چاک دەزانیت فریوت نادەم و هەمیشە دەگەڵتا ڕاستگۆ بووم، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەئی و بۆچوونی خۆمم لێ نەشاردوویتەوە، هەمیشە بەرەو ڕوو





پێم گوتوویت، ئەگەر شوو بە تۆ بکات، خۆی دەفەوتێنێ. تۆش دوچاری ئاقیبەتێکی ئەوەندە خراپ دەبی کە هەزار خۆزگەت بەو. زۆرم پێ خۆش دەبێ ئەگەر دووبارە لێکدی جیا ببنەوە... بەڵام بە نیازنیم تەفریقە و ناکۆکیتان بخەمە بەینەوە. لەو ڕووەوە خەیاڵت تەخت بێ، هەر بەدگومانییەک سەبارەت بە من لە مێشکی خۆت دەربکە. بە خۆتیش باش دەزانی قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان من ڕەقیب و خەنیمی ڕاستەقینەی تۆ نەبووم. تەنانەت ئەو کاتانەش کە هەڵات و پەنای بۆ من هێنا. دەبینم پێم پێدەکەنی، گاڵتەت پێم دێت، دەزانم بۆ پێدەکەنی. ئێمە لەوێندەر بە جیا دەژیاین، هەر یەکەمان لە ڤیلایەکی جیا دەژیاین: "بێگومان لەمە ئاگاداریت.". من پێشتر بۆم باس کردووی کە خۆشم دەوێت، بەڵام خۆشەویستی بەزەیی نەک خۆشەویستی ئەڤینداری. پێم وایە دەبێ ئەم خاڵە زیاتر ڕوون بکەمەوە. ئەوسا گوتت کە لە مەبەستم تێدەگەیت، وانیە، ئایا بە ڕاستت بوو؟ بە ڕاستی لێم گەیشتوویت؟ نیگات تەژی نەفرەتن! جا بۆیە بۆ ئێرە هاتووم تا دڵنیات بکەم و ئاسوودە ببیت، چونکە تۆشم بەلاوە ئازیزی. پارڤیون، باوەڕ بکە زۆرم خۆش دەوێی. هەنوکە ئیدی دەڕۆم و هەرگیز نایەمەوە. دەی بە دووعا!.

میرزادە، بە قەستی ڕۆیشتن هەستا. پارڤیون بە دەنگی نزم و پڕ سۆزەوە، بێ ئەوەی لە جێی خۆی هەستێت و، هێشتا هەر سەری نابووە ناو دەستی ڕاستی، گوتی:

– مەڕۆ، تۆزێکی دیکەش بمێنەوە، زۆر لەمێژە نەمدیبووی.

میرزادە، دانیشتەوە، هەر دووکیان بێدەنگ بوون. ئەوجا ڕوگوژین گوتی:

– لیون نیکولایوفیچ، کاتێ لێم دوور بی، لەبەر چاو نەبیت، زۆر ڕقم لێت دەبێتەوە. بە درێژایی ئەم سێ مانگەی کە نەم دەبینیت، سات بە سات زیاتر ڕقم لێت هەڵدەستا، دەم بوغزاندی. ئەگەر بۆم بکرایە دەرمانخواردم دەکردیت. بە زاتی خوا بۆم بکرایە، بێ چەندوچوون ژەهر خواردم دەکردیت! کەچی بەم چارەکە سەعاتەی کە لای من دانیشتبووی، هیچم لە دڵ نەما، وەکو جاران لەلام عەزیزی، تۆزێکی دی لەلام بمێنەوە...

میرزادە، کە دەیویست هەڵچوونەکەی وەشێرێت، بەدەم بزەیەکی پڕ میهرەوە بەرسڤی دایەوە:

- کە لێت نزیک بم متمانەم پێدەکەیت، کە لێت دوور کەوتمەوە لێم دەکەویتە گومانەوە. تۆ لە بابت دەچیت!

- کە گوێم لە دەنگت دەبێ، ئاسوودە و دڵنیا دەبم، متمانەت پێ دەکەم. من زۆر چاک دەزانم کە ناشێت خەڵکانی وەکو من دەگەڵ تۆدا بەراورد بکرێت، بە ڕاستی من هاوتای تۆ نیم...

میرزادە، لە کاتێکا دەیڕوانییە ڕوگوژین، بە سەرسامی گوتی:

- بۆچی ئەو ڕستەیەی دواییت گوت؟ بۆچی دیسان تورە بوویت؟

ڕوگوژین، بەرسڤی دایەوە:

- ئێمە لێرەدا، هاوڕێ گیان، کەس هیچ بە کڵاومان ناپێوێ، کەس پرسمان پێ ناکات، کاروبارەکان بەبێ پرسی ئێمە ڕێکدەخرێن! .

ڕوگوژین، بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، ئەوجا بە ئەسپایی لە سەری ڕۆیشت:

- هەر یەکەمان، بە شێوازی تایبەتیی خۆی خۆشەویستی دەکات، یانی لە یەکدی جیاوازین، لە هەموو شتێکدا لێکدی جیاوازین. بۆ نموونە تو دەڵێی وەکو بەزەیی خۆشت دەوێ، بەڵام من، پیاو ڕاست بڕوات، یەک تۆزقاڵ بەزەییم پێیدا نایەتەوە. سوور دەزانم کە ئەویش زۆری ڕق لە منە. شەو نییە خەونی پێوە نەبینم: لەم خەونانەمدا هەمیشە لەگەڵ کەسێکی دیدایە و گاڵتە بە من دەکات. جا برای ئازیز ئەمە لەواقیعیشدا وایە. قەولی داوە شوو بە من بکات، بەڵام زەڕەیەک لە بیری مندا نییە، حیسابی ئەو پێڵاوەشم بۆ ناکات کە فڕێی دەدا. باوەڕ دەکەی پێنج دانە ڕۆژە نەم دیتووە، چونکە زات ناکەم بچم بۆ ماڵەکەی؟ چونکە دڵنیام دەڵێت بۆچی هاتوویت... هەر لە ئێستاوە چەندین جار تەریقی کردوومەتەوە! شەرمەزاری کردووم...

- تەریقی کردویتەوە؟ مەبەستت چییە؟

- گوایە نازانی، لەوە دەچێ خۆت لە گێلی بدەی! مەگەر لە کڵێسادا، کە لە دەمەدەمی مارەبڕیندا هەڵنەهات، تا دەگەڵ تۆدا بڕەڤێ؟ تۆ خۆت تۆزێ لەمەپێش دانت بەمەدا نا...

- سەیرە. یانی باوەڕم پێناکەی کە پێت دەڵێم من....

- ئەدی لە مۆسکۆ، بەگەڵ یارۆی ئەفسەر، زمتیوژینکوف نەکەوت و سووک و ڕیسوای نەکردم؟ هەنوکە دڵنیام کە بە ئانقەست، دوای ئەوەی بە خۆی بە ڕواری مارەبڕینەکەی دیاری کرد، دەستی بەو کارە کرد.

میرزادە گوتی:

- مەحاڵە!

ڕوگوژین، بە قەناعەتی تەواوەوە گوتی:

- من دڵنیام لەمە. تۆ پێتوایە کاری وا لەو ناوەشێتەوە؟

ئەم قسەیە بۆ یەکێکی دی بکە گیانە! ئەو ڕەفتارە لەگەڵ تۆدا ناکات و بە ناپەسندی دەزانێ، قەناعەتم بەمە هەیە، بەڵام لەگەڵ مندا، وایە و ئەولاتریش، هەر بە بەشەریشم نازانێ. هیچ حیسابێکم بۆ ناکات! ئاگام لەو کەین و بەینەش هەیە کە لەگەڵ کابرای ئەفسەردا، کیلەری بۆکسۆردا هەی بوو، تەنیا بۆ ئەوەی من بکات بە گەپجاڕی ئاشناو بێگانە! تۆ نازانی لە مۆسکۆدا چەندی عەزاب دام، چەندی داخ کردە دڵمەوە. ئەدی پارە بۆ ناڵێی. مەگەر هەر خوا بزانێ چەندم بۆ خەرج کردووە! ...

میرزادە، بە شپرزەیی و پەریشانی گوتی:

- کەوایە چۆن دەتوانی زەماوەندی دەگەڵ بکەیت؟

ڕوگوژین، لە هەوەڵەوە، وەڵامی نەدایەوە، نیگایەکی سەرگەردان و خەمناکی میرزادەی کرد، پاش کەمێک گوتی:

- ئەمڕۆ پێنج دانە ڕۆژە نەمدیتووە. هەمیشە دەترسم دەرم بکات. سەری زمان و بنی زمانی ئەمەیە: "من هێشتا حوری نەفسی خۆمم، ئەگەر بمەوێ، دەرت دەکەم و بە خۆم بۆ هەندەران دەڕۆم.

هەنگێ تەمەشایەکی میرزادەی کرد و لە سەری ڕۆیشت:

- پێشتر پێی گوتووم کە بۆ هەندەران دەڕوات. هەڵبەتە هەندێ جار هەر بۆ ترساندنی من ئەو قسانە دەکات. لەزەت لەم کارە دەبینێ، دەمکات بە مەزەی ڕابواردن و پێکەنینی خۆی، هەندێ جاری دی چارەی دەدا بە یەکدا، بە جۆرێ زاری لێک دەنێ، بە کێردیش هەڵناپچڕێ. من زیاتر لەم

حاڵەی دەترسم. ڕۆژێک لە دڵی خۆدا گوتم وا چاکە بە دەستی بەتاڵ نەچم بۆ لای، با دیارییەکی دەگەڵ خۆدا بۆ ببەم. کە چاوی بە دیارییەکانم کەوت، هێندەی دی شوڵی لێ هەڵکێشا، نەک هەر کەوتە پێکەنین و تەشەران، بەڵکو لێشم تورە بوو. جارێکی دی کوڵوانەیەکم بە دیاری بۆ برد، کە بە عەمراتی شتی وای بە خۆوە نەدیتبوو، کەچی دای بە کاتیای کارەکەری، خۆ سەبارەت بە دیاریکردنی ڕۆژی زەماوەندەکەمان نەموێرا، هەر باسیشی بکەم. ئاخر ئەمە چ دەزگیرانداریییەکە پیاو نەوێرێ، دەزگیرانەکەی، هاوسەری ئایندەی خۆی بدینێ! ئیدی ئەوەتا سووچی ماڵم گرتووە، چاوەڕوان دەکەم، هەرکە بێتاقەت دەبم، دەچم بە دزییەوە سەرێ دوان بە دەوری ماڵەکەیدا دەسووڕێمەوە، یان لە گۆشەیەکی شەقامەکەدا خۆم پەنا دەدەم. جارێکیان، تاکو نزیکی بەیانی، وەکو پاسەوان، لەبەر دەرگاکەیدا وەستام. بە خەیاڵ تاپۆیەکم بینی. هەڵبەتە ئەویش لە پەنجەرەکەوە منی بینیبوو، بۆیە لەوێندەرەوە هاواری کرد و پرسیی: "باشە ئەگەر بۆت دەر کەوتبا خیانەتت لێ دەکەم، چیت لێ دەکردم؟" بە خۆم نەوەستام و گوتم: "بە خۆت چاک دەزانیت."

- بە خۆی چی دەزانی؟.
- چوزانم!

ڕوگوژین، ئەو قسەیەی کرد و بەدەم ژارخەنەوە، لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- من لە مۆسکۆ، وێڕای ئەوەی ماوەیەکی زۆر، دوورو نزیک تاقیب و سۆراخم کرد، بەڵام نەمتوانی لەگەڵ کەسداو لە قافدا بیگرم. جارێکیان یەخەم گرت و پێم گوت: " تۆ بەڵێنت بە من داوە کە شووم پێ بکەیت. هەڵبەتە تێکەڵاوی ماڵباتێکی خانەدان و بەڕێز دەبیت، بەڵام تۆ دەزانی چیت و چتۆ ژنێکی؟ تەمەشایەکی خۆت بکە! بزانە چیت؟".
- بە ڕاستی ئەوەت پێ گوت؟
- بەڵێ.
- ئەدی ئەو چیی گوت؟





- گوتی: "من لە ئێستا بە دواوە بە نۆکەریشت قەبووڵ ناکەم چ جای بە مێردا" وەڵامم دایەوە: "منیش لێرە ناجووڵێم، بە ئامان و زامان لێرە ناڕۆم." گوتی: "منیش کیللەرت بۆ بانگ دەکەم تا دەرت بکات." منیش کەوتمە گیانی، بگرە کوێت دێشێت، ئازای گیانیم شین و مۆر کردەوە.

میرزادە، بە هەڵچوونەوە گوتی:

- مەحاڵە، باوەڕ ناکەم!

ڕوگوژین، بە ئەسپایی، بەڵام بە چاوانی ئەبڵەقەوە گوتی:

- باوەڕبکە، تا توانیم لێمدا، بەڵام چیم بەسەر هات! سی و شەش دانە سەعاتی ڕێک، یانی ڕۆژ و تاقێکی تەواو، نە خەوم لێکەوت، نە نانم خوارد، نە ئاوم خواردەوە و لەو ژوورە نە جووڵام، لەبەردەمیا چۆکم دادا، گوتم:

" ئامادەم لێرەدا بمرم، بتۆپم، بەڵام تا نەمبوری لێرە ناڕۆم، ئەگەر دەرم بکەی، خۆم بە ئاوێدا دەدەم، خۆ دەخنکێنم. ئاخر من بەبێ تۆ دەکەمە چی؟... ئەویش بە درێژایی ڕۆژەکە وەکو شێت، جارێ دەگریا، دەمێ هەڕەشەی دەکرد بەر چەقۆیانم دەدات، گاڤێ بەر دەمرێژی جنێوی دەدام. زالیوگیڤ و کیللەر و زمتیوژنیکوڤ و خەڵکانی دی بانگکرد، تا بەو حاڵەوە بمبینن و ڕیسوا و سەرشۆڕم بکات. پێی دەگوتن: "کوڕینە با ئەم ئێوارەیە بە کۆمەڵ بڕۆین بۆ شانۆ، ئەگەر ئەو نایەوێ بڕوات، با لێرە بمێنێ، خۆ من ئێشکی بە دیارەوە ناگرم... من پابەندی ئەو نیم. پارفیون سمیونوفیچ، بێگومان برسیتە، گوێ مەدەیە کە من ڕۆیشتم نان و چات دەدەنێ. بە تەنێ لە شانۆ گەڕایەوە. گوتی:" - ئەوانە هەموو ترسنۆک و بێشەرمن، لە تۆ دەترسن، گەرەکیانە منیشت لێ بترسێنن. پێیان گوتم: "بەو ئاسانییە ناڕوات... دوور نییە بشتکوژێت." بەڵام من کە تۆزێکی دی دەچم بۆ ژوورەکەی خۆم تا بنووم، دەرگای ژوورەکەم داناخەم. ئیدی بزانە چەندت لێ دەترسم! حەز دەکەم ئەمە بزانیت و بە چاوی خۆت بیدینی. چایت خوارد؟ گوتم: "نا، ناخۆم." گوتی: "زۆر چاکە، دەتەوێ خۆت بنوێنی، کەیفی خۆتە، بەڵام ئەم ڕەفتارەت لێ نایەت." و دەقاودەق هەمان کاری کرد، دەرگاکەی بە کلیل قفڵ نەدا، بەیانی کە لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە، دەستی





بە پێکەنین کرد، گوتی: "چییە، شێت بوویت؟ دەتەوێ خۆت لە برسا بکوژی!" گوتم: "بمبورە!" گوتی: "نە دەتبورم و نە شووت پێ دەکەم، ئەمە قسەی بەرو دوامە. بە درێژایی شەو لەسەر ئەم کورسییە بێدار بوویت؟" گوتم: "بەڵێ، بۆ نیونەختێش نەخەوتم." ناستاسیا گوتی: "پێتەوە دیارە. یانی هەنووکەش خەیاڵی چا خواردنت نییە؟" گوتم: "هیچم ناوێ، تەنیا ئەوە نەبێ کە بمبەخشیت!" گوتی: "خۆزیا دەتزانی چەند ئەم کارانەت لێ نایەت! ڕێک وەکو ئەوەیە لەجیاتیی ئەسپ، زین لە مانگا بکەیت*، وەکو ئەوەیە قەلەباچکە لاسایی بکە و بکاتەوە. تۆ دەتەوێ من بترسێنی؟.

من چ باکم بەوەیە تۆ برسی بی یان تێر؟ بە قەد نووکە دەرزییەکیش کارم تێناکات! " ئەلهەقی تورە بوو، بەڵام تورەیەکەی زۆری نەبرد، دووبارە کەوتەوە گاڵتە پێکردنم. سەرم لەوە سووڕما، وێڕای ئەوەی ژنێکی ڕکونی و کینەکێش بوو، چۆن وا زوو تورەییەکەی ڕەوییەوە. هەنگێ وام هات بە خەیاڵدا، لەوە بە کەمترم دەزانی تاماوەیەکی زۆر ڕقم لێ هەڵگرێت. مەزەندەکەم دەقاودەق ڕاست بوو، لێی پرسیم: "پاپا چییە؟" وەڵامم دایەوە: "بیستوومە." گوتی: "پارفیون، تۆ قەت مێژووت خوێندووەتەوە؟" "نا هەرگیز نەمخوێندووەتەوە." گوتی: "کەواتە، کتێبێکی مێژووت دەدەمێ تا بیخوێنیتەوە. ڕۆژگارێک، پاپایەک لە ئیمپراتۆرێک* تورە دەبێت، ناچاری کرد سێ دانە ڕۆژ، بە بێخواردن و خواردنەوە، بە پێی پەتی لەبەر کۆشکەکەی پاپادا چۆک دابدات، تابە خێری خۆی بیبەخشێت. بە خەیاڵ و مەزەندەی تۆ، ئیمپراتۆر لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، بەدەم چۆکدادانەوە بیری لە چی کردووەتەوە و چ بەڵێنێکی بە خۆی داوە؟ دەققەیەک سەبربکە، خۆم ئەوەت بۆ دەخوێنمەوە." بەپەلە ڕۆیشت کتێبێکی هێنا و گوتی: "بە شیعرە". دەستی بە خوێندنەوەی ئەو پەرەگرافە کرد کە ئیمپراتۆر چۆن لە دڵی خۆیدا شەرتی کردووە تۆڵە لە پاپا بسەنێت. لەسەری ڕۆیشت: "پارفیون، بە دڵت بوو؟". گوتم: "ئەوەی خوێندتەوە هەمووی دروست بوو." گوتی: "ها، یانی تۆ ئەمە بە دروست دەزانی، کەواتە پێدەچێ تۆش لە دڵی خۆتدا شەرت بکەی هەر کاتێ شووم پێ کردیت، ئەم ڕۆژە وەبیر بێنیتەوە





و وەک دەڵێن ئەم درکەم لەژێر پێ دەر بێنی و تۆڵەم لێ بکەیتەوە! " گوتم: "نازانم، لەوانەیە بیرێکی وەهام لە مێشکدا هەبێت!" پرسیی: "چۆن نازانی؟" گوتم: "بە ڕاستی نازانم، بەڵام حاڵی حازر بیر لە شتی وەها ناکەمەوە." گوتی: " زۆر چاکە، ئەدی ئێستا بیر لە چی دەکەیەوە؟" گوتم: "دەی گوێ بگرە باپێت بڵێم بیر لە چی دەکەمەوە: کە هەڵدەستیت و بەلاما تێدەپەڕی، لە دواوە نیگات دەکەم، کە گوێم لە خشەخشی جلەکانت دەبێت، دڵم دادەخورپێت. کە لە ژوورەکە دەر دەچیت، هەر هەموو قسەکانت، وەکو خۆیان، دەنگت وەکو خۆی لە گوێمدا دەزرینگێنەوە، لە یادگەمدا دەنگدەدەنەوە. بە درێژایی شەو، کاتێ خەوتبووی، بیرم لە هیچ نەدەکردەوە، تەنیا گوێم لە هەناسەت دەگرت. هەستم کرد، دوو جار لەنێو جێگاکەتدا، گینگڵت دا." بەدەم پێکەنینەوە گوتی: "ئەدی ئەوەت بیر نەدەکەوتەوە کە چۆن لە منت دەدا؟" گوتم: "نازانم." گوتی: "باشە ئەگەر نەتبەخشم و شووت پێ نەکەم؟" گوتم: "وەکو پێشتر پێم گوتیت: خۆم بە ئاوێدا دەدەم و دەخنکێم." گوتی: "لەوەیە بەر لەوەی خۆت بە ئاوێدا بدەیت، من بکوژیت؟"

بەدەم گوتنی ئەو ڕستەیەوە لەفکران ڕاچوو. پاشان تووڕە بوو و لە ژوورەکە وەدەر کەوت. دوای سەعاتێک زڤڕییەوە، زۆر دڵتەنگ دیار بوو، بە گرژی و پەستی گوتی:

" پارفیون سیمیونوفیچ، من شووت پێ دەکەم. نەک لەبەر ئەوەی لێت دەترسم، بەڵکو لەبەر ئەوەی گوێم لەوە نییە بەم شێوەیە یان ئەو شێوەیە تیا بچم. هیچ ڕێگەیەکی لەمە باشتر شک نابەم، وەرە دانیشە، ئێستا شێوت بۆ دێنن." و لەسەری ڕۆیشت: "ئەگەر شووم پێکردیت، دڵنیابە ژنێکی وەفادار و بە ئەمەک دەبم، لەم ڕووەوە ئەرخایەن بە." تۆزێک بێدەنگ بوو، ئەوسا لەسەری ڕۆیشت: "جاران وام خەیاڵ دەکرد کە کابرایەکی نۆکەرسیفەتی، بەڵام من هەڵە بووم وا نیت." "ئەوسا بەرواری زەماوەندەکەی دیاریکرد. کەچی دوای هەفتەیەک دیسان هەڵات و پەنای وەبەر لیبدیف برد. کە گەیشتمە پترسبۆرگ، پێی گوتم: "من بە تەواوەتی

دەستبەرداری تۆ نەبووم، بەڵام گەرەکمە کەمێک زیاتر سەبر بکەم، چونکە من هێشتا خاوەنی خۆمم، هێشتا حوری نەفسی خۆمم، ئەگەر تۆش دەتەوێ چاوەڕوان بکەی، چاوەڕوان بکە..!" حاڵی حازر، وەزعەکەمان ئاوهایە. تۆ ئەمە چۆن لێک دەدەیتەوە لیون نیکولایوفیچ؟

میرزادە، کە بە خەمباری دەیڕوانییە ڕوگوژین، گوتی:

- تۆ خۆت چۆنی دەبینی، چۆنی لێک دەدەیتەوە؟

ڕوگوژین، تورە بوو، هاواری کرد:

- چما من توانای بیرکردنەوەم ماوە؟

ویستی شتێکی دی بڵێت، لێ لە داخا زمانی بەسترا و بێدەنگ بوو.

میرزادە، جارێکی دی بە نیازی ڕۆیشتن هەستا، بە ئەسپایی و بە دەنگێکی خەیاڵاوی، وەکو ئەوەی وەڵامی پرسیارێکی نهێنی بداتەوە کە خۆی لە ناخەوە لە خۆی کردبێت، گوتی:

- بەهەرحاڵ، من نابمە کۆسپی سەر ڕێگای تۆ.

ڕوگوژین، لەپڕ بوژایەوە و چاوانی کەوتنە پرشنگدان، گوتی:

- من لە تۆ تێناگەم بۆچی لەبەر خاتری من دەستبەرداری دەبیت. یانی ئەمە بەو مانایەیە کە بەیەکجاری دەستبەرداری ئەڤینی ئەو بوویت؟ دەمێکە هەستم کردووە کە خۆشت دەوێ. بۆچی بەم پەلەپەلە بۆ ئێرە هاتووی؟ لە ڕووی بەزەییەوە؟ بەدەم ئەو قسەیەوە، ژارخەنێک چارەی ڕوگوژینی گرژ کرد. میرزادە لێی پرسی:

- یانی پێت وایە من درۆت دەگەڵ دەکەم، فریوت دەدەم؟

- نا، درۆ ناکەی، باوەڕم بە قسەکەت هەیە، بەڵام سەر لە هەڵوێستت دەر ناکەم. لەوەیە بەزەییەکەی تۆ لە ئەشقەکەی من توندتر بێت.

ڕقێکی هەوسار پچڕی، نیشتە سەر چارەی ڕوگوژین.

میرزادە، بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

- خۆشەویستیەکەی تۆ لە ڕق دەچێت. لەوە دەچێ بە جۆرێ تێکەڵ بووبن کە جیاکردنەوەیان ئەستەم بێت. خۆ ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو سۆزەش کاڵ بووەوە، هەنگێ قورەکە خەست دەبێتەوە و لەوەیە کارەساتێکی گەورە بقەومێ. پارفیون، برای ئازیز من لەمەت ئاگادار دەکەمەوە...

- یانی چی؟ پێت وایە سەری دەبڕم؟

میرزادە، ڕاچڵەکی، بەخامۆشی دەیڕوانیە ڕوگوژین، ئەوسا گوتی:

- بە هۆی ئەم ئەشق و ڤیانەی ئێستاتەوە، لە سۆنگەی ئەم ئازارەوە کە حاڵی حازر دەیچێژیت، ڕۆژێک دێت لێی بێزار دەبیت، ڕقی لێ هەڵدەگریت. نازانم چۆن دەتوانێ جارێکی دی بەوە قاییل ببێ کەشوو بە تۆ بکات؟ من سەر لەمە دەرناکەم! کە دوێنێ بەم هەواڵانەم زانی، هەر چیم دەکرد نەمدەتوانی باوەڕ بکەم. بە ڕاستی خەمبار بووم. ئاخر بۆچی دوو جاران تۆی سووک و شەرمەزار کرد، لەسەری مارەبڕیندا، جێی هێشتی؟ ئەمە مانای وایە کە لە شتێک ترساوە! . باشە هەنوکە بۆچی دیسان بایداوەتەوە سەر تۆ؟ چ خاسیەتێکی لە تۆدا بەدی کردووە؟ تەماحی لە پارەکەتە؟ ئەمە گریمانەیەکی نا بەجێیە! بە تایبەتی کە تاکو ئێستا بەشێکی زۆری سەروەت و سامانەکەت خەرج کردووە. تۆ بڵێی مەبەستی تەنیا شووکردن بێت و بەس؟ خۆ زۆر بەئاسانی دەتوانێ مێردێکی لە تۆ باشتر پەیدا بکات، هەر مێردێکی دی بۆ ئەو لە تۆ باشترە، چونکە تۆ لەگینە سەری ببڕیت، لەوەشە بە خۆی زۆر بە باشی ئاگاداری ئەو بابەتە بێت، تۆ بڵێی بە هۆی ئەوەوە مەیلی تۆی هەبێت کە لەڕادەبەدەر خۆشت دەوێ؟ بەڵێ، لەوەیە لەبەر ئەمە بێت... بیستوومە هەندێ ژن هەن، کوشتەی ئەو جۆرە ئەشق و ڤیانەن... بەڵام...

میرزادە، بێدەنگ بوو، لە فکران ڕاچوو.

ڕوگوژین، کە بەوردی سەرنجی هەر جووڵە و گۆڕانێکی دەموچاوی میرزادەی دەدا، لێی پرسی:

- بۆچی کە تەمەشای وێنەکەی بابمت کرد، بزەت هاتێ؟

- بۆچی بزەم هاتێ؟ لەبەر ئەوەیەوام وێنا دەکرد کە ئەگەر ئەم ئەشق و ڤیانە پڕ ئازارە نەبوایە، زۆر زوو وەکو بابت لێدەهات: لەم خانووەدا دەگەڵ ژنێکی گوێڕایەڵ و بێدەنگدا دەژیایت، مەگەر بەدەگمەن قسەیەکت لەزار هاتبایەتە دەرێ. متمانەت بە کەس نەدەکرد و بە پێویستت نەدەزانی متمانە بە هیچ مرۆڤێک بکەیت، بۆ خۆت کڕوکپ، مژولی کاروکاسبی و پارەپەیداکردن دەبوویت. ئەو پەڕەکەی لە ئاخرو ئۆخری تەمەنتدا، خووت دەدایە کۆنە کتێبان و دووعا و نزا و وێرد و تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەهلی تەریقەت و سونەتی

کۆن و بە دوو قامکان ئاماژەی خاچت دەکێشا*.

- ڕابوێرە! گاڵتەم پێ بکە! ئەویش ماوەیەک لەوەپێش، کە دیقەتی ئەم وێنەیەی دا، کوتومت هەمان ئەم قسانەی تۆی دەکرد. سەیرە کە هەر دووکتان هەمان بۆچوونتان هەیە!

میرزادە، بە کونجاوی پرسیی:

- چی؟ چما هاتووەتە ئێرە؟

- بەڵێ، ماوەیەکی زۆر دیقەتی ئەم وێنەیەی داو زۆری سەبارەت بە ڕەحمەتی بابم پرسیار کرد، بە تیزخەنێکی ئاشکراوە گوتی: " تۆش بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەچیتەوە سەر ئەو، وەکو ئەوت لێ دێت. پارفیون سیمیونوفیچ تۆ کۆمەڵێک کەڵکەڵە و خولیای توندڕەوانەت هەیە، ئەگەر زیرەکی خۆت نەبوایە، لەوە بوو بیگەیاندبایتە سیبریا، بیخستبایتە زندانەوە. تۆ زۆر زیرەک و هۆشیاری (ئیدی باوەڕ دەکەی یان نا، ئەوە دەقی قسەکانی ئەو بوو. یەکەم جار بوو کە قسەی وام لێ دەبیست.) ئەوجا لەسەری ڕۆیشت: "لەوە بوو هەر زوو واز لە هەموو ئەم تورەهاتانەی ئەمڕۆکەت بێنی، چونکە خوێنەواریت نییە، ئیدی دەربەست خۆت بۆ پارەپەیداکردن تەرخان دەکرد. هەنگێ وەکو بابت دەگەڵ دارو دەستە و موریدە سکوپیەکانتدا (Scoptsi) لەم ماڵەدا دەمایتەوە و لەگین بوو لە ئەنجامدا بچیتە سەر ئایینەکەی ئەوان، ئەوەندە پارە خۆشەویستی، لەگین بوو نەک دوو ملیۆن، بەڵکو دە ملیۆن ڕۆبڵ کۆ بکەیتەوە، بەڵام وێڕای هەموو سەروەت و سامانەکەت لەگین بوو، بەسەر کیسە زێڕەکانتەوە لە برسا بمریت، چونکە تۆ هەرچییەک دەکەی بەوپەڕی تاسە و تامەزرۆیی و چاوچنۆکی دەیکەیت، تۆ دیل و ئەسیری، چاوچنۆکیت "دەقاودەق، وشە بەوشە ئەوەی پێگوتم. پێشتر قەت بەو شێوەیە قسەی دەگەڵ نەکردبووم، چونکە بە زۆری باسی شتی بێبایەخ و تورەهاتی دەگەڵ دەکردم، یان تانەوتەشەری لێدەدام. ئەم جارەشیان، بە گاڵتە و توانجەوە دەستی پێ کرد، بەڵام دوایی زۆر پەست بوو. کون بە کونی ئەم ماڵە گەڕا، لەوە دەچوو لە شتێک بترسێت. پێم گوت: " هەر هەموو ئەمانە دەگۆڕم. تازەی دەکەمەوە، یان بۆ زەماوەندەکەمان خانوویەکی دیکە دەکڕم." گوتی: "نا، نا، هیچ شتێک مەگۆڕە. با بەم دەقەوە بمێنێ، حەز





دەکەم کە شووم پێ کردیت، لەلای دایکت بم." بردم بۆ لای دایکم، بە یەکترم ناساندن، بە جۆرێ ڕێزی دایکی گرتم، لە تۆ وایە دایکی خۆیەتی. دایکم دوو ساڵە نەخۆشە، مێشکی تەواو نییە، لەوەتای بابم مردووە، وەکو منداڵی لێ هاتووە. قسە ناکات، لە جێی خۆی ناجووڵێ، لاقی ئیفلیج بوون. بە جووڵەی سەر خێرهاتنی ئەوانە دەکات کە سەری دەدەن. ئەگەر نانی بۆ نەیەنن، سێ ڕۆژ لەوێ بکەوێ داوای خواردن ناکات. دەستی ڕاستی دایکم گرت، قامکەکانیم بە یەکەوە چەسپاندو گوتم: "دایکە، بە ئاماژەی خاچ، دووعای خێری بۆ بکە، دەیەوێ شوو بە من بکات." هەنگێ بەگەرمی دەستی دایکمی ڕامووسی و گوتی: "پێدەچێ دایکت ڕەنجی زۆری کێشابێ." پاشان کە ئەم کتێبەی لە سەر مێزەکە بینی، لێی پرسیم: "چییە، مێژووی ڕووسیا دەخوێنیتەوە؟" (بە خۆی جارێک لە مۆسکۆ پێی گوتبووم: "بۆچی خۆت فێری خوێنەواری ناکەیت؟ هەوڵ بدە کەمێک خۆت خوێنەوارو ڕۆشنبیر بکە، بۆ نموونە مێژووی ڕووسیا، لە دانانی سولوفییڤ بخوێنەوە، چونکە تۆ هیچ نازانیت! " و لەسەری ڕۆیشت: "زۆر چاکە. بەردەوام بە! ئەگەر ڕازی بیت، لیستێکی ئەو کتێبانەت بۆ ئامادە دەکەم کە پێویستە لە سەرەتاوە بیانخوێنیتەوە. ڕازیت؟". قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان بەو شێوەیە قسەی دەگەڵ مندا نەکردبوو. زۆرم پێ سەیر بوو... حەپەسام... بۆ یەکەم جار، توانیم لە ژیانما وەکو بەشەر هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشم.

میرزادە، بە هەستێکی ڕاستگۆیانەوە گوتی:

- پارفیون، ئەمەم پێ خۆشە، بە ڕاستی خۆشحاڵم. کێ چوزانێ؟ لەوەیە خوا پێکتان بێنێ و پێکەوە بەختەوەر ببن.

ڕوگوژین، بە هەڵچوونەوە هاواری کرد:

- هەرگیز شتی وا نابێت!

- گوێ بگرە پارفیون: ئەگەر ڕاستە و ئەوەندەت خۆش دەوێ، دەبێ کارێکی وەها بکەیت ڕێزت بگرێت. ئەگەر کاری وات کرد، دەبێ ئومێدی ئەوەشت هەبێ پێکبگەن. من تۆزێ لەمە پێش پێم گوتیت کە پێم سەیرە و بگرە نارەحەتم کە قایل بووە شوو بە تۆ بکات. هەرچەندە لە هۆی ئەم قایيل بوونەی ناگەم، بەڵام بێگومان دەبێ هۆیەکی ماقوول و قەناعەتبەخش لەئارادا

بێ، ئەو لە ئەشق و ڤیانی تۆ دڵنیایە، هەڵبەتە قەناعەتی تەواویشی هەیە کە کۆمەڵێک سوخەتی باشیشت تیایە. ئەمە جەوهەری مەسەلەکەیە و باوەڕناکەم جگە لەوە هیچی تر لە ئارادا بێ. ئەو قسەیەی کە هەنوکە کردت، خۆی لە خۆیدا نیشانە و بەڵگەی دروستی بۆچوونەکەی منە. تۆ بە خۆت دەڵێی بە زمانێکی جیاواز لە جاران دواندووتی، ڕەفتاری لەگەڵتا گۆڕاوە، بەڵام تۆ پیاوێکی خانەگومانیت، غیرە لە هەموو شتێک دەکەیت، بۆیە خراپیەکانی ئەو، زۆر گەورە دەکەیت. مەحاڵە، بۆچوونی ئەو دەرهەق بە تۆ، بەو ڕادەیە خراپ بێت کە تۆ وێنای دەکەیت. دەنا هەرگیز قایل نەدەبوو شووت پێ بکات، لە کاتێکا دەزانێت شووکردن بە تۆ، هاوتای خۆکوژییە، ماقوولە، بەئانقەست و بە پێی خۆی بەرە و مەرگ بچێت، یان لە ئاوا بخنکێنرێ یان سەر ببڕدرێ؟ ئاخر کێ بە ویست و خوایشتی خۆی بەرەو پیری مەرگ دەڕوات؟

پارفیون، بەدەم بزەیەکی تاڵەوە، گوێی لەوشە لە ڕزۆکەکانی میرزادە دەگرت. میرزادە، کە سوور بوو لەسەر بۆچوونەکەی خۆی، بە خەمینی گوتی:

- پارفیون، ئەوە چیتە، بۆچی بەم خەمینی و شپرزەییە تەمەشام دەکەیت!

ڕوگوژین، ئەنجام هاتە قسان:

- لە ئاوا بخنکێنرێ یان بێتە سەر بڕین! ها... گوایە بۆیە شوو بە من دەکات تا بەدەستی من بێتە سەربڕین! نا....ماقوولە میرزادە، تا ئێستا پەیت بە جەوهەر و کرۆکی مەسەلەکە نەبردبێت؟

- لە مەبەستت تێناگەم.

- لەگینە لێم تێنەگەیت!... بۆیە خەڵکانێک سەبارەت بە تۆ دەڵێن کە بڕێک کۆرفامە...! ناستاسیا کەسێکی دیکەی خۆش دەوێ. تێدەگەی؟ ڕێک وەکو چۆن من خۆشم دەوێ، ئەویش بەو ئاوایە پیاوێکی دیکەی خۆش دەوێ. دەزانی ئەو پیاوە کێیە؟ "تۆی"! چی؟ نەتدەزانی؟

- من؟

- بەڵێ، تۆ. لە ئاهەنگی ساڵیادی لە دایکبوونەکەیدا، حەزی لێ کردیت، بەڵام دەزانێت، مەحاڵە بتوانێ شوو بە تۆ بکات، چونکە دەزانێت ئەگەر شوو بە تۆ بکات دەبێتە مایەی ناوزڕانت، ژیانت وێران دەبێت. بە خۆی دەڵێت: "هەموو خەڵکی دەزانن من چ ژنێکم." بێپەردە ئەو قسەیە دەکات، ڕووبەڕوو، بێ هیچ





لە ڕووداماتێک، بە ئاشکرا بە خۆمی گوتووە، کە حەز ناکات ببێت بە مایەی ناوزڕانی تۆ و وێرانکردنی ژیانت، بەڵام سەبارەت بە من، من گرینگ نیم، چاوم دەرەهات، دەتوانێ شووم پێ بکات، من ئەوەم لەلای ئەو، ئەوە قەدری منە لەلای ئەو، ئەمەت لە بیر بێت!

- ئەگەر وایە چۆن وەختێ کە لە تۆ هەڵات و هاتە لای من، دوایی لە منیش هەڵات تا...

- تا بگەڕێتەوە بۆ لای من؟ ها.... چما پیاو هەیە بزانێ چ خەیاڵێکی لە مێشکدایە، نیازی چییە؟ هەر دەمەی لەسەر ئەقڵێکە، دەڵێی تووشی هیستریا بووە، ڕۆژێ دێ پێم دەڵێت: "هەرچەندە شووکردنم بە تۆ وەکو ئەوەیە خۆم بخەمە ڕووبارەوە، بەڵام پەلە بکە، با زەماوەندەکەمان بکەین!" بەهەشتاو دەڕوات خۆی ئامادە دەکات، ڕۆژی زەماوەندەکە دیاری دەکات... هەر کە وەختەکە نزیک دەبێتەوە، گێچی هیستریاکەی بەرز دەبێتەوە یان خەیاڵێکی دیکەی بە مێشکا دێت، مەگەر هەر خوا سەری لێ دەر بکات! بە خۆت دیتووتە کە دەگری، پێدەکەنێ، وەکو شێت دێ و دەچێت. بۆیە هیچ سەیر نییە کە لە دەستی تۆش هەڵێت! بۆیە لای تۆ نەمایەوە، چونکە دەیزانی چەندی خۆش دەوێی، تەحەمولی ئەو خۆشەویستییەی خۆی نەدەکرد. تۆ تۆزێ لەمە پێش گوتت کە من لە مۆسکۆ دۆزیومەتەوە. ئەمە ڕاست نییە. بەڵکو خۆی لە تۆ هەڵاتبوو، بەهەشتاو هات بۆ لای من و گوتی: "ڕۆژی زەماوەندەکە دیاری بکە، من ئامادەم. دەی شامپانیا بێنە با بخۆینەوە و بڕۆین گوێ لە گۆرانی کێوەلی و قەرەجان بگرین!" ئەگەر من نەبوایەم، لەمێژبوو خۆی خستبووە ڕووبارەوە، ئەمە ڕاستی مەسەلەکەیە، بۆیە ئەمەی نەکردووە، چونکە من لە مەرگیش کوشندەترم. لە ڕووی ڕق و کینەوە شووم پێ دەکات، باوەڕبکە ئەگەر شووم پێ بکات، لە ڕقا دەیکات. بە جۆرە تۆڵەیەکی دەزانێت.

میرزادە هاواری کرد:

- ئەدی تۆ چۆن ڕازی دەبی کە.... چۆن...

بەڵام قسەکەی تەواو نەکرد، بە ترسەوە دەیڕوانییە ڕوگوژین.

ڕوگوژین، بەدەم ژارخەنێکەوە لێی پرسی:

- بۆچی، پرسیارەکەت تەواو ناکەی؟ حەز دەکەی پێت بڵێم هەنوکە بیر لە

چی دەکەیتەوە؟ تۆ لە دڵی خۆتا دەڵێی: "چۆن دەتوانێ شووی پێ بکات؟ ئاخر شتی وا چۆن دەبێت؟" من دەزانم کە تۆ وا بیر دەکەیتەوە...

- پارفیون، بۆتی دووپات دەکەمەوە کە من بەو مەبەستە بۆ ئێرە نەهاتووم، بیری واشم لە مێشکدا نەبووە.

- دەشێت بەو مەبەستە نەهاتبی. دەشێت لە سەرەتاوە ئەو بیرەت لە مێشکا نەبووبێ، بەڵام گومان لەوەدا نییە، کە نهوو ئەو بیرەت لە مێشکدایە. بەسە، پێویست بە گەنگەشە ناکات! بۆچی وا شڵەژایت؟ ماقوولە، پێشتر بەمەت نەزانی بێت؟ بە ڕاستی پێم سەیرە!

میرزادە، بەوپەڕی هەڵچوونەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

- پارفیون، ئەوە هەر هەمووی زادەی غیرەیە! غیرە لە لای تۆ بووە بە نەخۆشی... تۆ موبالەغە دەکەی، بێ ئینسافی باش نییە... ئەمە چییە، چی دەکات لێرە؟

پارفیون، بە لەز ئەو کێردەی لە دەست میرزادە سەند کە لە سەر مێزەکە، هەڵی گرتبوو، کێردەکەی لە دەست سەند و لەسەر مێزەکە، لە نزیکی کتێبێکەوە دای نایەوە و گوتی:

- واز لەمە بێنە!

میرزادە، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

- کە گەیشتمە پترسبۆرگ، هەموو ئەمانەم لە بەرچاو بوو، وەک بڵێی دڵم خەبەری دابوو... حەزم نەدەکرد بێم... دەمویست هەموو پەیوەندییەکانی خۆم دەگەڵ ئەم شارەدا فەرامۆش بکەم، هەموو یادگارییەکان لە مێشکی خۆم دەربکەم. هەر هەمووی لە دڵی خۆدا ڕیشەکێش بکەم! دەیسا من دەڕۆم، بە خوات دەسپێرم!... بەڵام ئەمە چی دەکات لای تۆ؟ ئەمەت بۆ چییە؟

تومەز، میرزادە، جارێکی دی، بەدەم قسەکردنەوە، بە بێ ویستی خۆی، کێردەکەی هەڵگرتبوو، ڕوگوژین بۆ جاری دووەم کێردەکەی لە دەستی ڕاپسکاند و هەڵی دایە سەر مێزەکە. کێردەکە، کێردێکی ئاسایی بوو، دەسکەکەی لە شاخی کەڵەکێوی بوو، دەمەکەی نزیکەی پازدە سانتیی مەتر دەبوو، پانییەکەشی هاوتەرازی درێژییەکەی بوو.

ڕوگوژین، کە بینیی، میرزادە زۆر بەوە تێک چوو کە دوو جار کێردەکەی





لە دەستی سەندەوە، بە تورەیی کێردەکەی نایە دوو توێی کتێبەکە، کتێبەکەی تووڕ دایە سەر مێزێکی دی.

میرزادە، کە لە فکران ڕاچووبوو، بەسەرسامی پرسیی:

- ئەم کێردە بۆ کاغەزبڕین بە کار دێنی!

- بەڵێ...

- بەڵام ئەم کێردە هی باخ بڕینە.

- بەڵێ وایە... چما ناکرێ بۆ کاغەز بڕینیش بەکار بێت؟

- بەڵام ئەمە، زۆر تازەیە.

ڕوگوژین، بەوپەڕی تورەیی، کە لەگەڵ هەر وشەیەکی میرزادەدا، تورەتر دەبوو، هاواری کرد!

- چ قەیدییە؟ یانی ناتوانم ئەگەر حەزبکەم، کێردێکی نوێ بکڕم؟

میرزادە، کە چاوی بڕیبووە ڕوگوژین، ڕاچڵەکی. لێ زوو بە زوو وەخۆ هاتەوە و بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- ئەوە چیمانە؟ بۆ دەبێ بەو شێوەیە یەکدی بدوێنین؟

بمبورە گیانەکەم، من کە سەرم وەکو ئێستا قورس دەبێت و ئیدی حەواسم بە جارێ پەرت دەبێ و خەیاڵم دەڕوات. ئەلهەقی بە هیچ جۆرێ نیازی ئەو پرسیارەم نەبوو. خەیاڵم ڕۆیشت و ئەو پرسیارەم لەبیر چوو کە دەمویست بیکەم، بەهەرحاڵ بە خوات دەسپێرم.

ڕوگوژین گوتی:

- لەم ڕێگەیەوە مەڕۆ.

- بیرم چووەوە!

- بە دوای منا وەرە! ڕێگاکەت نیشان دەدەم!

پەراوێز:

* - "Scopets":واتە خەسیو، ئەمانە فیرقەیەکی ئایینی بوون، کە ئەندامەکانیان لە ڕووی تەعەسوبەوە خۆیان دەخەساند، بە زۆری کاری سەڕافییان دەکرد.

* - "بۆرژوای فەخری بە میرات...": زۆربەی هەرە زۆری بازرگانان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، جووتیار بوون و لە ڕێگەی بازرگانییەوە دەوڵەمەند بووبوون. جا ئەوانەی کە ئابوونەی ئەندامیەتیی چینی بازرگانیان نەدەدا، دەهاتنەوە خوارێ بۆ چینی جووتیار و دێهاتی. ئیدی یاسادانەر بۆ چارەسەری ئەم هەستە چینایەتییەی کە لە مەیدانی بازرگانیدا پەیدا بووبوو، دوو چینی لەوانەی ئابوونە و باجیان نەدەدا دامەزراند بە ناوی: "چینی بۆرژوای کرێکار" و "چینی بۆرژوای فەخری بە میرات."

* - "سولۆڤییف...": ناوی سیرگی میخائیلوفیچ سولوڤییفە (١٨١٠- ١٨٧٩) کە لە مێژوونووسە گەورەکانی ڕووسیایە، گەورەترین کاری "مێژووی ڕووسیا"یە کە بە ٢٩ بەرگ لەنێوان سالانی ١٨٥١- ١٨٧٩ واتە هەر ساڵەی بەرگێک بلاو بووەوە و لە ساڵی ١٨٩٧دا لە حەوت بەرگدا چاپ کرایەوە. دۆستویفسکی زۆر دڵبەندی ئەم کتێبە بوو، کە لە ساڵی ١٨٦٧دا سەفەری هەندەرانی کرد، چەند بەرگێکی کتێبی ناڤبری دەگەڵ خۆیدا برد.

* - "موریدانی تەریقەتی کۆن..": مەزەبی "ڕاسکولنیک"یشی پێدەگوترێت، ئەمە مەزەبی باوەڕدارانی کۆن و سونەتییە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەو دووبەرەکییە ئایینییەی کە لەپاش ڕیفورمە ئایینیەکانی پەتریارک نیکوندا ڕووی دا.

* - "لەجیاتیی ئەسپ، زین لە مانگا بکرێت...": یەکێکە لە قسە باوەکانی ڕووس.

* - "پاپایەک لە ئیمپراتۆرێک...": ئاماژەیە بۆ هنری چوارەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا کە هاتبوو بۆ داوای بوردن و کەفارە لە پاپا گریگۆری حەوتەم، لە ساڵی ١٠٧٧دا.

* - "بە دوو قامکان ئاماژەی خاچت دەکێشا..": ئەوە شێوازی "باوەڕدارانی کۆن" بوو لە خاچ کێشاندا.

## فەسڵی چوارەم

بە هەمان ئەو ژووانەدا تێپەڕین کە میرزادە لێی انەوە هاتبووە ژوورەوە. ڕوگوژین، لە پێشییەوە دەڕۆیشت و خۆیان بە هۆڵە گەورەکەی میواندا کرد، کە تابلۆی جۆراوجۆر بە دیوارەکانیەوە هەڵواسرا بوو، هەر هەمووی وێنە مەترانان و دیمەنێن سروشتی تێکەڵ و پێکەڵ بوون و پیاو سەری لێ دەر نەدەکردن. تابلۆیەکی سەیر بە سەرووی ئەو دەرگایەوە هەڵواسرابوو کە بەسەر ژوورێکی دیدا دەکرایەوە. تابلۆیەکی سەیر بوو، درێژییەکەی دوو مەترو پانییەکەی هەر سی سانت دەبوو. ئەمەوێنەی عیسا مەسیحی فریاڕەس بوو، لە کاتی هێنانە خوارەوەی لەسەر خاچەکە.

میرزادە، نیگایەکی بلەزی وێنەکەی کرد، دەتگوت شتێکی بیر کەوتەوە، بەڵام نەوەستا، حەزی دەکرد لە دەرگاکە وەدەر بکەوێت. دڵی تەنگ بوو، خوا خوای بوو زووتر لەو ماڵە وەدەر کەوێ، لێ ڕوگوژین، لەناکاو لە بەردەم تابلۆکەوەستا و گوتی:

- هەر هەموو ئەم تابلۆیانەی کە دەیانبینی بابی ڕەحمەتیم لە هەڕاجە بازاڕدا یەکی بە یەک-دوو ڕۆبڵی کڕیون. هیوایەتی ئەم شتانە بوو. پیاوێکی پسپۆڕ تەمەشای کردن، گوتی: هیچیان ئەسڵ نین و گشتیان بێبایەخن، تەنیا ئەم تابلۆیەی سەرووی دەرگاکەی بەگەن کرد، کە بابم ئەویشی بە دوو ڕۆبڵ کڕی بوو...

جارێکیان، پێش ئەوەی بابم بمرێت، کابرایەکی لێپەیدا بوو سێ سەد و

پەنجا ڕۆبڵی دایە. ئیڤان دمتریچ سافلیوف، کە بازرگانێکی دەوڵەمەند و هونەردۆستە، جارێکیان چوار سەد ڕۆبڵی دایە. هەفتەی ڕابردوو بە سیمون سیمونوفیچی برامی گوتبوو کە پێنج سەد ڕۆبڵی دەداتێ، بەڵام من ڕەفزم کرد و لێبڕاوم بۆ خۆمی هەڵبگرم.

میرزادە، ئەمەی بە هەل زانی، بە دیقەت لە تابلۆکە ورد بووەوە، گوتی:

- بەڵام... بەڵام ئەم تابلۆیە تەقلیدی تابلۆکەی هانس هولبینە*، هەرچەندە من لەم بوارەدا شارەزاییەکی تەواوم نییە، بەڵام دەتوانم بڵێم لاساییکردنەوەیەکی زۆر عالە. جارێک لە هەندەران، نوسخە ئەسڵەکەی ئەم تابلۆیەم دیتووە و قەت لە بیرم ناچێتەوە، بەڵام چی... ئەوە چیتە؟

ڕوگوژین، لەناکاو تابلۆکەی جێ هێشت و کەوتە ڕێ، هەڵبەتە ئەم ڕەفتارە زادەی، ئەو گۆڕانە کوتوپڕە بوو کە سەرو دڵی ڕوگوژینی گرت. میرزادە، سەری لەوە سووڕ ما کە ڕوگوژین چۆن لەناکاودا، ئەو قسەیەی بڕی کە خۆی دای مەزراند بوو و تەنانەت، وەڵامی پرسیارەکەی ئەویشی پشتگوێ خست. ئەمەی پێ سەیر بوو.

ڕوگوژین، دوای چەند هەنگاوێک، لەناکاودا لە میرزادەی پرسی:

- ئەرێ لیون نیکولایوفیچ... دەمێ بوو دەمویست ئەم پرسیارەت لێ بکەم: تۆ باوەڕت بە یەزدان هەیە یان نا؟

میرزادە، بێ هیچ هەڵوەستەیەک گوتی:

- چ پرسیارێکی سەیرە... تەمەشاکردنەکەت غەریبە!

ڕوگوژین، کەمێک بێدەنگ بوو، لە تۆ وایە پرسیارەکەی خۆی فەرامۆش کرد، ئەوسا لەژێر لێوانەوە گوتی:

- حەز دەکەم سەیری ئەو وێنەیە بکەم.

میرزادە، بەدەم بیرۆکەیەکی کوتوپڕەوە هەڵی دایە و گوتی:

- ئەو وێنەیە؟ ئەو وێنەیە؟ ئەو وێنەیە لەگینە باوەڕی هەندێ کەس سەلب بکات!

ڕوگوژین، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، قسەکەی میرزادەی سەلماند:

- ڕاستە... باوەڕی پیاو سەلب دەکات! ...





هەنوکە گەیشتبوونە بەر دەرگای دەرەوە. میرزادە لەپڕ وەستا و گوتی:

- چۆن؟ من گاڵتەم کرد، کەچی تۆ قسەکەت زۆر بەهەند گرتووم! بۆچی پرسیت کە ئایا باوەڕم بە یەزدان هەیە یان نا؟

- هەر وا... بێ مەبەست.. لەمێژبوو دەمویست ئەو پرسیارەت لێ بکەم. لەم ڕۆژگارەدا زۆر کەس هەن کە باوەڕیان بەخوا نییە. تۆ لە هەندەران ژیاوی. دنیات زیاتر دیتووە. ڕاستە، وەکو جارێک کابرایەکی مەست پێی گوتم، گوایە ژمارەی ئەو کەسانەی لێرە، واتا لە ڕووسیا، باوەڕیان بە خوا نییە، لە هەموو وڵاتێکی دی زیاترن؟ ئەو کابرا مەستە پێی گوتم: "خوانەناسی بۆ ئێمە ئاسانترە لە خەڵکی تر، چونکە ئێمە لەوان پێشکەوتووترین...

ڕوگوژین، ژارخەنێکی بۆ کرد، هەرکە کۆتایی بە پرسیارەکەی هێنا، لەپڕ دەستی خستە سەر دەسکی دەرگاکە، دەرگاکەی کردەوە و چاوەڕوانی کرد تا میرزادە لە پێش ئەوەوە وەدەربکەوێ. میرزادە سەری سووڕ ما، بەڵام پێش ئەو کەوت، ڕوگوژین، تا بەر قاڵدرمەکان دوای کەوت، دەرگاکەی بە نیمچە داخراوی هێشتەوە. ئێستا هەر دووکیان ڕووبەڕووی یەکدی وەستابوون و زەق زەق دەیانڕوانییە یەکدی، لەوە دەچوو نەزانن چیبکەن.

میرزادە، دەستی ڕوگوژینی گوشی و گوتی:

- دەی، خوا حافیز!

ڕوگوژین، بە توندی و بە شێوەیەکی میکانیکی دەستی میرزادەی گوشی و گوتی:

- خوات لەگەڵ!

میرزادە، هەنگاوێکی نا، ئەوجا ئاوڕی لە ڕوگوژین دایەوە و کەوتەوە قسەکردن دەگەڵیا. خویا بوو کە نایەوێ ڕوگوژین بەو حاڵەوە جێ بێڵێ. ئەمە جگە لەوەی کە یادەوەرییەکی کوتوپڕیشی بیر کەوتەوە، بۆیە ئاوڕێکی لێ دایەوە و بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- سەبارەت بە باوەڕ، لە بیرمە هەفتەی ڕابردوو، لە ماوەی دوو ڕۆژا، تووشی چوار گەنگەشەی جیاوازی لەو جۆرە بووم. بەیانییەک، لە



## گەمژە

سەفەرێکما بە هێڵێکی تازەی خەتی شەمەندەفەر، لە قیتارا بووم بە هاوڕێی (س...)* ناوێک، چوار دانە سەعاتی ڕێک گەنگەشە و موناقەشەمان کرد. پێشتر زۆر شتم دەربارەی بیستبوو و بۆم دەرکەوتبوو کە پیاوێکی خوانەناسە. بە ڕاستی پیاوێکی ڕۆشنبیر و زانا بوو، زۆرم پێخۆش بوو کە دەرفەتی موناقەشە و گەنگەشەم دەگەڵ ڕۆشنبیر و زانایەکی وا گەورەدا بۆ هەڵکەوتبوو. بە تایبەتی کە پیاوێکی بە ڕێز و زۆر بە نەزاکەت بوو، بە جۆرێ قسەی دەگەڵ مندا دەکرد، وەکو ئەوەی، لە زانست و پڕ زانیاریدا هاوتای خۆی بم. ئەم پیاوە باوەڕی بە خوا نەبوو، بەڵام ئەوەی بە درێژایی گەنگەشەکەمان مایەی سەرنج بوو، ئەوە بوو لە گەنگەشەکەماندا، خۆی لە جەوهەری مەسەلەکە نەدەدا، لەوەش سەیرتر، ئەوەبوو هەموو ئەو خوانەناسانەی پێشتر دیتبوومن، یان ئەو کتێبانەی لەو بارەیەوە خوێندبوومنەوە لەوە دەچوون خۆ لە قەرەی جەوهەری مەسەلەکە نەدەن، تەنیا بە دەوری ڕواڵەتی مەسەلەکەدا دەسووڕانەوە. ویستم ئەم سەرنجەی خۆم بە هاوسەفەرەکەم بگەیەنم، بەڵام لەوە دەچوو نەمتوانی بێ بۆی ڕوون بکەمەوە، یان نەمتوانی بێ مەبەستەکەمی لێ بگەیەنم، چونکە کەم و زۆر لێم حاڵی نەبوو...

هەمان ئێوارە، لە میوانخانەیەکی چکۆلەی شارۆچکەیەک لامدا. باس، باسی ئەوە بوو کە دوێ شەو، لە هەمان میوانخانەدا، تاوانێک ڕووی دابوو، دەیانگێڕایەوە گوایە دوو دێهاتی، میانساڵ، ڕێکوپێک، دۆستی کۆنی یەکدی، دوای ئەوەی پێکەوە نان و چایان خوارد بوو، ژوورێکیان بە کرێ گرتبوو و چووبوون بخەون. یەکێکیان، دوو ڕۆژ بوو، سەعاتێکی بەر باخەڵی زیوی، زنجیر زەردی مرواری داری بە هاوڕێکەی بینیبوو. پێشتر ئەم سەعاتەی بە هاوڕێکەی نەبینیبوو. ئەم پیاوە نەک هەر دز نەبوو، بەڵکو پیاوێکی زۆر سەر ڕاست و دەستپاک و ئەمینیش بوو، لە چاو دێهاتی و جووتیارانی دیکەشدا هەژار و نەدار نەبوو. کەچی بە جۆرێ تەماحی چووە ئەم سەعاتە کە خۆی پێ نەدەگیرا. هەرکە بینی هاوڕێکەی پشتی کردە ئەو، هەڵی کێشایە چەقۆ و لە پشتەوە و بە پارێزەوە بۆی چوو، قەراری خۆی

دا، چاوی بڕییە ئاسمان و هێمای خاچی کێشا، لە بن لێوانەوە و بە کوڵ کەوتە دووعا و نزا: "خودایا، بمبورە، خودایا بە مەسیحم ببەخشە!" هەنگێ هاوڕێکەی وەکو بەرخ گۆشاوگۆش سەر بڕی و سەعاتەکەی نایە تەنکەی باخەڵی.

ڕوگوژین، لە قاقای پێکەنینێکی ئەوتۆی دا، لە تۆ وایە تووشی هیستریا بووە. ئەم پێکەنینەی لەکوێ و ئەو پەستیەی تۆزێ لەوە پێشی لەکوێ! بە ڕاستی سەیر بوو. بە دەنگێکی لە ڕزۆک و بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- خۆشە! یەکێک لە بنی باوەڕی بە خودا نییە و یەکێکی دی ئەوەندە بەدینە، کە بەدەم دووعا و نزاوە خەڵکی سەر دەبڕێ... نا، میرزادە، نا براکەم، ئەمە شتێک نییە لە هیچە دروست بکرێت، ئا.. ئا..! نا، نا، ئەمە جوانترین شتە کە بە عەمراتم بیستبێتم!...

هەرکە ڕوگوژین تۆزێک هێور بووەوە، ئەگەرچی هێشتا شوێنەواری پێکەنین بە سەر لێوییەوە مابوو، میرزادە لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

- بەیانی لە خەو ڕابووم، چووم بۆ ناو شار تا کەمێک بگەڕێم. سەربازێکی مەستم بینی، کە بە لارەلار بەسەر شۆستە تەختە فەرەشەکەدا دەڕۆیشت، سەراپای لە قوڕا هەڵکشا بوو. لێم هاتە پێشێ و گوتی: "قوربان، ئەم خاچەم لێ دەکڕیت، زیوە، بیست کۆپیکم بدەیە و هەڵی بگرە". خاچێکی بە دەستەوە بوو، کە کردبووی بە نەوارێکی کۆنەوە، دیار بوو تازە لە ملی خۆی داکەندبوو، بەڵام بە چاو دیار بوو کە خاچەکە لە قەڵایی (قصدیر) دروست کرابوو. خاچێکی گەورەی هەشت چوکڵە بوو کە لەسەر شێوازی ڕۆمی ڕۆژهەڵاتی " بیزەنتی " دروست کرا بوو. دراوێکی بیست کۆپیکیم لە بەرکم دەر هێنا و دام بە یارۆی سەرخۆش، هەر لەوێ خاچەکەم لە ملم کرد. بە سەروسیمایدا بۆم دەر کەوت کە زۆر خۆشحاڵە بەوەی ڕێبوارێکی ساویلکەی خەڵەتاندووە! یەکسەر ڕۆیی تا بە پارەی خاچەکەی مەشروب بخواتەوە! هەڵبەتە هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو! هەر شتێکم لە ڕووسیادا دەبینی کارێکی زۆری لە دڵ و دەروونم دەکرد. پێشان هیچم دەربارەی وڵاتەکەم، ڕووسیا نەدەزانی، چونکە لەوپەڕی غەفڵەتدا گەورە بووبووم و

ژیا بووم. خۆ لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەشدا کە لە هەندەران بووم، تەنیا هەندێ یادەوەریی خەیاڵیم دەربارەی ڕووسیا لە لا بوو. بەدەم ڕێکردنەوە، لە دڵی خۆدا دەمگوت: نا، نابێ پەلە بکەم و ئەم مەسیحفرۆشە مەحکوم بکەم. مەگەر هەر خوا بزانێ دڵی لاوازی ئەو مەست و سەرخۆشانە چیی تیایە!" دوای سەعاتێک، کە بۆ میوانخانەکە دەگەڕامەوە، تووشی ژنە دێهاتییەک بووم کە منداڵێکی ساوای بە باوەشەوە بوو. ژنەکە هێشتا گەنج بوو، ساواکەی باوەشیشی هەر مانگ و نیوێک دەبوو. منداڵەکە، لەوساوە کە لەدایک بووبوو، ئەمە یەکەم جاری بوو، کە بۆ دایکی دەگرژییەوە. ژنەی تاین لەناکاودا، بەوپەڕی ئیمانداریییەوە هێمای خاچی کێشا. لێم پرسی (ئەوسا هەمیشە پرسیارم لە خەڵکی دەکرد) بۆچی ئاماژەی خاچت کێشا خانم گیان؟ وەڵامی دامەوە و گوتی: "وەکو چۆن یەکەم بزەی ساوایەک، شادی و لەزەت بە دایکی دەبەخشێت، خواوەندیش کاتێ لە عەرشی باڵای خۆیەوە، دەڕوانێ و سەیر دەکات گوناهکارێکی پەشیمان، ڕاستگۆیانە و لە ناخی دڵەوە ڕوو دەکاتە ئەوو دووعا و نزا دەکات و لەبەری دەپاڕێتەوە، خواوەندیش بەو ئاوایە شاد دەبێ و لەزەت دەبینێ." ئەمە تەقریبەن دەقی ئەو قسانەیە کە ئەو ژنە ساویلکە دێهاتیە بە منی گوت. تۆ بزانە چەند بە زمانێکی ناسک، چەند بە ڕوونی و ڕەوانی، چەند ڕاستگۆیانە گوزارشتی لە جەوهەر و ڕوحی هەموو ئایینی مەسیحایی کردووە، بە ئاشکرا دەڵێت کە خواوەند بابی هەمووومانە، دڵخۆشیی خوا بە مرۆڤ، وەکو دڵخۆشیی باوکە بە منداڵەکەی! کە ئەمە هزرو ئەندێشەی ڕەسەنی مەسیحاییە! جا بیهێنە بەرچاوی خۆت کە ئەمە قسەی ژنێکی دێهاتی سادەیە. هەڵبەتە ئەو ژنە دایک بوو. کێ دەزانێ لەوەیە ژنی هەمان سەرباز بووبێ کە بۆم باسکردیت. گوێ بگرە پارفیون، تۆ کەمێک لەمە پێش پرسیاری ئەمەت لێ کردم، فەرموو ئەمەوەڵامی منە: جەوهەر و کرۆکی هەستی ئایینی لە گشت بیرکرنەوەیەک، لە هەموو کارێکی خراپ، لە گشت تاوانکاری و هەمووم ڕێچکە و ڕێبازێکی خوانەناسی بەدەرە. ئەم هەست و سۆزە، ڕازو نهێنییەکی تێدایە کە قەت بە بەڵگە و بۆچوونی خوانەناسان نایەتە کەشف

کردن و هەتا هەتایەش هەر بەو جۆرە و بەسەر مۆری دەمێنێتەوە، من گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتە. یەکێک لەو قەناعەتانەی کە دوای گەڕانەوەم بۆ ڕووسیا، لام پەیدا بووە، ئەمەیە. پارفیون، زۆر کار هەیە دەبێ بکرێ، باوەڕبکە زۆر کار هەیە دەبێ لەوڵاتەکەماندا، لە ڕووسیادا بکرێت! بیری خۆتی بێنەوە کە وەختێ لە مۆسکۆ بووین چۆن دیدار و گفتوگۆمان دەکرد... من هەرگیز حەزم نە دەکرد بۆ ئێرە بگەڕێمەوە. هەرگیز وێنام نەدەکرد تۆ لێرە ببینم و بەم شێوەیە ڕووبەڕووی یەکتر ببینەوە. بەهەرحاڵ ئەوەی چوو چوو. خودا حافیز، ئەسپاردەی یەزدان بیت!...

میرزادە ئەوەی گوت و وەر چەرخا و بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا. کە گەیشتە حەوشۆکەکەی ژێر قاڵدرمەکان، پارفیون لەسەرێ ڕا گازی کرد:

– لیون نیکولایوفیچ! ئێستا ئەو خاچەت پێیە کە لە سەربازەکەت کڕی؟

میرزادە، وەستاو گوتی:

– بەڵێ، پێمە.

– پیشانمی بدە.

میرزادە، ئەو داوایەی پێ سەیر بوو، بۆ چەند ساتێک، دوو دڵ، وەستا. هەنگێ بە قاڵدرمەکاندا سەر کەوت، خاچەکەی لەژێر کراسەکەیەوە، بە بێ ئەوەی لە ملی دابکەنێ، دەرهێنا. ڕوگوژین گوتی:

– ئەم خاچە بدە بە من.

– بۆچی؟ تۆ...

– من ئەوەی تۆ لە مل دەکەم و تۆش ئەوەی من لە مل بکە...

– دەتەوێ خاچەکانمان بگۆڕینەوە*؟ بە دڵی تۆ! پێم خۆشە. دەبین بە برا.

میرزادە، خاچە قەڵایەکەی داکەند و ڕوگوژین خاچە زێڕەکەی داکەند و گۆڕیانەوە. پارفیون، مات و بێدەنگ بوو. میرزادە نەک هەر پێی سەیر بوو بەڵکو زۆریشی لەبەر گرانبوو کە بینی، برا ئاییینیەکەی، هێشتا هەر پەست و تووڕە و بەگومانە و بزە تاڵ و توانج ئامێزەکەی نەڕەویوەتەوە و بەلای کەمەوە ناو بە ناو خۆی دەنوێنێ. ڕوگوژین ئەنجام، بە بێدەنگی دەستی





میرزادەی گرت، ماوەیەک بە بێ جۆڵە، وەکو ئەوەی نەتوانێ بڕیار بدات، لە جێی خۆی وەستا. ئەنجام بەگەڵ خۆی خست و بەئەسپایی و لە بن لێوانەوە پێی گوت: "وەرە". بە حەوشۆکەکەی قاتی خوارەوەدا تێپەڕین، لە زەنگی دەرگایەکی بەرانبەر دەرگای چوونە دەرەوەیان دا، پیرەژنێکی قەمووری ڕەش پۆش کە سەرپۆشێکی بە سەرا دابوو، بلەز دەرگای کردەوە، کە ڕوگوژینی بینی، بە بێ هیچ قسەیەک کڕنۆشی بۆ برد. ڕوگوژین بەپەلە چەند پرسیارێکی لێکرد، بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بکات، میرزادەی بردە ژوورەوە. جارێکی دی بە چەند ژوورێکدا تێپەڕین، ژوورەکان تاریک بوون، کەلوپەلی ناوماڵیان کەم تیا بوو، مێز و کورسییەکان پەردەی سپییان پێدا درابوو. ڕوگوژین، بە بێ هیچ پرسێک، یەکسەر میرزادەی بردە ژوورێکی چکۆلەوە کە زیاتر لە هۆڵی پێشوازی دەچوو، بە تەختەیەکی یەجگار لووس ناوبڕێکی بۆ کرابوو، دوو دەرگای بچووک لەم سەر و لەو سەری ناو بڕەکە هەبوون، لەو دیو ناو بڕەکەوە ژوورێک هەبوو، پێدەچوو ژووری نووستن بێت. لە سوچێکی هۆڵەکەدا، لە نزیکی موغەیریەکدا، پیرەژنێکی ئەندام وردیلە لەسەر قەنەفەیەک دانیشتبوو. لەوە نە دەچوو زۆر پیربێت، بەڵام قژی بە تەواوەتی سپی بووبوو، هەر کەسێک دیتبای، لە یەکەم نیگادا هەستی دەکرد، کە لە ڕووی ئەقڵییەوە بووەتەوە بە منداڵ. جلێکی خوری ڕەشی لەبەر بوو، مل پێچێکی ڕەشی لە گەردنی ئاڵاند بوو، کڵاوێکی زۆر سپی لەسەر کردبوو و کە خەت خەتی باریکی ڕەشی تیا بوو. هەر دوو پێی لەسەر تەپڵەکێکی چکۆلەی نزم دانا بوو. لە تەنیشت ئەوەوە پیرەژنێکی لەو پیرتر دانیشتبوو، یەجگار پاک و تەمیز بوو، ئەویش جلوبەرگی تازیەباری لەبەرو کڵاوێکی سپی لەسەر بوو. پێدەچوو خزمێکی هەژارو بێنەوای پیرەژنی یەکەم بێ. بە کڕی و کپی گۆرەویی دەچنی. وا دەهاتە بەرچاو کە ئەم دوو ژنە، هەر وا بێدەنگ بن و قەت زار هەڵنەیەنن. پیرەژنی یەکەم، کە ڕوگوژین و میرزادەی بینی بە ڕوویانەوە پێکەنی، چەند جارێک بە نیشانەی خێرهاتن سەری ڕێزی بۆ دانەواندن.

ڕوگوژین، دەستی ڕامووسی و ئەوسا گوتی:

– دایکە، ئەم پیاوە هاوڕێی بەڕێزم میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکینە. خاچەکانمان گۆڕیوەتەوە. لە مۆسکۆدا بۆ من لە برایەکی ڕاستەقینە باشتر بوو، چاکەیەکی زۆری بەسەرمەوە هەیە. دایکەوەکو کوڕێکی خۆت دووعای خێری بۆ بکە، پیرۆزی بکە. سەبر بکە دایکە، با من یارمەتیت بدەم، قامکەکانت بێنمەوە یەک تا بتوانی ئاماژەی خاچ بکێشی.

بەڵام پێش ئەوەی ڕوگوژین فریا بکەوێ، پیرەژن، سێ قامکی جووت کردن و، بەوپەڕی ئیمانداری و خواناسییەوە، سێ جاری یەک لەدوای یەک، ئاماژەی خاچی بە دەوری سەری میرزادەدا کێشا. ئەوسا، جارێکی دیکە و بەوپەڕی میهرو سۆزەوە، بەوپەڕی هێمنی سەری ڕێزو خۆشەویستی بۆ دانەواند.

پارفیون گوتی:

– دەی لیون نیکولایوفیچ با بڕۆین، هەر بۆ ئەمە تۆم بۆ ئێرە هێنا....

کە گەیشتنەوە حەوشۆکەکەی بەرقالدرمەکان، جارێکی دی بە میرزادەی گوت:

– هەرچییەکی پێ بڵێی تێناگات، هەڵبەتە کەم و زۆر لە قسەکەی من نەگەیی، کەچی وێرای ئەوەش پیرۆزی کردیت. یانی بە خۆی و بەخوایشت و حەزی خۆی ئەو کارەی کرد... دەیسا کاتی خوا حافیزی هاتووە... ئەسپاردەی خوا بی....

ڕوگوژین، بەدەم ئەو قسەیەوە دەرگاکەی کردەوە. میرزادە نیگایەکی ناسکی گلەیی ئامێزی کرد و گوتی:

– ماڵ خراپ، با بەلای کەمەوە بەر لەوەی بڕۆم، دەستت لە ملی بکەم.

میرزادە، ویستی باوەشی بکات، بەڵام پارفیون بەئاستەم باسکی کردنەوە و زوو دایگرتنەوە نەیدەتوانی بڕیاری خۆی بدات. ڕووی وەرگێڕا تا میرزادە نەبینێ، لە تۆ وایە خۆی لە نیگای میرزادە دەپارێزێ، حەز ناکات لە باوەشی بکات. لە بن لێوانەوە و بەدەم پێکەنینێکی سەیرەوە گوتی:

– مەترسە! ڕاستە خاچەکەم لێ سەندیت، بەڵام لەپێناوی سەعاتێکدا

ناتکوژم!

بەڵام پاشان، لەناکاوا چارەی گۆڕا. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لێوانی کەوتنە تەتەڵە، چاوانی کەوتنە پرشنگدان. هەر دوو دەستی بەرز کردنەوە، باوەشی گرتەوە و بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە باوەشی بە میرزادەدا کرد و بە دەنگێکی لە رزۆکەوە گوتی:

– مادام حوکمی قەدەر وایە بیبە بۆ خۆت! هیی تۆیە، بۆ خۆتی ببە! من وازی لێ دێنم بۆ تۆ! ڕوگوژینت لە بیر بێ!

ئەوسا میرزادەی ڕەوان کرد و، بێ ئەوەی ئاوڕی داوە بداتەوە، بەهەشتاو خۆی بە ئەپارتمانەکەیدا کرد و دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە شڵپ داخست.

پەراوێز:

* – "بەڵام ئەم تابلۆیە تەقلیدی تابلۆکەی هانس هولبین...": دەگێڕنەوە گوایە دۆستویفسکی لە ساڵی ١٨٦٧دا، لە شاری بال، تابلۆکەی هولبینی "مەسیح لە گۆڕا..." (١٥٢١) دیتوە و واقیعیەتی تابلۆکەی زۆر لە بەرگران و ناخۆش بووە. دەگێڕنەوە گوایە بە ژنەکەی گوتووە: "ئەم جۆرە تابلۆیە، لەوەیە ئیمان لەلای پیاو نەهێڵێ".

* – "س.. ناوێک..": لەگینە دۆستویفسکی کاتێ ئەم کەسێتییە زۆر ڕۆشنبیرەی کە باوەڕی بە خوا نییە و ڕێچکەی خوانەناسانی گرتووەتە بەر، وەسف کردووە، مەبەستی ئاماژەی بوو بێ بۆ نیکولا سبیشنیفی ئەندامی گروپی پتراشفسکی، کە دۆستویفسکی پاشان وەکو نموونەیەک بۆ وێنەگرتنی (ستافروگین)ی شا قارەمانی ڕۆمانی ئەهریمەنان سوودی لێ وەر گرتووە.

* – "دەتەوێ خاچەکانمان بگۆڕینەوە...": هەموو ڕووسییەکی ئەرسەدۆکسی لە ڕۆژی لەدایکبوونییەوە خاچێکی لە مل دەکرا، خاچێکی تەختە یان ئاسنجاو. گۆڕینەوەی خاچ لەنێوان دوو کەسدا، سرووتێکی ئایینییە بە مانای برایەتی و بوونە برای ڕوحی و مەعنەوی دێت.

## فەسڵی پێنجەم

کات درەنگ بوو، نزیکی سەعات دوو و نیو بوو. میرزادە، جەنەراڵ یەپانچینی لەماڵەوە نەبینی. کارتەکەی بۆ داناو لێبڕا بڕوات بۆ میوانخانەی (وسی) تا لەوێ سۆراخی کولیا بکات، ئەگەر لەوێ بوو بیدینێ و ئەگەر چووبووە دەرەوە نامەیەکی بۆ بەجێ بێڵێ.

کاتێ گەیشتە میوانخانەکە پێیان گوت نیکولا ئاردالیونیچ لە بە یانی زووەوە دەر چووە و گوتوویەتی هەر کەسێک پرسیاری کرد پێی بڵێن: " ڕەنگە دەوروبەری سەعاتی سێ بگەڕێتەوە، ئەگەر تا ئەو کاتە نەگەڕایەوە، مانای وایە کە بە قیتار سەفەری پافلوفسکی کردووە، تا سەری خانم یەپانچین ( جەنەراڵ ژن ) بدات و لەوێش شێو دەخوات." میرزادە لێبڕا کە لە میوانخاکەدا چاوەڕوان بکات و بە دەرفەتی زانی و داوای خواردنی کرد.

بەڵام کولیا، نە سەعات سێ و نیو و نە سەعات چوار نەگەڕایەوە. میرزادە، لە میوانخانەکە وەدەر کەوت و بێ هیچ مەبەستێکی دیاریکراو کەوتە گەشت و گەڕان.

هەوای پترسبۆرگ، هەندێ جار لە ڕۆژانی هەوەڵی هاویندا زۆر خۆشە، دنیا ڕووناک و درەخشان و کپ و هێمنە. بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە، یەکێک بوو لەو ڕۆژە جوان و دەگمەنانە.

میرزادە، مودەتێک، وێڵ و سەرگەردان سووڕایەوە. زۆر شارەزای شار

نەبوو. هەندێ جار لە چوار ڕیانەکان، لە مەیدان و سەر پردەکان و لەهەنبەر هەندێک خانوو و ئەپارتمانانندا هەڵوەستەیەکی دەکرد. لەناکاو خۆی بە شیرینی فرۆشییەکدا کرد، تا لاقەکانی کەمێک بحەسێنەوە. هەندێ جار بەوپەڕی کونجکاوی و فزوڵیەتەوە دەیڕوانییە ڕێبوارەکان و بە قووڵی سەرنجی دەدان، بەڵام زۆر جار، وێڕای ئەوەی دەیڕوانی، هەستی بە ڕێبوارەکان نەدەکرد، نەیدەزانی لەکوێیە. لەوپەڕی نیگەرانی و دوو دڵیدا بوو، بەدەم ئازاری نیگەرانییەوە دەتلایەوە و هەستی دەکرد پێویستی بە تەنیاییە. حەزی دەکرد دەگەڵ خۆیدا تاک بکەوێتەوە و خۆی ڕادەستی ئازاری ئەو شپرزەییە بکات و لەگەڵیا بژی. بە بێزارییەوە، شەپۆلی ئەو پرسیارانەی کە پەلاماری دڵ و دەروونیان دەدا، لە خۆی دوور دەخستەوە، بە بێ ئەوەی لە خۆی بگات، لە مانای قسەکەی خۆی بگات، لە بن لێوانەوە بە خۆی دەگوت: "تۆ بڵێی من سەبەبکاری ئەم هەموو هەراوهەنگامەیە بم؟".

نزیکی سەعات شەش بوو، خۆی لەسەر شۆستەی سکەی قیتاری تسارسکوی- سیلو بینییەوە. تەنیاییەکی قورسی تێ ئاڵا بوو، باری ئەو تەنیاییەی نەدەبرد. هەستێکی تازە باڵی بەسەر دڵ و دەروونیدا کێشا. ڕووناکییەکی پرشنگدار، ئەو تاریکییەی ڕەواندەوە کە بە هۆی خەم و پەژارەوە باڵی بەسەر دڵ و دەروونیا کێشابوو. بلیتی پاڤلوفسکی بڕی، بەڵام ئاشکرا بوو کە دوو دڵە، شتێک، شتێکی واقیعی نەک خەیاڵی بەرۆکی دەگرێت و پێی دەڵێت مەڕۆ، سەفەری باڤلوفسک مەکە. ڕێک لەو کاتەدا کە دەیویست سواری قیتارەکە بێت، بلیتەکەی تووڕ دا و پەست و خەیاڵاوی لەوێستگەی قیتارەکە وەدەر کەوت. دوای تۆزێک، پاش ئەوەی بە ناو شەقامەکە کەوت، لەوە دەچوو لەناکاوا شتێکی سەیری بیر کەوتبێتەوە، شتێک کە لە مێژبوو مژولی کردبوو، هزری داگیرکردبوو و پەی پێنەدەبرد. لەپڕ ئەو شتەی وەبیر کەوتەوە. لە ماوەی چەند سەعاتی ڕابردوودا، تەنانەت پێش ئەوەی بچێت بۆ میوانخانەی (وسی)ش، وەکو ئەوەی منەی شتێک بکات، لەناکاوا ڕوانی بوویە دەوروبەری خۆی. پاشان بۆ ماوەیەکی زۆر، پتر لە نیو سەعات ئەو شتەی فەرامۆ شکردبوو، لەناکاوا پەشێوو





پەریشان کەوتبووە ڕوانینی دەوروبەری خۆی.

بەڵام هێشتا ئەو خەیاڵە نەخۆشانەیە بەتەواوەتی بەری نەدا بوو، کە لەناکاودا یادەوەرییەکی دیکە لەزەین و مێشکیدا درەوشایەوە. بیری کەوتەوە، کە لەو دەمەدا منەی شتێکی لە دەوروبەری خۆیدا کردبوو، لەبەر جامخانەی موغازەیەکدا وەستابوو، بە تاسە و تامەزرۆییەوە غەرقی تەمەشای شتەکانی ناو جامخانەکە بووبوو. جا دەیویست بزانێ کە ئایا بە ڕاستی پێنج دەقیقەیەک لەبەر هەمان موغازەدا وەستابوو یان ئەمە تەنیا زادەی خەیاڵی ئەو بووە و هەموو شتەکانی تێکەڵاو کردووە؟ ئایا ئەو دوکان و ئەو جامخانەیە و شتەکانی ناوی بە ڕاستی بوونیان هەبووە یان نا؟ بەهەرحاڵ، لە بەیانییەوە هەستی دەکرد مەیلەو نەخۆشە، هەمان حاڵی لێهاتووە کە جاران بەر لەوەی فێیەکە بیگرێ، لێی دەهات. دەیزانی و لە بیری مابوو کە لەو کاتانەدا، واتا بەر لەوەی فێی لێ بێت، زۆر دڵی تەنگ دەبوو، شتەکانی لێتێکەڵ دەبوو، دەمو چاوەکانی لێدەگۆڕا، ئەگەر زۆر تەرکیزی لەسەر نەکردبان، بەڵام شتێکی تایبەتی کردبوو بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو کاتە بە ڕاستی لەبەر دوکانەکەدا وەستاوە. شتێکی ناو جامخانەکەی دابووە چاو کە بە تەقدیری ئەو هەر شەست کۆپێکی دەهێنا، وێڕای حەواس پەرتی خۆی، ئەوەی لە بیر مابوو. بۆیە ئەگەر ئەو موغازەیە بە ڕاستی هەبووبێت، مانای وایە کە ئەو شتە سەرنجی ڕاکێشاوە، بۆیە لەبەر موغازەکە وەستاوە. دیارە ئەو شتە بە ڕاستی بە ئەندازەیەک مایەی سەرنج بووە کە کاتێ بەو هەموو پەریشانییەوە، لە وێستگەی قیتارەکە وەدەر کەوتووە، هەر لە بەرچاو و لە خەیاڵیدا ماوە. بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە. بە جۆرە ترسێکەوە دەیڕوانیە سەمتی ڕاست، بێ ئۆقرەیی و نیگەرانی چنگیان نابووە دڵی. موغازەکە لە هەمان شوێن بوو. ئەنجام دۆزییەوە! وەختێ کە لێبڕا بەرە و موغازەکە بگەڕێتەوە نزیکەی پێنج سەد هەنگاوێک لە دوکانەکە دوور کەوتبووەوە. بەڵێ ئەو شتەی کە لە دڵی خۆیدا بە شەست کۆپیک قەبڵاندبووی لە شوێنەکەی خۆی بوو. میرزادە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەر شەست کۆپێک دێنێ، زیاتر نایەنێ!" پێکەنی، بەڵام

ئەمە پێکەنین نەبوو، هیستریا بوو. هەستی کرد دڵی تەنگ و سینەی قورسە! بە ئاشکرا، ئەوەی بیر کەوتەوە کە تۆزێ لەوەپێش، لە هەمان شوێندا، لەبەر ئەم جامخانەیەدا، بە توندی ئاوڕی دایەوە، وەکو چۆن بەیانیتەکەی، کاتێ لەناکاو بینی ڕوگوڕین نیگای بڕیوەتێ، بەو ئاوایە ئاوڕی دایەوە. کە دڵنیا بوو هەڵە نەبووە (هەڵبەتە بەر لەوەی بکەوێتە تاقیقش هەر دڵنیا بوو) بەلەز دوکانەکەی جێ هێشت و کەوتە ڕێ. دەبوایە بەپەلە بە هەموو ئەو بیرانەدا بچووایەتەوە. ئیدی بۆی ڕوون بووەوە کە ئەوەی لەوێستگەی قیتارەکەدا ڕووی دابوو، حەقیقەت بووە نەک خەیاڵ و وەهم، بێگومان پێشهاتێکی بۆ هاتووەتە پێشی کە پەیوەندیی بە نیگەرانی و پەریشانییەکانی پێشوویەوە هەبووە، بەڵام دیسان جۆرە بێزارییەکی دەروونی بە ڕۆکی گرت، کە نابێ بەجیددی بیر لە شتێک بکاتەوە. ئەو بابەتەی بەتەواوەتی لە هزرو بیری خۆی سڕییەوە. هەنوکە بیری لە شتی دی دەکردەوە. یەکێک لەو شتانەی بیری کەوتەوە، ئەوە بوو کاتێ وەختی نۆرە فێیەکەی دەهات، بە ماوەیەکی زۆر کەم، پێش ئەوەی فێیەکە بیگاتێ (ئەو کاتانەی لە بێداریدا فێ دەیگرت نەک لە خەوا) تووشی خەم و پەژارە و دڵتەنگی و گوشارێکی دەروونی قورس دەبوو، دوای ئەوە بە ساتێک، مێشکی لەناکاودا وەک بڵێی هەڵبێت، گڕ بگرێت، دڕی بەو بارە نالەبارە دەروونییەی دەداو بە جۆرێک دەبوژایەوە و چەلەنگ دەبووەوە کە زندوویەتی و ژیانی لێدەچۆڕا. لەو ساتانەدا، کە لە درەوشانەوەی چەخماخەیەک تیژ تێپەڕترو خێراتر بوو، هەستکردنی بە ژیان و خۆ ناسینی دەهێندەی جاران زیادی دەکرد. هزرو دڵی ڕووناکی ڕووناک دەبوونەوە، هەرچی نیگەرانی و گومان و دوو دڵی و ترسێکی هەبوو، یەکسەر دەڕەوینەوە و دادەمرکانەوە و جێگەیان بۆ جۆرە دڵنیایی و ئاسوودەییەکی باڵا و شادی و ئومێدەوارییەکی لەوەسفنەهاتوو چۆڵ دەکرد. جا ئەو ساتانە یان ئەو درەخشینە تیژ تێپەڕانە، دەستپێکی نۆرە فێیەکە بوون، دەستپێکێک – کە هەرگیز لە چاوتروکانێک زیاتری نەدەخایاند- بەڵام ساتێک بوو کە تەحەمول نەدەکرا. دوای ئەوەی نۆرە





فێیەکە بەری دەدا، وەخۆ دەهاتەوە و بیری لێ دەکردەوە، بە خۆی دەگوت: هەر هەموو ئەم درۆشین و ساتە گوزەرایانەی کە وا زەن دەبەین درۆشین و بروسکانەوەی "هۆشی باڵا " و "ژیانی باڵا"یە، جگە لە نەخۆشی هیچی تر نییە، یانی حاڵەتێکی سەنگەلایە، ئاسایی نیە. ئەگەر وا بێ ناکرێ بە ژیانی باڵا دابنرێ، بەڵکو دەبێ بە نزمترین حاڵەت دابنرێ!... بەڵام ئەم لێکدانەوەیە گەیاندییە ئەنجامگیرییەکی یەجگار غەریب و، بنجبڕانە گوتی: "چ قەیدیە ئەگەر ئەم حاڵەتە نەخۆشی بێت، چ قەیدیە ئەگەر ئەم حاڵەتە، حاڵەتی دەروون پەرێشییەکی نائاسایی بێت، مادامێکی ئەنجامەکەی ئەوە بێ، کاتێ پیاو وەخۆ دێتەوە و ئەو ساتانەی وەبیر دەکەوێتەوە و لێی ورد دەبێتەوە، وەکو باڵاترین پلەی جوانی و هاوسەنگی و هاوئاهەنگی دەی بینێ، مادامێکی سۆزو گودازێکی بێ وێنەی لەلا دروست دەکات، سۆز و گودازێکی پڕ لە کەماڵ، میانڕەوی، ئارامی و دڵنیایی، ئاوێتەبوون بە نوێژ و نزا، ئارامیی خوایی، زادە و هەڵقوڵاوی بوون و ژیانی باڵا؟" ئەم دەربڕین و گوزارشتە تەمومژاویانە، هەرچەندە هێشتا لاواز بوون، بەلای ئەوەوە زۆر ڕوون و مەفهوم بوون. بەلام سەبارەت بە حاڵەتی "جوانی" و "خوایی" و بە ڕاستی "هەڵقوڵاوی بوونێکی باڵا " ئەمانەی بەلاوە حەقیقەتێک بوون کە نەیدەتوانی گومانیان لێ بکات. ئەمانە. بەلای ئەوەوە حەقیقەت بوون، ئەوەی لەو ساتانەدا، لەو ساتە تیژ تێپەڕەدا هەستی پێ دەکرد، خەیاڵی زادەی حەشیشە و ئەفیون و تلیاک و وڕاوەی نەخۆشی نەبوو، لەو خەیاڵاتە ناواقیعییانە نەبوون کە ئەقڵ دەپوکێننەوە و دەروون دەشێوێنن. هەرکاتێ میرزادە، فێیەکە بەری دەداو وەخۆ دەهاتەوە، بە جۆشوخرۆشەوە حاڵەتەکەی تاوتوێ دەکرد، دەیگوت نا، نا ئەو ساتانە ئەوپەڕی هەوڵە لە ڕای گەیشتن بە خودئاگایی و ئەگەر قەراربێ ئەو حاڵەتە لە یەک وشەدا چڕ بکرێتەوە – دەکرێت بگوترێت گوزارشتی ڕاستەوخۆیە لە خودی هۆشیاری. ئەگەر لەو ساتەدا، واتە لەو دوا ساتەی بەر لە نۆرە فێیەکە، دەرفەتی هەبوایە و بە ئاشکرا خۆی دواندبا، ئەوا دەیگوت " بەڵێ، پیاو ئامادەیە هەموو ژیانی خۆی لە قەبەڵی ئەو ساتە بکات ". قەناعەتی بەوە

هەبوو کە ئەو ساتە بە تەنیا، عومرێک دێنێ. هاوتای عومرێکە بۆ خۆی. هەڵبەتە میرزادە، زۆر گوێی لەلایەنی دیالیکتیکی ئەنجامگیریەکەی خۆی نەبوو: فام کوری و زەین کوێری و دەروون پەرێشی و تەنانەت گەمژەییشی بە زادەی بێ چەندو چوونی ئەو (ساتە باڵا)یانە دەزانی، خۆ ئەگەر کەسێک ویستبای گەنگەشەیەکی جدی ئەو بابەتەی دەگەڵ بکردبا، خۆی لێ دەبوارد. هەڵبەتە داوەریەکەی وی دەربارەی ئەو ساتە هەڵە بوو، بەڵام واقیعیەتی خودی هەستەکە خۆی بەسەریا دەسەپاند و نیگەرانی دەکردو کەمێک ئازاری دەدا. ئاخر چۆن دەیتوانی حیساب بۆ واقیع نەکات، ئەوا واقیعە پشت گوێ بخات؟ چونکە ئەوەی لەو رووی دابوو، بە ڕاستی رووی دابوو و ئەویش لە هەمان ساتدا، هەمان ساتی شادی هێنی خەفەتبەردا، بە خۆی گوتبوو: ئەو ساتە بە تەمەنێکی تەواو دەچێت.

میرزادە، ڕۆژێک لە مۆسکۆ، لە دیدارێکیدا دەگەڵ ڕوگوژیندا گوتبووی: "لەو ساتەدا، مانای قسە نائاسایەکەی یوحەنام: " لەمەدوا هیچ زەمانێک نامێنێ*" تاڕادەیەک بۆ ڕوون بووەوە. هەنگێ بەدەم بزەیەکەوە لەسەری ڕۆیی بوو: " لەوەیە ئەم ساتە هەمان ئەو ساتە بێ کە بەشی ئەوەی نەکردبوو ئاوی ئەو گوزەیەی کە محەمەد پێغەمبەر لە کاتی غەیب بووندا قلپی کردبووەوە بڕژێتە سەر ئەرز، بەڵام توانی لەو ساتەدا، هەر هەموو ئاسمانەکان تەی بکات."

بەڵێ، میرزادە، زۆر جار لە مۆسکۆدا ڕوگوژینی دەبینی و قسەوباسیان دەربارەی بابەتێن دیکەش دەکرد. میرزادە لە فکران ڕاچوو: "ڕوگوژین تۆزێ لەمەپێش بە دایکی گوت کە من لەمە دوا لە جێی برای ئەوم. ڕوگوژین ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار بەو زمانە هاتەگۆ." بەڵێ، کاتێ لە پارکە هاوینە چۆڵەکەی شارا، لەسەر تەختێک و لەژێر درەختێکدا دانیشتبوو، بیری لەو شتانە دەکردەوە. سەعات نزیکەی حەوتی ئێواری بوو. پارکەکە چۆڵ بوو. هەورێکی ڕەش بەری ڕۆژی گرتبوو. دنیا هەورو هەڵا بوو، لەوە دەچوو تۆف و زریانێک لە دوورووەوە، بە ڕێوەبێت. میرزادە، لە دڵی تەنگی خۆیدا هەستی بە جۆرە چالاکی و ئاسوودەیەک دەکرد، هەر شتێکی

دەرەکی دەبینی کۆمەڵێک یادەوەری لە لا زندوو دەبووەوە و لەزەتی لەو حاڵە دەبینی. هەوڵی دەدا ئێستا فەرامۆش بکات، لە زەمانی ئێستا بڕەڤێ، هەڵێت، بەڵام هەرکە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، جارێکی دی هەمان بیرو ئەندێشەی تاریک، ئەو بیرەی پڕ بە دڵ حەزی دەکرد، لە خۆی بتارێنێ، سەرو دڵی دەگرتەوە. لە کوتوپڕێکا بیری کەوتەوە، کە تازە، کاتێ لە میوانخانەیەکدا، نانی دەخوارد، سەبارەت بەتاوانێکی سەیر، کە لە شارا بووبوو بە داستانی سەرزاران و وێردی سەر زمانی خەڵکی، گفتوگۆی دەگەڵ گارسۆنی خوارنگەکەدا کردبوو. هەرکە ئەو بابەتەی بیر کەوتەوە، جارێکی دیکە و لەناکاودا تووشی حاڵێکی نائاسایی بوو.

ئارەزوویەکی یەجگار بەهێز، لە کۆنترۆڵنەهاتوو، وەسوەسە ئاسا، لەناکاو جڵەوی ویست و ئیرادەی لە دەست سەند، لەسەر تەختەکە هەستا، لە پارکەکە وەدەر کەوت. یەکسەر بەرە و ڕەخی دەستەڕاست ملی نا. تۆزێ لەوەپێش، کاتێ بەسەر خاکرێزەکەی ڕووباری نیڤادا ڕێی دەکرد، داوای لە ڕێبوارێک کردبوو کە ڕێگەی ئەو گەڕەکەی پترسبۆرگ، ئەو گەڕەکەی ئەو دیوی ڕووبارەکەی پێنیشان بدات. کابرا پێی نیشان دابوو، بەڵام میرزادە هەنگێ نەچووبوو بۆ ئەو گەڕەکە، چونکە زانی بووی چوونەکەی بێفایدەیە. لەمێژبوو ئەدرەسەکەی وەر گرتبوو، دەیتوانی بەئاسانی ماڵی ژنەکەی خزمی لیبدیف بدۆزێتەوە، بەڵام نیمچە دڵنیابوو کە خزمەکەی لیبدیف، لە ماڵەوە نابینێ. " بێگومان دەبێ سەفەری پاڤلوڤسکی کردبێت، دەنا وانەبوایە کولیا، جوابێکی لە میوانخانەی "وسی" بۆ دادەنا " وەکو ڕێکەوتبوون. بۆیە میرزادە کە هەنوکە بۆ ئەوێندەر دەڕۆیشت، بێگومان بە نیازی دیتنی ئەو ژنە نەدەڕۆیشت، بەڵکو شتێکی دیکە هانی دەدا کە بۆ ئەوێندەر بڕوات، کونجکاوییەکی تاریک و بە ئازار هانی دەدا. بیرۆکەیەکی تازە و کوتوپڕ دابووی لە کەللەی...

بەهەرحاڵ بڕیاری خۆی دا، ئەوەندەی بەس بوو کە بزانێ بە چ سەمتێکدا بڕوات و بکەوێتە سەر ڕاستە ڕێگاکە، تا بێخەم و سەر لە نوێ ملی ڕێگا بگرێت و بڕوات. هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا نەیدەتوانی

دەستبەرداری "بیرۆکە کوتوپڕەکەی" ببێت، ئەمەی بە مەحاڵ دەزانی. بەدەم ڕێوە، بەوپەڕی بێتاقەتی و بە ئازارەوە، سەرنجی هەر شتێکی دەدا، کە دەهاتە ڕێی... کەوتە تەمەشای ئاسمان و ڕووباری نیڤا. تەنانەت لە ڕێگادا هەوڵی دا دەگەڵ منداڵێکدا بکەوێتە گفتوگۆ. لەوە دەچوو، فێیەکەی هێرشی بۆ بێنێ. بە ڕاستی تۆف و باهۆز، هێدی هێدی نزیک دەبووەوە. لە دووری دوورەوە دەنگی هەورە تریشقەیەک دەهات.

بە بێ هیچ هۆیەکی دیار، یادی خوشکەزایەکەی لیبدیف، کە ئەو ڕۆژە لە ماڵی لیبدیف دیتبووی، لە هزرو زەینی میرزادەدا زندوو بووەوە، هەرچی دەکردو دەکۆشا نەیدەتوانی یادی ئەو کوڕە لە بیری خۆی وەدەربنێ. لە کەسێک دەچوو یادەوەرییەکی ناخۆش بە تۆبزی خۆی بەسەردا سەپاندبێ و تەواو بێتاقەتی کردبێت و، نەتوانێ لە مێشکی خۆی دەربکات، بیسڕێتەوە. سەیر ئەوە بوو کە ئێستا خوشکەزایەکەی لیبدیفی ڕێک وەکو ئەو بکوژە دەهاتە بەرچاو کە لیبدیف لە کاتی ناساندنی خوشکەزایەکەیدا بە میرزادە، باسی کردبوو. هەڵبەتە میرزادە تازە شتێکی دەربارەی ئەو بکوژە خوێندبووەوە. میرزادە، لەوەتای بۆ ڕووسیا گەڕابووەوە، زۆر شتی دەربارەی ئەو جۆرە چیرۆک و ڕووداوانە خوێندبووەوە و بیستبوو، بەوردی پەیگیری ئەو مەسەلانەی دەکرد. تەنانەت کاتێ دەگەڵ گارسۆنی خوارنگەکەشدا قسەی کردبوو، زۆر بە تاسەوە باسی ئەو تاوانەی کردبوو کە دەرهەق بە ماڵباتی ژیمارین کرابوو. ئەوەشی بیر مابوو کە یارۆی گارسۆن، پشتیوانیی لە بیروبۆچوونەکانی ئەم کردبوو. گارسۆنەکەشی هێنایەوە بەرچاوی خۆی کە گەنجێکی ئارام و زیرەک، سەلار و سەنگین، بە سەبرو ئاقڵ دیاربوو. لە فکران ڕاچوو و لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڵام بەندە ناس هەر خوایە، کێ چوزانێ؟ زۆر زەحمەتە پیاو لە جێیەکی تازەدا بتوانێ بەئاسانی خەڵکی تازە بناسێت و پەی بە ناخیان بەرێت." بەڵام بۆچوونێکی ڕەشبینانەی لەمەڕ ڕوحی ڕووسی لا دروست بوو.جا لە ماوەی ئەم شەش مانگەدا چ شتێکی، سەیرو نامۆی نەبینیبوو، شتانێ کە بۆ وی یەجگار تازە بوون، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نە بە خەیاڵیدا هاتبوون و نە

تەسەوریشی دەکردن؟ کێ تاریکستانی دەروونی خەڵکی دی دەناسێت، دەتوانێ پەی بەرێتە ناو تاریکستانی دەروون و ڕوحی خەڵکی دی، بە تایبەتی دەروون و ڕوحی ڕووسی؟ ئەمە مەتەڵە مەتەڵ، بە کەم کەس هەڵدێت. ڕوگوژین، یەکێکە لەو نموونانە. میرزادە، ماوەیەکی زۆرە پەیوەندیی نزیکی بە ڕوگوژینەوە هەیە، پەیوەندیی "برایانە" بەڵام ئاخۆ ڕۆگۆژینی ناسیوە، دەیناسێت؟ مەگەر هەر خوا بزانێ ئەم پەیوەندییە چەند ئاڵۆز، چەند ناهاوئاهەنگ، چەند گۆنگ و پڕ گلەیی و گازاندە و ئاژاوەیە!... ئەدی خوشکەزاکەی لیبدیف بۆ ناڵێی.. تەحا کە گەنجێکی فشەکەرو دەنی تەبیعەت و شەلاتی بوو! "ئەرێ ئەوە من چ دەڵێم؟" میرزادە ئەو پرسیارەی لە خۆکرد، چما ئەو، ئەو ماڵەی قەتڵ و عام کرد، ئەو شەش کەسەی بە جارێ کوشت؟ لەوە دەچێ شتەکان تێکەڵ بکەم... سەیرە!... هەستدەکەم سەرم لە گێژەوە دەچێت... بەڵام کیژە گەورەکەی لیبدیف چەند ڕەزا سووک بوو... ئەو کیژەی کە منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو!... چەند سیمایەکی پاک و بێگەردی هەبوو، پێکەنینەکەی چەند منداڵانە بوو! لە پێکەنینی منداڵێکی چکۆلە دەچوو!..." شتێکی غەریب بوو کە ئەو دەموچاوە لە بیربکات و تازە بیری بکەوێتەوە. لیبدیف، ئەگەرچی پێی بە عاردیدا دەکوتا تا بیان ترسێنێ، پێدەچوو خۆشی بووێن، زۆری خۆش بووێن، بیان پەرستێ، بەڵام ئەوەی چەند و چوونی هەڵنەدەگرت، وەکو ڕۆژی ڕووناک عەیان بوو، ئەوە بوو کە خوشکەزاکەشی زۆر خۆشدەویست.

ئاخر ئەوێک کە ماوەیەکی زۆر کەمە هاتووەتە ناو ئەمانە، چۆن دەتوانێ قەزاوەت و داوەری یەکجارەکییان دەربارە بکات؟ بە چ هەقێک ئەم جۆرە حوکمە دەدا؟ بۆ نموونە لیبدیف بگرە: ئایا ئەمڕۆکە، بۆ ئەو نەبووبوو بە مەتەڵ؟ وێنای ئەوەی دەکرد بنیادەمێکی وا بێت؟ ئایا تا ئەمڕۆکە لیبدیفی بەو شێوەیە دیتبوو؟ لیبدیف و کونتێس دوباری... خودایا! خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت ڕوگوژین دەستی دابایە کوشتن، بەلای کەمەوە ئەم هەراوهەنگامەیەی نەدەنایەوە، ئەم هەموو ئاژاوەیەی بەرپا نەدەکرد، بچێ وەکو بکوژەکەی ماڵی ژیمارین، چەکێکی تایبەتی بداتە کرد و پاشان بەدەم





نۆرە شێتاتییەکەوە، شەش کەس بە کەڕەتێ بکوژێ*! نا ڕوگوژین، ناچێ چەکی تایبەتی بداتە کرد... باشە مەعلومە کە ڕوگوژین بە نیازی کوشتنە؟ میر زادە، بەدەم ئەو بیرەوە ڕاچڵەکی و لە شەرمەزاریدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو بە خۆی گوت: "شەرم نییە بۆ من، گوساخی نییە، بەم زەقیە پێشبینی ئەو گریمانە تاوان ئامێزە بکەم؟".

هایم و سەراسیمە لەجێی خۆی چەقی. لەپڕ هەموو ئەو ڕووداوانەی تۆزێ لەوەپێشی وێستگەی قیتاری پاڤلوڤسک و نیکولایوڤسکی وەبیر هاتەوە، ئەو پرسیارە بێ پەروایەی کە سەبارەت بە (نیگایان) لە ڕاگوژینی کردبوو، بیرکەوتەوە، خاچەکەی ڕوگوژینی بیر کەوتەوە کە حاڵی حازر لە ملیا بوو، پیرۆز کردنەکەی دایکی ڕوگوژین، کە ڕوگوژین بەخوایشتی خۆی بۆ لای ئەوی بردبوو، بیرکەوتەوە. تەوقە و لە هەمێزگرتنە ناچارییەکەی سەر قاڵدرمەکانی بیر کەوتەوە، ئەویە بیر کەوتەوە کە ڕوگوژین، بە خوایشتی خۆی، چاوپۆشی لە ناستاسیا کردبوو بۆ ئەو. هەر هەموو ئەوانەی وەبیر خۆی هێنایەوە و ئەوجاش، هەر دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی... وەکو ئەوەی بۆ شتێک بگەڕێت...- ئەو دوکانە و ئەو شتەی لە جامخانەکەدا دانرا بوو، ئەو شتەی کە لە دڵی خۆیدا بە بایی شەست کۆپێکی تەخمین کردبوو...- دەک داوەشێی پیاو!... ئەمێستا بە "نیازە تایبەتی" و "بیرە کوتوپڕەکەیەوە" بە ڕێی خۆیدا دەڕۆیشت.

خەم و پەژارە، دەرد و ئازار، باڵیان بەسەر دڵ و دەروونیا کێشابوو. خەریک بوو بەرە و میوانخانەکەی خۆی دەڕۆیشت، تەنانەت چەند هەنگاوێکیشی بەرە و ئەوێ نا، بەڵام دوای دەقیقەیەک وەستا، بۆ چەند ساتێک لە فکران ڕاچوو، دووبارە درێژەی بە ڕێگای خۆی دا. نها لە ڕەخی دەستە ڕاستا، لە پترسبۆرگی کەنارا، لە نزیکی ماڵەکە بوو. حەزی نەدەکرد بە هەمان نیازی پێشووی یان بە هەمان "بیری تایبەتییەوە" بۆ ئەوێ بڕوات، چۆن ئەمەی بە بیرا هات؟ بەڵێ نەخۆشییەکەی سەری هەڵدا بووەوە، ئەمە جێی گومان نەبوو، شتێک بوو کە گومانی تیا نەبوو: لەوە بوو هەر هەمان ڕۆژ نۆرە فێیەک بیگاتێ. هەر هەموو ئەم دڵتەنگی و

ڕەشبینی و ئەو "بیرە تایبەتییە" نیشانەی نزیکبوونەوەی نۆرە فێیەکەی بوو، بەڵام ئێستا دڵتەنگی و ڕەشبینیەکەی ڕەویبوەوە، ئەهریمەن هەڵات و ڕۆیشت، هەر هەموو دوو دڵی و گومانەکانی لە حەوت کێوان ئاوا بوون. دڵی لە شادی و خۆشیا سەر ڕێژ بوو! لەمێژبوو ئەوی "ناستاسیا" نەبینیبوو. هەستی دەکرد پێویستی بە دیتنی ئەوە و "ناستاسیا"، و... بەڵێ... حەزی دەکرد، ڕوگوژین بدینێ. ئەگەر دیتبای دەستی دەگرت و بە دوو قۆڵی بۆ لای ئەو (ناستاسیا) دەچوون. دڵی پاک بووەتەوە... چما دژمنی ڕوگوژینە، هەڤرکی ئەوە؟ سبەینێ بە تاقی تەنێ دەچێت بۆ لای ڕوگوژین و پێی دەڵێت کە دیتویەتی (ناستاسیا). باشە تۆزێ لەوەپێش، ڕوگوژین گوتەنی بە تەنیاو بە نهێنی بۆ ئەوێندەر نەچووبوو تا ئەو بدینێ؟ بەو ئومێدەی بەڵکو بتوانێ لە ماڵەوە بیدینێ، چونکە لەوە دڵنیا نەبوو کە سەفەری پاڤلوڤسکی کردبێت.

بەڵێ، دەبێ ئیدی ڕەوشەکە بە تەواوەتی ڕوون ببێتەوە، تا هەمووان بتوانن یەکتر بناسن و دڵی یەکتر بە تەواوەتی بخوێننەوە. تا لەمەوداو، ئەو چاوپۆشییە پڕ نائومێدیانەی وەکو چاوپۆشیەکەی تۆزێ لەوەپێشی ڕوگوژین ڕوو نەدەن. دەبێ هەموو شتێک بەو پەڕی ئازادی و بە ڕاشکاوی ئەنجام بدرێت. ئاخۆ ڕوگوژین تەحەمولی ڕاشکاوی دەکات؟ ئەو دەیگوت کە ئەو ئافرەتەی (ناستاسیا)ی لە ڕووی ئەشقەوە خۆشدەوێت نەک لە ڕووی بەزەییەوە، دوایی ئەوەشی گوت: "ڕەنگە بە زەیەکەی تۆ زۆر لە ئەشقەکەی من توندتر بێ"، بەڵام بە ڕاستی نەبوو. هەم!... ڕوگوژین و کتێبخوێندنەوە – ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا بەمانای بەزەیی یان دەستپێکی بەزەیی نییە؟ ئایا بوونی ئەو کتێبە لەبەر دەستیا، خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوە نییە کە بە تەواوەتی لەوە گەیشتووە، دەبێ هەڵوێستی لەهەنبەر ئەم ئافرەتەدا چۆن بێت؟ نا، هەستی ئەو زۆر لە واز وازی و ئەشقی ڕووت قووڵترە." ئایا سیمای ئەم ژنە تەنیا ئەشقبزوێنە؟ یانی ئەو دەموچاوە بە ڕاستی شەهوەت ئەنگێزە؟ نەخێر، ڕازی ئەو دەموچاوە لەو ڕەنج و ئازارە دایە کە لێوەی هەڵدەقوڵێت، هەر ئەوەیە کە ڕوحی





بەرانبەرەکەی فەتح دەکات. لێرەدا، یادەوەرییەکی بە سوێ، دڵی میرزادەی هێنایە ژان. بەڵێ یادەوەرییەکی بە سوێ. ئەوەی بیرکەوتەوە، کە یەکەم جار، نیشانەی شێتاتی لە ناستاسیادا بەدی کردبوو، چەند ئازاری چەشتبوو، چەند خەفەتی خوارد بوو. ئەو کەشفە تووشی ڕەشبینی و نا ئومێدی کردبوو. گلەیی ئەوەی لە خۆی دەکرد، چۆن کاتێ لەو هەلات و پەنای بۆ ڕوگوژین برد، توانیبووی دەستی لێ بشوات؟ دەبوایە لەجیاتیی ئەوەی چاوەڕوانی هەواڵی بێت، دوای بکەوتایە. چۆن ڕوگوژین تا ئەو کاتە نەی توانیبوو نیشانانی شێتاتی لەودا بەدی بکات؟ بەلام ڕوگوژین، هەرچییەکی لێدەبینی، دەیگێڕایەوە بۆ هۆی دیکە، بۆ ئەنگێزەی هەوا و هەوەسبازی! چونکە غیرەی لێ دەکرد، دیارە ئەوە نەک هەڵە بەڵکو گومڕاییشە. ڕوگوژین مەبەستی لەو پێشنیازەی تۆزێ لەوە پێشی چی بوو؟" – میرزادە لەناکاوا سوور بووەوە، هەستی دەکرد دڵی دەلەرزێ–.

باشە سوودی گەڕانەوە بۆ ئەم بیرەوەرییانە چی بوو؟ هەر دوو لا جۆرە شێتاتیەکیان تیا بوو. شێتاتیەکە دوو لایەنە بوو. میرزادە بەش بە حاڵی خۆی پێی وا بوو ماقووڵ نییە پیاو ئەم ئافرەتەی بۆ ڕابواردن و ئاشقێتی خۆش بوێت، ئەوەی بە کارێکی حەیوانی و نامرۆڤانی دەزانی. میرزادە بە خۆی گوت: "نا، ڕوگوژین، نە هەقی لە خۆی دەکات، بوختان بۆ خۆی دەکات، دڵێکی گەورەی هەیە، سەرڕێژە لە سۆز، هەم جێی ئازاری تیا دەبێتەوە و هەم جێی بە زەیی. هەرگافێ حەقیقەتی بە تەواوی بۆ دەربکەوێ، هەرکاتێ بگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم ئافرەتە داماوە، ئەم کلۆڵە، ئەقڵی تەواو نییە و نیمچە شێتە، شایستەی بەزەییە. هەنگێ لە هەموو ڕابردووی دەبورێت، لە هەموو ئەو ئازارانە دەبوورێت کە لە سۆنگەی ئەوەوە چەشتوویەتی. هەنگێ بۆی دەبێت بە خزمەکارو براو برادەرو پشت و پشتیوان. بەزەیی و شەفەقەت دەیهێنێتەوە سەر ڕاستە ڕێگا، بۆی دەبێت بە پەندو دەرس، چونکە بوونی مرۆڤ بەندە بە دلۆڤانی و بەزەییەوە، دلۆڤانی و میهرەبانی تاقە پێوەری مرۆڤانی مرۆڤە." میرزادە زۆر پەشیمان بوو لەو ڕەفتارەی دەگەڵ ڕوگوژیندا کردی، بە ڕەفتارێکی

نابەجێی دەزانی، ڕەفتارێکی لە بەخشین نە هاتوو. نا، ویژدان و ڕوحی ڕووسی، نەفسیەتی ڕووسی، تاریک و گۆنگ نییە، مەتەڵ نییە، بەڵکو ویژدانی تاریکی خۆی، گونگ و مەتەڵ ئاسا بوو، چونکە توانیبووی ئەو جۆرە خەیاڵاتە نەنگێنەوێنا بکات. تەنیا لەبەر ئەوەی لە مۆسکۆدا، چەند قسەیەکی دۆستانە و خۆشی دەگەڵ ڕوگوژیندا کردبوو، ئەی بە برای خۆی دانا، ئەدی ئەو چییەتی... بەڵام هەموو ئەوە زادەی نەخۆشی و وڕێنە بوو... ئەنجام هەموو ئەمە دەقەتێ. ئێستاش لە بەر چاویەتی کە ڕوگوژین، بە چ خەمینی و نا ئومێدیەکەوە پێی گوتبوو "خەریکە ئیمانی لەق دەبێت!" هەڵبەتە ئەو پیاوە کول و کۆڤانێکی ترسناکی هەبووە. گوتبووی: "حەز دەکەم تەمەشای تابلۆکەی هولبین بکەم." دیارە، مەسەلەکەی ئەوە نەبوو کە بە ڕاستی تابلۆی ناوبراوی خۆش بوێت، بەڵکو پێویستی بەو خۆشەویستییە هەبوو. ڕوگوژین، نەک هەر کەسێکی سەودایی و شەیدا بوو، بەڵکو کەسێکی بە تەبیعەت کۆشیار بوو، دەیویست بە هەر نرخێ بووە، باوەڕو ئیمانی لە دەستچووی، کە زۆری پێویست بوو، بگێڕێتەوە. ئە ڕێ، زۆر ناڕەحەت بوو، هەستی دەکرد دەبێ باوەڕ بە شتێک، بە کەسێک بێنێ! لێ ئەو تابلۆیە، تابلۆکەی هولبین! چەند سەیر بوو!... ئەنجام گەیشتبووە شوێنی مەبەست، ئا... ئەوە شەقامەکەیە، لەگینە ئەم خانووە ئەوە بێ کە من بۆی دەگەڕێم... بەڵێ، ئەمە خانووەکەیە، خۆیەتی: خانووی ژمارە شازدە. کە بە ناوی خاوەنەکەیا دیار بوو هیی خانمی فلیسۆڤایە.

میرزادە، لە زەنگی دا، داوای ناستاسیا فیلیپوڤنای کرد. خانمی خاوەن ماڵ کە بە خۆی دەرگاکەی کردبووەوە بەرسڤی دایەوە و گوتی ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئەم بەیانییە سەفەری پاڤلوڤسکی کردووە و چووە بۆ دیدەنی داریا ئەلکسیڤنا و "لەوەیە چەند ڕۆژێک لە نک ئەو بمێنێتەوە". خانم فلیسوڤا، ژنێکی کورتەباڵای، دەموچاو باریکی، چاوتیژی، نیگا مەکراوی، تەمەن نزیکەی چل ساڵ، بوو. بە جۆرە کونجکاویەکەوە ناوی میرزادەی پرسی. میرزادە، لە هەوەڵەوەویستی وەڵامی پرسیارەکەی نەداتەوە، بەڵام زوو بە زوو لەو هەڵوێستەی ژێوان بووەوە، تکای لێ کرد کە ناوی بە ناستاسیا فیلیپوڤنا بڵێت و لە بیری نەچێت. خانمی خاوەن ماڵ، بە ڕووخۆشی و بە بایەخێکی زۆرەوە،





ڕاسپاردەکەی میرزادەی لای خۆی تۆمار کرد، وەکو ئەوەی بیەوێ بڵێ: " خەمت نەبێ تێگەیشتم!". دیار بوو کە ناوی میرزادە کارێکی زۆری تێ کرد. میرزادە، نیگایەکی خەیاڵاوی کرد و هەنگێ پشتی تێکردو بەرە و میوانخانەکەی خۆی ملی ڕێگای گرت، بەڵام سەر و ڕووی ئێستای، زۆر جیاواز بوو لەو کاتەی کە لە زەنگی دەرگای ماڵی خانم فلیسوڤای دا. لە چاو تروکانێکا سەراپای گۆڕا: ڕەنگ زەرد، بێتاقەت، دڵتەنگ و نیگەران ڕێی دەکرد. ئەژنۆکانی دەلەرزین، بزەیەکی سەرگەردان، وێڵ، ساردوسڕ و مردەڵە، دەنیشتە سەر لێوە شینەکانی و زوو ئاوا دەبوو: "بیرە کوتوپڕەکە"ی جارێکی دی سەری هەڵدایەوە، میرزادە هەستی کرد جارێکی دی کەوتەوە دەستی ئەهریمەن، بەڵام چی ڕووی دابوو کە ئەم حاڵەتەی لێ هاتبووەوە؟ بۆچی ئەم لەرزەی لێهاتبووەوە، ئەم ئارەقە ساردە چییە، بۆچی دڵ و دەروونی وا تاریک بووەوە؟

هەر لەبەر ئەوەی ئەو "جووتە چاوەی" بینیبووەوە؟ ئەدی بۆ ئەوە لە پارکەکە دەرنەکەوت تا بچێ جارێکی دی ئەو چاوانە ببینێ؟ جەوهەری " بیرە کوتوپڕەکەی "ئەوە بوو. لە ناخی دڵەوە ئارەزووی دیتنی ئەو" جووتە چاوەی " دەکرد کە تۆزێ لەوەپێش دیتنی. دڵنیا بوو کە لەوێندەر، لەو ماڵەدا دەیانبینێ. باشە کە ئەوەندە تاسەمەندو پەرۆشی دیتنی ئەو چاوانە بوو، بۆچی کە دیتیانی ئەو حاڵەی بەسەر هاتبوو، شەکەت و ماندوو، هایم و حەیران، شپرزە و پەژمردە بووبوو؟ مەگەر پێشبینی ئەمەی نەکردبوو؟ بەڵێ، بە ڕاستی هەمان ئەو چاوانە بوو –ئیدی ئەمە هیچ گومانێکی هەڵنەدەگرت – کە ئەم بەیانییە، کاتێ لەوێستگەی قیتاری نیکولادا*، لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا دابەزیبوو، بەر پرشنگی نیگایان دابوو. بەڵێ ئەم چاوانە هەمان ئەو چاوانە بوون، کاتێ لە ماڵی ڕوگوژین، دەیویست دابنیشێت، هەستی بە قورساییان کردبوو لەسەر شانی. ڕوگوژین نکۆڵی لە هەموو شتێک کردبوو. تەنانەت بەدەم بزەیەکی ساردو سڕیشەوە پرسی بووی: "دەبێ چاوانی کێ بن؟" میرزادە، ئەو ڕۆژە، کاتێ لەوێستگەی قیتاری (تسارسکوی* – سیلو) دەیویست بە نیازی سەردانی ئاگلایا سواری قیتار بێت، بۆ جاری سێیەم ئەو چاوانەی بینی. هەنگێ کەڵکەڵەیەکی ئاگرینی کەوتە سەر کە هەر ئەو ڕۆژە

خۆی بگەیەنێتە لای ڕوگوژین و لێی بپرسێت "ئەوانە چاوی کێن؟"، بەڵام بەلەز لە وێستگەکە وەدەر کەوت بوو، ملی ڕێگای گرتبوو، کاتێک وەخۆ هاتبووەوە، خۆی لەبەر جامخانەی دوکانی چەقۆ فرۆشیەکەدا بینیبووەوە. ڕێک لەو کاتەدا وەخۆ هاتبووەوە کە لە دڵی خۆیدا تەخمینی نرخی ئەو شتەی دەکرد کە لە جامخانەکەدا دیتبووی و دەسکەکەی شاخی کەڵەکێوی بوو، بە شەست کوپێکی تەخمین کردبوو.

ئەهریمەنێکی سەیرو ترسناک، سەراپای داگیرکردبوو و نیازی نەبوو دەست بەرداری ببێ و بەرۆکی بەربدات. هەر ئەو ئەهریمەنە بوو، کاتێ میرزادە لە پارکەکەداو لەژێر دار زەیزفۆنەکەدا دانیشتبوو و لە فکران ڕاچووبوو، ئیحای دایە، کە ڕۆگوژین لە بەیانی زووەوە، هەنگاو بە هەنگاو لە دوویەتی و تاقیبی دەکات، هەرکە بۆی دەر کەوتووە کە میرزادە سەفەری پاڤلوڤسک ناکات (کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بۆ ڕوگوژین کەشفێکی یەجگار گرینگ و هەستیار بوو) بڕیاری دا بۆ (ئەوێ) بۆ هەمان ئەو ماڵەی کە لە گەڕەکی پترسبۆرگی کۆن بوو بچێ، تا دوور و نزیک چاودێری دەوروبەری ماڵەکە و میرزادە بکات کە بەڵێنی دابوو نەچێت بۆ دیدەنی ناستاسیاو، پێی گوتبوو کە بەو نیاز و مەبەستە بۆ پترسبۆرگ نەهاتووە."

بەوجۆرە میرزادە، ئاشوفتەحاڵ، بەرە و ئەو ماڵە ڕۆیشتبوو. بۆیە هیچ سەیر نەبوو ئەگەر ڕوگوژین لەوێندەر بدینێ! پیاوێکی بەدبەختی کڵۆڵی بینی، کە زەینی تاریک و نوتەک، بەڵام قابیلی دەرک بوو. ئەو پیاوە نەگبەتە، بەدبەختە تەنانەت هەوڵی ئەوەشی نە دەدا خۆی پەنا بدات. پێشتر ئەم پیاوە ( ڕوگوژین ) نکوڵیی لە هەموو شتێک کردبوو، درۆی کردبوو، بەڵام لەوێستگەی تسارسکوی خۆی پەنا نەدا بوو. لەجیاتیی ئەوەی ئەو خۆی وەشێرێ، میرزادە خۆی وەشاردبوو. ڕوگوژین، لەو بەری شەقامەکە، لە دووری پەنجا شەقاوێک وەستابوو، هەر دووک دەستی لەسەر سنگی تێک هاڵاندبوو. دیار بوو نەک نایەوێ خۆی بشارێتەوە، بگرە حەزی دەکرد ببینرێ. لەوێدا وەکو داواکار و قازی وەستابوو، نەک وەکو... نەک وەکو چی؟

بەڵام میرزادە، لەجیاتیی لێی نزیک ببێتەوە، لاتریسکەی بەست و وەکو ئەوەی هەر نەیدیتبێ دوورکەوتەوە، لە کاتێکا نیگایان لێکدی هەڵەنگوت بوو،

بۆچی؟ (بەڵێ نیگایان لێکدی هەڵەنگوت بوو و تەمەشای یەکیان کردبوو.) باشە بە خۆی بەتەمای ئەوە نەبوو بچێ دەستی ڕوگوژین بگرێت و دەگەڵ ویدا (بۆ ئەوێندەر) بڕوات؟ باشە بە نیاز نە بوو سبەینێ بچێتە نک وی و پێی بڵێ چووە بۆ ماڵی وی؟ مەگەر لە نیوەی ڕێگادا بۆ ماڵەکە، ئەهریمەنەکەی لە خۆی نەتاراندبوو، دڵی لە پڕ، لێوان لێوی شادی و خۆشی نەبووبوو؟ یان لە شەخسی ڕوگوژیندا، تۆ بڵێ لە ڕەوشی گشتی ئەو پیاوەدا "بە درێژایی ئەو ڕۆژە" واتا لە تێکڕای گوتار و ڕەفتار و هەڵسوکەوت و نیگا و نۆڕینی ئەو پیاوەدا شتێک هەبوو کە بکاتە پاکانە بۆ ترسەکانی میرزادە و ئیجا دژوار و سەیرەکانی ئەهریمەنەکەی؟

هەر هەموو ئەو شتانە دەبینران، بەڵام شیکردنەوە و ڕاڤە و شرۆڤەیان ئەستەم بوو، هیچ پاکانەیەکیانیش بۆ نەدەکرا، مەحاڵ بوو بدرێنە پاڵ هیچ بنەمایەکی لۆژیکی. وێڕای ئەوەش، لەگەڵ ئەم دژواریەشدا، سەرباری ئەم مەحاڵ بوونەش، باری سەرنج و بۆچوونێکی گشتیی ئەوتۆی دروست دەکرد، کە خۆبەخۆ دەگۆڕا بۆ باوەڕ و قەناعەتێکی ڕەها.

باوەڕ — بە چی؟ ئاە کە میرزادە، لە کرێتی و هیچی ئەم باوەڕە، لەو ترسە بێ مانایەی کە لەم باوەڕو قەناعەتەدا هەبوو، بێزار بوو. هەر خۆی دەیزانی چەند عەزابی پێوە دەچەشت، چەندی گلەیی و گازاندە لە خۆی هەبوو! میرزادە زۆر جار بە توندی و بێزاری دەکەوتە سەرکۆنەکردنی خۆی و بە خۆی دەگوت: "ئەگەر ئازایت، بەلای کەمەوە، بەڕاشکاوی قەناعەت و باوەڕی خۆت دەر بڕە، بەئاشکرا گوزارشت لە بیرۆکەکەت بکە. پیاو بەو قسەی خۆت بکە، غیرەتی ئەوەت هەبێ کە هەموو بیرەکانت بە ڕوونی، بەوردێ و بێپێچوپەنا، دەر ببڕە! ئاە! من مرۆڤێکی سەرچەوت، بێئابڕووم! ئاخر لە ئێستا بەدواوە، بە درێژایی ژیانم، بە چ ڕوویەکەوە، بوێرم سەیری ئەم پیاوە بکەم؟ ئاە... ئەمە چ ڕۆژێک بوو! خودایا ئەم مۆتەکە قورسە چییە!..."

هیلاک و ماندوو، لە گەڕەکی پترسبۆرگی کۆن گەڕایەوە، زۆری پێچوو، تەواو بێتاقەت بوو، بەدەم ڕێگاوە بیرۆکەیەکی کوتوپڕی بەمێشکا هات کە بچێت بۆ ماڵی ڕوگوژین. چاوەڕوانی بکات تا دەگەڕێتەوە، بەدەم ڕوندوک و گریانی پەشیمانیەوە لە هەمێزی بگرێت و هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە، گرێی





دڵی خۆی بۆ بکاتەوە و بە یەکجارەکی خۆی لەم کێشەیە دەرباز بکات و ببڕێتەوە... بەڵام خۆی لەبەر میوانخانەکەدا بینییەوە... چەند لەم میوانخانەیە بێزار بوو. هەر لە هەوەڵەوە لە بینای میوانخانەکە و لە ڕاڕەوەکان و لە ژوورەکەی خۆیشی زۆر بێزار بوو. بە درێژایی ئەو ڕۆژە چەند جارێک کە بیری لەوە کردبووەوە دەبێ بۆ میوانخانەکە بگەڕێتەوە، هەستی بەوپەڕی بێزاری و بێتاقەتی کردبوو. ئەوەتا لە فکران ڕاچوو بە خۆی گوت: "ئاخر ئەمە کەی حاڵە منی تیام؟ وەکو ژنی نەخۆش... ئەمڕۆکە باوەڕم بە هەموو جۆرە خەیالات و مەزەندەکاریەکە!" میرزادە، بەوپەڕی تووڕەیی و تەوسەوە ئەوەی بە خۆی گوت. بەدەم ئەو بیرۆکەیەوە لەبەر دەروازەی میوانخانەکەدا وەستا. لەو ساتەدا تەنیا یەک ڕووداو لەنێو هەموو ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەدا، مێشکی داگیرکردبوو. لێ میرزادە بە "هێمنی و ساردی" بە "کەماڵی ئەقڵەوە" نەک لە میانەی کابوسێکی قورسەوە، بەگژیا دەچووەوە. ئەو کێردەی سەر مێزەکەی ڕوگوژینی بیر کەوتەوە. وەکو ئەوەی گەنگەشەی بیرۆکەکەی خۆی بکات، بە سەرسامی پرسیی: "جا چیی تیایە ئەگەر مێزەکەی ڕوگوژین چەقۆیەکی لە سەر بێ، خوای دەکرد پڕ دەبوو لە چەقۆ؟" کە لەناکاوا ئەوەی بیر کەوتەوە، ئەو پاش نیوەڕۆیە لە بەر دوکانی چەقۆ فرۆشیەکەوەستاوە، هێندەی دی سەری سووڕ ما. ئەوەتا هەمدیس دەڵێت: "بەڵام! عەجایەب!... دەشێت چ پەیوەندییەک لەنێوان..." قسەکەی تەواو نەکرد، بەڵام شەپۆلێکی تازەی هەستکردن بە شەرمەزاری و تەریقی، بە نامرادی و نا ئومێدی، دای بە سەریاو لە جێی خۆی، لە بەردەرگاکەدا ڕایگرت. بۆ ساتێک لە جێی خۆی وشک بوو. زۆر جاری وا هەیە، کە بیرەوەرییەکی کوتوپڕ، بیرەوەرییەکی ترسناک، بە ڕۆکی زەین دەگرێت و پیاو بۆ چەند ساتێک، بەنج دەکات و لە پەلوپۆی دەخات. میرزادە، پەست و غەمگین، بەوپەڕی دڵتەنگی بە خۆی گوت: "بەڵێ، من کابرایەکی بێ هەست و بێ دڵم، من کابرایەکی ترسنۆکم!". ئەوسا چەند هەنگاوێکی لەرزۆکی بۆ پێشەوە نا، بەڵام... دیسان وەستا.

دەروازە و ڕاڕەوی میوانخانەکە، بە خۆی کەم ڕووناکی بوو، بەڵام لەو دەمەدا زۆر تاریک بوو، چونکە هەورێکی تاریکی، نزمی، باراناوی، زریان ئامێز، بەری ئاسمانی گرتبوو. لەو کاتەدا کە میرزادە لە میوانخانەکە نزیک

بووبووەوە، بایەکی توند هەڵی کرد، باران بەلێزمە دای کرد. میرزادە پاش هەڵوەستە کورتەکەی لە بەر دەروازەی میوانخانەکە، بە هەنگاوی لەرزۆک وەڕێ کەوت، هەر کە پێی نایە ناو ڕاڕەوەکە، لەناکاودا، پیاوێکی لە تاریکییەکەدا بەدی کرد کە لەبەر قاڵدرمەکاندا وەستابوو. پێدەچوو ئەم پیاوە چاوەڕوانی شتێک بکات، بەڵام پێش ئەوەی میرزادە بتوانێ بیناسێتەوە، لە چاو تروکانێکا لە چاو ون بوو، دیار نەما. بەهەرحاڵ میرزادە نەیناسییەوە بۆیە نەیدەتوانی بڵێ کێیە، بە تایبەتی کە ئەوێندەر میوانخانە بوو، خەڵکێکی زۆر لە هاتوچۆدان، خەڵکانێک دێن، خەڵکانێک دەڕۆن، خەڵکانێک لە ڕاڕەوەکاندان، بەڵام لەناکاودا قەناعەتی تەواوی لا دروست بوو کە ئەو پیاوەی ناسییەوە و جگە لە ڕوگوژین کەسی دی نییە. دوای تۆزێک میرزادە، بە غاردان بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوت، گوایە دەیگرێت. دڵی داخورپا، بە متمانەوە بە خۆی گوت: "هەنوکە لە چاوتروکانێکا هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە!".

ئەو قاڵدرمەیەی کە میرزادە پێیدا سەر دەکەوت، دەچۆوە سەر ڕاڕەوەکانی هەر دوو نهۆمی یەکەم و دووەم. قاڵدرمەیەکی بەردین بوو، وەکو قاڵدرمەی هەموو بینا کۆنەکان، تاریک و باریک بوو، بە دەوری کۆڵەکەیەکی ئەستووردا پێچی دەخوارد. لەبەر یەکەم پلەی ئەم کۆڵەکەیەدا، پانتایەک هەبوو درێژییەکەی هەر پێیەک و پانیەکەی هەر نیو پێ دەبوو، بەڵام جێگەی کەسێکی تیا دەبووەوە کە بە پێوە بوەستێ. کە میرزادە گەیشتە ئەم پانایییە، یەکسەر، وێڕای تاریکیەکە، کەسێکی بەدی کرد، کە خۆی لەوێندەر حەشار دابوو، لە سەرەتاوەویستی گوێی نەداتێ و بێ ئەوەی تەمەشای سەمتی ڕاست بکات، تێپەڕێ و بڕوات، بەڵام هێشتا یەک هەنگاوی نەنابوو کە بە خۆی نەوەستاو ئاوڕی پاشی دایەوە. هەنگێ هەر دوو چاوی لەو جووتە چاوە هەڵەنگوتن کە دوای نیوەڕۆ دیتبوونی، ڕێک هەمان ئەو "جووتە چاوە" لەناکاوا لە چاوانی هەڵەنگوتن. ئەو پیاوەش کە لە پانایەکەدا خۆی حەشار دابوو، هەنگاوێکی نا کە لەوێندەر دەربچێت. هەر دووکیان بۆ ساتێک ڕووبەڕووی یەکدی وەستان. هەنگێ میرزادە، شانی گرت و ڕووی بۆ ڕووناکیەکەوەرچەرخاند تا باشتر دەموچاوی بدینێ.

چاوانی ڕوگوژین پرشنگیان دا و بزەیەکی گەوجانە نیشتە سەر لێوی.

دەستی ڕاستی بەرز کردەوە، ئامێرێکی لە دەستا بوو. میرزادە بیری لەوە نەکردبووەوە کە دەستی بگرێت، بەڵام پاشان بیری کەوتەوە کە هاواری کردبوو:

- پارفیون! ئەمە تۆی! باوەڕ ناکەم!

میرزادە، هەنگێ وای هەست کرد کە لەناکاودا، بۆشایەک لە بەردەمیا کرایەوە و قووتی دا. ڕووناکییەکی دەروونی نائاسایی، ڕوحی ڕووناک کردەوە، ئەم حاڵە لە نیونەخت پتری نەخایاند، بەڵام میرزادە، زۆر بە ڕوونی، دەنگدانەوەی یەکەمین هاواری ترسناکی خۆی لە بیر بوو، لە بیری بوو چۆن ئەو هاوارە لە سینگییەوە هەڵدەستاو بە هیچ کلۆجێ بۆی جڵەو نەدەکرا، پاش ئەوە لە چاوتروکانێکا کوژایەوە، لە بێهۆشی و تاریکییەکی خەستدا نقوم بوو.

ئەم حاڵە، نۆرە فێ بوو، نۆرە فێیەک کە لەمێژبوو لێی نەهاتبوو، هەموو دەزانن کە نۆرە فێ زۆر کوتوپڕە، لەناکاوا لە نەخۆش دێت. لەم حاڵەدا دەموچاوی دەگۆڕێ، چاوانی دەشلەقێن، سەراپای گرژ دەبێت. هاوارو ناڵە ناڵی زۆر ترسناک، کە لە تەسەور نایەت و لە هیچ دەنگێکی دی ناچێت، لە سینەیەوە دەردێت، ناڵە و هاوارێک کە زۆر جیاوازە لە هاوار و ناڵەی مرۆڤانی. مەحاڵە تەسەور بکەی کە ناڵەی ئەو بەلەنگازە بێچارە بێ، وا دێتە بەر خەیاڵ، کە ئەوە هاوار و ناڵەی بوونەوەرێکی دیکە بێت کە لە ناخی یارۆی فێ گرتوودا خۆی مەڵاس دابێت. ئەمە بەلای کەمەوە بۆچوونی گەلێک لەو کەسانەیە کە بەخۆیان گوێیان لەو جۆرە هاوارو ناڵە ناڵە بووە. دیمەنی ئەو نەخۆشەی کە فێی لێهاتووە، ترسێکی ئەوتۆ دەخاتە دڵەوە کە پیاو بەرگەی ناگرێت.

دەشێت ڕوگوژین هەستی بەو ترسە کوتوپڕە کردبێت، دەشێت ئەو ترسە کوتوپڕە و هەندێ هۆی دەروونی بە ئازاری دیکە، بەنجیان کردبێت و بەو جۆرە میرزادە لە جەزرەبەی چەقۆکەی وی خەلەسابێت، بەڵام کاتێ کە بینی هەڤرکەکەی لەناکاوا بەلایا هات و بە پشتا کەوت و پشتی سەری دای بە یەکێک لە پلەکانی قاڵدرمەکەدا و درێژاو درێژ کەوتە سەر عاردەکە، بەپەلەو بە هەر هەنگاوێ چوار پلەی دەبڕی، بەسەر لاشەکەی ئەودا بازی دا و وەکو جن زەدە بە غاردان لە میوانخانەکە هەڵات.

جەستەکەی میرزادە، بەدەم هەڵپلان و تەکان خواردنەوە، بە قاڵدرمەکەدا ( کە یازدە پلە بوو) پلە بە پلە بۆ خوارەوە غل بووەوە. دوای پێنج دەقیقەیەک جەستەکەی میرزادەیان لە پاینی قاڵدرمەکەدا بینی، کۆمەڵێک لە دەوری خڕ بوونەوە. تەمەشایان کرد، سەری خڵتانی خوێنە، ئەم دیمەنە گومانی ئەوەی دروست کرد کە ئایا ئەم پیاوە لە قاڵدرمەکان بەربووەتەوە یان تاوانێکی دەرهەق کراوە؟

بەڵام هەندێ لە ئامادەبووان، یەکسەر زانیان کە یارۆ فێی لێهاتووە. یەکێک لە پێشخزمەتەکانی میوانخانەکە میرزادەی ناسییەوە، گوتی میوانی ئوتێلەکەیە، ئەم بەیانییە هاتووە. پاشان بە هۆی ڕێکەوتێکی خۆشەوە، هەموو گومان و دوودڵییەکان ڕەوینەوە.

کولیا ئیڤولگین، کە قەولی دابوو تا سەعات چوار بۆ میوانخانەی (وسی) بگەڕێتەوە، ژێوان بووبووەوە و سەفەری پاڤلوفسکی کردبوو، بەڵام لەبەر هۆیەکی لەناکاوا، نەی توانیبوو نانی ئێواری دەگەڵ ماڵباتی یەپانچیندا بخوات، بۆ پترسبۆرگ گەڕابووەوە و لە دەوروبەری سەعات حەوتی ئێوارەدا گەیشتبووەوە میوانخانەی (وسی). نامەکەی میرزادەیان دابوێ و بە نامەکەدا زانیبووی میرزادە لە شارایە، چووە بۆ ئەو ئەدرەسەی کە لە نامەکەیدا دیاری کردووە. کولیا کە بەمەی زانی، چوو بۆ کۆفی میوانخانەکە و بەدەم چاوەڕوانی میرزادەوە داوای چای کرد و بەدەم چا خواردنەوەوە گوێی لە ئاوازی ئۆرگۆنە میکانیکییەکە دەگرت، بەڵام بەڕێکەوت گوێی لە خەڵکانێک بوو کە باسی یەکێکیان دەکرد گوایە فێی لێ هاتووە و لە قاڵدرمەکان بەر بووەتەوە و سەری شکاوە. یەکسەر دڵی خەبەری دا کە هەبێ و نەبێ میرزادەیە، بلەز چوو بۆ شوێنی ڕووداوەکە، میرزادەی ناسییەوە. ئیدی میرزادە، بۆ ژوورەکەی خۆی گوێزرایەوە و هەرچەندە وەخۆ هاتەوە، بەڵام تا ماوەیەکی تاڕادەیەک زۆر، وەکو پێویست ئاگای لە خۆ نەبوو، بە تەواوەتی هۆشی بە خۆی نەبوو. ئەو پزیشکەی کە بۆ معایەنەی زامەکانی سەری وی هاتبوو، زامەکانی تیمار کردوو بە ستنی و گوتی زامەکانی سووکە و هیچ مەترسییەکیان نییە. دوای سەعاتێک کاتێ میرزادە بە تەواوەتی وەخۆ هاتەوە و زانی چی ڕوویداوە، هەنگێ کولیا، بە گالیسکە لە میوانخانەکەوە بۆ ماڵی





لیبدیفی برد. لەوێ زۆر بە گەرمی و بەڕێزەوە پێشوازی لێکرا. تەنانەت لەبەر خاتری ئەو کاتی سەفەری گوندشیان پێشخست و دوای سێ ڕۆژ هەموویان لە هاوینەهەواری پاڤلوڤسک بوون.

پەراوێز:

* - "هیچ زەمانێک نامێنێ...": ڕۆیا یوحنا، الاصحاح العاشر، ٦.

* - "چەکێکی تایبەتی بداتە کرد و بەدەم نۆرە شێتاتییەکەوە، شەش کەس بە کەرەتێ بکوژێ...": لێرەدا ڤەبێژ (ڕاوی)، مەسەلەی بکوژی ماڵباتی ژیمارینی وەیاد دێتەوە... ڤیتولد گورسکی کە قوتابی دوا ناوەندی بوو، پێشوەختە دەمانچەیەکی ئامادە کردبوو، ئاسنگەرێکی ڕاسپارد بوو کە چەکێکی تایبەتی بۆ دروست بکات، گوتبووی بۆ گەمەێن وەرزشی پێویستیەتی.

* - "وێستگەی نیکولا...": ئەو هێڵی ئاسنەی نێوان پترسبۆرگ و مۆسکۆ، کە لە سەردەمی نیکولای یەکەمدا دامەزرا، بە ناوی نیکولایوفسکییەوە بوو، ئەمە ناوی هەر دوو وێستگەی کۆتایی ئەم هێڵەش بوو لە پترسبۆرگ و لە مۆسکۆش.

* - "وێستگەی ڤیتاری (تسارسکۆی- سیلۆ).": هێڵی تسارسکۆی سیلو، یەکەم هێڵی ئاسن بوو لە ڕووسیادا، لە ساڵی ١٨٣٥دا هاتە دامەزراندن و بە شارە دێی پاڤلوڤسکدا ڕەت دەبوو.

## فەسڵی شەشەم

خانووە هاوینەکەی لیبدیف، زۆر گەورە نەبوو، بەڵام خۆش و دڵگیرو جوان بوو. ئەو بەشەی کە بۆ کرێ جیا کرابووەوە، بایەخی زیاتری پێدرابوو و زۆر ڕازاوە بوو. ئەو بانیژە بەرینەی سەمتی پێشەوەی خانووەکە، کە دەیڕوانییە سەر جادەکە، یەکپارچە ئینجانەی دارین بوو، کە هەموویان بە بۆیەی کەسک بۆیە کرابوون و پڕ بوون لە شەتڵی نارنج و لیمۆ و یاسەمین، کە بەدڵی لیبدیف جوا نیەکی تایبەتی و دڵگیریان بەو شوێنە بەخشی بوو. هەندێ لەم دەوەن و شەتڵانەی لەگەڵ خانووەکەدا کڕی بوو، ئەوەندە دیمەنی ئەم گوڵدان و شەتڵانەی بە دڵ بوو، ئەوەندە کەیفی پێیان دەهات، کە لە نزیکترین دەرفەتدا، کۆمەڵێکی دیکەی لە مەزادا لێ کڕین، کاتێ هەموو دەوەنەکان گەیەنرانەماڵەوە و لە شوێنی خۆیاندا دانران، لیبدیف، هەموو ڕۆژێ چەند جارێک بە قاڵدرمەکاندا سەر دەکەوت و دادەبەزی تا لەسەر جادەکەوە تەمەشای دیمەنیان بکات و هەموو جارێک لە دڵی خۆیدا بەهای ئەو کرێیەی کە بە نیاز بوو لە کرێچی داوا بکات، زیاد دەکرد.

میرزادە، کە هێشتا لە هەر دوو ڕووی بەدەنی و دەروونییەوە، داهێزراو وداڕوخاو بوو، ڤێلاکەی زۆر بە دڵ بوو. لەوەتای گەیشتبووە پاڤلوڤسک، واتا لە ڕۆژی سێیەمی پاش نۆرە فێیەکەی، بە ڕواڵەت بوژابووەوە،

هەرچەندە لە ناخا هەستی دەکرد کە هێشتا ماویەتی و بە تەواوی چاک نەبووەتەوە. هەڵبەتە لەم سێ ڕۆژەدا زۆر خۆشحاڵ بوو بەو کەسانەی کە لە دەوری بوون، پڕ بە دڵ خۆشی دەویستن، بە تایبەتی کولیا کە هەمیشە لەگەڵیا بوو و جێی نەدەهێشت. هەروەها بە دیتنی هەموو ئەندامانی خانەوادەی لیبدیف و، (جگە لە خوشکەزایەکەی کە لەوێندەر نەبوو و کەس نەیدەزانی کێوە چووە)، لیبدیف خۆیشی، خۆشحاڵ و کەیفخۆش بوو. تەنانەت بە دیتنی (جەنەراڵ ئیڤولگین)ش کە لە پترسبۆرگ و بەر لەوەی سەفەر بکات، سەری دابوو، خۆشحاڵ بوو.

ئەو ئێوارەیەی کە گەیشتە پاڤلوڤسک، کۆمەڵێک لە ئاشنایانی خۆی، لە بانیژەکەدا، لە دەوری خڕبوونەوە، یەکەم کەس کە هاتە لای، گانیا بوو. کە میرزادە بە زەحمەت ناسییەوە. گانیا زۆر گۆڕا بوو، بووبوو بە داسک و دەرزی. پاشان ڤاریاو پتیتسن هاتن، ئەوانیش هاتبوون هاوینەکە لە پاڤلوڤسک بەسەر بەرن، بەڵام جەنەراڵ ئیڤولگین، تەقریبەن بە بەردەوامی لەماڵی لیبدیف بوو، لەوەدەچوو دەگەڵ ئەودا هاتبێ و، لیبدیف بە هەموو هێزو توانایەکی خۆیەوە هەوڵی دەدا لەلای خۆی گلی بداتەوە و نەیەڵێ لە میرزادە نزیک ببێتەوە. ڕەفتاری دەگەڵ جەنەراڵدا، دۆستانە بوو، لەوە دەچوو دوو برادەری کۆنی یەکتر بن. میرزادە، لە میانەی ئەم سێ ڕۆژەدا چەند جارێک دیتبوونی کە زۆر بەجدی و دووورودرێژی دەکەوتنە گفتوگۆ وەک ئەوەی گەنگەشەی مەسەلەێن زانستی بکەن و، دیار بوو لیبدیف ئەمەی لێخۆش دەهات.

هەر لە یەکەم ڕۆژ ەوە کە گەیشتنە پاڤلوڤسک و بارگەیان لە ڤێلاکە خست، لیبدیف و خانەوادەکەی وەزع و حاڵی میرزادەیان ڕەچاو دەکردو زۆریان مدارا دەکرد. بە هەنجەت و بیانووی ئەوەی کە میرزادە نارەحەت نەبێت، نەیدەهێشت کەس لێی نزیک بکەوێتەوە. هەرکە دیتبای منداڵەکانی بەتەمان بچن بۆ ئەو بانیژەیەی کە میرزادە لێی دادەنیشت، پێی بەعاردیدا دەداو بەغار دوویان دەکەوت کە نەیەڵێ بچنە ئەوێندەر، هەرچەندە میرزادە حەزی نەدەکرد دەوری چۆڵ بێت. تەنانەت (ڤیرا) و منداڵە شیرە خۆرەکەی

باوەشیشی لەم زەبت و ڕەبتە نەدەبوارد. لەوەڵامی نارەزایی میرزادەدا دەیگوت:

- نابێ ڕوویان بدرێتێ، چونکە ئەگەر زیاد ڕوویان درایە، شەرمیان دەشکێ و سیوایان دەبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی شایستەی ئەوە نین...

میرزادە، بەرپەرچی دەدایەوە:

- ئاخر بۆچی؟ ئەم هەموو مدارایەی تۆ، خەمبار و بێتاقەتم دەکات. زۆر جار پێم گوتوویت کە لە تەنیایی بێزارم. کە تۆ دەبینم، بەردەوام بە دەست و بە سەر هەر خەریکی ئاماژەکردنی و لەسەر نووکی پێ دەڕۆیت، گوایە مدارای من دەکەیت، زۆر ناڕەحەت و دڵتەنگ دەبم.

مەبەستی میرزادە، ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە لیبدیف، هەرچەندە بە هەنجەت و بیانووی دابینکردنی ئاسوودەیی نەخۆشەکە ڕێگەی هیچ یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی نەدەدا بچنە لای و ناڕەحەتی بکەن، کەچی بە خۆی لە زەرفی ئەو سێ ڕۆژەدا، فێر بووبوو، هەر سا ناساتێ، لە وەخت و ناوەختدا خۆی بە ژوورەکەی میرزادەدا دەکرد، درزێکی دەخستە دەرگاکەو، سەرێکی دەکێشایە ژوورەوە و چاوێکی بە هەموو گۆشە و کەنارێکی ژوورەکەدا دەگێرا، وەک بڵێی بیەوێ بزانێت ئاخۆ میرزادە لەوێندەر ماوە یان هەڵاتووە. ئەوسا لەسەر نووکی پێیان بە جۆرێکی هێندە کوتوپڕ لە کورسییەکە نزیک دەبووەوە، کە میرزادە دڵی دادەخورپاو ڕادەچڵەکی. هەمیشەش لێی دەپرسی ئایا پێویستی بە هیچ نییە؟ و ئەنجام کە میرزادە تکای لێدەکرد بەجێی بێڵێ و حەز دەکات بە تەنیا بێت، ملکەچ و گوێڕایەڵ و خامۆش، لەسەر نووکی پێیان بەرە و سەمتی دەرگاکە دەڕۆیشت و هەر دوو دەستی دەجووڵاند وەک ئەوەی بڵێ، بەرێکەوت هاتووەتە ژوورەوە و هیچ مەبەست و کارێکی نییە و وا دەچێتە دەرێ و ئیتر نایەتەوە. کەچی دوای دە دەقیقە یان ئەوپەڕی چارەکێک، دووبارە دەهاتەوە. کولیا، کە بۆی هەبوو هەر دەقەیەک خۆی بیەوێ، سەری میرزادە بدات،و چەندی بوێ لەلای بمێنێتەوە، ئەمە لیبدیفی قەڵس دەکرد، حەسوودی پێدەبرد، غیرەی لێ دەکرد. کولیا هەستی بەوە کرد کە لیبدیف

هەندێ جار، نزیکەی نیو سەعاتێک لەپشت دەرگاکەوە خۆی لێی دەداگرێت و گوێ بۆ قسەکانی وی دەگەڵ میرزادەدا، هەڵدەخات، هەڵبەتە کولیا، میرزادەی لەمە ئاگادار کرد.

میرزادە گلەیی لە لیبدیف کرد:

- تۆ بە جۆرێ چاودێریم دەکەیت، وەکو ئەوەی گەورە و بەرپرسی من بیت، بەڵام من لێرەدا، بەلای کەمەوە لەم هاوینەوارەدا ئازادم، بۆیە هاتوومەتە ئێرە کە ئازاد بم، چاک بزانە کێم بوێ، میوانداری و پێشوازیی دەکەم، بە کەیفی دڵی خۆم بۆ کوێم بوێ دەڕۆم.

لیبدیف، بەدەم دەستجووڵاندنەوە گوتی:

- هەڵبەتەوایە، گومان لەوەدا نییە!

میرزادە، سەراپای بە نیگا دابێژت.

- ئەرێ لوکیان تیموفیفیچ (لیبدیف): خەزێنە چکۆلەکەت بۆ ئێرە هێناوە، ئەها ئەوەی لە دیوارەکەدا بوو، لە سەرووی تەختە خەوەکەتەوە؟

- نا، نەمهێناوە.

- چۆن؟ یانی لەوێ جێت هێشتووە؟!

- ناگوازرێتەوە، مەگەر دیوارەکە تێک بدەی، لە دیوارەکەدا قاییم کراوە.

- دیارە لێرەش یەکێکی دیکەی وەکو ئەوەت هەیە؟

- بەڵێ، ئەم خانووە یەکێکی لەوە باشتری تیایە. هەر بۆیەش ئەم خانووەم کڕی.

- باشە، ئەو کەسەی سەعاتێ لەوە پێش هاتبوو بۆ لام و تۆ ڕێت نەدابوو، کێ بوو؟

- ئا... جەنەراڵ بوو. بەڵێ، دروستە، ڕێم نەدا بێتە ژوورەوە. ئێرە شوێنی ئەو نییە. میرزادە، من زۆر ڕێزی ئەو پیاوەم لایە. پیاوێکی گەورەیە، باوەڕ ناکەی؟ کەسێ نەمرێ دەی بینی... بەڵام، بەڵام وێڕای ئەوەش، میرزادەی بەڕێز، هەق وایە ڕووی نەدەیتێ، نەیەڵی بێت بۆ لات.

- دەتوانم بپرسم بۆچی؟ لیبدیف، تۆ بۆچی لەسەر نووکی پێیان ڕێ دەکەیت و هەمیشە بە جۆرێ دێی بۆ لای من وەکو ئەوەی بتەوێ

نهێنییەکم بە گوێدا بچپێنی؟.

لیبدیف، دەستێکی بە سینگی خۆیدا کێشا و زۆر بە نەرمی و کوتوپڕ بەرسڤی دایەوە:

– ئەوە لە بچووکی و بێ قیمەتیمە! خۆم هەست بەمە دەکەم. بەڵێ ئەمە ئەوپەڕی بچووکییە! بەڵام ئاخۆ جەنەراڵ، بۆ تۆ نابێ بە بارگرانی، بە تایبەتی کە پیاوێکی زۆر میواندۆستە؟

– زۆر میواندۆستە؟ مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

– بەڵێ لەڕادەبەدەر میواندۆستە! ئەم پیاوە لەلایەکەوە بە نیازە لێرە، لە ماڵەکەی مندا ئاکنجی ببێت. گریمان ئەمەمان قەبووڵ کرد، بەڵام هیچی پێ عەیب نیە و لە ڕووداناماندنێ، زۆر نابا خۆی لە کاروباری خێزانەکەم هەڵدەقورتێنێ، هەر لە ئێستاوە دەڵێت گوایە دەگەڵ مندا خزمە. پێشتر باسی چۆنیەتی ئەو خزمایەتیەمان دەگەڵ یەکدا کردووە و دەر کەوت کە لە ژن و ژنخوازییەوە خزمین. گوایە تۆش لە دایکەوە بەخزمایەتی دەیگەیتێ. کەواتە بەم پێیە جەنابی میرزادە، من و تۆش دەبینە خزم. بەهەرحاڵ ئەمە مەسەلەیەک نییە و ڕەنگە ئەو پەڕەکەی بکاتە خاڵێکی لاوازی چکۆلە لە جەنەراڵداو زۆریش لێی ناگیرێت، بەڵام تۆزێ لەمە پێش بۆی گێڕامەوە، کە بەدرێژایی تەمەنی لەو ڕۆژەوە کە چووەتە دەورەی ئەفسەری تاکو ڕۆژی ٦/١١ی پارەکە، قەت ڕۆژێک نەبووە لە دوو سەد میوان کەمتری بووبێت، بە کورتیەکەی خوانەکەیان هەرگیز لە میوان چۆڵ نەبووە، جونێ هەستاون، جونێ دانیشتوون، لە قاوەڵتییەوە بۆ فراڤین، لە فراڤینەوە بۆ چای و لە چایەوە بۆ شێو، دەڵێ بە درێژایی سی دانە ساڵی خشت، ڕۆژی پازدە سەعاتی بەردەوام ئەمە حاڵی بووە، تەنانەت دەرفەتی ئەوەیان نەبووە پەردەی سەر خوانەکەش بگۆڕن. یەکێک ڕۆییوە و یەکێکی دی هاتووە، گوایە لە ڕۆژانی جەژندا، بە تایبەتی لە جەژنانی خانەدانی ئیمپراتوریەتدا، ژمارەی میوانانی جەنەراڵ، گەییونەتە سێ سەد کەس.

لە هەزارەمین* ساڵیادی دامەزراندنی ڕووسیادا، ژمارەی میوانانی جەنەراڵ، گەییونەتە حەوت سەد کەس. کێشەکەی لەمەدایە، دیارە ئەم





جۆرە چیرۆکانە نوقلانەی خێر نین، بۆیە زۆر ئەستەمە پیاو، بتوانێ لە ماڵی خۆیدا داڵدەی ئەم جۆرە خەڵکە میواندۆستە بدات. بۆیە لە دڵی خۆدا پرسیم ئاخۆ ئەم پیاوە میواندۆستە بەم حاتەمییەتەی خۆیەوە، چ بۆ تۆو، چ بۆ منیش نابێ بە بەڵا؟.

- باشە، خۆ بە ڕواڵەت، ئێوە بەینتان زۆر خۆش بوو، تۆ بڵێی من هەڵە بووبم؟

- من وڕێنەکانی بە گاڵتە و شۆخی وەر دەگرم، یانی برایانە تەمەشای دەکەم. من شانازی بەوەوە دەکەم کە لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە خزمین. وێڕای میوانە دوو سەد کەسییەکانی و سەرباری ئاهەنگی هەزارەمین ساڵیادی دامەزراندنی ڕووسیاش، هەر جەنەراڵ بە پیاوێکی بەڕێزو گەورە و خۆشمەشرەف دەزانم. من ئەم قسانەم بە ڕاستی و بە جیددییە، لە ناخی دڵمەوە دەردەچن. میرزادە تۆ بە خۆت تۆزێ لەمەپێش پێت گوتم: کە من بە جۆرێ دێم بۆ لای تۆ وەک ئەوەی بمەوێ نهێنییەکت بۆ بدرکێنم. جا ئەم جارەیان بە ڕاستی ڕازێکم پێیە و گەرەکمە پێتی بڵێم: ئافرەتێک ڕای سپاردووم کە پێت بڵێم حەز دەکات بە دزییەوە بتبینێ.

- بۆچی بە دزییەوە؟ نا، ئەگەر پێویست بکات من بە خۆم و لەمڕۆ زووتر نییە، دەچمە دیدەنی.

لیبدیف، بەدەم دەستجووڵان و سەرلەقاندنەوە گوتی:

- نا، نا ئەو بە هیچ جۆری ترسی لەو شتە نییە کە تۆ وێنای دەکەیت. دەزانی ئەو ئەهریمەنە هەموو ڕۆژێ بۆ ئێرە دێت و لە ساغ و سەلامەتیت دەپرسێت؟

- تۆ بە جۆرێ بە ئەهریمەن ناوی دەبەیت و وەسفی دەکەیت کە من دەکەومە گومان و دوو دڵییەوە!

لیبدیف، بلەز بەرسڤی دایەوە:

- نا، نا بە هیچ جۆرێ جێی گومان نییە. مەبەستم ئەوە بوو کە ترسی ئەم ئافرەتە لەو کەسە نییە، بەڵکو لە کەسێکی ترە، لە کەسێکی تەواو جیایە.

میرزادە، کە لەم چاوورِاوەی لیبدیف پەست و بێزار بووبوو، پرسیی:

- ترسی لە کێیە؟ خێرا پێم بڵێ!

لیبدیف، بە پێکەنینەوە گوتی:

- نهێنییەکە لەوەدایە!

-نهێنیی کێ؟

- نهێنی تۆ. جەنابی میرزادە تۆ بە خۆت ناتەوێ لە حوزوری جەنابتا سەبارەت بەم نهێنییە قسە بکەم...

لیبدیف، بەدەم ئەو قسەیەوە کە بینی هەستی کونجکاوی بەرانبەرەکەی ورووژاندووە، بە شادییەوە لەسەری رۆیشت:

- ئەو ئافرەتە، لە ئاگلایا ئیڤانوڤنا دەترسێت.

میرزادە برۆی ویکهێنانەوە، دوای دەقیقەیەک بێدەنگی ئەوجا گوتی:

- بەزاتی خوا لە ماڵەکەت دەڕۆم لیبدیف! کاڤریلا ئاردالیونوفیچ و پتیتسن لەکوێن؟ لەماڵی تۆن؟ بۆ ئێرەشت هێنان؟

لیبدیف، هەراسان و دەسەپاچە، بەدەم دەست جووڵانەوە، لەم دەرگاوە خۆی بەو دەرگادا دەکرد. بە ئەسپایی گوتی:

- دێن، دێن. جەنەراڵیش لە دوای ئەوان دێت... هەموو دەرگاکان دەخەمە سەر گازی پشت. کیژەکانیشم بۆ ئێرە گاز دەکەم، هەر ئێستا گشتیان گازدەکەم.

ڕێک لەم کاتەدا کولیا، لە جادەکەوە هات و خۆی بە بانیژەکەدا کرد و گوتی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و هەر سێ کیژەکەی لە دواوەن و بۆ ئێرە دێن.

لیبدیف، کە بەم هەواڵە زۆر قەڵس و نارەحەت بوو، بەوپەڕی شپرزەیی پرسیی:

- یانی دەبێ ڕێگەی پتیتسن و (گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)یش بدەم؟ دەبێ ڕێگەی جەنەراڵیش بدەم؟

میرزادە، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- بۆ نا؟ کێ دێ بابێت. لیبدیف تۆ دڵنیابە کە لە هەوەڵ ڕۆژەوە، منت خراپ ناسیوە. هەمیشە هەر هەڵە بوویت. هیچ پێویستم بەوە نییە خۆم لە

خەڵکی دووربگرم.

لیبدیف کە بینی میرزادە پێدەکەنێ، وای بە مەسڵەحەت زانی کە لاسایی بکاتەوە، بۆیە ئەویش دەستی بە پێکەنین کرد. بە ڕواڵەت زۆر خۆشحاڵ دیاربوو، هەرچەندە زۆریش شپرزە و نیگەران بوو.

هەواڵەکەی کولیا، ڕاست دەربچوو: کولیا، بۆیە چەند هەنگاوێک پێش ماڵباتی یەپانچین کەوتبوو تا هەواڵی هاتنەکەیان ڕابگەیەنێت. بەو جۆرە میوانان لە یەک کاتدا، لە دوو لاوە پەیدا بوون: ماڵباتی یەپانچین لە دەستی بانیژەکەوە و پتیتسن، گانیاو جەنەراڵ ئیڤۆلگین لە ناو خانووەکەوە.

کولیا، ماڵباتی یەپانچینی لە نەخۆشییەکەی میرزادە و هاتنی بۆ پاڤلوڤسک، ئاگادار کردبوو. خانم یەپانچین تا ئەو کاتە زۆر شپرزە و نیگەران بوو. جەنەراڵی مێردی، پێریکە کارتەکەی میرزادەی، گەیاندبوونێ، ئیدی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بەوەدا دڵنیا بووبوو کە میرزادە بە مەبەستی سەردانیان دێت بۆ پاڤلوڤسک، بەڵام کیژەکانی بێهودە هەوڵیان دەدا بەرپەرچی بدەنەوە و دەیانگوت کەسێک کە بە درێژایی شەش هەیڤان لێی نەپرسیبن و نامەی بۆ نەناردبن، ناچێتە ئەقڵەوە بەو پەلەپەلە بە مەبەستی سەردانی وان، بێت بۆ پاڤلوڤسک و کێ چوزانێ؟ لەوەیە بەڕادەیەک مژول و سەرقاڵ بێ، هەر لە پترسبۆرگ بمێنێتەوە. هەڵبەتە خانم یەپانچین، بەو قسانە زۆر قەڵس بوو، ئامادە بوو گرێو بکات، کە میرزادە چەند دێربکەوێ، تا سبەینێ دێتە دیدەنیان. بۆیە سبەینێ، بە درێژایی دانی بەیانی هەر چاوەڕێی بوو، پاشان بۆ نیوەڕۆژە و دواتر بۆ شێو چاوەڕێی کرد و کە دنیا تاریکی کرد و بوو بەشەو، خانم یەپانچین بەتەواوەتی تووڕە بوو، شەڕی بە هەمووان دەفرۆشت، هەڵبەتە بێ ئەوەی ناوی میرزادە بێنێ، کە سەبەبکاری شەڕەکە بوو. لە ڕۆژی سێیەمیشدا ناوی میرزادەی نەهێنا، بەڵام ئاگلایا لەسەر نانی ئێوارێ لە زمانی دەرچوو و گوتی: "دایکە بۆیە تووڕەیە چونکە میرزادە نەهاتووەتە دیدەنیمان." جەنەراڵ گوتی "خەتای ئەو نییە". ئیدی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا تووڕە بوو، هەستا و خوانەکەی جێ هێشت.

ئەوە بوو شەوێ کولیا پەیدابوو، هەرچی شتێکی لەمەڕ میرزادە زانیبوو،

له سیری تا پیازی بۆ گێڕانەوە. لیزاڤیتا بروکوفیڤنا ئەمەی بە سەرکەوتنی خۆی زانی، بەڵام وێڕای ئەوەش کەوتە گلەیی و ڕووی لە کولیا کرد و گوتی: "کە ئیشمان پێی نابێ، دێت لێرە بە جۆرێ دای دەکوتێ، نازانین چۆن لەدەستی ڕزگارمان بێت، کە ئیشمانیش پێی دەبێ، بە جۆرێ غەیب دەبێ لە تۆ وایە مردووە!" کولیا لەم قسەیەی خانم یەپانچین: "نازانین چۆن لە دەستی ڕزگارمان بێت." تووڕە بوو، بەڵام جڵەوی خۆی گرت و لێبڕا جارێ وەڵامی نەداتەوە. ئەگەر قسەکانی ئەوەندە ڕەق نەبوایە و بەو ئەندازەیە هەستی بریندار نەکردبا، لەوە بوو لە هەموو قسورێکی ببورێت، بە تایبەتی کە بە چاوی خۆی بینی کاتێ بە نەخۆشییەکەی میرزادەی زانی، چەند پەشۆکاو چۆن شپرزە بوو. خانم یەپانچین کە بە نەخۆشییەکەی میرزادەی زانی، پێشنیازی کرد، کە یەکێک بەپەلە بنێرن بۆ پترسبۆرگ، تا دکتۆرێکی زۆر شارەزاو کارامە بێنێ بۆ معایەنەی میرزادە، بەڵام کچەکانی ڕێیان نەدا ئەم کارە بکات، بەڵام کاتێ دایکیان بڕیاری دا بچێت بۆ سەردانی نەخۆشەکە، هەنگێ بەناچاری دوای کەوتن.

خانم یەپانچین، بەدەم خۆئامادەکردنەوە، دەی پرتاند:

- یارۆ خەریکە دەمرێ! ئێستا وەختی گلەییە! یارۆ دۆستی خانەوادەییمانە یان نا؟

ئاگلایا گوتی:

- باشە، بە چ مەعلوم چوونی ئێمەی پێ خۆشە!

- باشە، تۆ مەیە. نەیەی باشترە، چونکە ئەگەر یەڤگینی پافلوفیچ بێت، کەس لە ماڵ نابێ پێشوازی بکات.

دوای ئەو قسانە، (ئاگلایا)ش یەکسەر کەوتە خۆ کە بەگەڵ دایکی و دوو خوشکەکەی بکەوێت. هەڵبەتە لە هەوەڵیشەوە هەر بەتەمای چوون بوو. میرزادە (س)ش کە لەگەڵ ئادیلایدادا بوو، لەسەر داوای ئەو، یەکسەر قایبل بوو کە بەگەڵ خانمەکان بکەوێ. دەمێک بوو، لەوەتای ئاشنایەتی دەگەڵ خانەوادەی یەپانچیندا پەیدا کردبوو و بۆ یەکەم جار باسی میرزادەی لەوان بیستبوو، حەزی دەکرد میرزادە لە نزیکەوە بدینێ و بناسێت. دوایی دەر





کەوت کە سێ مانگێک لەوە پێش، میرزادەی دیتووە و نزیکەی دوو هەفتەیان لە شاروچکەیەکدا پێکەوە بەسەر بردبوو. میرزادە "س" کە زۆری ستاییشی میرزادە میشکین کردبوو و ڕێزو تایبەتی بۆی هەبوو، بۆیە بە خۆشحاڵییەوە قاییل بوو جارێکی دی لەگەڵ ئەواندا بچێتە دیدەنی کۆنە برادەرەکەی. ئەو ڕۆژە جەنەراڵ ئیڤان فیدوروڤیچ لە ماڵ نەبوو، (یەڤگینی پاڤلوفیچ)ش هێشتا نەگەیشتبوو. مەودای نێوان ڤێلاکەی خانەوادەی یەپانچین و ڤێلاکەی لیبدیف هەر سێ سەد شەقاوێک دەبوو.

ناخۆشترین شت بۆ خانم یەپانچین، ئەوە بوو کاتێ گەیشتە لای میرزادە، خەڵکێکی زۆری بەدەورەوە بینی، بە تایبەتی کە ڕقی زۆری لە دوان سیانێکیان بوو. ئەمە جگە لەوەی کاتێ میرزادە چووە پێشوازیان، سەری سوورما لەوەی کە لەجیاتیی ئەوەی بە خەیاڵی خۆی گەنجێکی نەخۆشی ڕەنگ و ڕوو سیسەڵە و چرچەڵە بدینێ، گەنجێکی خۆش ڕەنگ و ڕوو، بە سیحەت و بە دەماخی بینی، بە ڕادەیەک سەری سوورما کە لە جێی خۆی وەستا، باوەڕی بە چاوانی خۆی نەدەکرد. مەگەر خوا بزانێ کولیا چەند بەم هەڵوێستەی خانم یەپانچین خۆشحاڵ بوو! چونکە دەیتوانی بەر لەوەی خانم یەپانچین و کیژەکانی لە ماڵ بە ڕێ بکەون، حەقیقەتی مەسەلەکەی بۆ باسبکات، بەڵام بە ئانقەست ئەو کارەی نەکردبوو، چونکە دەیزانی کاتێ خانم یەپانچین، دۆستە ئازیزەکەی بەوپەڕی ساغ و سەلامەتی دەبینێ، چۆن تووڕە دەبێت و پێکەنینەکەیان دەر دەچێت!

کولیا، هەر بەوەندەوە نەوەستا، بەڵکو بە بێپەروا نەخشە و پێشبینییەکەی خۆی گێڕایەوە تا هێندەی دی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا تووڕە بکات.

هەرچەندە کولیا، بە ینی لەگەڵ خانم یەپانچیندا خۆش بوو، بەڵام زۆری حەز دەکرد سەر بکاتە سەری و تووڕەی بکات.

میرزادە کورسییەکی هێناو فەرمووی لە خانم یەپانچین کرد کە لەسەری دانیشێت، خانم یەپانچین بەدەم دانیشتنەوە بە کولیای گوت:

- کوڕەکە گیان پەلە مەکە! سەرکەوتنەکەت لە بارمەبە!

ئیدی لیبدیف و پتیتسن و جەنەراڵ ئیڤولگین، خێرا کورسیان بۆ کچەکان

هێنا. جەنەراڵ، کورسیی بۆ ئاگلایا دانا و (لیبدیف)یش بەدەم کڕنۆشێکی پڕ لە ڕێزو حورمەتەوە کورسییەکی دیکەی بۆ میرزادە (س) دانا. ڤاریاش وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، بەوپەڕی گەرم و گوڕی و ڕووخۆشی و شادییەوە خێرهاتنی کیژەکانی کرد، کەوتە چپەدوو لەگەڵیاندا.

خانم یەپانچین گوتی:

- میرزادە، ڕاستت دەوێ من بەتەمابووم لەناو جێگادا بتبینم، هەڵبەتە لە ڕووی خەمخۆری و پەرۆشیمەوە، شتەکەم لە خۆم گەورە کردبوو، پیاو ڕاست بڕوات، کە یەکەم جار تۆم بەم تەندروستییە باشەوە بینی، زۆر ناڕەحەت بووم، بەڵام باوەڕم پێبکە تەنیا یەک دەقیقە وا بووم، هەر بایی ئەوەی بیربکەمەوە، ئیدی ناڕەحەتییەکەم ڕەوییەوە، من هەمیشە کە بیر دەکەمەوە ئاقڵانەتر قسان دەکەم و ماقوولتر ڕەفتار دەکەم. پێم وایە تۆش وەکو من وایت. هەمان حاڵی منت هەیە. باوەڕبکە ئەگەر کوڕێکی نەخۆشم هەبا، بە چاکبوونەوەی، هێندەی چاکبوونەوەی تۆ خۆشحاڵ نەدەبووم. بە ڕاستی شەرمە ئەگەر باوەڕم پێ نەکەیت، بەڵام ئەم کوڕێژگە ناڕەسەنە، سوعبەتی لەوەش خراترم دەگەڵ دەکات، داوی لەوەش خراترم بۆ دەنێتەوە . لەوە دەچێ تۆ گرتبێتە ژێر پەڕوباڵی خۆت. جا تۆ بە شایەد بەو لە بیرت بێ کە بەم زووانە، لێی زوێر دەبم و چش لەو دۆستایەتییە...

کولیا هاواری کرد و گوتی:

- باشە من گوناحم چییە؟ چەندم پێگوتیت کە میرزادە تەقریبەن چاک بووەتەوە، باوەڕت پێ نەدەکردم، چونکە حەزت دەکرد لەسەر جێگای مەرگ بیدینی، زیاتر خۆت بۆ ئەو حاڵەتە ئامادە کردبوو...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لە میرزادەی پرسی:

- بەتەمای زۆر لێرە بمێنیتەوە؟

- هەموو هاوینەکە، ڕەنگە زیاتریش.

- هێشتا هەر ڕەبەنی؟ ژنت نەهێناوە؟

میرزادە، کە پێکەنینی بەم پرسیارە ساکارەی خانم یەپانچین دەهات، بەرسڤی دایەوە:

- نا، هێشتا ژنم نەهێناوە.

- پێکەنینی ناوێ! خۆ هەر دەبێ بیهێنی، کوڕە ژن دێنێ و کچە شوو دەکات. باشە سەبارەت بە جێگاکەت، بۆچی نایەیتە لای ئێمە؟ لایەکی تەواوی خانووەکەمان چۆڵە، کەسی تیا نییە. بەهەرحاڵ ئەمە پەیوەندیی بە خۆتەوە هەیە، خۆت باشتری دەزانی!

هەنگێ، لە کاتێکا بە گۆشەی چاو ئاماژەی بۆ لای لیبدیف دەکرد، بە ئەسپایی گوتی:

- ئێرەت لەم کابرایە بەکرێ گرتووە؟ ئەدی چییەتی هەر دێ و دەچێ و لە هیچ شوێنێ ناحەوێتەوە؟

لەو دەمەدا، ڤیرا کە وەکو هەمیشە منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو، لە ژوورەکانەوە وەدەر کەوت و هاتە بەر هەیوانەکە، لیبدیف کە بە بەینی کورسییەکاندا دەسووڕایەوە و بەخۆیشی نەیدەزانی چی بکات، بە نیازی ڕۆیشتنیش نەبوو، لەناکاو شاڵاوی بۆ ڤیرای کیژی برد و بە دەست کەوتە ئاماژە کە لە هەیوانەکە وەدەر بکەوێ، بە جۆرێ ئاگای لە خۆ نەمابوو کە تەنانەت پای کوتا بە عاردیدا.

خانم یەپانچین لەناکاودا پرسیی:

- چییە، شێتە؟

- نا، بەڵام...

خانم یەپانچین، قسەکەی بە میرزادە بڕی و چاوێکی بە ئامادەبووواندا گێڕا و گوتی:

- دەبێ سەرخۆش بێ. بە ڕاستی دەوروبەرەکەت ناچنە دڵەوە، پیاو خۆزیات پێ ناخوازێ. ئەدی ئەم کچە جوانە کێیە؟

- ئەمە ڤیرا لوکیانوفنایە، کیژی لیبدیفە.

- ئا... بە ڕاستی کیژێکی ناسکە. حەز دەکەم تەعاروفی لەگەڵ بکەم.

لیبدیف، کە گوێی لە ستاییشەکانی لیزاڤیتا پروکوڤیفنا بووبوو، کیژەکەی بردە پێشەوە تا پێی بناسێنێ. بە ڕێزەوە چووە پێشێ و بە سۆزەوە گوتی:

- هەتیون! داماوانە هەتیون! ئەو منداڵەی باوەشیشی هەتیوە. ئەمە

لیوبوفی خوشکیەتی، یانی کیژی شەرعی منە لە ژنە یاساییی و زۆر شەرعیەکەم، ئیلینایە، کە شەش هەفتە لەمە پێش بەسەر ئەم منداڵەوە چوو... بە لێ... بۆ ئەم منداڵە بووە بە دایک، جێی دایکی بۆ گرتووەتەوە... هەر ئەو خوشکەی هەیە، تەنیا ئەو خوشکەوهیچی تر...

لیزاڤیتا، بە هەڵچوونێکی کوتوپڕەوە گوتی:

– جەناب، تۆش بابایەکی گەوج و کەودەنیت و هیچی تر. ببورە کە بەو ڕاشکاوییە قسان دەکەم. دەی بەسە.

ئەوجا بە پەستی لەسەری ڕۆیشت:

– وا بزانم بەخۆت تێدەگەی!

لیبدیف، بەڕێزەوە و بەدەم کڕنۆشەوە گوتی:

– زۆر ڕاستە!

ئاگلایا لێی پرسی:

– جەنابی لیبدیف، ڕاستە دەڵێن تۆ خەون و مکاشەفەکانی یوحەنا ڕاڤە دەکەی؟

– زۆر ڕاستە، پتر لە چواردە ساڵە خەریکی ئەوەم.

– ناوم بیستوویت، پێم وایە ڕۆژنامان لەسەریان نووسیویت.

لیبدیف، کە لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری کەوتە قسان:

– نا، ئەوەی لە ڕۆژنامانداد باسکراوە، شرۆڤەکارێکی دیکە بوو، مردووە و من جێی ئەوم گرتووەتەوە.

– باشە، دەشێت وەکو دراوسێیەک، لوتف بفەرموویت و ڕۆژێک بێی چەند پەرەگرافێکی خەونەکانی یوحەنام بۆ ڕاڤە بکەیت؟ بە ڕاستی من هیچیان لێ حاڵی نابم.

جەنەڕاڵ ئیڤولگین، کە لەتەنیشت ئاگلایاوە ڕۆنیشتبوو،خوا خوای بوو، دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوێت و بەشداری گفتوگۆیەکان بکات، لەناکاودا هاتە قسان و گوتی:

– ئاگلایا ئیڤانوفنا، من بە ئەرکی خۆمی دەزانم ئاگادارت بکەمەوە کە هەر هەموو ئەمە تەڵەکەبازیە و لە گیرفانی خۆیەوە دەری دێنێ، باوەڕم پێ

بکە...

جەنەراڵ ئیڤولگین لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی:

- هەڵبەتە، ژیانی گوندی و هاوینەواران خۆشی و سەرگەرمیی خۆی دەوێت. بۆ نموونە بانگ کردنی مێلێکی وەکو ئەمە بۆ ماڵەوە، کە خەونەکانی یوحەنا ڕاڤە بکات، یەکێکە لەو سەرگەرمییانە... یەکێکە لەو کەڵکەلانە، ڕەنگە کەڵکەڵەیەکی ئاقڵانەش بێ، بەڵام من... ئەوە چییە، بۆ بەو جۆرە سەیرم دەکەی؟ بە یارمەتیت با خۆمت پێ بناسێنم: من جەنەراڵ (ئیڤولگین)م ئاگلایا ئیڤانوڤنا، من بە منداڵی لە باوەشم گرتوویت.

ئاگلایا، کە بەتۆبزی جڵەوی خۆی گرتبوو تا لە قاقای پێکەنین نەدا. لە بن لێوانەوە گوتی:

- بە ناسینت خۆشحاڵم. من ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا و نینا ئالکسندروڤنا دەناسم...

لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، تورە بوو، لە تورەییدا سوور هەڵگەڕا. ئەو غەزەب و تورەییەی کە لە مێژبوو لە دڵیا پەنگی خواردبووەوە، پێویستی بە مەفەڕێک بوو لێوەی دەربچێت. نەیدەتوانی، تەحەمولی جەنەراڵ ئیڤولگین بکات، کە لەمێژبوو دەیناسی. بۆیە بە هەڵچوونەوە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- درۆ دەکەیت، خووت بە درۆوە گرتووە! دەنا قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم کیژەی منت لە باوەش نەگرتووە!

ئاگلایا، خۆی لە قسەکانی هەڵقورتاند و لە پڕێکا گوتی:

- با دایکە. تۆ لە بیرت نەماوە. کە ماڵمان لە تڤیر بوو، هەموو جارێ لە باوەشی دەگرتم. هەنگێ تەمەنم شەش ساڵان بوو، ئێستاش لە بیرمە کە تیروکەوانێکی بۆ دروست کردم، فێری کردم چۆن بەکاری بێنم، کۆترێکم پێکا. لە بیرت نایەت کە کۆترێکمان پێکەوە ڕاو کرد؟

(ئادیلاید)ش لەولاوە هەڵی دایە و گوتی:

- کڵاوخودێکی کارتۆنی و شمشێرێکی دارینیشی بۆ من دروست کرد. منیش لە بیرمە.

(ئالکسندرا)ش هەڵی دایە و گوتی:

- منیش لەبیرمە. ئێوە، هەر دووکتان لەسەر کۆترە بریندارەکە کردتان بە شەڕو ئەوە بوو من هەر یەکەتانم لە سووچێکدا دانا. ئادیلاید، ناچار بوو بە خۆی و کڵاوخودو شمشێرەکەیەوە لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستێت.

کە جەنەراڵ بە ئاگلایای گوتبوو لە باوەشی گرتووە، هیچ مەبەستێکی نەبوو تەنیا ئەوە نەبێت کە زەمینە خۆشبکات بۆ ئەوەی قسەی دەگەڵ بکات، چونکە عادەتی وابوو هەرکاتێ بیویستبایە دەگەڵ کوڕ یان کچێکی گەنجدا ئاشنایەتی پەیدا بکات، بەو قسەیە، وەکو مجامەلە، دەرگای ئاشنایەتی دەگەڵ دەکردنەوە.

ئیدی، ئەم جارە، بە ڕێکەوت و خوا بەختەکی قسەکەی ڕاست دەر چوو، چونکە شتێکی گێڕابووەوە کە بە خۆی لە بیری نەمابوو، کاتێ ئاگلایا باسی ڕاوە کۆترەکەی هێنایەوە گۆڕێ، یەکسەر یادەوەرییەکانی زندوو بوونەوە، ڕێک وەکو زۆربەی ئەو پیرەمێرانەی کە ڕابردوویەکی دووری دووریان وەبیر دەکەوێتەوە. دیارە ئەستەمە بزانین کە چ شتێکی ئەو بیرەوەرییە، بەو ڕادەیە جەنەراڵی داماوی، (کە وەکو هەمیشە کەمێ مەست بوو) هێنایە جۆش، بەڵام دیار بوو کە لەڕادەبەدەر هاتبووە جۆش و هاواری کرد:

- لە بیرمە، بەڵێ هەر هەموویم لە بیرە! من ئەوسا کاپتنێکی (ملازم) گەنج بووم. تۆ زۆر منداڵ بوویت، جا جوان و زیتەڵە!... نینا ئەلکسندروڤنا!... گانیا گیان!... ئەوسا من هەمیشە هاتوچۆی ئێوەم دەکرد...

خانم یەپانچین، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- بەڵام تەمەشاکە ڕۆژت بە چ ڕۆژێک گەیشتووە! هەرچەندە خواردنەوە کارێکی زۆری تێ کردوویت، بەڵام هەر باشە هەستە مرۆڤانیەکانی نەسرپویتەوە، بەڵام هاوسەرەکەتت زوخاوەسک کرد، بە داخ و خەفەتەوە کوشتت، لە بری ئەوەی نموونە و سەرمەشقێکی باش بێت بۆ منداڵەکانت، ئەوەندەت قەرزو قۆڵە کرد تا لەو سۆنگەیەوە کەوتیتە زندان. برۆ، لێرە مەمێنە، برۆ بۆ خۆت کونجێکی چۆڵ پەیدا بکە، برۆ، برۆ بۆ حاڵی خۆت بگری، بۆ پاکی و بێگەردی لە دەست چووت بگری، تۆبە بکە، بەڵکو خواوەند لێت خۆش بێ و تۆبەت لێقەبووڵ بکات. دەی هەستە برۆ، بە

ڕاستمە، گاڵتە ناکەم. خێرا بڕۆ، تا زووە پەشیمانی خۆت دەربڕە، هیچ شتێک وەکو پەشیمانی لە ڕابردوو، بۆ مرۆڤ باش نییە، پاکت دەکاتەوە!.

هەڵبەتە پێویستە بە گوتن ناکات کە هەموو ئەو شتانە بەوپەڕی ڕاشکاوی گوتران. جەنەراڵ وەکو هەموو مەی گوساران، فرە هەستیار و دڵناسک بوو، وەکو هەموو ئەو بادەنۆشانەی ئالوودە دەبن و لێدەبنەوە کە ڕۆژانی خۆشی ڕابردووی بیر دەکەوتەوە زۆری عەزاب دەچەشت. هەر هەستاو بەوپەڕی ملکەچی و گوێڕایەڵی بە نیازی ڕۆیشتن، بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت. لیزاڤیتا پروکوڤیفنا زۆری بەزەیی پێیدا هاتەوە و بانگی لێ کرد و گوتی:

- ئاردالیون ئالکسندروفیچ، برای ئازیز، دەقەیەک سەبرکە، ئێمە هەموومان هەر گوناهکارین. هەرکاتێ هەستت کرد کەویژدانت تۆزێ ئاسوودە بووە و کەمێک هێوریوە، وەرە دیدەنیم، تا کەمێک باسی ڕابردوو بکەین. بە چ مەعلوم من پەنجا ئەوەندەی تۆ و زیاتریش، گوناهکار نیم؟.

کە بینی خەریکە دەگەڕێتەوە، بە نیگەرانیەوە لەسەری ڕۆیشت:

- جارێ خوا حافیزت بێ! بڕۆ، تۆ ئیشت لێرە نییە...

کولیا ویستی بەگەڵ بابی بکەوێ، بەڵام میرزادە پێیگوت:

- جارێ وازی لێبێنە، لەگەڵی مەڕۆ. ئەگینا مجێزی تێک دەچێت و ئەو خەیاڵە خۆشەی لێ دەشێوێ!

لیزاڤیتا پروکوڤیفنا گوتی:

- ڕاست دەکات! وازی لێ بێنە! با جارێ بە تەنیا بێ، دوای نیو سەعاتێکی دی بڕۆ بۆ لای.

لیبدیف، زاتی وەبەر خۆی نا و گوتی:

- بەدرێژایی تەمەن تەنیا یەک کەڕەت ڕێدەکەوێ پیاو حەقیقەت بڵێ. ئەم قسانە خستیانە گریان.

لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، لە دەمی دایەوە و گوتی:

- ئەگەر ئەوەی دەربارەی تۆ دەگوترێ ڕاست بێ، تۆش هیچت لەو زیاتر نییە! تۆش لەو باشتر نیت!

بەرە بەرە، ڕەئی و هەڵوێستی میوانەکانی دەوری میرزادە، بەرانبەر بە یەکدی دەردەکەوت. میرزادە، هەستی بەوە دەکرد کە خانەوادەی یەپانچین، یانی خانم یەپانچین و کیژەکانی، زۆر دڵسۆزانە و ڕاستگۆیانە بە خەمی ئەوەوەن. بۆیە دەرفەتی هێناو بەوپەڕی ڕاستگۆیی پێی گوتن، کە بەر لەوەی ئەوان بێن، وێڕای نەخۆشی خۆی و درەنگی کاتەکەش، هەر تەما بووە، ئەو ڕۆژە بچێتە دیدەنیان. لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، نیگایەکی پڕ حەقارەتی میوانەکانی دیکەی کرد و بەرسڤی دایەوە کە ئێستاش نەچووە بچێت.

پتیتسن، وەکو خووی هەمیشەیی و ئاسانگیری خۆی، یەکسەر هەستاو، بەو ئومێدەی (لیبدیف)ش چاوی لێ بکات، بۆ ڤێلاکەی لیبدیف ڕۆیشت، بەڵام لیبدیف ئەوەندەی پێگوت کە تۆ بڕۆ وا منیش هاتم. ڤاریا کە دەگەڵ کیژەکاندا سەرگەرمی گفتوگۆ بوو، هەر لەوێ مایەوە. ئەو و گانیا ڕۆیشتنەکەی جەنەراڵیان پێ خۆش بوو. گانیاش، کەمێک دوای پتیتسن هەستاو ڕۆیشت. گانیا، لەو ماوە کەمەدا، کە لە بانیژەکەدا، دەگەڵماڵباتی یەپانچینەکاندا بەسەری برد، حورمەتی خۆی گرتبوو، نیگاکانی لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، کە دووجار سەراپای بەر نیگا دابوو، نەیان پەشۆکاند بوو. ئەوانەی کە پێشتر دەیانناسی، یەکسەر هەستیان کرد کە زۆر گۆڕاوە. ئاگلایا بەم هەڵوێستەی وی زۆر خۆشحاڵ بوو.

ئاگلایا، بە عادەتی هەمیشەیی خۆی کە حەزی لەوە بوو قسان بە خەڵکی ببڕێت، لەناکاودا و بێ ئەوەی ڕووی دەمی لە کەسێکی تایبەتی بێت، بە دەنگی بەرز پرسیی:

- ئەوە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بوو کە هەنوکە چووە دەرێ؟ خۆی نەبوو؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، خۆی بوو.

ئاگلایا گوتی:

- خەریک بوو نەیناسمەوە. زۆر گۆڕاوە... لە جاران باشتر بووە.

میرزادە گوتی:

- زۆرم پێ خۆشە، کە بەو شێوەیە گۆڕاوە.

ڤاریا، بە هاودەردییەکی ئاشکرا و خۆشحاڵییەکی پەنهانەوە هەڵی دایە:
- زۆر نەخۆش بوو.
لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، بە دەنگێکی تورە و بە نیمچە سەرسامییەکەوە پرسیی:
- چ شتێکی باشتر بووە؟ ئەمەت لەکوێوە دەر هێنا؟ ئاخر باشتربوونەکەی کامەیە؟
کولیا، کە هێشتا بەدیار کورسییەکەی لیزاڤیتا پروکوڤیفناوە وەستابوو، لەپڕ هەڵی دایە و گوتی:
- حەیف نییە پیاو هەر (سوارچاکێکی لات*) نەبێت.
میرزادە (س) بەدەم پێکەنینەوە گوتی:
- منیش هەمان ڕەئیم هەیە.
ئادیلاید گوتی:
- منیش هەمان ڕەئیم هەیە.
خانم یەپانچین، سەرسام و تورە نیگایەکی هەر دووکیانی کرد و گوتی:
- مەبەستتان لە (سوارچاکی لات) چییە؟
کاتێک بینیی ئاگلایا سوور بووەوە، بە تورەیی لە سەری ڕۆیشت:
- قسەی قۆڕ و بێمانا! ئەم "سوارچاکە لاتە" کێیە؟
ئاگلایا، بە تورەییەکی زۆرەوە بەرسڤی دایەوە:
- چما ئەمە یەکەم جارە ئەم منداڵە نەگریس و بەدفەڕە، ئەم دەسکەگوڵەی تۆ، قسەی خەڵکانی دی هەڵگێڕێتەوە؟
ئاگلایا، زۆر جار تورە دەبوو، زوو زوو هەڵدەچوو، بەڵام تورەییەکەی، زیاتر لە تۆرانی سادە و ساکاری منداڵ دەچوو. کە پیاو بەو حاڵەوە دەیبینی، پێکەنین دەیگرت، جڵەوی پێکەنینی خۆی پێ نەدەگیرا. ئیدی ئەم پێکەنینە بە جارێ دەهری دەکرد، چونکە سەری لەوە دەر نەدەکرد کە بە چی پێدەکەنن و لە دڵی خۆیدا دەیپرسی: "چۆن زات دەکەن بەو پێبکەنن.
ئەم جارەیان هەر دوو خوشکەکەی و میرزادە (س) یش پێکەنین، تەنانەت میرزادە ( لیون نیکولایوفیچ )ش هەرچەندە نازانین بۆ سوور

بووبووەوە! بزەیەکی بۆ کرد. کولیا کە سەرکەوتبوو، پڕ بەزار قاقای لێدەدا. ئاگلایا تورە بوو، ئەم تورەییە هێندەی دی جوانی کرد. ئەو تورەیی و نیگەرانییەی کە هەستی پێ کردن. هێندەی دی جوانیان کرد. ئاگلایا لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- باشە ئەم کوڕە هەر ئەوە پیشەی نەبووە، هەمیشە هەر قسەکانی تۆی هەڵنەگێڕاوەتەوە؟

کولیا گوتی:

- من هیچم نەگوتووە، تەنیا قسەیەکی خۆتم دووبارە کردووەتەوە. نزیکەی مانگێ لەوە پێش کاتێ "دۆنکیشۆت"ت دەخوێندەوە بە خۆت گوتت هیچ شتێک لە "سوارچاکێکی لات" باشتر نییە. هەنگێ نەمدەزانی مەبەستت کێیە: مەبەستت دۆنکیشۆتە، یەڤگینی پاڤلوڤیچە، یان کەسێکی ترە؟ بەڵام بە قسەکانتا دیار بوو کە کەسێکت مەبەستە و گەنگەشە و قسەیەکی زۆریش لەو بارەیەوە کرا.

خانم یەپانچین، بە تورەیی قسەکەی پێبڕی:

- کوڕۆ، هەستدەکەم لە مەزەندەکانتا زیادەڕۆیی دەکەی... زیادی پێوە دەنەی.

کولیا بەرسڤی دایەوە:

- هەر من وا دەڵێم؟ هەمووان وا دەڵێن. تۆزێ لەمەپێش میرزادە (س) و ئادیلاید ئیڤانوڤنا و خەڵکانێکی دیکەش گوتیان کە لایەنگری "سوارچاکی لات"ن. کەواتە ئەم سوارچاکە هەیە، من پێم وایە ئەگەر ئادیلاید ئیڤانوڤنا زوو پاشەکشەی نەکردبا، لەمێژبوو دەمانزانی ئەو سوارچاکە لاتە کێیە.

ئادیلاید، بە پێکەنینەوە پرسیی:

- خەتای من چییە؟

- خەتای تۆ ئەمەیە کە قەبووڵت نەکرد پۆرترێتێکی ئەومان بۆ بکێشیت! هەرچەندە ئاگلایا ئیڤانوڤنا تکای لێ کردیت کە ئەو کارە بکەیت و تەنانەت هەموو تەفسیلاتێکی وێنەکەی وەکو لای خۆی تەسەوری کردبوو، بۆ شرۆڤە کردیت، بیرت نایەت؟ بەڵام تۆ نەتویست...

- ئاخر کاری وا چۆن دەکرێت، وێنەی کێم بکێشایە؟ ئەو سوارچاکە لاتەی کە بۆ من باس کرا، پیاوێک بوو:
کەس چارەی نەبینیبوو.
شەو و ڕۆژ کڵاوخودی لە سەر بوو.
دەبوا چ چارە و سیمایەکی بدەمێ؟ چیم وێنە بکێشایە؟ کڵاوخود؟ دەمامکی پۆڵایین؟ وێنەی کەسێکی بێ دەموچاوم بکێشایە؟
خانم یەپانچین، بە بێزارییەوە گوتی:
- ئەوە باسی چ دەکەن؟ هیچ تێناگەم! ئەم کڵاوخودو دەمامکە پۆڵایینە چییە کە باسی دەکەن؟
بە سیمایدا دیار بوو کە دەزانێت مەبەست لەم سوارچاکە لاتە کێیە (پێدەچوو، دەمێک بێ لە خەیاڵی خۆیدا دیاریی کردبێت.)
ئەوەی خانم یەپانچینی پەست دەکرد، ئەو پەشۆکانە ئاشکرایە بوو کە بە سیمای میرزادە لیون نیکولایوفیچەوە دیاربوو، بە جۆرێ دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو لە تۆ وایە منداڵێکی دە ساڵانە. خانم یەپانچین درێژەی دایێ:
- ئەم گەوجە گەوج و شۆخیبازییە کەی دەبڕێتەوە؟ چیرۆکی ئەم سوارچاکە لاتەم بۆ باس دەکەن یان نا؟ یانی ئەوەندە نهێنییەکی گەورەیە کە باس نەکرێت؟
هەموو، بە جارێ لە قاقای پێکەنینیان دا.
میرزادە (س) کە بە ئاشکرا حەزی دەکرد، بابەتەکە بگۆڕێ، هەڵی دایە و گوتی:
- مەسەلەکە، شیعرێکی ڕووسی عەنتیکەیە و هیچی دی. شیعرێکە نە سەری هەیە و نەبن، دەربارەی بابایەکی سوارچاکی لاتە. نزیکەی مانگێ لەوەپێش، ئێوارەیەک دوای شێو، بەدەم گفتوگۆ و پێکەنینەوە لە بابەتێک دەگەڕاین کە ئادیلاید بیکات بە تابلۆیەک. تۆ بە خۆت دەزانی، لە کۆنەوە دۆزینەوەی بابەت بۆ تابلۆکانی ئادیلاید بووە بە ئەرکی خانەوادەکە. یەکێکمان، لە بیرم نەماوە کێ بوو، پێشنیازی کرد کە ئەم سوارچاکە لاتە

بکات بە تابلۆ و وێنەی بکێشێت.

کولیا هاواری کرد:

- بیرۆکەی ئاگلایا ئیڤانوڤنا بوو!

میرزادە (س) لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- دەبێت، بەڵام من لە بیرم نەماوە. ئیدی هەندێک گاڵتەیان بە بابەتەکە هات و هەندێکی دی گوتیان هیچ شتێک لەمە باشتر نییە، بابەتە ئەمما بابەت، بەڵام دەبێ گونجاوترین دەموچاوی بۆ بێنە هەڵبژاردن. ئیدی هەموو کەوتینە بیرکردنەوە تا بزانین لەنێو دەموچاوی ئاشناو دۆستەکانی خۆماندا دەموچاوی کێ لەم بابەتە دێت، بەڵام هەرچی بیرمان کردەوەو، سەرمان هێناو سەرمان برد، لەسەر دەموچاوی هیچ کەسێک نەگیرساینەوە. ئەمە حاڵ و حیکایەتەکە بوو. ئیدی نازانم بۆچی نیکولا ئاردالیونوفیچ، لەم کاتەدا ئەو بابەتەی وەبیر هاتووەتەوە. ئەو بابەتە بۆ ئەو کاتە خۆش بوو، بەڵام ئێستا نە تامی هەیە و نە بایەخ.

لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، بە توڕەیی گوتی:

- چونکە ژێراو ژێر مانای ناخۆشی تیایە. قسەیەکی بە نێشوئێشە.

ئاگلایا، کە زەوقی هاتبووەوە تایم و بە تەواوەتی بەسەر خۆیدا زاڵ بووبوو، لەناکاوا، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، زۆر بەجیددی گوتی:

- هەرگیز شتی وا نییە؟ بە پێچەوانەوە، ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی تیایە.

بەگوێرەی هەندێ قەرینە و نیشانان لەوە دەچوو بە بڵاوبوونەوەی زیاتری ئەم چیرۆکە خۆشحاڵ بێت، کە هەستی کرد و بینی نیگەرانی میرزادە سات بە سات زیاتر دەبێت، بە جارێ هاتە زەوق. لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری.

- هەوەڵ جار وەکو شێت پێدەکەنن و، پاشان باسی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەت دەکەن! ئەمە شێتاتیە یان ڕێز و حورمەت؟ دەی پێم بڵێ، چۆن لەناکاوا ئەمەت بە بیراهات؟ پێم بڵێ ئەم ڕێزو حورمەتەت لەکوێوە بۆ هات؟

ئاگلایا، بە هەمان سەنگینی و ویقارەوە، بەرسڤی پرسیارە توندو





تیژەکەی دایەوە و گوتی:

- کە باسی ڕێز و حورمەت دەکەم، لەبەر ئەوەیە ئەم قەسیدەیە باسی پیاوێک دەکات کە باوەڕی بە یەک ئایدیال هەیە و کوێرانە هەموو ژیانی لە قەبەڵی ئەو ئایدیاڵ و ئارمانجە کردووە. کە شتی وا لەم سەردەمەی ئێمەدا یان لە بنی نییە یان ئەگەر هەبێ یەجگار کەمە. لە قەسیدەکەدا دیار نییە کە ئایدیاڵی سوارچاکە لاتەکە چییە، ئایدیالەکەی دیارینەکراوە، بەڵام بەئاشکرا دیارە کە تەجەلی خەیاڵی خالیسە و جوانیی ڕووتە، تەنانەت ئەم سوارچاکە شەیدا دڵە، لەجیاتیی دەسماڵ، تەزبیحێک لە ملی خۆی دەئاڵێنێ. ڕاستە ئەم شیعرە، ڕەمزێکی هەندێ گۆنگ و نامەفهومی تیایە کە بریتییە لە حەرفێن "ئا. م. ب*" کە لەسەر قەڵغانەکەی نەخشێنراوە.

کولیا، بۆی ڕاست کردەوە و گوتی:

- " ئا. م.د "

ئاگلایا، بە تەشەرەوە گوتی:

- من حەز دەکەم بڵێم "ئا. م. ب" و ژێوانیش نابمەوە. بەهەرحاڵ یارۆی سوارچاکی لات، بەلایەوە گرینگ نییە دلبەرەکەی،خانمەکەی (سیدتە) کێیە، چیدەکات، چ کارەیە. گرینگ ئەوەیە بەگەنی کردووە و هەڵی بژاردووە، دڵبەندی "جوانیە پاک و خاڵیسەکەیەتی" و هەتا هەتایە کڕنۆشی بۆ دەبات، دەیپەرستێ. شکۆی ئەشقی ئەم سوارچاکە لاتە لەوەدا بوو کە ئەگەر ئەم دلبەرەی ئەو دواتر تەنانەت دەست بداتە دزییش، ئەو هەر بەرەڤانی لێدەکرد، باوەڕی پێی لەق نەدەبوو و شەڕە شمشێری لەسەر "جوانییە خاڵیسەکەی" دەکرد. لەوە دەچێ شاعیر ویستبێتی لەوێنەیەکی دەگمەن و ئاوارتەدا چەمکی قووڵ و بەرین و پاکی ئەشقی سوارچاکی و ئەفلاتوونی بەرجەستە بکات، بەڵام ئەم ئایدیالە لەلای "سوارچاکە لاتەکە" نەک هەر دەگاتە لوتکە، بەڵکو دەگاتە خەڵوەت نشینی و چلەکێشان. هەڵبەتە دەبێ دان بەوەدا بنەین کە ئەم هەست و سۆزە، کە خۆی لە خۆیدا سەبرو حەوسەڵەیەکی زۆری دەوێ، ورەیەکی بەرزی دەوێ، گاڵتە نییە، گاڵتەی پێناکرێت، هەستێکی قووڵ و مایەی ستاییشە، با بشوبهێتە سەر

دۆنکیشۆتیش، ئەم سوار چاکە لاتە دۆنکیشۆتە، دونکیشۆتێکی جدی نەک کۆمیدی. من لە سەرەتاوە لێی نەدەگەیشتم، نەک بیروهزری ئەوم بۆ دەرک نەدەکرا، بەڵکو گاڵتەشم پێی دەهات، بەلام هەنوکە "سوارچاکە لات)ەکەم خۆش دەوێ، ڕێزی بوێری و هەڵوێستەکانی دەگرم.

ئاگلایا، قسەکەی خۆی تەواو کرد. بێدەنگ بوو. هەرچەند تەمەشات دەکرد، زۆر زەحمەت بوو بتوانی بزانی ئەو قسانەی بەجدی بوو یان سوعبەت و ڕابواردن بوو.

خانم یەپانچین هەڵی دایە:

- بێگومان، ئەم "سوارچاکە لاتە"، هەرچەندە تۆ زۆرت بە بوێری و هەڵوێستەکانیا هەڵدا، پیاوێکی شەواک و گێل بووە، بەلام تۆ، کچەکەم محازەرەیەکی دوورودرێژت پێ گوتینەوە. پێم وایە بەخۆتیش چاک بزانیت کە باشت نەکرد، تۆ و ئەم وەعز دادانەیان نەگوتووە. ئەو شیعرە چۆنە؟ ئەگەر لەبەرتە بۆمی بخوێنەوە. هەرچەندە بە عەمراتم حەزم لە شیعر نەکردووە، بەلام زۆر حەز دەکەم گوێم لێی بێ...

هەنگێ کە دیار بوو زۆر پەست و توڕەیە، ڕووی کردە میرزادە لیون نیکولایوفیچ و گوتی: میرزادە بێزەحمەت تەحەمول بکە، حیلمت بێ، حیلم و سەبر بۆ من و تۆ باشترین شتە.

میرزادەویستی شتێک بڵێت، بەلام لەبەر نیگەرانی و شپرزەیی خۆی، نەیتوانی تاقە وشەیەکیش بڵێت. تەنیا ئاگلایا کە ڕێگەی بە خۆی دابوو ئەو هەموو "وەعزخوانییە" بکات، بە هیچ جۆرێ نەک هەر خۆی شێلو نەدەکرد. بەڵکو خۆشحاڵ و بە کەیفیش دیاربوو. لەپڕ لە جێی خۆی هەستا، ڕێک بە هەمان ویقار و سەنگ و ڕەنگی پێشووەوە. وەکو ئەوەی پێشوەختە خۆی بۆ خوێندنەوەی ئەو شیعرانە ئامادە کردبێت و چاوەڕوانی یەکێک بێت تەکلیفی لێ بکات. ڕێک خۆی گەیاندە ناوەڕاستی بانیژەکە، لەبەردەم میرزادەدا، کە هێشتا لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو، ڕاوەستا. هەموو بەسەرسامی تەمەشایان کرد.

میرزادە (س)، هەر دوو خوشکەکەی ئاگلایا، دایکی و هەموو





ئامادەبووان، لەم پرکێشییە منداڵانەیەی ئەو، کە تۆزێک لە حەد دەر چووبوو، نیگەران بوون، بەڵام بەئاشکرا دیار بوو کە ئاگلایا لەم ڕەفتار و زەمینەسازییەی خۆی، بۆ خوێندنەوەی شیعرەکە ڕازی و خۆشحاڵ بوو. لیزاڤیتا پروکوڤیفنا بە نیازبوو ڕێی لێبگرێت و بێگەڕێنێتەوە سەر جێگاکەی خۆی، بەڵام دەقاودەق لەو دەمەدا کە ئاگلایا خەریک بوو دەست بە خوێندنەوەی شیعرەکە بکات، دوو میوانی تازە، کە بە دەنگی بەرز قسانیان دەکرد، لە جادەکەوە سەرکەوتن و خۆیان بە بانێژەکەدا کرد. میوانەکان جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین بوو لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا. هاتنی ئەوان، جۆرە سەرسامییەکی لای ئامادەبووان دروست کرد.

پەراوێز:

* - "هەزارەمین ساڵیادی دامەزراندنی ڕووسیا...": ئەو ڕۆژەی هاوینی ساڵی ١٨٦٢، کە زنجیرە ئاهەنگێکی گەورە و بەشکۆی تیادا ساز کرا، ئەو ڕۆژە بوو کە هەزار ساڵ بە سەر چوونی میری یەکەم، ڕۆرێک، بۆ نوڤوگوردود، لە ساڵی ١٠٦٢دا تێپەڕیبوو. ئەوسا مینیمونتێک بەو بۆنەیەوە دامەزرا، کە تا ئێستا ماوە.

* - "سوارچاکی لات...": چامەیەکی پوشکینی شاعیرە کە لە ساڵی ١٨٣٠دا دای ناوە، لەو چامەیەدا باسی سوارچاکێکی سەدەکانی ناڤین دەکات کە مریەمی پاکیزەی کردووە بەخانمی نموونەیی و ئایدیالی خۆی.

* - "سوار چاکە لاتەکە، ئەم سێ پیتەی "ئا. م. د" کردبوو بە دروشم و ئارمی خۆی، کە بریتییە لە پیتی یەکەمی سێ وشەی لاتینی کە بە مانای (سڵاو ئەی دایکی خوا) دێت، بەڵام ئاگلایا پیتی "د"کەی گۆڕی بە "ب" کە دەکاتە پیتی یەکەمی ماڵباتی ناستاسیا فیلیپوڤنا باراشکۆفا. دوای تۆزێک بە ئاشکرا پیتێن "ن.ف.ب" جێی پیتێن "ئا. م. ب" دەگرنەوە.

## فەسڵی حەوتەم

ئەو کوڕەی لەگەڵ جەنەراڵ یەپانچیندا بوو، گەنجێکی نزیکەی بیست و هەشت ساڵ بوو. باڵابەرزێکی چالاک و چەلەنگ، بە سەروسیما وریاو زیرەک بوو، دوو چاوی درشتی ڕەشی پێوە بوو کە شۆخ تەبعیان لێدەباری. ئاگلایا، هەر ئاوڕیشی لێ نەدایەوە، بە شێوەیەکی جیلوەفرۆشانەی ئەوتۆوە لە سەر خوێندنەوەی شیعرەکە بەردەوام بوو، وەکو ئەوەی تەنیا چاوی لە میرزادە بێ و ڕووی دەمی لە کەس نەبێ، تەنیا لەو نەبێت. میرزادە، یەکسەر هەستی کرد کە ئەم ماستە موویەکی تایبەتی تیایە، بەڵام هەرچۆنێک بوو هاتنی میوانە تازەکان کەمێک هێوری کردەوە. میرزادە، بە دیتنی وان ئاخێزێکی کرد و لە دوورەوە سەری ڕێزی بۆ جەنەراڵ دانەواند و بە ئاماژەی دەست تێیگەیاند کە خوێندنەوەی شیعرەکە بە ئاگلایا نەبڕێت. ئەوجا چوو لەپشت کورسییەکەی خۆیەوە وەستا، ئانیشکی چەپی دادایە سەر پشتی کورسییەکە، تا بە متمانەیەکی زیاتر و پەریشانییەکی کەمترەوە، گوێ لە قەسیدەکە بگرێت، نەک بە شێوە یەکی کۆمیدی بە دانیشتنەوە لە قەنەفەکەیدا نقوم ببێت. لیزاڤیتا بروکوڤیفناش، لەلای خۆیەوە دوو جاران بە ئاماژەی دەست و سەر دەستووری بە جووتە میوانە تازەکە دا کە لە شوێنی خۆیان بوەستن.

میرزادە، هەر لە خۆوە، هەستی بە جۆرە ڕێزو خۆشەویستییەکی تایبەتی بەرانبەر بەو کوڕە گەنجە کرد کە دەگەڵ جەنەراڵدا هاتبوو. بە مەزەندەوای

بۆ چوو کە ئەمە هەمان ئەو یەڤگینی پاڤلوفیچ ڕادومسکییەیە کە زۆری لە بارەیەوە بیستبوو و چەند جارێکیش بیری لێ کردبووەوە، بەڵام ئەو جلوبەرگە مەدەنییەی بەری سەری لێ شێواندبوو، چونکە بیستبووی گوایە یەڤگینی بافلوفیچ پیاوێکی سوپاییە نەک مەدەنی*. بە درێژایی ماوەی شیعر خوێندنەوەکە، بزەیەکی تەوسامێز، ناو بە ناو بەسەر لێویەوە هەڵدەهات و زوو ئاوا دەبوو. کە لەوە دەچوو ئەویش شتێک لەمەڕ چیرۆک و سەربهوردی "سوارچاکە لاتەکە" بزانێت.

میرزادە بە خۆی گوت: "لەگینە هەموو ئەمە زادەی خەیاڵ بێ".

بەڵام ئاگلایا، باری دەروونی زۆر جیاواز بوو. ئەو خۆنوێنییەی کە لە دەستپێکی خوێندنەوەی چامەکەوە نیشانی دەدا، نەما، گۆڕا، بوو بە سۆزێکی مەنگ و ئاوێتەی مانای بەیتە شیعرەکان بوو، ئەوەندە بە جوانی خوێندییەوە، نەک هەر ڕوحی بە بەر چامەکەدا کرد، بەڵکو بە جۆرێ سەرنجی هەمووانی ڕاکێشاو نێوەڕۆک و مانای شیعرەکەی بەرجەستە کرد. کە هەندێ لە ئامادەبووان، پاکانەیان بۆ خۆ نواندنەکەی سەرەتا دەهێنایەوە و دەیانگوت ئەو هەموو خۆنوێنی و جیلوەفرۆشییە، خۆی لە خۆیدا ڕێز و حورمەتێکی زیرەکانەی کیژییە بۆ ئەو چامەیەی کە خوێندییەوە.

چاوانی دەدرەوشانەوە، دووجار، سووکە تەزوویەکی پێواری (نەدیار) حەماسەت ئامێز، ڕووە دڵڕفێن و جوانەکەی ڕووناک کردەوە.

ئەمەش ئەو بەیتانەیە کە خوێندنیەوە:

ڕۆژێ لە ڕۆژان
سوارچاکێکی هەژار
کڕ و کپ و سادە و بێدەنگ
سیما خەمین و ڕەنگزەرد
بەڵام ڕوح پاک و دلاوەر
خەونێکی بینی
زۆر کاری لە دڵ و دەروونی کرد



گەمژە

ئیدی لەو ڕۆژەوە
تەمەشای ژنانی تەرک کرد
تا مردیش زاری لە
زاری ژن نەگەڕا.
لەجیاتیی دەسماڵ
تەزبێحێکی لە مل ئاڵاند.
دەمامکێکی ئاسنینی کرد
شەوو ڕۆژ دای نەدەکەند.
کڵاوخودێکی لەسەر نا
شەوو ڕۆژ دای نەدەکەند
کەس سەروچاوی نەدەبینی
دڵی تەژی خۆشەویستییەکی پاک بوو
بەئەمەک و وەفادار
خۆی لە قەبەڵی خەونەکەی کرد
بە خوێنی خۆی لەسەر قەڵغانەکەی
لەجیاتیی ناوونیشان
حەرفێن "ئا. م. د"ی نووسیبوو
لە بیابانی کاکی بە کاکی دوورەدەستی
فەلەستینا لە کاتێکا
پاڵەوانان، سوارچاکان، بە
جۆشوخرۆشەوە
دەچوونە مەیدانی شەڕ
برووسکە ئاسا پەلاماریان دەدا
ناوی مەحبوبەکانی خۆیان دەبرد
پڕ بەزار، بەدەم هێرشەوە، هاواری کرد
ئەی ڕووناکیی ئاسمان، ئەی ڕۆزای پیرۆز!
فریام کەوە، دەست بدە باڵم

ئیدی بروسکە ئاسا پەلاماری دەدا
سەری دژمنی دەپەڕاند.
کە بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە
کونجی خەڵوەتی گرت، وەکو ڕەبەنان
هەمیشە بێدەنگ، هەمیشە خەمین ژیا
تا مەرگ، مەلی ڕوحی ئازاد کرد
خەڵکی بە شێتیان ناو دەبرد.

کاتێ میرزادە، دواتر، ئەو ساتانەی بیر دەکەوتنەوە، تا ماوەیەکی زۆر دەحەپەسا، زۆری لە بەر گرانبوو کە وەڵامی ئەم پرسیارەی پێ نەدەدۆزرایەوە: چۆن دەتوانن هەست و سۆزێکی ئەوەندە ڕاستگۆیانە، ئەوەندە ڕەسەن و جوان، ئاوێتەی تەوس و توانجێکی ئەوەندە ئاشکرا، ئەوەندە بێ پەردە، ئەوەندە زەق و خراپ بکەن؟ گومان لەوەدا نەبوو کە تانەوتەشەرێک لەئارادایە، بەڵگەی بێ چەند و چوونیشی ئەوە بوو: ئاگلایا بەدەم خوێندنەوەی شیعرەکەوە، ڕێی بە خۆی دابوو پیتێن (ئا. م. ب) بگۆڕێت بە پیتێن (ن. ف. ب). میرزادە دڵنیا بوو کە بە هەڵەدا نەچووە و بە هەڵە گوێی لەو بەیتە نەبووە و (پاشان دروستی ئەم بیرە دەر کەوت)، بەهەرحاڵ تانەوتەشەرەکەی ئاگلایا – کە بێگومان سوعبەتێکی بە نێشوئێش و گەوجانە بوو- بەئانقەست بووە. "سوارچاکی لات" پێش ئەوە، مانگێک بوو، کەوتبووە سەر زاری هەموویان و مایەی سوعبەت و پێکەنینیان بوو.

بەڵام کاتێ میرزادە، دواتر بەم یادەوەرییانەدا چووەوە، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ئاگلایا ئەم پیتانەی "ن. ف. ب" نەک هەر بە غەرەز و تانەوتەشەرەوە ئەدا نەکرد، بەڵکو بە هێمنی و ئارامی و سادەیی و بێگەردییەکی ئەوتۆوە ئەدای کردن، کە پیاو وا هەست بکات کە ئەم پیتانە لە بنەڕەتدا بەشێک بوون لە دەقی شیعرەکە.

بەهەرحاڵ، میرزادە، پاش ئەوەی گوێی لە چامەکە بوو، هەستی بە دڵتەنگییەکی ناخۆش کرد. هەڵبەتە لیزا ڤیتا پروکوڤیفنا هەستی بە گۆڕینی

پیتەکان و نیاز و مەبەستی پەنهانی پشت ئەم گۆڕینە نەکردبوو. جەنەراڵ (ئیڤان فیدوروفیچ)یش جگە لە خوێندنەوەی شیعر، هەستی بە هیچ شتێکی دی نەکرد، بەڵام گەلێک لە گوێگرەکانی دی هەستیان بە مەبەستەکەی ئاگلایا کردبوو، ئەم پرکێشییەی ئەویان بەلاوە سەیر بوو، بەڵام بەردێکیان لەسەر دانابوو و خۆیان لێ بە خاوەن نەکردبوو، بەڵام یەڤگێنی باڤلوفیچ نەک هەر هەستی پێ کردبوو (میرزادە ئامادە بوو گرێو لەسەر ئەمە بکات)، بەڵکو هەوڵیشی دەدا، ئەم مەسەلەیە لەوانی دیکەش بگەیەنێ، بزە و پێکەنینەکەی لە ئەندازە بەدەر تەوسامێز بوو.

هەرکە خوێندنەوەی چامەکە تەواو بوو، خانم یەپانچین، لە ناخی دڵەوە، بەوپەڕی شەوقوزەوقەوە هاواری کرد:

– چەند جوان بوو! ئەمە شیعری کێیە؟

ئادیلاید گوتی:

– هی پوشکینە دایکە.. حەیامان مەبە! کەس هەیە نەزانێ هیی پوشکینە؟

لیزاڤیتا پروکوڤیفنا، بە گلەیی و گازاندەوە گوتی:

– ئینسان دەگەڵ ئێوەدا هێندەی دی گەوج و گەمژە دەبێ! بە ڕاستی عەیبە! هەرکە گەڕاینەوە بۆ ماڵ! ئەم شیعرەی پوشکینم بدەنێ!

– پێم وایە هیچ شیعرێکی (پوشکین)مان لە ماڵەوە نییە.

ئەلکسندرا گوتی:

– با! ئەوەندەی من لە بیرم بێ، هەمیشە دوو بەرگی شڕ و وڕی شیعرەکانی ئەومان، لە ماڵەوە هەبووە!

– هەر ئێستا، یەکێک بۆ شار بنێرن تا شیعرەکانی پوشکین بکڕێت. با ئەلکسی یان فیدور، یەکێکیان بە یەکەم قیتار بڕۆن. ئەلکسی بڕوات باشترە. ئاگلایا، وەرە! ماچم بکە! ئافەرین شیعرەکەت زۆر جوان خوێندەوە. بە ڕاستی ئافەرین!

ئەوسا، بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە لەسەری ڕۆیشت:

– بەڵام ئەگەر مەبەستت ئەوە بووبێ گاڵتە بەو بکەی، من لەگەڵ ئەم ڕەفتارەتدا نیم، چونکە لەم حاڵەدا باشتر وابوو شیعرەکە لە بنی

نـەخوێنیتەوە، لـێم تێدەگـەی؟ ئێسـتا بـڕۆ، دوایـی باسـی دەکـەین. درەنگـە، لەمێژە لێرە دانیشتوین.

لەم کاتەدا، میرزادە، خێرهاتنی جەنـەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ یـەپانچینی کرد و (یەپانچین)یش یەڤگینی پاڤلوڤیچ ڕادومسکی بە میرزادە ناساند:

– من لە ڕێگا تووشی بووم. تازە لە قیتـار دابـەزیبوو و یەکسـەر چووبـوو بـۆ مـاڵی خۆمـان، لەوێنـدەر پێیـان گوتبـوو کـە مـن بـۆ ئێـرە دێـم و هـەموو خانەوادەکەش لێرەن..

یەڤگینی پاڤلوڤیچ، قسەکەی پێبڕی  و گوتی:

– هەروەها زانیم کە تۆش لێرەیت و، مـن زۆر لـەمێژە حـەزم دەکرد نـەک هەر تەعاروفت دەگەڵ بکەم، بەڵکو دۆستایەتیشت بکەم. ئیدی لـە دڵـی خۆمـا گـوتم دەرفـەتی لەمـە باشـترم بـۆ هـەڵناکەوێ، بـا ئـەم دەرفەتـە لـە دەسـت نـەدەم... چ خێرتـە!  نەخۆشـیت؟ بـاوەڕ بکـە ئێسـتا، تـۆزێ لەمـە پـێش زانـیم نەساغی....

لیون نیکولایوفیچ، بەدەم تەوقە کردنەوە گوتی:

– حـاڵی حـازر عـەیبم نییـە، حـاڵم زۆر باشـە، بـە دیدارت خۆشـحاڵم، زۆر شـتم لـە بـارەی تـۆوە بیسـتووە، تەنانـەت دەگـەڵ میـرزادە (س)شـدا باسـم کردویت.

بەدەم ئەو مجامەلانەوە، بە گەرمی دەستی یەکتریان گوشـی و چاویـان لـە دوڕ چاوی یەکدی بڕی. گفتوگۆیەکەیان زوو بـە زوو گۆڕاو بـوو بـە قسـە و باسی گشتی. میرزادە هەستی کرد (ئێستا زۆر هەسـتیار بووبـوو، نـەک هـەر هەسـتی بـە شـتە دیارەکـان، بـەڵکو هەسـتی بەشـتە پەنهانـەکانیش دەکـرد) هـەموو ئامـادەبووان، سـەریان لەوە سـووڕمابوو کە یـەڤگینی بـاڤلوفیچ جلـی مـەدەنی لەبـەرە نـەک جلکـی سـوپایی... هەڵبەتـە ئـەم کـارە خـۆی لـە خۆیـدا ئەوەی دەگەیانـد کـە دەبـێ ڕووداوێکـی گرینـگ پێشـهاتبێت. ئادیلایـد و ئەلکسندرا، حایر و سەرسام کەوتنە پرسیاری هۆی ئـەم کـارە. یـانی بۆچـی جلـی مـەدەنی لەبـەر کـردووە. میـرزادە (س) کـە خزمـی ڕادومسـکی بـوو، نیگەرانییەکی زۆری پێوە دیار بوو. جەنـەراڵ، بـە ڕادەیـەک شـپرزە بـوو کـە

دەنگی دەلەرزی. تەنیا ئاگلایا زۆر هێدی و هێمن بوو، وەک دەڵێن مێشی میوان نەبوو. بە کونجکاوی نیگایەکی یەڤگینی باڤلوفیچی کرد، لە تۆ وایە گەرەکیەتی بزانێ ئاخۆ جلکی مەدەنیی زیاتر لێ دێت یان جلکی سوپایی، بەڵام دوای تۆزێک ڕووی وەر گێڕا و هەر تەمەشاشی نەکردەوە. ( لیزاڤیتا پروکوفیفنا )ش، هەرچەندە جۆرە نیگەرانییەکی، پێوە دیاربوو، بەڵام هیچ پرسیارێکی لێ نەکرد. میرزادە، هەستی کرد کە خانم یەپانچین، کەمێک دەگەڵ یەڤگینی پاڤلوفیچدا ساردە.

ئیڤان فیدوروفیچ، بەدەم وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەکانەوە دەیگوت و دەیگوتەوە:

- بە ڕاستی زۆر سەرم سووڕ ما، کاتێ لە پترسبۆرگ، بە جلکی مەدەنییەوە دیتم، بەڕادەیەک سەرم سووڕ ما کە باوەڕم بە چاوی خۆم نەدەکرد. لە دڵی خۆدا گوتم ئەم گۆڕانە کوتوپڕە چییە؟ ئەمە چ مەتەڵ و لەگەزێکە! خۆ ئەو بە خۆی دەیگوت پەلە کردن باش نییە، پەلە کردن کاری شەیتانە.

لە کۆی ئەو قسانەدا دەربارەی ئەو مەسەلەیە، ئەوە دەر کەوت کە یەڤگینی پاڤلوڤیچ، دەمێ بوو باسی ئەوەی کردبوو کە بە نیازەواز لە خزمەتی سوپایی بێنێ، بەڵام کە دەهاتە سەر ئەو باسە، ئەوەندە بە لامسەرلایی باسی دەکرد کە کەس باوەڕی پێنەدەکرد. ئیدی عادەتی وابوو بە شۆخییەکی ئەوتۆوە باسی مەسەلەێن جیددی دەکرد، کە خەڵکی نەیاندەزانی باوەڕی پێبکەن یان نا، بە تایبەتی ئەو جارانەی کە خۆی ویستبای خەڵکی چەواشە بکات و بیانخانە گومان و دوو دڵییەوە.

یەڤگینی پاڤلوڤیچ، بەدەم بزەیەکەوە گوتی:

- بەڵام تا ماوەیەک واز لە خزمەتی سوپایی دێنم، بۆ چەند مانگێک، ئەوپەڕەکەی بۆ ماوەی ساڵێک.

جەنەراڵ، بەوپەڕی گەرموگوڕی گوتی:

- بەڵام، ئەوەندەی من ئاگادارم، ئەوەندەی من ئاگام لە کاروبارت هەیە، پێویستی بەمە نەدەکرد.

- بەڵام لەسەر قسەی تۆ، گەرەکمە سەرێکی موڵکەکانم بدەم، ئەدی بە خۆت پێت نەگوتم؟ وێڕای ئەمەش نیازی سەفەرێکی هەندەرانم هەیە...

زوو بە زوو ڕێڕەوی گفتوگۆکان گۆڕا، بەڵام لەوە دەچوو میرزادە، گیرۆدەی نیگەرانی و بێئۆقرەییەکی دژوار بێت و نەیدەزانی هۆیەکەی چییە.

یەڤگینی باڤلوڤیچ ڕادومسکی، چووە لای ئاگلایاوە و گوتی:

- چییە هەمدیس باسی "سوارچاکە لاتەکە" هاتووەتەوە گۆڕێ؟.

میرزادە، سەری لەوە سوورما کە بینی، ئاگلایا بە نیگایەکی پڕ سەرسامی و پرسیارئامێز جوابی یارۆی دایەوە، لە تۆ وایە، بە زمانی نیگا پێی دەڵێت قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان، مەسەلەی (سوارچاکە لاتەکە )، بابەتی باسی نێوان ئەوان نەبووە و تێناگات بۆ ئەو پرسیارەی لێ دەکات؟

کولیا، هێشتا هەر گەنگەشەی دەگەڵ لیزاڤیتا پراکوڤیڤنادا دەکرد و دەیگوت و دەیگوتەوە:

- ئێستا درەنگە، زۆر درەنگە، وەختی ئەوە نەماوە کە کەسێک بۆ شار بنێردرێت تا کتێبی پوشکین، بکڕێت. سێ هەزار جارم گوت کە زۆر دڕەنگە!

یەڤگینی پاڤلوڤیچ، بەهەشتاو لە ئاگلایا دوور کەوتەوە و گوتی:

- ڕاست دەکات... درەنگە... تا دەگەیتە شار، دوکان و بازاری پترسبۆرگ دادەخرێن.

هەنگێ تەمەشای سەعاتەکەی کرد و گوتی:

- وا سەعات نۆیە.

ئادیلاید گوتی:

- کە تا ئێستا بەبێ کتێب هەڵمان کردووە دەشتوانین تاسبەی چاوەڕوان بکەین.

کولیاش گوتی:

- ئەمە جگە لەوەی کە بایەخدانی زۆر بە ئەدەبیات، بۆ کۆمەڵگەی خانەدان و ئەرستۆکرات، زۆر پەسند نییە. حەز دەکەن لە یەڤگینی پاڤلوڤیچ بپرسن. بۆ نموونە پیاو گالیسکەیەکی زەردی، پێچکە سووری هەبێت، زۆر دیارتر و باشترە لە کتێب.

ئادیلاید، هەڵی دایە و گوتی:

- کولیا، دیسان خەریکی قسەی ناو کتێبان دەڵێیتەوە!

یەڤگینی باڤلوڤیچ گوتی:

- ڕاستە هەرچییەک دەڵێت، لە کتێبانەوە وەری گرتووە، دەتوانێ چەندین لاپەڕەی وەرگیراو لە گۆڤارێن ڕەخنەییەوە، لەبەر بڵێتەوە، من دەمێکە ئەمەم لە نیکولای ئاردالیونوفیچ کەشف کردووە و زۆریشم پێ خۆشە، بەڵام ئەم جارەیان قسەکەی لە کتێبانەوەوەرنەگرتبوو، بەڵکو مەبەستی گالیسکە زەردە پێچکە سوورەکانی منە، بەڵام حەز دەکەم ئەوەت پێ بڵێم کە ئەو گالیسکەیەم گۆڕیوە، بۆیە ئەو قسانەت کۆن بووە، کاتێ بەسەر چووە.

میرزادە، بەوردی گوێی لە قسەکانی ڕادومسکی دەگرت، زۆری پێخۆش بوو کە دەیبینی گەنجێکی خۆشڕەفتارو خاکی و بێ هەوا و ڕووخۆشە، بەتایبەتی کە دەیبینی لە وەڵامی تانەوتەشەرەکەی کولیادا، بە زمانێکی میانڕەوی دۆستانە دەدوێ.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لە ڤیرای کچی لیبدیفی، کە لە پرێکا، بە باوەشێ کتێبی ئەستووری، تازە بەرگ کراوەوە لە بەردەمیا وەستا، پرسیی:

- ئەمانە چین؟

ڤیرا، بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- پوشکینە، پوشکینی شاعیری خۆمان. بابم فەرمووی پێشکەش بە تۆیان بکەم.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا بە سەرسامی پرسی:

- چۆن؟ ماقوولە؟

لیبدیف، لەپشت کیژەکەیەوە دەر کەوت و گوتی:

- نا، نا دیاری و پێشکەش نیە! ناتوانم شتی وا بکەم! بەڵکو بە نرخەکەی خۆی پێتی دەفرۆشمەوە. ئەمە کۆ بەرهەمەکانی پۆشکینە، کە لەسەر ئەرکی بنەماڵەی خۆمان چاپ کراوە، چاپی ئاننکوفە* کە لە بازاڕا نەماوە و دەست ناکەوێ. جا من بە نرخەکەی خۆی، وێڕای جیاوازی

نرخی ئێستا لەگەڵ ئەوسادا، دەتدەمێ، تا تینویەتی هەستی بێگەرد و ناسکی ئەدەبی و ئەدەبدۆستی جەنابتان بشکێنێ.

- زۆر باشە، ئەگەر بیانفرۆشیت مەمنوون دەبم. دڵنیابە لەم سەودایەدا زەرە ناکەیت، بەڵام واز لەم لێبۆکبازی و ڕووبینییە بێنە!... بیستوومە کە تۆ پیاوێکی خوێنەوار و ئەهلی کتێبی، زۆر باشە، دوایی، ڕۆژێک لەم بارەیەوە قسان دەکەین. دەتوانی بە خۆت ئەمانەم بۆ بێنی؟

لیبدیف، بەوپەڕی ڕووپامایی و مەراییەوە گوتی:

- بەوپەڕی شانازییەوە...

هەنگێ کتێبەکانی لە دەست کیژەکەی وەر گرت.

خانم یەپانچین، چاوی بڕییە دوڕ چاوانی لیبدیف و گوتی:

- دەیسا باشە. بۆمیان بێنە. ئیدی بە شانازی یان بێ شانازی بێ، بیانهێنە. وریابە کتێبەکان ون نەکەیت، بەڵام بە مەرجێ تا بەر دەرگا بێی، بۆت نییە بێیتە ژوورەوە، چونکە بە نیازنیم ئەمڕۆ پێشوازیت بکەم، بەڵام ئەگەر ڤیرای کچت دەیەوێ بیان هێنی، ئەوا یەکسەر بینێرە، چونکە زۆرم چووەتە دڵەوە.

ڤیرا، بەبێ سەبری بە بابی گوت:

بۆ ناچی بەدەنگ ئەوانەوە کە لەوێندەر چاوەڕوانن؟ ئەگەر ڕێیان نەدەیت، بە خورتیش بێ دێنە ژوورەوە. گوێت لێ نییە چ ژاوەژاوێکیان ناوەتەوە!

ئەوسا، ڕوو لە میرزادە کە کڵاوەکەی داکەندبوو، گوتی:

- لیون نیکولایوفیچ، چوار کەس، ماوەیەکە لە بەرماڵەکەتدا چاوەڕوانت دەکەن، سەبریان سواوە و کردوویانە بە دەنگە دەنگ، چونکە بابم ڕێیان نادات وەژوور بکەون و بێنە دیدەنیت.

میرزادە، لێی پرسی:

- نازانی ئەو میوانانە کێن؟

- دەڵێن کاریان پێت هەیە. لەو کەسانەن ئەگەر ئێستاش ڕێ نەدرێن بێنە ژوورەوە، لارییان نییە لە جادەدا یەخەت بگرن.

جا مەسڵەحەت لەوەدایە لیون نیکولایوفیچ، ئێستا بیان بینیت و لە کۆڵ خۆتیان بکەیتەوە. گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ و پتیتسن یەک سەعاتە لە بەردەرگا خەریکن قسەیان دەگەڵ دەکەن، بەڵام فایدەی نییە، قسە نابیستن و نابیستن!

لیبدیف، بەدەم دەستبادانەوە گوتی:

- ئەوە کوڕەکەی پاڤلیشچوفە، کوڕی پاڤلیشچوفە! هیی ئەوە نییە پێشوازی بکرێت... ئەوانە خەڵکانێکن شاییستەی ئەوە نین گوێیان لێبگری. بەڵێ میرزادەی پایەبەرز! پێویست ناکا خۆت ئەزیەت بدەیت و بیانبینی، بەڵێ، شاییستەی ئەوە نین...

میرزادە، بەوپەڕی شپرزەیی هاواری کرد:

- کوڕی پاڤلیشچوف! پەنا بە خوا!... دەزانم کە... بەڵام خۆ من ئەو مەسەلەیەم بە گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ سپاردبوو. تۆزێ لەمەپێش خۆی پێی گوتم کە...

لەم کاتەدا گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ لە شوقەکەی میرزادەوە وەدەر کەوت و خۆی بە بانیژەکەدا کرد، پتیتسن بە دوویدا هات. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەنگە دەنگی گەنگەشە و دەحکە دەهات، دەنگی بەرزی جەنەراڵ ئیڤولگین لەناو چەندین دەنگی دیکەدا دیار بوو. کولیا بەهەشتاو بەرەو سەمتی دەنگەکان ڕۆیشت.

یەڤگینی پاڤلوڤیچ، بە دەنگی بەرز گوتی:

- گۆڵمەزەکە خۆش بوو!

میرزادە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "کەواتە ئەم دەزانێ مەسەلەکە چییە!".

جەنەراڵ ئیڤان فیدوروفیچ، کە بە کونجکاوی، تەمەشای تێکڕای ئامادەبووانی دەکرد و دەیزانی کە تەنیا ئەو لەم حیکایەتە تازەیە بێئاگایە، بەسەرسامی پرسی:

- کوڕی پاڤلیشچوف؟ نۆبەتی ئەم قەوانەیە، پاڤلیشچۆف کوڕی وای لەکوێ بوو؟

ئەم مەسەلەیە هەموویانی هاڕوژاند. میرزادە، هەرچەندە سەری دێنا و

سەری دەبرد، نەیدەزانی، ئەم مەسەلەیە کە تەنیا پەیوەندیی بەوەوە هەبوو، بۆچی بەو جۆرە هەموو ئامادەبووانی هاروژاندووە.

ئاگلایا، بەکاوەخۆ چوو بەلای میرزادەوە و بەپەری ویقارو جدیەوە گوتی:

- باشترین شت ئەوەیە، هەر ئێستا بە خۆت و بە بەرچاوی هەموومانەوە، بە شایەدی هەموومان ئەم مەسەلەیە یەکلایی بکەیتەوە. ئەمانە بە نیازن لەکەدارت بکەن، عەیبدارت بکەن، میرزادە. تۆ دەبێ حەقانیەت و پاکیی خۆت بەتەواوەتی بسەلمێنی. من دەزانم، کە ئەمەت لێ دەوەشێتەوە و لەدەستت دێ و لە کانگای دڵەوە و پێشوەختە بەمە خۆشحاڵ دەبم.

خانم یەپانچین هەڵی دایە:

- منیش حەز دەکەم کە سنوورێک بۆ ئەم ئیدیعا قێزەونە دابنرێت! میرزادە، هیچ خاتریان مەگرە، حەز دەکەم زۆر توندبی لەگەڵیاندا، بیانکەیت بە پەندو عیبرەت! تاقەتی بیستنی ئەم قسە و قسەلۆکانەم نەماوە، شەری زۆرم لەسەر تۆ کردووە. باشتر وایە بیان بینی. بانگیان بکە تا ئێمە لێرەین، با بێنە ژوورەوە. تەگبیرەکەی ئاگلایا تەگبیرێکی باشە.

هەنگێ رووی کردە میرزادە (س) و پرسیی:

- میرزادە، تۆ هیچت لەمەر ئەم مەسەلەیە بیستووە؟

میرزادە "س" بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، بیستوومە، لە ماڵی ئێوە بیستوومە. ئەلهەقی حەز دەکەم ئەو گەنجانە ببینم. ئەمانە نەهلیستین*، وا نییە؟

لیبدیف، کە بە جۆرێ هەڵچووبوو، خەریک بوو دەلەرزی، هەنگاوێک هاتە پێشەوە و گوتی:

- نا، یانی نەهلیستی تەواو نین، ئەمانە گروپێکی دیکەن، جیاوازن. خۆشکەزاکەم دەڵێ لە نەهلیستییەکان توندرەوترن. ئیعتراف بە نەهلیستییەکان ناکەن. قوربان، ئەگەر تۆ وا بزانیت، لە حوزووری تۆدا شەرم دەکەن یان لێت دەترسن، خەیاڵت خاوە، ئەوانە نە لە کەس دەترسن، نە

شەرم لە کەس دەکەن، زۆر ڕوودارن، نەهلیستییەکان هەر هیچ نەبێ هەندێ جار خەڵکی ڕۆشنبیریان تیایە، بگرە زاناشیان تێدا هەیە، بەڵام ئەمانە، زۆر خراترن، زیاتر خەڵکی عەمەلین. دروستە دوور بە دوورو ناڕاستەوخۆ ڕەگیان دەچێتەوە سەر نەهلیستیەکان، ئەمانە، بە وتار و نووسین لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا گوزارشت لە خۆ ناکەن. بەڵکو بە کردەوە و کرداری ڕاستەوخۆ خۆیان دەنوێنن. بۆ نموونە ئەمانە نایەن بە بەڵگەوە بۆتی ساغ بکەنەوە کە پوشکین ناکاتە هیچ و بە کەڵکی هیچ نایەت*، یان پارچە پارچە کردنی ڕووسیا پێویستە.... خۆیان بە سەلماندن و بەڵگە و بەڵگەکارییەوە خەریک ناکەن. کە شتێکیان ویست، هەر ئەوەیە و تەواو، نابێ کەس دەست بێنێتە ڕێگایان یان ڕێیان لێ بگرێت، یان هیچ کۆسپێکیان بخرێتە بەردەم. ئەمانە لە هیچ ناپرینگێنەوە، بەلایانەوە گرینگ نیە لەپێناوی گەیشتن بە مەرام و مەبەستی خۆیان، هەشت کەس بە جارێ بکوژن، کوشتن بەلای ئەمانەوەوەکو ئاو خواردنەوەوایە، بۆیە میرزادە ئەگەر بە قسەی من دەکەی...

بەڵام میرزادە میشکین کە هەستا بوو، دەرگا لەو میوانانە بکاتەوە، بەدەم زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

– لیبدیف، تۆ زۆری پێوە دەنەی، غەدریان لێدەکەی، نەهەقییان دەرهەق دەکەی. ڕاستە خوشکەزاکەت زۆری ئەزیەت داوی، ڕەنجاندووتی. لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا تۆ باوەڕی پێمەکە. دڵنیا بە خەڵکانی وەکو گورسکی و دانیلوف، حاڵەتی ڕیزپەڕو ئاوارتەن، بەڵام ئەم گەنجانە... تەنیا بە هەڵەدا چوون و هیچی دی!... بەهەرحاڵ حەز ناکەم لێرە و لە حوزوری هەمووتاندا قسەیان دەگەڵ بکەم. بمبورە لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا من لەبەر خاتری تۆ دەیان هێنمە ئێرە، تەعاروفێکتان پێ دەکەم و پاشان لەگەڵیاندا دەر دەچم و بۆ شوێنێکی دیکەیان دەبەم. فەرموون بەڕێزینە!...

بەڵام میرزادە، بیرۆکەیەکی دی دەیئازاراند (ئەزیەتی دەدا). لە دڵی خۆیدا دەیپرسی، نەبادا ئەم سیناریۆیە لەلایەن کەسێکەوە و بۆ ئەم سەعاتە و بۆ ئەم مەجلیسە ئامادەکرابێ، تا لە حوزوری ئەم هەموو شایەدەدا، عەیبدار

ببێت؟ بەڵام لەسەر ئەم " گومانە ئەهریمەنیە! " زۆری سەرکۆنەی خۆی کرد، بێئەندازە خەمبار بوو. هەستی دەکرد ئەگەر کەسێک پەی بەو هزرین و بیرەی بەرێت، ڕەنگە لە تەریقی و شەرمەزاریدا بمرێت! لەو کاتەدا میوانەکان وەژوورکەوتن، لە ناخی دڵەوە ئامادە بوو، لە باری ئەخلاقییەوە، خۆی لە هەر هەموو ئەوانەی دەوروبەری بە کمتر بزانێت.

پێنج کەس وەژوور کەوتن: چواریان تازە بوون و، جەنەراڵ ئیڤۆلگینش لە دوایانەوە بوو کە یەجگار پەست و تورە و لە حاڵی جنێودانا بوو. میرزادە بەدەم بزەیەکەوە و لەدڵی خۆیدا گوتی: "بێگومان ئەو لایەنگری منە!" کولیا کە لەگەڵ هیپولیتدا، کە یەکێک بوو لە گروپەکە، سەرگەرمی قسان بوو، دەگەڵ ئەوانی دیدا خۆی بە بانیژەکەدا کرد. هیپولیت بە سیمایەکی تەوسامێزەوە، گوێی لێدەگرت.

میرزادە، خوڵکی میوانە تازەکانی کرد کە دانیشن. بە ڕادەیەک گەنج و تازەساڵ بوون، کە ڕەچاوکردنی ئەو هەموو تەشریفاتە سەبارەت بەوان، جێی سەرسووڕمان بوو. کاتێ ئیڤان فیدوروفیچ چاوی بەم گەنجە تازە بالقانە کەوت - کە هیچی لەمەڕ ئەم "مەسەلە تازەیە" نەدەزانی و کەم و زۆر سەری لێ دەر نەدەکرد- زۆر تورە و پەست بوو، ئەگەر لەبەر خاتری ژنەکەی نەبا، کە بایەخێکی یەجگار زۆرو نالوژێکی بە کاروبارەکانی میرزادە دەدا، بێگومان زۆر تورە دەبوو و لەوە بوو مەجلیسەکە جێ بێڵێ، بەڵام چ لەبەر کونجکاوی و چ بەو نیازەی دەورێکی خێر ببینێ و بتوانێ کۆمەکێک بکات یان بەلای کەمەوە بە زەبری دەسەڵات و هەیبەتی خۆیەوە خزمەتێک بکات، دانیشت و کوڕەکەی جێ نەهێشت، بەڵام کاتێ جەنەراڵ ئیڤولگین وەژوور کەوت و لە دوورەوە کڕنۆشی بۆ برد، جارێکی دی تورەی کردەوە، دەموچاوی بە یەکاداو برۆکانی وێک هێنانەوە و قەراری دا، هەرچۆنێ بووە بێدەنگ بێت و تاقە وشەیەکی لە زار نەیەتە دەر.

لەنێو چوار میوانە گەنجەکاندا، پیاوێک هەبوو نزیکەی سی ساڵێک دەبوو. ئەمە هەمان ئەو ملازمە دەرکراوە بوو کە ئەندامی گروپەکەی ڕوگوژین بوو، هەمان ئەو بۆکسبازەی کە خۆی هەڵدەکێشاو بەوە دەفشی کە کاتی




خۆی هەر کەسێک داوای کۆمەکی لێ کردبا، لە یەک جێ، پازدە ڕۆبڵی بە جارێ دەدایە. دیار بوو کە وەکو دۆستی گیانی بە گیانی، وەکو پشت و پشتیوان و هاندەر، وەکو بەهاناوە چوون لە کاتی پێویستدا، بەگەڵ ئەو گروپە کەوتبوو. لە ناو سییانەکەی دیدا، گەنجێک لە پێشی پێشەوە بوو کە ڕۆڵی هەرە گەورەی دەبینی و، "کوڕی پاڤلیشچوف"یان پێدەگوت، بەلام خۆی، خۆی بە ناوی " ئانتیپ بۆردوفسکی"یەوە بەخەڵکی دەناساند. ئەمە گەنجێکی مووزەردی، سورفلی، دەموچاو زیپکاوی بوو، دەستێ جلی هەژارانەی چڵکنی لەبەر بوو، پاڵتۆکەی ئەوەندە چڵکن بوو، سەری قۆڵەکانی لە چڵکا دەبریقانەوە. ئێلەکێکی چڵکنی لەبەر بوو، دوگمەکانی لە ژێرەوە تا بن ملی داخستبوو، دیار بوو لە ژێرەوە کراسی لەبەر نییە، دەسماڵێکی ئاوریشمی ڕەشی چڵکنی لەملی ئالاند بوو، کە وەکو پەت لوول بووبوو، دەستەکانی نەشۆردرا بوون، نیگای تێکەڵەیەک بوو لە ساویلکەیی و ویقار، باریکەلەیەکی مەیلەو درێژ بوو، لەوە دەچوو هەر بیست و دوو ساڵان بێت. هیچ نیشانەیەکی تەوس یان هزرین بە سیمایەوە دیار نەبوو. پیاو تەنیا ئەوەی لەم سیمایەدا دەخوێندەوە کە بەئاشکرا خۆی بە مەزڵووم و غەدرلێکراو دەزانی، دەمودووی شەڕانی بوو، قسەکردنی بەپەلە بوو، بە جۆرێ وشەکانی دەدرکاند لە تۆ وایە زمانی گرانە یان کەسێکی بیانیە، لە کاتێکا بابەل باب ڕووس بوو.

ئەو خوشکەزایەی (لیبدیف)یشی دەگەڵ بوو، کە خوێنەران پێشتر ناویان بیستووە. (هیپولیت)یشی لەگەڵ بوو. ئەم هیپولیتە گەنجێکی منداڵکاری تەمەن هەڤدە هەژدە ساڵ بوو. زیرەکی بە سەروسیمایەوە دیار بوو، بەلام هەمیشە گڕژرو خەفەتبار، شوێنەواری نەخۆشییەکی ترسناکی پێوە دیار بوو، باریک و بنێس و لەڕولاواز پێستی بەسەر ئێسکییەوە هیشک بووبوو، ڕەنگی زەرد دەتگوت زەعفەرانی زەردە، چاوەکانی گەش و پرشنگدار بوون، دوو پەڵەی سوور بەسەر گۆناکانیەوە بوون، بەردەوام دەکۆکی، بە زەحمەت قسەی بۆ دەکراو هەناسەی بۆ دەدرا. دیار بوو کە نەخۆشی دەردە باریکە و سیل، کەسیرەی کردبوو. کە تەمەشات کردبا، دەتگوت

ئەوپەڕی دوو یان سێ هەفتەی دی دەژی. زۆر شەکەت و ماندوو دیار بوو، هەرکەوەژوور کەوت، بەر لەوانی دی خۆی دا بە کۆڵی کورسییەکدا.

هاوڕێکانی دیکەی بەجۆرەویقارو هەیبەتێکەوەوە ژوورکەوتن، کەمێک شپرزە و پەشۆکاو دیاربوون، پێدەچوو خەمی ئەوەیان بێ، کارێ نەکەن کە عەیبداربن و ئابڕوویان بچێت، بۆیە خۆیان قورس دەگرت. ئەم هەڵوێستە ڕێک پێچەوانەی ئەو دەنگۆیانە بوو کە گوایە ئەوانە گاڵتەیان بە هەموو دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی و خووخدەیەکی دنیایی بێفایدە و هیچ دێت و هیچ شتێکیان بەلاوە گرینگ نییە تەنیا بەرژەوەندی خۆیان نەبێت.

" کوڕەکەی باڤلیشچوف"، بە نیازی خۆناساندن، لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئانتیپ بۆردۆڤسکی.

خوشکەزاکەی "لیبدیف"ش، بە زمانێکی ڕەوان و ڕوون وەکو ئەوەی شانازی بەو ناوەوە بکات، خۆی ناساند و گوتی:

- فلادیمیر دوکتور نکۆ.

مولازمە ترۆکراوەکە خۆی ناساندو لە بن لێوانەوە گوتی:

- کیللەر.

دوا ئەندامی گروپە تازەکە، بە دەنگێکی زیقن گوتی:

- هیپولیت تیرنتیف.

ئەنجام هەموویان بەریز لەهەنبەر میرزادەدا ڕۆنیشتن. پاش ئەوەی خۆیان ناساند و لە خۆناساندن بوونەوە، هەموو ڕوویان گرژ کرد، وەکو خۆ نواندن، کڵاوەکانیان ئەم دەست و ئەو دەست پێ دەکرد. هەموو هەر ئامادەی قسەکردن بوون، کەچی هیچیان نەدەگوت، لە تۆ وایە لە بیری ئەوەدان بڵێن: "نا، قوربان، ئەگەر بەتەمای فریومان بدەیت، کڵاومان لە سەر بنەی، خەیاڵت خاوە!" پیاو وای هەستدەکرد، هەرکە یەکەم وشە لە زاری یەکێکیانەوە دەر بێ، ئیدی سەری قسان دەکرێتەوە و هەموو بەجارێک و لە هەمان کاتا دێنە قسە و چەندی بتوانن قسان بە یەکدی دەبڕن! .

پەراوێز:

* - "یەڤگینی پاڤلوفیچ، پیاوێکی سوپاییە نەک مەدەنی...": سوپاییان بۆیان نەبوو جلکی مەدەنیی لەبەر بکەن، تەنیا بۆ سەفەری هەندەران نەبێت.

* - "چاپی ئاننکوف...": یەکێکە لە چاپە هەوەڵینەکانی کارەکانی پوشکینی شاعیری گەورە، کە ئا. ئاننکوف لەنێوان سالآنی ١٨٥٥- ١٨٥٧دا بلآوی کردووەتەوە.

* - "نەهلیستی....": ئەم زاراوەیە کە دەڵێن تورگینیف یەکەم جار بەکاری هێناوە، هێشتا تازە و ناباو بوو.

* - "بۆتی ساغ بکەنەوە کە پوشکین ناکاتە هیچ و بە کەڵکی هیچ نایەت...": ئاماژەیە بۆ ئەو مشت ومڕە ڕەخنەییانەی کە لە ساڵی ١٨٦٥دا بەرپا بوو، لەو مشتومڕانەدا ڕەخنەگری نەهلیستی بیساروف، شیعری بە جارێ سووک کرد و هێرشێکی زۆر توندی کردە سەر پوشکین.

* - ڤیتولدگورسکی: قوتابیەکی هەژدە ساڵانی قوتابخانەی وەرزش بوو کە لە ساڵی ١٨٦٨دا لە شاری تامبۆڤ، شەش کەسی لە ماڵباتی ژیمارینی بازرگان کوشت. لە دادگادا هۆی ئەم تاوانەی بۆ کاریگەریی نەهلیزم گەڕاندەوە.

* - دانیلوف: کەسێکی بکوژ بوو، دادگایەکەی لەو زەمانەدا ١٨٦٦- ١٨٦٧ دەنگدانەوەیەکی زۆری لێکەوتەوە. ئەمە قوتابیەکی نۆزدە ساڵان بوو، سووتخۆرێکی بە ناوی پوپوڤ، لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا کوشت. هەڵبەتە بۆ دزی کوشتنی، بەلآم لە دادگادا گوتی لەسەر بیروباوەڕی سیاسی کوشتوونی، ئەنجام بە حەوت ساڵ زندانی حوکم درا.

## فەسڵی هەشتەم

میرزادە بەم جۆرە کەوتە قسان:

- بەڕێزان، من چاوەڕوانی ئەوە نەبووم هیچ یەکێک لە ئێوە بدینم! تاکو ئەمڕۆکەش نەساغ بووم، بەڵام سەبارەت بە مەسەلەکەی تۆ (ڕووی دەمی لە ئانتیپ بوردوفسکی بوو) نزیکەی مانگێک دەبێت بە (گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)م سپاردووە و کاتی خۆیشی پێم گوتوویت. بەهەرحاڵ، من لاریم لەوە نییە بەخۆم باسی مەسەلەکەتان دەگەڵ بکەم. هەڵبەتە بە خۆیان دەزانن کە باسی ئەم مەسەلەیە ئێستاو بەم درەنگوەختە... من پێشنیاز دەکەم بە مەرجێ درێژە نەکێشێت، پێکەوە بچینە ژوورێکی دیکە... چونکە حاڵی حازر کۆمەڵێک دۆست و برادەر هاتوونەتە دیدەنی و سەردانم، تکاموایە کە باوەڕبکەن...

خوشکەزایەکەی لیبدیف، بێ ئەوەی دەنگ بەرز بکاتەوە، بە زمانێکی ڕەق و لۆمە ئامێزەوە گوتی:

- ئێمە هەقمان نییە، خوای دەکرد دۆستی دنیات لە کن دەبوو، بەڵام خۆ دەتتوانی ڕەفتارێکی ماقووڵترت دەگەڵ ئێمەدا بکردایە، هەر نەبێ ئەدەب و نەزاکەتێ بنوێنی، نەک سەعاتێک لە پاکەنەی ماڵەکەتدا بەدەم چاوەڕوانییەوە ڕامان بگریت.

هەرکە خوشکەزاکەی لیبدیف ئەو قسەیەی کرد، لەپڕ ئانتیپ بوردوفسکی، دەمی کرایەوە و بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی:

- وایە... هەڵبەتە... منیش... تەمەشاکەن، میران چۆن ڕەفتار دەکەن!

ڕاستە تۆ میر و میرزادەی!... بەڵام من نۆکەری تۆ نیم! بەڵام من... من...
بەدەم ئەو قسانەوە لێوی تەتەڵەی دەکرد، لە تورەییدا لێوی دەلەرزی، کەفی دەپرژاند، هێندە بەلەز قسانی دەکرد، دوای دە وشەیەک کەس تێی نەدەگەیشت چ دەڵێت.
هیپولیت، بە دەنگێکی تیژ و ناخۆش گوتی:
- بەڵێ، ئەمە داب و سوخەتی میرانە!
یارۆی بۆکسباز (بۆکسۆر)، پرتە پرتێکی لێوە هات:
- ئەگەر ئەم ڕەفتارە دەگەڵ مندا بکرایە، یانی ئەگەر ئەم ڕەفتارە ڕاستەوخۆ دەگەڵ مندا بکرایە نەک دەگەڵ بوردوفسکی، دەمزانی کە...
میرزادە گوتی:
- بەڕێزینە باوەڕبکەن، تاقە یەک دەقیقەیە کە زانیومە ئێوە بۆ ئێرە هاتوون.
خوشکەزاکەی لیبدیف، دیسان هەڵی دایە و گوتی:
- میرزادە، ئێمە لە دۆستەکانی تۆ، هەر کێیەک هەن، نە شەرم دەکەین و نە دەترسین، چونکە ئێمە لەسەر هەقین و داوای هەقی خۆمان دەکەین.
هیپولیت، کە یەجگار گەرم بووبوو، دیسان دەنگە زیقاوڵەکەی لێ هەڵبڕی:
- ڕێم بدە با پرسیارێکت لێبکەم، باشە کێ ڕێی پێداویت کە مەسەلەکەی بوردوفسکی، بە داوەریی دۆستەکانت بسپێری، بە چ هەقێک ئەوانت کردووە بە قازی قەزاوەت؟ کێ دەڵێ ئێمە بە حوکم و داوەریی ئەوان ڕازی دەبین، چونکە ئێمە دەزانین حوکم و قەزاوەتی وان چۆنە و چی دەگەیەنێت!
میرزادە، کە تەواو بەو قسانە پەشۆکابوو، نەیدەزانی چۆن وەڵامی ئەو ڕێژنە قسانە بداتەوە، ئەنجام هاتە قسە:
- کاکە بوردوفسکی وەکو پێشتر گوتم: ئەگەر ناتەوێ لێرە باسی مەسەلەکە بکەین، دەتوانین هەر ئێستا بگوازینەوە بۆ ژوورێکی دیکە. جارێکی دی دەیڵێمەوە، ئا ئێستا، ئەم دەقیقەیە بە هاتنی ئێوەم زانیوە.
بوردوفسکی، کە بەگومان و دوو دڵییەوە دەیڕوانیە دەوروبەری و سات

بە سات بێ متمانەتر دەبوو، لەبن لێوانەوە هەر پرتەپرتی بوو، گوتی:

- بەڵام تۆ هەقی ئەوەت نییە، ئەو هەقەت نییە، نا...هەقی ئەوەت نییە.... دۆستەکانت... ها! ئەو هەقەت نییە...

لێرەدا، کوتوپڕ وەکو ئەوەی شتێک لە ناخیا هەرەسی هێنابێ لە قسان وەستا، بۆ پێشەوە دانەویەوە، چاوە خوێن گرتوو و زەقەکانی بڕییە میرزادە. میرزادە، بە ڕادەیەک حەپەسابوو نەیدەزانی چ بڵێ، بۆیە ئەویش بە بێدەنگی چاوانی بڕینە بوردوفسکی.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا بانگی کرد و گوتی:

- لیون نیکولایوفیچ، ئەم نووسینە، لێرەدا، لەم مەجلیسەدا بخوێنەوە، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەکەی تۆوە هەیە!

خێرا ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی گاڵتەجاڕی کومیکی* بۆ درێژ کرد، بە قامکان وتارێکی ناو ڕۆژنامەکەی نیشان دا.

لیبدیف، کە خوا خوای بوو لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا لە خۆی ڕازی بکات. کاتێ میوانە تازەکان وەژوور کەوتبوون، ڕۆژنامەی ناڤبری لە بەرکی دەرهێنابوو و بەبێ هیچ قسەیەک لەبەر چاوی خانم یەپانچین ڕای گرتبوو و ئەو ستونەی پێنیشان دابوو کە بە قەڵەمی ڕەش نیشانە کرابوو. ئیدی خانم کە ئەو چەند دێرە کەمەی خوێند بووەوە، زۆر ناڕەحەت و نیگەران بووبوو.

میرزادە، بە شەرمەزارییەکی یەجگار زۆرەوە، بەوپەڕی دوو دڵییەوە، بەئەسپایی گوتی:

- باشتر وایە بە دەنگی بەرز نەخوێنرێتەوە. دوایی.. بە خۆم، بە تەنیا دەیخوێنمەوە...

خانم یەپانچین کە ئەوەی لە میرزادە بینی، بەر لەوەی فریای خوێندنەوە بکەوێ، بە تورەیی ڕۆژنامەکەی لە دەستی ڕاپسکاند و دایە کولیا و گوتی:

- باشە... هانێ تۆ بیخوێنەوە... یەکسەر بیخوێنەوە...بە دەنگی بەرز بیخوێنەوە... بەئاشکرا بیخوێنەوە... حاڵی بوو؟ بە دەنگی بەرز بیخوێنەوە با هەمووان گوێیان لێبێت!...





لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، ژنێکی زۆر توندە تەبیعەت بوو، زوو هەڵدەچوو، لەو کەسانە بوو ئەگەر هەڵچووبا لەوەبوو لەناکاوداو بێ هیچ بیرکردنەوەیەک، هەموو لەنگەران هەڵکات و وێڕای زریان و گەرداوان بەناو جەرگەی دەریا بکەوێ. یانی لەو کەسانە بوو کە هەڵچووبا دۆودۆشاوی تێکەڵ دەکرد. ئیڤان فیدوروفیچی مێردی هەستی بە نیگەرانی دەکرد. هەموو ئامادەبووان، حایر و حەپەساو، بە بێدەنگی چاوەڕوانیان دەکرد کە چ دەقەومێ. کولیا ڕۆژنامەکەی والا کرد و بە دەنگی بەرز کەوتە خوێندنەوەی ئەو وتارەی لیبدیف، بەپەلە بۆی دەستنیشان کردبوو:

پرۆلیتاران و نەوەی میران

چیرۆکی دزیەک کە ئەمڕۆ و هەموو ڕۆژێک ڕوو دەدات

پێشکەوتن! چاکسازی! عەدالەت! ...

" شتی سەیر لەم وڵاتەدا، کە ڕووسیای پیرۆزی پێدەڵێن، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕوو دەدات، لە ڕۆژگاری ریفۆرم و چاکسازیدا، لە ڕۆژگاری چالاکی و پرۆژەی گەورەی سەرمایەداریدا، لە ڕۆژگاری بوژانەوەی هەستی نەتەوەییدا، لە ڕۆژگارێکدا کە سالانە سەدان ملیۆن ڕۆبڵ بە ناوی سەرمایەگوزارییەوە، ڕەوانەی هەندەران دەکرێت، لە ڕۆژگارێک کە پشتیوانی لە پیشەسازی دەکرێت و کرێکاران دەچەوسێنرێنەوە و نانیان بە دۆیان ناگات... هتد، بەڵێ لە ڕووسیای بەناو پیرۆزی ئێمەدا ڕووداوی سەیروسەمەرە ڕوودەدەن، جا خانمان و ئاغایانی بەڕێز، چونکە لیستی ئەم ڕووداوانە یەجگار زۆرە و لە کۆتایی نایەت، باشتر وایە یەکسەر بچینە سەر ئەسڵی مەبەست:

" ڕووداوێکی سەیر لە یەکێک لە ڕۆڵەکانی، ئەرستۆکراتیەتی فیودالی ڕەحمەتی ئێمە ڕووی داوە!... ئیدی باو باپیرانی ئەو کوڕو نەوانە، دارو نەداری خۆیان لەسەر مێزی قومار و بە ڕۆڵێت دەدۆڕاند. ئیدی ناچار دەبوون بە پلەی دەرەجەدار و ملازم لە سوپادا خزمەت بکەن و بە زۆری لەوێش لەسەر وردە تاوان و سەرپێچی و دەستپیسی دراونەتە دادگاو بەدەم ڕۆتینیاتی دادڤانی و لێپێچینەوەی یاساییەوە دەمردن و کوڕەکانیان





وەکو قارەمانی چیرۆکەکەی ئێمە، یان بەزگماک گێل و گەمژەن یان بە هۆی تاوانانەوە دەگیرێن و دەدرێنە دادگاو دادگاش تەبرێیان دەکات بەو نیازەی دەرفەتیان بداتێ خۆیان چاکبکەن، ئەگەر خۆیان چاک کرد وا چاکی دەکەن، دەنا ئەوپەڕی فەزیحەتێکی ئەوتۆ دەنەنەوە کە عالەم سەری سوور بمێنێ، چ قەیدیە، مەڵۆیەکی تازە دەخەنە سەر خەرمانی فەزیحەتەکانی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە.

ئەم ئازیزەی ئێمە، ئەم میرزادەیە، شەش مانگێکە لە سویسراوە بۆ ڕووسیا گەڕاوەتەوە، بۆ چارەسەری گێلایەتی و گەوشەگی چووبووە سویسرا، کە گەڕایەوە پاڵتۆیەکی دەڵبی بێ ئەستەڕی تاڵکێشی لەبەردا بوو، لە سەرما هەڵدەلەرزی. دەبێ دان بەوەدا بنەین کە پیاوێکی بە شانسە... تۆ واز لەو نەخۆشیە سەیروسەمەرەیەی بێنە کە چووبوو بۆ سویسرا بۆ چارەسەری (چارەسەری گەوجاتی، جا تەسەوری ئەمە بکەن! ئاخر کێ بیستوویەتی گەوجاتی و گەمژەیی چارەسەری هەبێت!) ئیدی پەندی ڕووسانە "تەنیا گێلان بە بەخت و یەغباڵن!". جا ئێمە ڕووداوەکە دەگێڕینەوە و ئێوە خۆتان حوکم بدەن: ئەم میرزادەیەی هاوڕێمان هەر بە منداڵی هەتیو دەکەوێت. دەگێڕنەوە دەڵێن بابی مولازم دەبێت، دەدرێتە دادگا، لە کاتی دادگایی کردنیا بە تۆمەتی ئەوەی هەموو پارەی سریەکەی خۆی وەکو ملازمێک لە قوماردا دۆڕاندووە و گوایە حەسیر مەیدانێکی باشی یەکێک لە سەربازەکانی ژێر دەستی خۆیشی کردووە – ئەوەتان لە بیر نەچێت کە ئەو زەمانە، چ ڕۆژگارێکی خۆش و زێڕین بووە- بەڵێ لە کاتی دادگاییدا دەمرێت! کە بابی مرد، ئیدی موڵکدارێکی ڕووسی خێرەومەندی یەجگار دەوڵەمەند دەیگرێتە ژێر باڵی خۆی. ئەو موڵکدارە، با ناوی بنەین "پ..." لەو سەردەمە زێڕینەدا چوار هەزار ڕەعیەتی هەبوو (لێرەدا ڕەعیەتم لەجیاتیی قن بەکار بردووە، هەرچەندە پڕ بە مانای وشەکە نییە، بەڵام هیچ وشەیەکی کوردی پڕ بە پێستی وشەی "قن"م بە بیردا نەهات. ح. ع)

جا بەڕێزینە ئێوە دەزانن مانای ڕەعیەت چییە؟ بەڵام من نایزانم، بۆیە

دەبێ بۆ دۆزینەوەی مانای ئەم وشەیە قاموس و فەرهەنگان بگەڕێم.
"هەرچەندە ئەم قەوانە تازەیە، بەڵام زەحمەتە پیاو باوەڕی پێ بکات.*"
هەڵبەتە دەبێ یەکێک بووبێ لەو ڕوسە تەمەڵ و مێملانەی کە ژیانی بۆش و بە تاڵی خۆیان لە هەندەران بەسەر دەبەن، هاوینان لەدەوری کانیاوە مەعدەنیەکان بەسەر دەبن و زستانان دەگوازنەوە بۆ "کۆشکی گوڵان" لە پاریس و لەوێندەر پارەی خەیاڵی سەرف دەکەن! دەتوانین بێژین کە سێیەکی ئەو باج و سەرانانەی کە وەرزێر و جووتیاران لە سەردەمی ڕەعیەتداریدا دەیاندا بە ئاغاکانیان، خڕ دەکرایە دەستی خاوەنی "کۆشکی گوڵان" (خەنی لەو پیاوە بەختەوەرە!).
با واز لەمە بێنین و بێینەوە سەر ئەو پیاوە خۆشگوزەرانە، بێینەوە سەر جەنابی "پ..." ئەم پیاوە میهرەبان و دلۆڤانە ئەم هەتیوەی وەکو میرو میرزادە بە خودان کرد و لەلەو دایەنانی بۆ ڕاگرت، (هەڵبەتە دایەنانی زۆر جوان! ) ئەمانەی لە پاریسەوە بۆ دەهێنان. ئیدی ئەم هەتیوە دە دوا پاشماوەی ماڵباتێکی ئەرستۆکراتی بە ناوبانگ بوو، ئەم کوڕە نازدارە، گەمژە بوو. سەرباری هەموو هەوڵێکی ئەو دایەنانەی "کۆشکی گوڵان"، کە بە زەبری پارەی زۆر بۆی ڕاگیرا بوون، ئەم قوتابیەیان تەمەنی گەیشتە بیست ساڵ و نەک هەر هیچ زمانێکی بیانی فێر نەبوو، تەنانەت زمانە رووسیەکەی خۆیشمان فێر نەبوو. ئیدی ئەمە شتێکە و هیچی لەگەڵ ناکرێت. ئەنجام هەوایەکی دیکە لە کەللەی کابرای ڕەعیەتدار، جەنابی "پ..."ی دا، کە باوەڕی بە کۆیلەداری هەبوو، بە ئەقڵ و مەزەندەی وی لەوە بوو، لە سویسرا چارەسەری گەمژایەتی هەبێت و ڕەنگە ئەم گەمژەیە لەوێندەر شتێک فێر ببێت. هەڵبەتە ئەم بیرۆکەیە، بڕێک لۆژیکیشی تیا بوو.
ئەم فیوداڵە بێکارو مێملە، وای وێنا دەکرد کە دەشێت بە پارە ئەقڵیش وەکو هەر کاڵایەکی دی بێتە کڕین، بە تایبەتی لە سویسرا! ئیدی بەو جۆرە کوڕە بۆ چارەسەر نێردرا بۆ سویسرا، لەوێ پێنج دانە ساڵی تەواو لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی پرۆفیسۆرێکی زۆر ناودارا مایەوە، هەزاران ڕۆبڵی لێ خەرج کرا. هەڵبەتەوەکو دەڵێن یارۆی گەوشەگ

ئەگەرچی نەبوو بە خاوەن ئەقڵ، بەڵام کەمێک ڕواڵەتی بەشەری پەیدا کرد. یانی کەمێک لە بەشەر دەچوو.

لەپڕێکا "پ..." مرد. هیچ وەسیەتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو. ئیدی کاروباری دارایی وی یەکپارچە ئاژاوە بوو، جۆرەها هەقدار و میراتگری چاوچنۆک و تەماعکاری بۆ پەیدا بوون، کە هیچ بەخەمی پاشماوەی ئەو ماڵباتە ئەشرافانەوە، نەبوون کە بە هۆی گەمژەیی زگماکەوە لە سویسرادا، لەژێر چارەسەردا بوون، بەڵام ئەم گەوهەری یەک دانەیەی ئێمە باسی دەکەین، هەرچەندە گێل و گەمشۆ بوو، ویستی ئەو پرۆفیسۆرەی کە سەرپەرشتی و چارەسەری دەکرد، فریو بدات، ئەوەندەی ئێمە ئاگامان لێیە، هەواڵی مەرگی بەخێوکەرەکەی خۆی لێشاردەوە، بەو جۆرە توانی کارێک بکات کە دوو دانە ساڵ بەخۆڕایی چارەسەری بکات، بەڵام پرۆفیسۆرەکەش، شەیتان بوو، کاری خۆی دەزانی، کە دیتی هیچ هەواڵێکی پارەوپول نییە و نەخۆشێکی گەمژەی بیست و پێنج ساڵانی نەوسن و زۆر خۆری بەسەردا کەوتووە، پێڵاوە شڕەکانی خۆی دایە و پاڵتۆیەکی دەڵبی کۆنەی بێ قۆڵی لەبەر کرد و بە قیتاری نمرە سێ و لەسەر حیسابی خۆی، تا لە کۆڵ سویسرای بکاتەوە، بۆ ڕووسیای ناردەوە.

ڕەنگە وا مەزندە ببرێت کە بەخت لەم قارەمانەی ئێمە هەڵگەڕابێتەوە، بەڵام مەسەلەکەوانە بوو. ئەو بەخت و قەدەرەی کە بەلایەوە گرینگ نەبوو تێکڕای هاوشاریانی مە لە برسا بمرن، هەرچی خێرو بێرو نیعمەتی خۆی هەبوو، هەمووی بە جارێ، بەسەر ئەم ئەرستۆکراتیە چکۆلەیەدا داباراند بوو، ڕێک وەکو هەورەکەی حیکایەتەکەی کریلوف*، کە بەسەر کێڵگە بێ ئاوو تینوەکاندا، ڕەت دەبێ و دەچێت لەسەر دەریا و ئۆقیانووساندا دەبارێ. ئەم میرزادەیە، هێشتا لە سویسراوە، بە تەواوەتی نەگەیشتبووەوە پترسبۆرگ کە یەکێک لە خزم و خوێشەکانی دایکی (کە لە چینی بازرگانان دەبێت) دەمرێت. ئەم پیرە بازرگانە ڕیشنە، وەچاخ کوێر دەبێت، یانی منداڵی نابێت و موریدو لایەنگری تەریقەتی ئایینی ڕاسکولنیک* دەبێت. میراتی و

پارەوپولێکی بێشوماری لەپاش بەجێ دەمێنێ، بە چەندین ملێونی کاش تەقدیر دەکرێت. (خوێنەری ئازیز چ دەبوو ئەگەر ئێمەش شتێکی وامان بە نسیب ببوایە! لە هەر پێویستییەکی دنیا دەخەلەساین!) تێکرای ئەم میراتە بەم نەونەمامەی لەمەڕ خۆمان، کە لە سویسرا خەریکی چارەسەری گەوجاتی خۆی بوو! بڕا.. ئیدی وەزع و حاڵەکە یەکسەر گۆڕا. میرزادەی زەرگاڵ لەپێ، پاش ئەوەی لە ئافرەتێکی زۆر جوانی فاحیشەی ناوزراوی مەنشور نزیک بووەوە، کاتێکی بە خۆ زانی دۆست و بنارۆی دنیا لە دەوری خڕبوونەوە، جۆرەها خزمی لێپەیدا بوون، بە تایبەتی کیژە نەجیمزادان، کە خوا خوایان بوو شووی پێبکەن. نە هەقیان نەبوو، کێ خوا دەیداتی مێردی وای دەست بکەوێ، گەنجێکی ئەرستۆکراتی، دەوڵەمەندی، گێلۆکە؟ مێردێک کە هەموو خەسڵەتێکی بە کەڕەتێ تیا کۆبووبێتەوە؟ بە چراشەوە بۆ مێردی وا گەڕابان دەستیان نەدەکەوت، یان بەگوێرەی دڵی خۆیان بە کردیان دابا وا دەر نەدەچوو!...

ئیڤان فیدوروفیچ لەناکاودا، بەوپەڕی تورەیی هاواری کرد:

- ئەمە... ئەمە... من تێناگەم!

میرزادە، بە شێوەیەکی پاڕانەوە ئامێز هاواری کرد:

- بەسە کولیا!

لە هەموو لایەکەوە دەنگی سەرسامی و ناڕەزایی بەرز بووەوە.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەپێداگرتنەوە گوتی:

- با بیخوێنێتەوە، با بەردەوام بێ لەسەر خوێندەوە، چی دەبێ با ببێ. میرزادە، لێی گەڕێ با بەردەوام بێ دەنا شەڕمان دەبێ!

دیار بوو، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا. بەهەرحاڵ هیچ چارێک نەبوو، کولیا سوور هەڵگەڕاڤو بە دەنگێکی لەرزۆک، سەرلەنوێ دەستی بە خوێندنەوە کردەوە:

لە کاتێکا کە هاوڕێ ملێونێرە تازەکەمان وای هەست دەکرد لە حەوت تەبەقەی ئاسماندا گەشتوگوزار دەکات، شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕووی دا، ڕۆژێکی هەتاو، بەیانی زوو، میوانێکی هات، سیما ئارام، مەند و بەسام،

جلوبەرگ ساکار، لێ پاکوخاوێن. دەم و دووی شارستانیانە و پڕ نەزاکەت بوو، پێدەچوو کەسێکی لیبراڵ باوەڕ بێت. زۆر بەکورتی مەبەستی هاتنەکەی خۆی بۆ شرۆڤە کرد، ئەم بەڕێزە ئەوقات و پارێزەرێکی بە ناوبانگ بوو، لەوەکیلی کوڕێکی گەنجەوە هاتبوو کە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئەوی گرتبووە ئەستۆ. تومەز ئەم کوڕە گەنجە، کوڕی جەنای "پ..."ی ڕەحمەتی بوو، بەڵام ناوی شۆرەتی لەو جیاواز بوو. ڕەحمەتی "پ..." لە گەنجیدا، پیاوێکی هەرزە و داوێن پیس دەبێت، کیژێکی هەژاری ڕوو سووری بەدبەخت، کە کۆیلەیەکی خانەزای خۆیان دەبێت، بەڵام پەروەردەیەکی ئەوروپایی دەبێت، بێ بن و فەسات دەکات. (هەڵبەتە مومارەسەی ئەو مافەی کردووە کە سیستەمی کۆیلایەتی و ڕەعیەتداری بە ئاغایانی ڕەوا دیتووە.) کە زانی کچە سکی پڕ بووە و فریای خۆی نەکەوێت ئابڕووی دەچێت، خێرا کەوتە خۆی، کیژەی بە پیاوێکی پیاوانەی شەریفی ئەهلی کاسبی کە وەزیفەیەکی چکۆلەی فەرمیشی هەبوو، لەمێژبوو دڵی بەم کچەوە بوو، بە شوودا. لە سەرەتاوە یارمەتی ئەم ژن و مێردەی دەدا، بەڵام مێردی کچە، زۆری نەبرد، غیرەتی ئەمەی قەبووڵ نەکردو ڕەفزی کۆمەک و یارمەتییەکانی ئاغای "پ..." کرد. دوای ماوەیەک "پ..." بەرەبەرە کچە و ئەو منداڵەی لێی بووبوو، فەرامۆش کرد، پاشان، وەکو پێشتریش باسمان کرد، مردو هیچ وەسێتنامەیەکی نووسراوی لە پاش بەجێ نەما.

جا ئەم کوڕەی کە لە "پ..." بوو پاش ئەوەی دایکی شووی کرد، مێردەکەی دایکی، کە پیاوێکی ڕەسەن و بنیچە ئەسڵ بوو، گرتیە ژێر باڵی خۆی و کوڕە ناو و شۆرەتی ئەوی هەڵگرت، کە ئەم پیاوە باشە، یانی مێردەکەی دایکی مرد، ئیدی وەزعی خراپ دەبێت، هەژار و دەستکورت و بێ دەرامەت، مەسئولیەتی دایکە نەخۆشەکەشی، کە بە هۆی لەکار کەوتنی لاقەکانیەوە زەمینگیر بووبوو، دەکەوێتە سەر ئەو. دایکی لە شارۆچکەیەکی دوورەدەستا دەژیا و بە خۆیشی لە پایتەختدا دەژیا، لە لایەکەوە قوتابی بوو وەدەیخوێند، لەلایەکی ترەوە، پیاوانە کاری دەکرد، دەچووە ماڵان و

دەرسـی تایبـەتی بـە منداڵـە بازرگانـان دەگـوتەوە، بەو جـۆرە بـەدەم خوێنـدنەوە، خـۆی دەژیانـد، قۆنـاغی خوێنـدنی ئامـادەیی تەواوکـرد، تـوانی درێـژە بـە خوێنـدنی بـاڵاتر بـدات، بەو ئومێـدەی لـە ئایینـدەدا، پـایە و وەزیفەیـەک بۆ خـۆی بپچرێت، بـەڵام دەبێ خێروبێری دەرسـی تایبـەتی بە منداڵە کاسبکارانی ڕووس، کـە سـەعاتی دە کوپیکت دەدەنێ، چ دەرامـەتێکت بـۆ دابینبکـات، بـە تایبـەتی کـە خـەرجی دایکێکـی شـەپڵەلێدراوی ئیفلیجشـت بەسەرەوە بێت؟ دایکی لەو شـارۆچکە دوورەدەسـتەدا دەمرێت، بـەڵام ئەمـە باری سەر شانی سووک نەکرد.

جا لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە: دەبێ ئـەم هـاوڕێ میرزادەیـەی لەمـەڕ ئێمـە، ئەگـەر پیاوێکی بەویـژدان و ئینسـاف بێـت، چـۆن بیـر لـەم مەسـەلەیە بکاتەوە، چ هەڵوێستێ بگرێت؟ بێگومـان تـۆی خوێنـەری ئازیز، وا مەزەنـدە دەبەیت کە شتێک بەم نێوەڕۆکە بە خۆی دەڵێت: "پ..." بە درێژایـی تەمـەنی، درێغی لە من نەکردووە. دەیان هـەزار ڕۆبڵـی لـە خوێندنی مـن، لـە دایـەن و لـەلەو مامۆسـتاکانم، لـە چارەسـەری گەوجاتیەکـەم لـە سویسـرا، خـەرج کـردووە. مـن ئـەمڕۆ کـە ملێـونێرم، بـە بـەرچاوی مـنەوە، کـوڕە پـاک و بێگەردەکەی، کە هـیچ دەسـتێکی لـە حـەرامزادەبوونی خۆیدا نییـە، سـووچ و تاوانی چییە کە زادەی داوێن پیسـی و مێبـازی پیاوێکە هـەر نەیناسـیوە... بـە بـەرچاوی مـنەوە بـە دەرسـی تایبـەتی و، بـە هـەزار گیانەمـەرگی، مـەژی و مەمر خۆی دەژێنێ. هەرچییـەک، بابی وی لـە منیـا خـەرج کردووە، ئەگـەر ڕاستت دەوێ، بـە هـەموو ویـژدان و ئینسـافێک هەقـە بۆ ئەو بگێـڕدرێتەوە! هەر هـەموو ئەو پارە مۆڵـەی بـابی وی لـەپێناوی مندا خـەرجی کردووە، لـە ڕاسـتیدا هـی مـن نـەبووە. ئەمـە تـەنیا و تـەنیا هەڵەیـەکی کوێرانـەی بـەخت و چارەنووس بـووە، دەنـا دەبوایـە بـە کوڕەکـەی "پ..." بـدرابا، دەبـوا ئەو سـوودی لێببینـێ نـەک مـن، چونکە ئەوەی بـە مـن بـڕاوە، تـەنیا خێـرو بێـری هەوەسبازی و داوێنپیسـی و سـووکی و بێفکری "پ..." بووە. جا ئەگـەر مـن پیاوێکی ئابڕوومەندو ڕەندو مەرد بم، بە ئەمـەک و بەویـژدان و بـە ئینسـاف و شیرپاک بم، هەقە نیوەی بەشە میراتەکەم بدەم بـە کوڕەکـەی ئەو پیـاوەی





کە چاکەیەکی یەجگار زۆری بە سەرمەوە بوو! بەڵام من، چونکە بەر لە هەر شتێک کەسێکی ڕژدم و سوور دەزانم کە ئەو کوڕە هیچ مافێکی داوای یاسایی نییە، ئیدی نیوەی ئەو ملیۆنانەی نادەمێ کە پێمبڕاوە، بەڵام ئەگەر ئێستا بەلای کەمەوە ئەو دەیان هەزار ڕۆبڵەی کە بابی خەرجی چارەسەری گەوجاتیەکەی منی کرد، بۆ نەگێڕمەوە، ئەمە ئەوپەڕی نامەردی و خوێڕیەتییە، (لە بیری چوو ئەوەش بڵێ کە ئەوپەڕی کورتبینی، بێ ئەقڵیە.). مەسەلەکە پەیوەندی بەویژدان و دادپەروەرییەوەیە، چونکە ئەگەر "پ..." نەیگرتبامە خۆی، نەی نابامە بەر خوێندن و خەرجی نەکێشابام و لەجیاتیی من خەمی کوڕەکەی خۆی خواردبا و مەسرەفی ئەوی کردبا، ئێستا چ بەڵایەکم بەسەر هاتبوو؟"

" بەڵام نا بەڕێزینە! نەوە و نە تیرەیماڵباتی میران وابیر ناکەنەوە، بیر لەم جۆرە شتانە ناکەنەوە! باوەڕ دەکەن ئەم میرزادەیەی لەمەڕ ئێمە، کە پەروەردەی سویسرا بوو، کەم و زۆر گوێی بە گەنگەشە و بەڵگە بنجبڕەکانی یارۆی پارێزەر نەدا، چەند باسی دابونەریت و یاساو ڕێسای ئەخلاق و ئابڕوو و ویژدان و ئینساف و دووربینی بۆ کرد، فایدەی نەبوو، لەم گوێیەوە دەهات و لەو گوێیەوە دەردەچوو. (هەڵبەتە پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەم پارێزەرە تەنیا لەبەر خاتری دۆستایەتی و تەقریبەن بەبێ ڕەزامەندی کوڕەکەی "پ..." ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرتبوو).

" ئەگەر مەسەلەکە هەر بەوەندەشەوە وەستابا، قەیدی نەدەکرد، لەوە بوو تەحەمول بکرێت، بەڵام شتێکی ئەوەندە دزێوو کرێت ڕووی دا کە بە هیچ بیانوویەک. بە بیانووی هیچ نەخۆشییەک پینە نەکرێت و چاوپۆشیی لێ نەکرێت، فەرموون ئێوە و ئەو ڕووداوە. ئەم ملیۆنێرەی کە ماوەیەکی کەم بوو زەڕگاڵەکانی پرۆفیسۆری لە پێڵاوە شڕەکانی فڕێ دابوو، ئەوەندەی هەست و شعور نەبوو کە ئەقڵ و ئاوەزی بەوەدا بشکێت کە ئەو گەنجە بە شەخسیەت و نەفس بەرزە داوای خێرو بەزەیی لەو ناکات، بەڵکو داوای مافی یاسایی خۆی دەکات، با هیچ بەڵگەیەکی یاساییشی نەبێت، ماف بەبێ بەڵگەی یاساییش هەر مافە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم گەنجە بە خۆی

داوای هیچی نەکردبوو، بەڵکو دۆست و برادەرەکانی لەجیاتیی ئەو، ئەو کارەیان گرتبووە ئەستۆ. کەچی ئەم میرزادەیەی لەمەڕ ئێمە، بەوپەڕی کەش و فشەوە، ئەسکەناسێکی پەنجا ڕۆبڵی، لە بەرکی دەردێنێ و بە مەبەستی سووکایەتیکردن بەو گەنجە مەردە، بە هەموو ئیفادە و فیزی ملیۆنێریکەوە، کە پێی وایە مادامێکی ملیۆنێرە، ئیدی هەموو شتێک بۆ ئەو حەلاڵە، بۆی دەنێرێت. باوەڕ ناکەن؟ هەقتانە باوەڕ نەکەن، تووڕە ببن! بێزار ببن! ناڕەزایی دەرببڕن! بەڵام ئەو هەمان کاری کرد! هەڵبەتە یەکسەر پارەکەی نەک هەر لەوێ بۆی گێڕدرایەوە، بەڵکو درا بە سەروچاویا!

" باشە تەگبیر، ئەم مەسەلەیە دەبێ چۆن چارەسەر بکرێت؟ مادامێکی هیچ بنەمایەکی یاسایی نییە، چار هەر ئەوەیە بخرێتە بەر ڕای گشتی خەڵکی. بۆیە ئێمە ئەم چیرۆکە بۆ خوێنەران دەگێڕینەوە و دڵنیایان دەکەین کە چیرۆکێکی ڕاست و ڕاستەقینەیە. جا یەکێک لە شاعیرە تەنزنووسە هەرە ناودارەکانمان، بەم بۆنەیەوە چەند بەیتێکی جوانی هۆنیوەتەوە کە هەقە وەکو نموونەیەکی ئەخلاق و دابونەریتی ئێمە بە ئاوی زێڕ بنووسرێت و نەک هەر لە شارۆچکەکاندا، بەڵکو لە پایتەختیشدا، هەڵبواسرێت. فەرموون ئێوە و بەیتەکان:

لیوفا* پێنج ساڵەزگاری خشت
بە کۆنە پاڵتۆیەکی شنایدەرەوە*
خۆی بادا، خۆی نواند.
سەرقاڵ و سەرگەرمی،
وەهم و خەیاڵڕێسی
تووڕەهات و منداڵانە
ڕۆژگاری بەڕێ دەکرد
کە بۆ وڵات گەڕایەوە
هێشتا جووتێ پێڵاوی شڕی
زەرگال پێچی
لە پێدا بوو.

کەچی لەپڕ بوو
به ملیۆنێر،
ملیۆنان ڕۆبڵی میراتی
پێ بڕا.
به ڕووسی نوێژەکانی دەخوێنێ
بەڵام دزی له قوتابییان
دەکات.
بۆ دزینی ماڵی خەڵکی نەک گێل نییه
گرێو له شەیتان دەباتەوه.

که کولیا، له خوێندنەوەی وتارەکه بووەوه، خێرا ڕۆژنامەکەی دایه دەست میرزاده و بێ ئەوەی وشەیەکی له زار بێتە دەرێ، چوو له سووچێکەوه کزکۆڵەی کرد و دەموچاوی لەنێو هەر دوو لەپی نا. هەستی به شەرمەزارییەکی یەجگار زۆر دەکرد. به هەستێکی مناڵانەی ئەوتۆوه که هێشتا خووی بەم قۆڕیات و پۆخڵەواتانەی ژیانەوه نەگرتبوو، دووچاری نیگەرانییەکی بێوێنه بووبوو. نیگەران بوو ئەمما نیگەران. هەستی دەکرد، کارەساتێکی ئەوەنده نا ئاسایی ڕووی داوه که هەموو دنیای پێوه ڕوخاوه و سەبەبکاری کارەساتەکەش ئەو بووه، چونکه ئەم ئەو گوتارەی به دەنگی بەرز خوێند بووەوه. به ڕێکەوت هەموو ئامادەبوانیش هەستێکی لەو جۆرەیان لا دروست بوو.

کیژەکان، هەستیان به شەرمێکی زۆر کرد. لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا که به خورتی جلەوی توڕەیی خۆی پێ دەگیراو، پێدەچوو ژێوان بێ لەوەی به تۆپزی خۆی لەم مەسەلەیه هەڵقورتاند بوو، هەنوکه کرو کپ، مات و بێدەنگ ڕۆنیشتبوو.

میرزاده، وەکو هەر کەسێکی شەرمنی گیرۆدەی ئەم حاڵەتانه، خەریک بوو له شەرمەزاریدا بتوێتەوه: به ڕادەیەک له ڕەفتاری ئەو میوان و ئامادەبووانه شەرمەزار بوو، که تا ماوەیەک نەیدەوێرا تەمەشای کەسیان بکات. پتیتسن، ڤاریاو تەنانەت (لیبدیف)یش هەر هەموویان شەرمەزار و





نیگەران و پەریشان دیاربوون. خوشکەزایەکەی (لیبدیف)یش بە ئاشکرا ناڕەحەت بوو. تەنیا یارۆی بۆکسباز، ئاسوودە بوو، بە کەشوفشەوە سمێڵی با دەدا و چاوانی داخستبوون، نەک لەبەر ناڕەحەتی، بەڵکو لە ڕووی بێفیزی و هەستکردنی بە سەرکەوتن.

دیار بوو کەوتارەکەی زۆر بە دڵ بوو.

ئیڤان فیدوروفیچ بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە گوتی:

– مەگەر شەیتان پەی بە بنجوبناوانی ئەم نامەردییە بەرێت! ڕێک لەوە دەچێت پەنجا کەسی هیچوپوچ، نۆکەرتەبیعەت کۆ بووبنەوە و بە شەریکی ئەم دەسکە گوڵەیان بە ئاوا دابێت! نامەردییش بەو ئەندازەیە!

هیپولیت کە لە توڕەییدا دەلەرزی، گوتی:

– قوربان بە یارمەتیت، تۆ بە چ هەقێک ئەم بەراوردانە دەکەیت؟

یارۆی بۆکسباز، کە هەستا بووە سەر پێیان و هێشتا هەر سمێڵی با دەدا، لەپڕ لەش وشانی کەوتنە لەرزین و گوتی:

– ئەمە، ئەمە، جەنابی جەنەراڵ، هەر هەمووی بۆ پیاوێکی وەچاخزادە، خانەدان، بۆ بابایەکی ئابڕوومەند، سووکایەتییە.

ئیڤان فیدوروفیچ، کە بەم قسەیە تەواو توڕە بوو، گوتی:

– یەکەم نامەوێ بە من بڵێی "جەنابی جەنەراڵ"، دووەم بەتەمانیم هیچ ڕوونکردنەوەیەکت بدەمێ یان تەوازۆت بۆ بێنمەوە.

هەستایە سەرپێیان و بە بێ ئەوەی تاقە وشەیەکی لە زار بێتەدەر، وەکو ئەوەی بیەوێ لە بانیژەکەوە دابەزێ، جووڵا. پاشان، پشت لە ئامادەبووان، لەسەر پلەکەی سەری سەرەوەوەستا. زۆر لە لیزاڤیتا پروکوڤیڤنای ژنی پڕبوو کە تەنانەت لەم ساتەشدا نیازی هەستانی نەبوو.

میرزادە، پەشێوو وخەمبار گوتی:

– بەڕێزینە، بەڕێزینە، بێزەحمەت با منیش قسەیەک بکەم هەندی تۆزێک، تکایە با بە جۆرێ قسە بکەین کە لە یەکدی حاڵی ببین، سەبارەت بەم وتارە هیچ کۆمێنت و بە دواداچوونێکم نییە، مەچنەوە سەری، بەڵام خانمان و ئاغایانی بەڕێز دڵنیابن هەر هەمووی، لە سیری تا پیازی، خڕ درۆ و

بوختانە، حەرفێکی ڕاستی تیا نییە. من بۆیە ئەمە دەڵێم، چونکە هەمووتان وەکو من دەیزانن. ئەم وتارە شتێکی حەیابەرەیە. بە ڕاستی شەرمە. زۆرم پێ سەیرە ئەگەر یەکێک لە ئێوە نووسیبێتی.

هیپولیت گوتی:

- من بەش بە حاڵی خۆم تا ئەم ساتە هیچ شتێکم دەربارەی ئەم وتارە نەزانیوە. نە پێم باشە و نە پشتیوانیی لێ دەکەم.

خوشکەزایەکەی (لیبدیف)ش گوتی:

- من ئاگام لە نووسینی وتارەکە هەبوو،.... بەڵام ئەگەر پرسم پێ بکرایە، دەمگوت با بڵاو نەکرێتەوە، چونکە هێشتا زوو بوو بۆ بڵاوکردنەوەی.

کوڕەکەی بافلیشچوف، بەئەسپایی گوتی:

- من ئاگادار بووم، بەڵام هەقی خۆمە... من...

میرزادە، بە کونجکاوی و بە سەرسامی کەوتە تەمەشاکردنی و پرسیی:

- چی؟ تۆ ئەم هەموو درۆ و بوختانەت هەڵبەستووە؟ مەحاڵە...

خوشکەزاکەی لیبدیف گوتی:

- هەقی ئەم جۆرە پرسیارەت نییە.

- من پێم سەیرە کە جەنابی بوردوفسکی، توانیویەتی ئەم... بەڵام بەهەرحاڵ دەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئێوە بە خۆتان ئەم مەسەلەیەتان لە غەزەتەدا بڵاو کردووەتەوە، بۆچی بەوە قەڵس بوون کە کاتێ من دەمویست لە حوزوری دۆست و برادەرەکانما باسی بکەم؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بەتوڕەیی و بەدەم بۆڵەبۆڵەوە گوتی:

- ئاخری! ...

لیبدیف، کە سەبری لێوڕێژ بووبوو، لەناکاودا، لە بەینی کورسییەکانەوە خۆی ڕەپێش خست و بە هەڵچوونەوە گوتی:

- میرزادە تۆ شتێکت لەبیر چوو کە بیڵێی... بیرت چوو ئەوە بڵێی کە تۆ لە دڵپاکی و چاکەی خۆت، پێشوازیت لەمانە کرد و گوێت لێ گرتن. هیچ هەقی ئەوەیان نەبوو داوای ئەمە لە تۆ بکەن. بە تایبەتی کە تۆ مەسەلەکەت بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ سپاردبوو کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی

دیکەی دڵپاکیی تۆیە. ئەمە جگە لەوەی جەنابی میرزادەی پایەبەرز تۆ هەنوکە لەگەڵ دۆستانی دڵسۆزو هەڵبژاردەی خۆتدایت، خۆ ناکرێ ئەمانە بکەیت بە قوربانی ئەو بەڕێزانە. بۆیە تۆ دەتوانی ئەوانە بکەیتە دەرێ، جا ئەگەر تۆ ئەمرت لەسەر بێ، من وەکو خاوەن خانووەکە، ئامادەم بە کەماڵی مەیل ئەم کارە بکەم، دەریان بکەم...

جەنەراڵ ئیڤولگین، لە بنەبانی ژوورێکەوە هاواری کرد:

- ڕاست دەکات، زۆر ڕاستە.

میرزادە گوتی:

- لیبدیف، بەسە، قسەی وا مەکە...

بەڵام لە هەموو لایەکەوە دەنگی ناڕەزایی بەرز بووەوە و قسەکانی میزرادە کەوتنە ژێرەوە...

خوشکەزاکەی لیبدیف، بە دەنگێکی بەرزی ئەوتۆ کە هەموو دەنگەکانی تری کردە ژێرەوە گوتی:

- نا جەنابی میرزادە، ببورە، شتەکەوا نابێت. دەبێ خاڵ بخرێتە سەر حەرفان، وا دیارە بە باشی لە ئێمە نەگەیشتوون. خەڵکی وا لێرەیە، گەرەکیەتی بە هەنجەتی یاسایی دەرمان بکات. یانی بە ناوی یاساوە هەڕەشەی دەرکردنمان لێ دەکات. تۆ بڵێی میرزادە، ئێمە ئەوەندە گەوج و کەودەن بین کە نەزانین مەسەلەکەی ئێمە هیچ بنجوبناوانێکی یاسایی نییەو، ناتوانین لە ڕووی یاساییەوە داوای تاقە ڕۆبڵێکت لێ بکەین؟ جا لەبەر ئەوەی ئێمە دەزانین کە یاسا هیچ هەقێکمان ناداتێ، لە دەرگای هەقە ئینسانیەکەوە بۆی هاتووین، یان ئەو هەقەی کە هەستی مرۆڤانی و عەدالەت و بانگەوازی ویژدانی ڕاستگۆ دەیدات. ئیدی مەرج نییە ئەم هەقە لە هیچ یاسایەکی سواوو پواوی بەشەریدا، تۆمار کرابێت، چونکە هەر مرۆڤێکی نەجیب و، وەجاخزادە و ئابڕوومەند و دڵپاک و بەویژدان و بەئینساف، لەسەریتی ئەو لایەنە مرۆڤانییانە ڕەچاو بکات، کە یاسا فەرامۆشی کردوون و خۆی لێ بواردوون و باسی نەکردوون. جا ئێمە کە بۆ ئێرە هاتووین قەت بیرمان لەوە نەکردووەتەوە بە هۆی

داواکارییەکانمانەوە، یان بە هۆی ئەوەوە کە بەم وەختە ناوەختە هاتووین دەربکرێین (کە تۆ هەنوکە هەڕەشەی دەرکردنمان لێ دەکەیت... هەڵبەتە ئێمە داوا دەکەین نەک تکا، درەنگیش نەهاتین، بەڵکو لە پاکانەکەدا چاوەڕوانی جوابی تۆ بووین.) دووپاتی دەکەمەوە بۆیە هاتووین، چونکە تۆ بە پیاوێکی سەرڕاست و دروستکار و مرۆڤێکی ئابڕومەند و بەویژدان دەزانین. بەڵێ ئەمە حەقیقەتی مەسەلەکەیە، ئێمە وەکو مێمڵ و دەرۆزەکەران، نەهاتووین سەرشۆڕ و ملکەچ لێت بپاڕێینەوە کە شتێکمان بدەیتێ، بەڵکو سەربەرز و سەرفراز، وەکو خەڵکێکی ئازاد و بێمنەت هاتووین، ناپاڕێینەوە، داوا دەکەین (گوێت لێیە؟ داوا، نەک تکا، باش گوێت لێ بێ.) جا ئێمە بەڕاشکاوی و بێ هیچ پێچوپەنایەک لێت دەپرسین: تۆ لە مەسەلەکەی بوردوفسکی دا، خۆت بە ڕاست دەزانیت یان بە هەڵە؟ ئایا دان بەوەدا دەنەیت کە پاڤلیچشوف چاکەی بۆت بووە و قەرزارباری ئەویت و ڕەنگە ئەگەرئەو نەبا لە برسا مردبایت، یان نا؟ ئەگەر دان بەم حەقیقەتەدا دەنەیت، کە هەقە دانی پێدا بنەیت، ئایا بە نیازی یان بە ڕەوای دەزانیت پاش ئەوەی بوویت بە ملیونێر، چاکەی پافلیچشوف بدەیتەوە، ژیانی کوڕەکەی ئەو، کە نانی شەوی نییە، با ناو و شۆرەتی (بردوفسکی)یشی هەڵگرتبێ، دابین بکەیت؟ ئا یان نە ؟... ئەگەر وەڵامەکەت "ئا" بێت، بە گوتەیەکی دی، ئەگەر ئەو شتەت تیایە کە بە زمانی ئێوە پێی دەگوترێ شەرەف و ویژدان و ئێمە بە جۆرێکی وردترو دروست تر پێی دەڵێین "داوەری دادوەرانە"، ئەوا دەبێ داواکەی ئێمە جێبەجێ بکەیت و هەنگێ پاک لە پاک، هەرگیز باسی ئەم مەسەلەیە ناکەینەوە، بەڵام دەبێ ئەم مەسەلەیە یەک لایی بکەیتەوە و چاوەڕوانی هیچ سوپاس و منەتبارییەک لە ئێمە نەکەی، چونکە ئەم کارە لەپێناوی عەدالەتدا دەکەیت نەک لەبەر خاتری ئێمە، بەڵام ئەگەر دڵی ئێمە ڕازی نەکەیت، واتە بڵێیت "نا". یەکسەر دەڕۆین و مەسەلەکە لێرەدا دەبڕێتەوە، بەڵام لەو حاڵەتەدا، بێ ئەوەی لە ڕوودابمێنین و بێ هیچ شەرمێک ڕووبەڕووی خۆت و لە بەرچاوی هەموو ئەم خەڵکە، پێت دەڵێین کە تۆ پیاوێکی کەللە ڕەق، بێ شعور، بێ

شەخسیەتیت و بۆت نییە لە ئێستا بە دواوە خۆت بە پیاوێکی ئابڕوومەندو خودان ویژدان بزانیت، دەتەوێ هەق بە هەرزاترین نرخ بکڕیت. من قسەی خۆم کرد. مەسەلەکەم نایە قولی مستت. ئەگەر ئازایت لە ئێستا زووتر نیە دەرمان بکە، لەدەستت دێت... دەتوانیت، بەڵام ئەوە بزانە کە ئێمە داوا دەکەین نەک تکا، ئێمە داوا دەکەین نەک گەدایی!...

خوشکەزاکەی لیبدیف، لە قسان وەستا، زۆر هەڵچووبوو.

بوردوفسکی، کە سوور سوور بووبووەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئێمە داوا دەکەین، داوا، داوا، تکاو سواڵ ناکەین!...

قسەکانی خوشکەزایەکەی لیبدیف، ئامادەبووانی خرۆشاند. جم و جۆڵێکی تەواویان پێکەوت، بەڵام خویابوو کە هیچ کەسێک نەیدەویست خۆی لە مەسەلەکە هەڵقورتێنێ، تەنیا لیبدیف نەبێ کە پێدەچوو خۆشحاڵ بێت. (سەیر ئەوە بوو، هەرچەند لیبدیف بە ڕواڵەت لایەنگری میرزادە بوو، کەچی لەوە دەچوو، قسەکانی خۆشکەزاکەی سۆزی خزمایەتی جووڵاندبێت و بە جۆرە ڕەزامەندییەکی تایبەتی و شادمانییەکی ئاشکراوە چاوی بە ئامادەبوواندا دەگێڕا.)

میرزادە بە دەنگێکی هەندێ نزم، دەستی بە قسان کرد:

- بە نۆرینی من، جەنابی دوکتورنکو، نیوەی قسەکانت، بەڵکو لە نیوەش زیاتری ڕاستن، ئەگەر یەک شتت لە قسەکانتا فەرامۆش نەکردبایە، لەوە بوو سەدی سەد لەگەڵت بوایەم. لێ هەرچی سەر دێنم و سەر دەبەم ناتوانم ئەو شتەت بۆ دیاری بکەم و پێتی بڵێم... گرینگ ئەوەیە دەزانم قسەکانت شتێکیان کەمە، تا دروستی دروست دەر بچن، بەڵام بەرێزینە، با بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان، ئەمەیان گرینگە، پێم بڵێن بۆچی ئەم وتارەتان بڵاو کردەوە؟ تاقە حەرفێکی تیا نییە، لە بوختان و درۆ بەدەربێت. بۆیە بەڕێزینە ئێوە ڕەفتارێکی زۆر ناشیرین و دزێو، گەلێک سووکتان کردووە.

- بە یارمەتیت، ڕێم بدە...

- قوربان گیان!...

- ئا.. ئەمە... ئەمە...

میوانەکان، بە شپرزەیی و بە یەکەوە، ئەو جۆرە وشانەیان دەگوت.

هیپولیت، بەدەنگە زیقنەکەی وەڵامی دایەوە:

- سەبارەت بەوتارەکە، وەکو پێم گوتیت نە من و نە کەسی تر، نە لەگەڵیداین و نە پێمان خۆشە. ئەم پیاوە نووسیویەتی (هیپولیت بەدەم ئەو قسەیەوە ئاماژەی بۆ یارۆی بۆکسباز کرد کە لە نزیکەوە دانیشتبوو.) من دان بەوەدا دەنێم کەوتارێکی خراپە، بە شێوازێکی نەخوێنەوارانە نووسراوە، دیارە قوڕی بابایەکی سوپایی ترۆکراو هەر ئەو تۆزەی لێ هەڵدەستێ. هەڵبەتە نەک هەر بابایەکی گەوجە بەڵکو کەسێکی خاپینۆک و کڵاوچیشە، من لەگەڵتام. من ئەم قسەیە ڕووبەڕووی خۆی دەکەم، بەڵام پیاو درۆیەک بۆ دزییش بکات هەر بەینی خۆمان بێ، زۆریش نەهەق نییە. مافی بڵاوکردنەوە، مافێکی یاسایی هەر کەسێکە، بۆیە (بوردوفسکی)یش ئەو هەقەی هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی وتارەکەی ئەگەر تورەهاتیش بێ، ئەوا خۆی لێی بەرپرسە، بەڵام سەبارەت بەو نارەزایی و ئیعترازەی کە من تۆزێ لەمەپێش لە حوزووری دۆستەکانتدا بە ناوی هەموومانەوە گرتم، بەڕێزینە بە ئەرکی خۆمی دەزانم پێتانی ڕابگەیەنم کە ئەو ئیعترازەم تەنیا بۆ دووپات کردنەوەی مافی خۆمان گرت. پیاو ڕاست بڵێ حەزمان دەکرد شایەدیشمان هەبن، تەنانەت هەر چوارمان پێش ئەوەی بۆ ئێرە بێین، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبووین، ئیدی ئێمە شایەدەکانمان قەبووڵە، هەر کێیەک بن، تەنانەت ئەگەر دۆست و ئاشناکانی تۆش بن، مادامێکی نە توانن نکۆڵی لە مافی بوردوفسکی بکەن (کە ئەم مافە مافێکی حاشاهەڵنەگرە، وەکو چۆن دوو جاران دوو دەکاتە چوار). بۆیە ئەگەر شایەدەکان لە دۆستانی خۆت بن باشترە، چونکە ئەوە حەقیقەتەکە ڕوونتر دەنوێنێ.

خوشکەزاکەی لیبدیف، هەڵی دایە و گوتی:

- بەڵێ، لەسەر ئەوە ڕێ کەوتبووین.

میرزادە، بە سەرسامی پرسیی:

- جا کە ئەوە نیاز و مەبەستتان بوو، کە شایەدتان گەرەک بوو، بۆچی

لە یەکەم قسەتانەوە، ئەو هەموو هەراوهەنگامەیەتان نایەوە، کردتان بەو هەراو زەنایە؟

یارۆی بۆکسباز، کە تامەزرۆی قسەیەک بوو و هاتبووە جۆش و (لەوە دەچوو، حوزووری ئافرەتەکان بە ئاشکرا کاریان تێ کردبێت) بە زمانێکی دۆستانە گوتی:

- سەبارەت بە وتارەکە جەنابی میرزادە، وێڕای ئەو ڕەخنە توندەی کە هاوڕێ نەخۆشەکەم لێی گرت، بەڵام من لەبەر نەخۆشییەکەی دەی بورم و لێی ناگرم، دان بەوەدا دەنەم کە من نووسیومە، نکوڵی لێناکەم، بەڵام من لە شێوەی نامەیەکی ڕۆژنامەوانیدا نووسیم و لە ڕۆژنامەی برادەرێکی زۆر نزیک و دڵسۆزی خۆمدا بڵاوم کردەوە. تەنیا شیعرەکان هی من نین، بەڵکو شاعیرێکی تەنزنووسی بەنێوبانگ هۆنیویێتیەوە. من وتارەکەم بۆ بوردوفسکی خوێندەوە، هەڵبەتە بەر لەوەی هەمووی بۆ بخوێنمەوە، یەکسەر قاییل بوو کە بڵاوی بکەمەوە. دیارە من بۆ بڵاوکردنەوەی وتارەکە پێویستم بە ڕەزامەندیی ئەو نەبوو. بڵاوکردنەوە مافێکی گشتییە، مافێکی ڕەوا و بە سوودیشە، جا میرزادە ئومێدەوارم کە سینگت لەوە فراوانتر بێ کە نکوڵی لەم مافی بڵاوکردنەوەیە بکەیت.

- من نکۆڵی لە مافی بڵاوکردنەوە ناکەم، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنەیت کە وتارەکەت شتی...

- دەتەوێ بڵێی شتی هەندێ توندی تیایە... گەرەکتە ئەوە بڵێیت؟ بەڵام هەر هەموو ئەو شتانە، دەچنە خانەی خزمەتی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵایەتیەوە. دەبێ خۆت دان بەوەدا بنەیت. ئەمە مەسەلەیەک نییە پیاو بتوانێ لێی بێدەنگ بێت. ئێمە تاوانبارانمان بەلاوە گرینگ نین، چاویان دەرەهات! بەرژەوەندی گەل، لە سەرووی هەموو بەرژەوەندییەکەوەیە! سەبارەت بە وتارەکە، ئەگەر هەندێ بێ دیقەتی و موبالەغەی تیا دەبینی، مەبەستم موبالەغە لە دەربڕین و گوزارشتەکەیەتی، دەبێ ئەوە بزانی کە عیبرت لە ئامانج و مەبەستی وتارەکەیە نەک لە شێوازی نووسینەکەی. گرینگ ئەوەیە نموونەیەکی بە سوود پێشکەش بکەین. پاشان دێینە سەر

گەنگەشـەی لایەنـە شەخسـیەکان. سـەبارەت بـە شـێوازیش، هەڵبەتـە ئەمـە شـێوازێکی کـۆمێکی تـەنزامێزە، بـە خۆتـان دەزانـن کـە هـەموو خـەڵکی بـەم شێوازە دەنووسن! ها ها!...

میرزادە گوتی:

- بەڵام بەڕێزینە، من دڵنیاتان دەکەم کە ئێوە سـەر چێخ چوون، بەلاڕێدا چـوون! خۆتـان گـومڕا کـردووە! ئێـوە وتارەکـەتان بەو تەسـەورەوە دارشـتووە کـە مـن هـەرگیز ئامـادە نـیم بـە دەنـگ داواکـەی بەڕێـز بوردوفسکییەوە بچم، ئیدی ویستووتانە لەو ڕوانگەیەوە بمترسێنن و تۆڵـەم لێ بکەنەوە، بەڵام ئێوە چوزانن؟ لەوەیە بمەوێ ڕێزدار بوردوفسکی ڕازی بکـەم. دەیسـا، ئێسـتا بەئاشـکرا و لەبـەردەمی ئێوەدا دەیڵـێم کـە مـن هـەمان نیازم...

یارۆی بۆکسباز، گوتی:

- ئۆخـەی! ئـەنجام چەنـد قسـەیەکی ئاقڵانـە، لـە زاری پیـاوێکی عاقـڵ و وەجاخزادە دەر هات!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- پەنا بە خوا!

جەنەراڵ، بەدەم پرتە و بۆڵەوە گوتی:

- شتی وا مەحاڵە! چۆن دەبێ!

میرزادە کەوتە تکا:

- تکاتـان لـێ دەکـەم، خانمـان، ئاغایـان، تکایـە ڕێـم بـدەن بـا حەقیقـەتی مەسـەلەکە ڕوون بکـەمەوە! جـەنابی بوردوفسـکی، نزیکـەی پێـنج هەفتەیـەک لەمەپێش، چیباروڤی وەکیل و نوێنەری تۆ، لە"ز"دا هاتـە لام. (لێرەدا میرزادە بـە پێکـەنینەوە ڕووی کـردە کـابرای بۆکسـبازو لەسـەری ڕۆیشـت). کـە تـۆ جەنابی کیللەر لەوتارەکەتدا زۆرت بە شان و باڵیا هەڵداوە و فرە بە ئاو و تاو وەسفت کردووە، بـەڵام من بـە هـیچ جۆرێ خۆشـیم بـە چارەیـا نـەهات. یەکسـەر هەستم کرد سەری هەموو داوەکان لە دەستی ئـەم چیباروڤـەدایە و با بـە ئاشـکرا بیڵـێم کـە ئـەم ئاگری ژێـر کایـە، ساویلکەیی تـۆی کـردووە بـە

دەساوێزی خۆی و بۆ ئەم کارەی هان داویت و بەم جۆرە تووشی کردوویت و تێوەی گلاندویت.

بوردوفسکی، لە تووڕەییدا زمانی کەوتە تەتەڵە:

- تۆ هەقی ئەوەت نییە... من... من.. ئەوەندە ساویلکە و گەوج نیم... ئەمە...

خوشکەزایەکی لیبدیف، لەسەری هاتە جواب و گوتی:

- هەق نیە تۆ ئەم جۆرە تەسەورە بکەیت! هەقی ئەم جۆرە تەسەورەت نییە!

هیپولیت، بە دەنگە زیقنەکەی هەڵی دایە:

- ئەمە سووکایەتییە! تەسەورێکی دزێوە، درۆیەکی شاخدارە، هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەکەوە نییە!

میرزادە، بەلەز کەوتە پۆزشهێنانەوە:

- ببورن بەڕێزینە! تکایە ببورن، من هەندێک قسەم لە ڕووە، من پێم وا بوو، قازانجی هەر دوو لامان لەوەدایە بە ڕاشکاوی قسان بکەین... ئێوەش کەیفی خۆتانە. من بە چیباروفم گوت، چونکە لە پترسبۆرگەوە دوورم، یەکسەر هاوڕێیەکی خۆم ڕادەسپێرم کە پەیگیری ئەو مەسەلەیەم بۆ بکات، هەروەها، من بە چیباروفم گوت، بە خۆم جوابەکە لە جەنابی بوردوفسکی دەگێڕمەوە. جا بەڕێزینە لێتانی ناشارمەوە کە تەدەخولی ئەم چیباروفەوای لێ کردم بکەومە گومانی ئەوەوە کە فێڵ و تەڵەکەبازیەک لەم مەسەلەیەدا هەیە، کە موویەک لەم ماستەدا هەیە..

میرزادە، کە چاوی بە نیگەرانی و ناڕەحەتی بوردوفسکی و ناڕەزایی هاوڕێکانی تری کەوت، بەلەز بای دایەوە و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- بەڕێزینە پێتان ناخۆش نەبێ، تکایە زویر مەبن! ئەمە هیچ پەیوەندییەکی شەخسی بە هیچ یەکێک لە ئێوەوە نییە. کە دەڵێم هەستم بە جۆرە فێڵ و تەڵەکەبازیەک کرد، ئەم قسەیەم کەم و زۆر ئێوە ناگرێتەوە، چونکە ئەو کاتە شتاقتانم نە دەناسی و تەنانەت ناوی کەستانم نەدەزانی. من لە میانەی چیباروفەوە حوکمی خۆم داوە و مەسەلەکەم

هەڵسەنگاندووە... بۆیە قسەکانم گشتین... خۆزگە دەتانزانی لەوەتای ئەو بەشە میراتەم بەر کەوتووە، چەند فریودراوم!

خوشکەزاکەی لیبدیف، بە تەوسخەنەوە گوتی:

– میرزادە، تۆ یەجگار ساویلکەی!

( هیپولیت )ش پلاری خۆی وەشاند:

– تۆ وێرای ئەوە، هەم میرزادە و هەم ملیۆنێریشی! جا ئەگەر ساویلکە و دڵپاک و دڵسافیش بیت، ناتوانی لە یاسای گشتی دەربچیت.

میرزادە، بەلەز هاتەوەلام:

– لەگینە، دەشێت نەتوانم، هەرچەندە نازانم مەبەستت کام یاسای گشتییە، بەلام من لەسەر قسەکەی خۆم دەڕۆم، بەلام تکا دەکەم لە خۆڕایی خۆتان سەغڵەت مەکەن، بە بەلاش قسەکانم مەبەنە سەر خۆتان، چونکە – باوەڕم پێبکەن – بە هیچ کلۆجێ نیازی ئەوەم نییە سووکایەتیتان پێ بکەم! ئاخر بەرێزینە ئەمە کەی ڕەوای هەقە پیاو هەر قسەیەک بکات و، ئێوە بیبەنە سەر خۆتان و وەکو فیشەکەشێتە بچن بە ئاسماندا؟ بەهەرحاڵ، کە یەکەم جار زانیم کوڕێکی گەنج هەیە بە ناوی "کوڕی پاڤلیشچوف"ـەوە و بەو وەزعە نالەبارەوە کە چیباروف بۆی گێڕامەوە، سەرم سووڕ ما. پاڤلیشچوف پشتیوانی من و دۆستی بابم بوو (باشە، جەنابی کیللەر، تۆ چۆن توانیوتە ئەم درۆودەلەسانە لە وتارەکەتدا دەربارەی بابم بنووسیت؟ هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان پارەی سرییەکەی خۆی نەدزیوە و لە قومارا نەیدۆڕاندووە، قەت بەد ڕەفتاری لەگەڵ ژێر دەستانی خۆیدا نەکردووە. من لەم ڕووەوە دڵنیای دڵنیام. چۆن دەستت تێچوو ئەم بوختانە گەورەیەی بۆ هەڵبەستی؟). ئەوەی دەربارەی پاڤلیشچوف نووسیوتە، فرِی بە ڕاستییەوە نییە... تۆ هێندە بە متمانە و دڵنیاییەوە باسی هەرزەیی و داوێنپیسی و فاسقی و زیناحکاری ئەم پیاوە مەردو ڕەندو شەریفە دەکەیت، وەکو ئەوەی باسی حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر بکەیت. کە ئەمە درۆ و بوختانێکی شاخدارە. هەڵبەتە پاڤلیشچوف، بە پێچەوانەی بوختانەکانی تۆوە، یەکێک بوو لەو مرۆڤە دروستکار و داوێنپاک و بێگەردانەی کە دنیا بەدەگمەن هی

وای بە خۆوە دیتوە! سەرباری ئەوەش پیاوێکی زانا بوو، پایەیەکی زانستی شایستەی هەبوو، نامە و نامەکاری دەگەڵ گەلێک لە زانا بە نێوبانگ و ناودارەکاندا هەبوو، پارەیەکی یەجگار زۆری لە قەبەڵی پێشکەوتنی زانست کردبوو. سەبارەت بە پیاوەتی و چاکە و کارێن خێری وی، زۆر ڕاست دەکەی کە نووسیوتە من لەو کاتانەدا بابایەکی نیمچە شێت، یان گێلۆکە یان گەمژەیەکی ئەوتۆ بووم کە هیچ تێنەدەگەییم (بەڵام دەمتوانی بە ڕووسی قسان بکەم و تێی بگەم)، بەڵام ئێستا دەتوانم ڕای خۆم لەمەڕ هەموو ئەو شتانە دەر ببڕم کە بیرم ماون...

هیپولیت، دەنگە زیقنەکەی لێ هەڵبڕی:

- بمبورە... واز لەم قسە عاتیفیانە بێنە. خۆ ئێمە منداڵ نین. قەرار بوو بچیتە سەر باسی جەوهەری مەسەلەکە. ئەوەشت لەبیر نەچێت کە هەنوکە سەعات لە نۆ تێپەڕیوە!

میرزادە، یەکسەر، قسەکەی بۆ سەلماندو گوتی:

- دەی باشە بەڕێزینە، هەر ئێستا دێمەوە سەر ئەسڵی مەسەلەکە.

پاش کەمێک لە دوو دڵی و گومان، لە دڵی خۆدا گوتم لەگینە من هەڵە بم، لەوەیە باڤلیشچوف کوڕێکی هەبێ، بەڵام سەرم لەوە دەرنەدەکرد کە ئەم کوڕە بۆچی دەبێ بەم شێوەیە جاڕی لە دایکبوونەکەی خۆی بدات و بە دنیادا بڵاوی بکاتەوە، لەمەش خراتر بۆچی دەبێ بەم ئاوایە ناوی دایکی خۆی بزڕێنێ و حەیا و ناموسی لە ناو خەڵکیدا بەرێت، چونکە چیباروف، هەڕەشەی لێ کردبووم کە نەنگ و فەزیحەتەکە بڵاو دەکاتەوە...

خوشکەزایەکەی لیبدیف هەڵی دایە و گوتی:

- لەو کەرێتییە!

بوردوفسکی گوتی:

- تۆ بۆت نییە، نا بۆت نییە!...

هیپولیت، بەوپەڕی هەڵچوونەوە، بە دەنگە زیقنەکەی گوتی:

- کوڕە، لە فسق و فجوری بابی بەرپرس نییە، دایکشی هیچ تاوانێکی نییە!

میرزادە، بە شەرمەوە گوتی:

- ئاخر هەر لەبەر ئەمە دەبووایە چاوپۆشی لە قسوری دایکی بکرابایە و ناوی نەزڕێنرابا.

خوشکەزایەکەی لیبدیف، بەدەم تەوسخەنێکی شەڕانییەوە گوتی:

- میـــرزادە، تــۆ نـــەک هـــەر ســـاویلکەیت، ڕەنگـــە لـــە ساویلکەییشـــت تێپەڕاندبێت...

هیپولیت بە دەنگێکی زۆر نائاسایی گوتی:

- ئاخر تۆ هەقت چییە؟

میرزادە، بەلەز گوتی:

- هیچ، هیچ هەقێکم نییە...

هەنگێ لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- لێرەدا هـەق بـە تۆیـە، ئەشـەد و هـەق بـە تۆیـە، بـەڵام ئیدی بـێ هـیچ غەرەزێک بە بیرما هات. پاشان هەر زوو لە دڵی خۆدا گوتم، نـابێ هەسـت و بۆچـوونی شەخسـی مـن هـیچ کارێـک لـە مەسـەلەکە بکـات، چونکـە ئەگـەر قـەراربێ لەبـەر خـاتری پافلیشـچوف و وەکـو وەفادارییـەک دەرهـەق بـە پیاوەتی و چاکەی وی لەهەنبەر منا، داوایەکانی بوردوفسکی جێبەجێ بکەم، هەنگێ چ ڕێزی جەنابی بوردوفسکی بگرم چ ڕێزی نـەگرم هـەر دەبێ ئەو کارە بکـەم... بۆیـە بـە ڕێزینـە کـە مـن باسـی گومـان و دوو دڵیـی خـۆمم بـۆ کردن، لەبەر ئەوە بوو کە پێم وا بوو و ئێستاش پێم وایە کە سرهەڵماڵینی دایک لەلایەن کوڕەکەیەوە کارێکی نـا ئاسـاییە... بە کورتییەکەی، لەبـەر ئەو شتە گەیشتمە ئەو قەناعـەتی کـە چیبـاروف پیـاوێکی کڵاوچییە و بـە فێـڵ و دەهۆیان جەنابی بوردوفسکی لەم فڕوفێڵانەوە گلاندووە.

ئیدی هات و هاواری دەستەجەمی میوانە تازەکان بەرز بووەوە:

- ئاە... ئەم قسەیە ئیدی لە کێشا نیە!

تەنانەت هەندێکیان خەریک بوو هەڵدەستانە سەرپێ.

- بەڕێزینـە! بـەم بەڵگەیـەدا بـۆم دەر کەوت کـە جـەنابی بوردوفسـکی بەلـەنگاز و کڵـۆڵ، دەبـێ پیـاوێکی سـاویلکە و سـائەقڵ بێـت و نـەزانێ چـۆن

خـۆی لــە داوی داوبــازان ببـوێرێ و خـۆی لــە فەنـدەڵ فێڵــی فریبۆکــان بپەڕێنێتەوە، ئیدی ئەمە کردیە کارێک، بەو حیسـابەی "کوڕی پافلیشـچوفە" بە سێ جۆر یارمەتیی بدەم، یەکەم: لە کاریگەریی چیباروف دەربازی بکەم. دووەم، بە دڵسۆزی و دۆستانە ڕێنوێنیی بکەم، سێیەم، دە هەزار ڕۆبڵی بدەمێ کە ئەمە بە پێی حیسـاباتی من ئەو بڕە پارەیەیە کە پافلیشـچوف لە منا خەرجی کردووە.

هیپولیت هاواری کرد:

- چی؟ تەنیا دە هەزار ڕۆبڵ؟

خوشکەزاکەی لیبدیف، بە تەشەرەوە گوتی:

- دەی میرزادە، لە حیسابا بە قوەت نیت، یان زیاد لە پێویست بە قوەتی، بەڵام خۆت لە گێلی دەدەی.

بوردوفسکی هەڵی دایە:

- من بە دە هەزار ڕۆبڵ قاییل نابم.

یارۆی بۆکسباز، لەپشت کورسییەکەی هیپولیتەوە، ملی هێنایە پێشێ و بە چپە گوتی:

- ئانتیب قاییل بە، جارێ قاییل بە، تا دوایی.

هیپولیت دیسان زیقاندی:

- تەمەشا جەنابی میشکین! جارێ دەبێ ئەوە بزانیت کە ئێمە گەوج نین. لەو کەر و گایانەش نین کە پێدەچێ میوانـەکانت وامـان تەسـەور بکـەن، لەو گێـل و شــەواکانە نـین کــە ئەو خانمانــە تەســەوریان دەکــەن و بــەدەم تیزخەنەوە تەمەشـامان دەکەن، بەتایبەتی ئـەم ئەرسـتۆکراتە بـەڕێزە (بـەدەم ئەو قسەیەوە ئاماژەی بۆ یەڤگینی باڤلوڤیچ کرد) کە هەرچەندە بە ناسـینی مشەڕەف نەبووم، بەڵام ناوبانگیم بیستووە.

میرزادە، بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی:

- بەڕێزان، بە یارمەتیتان، تکایە بە یارمەتی خۆتان، ئەلهەقی ئـەم جـارەش لــە مەبەسـتم نەگەیشــتن، جــارێ پــێش هــەموو شــتێک جـەنابی کیللــەر، وتارەکەی تۆ دەربارەی تەخمینی سەروەت و سامانەکەی مـن زۆر بێدیقەت

و شاشـە، فڕی بـە ڕاسـتیەوە نییـە: مـن چەنـد ملیۆنێکم پـێ نـەبڕاوە، ڕەنگـە هەشت یەک یان دەیەکی ئەو بڕە پارەیەم هـەبێ کە تۆ قەبڵاندووتـە. پاشـان ئەوەی لە سویسرا خەرجی من کراوە هـەرگیز دەیـان هـەزار ڕۆبڵ نـەبووە، جارێ شنایدەر سالّی تەنیا شەش سەد ڕۆبڵی وەر دەگرت، ئەویش تـەنیا لـە سـێ سـالّی یەکەمـدا. سـەبارەت بـە پـەروەردەکارو فێرکـاری جـوان و خشکۆک، پاڤلیشچوف هـەرگیز، ڕۆژێ لـە ڕۆژان، پەروەردەکار و فێرکاری لە پاریسەوە بۆ مـن نـەهێناوە – ئەمـەش بوختانـە بـە خەڵکیدا. پێم وایـە ئەو پارەیـەی خـەرجی مـن کراوە، زۆر لـە دە هـەزار ڕۆبڵ کـەمتر بـووە، بـەلّام قەیدی نیە من ئەم دەهەزار ڕۆبڵـەم قەبووڵـە، بـاوەڕ بکـەن، ئەگـەر قەرزیشـم لـەلا بوایـە، چەندیشـم جـەنابی بوردوفسـکی خۆش ویسـتبا هـەر قەرزەکـەیم دەدایەوە، نەمـدەتوانی لـە قـەرزەکـە زیـاتری بـدەمەوە، چونکـە سـادەترین ئەتەکێتی زەوق ڕێگەم نادات، لە کاتێکا کە مـن قـەرزی دەدەمەوە، وا بنـوێنم کە خێری پێ دەکەم. نـازانم بۆچی ناتـانەوێ لـەم مەسـەلەیە بگـەن! جاران بـەزەییم بـە کڵـۆڵی و بەدبـەختی ویـدا دەهـاتەوە، دەمویسـت لـە ڕووی دۆستایەتیەوە قـەرەبووی ئەو کڵۆڵی و بـەد بەختیـەی بۆ بکـەمەوە، دوایـی بـۆم دەر کەوت کـە فریـوی خـواردووە، ئەگـەر فریـوی نـەخواردبا، هـەرگیز بەوە ڕازی نەدەبوو کیللەر لە وتارەکەیدا، بەو شـێوەیە نـاوی دایکی بزڕێنێ و ڕیسـوای بکـات. بـۆچی دووبـارە تـوڕە دەبـن بەڕێزینـە؟ ئەگـەر کـار وا بڕوات، قەت لە یەکدی ناگەین و ناگەینە هیچ لێکدی حاڵیبوونێک!.

میرزادە بەم جۆرە کۆتایی بە قسەکەی خۆی هێنا:

– بـەڵێ، قسـەکەی مـن دەرچـوو، هەنوکـە دڵنیـام، کـە لێکـدانەوە و مەزەندەکەی من ڕاست و دروست بوو.

میرزادە، بە خۆشحاڵییەوە هەوڵیدەدا هێوریان بکاتەوە، بەلّام ئاگای لەوە نەبوو، بەو کارەی هێندەی دی دەیهاڕوژاندن و هاری دەکردن.

هاواریان لێ هەستا و بە توڕەیی پرسیان:

– قسەی چی؟ لە چی دڵنیا بوویت؟

میرزادە، بەرسڤی دایەوە:

- بە چاوی خۆم و زۆر بەشێنەیی جەنابی (بوردوفسکی)م بینی. لە نزیکەوە ناسیم و زانیم بۆردوفسکی چ جۆرە بە شەریکە و چ کەسێتییەکی هەیە... گەنجێکی سادە و ساویلکە و خۆشباوەڕە، بە هەر کەسێک دەخەڵەتێ و لە خشتە دەبرێت. بەئاسانی دەبێ بە داردەستی هەر کەسێک. کەسێکە ناتوانێ بەرگری و داکۆکی لە خۆی بکات، بۆیە لەسەرمە کە بیپارێزم و داکۆکی لێبکەم. سەربارەت بە (گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)یش کە ڕامسپاردبوو، پەیگیری ئەم مەسەلەیەم بۆ بکات و ماوەیەکی زۆر بوو، بە هۆی سەفەرم و بە هۆی نەخۆشیمەوە لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، کە لە پترسبۆرگ بووم، هیچ هەواڵێکم نەدەزانی، سەعاتێک لەمەپێش، لە یەکەم دیدارماندا پێی ڕاگەیاندم کە پەی بە هەموو نەخشە و مەرام و مەبەستەکانی چیباروف بردووە و قوڕی بنی دەرهێناوە و بەڵگەی تەواوی بە دەست هێناوە کە چیباروف، هەمان ئەو جۆرە پیاوەیە کە من مەزەندەم لێ دابوو. جا خانمان و ئاغایانی بەڕێز، من زۆر چاک دەزانم، خەڵکێکی زۆر بەگەمشەگ و گەمشۆم دەژمێرن. (چیباروف) کە بیستوویەتی من مرۆڤێکی دەستبڵاوم و بەئاسانی پارەم لێ دەر دەهێنرێ، ئیدی وای خەیاڵ کردووە، دەتوانێ بەئاسانی بلۆفم لێ بدات و هەڵم بخەڵەتێنێ، بە تایبەتی کە زانیویەتی کە جۆرە نمەکناسییەکم دەربارەی باڤلیشچوفی ڕەحمەتی هەیە و بە چاکە و پیاوەتیی ئەو پیاوە دەزانم و خۆم بە منەتباری دەزانم، ئیدی لەو دەرگایەوە بۆم هاتووە، بەڵام ئەسڵی مەسەلەکە... ئەوە چیتانە بەڕێزینە؟ تکایە قسەکانم پێمەبڕن، تا کۆتایی گوێم لێبگرن... گوتم ئەسڵی مەسەلەکە ئەمەیە کە بە بەڵگەی بنجبڕەوە ئەوە ساغ بووەتەوە کە ئەم ئاغای بوردوفسکییەی کە ئێستا سەر و کەللەی پەیدا بووە، کوڕی باڤلیشچوف نیە! گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، ئا ئێستا ئەو هەواڵەی دامێ و گوتی بەڵگەی بنج بڕی لەو بارەیەوە پەیدا کردووە. ها، ئێوە چ دەڵێن؟ هەڵبەتە پاش ئەو هەموو هەراوهەنگامە و هەراوزەنایە زەحمەتە پیاو باوەڕ بکات! کەواتە باش گوێم لێبگرن: بەڵگەی بنج بڕ هەیە! من خۆیشم تا ئێستا بە تەواوەتی باوەڕ ناکەم، دڵنیا بن ناتوانم باوەڕبکەم. هێشتا گومانم

هەیە، چونکە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، هێشتا فریا نەکەوتووە، بەوردی و تێرو تەسەلی مەسەلەکەم بۆ بگێڕێتەوە و بەڵگەکانم بخاتە بەردەست، بەڵام ئەوەی ساغ بووەتەوە و هیچ چەند و چوونێک هەڵناگرێت ئەوەیە کە چیباروف، پیاوێکی سێبەندی، سەرسەری دەستبڕە، نەک هەر بوردوفسکی بە لەنگاز، بەڵکو هەموو ئێوەی بەڕێزیشی خاپاندووە کە بەوپەڕی نیاز پاکییەوە بۆ ئێرە هاتوون تا بەرگری و پشتیوانی لە هاوڕێکەتان بکەن (چونکە پێویستی بە پشتیوانی و کۆمەک و بەرگرییە، من لەمە دەگەم). ئیدی چیباروف هەمووتانی تووش کردووە. هەر هەمووتانی لە فێڵ و تەڵەکەبازی و دەستبڕییەوە گلاندووە، چونکە ئەم مەسەلەیە جگە لە دەستبڕی و فێڵ و فریو هیچی تر نییە.

لە هەموو لایەکەوە، دەنگ بەرز بووەوە:

- چۆن؟ فێڵ و درۆ و دەستبڕی؟ چۆن؟ کوڕی پاڤلیشچوف نیە؟ شتی وا چۆن دەبێت؟

دارو دەستەکەی بوردوفسکی، هەموو بە جارێ حەپەسان!

میرزادە گوتی:

- بەڵێ، دزی و درۆو دەستبڕییە! ئەگەر ئاغای بوردوفسکی نەیسەلمێنێت کە کوڕی "پاڤلیشچۆفە"، ئیدی داواکەی دەکاتە فێڵ و درۆ و دەستبڕی (هەڵبەتە ئەگەر ئاگای لە مەسەلەکە بووبێت)، بەڵام لە حەقیقەتدا ئەو فریو دراوە، لە خشتە براوە. بۆیەش سوورم لەسەر ئەم خاڵە تا لە هەر تاوانێک تەبرێی بکەم، چاوپۆشی لە هەڵە و تاوانەکانی بکەم. لێی ببورم. پێم وایە پیاو دەبێ بەزەیی بە ساویلکەیی و غەشیمی ئەم گەنجەدا بێتەوە و بەرگریی لێ بکات، دەنا لەوەیە لەم مەسەلەیەدا ببێ بە شەریکی فێڵ و دزی و دەستبڕی، بەڵام من لە ئێستاوە قەناعەتم وایە کە ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە. منیش پێش ئەوەی بچم بۆ سویسرا وا بووم، هەمان وەزع و حاڵی ئەوم هەبوو. قسەی بێ سەرو بەرم دەکرد، وڕێنەم دەکرد. دەمویست نیازو مەبەستی خۆم دەربڕم، بەڵام وشەم لێدەچوونە قاتی، بۆم نەدەهات... چونکە خۆم بەم حاڵەتەدا ڕۆیشتووم، لە هەموو کەس

زیاتر بەزەییم پێیدا دێتەوە و دەتوانم هاوخەمی و هاوسۆزیی دەگەڵدا بکەم، چونکە منیش تەقریبەن هەمان وەزعم بەسەر هاتووە، بۆیە هەقی ئەوە بە خۆ دەدەم باسی ئەو مەسەلەیە بکەم. لە کۆتاییدا، هەرچەندە ساغ بووەتەوە کەسێک نییە بە ناوی کوڕی پاڤلیشچوفەوە و مەسەلەکە تەنیا چاووڕاو بووە، بەڵام لە کۆتاییدا دەیڵێمەوە کە من هەر لەسەر بڕیار و قسەی خۆمم، ئامادەم لەبەر خاتری قەبرەکەی باڤلیشچوف، دە هەزار ڕۆبڵ بە ئاغای بوردوفسکی بدەم. بەر لەوەی سەرو سەکوتی بوردوفسکی پەیدا ببێت، بەتەما بووم، ئەم بڕە پارەیە سەرفی دامەزراندنی قوتابخانەیەک بکەم بە ناوی باڤلیشچوفەوە، بەڵام ئێستا بەلامەوە گرینگ نییە ئەو بڕە پارەیە سەرفی دامەزراندنی قوتابخانە بکەم یان بیدەم بە ئاغای بوردوفسکی، چونکە ئەگەر بە حەقیقەتیش کوڕی باڤلیشچوف نەبێت، ئەوا ئەوەندە زۆڵانە فریویان داوە، قەناعەتی تەواوی لا دروست بووە کە کوڕی بافلیشچوفە. بەڕێزینە حەز دەکەم گوێ لە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بگرن با قسەکانی بکات و بە یەکجارەکی کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنین. تکادەکەم تووڕە مەبن، هێدی و هێمن لە شوێنی خۆتان دانیشن! با گاڤریلا ئاردالیونوفیچ مەسەلەکەمان بەوردی بۆ باس بکات، ئەلهەقی من زۆر تاسەمەندی ئەوەم، بە هەموو وردودرشتێکی مەسەلەکە بزانم. گاڤریلا دەڵێت چووە بۆ بسکوف و دایکی بوردوفسکی دیتووە – کە هەڵبەتە بە پێچەوانەی وتارەکەوە، نەمردووە و لە ژیاندایە –... خانمان و ئاغایانی بەڕێز، دانیشن! بفەرموون دانیشن!

میرزادە، بە خۆی دانیشت، جارێکی دی داوای لە دارو دەستەکەی بوردوفسکی کرد، کە نیگەران و بێئۆقرە لە پێستی خۆ نەدەهێورین، دانیشن. میرزادە کە نزیکەی دە-پازدە دەقیقەیەک زۆر بە جۆشوخرۆشەوە، بە دەنگی بەرز و بەپەلە و بە هەڵچوونەوە قسانی کردبوو، ویستبووی بەسەر هەراوهەنگامە و دەنگە دەنگ و هاتوهاواری سەرسامی و ناڕەزایی ئەوانی دیدا زاڵ بێت! هەنوکە لە کانگای دڵەوە پەشیمان بوو لەوەی هەندێ قسانی کردبوو کە خۆزیای دەخواست نەی کردبان، خۆ ئەگەر نەیانوروژاندبا و بەو شێوەیە دەهریان نەکردبا، هەرگیز ڕێی بە خۆی





نـەدەدا، بەو پەلـەپروزێ و هاتوهـاوارە، هەنـدێ مەبەسـت و بۆچوونـان و مەزەندەی خۆی بەو ڕاشکاوی و بێ پەردەییە دەرببڕێت. هەر کە لەسەر کورسییەکەی دانیشت هەستی بە پەشیمانییەکی بە سوێ کرد کە دڵی دەگوشی، گلەیی ئەوەی لە خۆی دەکرد بۆچی بە بەرچاوی هەمووانەوە هەمان ئەو نەخۆشیەی خۆی، کە بۆ چارەسەری چووبوو بۆ سویسرا دابووە پاڵ بوردوفسکی و سووکایەتیی پێ کردبوو. لەوەش خراتر، ئەوە بوو، خۆی گوتەنی بە شێوەیەکی زۆر ناپەسند و دوور لە هەر ئەتەکێت و زەوقێک، پێشنیازی ئەو دە هەزار ڕۆبڵەی بۆ بوردوفسکی کردبوو، کە تەرخانی کردبوو بۆ دامەزراندنی قوتابخانەیەک، ئەم پێشنیازەی بە بەر چاوی خەڵکەکەوە و وەکو خێر و سەدەقەیەک کردبوو. میرزادە، لەمەش زۆر ژێوان بوو، بۆیە لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەبوایە تا سبەینێ چاوەڕوانم کردبا و هەنگێ بە تەنیا ئەو کارەم دەگەڵی کردبا، بەڵام تازە ڕۆیشت!. بەڵێ من گەوجم! گێلم گێل! بە ڕاستی گەمژەم! ".

پاش ئەوە، گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، کە تا ئەو کاتە بە بێدەنگی لە سوچێکەوەوەستابوو و تاقە وشەیەکی لە زار نەهاتبووە دەرێ، لەسەر داوای میرزادە هاتە بەرەوە. لەلای میرزادەوە دانیشت، بە دەنگێکی ئاشکرا و ڕەوان و بێگرێ کەوتە باسی ئەو ئەرکەی کە میرزادە پێی سپاردبوو. لەپڕ هەموو ئامادەبووان بێدەنگ بوون، ورتە لە کەسەوە نەدەهات، بە تایبەتی بوردوفسکی و دارودەستەکەی سەراپا بووبوون بە گوێ و بەوپەڕی کونجکاوی و بایەخەوە گوێیان هەڵخستبوو.





پەراوێز:

* - "خێرا ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی گاڵتەجاڕی کۆمیکی...": ئەو وتارە دوورودرێژەی لەم ڕۆمانەدا بڵاو بووەتەوە، لاسایی کردەوەی ئەو وتارانەیە کە ڕۆژنامەوانێکی گومنا و بە ناوی ستوبانوفسکی لە گۆڤاری هەفتانەی گاڵتەجاڕی "الشرارە"دا بڵاوی دەکردەوە، کە لە ساڵانی ١٨٥٩-١٨٧٩، لە پترسبۆرگ دەر دەچوو.

* - "هەرچەندە ئەم قەوانە تازەیە، بەڵام زەحمەتە پیاو باوەڕی پێ بکات": ئەمە بەیتە شیعرێکە کە لە شانۆنامەیەکی کۆمیدی بە ناوبانگی گریبویدیف)ەوە بە ناونیشانی "ئەقڵی زۆر زەرەرە" وەر گیراوە، کە ئاماژەیە بۆ بەربەریەت و هۆڤیگەریی ئەو سەردەمەی کە زۆری بەسەردا نەڕۆیشتووە.

* - "هەورەکەی حیکایەتەکەی کریلوف...": (١٨١٥)، یەکێکە لەو حیکایەتە ئەفسانەییە هەرە جوانانەی کە کریلوفی گەورە نووسەری ڕووسی نووسیویەتی.

* - "تەریقەت و ئایینی راسکولنیک...": ئەمە تەریقەت و ڕێبازی باوەڕدارە دێرینەکانە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەو دووبەرەکییە ئایینییەی کە لەدوای ڕیفۆرمە ئایینیەکانی پەتریارک نیکون بەرپابوو.

* - "لیوڤا...": دۆستویفسکی لێرەدا، پەرەگرافی وتارێک هەڵدەگێڕێتەوە کە ڕەخنەگرێکی گومناوی هیچ، لە گۆڤارێکدا دەربارەی ئەو بە ناونیشانی " فیدیای لە خۆبایی" بڵاودەکاتەوە کە لەو وتارەدا گاڵتە بە دۆستویفسکی دەکات گوایە چیرۆکی پاڵتۆی گۆگول تالاند دەکات و دەیشێوێنێ و وەختی خۆ بە شتی تورە هاتەوە دەکوژێت. جا دۆستویفسکی لێرەدا ئەو ڕەخنەگرەی وەکو یەکێک لە شاعیرە تەنزنووسە بەناوبانگەکانمان وەسف کردووە.

* - "شنایدەر...": ناوی ئەو پروفیسۆرەیە کە "گەمژەی" لە سویسرا، چارەسەر دەکرد.

## فەسڵی نۆیەم

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، لە سەرەتاوە ڕووی دەمی کردە بوردوفسکی کە بە ئاشکرا شپرزەیی و نیگەرانیی پێوە دیار بوو، بە چاوانی ئەبڵەق و، واقی وڕەوە، بەوپەڕی کونجکاوی چاوی بڕیبوونە گاڤریلا. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ پێی گوت:

- بێگومان تۆ نکوڵی لەوە ناکەیت کە دوو ساڵی ڕێک دوای زەوجینی فەرمی و یاسایی، لەنێوان دایک و باوکتا، واتە ئاغای بوردوفسکی فەرمانبەری پلە دەیەم*، هاتوویتە دنیا. دیارە سەلماندنی ڕۆژو بەرواری لە دایکبوونی تۆ بەگوێرەی بەڵگەیێن حاشاهەڵنەگر و تۆمارێن ورد زۆر ئاسانە، بەڵام تەزویر و دەسکاری کردنی ئەم بەروارە لەوتارەکەی جەنابی کیللەردا، کە هەم بۆ تۆ و هەم بۆ دایکت، ئەوپەڕی سووکایەتییە، هیچ لێکدانەوەیەک هەڵناگرێت، تەنیا ئەوە نەبێت کە زادەی خەیاڵی ئاغای کیللەرە، کەوای تەسەور کردووە، بەو کارە خزمەتی بە ڕژەوەندی تۆ دەکات و هەقانیەتی داوایەکەت دەسەلمێنێ. ئاغای کیللەر دەڵێت وتارەکەی لەپێشا، واتە پێش ئەوەی بڵاوی بکاتەوە، بۆ تۆ خوێندووەتەوە، بەڵام هەمووی، بە تەواوەتی بۆ نەخوێندوویتەوە... بۆیە هیچ گومانی تیا نییە کە لە کاتی خوێندنەوەکەدا ئەو پەرەگرافەی پەڕاندووە...

یارۆی بۆکسباز قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- دروستە، ئەو پەرەگرافەم بۆ نەخوێندەوە، بەڵام هەر هەموو ئەو

زانیاریانە، کەسێکی شارەزا بۆی گێڕامەوەو، من....

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- ببورە ئاغای کیللەر، بە یارمەتیت با قسەکەم تەواوبکەم. نۆرەی وتارەکەی تۆش دێت، دڵنیات دەکەم هەنگێ تۆش دەتوانی قسەی خۆت بکەیت، بەڵام جارێ با شتەکان بەڕیز باس بکەین. من خۆشبەختانە بە ڕێکەوت و بە کۆمەکی ڤارڤارا ئاردالیونوڤینا پتیتسنی خوشکمەوە، لەلای ڤیرا ئەلکسیڤنا زوبکوڤای دەستە خوشکی دڵسۆزی، کە بێوەژنێکی موڵکدارە، نامەیەکی نیکولا ئاندریوفیچ پاڤلیشچوفی ڕەحمەتیم دەست کەوتووە، کە بیست و چوار ساڵ لەوەپێش، کاتێ لە هەندەران بووە، بۆ ئەو ژنەی ناردووە. پاش ئەوەی پەیوەندیم بە ڤیرا ئەلکسیڤناوە کرد، لەسەر قسەی ئەو چووم بۆ لای کۆلۆنێلێکی خانەنشین، بەناوی تیمونی فیدوروفیچ ڤیازوڤکین، ئەمە خزمێکی دوور و دۆستێکی نزیکی پاڤلیشچوفی ڕەحمەتی بوو، دوو نامەی دیکەی (نیکولا ئاندرویوفیچ)م لەلای ئەم بەڕێزە دەست کەوت، کە هەر دووکیانی لە هەندەرانەوە نووسیبوو. بەگوێرەی بەروار و مێژووی ئەم سێ بەڵگەنامەیە، کە بە دیقەتێکی ماتماتیکییانەی ئەوتۆوە نووسراون، کە هیچ گومانێک هەڵناگرن، ئەوە دەردەکەوێ کە ئاغای پاڤلیشچوف لەو سەردەمەدا سێ دانە ساڵی تەواو لە هەندەران ژیاوە، ڕێک بە ساڵ و نیوێک بەر لەدایکبوونی تۆ جەنابی بوردوفسکی، سەفەری هەندەرانی کردووە. بە خۆت لە هەموو کەس باشتر دەزانی کە دایکی تۆ بە عەمراتی، لە ڕووسیا دەرنەچووە... جا ئێستا ئەو نامانە ناخوێنمەوە، چونکە درەنگە. تەنیا ڕووداوەکان دەگێڕمەوە و هیچی تر. جا جەنابی بوردوفسکی من ئامادەم سبەینێ ئەگەر خۆت حەز دەکەی، سبەینێ لەلای من یەکتر ببینین، شایەدیش لەگەڵ خۆتا بێنە، چەند کەس دێنێ بیان هێنە، خەڵکی پسپۆری خەتناسیش بێنە، ئەوسا دەبینی چۆن ناچار دەبیت دان بەو حەقیقەتانەدا بنەیت کە بۆم باسکردیت. من لەمە دڵنیام، کە دانت بەو ڕاستییەدا نا ئیدی داواکەت خۆبەخۆ بەتاڵ دەبێتەوە.

ئامادەبووان، دیسان جموجۆڵیان تێکەوت، بوردوفسکی، لەپڕ لەسەر

کورسییەکەی هەستا، گوتی:

– ئەگەر مەسەلەکە وا بێت، مانای وایە من فریودراوم، بەڵێ نامەرادنەش فریودراوم، بەڵام چیباروف فریوی نەداوم، بەڵکو زۆر لەوە پێشتر فریو دراوم، زۆر لەمێژە! بۆیە نە پسپۆڕی خەتناسیم گەرەکە و نە دیدار لەگەڵ تۆدا. من باوەڕت پێ دەکەم. واز لە داواکەم دێنم... دە هەزار ڕۆبڵەکەشم ناوێ... بە خواتان دەسپێرم!.

ئەوسا، کڵاوەی هەڵگرت و کورسییەکەی بردە دواوە، خۆی ئامادە کرد تا بڕوات.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بە زمانێکی نەرم و ناسک گوتی:

– جەنابی بوردوفسکی پەلە مەکە ئەگەر دەتوانی، کەمێکی دی، ئەگەر بۆ پێنج دەقیقەش بووە، دانیشە، چونکە ئەم مەسەلەیە شتی دیکەی زۆر گرینگی تیایە، بە تایبەتی سەبارەت بە تۆ و بۆ تۆ، زۆریش خۆشن. بە ڕای من زۆر پێویستە تۆ ئەو شتانە بزانی، لاموایە ئەگەر مەسەلەکە بە تەواوەتی ڕوون ببێتەوە، ڕەنگە لە ڕووی دەروونییەوە هەست بە ئاسوودەییەکی زیاتر بکەیت.

بوردوفسکی، بێ ئەوەی هیچ بڵێت دانیشتەوە. بە جۆرێ سەری داخستبوو لە تۆ وایە لە بیر کردنەوەیەکی زۆر قوڵدایە. خوشکەزایەکەی (لیبدیف)یش کە هەستابوو لەگەڵ ئەودا بڕوات، دانیشتەوە، هەرچەندە لە دلێری و بێباکی خۆی نەکەتبوو، بەڵام بە ئاشکرا شپرزەیی و نیگەرانی پێوە دیار بوو. هیپولیت گرژ و پەست، خەمین و دڵتەنگ دیاربوو، لەو کاتەدا کۆکەیەکی هێندە توندگرتی، کە ئەو دەستەسڕەکەی بە دەمیەوە گرتبوو، پڕبوو لە خوێن. کابرای بۆکسباز حەپەساو و هەراسان دیاربوو، بە پەستییەوە ڕووی کردە بوردوفسکی و بە زمانێکی تاڵ گوتی:

– ئاهـ... ئانتیپ پێم نەگوتی.. دوێنێ... پێرێ.. پێم نەگوتیت، لەوەیە کوڕی باڤلیشچوف نەبێت؟!

دەنگی پڕم و هۆڕی تەوسامێز بەرز بووەوە، دوو سێ کەس خۆیان پێنەگیراو لە قاقای پێکەنینیان دا.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، لە وەڵامی قسەکانی کیللەردا گوتی:

- جەنابی کیللەر، ئەو شتە کەمەی کە ئێستا بۆت کەشف کردین، بایەخێکی زۆری هەیە. بەڵێ، بەڵام من بەگوێرەی زانیاریی زۆر ورد دەتوانم ئەوە بسەلمێنم کە جەنابی بوردوفسکی، هەرچەندە زۆر بەوردی بەرواری لە دایکبوونی خۆی دەزانێت، بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبووە کە لەو سەروبەندەدا پاڤلیشچوف لە هەندەران ژیاوە، زۆربەی کات هەر لە هەندەران بووە، مەگەر بە ڕێبواری بۆ ڕووسیا گەڕا بووبێتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو سەفەرەی پاڤلیشچوف. ئەوەندە گرینگ نەبووە کە دوای پتر لە بیست ساڵان، لە بیری نزیکترین دۆستی پاڤلیشچوف بمێنێ، تا لە بیری بوردوفسکیەک بمێنێ، کە ئەو کاتانە هەر لە دایکیش نەبووبوو. ڕاستە بەدەستهێنانی بەڵگە و زانیاری دەربارەی ئەو سەفەرە بۆ هەندەران، کارێکی نەکردەنی یان مەحاڵ نییە، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنەم کە ئەو هەوڵەی من لەو بارەیەوە داومە، لەگین بوو هیچی لێ شین نەبێت و من بەڕێکەوت ئەو زانیارییانەم دەست کەوتووە. خۆ ئەگەر بوردوفسکی یان چیباروف، هەوڵیان دا با ئەو زانیارییانە بەدەست بێنن، مەحاڵ بوو هیچ بە هیچ بکەن، ئەمە ئەگەر لە بنەڕەتدا شتی وایان بە بیرا بهاتبایە.

هیپولیت، لەپڕ تورە بوو، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- بە یارمەتیت ئاغای ئیڤولگین، ئەم هەموو درێژدادڕییەی بۆ چییە؟ (ببورە کەوا دەڵێم!). مەسەلەکە تەواو ڕوون بووەتەوە و حەقیقەتەکەمان زانی، ئیدی ئەم هەموو درێژدادڕییەی و شاخ و باڵ لێنانەی بۆ چییە؟ یان دەتەوێ تواناو بەهرەی پشکنین و گەڕان و پەیگیری خۆت بنوێنی و بە ئێمە و شازادەی نیشان بدەیت کە پەیگیرو پشکنەرێکی بەهرەداریت؟ یان دەتەوێ بەوە پاکانە بۆ بوردوفسکی بکەیت و لە هەموو خەتایەکی تەبرێ بکەیت کە بە هۆی نەزانی و گەوجی خۆیەوە لەم ڕووداوەوە گلاوە؟ بەڵام ئەمە گۆساخییە قوربان! بوردوفسکی پێویستی بە پاکانەی تۆ نییە، دڵنیا بە ئەمە خۆی لە خۆیدا سووکایەتییە، خۆی باری زۆر سووک نییە تا تۆش هێندەی دیکە باری قورس بکەیت. دەبوایە ئەمەت ڕەچاو بکردایە...

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:
- بەسە، بەسە جەنابی تیرنتییف! کەمێک هێدی بە، زۆر خۆت سەغڵەت مەکە! لەوە دەچێ زۆر نەخۆش بیت؟ دڵم بە حاڵت دەسووتێ. من تەواو، لێرەدا قسەکەم دەبڕم ئەگەر مەبەستت ئەوەیە! بەڵام هەست دەکەم لەسەرمە، هەموو ئەو ڕاستییانەی کە پێویست و زەرورییە بزانرێن، بە تەواوی بخەمە ڕوو....
هەنگێ ئیڤولگین کە بینیی ئامادەبووان، جموجووڵێکیان تێ کەوت و لەوە دەچوو حەز بکەن گوێ بگرن، لەسەری ڕۆیشت:
- من گەرەکمە، بە بەڵگەوە، ئەوە بۆ هەموو ئەو کەسانە ڕوون بکەمەوە کە کەم و زۆر پەیوەندیان بەم مەسەلەیەوە هەیە و ئەم پرسەیان مەبەستە، کە دایکی تۆ جەنابی بوردوفسکی ڕێزو حورمەتێکی زۆری لەلای نیکولا ئاندریوفیچ هەبوو و زۆری مدارا دەکرد، دەزانی بۆ؟ چونکە خوشکی کیژێکی مسکێن و کارەکەر بوو کە نیکولا ئاندریوفیچ، لە هەوەڵی گەنجیدا، زۆری خۆش دەویست، ئەگەر ئەو کیژە کوتوپڕ نەمردبا، بێگومان نیکولای ئاندریوفیچ دەیخواست. من بەڵگەی بنجبڕم دەربارەی ئەم ڕووداوە پێیە کە شتێکی ئەوتۆی لە بارەوە نازانرێ یان بە تەواوەتی فەرامۆش کراوە. لەمەش بترازێ دەتوانم ئەوەشت بۆ ڕوون بکەمەوە کاتێ دایکی تۆ لە تەمەنی دە ساڵیدا بووە، چۆن جەنابی پاڤلیشچوف وەکو خزمێکی نزیکی خۆی گرتوویەتییە ژێر باڵی خۆی و بە خەرجی خۆی ناوێتیە بەر خوێندن و بەخێوی کردووە و جیازییەکی زۆروزەبەندەی بۆ فەراهەم کردووە. ئیدی ئەم کارە کردویەتیە کارێک کە مقۆمقۆیەکی زۆر لەنێو خزم و کەسوکارە زۆروزەبەندەکەی پاڤلیشچوفدا بڵاو بووەتەوە... تەنانەت هەندێکیان گومانی ئەوەیان کردووە کە پاڤلیشچوف گەرەکیەتی ئەو کچە بخوازێت، بەڵام دایکی تۆ کە دەگاتە تەمەنی بیست ساڵی، شوو بە فەرمانبەرێکی دایەرەی ڕوپێوی زەویوزاران دەکات بە نێوی بوردوفسکی. دیارە بە حوسن و ڕەزای خۆی شووی پێ دەکات، دەتوانم بە بەڵگەی تەواوەوە هەموو ئەمانە بسەلمێنم. هەروەها جەنابی بوردوفسکی کۆمەڵێک

زانیاری وردو بەڵگەی تەواوی دیکەم کۆ کردوەتەوە، ئەوە دەسەلمێنیّ کە بابت، واتا بوردوفسکی کابرایەکی دەست و پیّ سپی بووە، هیچ بەهرەیەکی کاروکاسبی و کاری ئازادی نەبووە. دوای ئەوەی جیازی و مارەییەکەی دایکتی وەر گرتووە، کە برِی پازدە هەزار رۆبڵ دەبێت، ئیدی وازی لە وەزیفە فەرمیەکەی هێناوە و رووی کردووەتە کاروکاسبی و بازرگانی، بەڵام دەی خەڵەتێنن و تیّ دەکەویّ و دەستمایەکەی لە دەست دەدا. ئیدی بەرگەی ئەم جەزرەبەیە ناگرێت و لە داخ و خەفەتا، سەردەکاتە خواردنەوە و مەینۆشی، ئیدی خواردنەوە کاری تێکردو زوو بە زوو کوشتی، یانی پاش گواستنەوەی دایکت بە حەوت یان هەشت ساڵ مرد. دوای ئەوە دایکت، گیرۆدەی هەژاری و دەستکورتییەکی دژوارو زەحمەتی ئەوتۆ دەبێت، کە بە قسەی خۆی ئەگەر کۆمەک و یارمەتی زۆرو بەردەوامی پاڤلیشچوف نەبوایە، لەگین بوو لە برسانا بمرێت ( ساڵی برِی شەش سەد رۆبڵی بۆ برِیبووەوە ). زۆر بەڵگەی دیکەش هەن، ئەوە نیشان دەدەن کە پاڤلیشچوف تۆی بە منداڵی زۆر خۆش ویستووە. بەگوێرەی ئەم بەڵگانە و بە پێی شایەدیی دایکت، ئەو پیاوە بۆیە خۆشی ویستووی و رووی داویەتیّ و هاوسۆزی دەگەڵ کردوویت، چونکە زمانت گیربووە و منداڵێکی ریوەڵە و جیقن و دەغەزار و بەدبەخت بوویت. هەڵبەتە من بەڵگەی تەواوم لایە کە پاڤلیشچوف، بە درێژایی تەمەنی، سەبارەت بە خەڵکی نەخۆش و داماوو لێقەوماوو بەدبەخت، بەتایبەتی ئەگەر منداڵ بووبن، دلۆڤان و بە بەزەیی بووە. جا، بە بۆچوونی من ئەم خاڵە، لەم مەسەلەیەدا کە باسی دەکەین، بایەخێکی یەجگار گەورەی هەیە. بۆیە دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم کە دلۆڤانی پاڤلیشچوف بەرانبەر بە تۆ (کە بە هۆی ئەوەوە نێردرایتە قوتابخانەی وەرزش و لەژێر چاودێری تایبەتیدا درێژەت بە خوێندن دا) کردیە کارێک کە خزم و کەسوکار و برادەرەکانی، بەرە بەرەوا تەسەور بکەن رەنگە تۆ کوری ئەو بیت و، لەوەیە باوکە یاسایی و فەرمیەکەت، تەنیا داهۆڵێکی فریودراوی خیانەت لێکراو بووبیّ، بەڵام لێرەدا دەبیّ ئەوەش بگوتریّ کە ئەم تەسەورو دەنگۆیە، تەنیا لە ئاخروئۆخریی ژیانی

پاڤلیشـچوفدا، بـە تەواوەتـی لـەنێو خەڵکیـدا بـڵاو بـووەوە و زۆر کـەس باوەڕیان بـە دروسـتی هێنـا، یـانی ئەو کاتانـەی کـە خـزم و کەسـوکارەکەی پاڤلیشـچوف کەوتبوونـە خـەمی وەسـێتنامەکەی ئەو و حەقیقـەت و ڕاستەکانیش لـە بیـر چووبوونەوە و کەشـف کـردن و دۆزینەوەیـان مـەحاڵ بـوو. دیـارە جـەنابی بوردوفسـکی، تـۆش ئەو دەنگۆیانـەت بیسـتووەتەوە و باوەڕیشـت پـێ کـردووە. دایکیشـت کـە بـەخۆم بـە دیداری مشـەڕەف بـووم، هەرچەندە ئاگای لەم دەنگۆیانە هەبوو، بەڵام تـاکو ئـەمڕۆش، نـازانێ کـە تۆ، تـۆی کـوڕی، بـاوەڕت بەو دەنگۆیانـە کـردووە (منـیش ئەوەی ڕاسـتی بـێ ئەوەم لێی شاردەوە). جەنابی بوردوفسکی، من دایکی بـەڕێزو حورمـەتتانم، (خـانم بوردوفسـکی)م لـە شـاری پسـکۆف بینـی، لـە دوای مـەرگی پاڤلیشچوفەوە، بە نەخۆشی و دەسکورتی و داماوی ژیاوە. هەڵبەتـە بـەدەم ئەشـکی منـەتبارییەوە پێـی گـوتم. کـە ئەگـەر مـابێ، بـە فـەزڵی کۆمـەک و یارمەتیی تۆ ماوە و دەژی. زۆر ئومێدی بە ئاییندەی تـۆ هـەیە و لـە کانگـای دڵیەوە باوەڕی بە سەرکەوتنی تۆ هەیە...

خوشکەزایەکەی لیبدیف، سەبری سوا، هاواری کرد:

– بە ڕاستی هەموو ئەمانە قسەی بێتام و بێ مانان! ئاخر سوودی ئەم شانامەخوانییە چییە؟ ئەم هەموو سۆز و گودازە لە پای چی؟

هیپولیت، بە توڕەیی هەڵی دایە:

– بە ڕاستی ئەمانە قسەی قوڕ و بێمانان!

بەڵام بوردوفسکی، نـەک ورتـەی لێوە نـەهات، هـەر جووڵەشـی بۆ نـەکرد. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، کە خۆی بۆ ئەنجامگیرییەکی گورچکبڕ ئامـادە دەکـرد، بەدەم بزەیەکی تەوسامێزەوە پرسیی:

– سوودی چییە؟ سوودی یەکەمی ئەمەیە کە: جەنابی بوردوفسکی ئێستا بۆی دەر کەوت کە پاڤلیشـچوف لـە ڕووی سـۆزی مرۆڤـانی و دڵۆڤـانییەوە خۆشـی ویسـتووە نـەک لـە ڕووی غـەریزە و سـۆزی باوکایـەتییەوە. دەبوایـە بـەلای کـەمەوە ئـەم خاڵـە بـۆ بوردوفسـکی بـەڕێز ڕوون ببوایـەتەوە، چونکـە، تـۆزێ لەمـەپێش، دوای خوێنـدنەوەی وتـارەکـە، پشـتیوانی لـە بۆچوونـەکانی

کیللەر کرد. جا من تەنیا لەبەر ئەوە ئەم ڕوونکردنەوەیەم دا، چونکە جەنابی بوردوفسکی تۆ بە پیاوێکی بەڕێز و شەریف دەزانم، سوودی دووەمی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە دەر کەوت هیچ نیازێکی کڵاوچیاتی و دەستبڕی و ساختەچیاتی، تەنانەت لەلای (چیباروف)یش نەبووە. دیارە ئەمە خاڵێکی گرینگە، تەنانەت بۆ منیش گرینگە، چونکە میرزادە تۆزێ لەمەپێش، بەدەم هەڵچوونەوە گوتی کە من دەربارەی هەوڵی کڵاوچیاتی و دەستبڕی و ساختەچیاتی لەم مەسەلەیەدا، هاوشعوری ئەوم. بە پێچەوانەوە: هەموو بەشداران، نیازیان پاک بووە، ئەگەرچی ڕەنگە چیباروف، کەڵەکبازێکی گەورە بێ، بەڵام لەم مەسەلەیەدا، تەنیا وەکو ئەوقات و پارێزەرێکی پیشەیی و زرینگ و کۆڵنەدەر کاری کردووە. بە ئومێدی ئەوە بووەوەکو پارێزەرێک، پارەیەکی مۆڵ بە دەست بێنێ، دیارە حیسابەکەشی نەک هەر زیرەکانە و دروست بووە، بەڵکو لەسەر بنەمایەکی یەجگار مکومیش بووە، حیسابی ئەوەی کردووە کە میرزادە لەلایەکەوە پیاوێکی دەست و دڵ کراوە و تێرە و لەلایەکی تریشەوە، لەڕادەبەدەر ڕێزو حورمەتی پاڤلیشچوفی ڕەحمەتی لەلایە و لە ئاستی هەقدا ملی لە موو باریکترە، بەڵام سەبارەت بە ئاغای بوردوفسکی، دەکرێ بە دڵنیایی تەواوەوە بڵێین کە لەبەر هەندێ قەناعەتی تایبەتی خۆی، بە ڕادەیەک لەژێر کاریگەریی چیباروف و دۆستەکانی دیکەیدا بووە، کە بە خوت و خۆڕایی، بێ هیچ قازانجێکی شەخسی، بە بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ، لەم مەسەلەیەوە گلاوە، یانی وەکو ئەوەی ئەم کارەی لە ڕای خزمەتی حەقیقەت و پێشکەوتنی تیرەی بەشەردا کردبێت، بەڵام ئێستا دوای ئەم گەنگەشە و بەڵگانە کە هەموو شتێک ڕوون بووەوە. دەر کەوت کە بوردوفسکی، بە هەموو حاڵ و حیسابێک، پیاوێکی ڕاستگۆیە، ئیدی میرزادە دەتوانێ بەکەماڵی دڵنیایی ئەو کۆمەکە دۆستانەیەی کە تۆزێ لەمەپێش، لە کاتی باسکردنی قوتابخانە و پاڤلیشچوفدا باسی کرد، دووبارە بکاتەوە.

میرزادە، بە جۆرە ترسێکی ڕاستگۆیانەوە هاواری کرد:

– بوەستە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بوەستە!

بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. بوردوفسکی بە تورەیی هاواری کرد:

– من سێ جارم گوت کە ئەم پارەیەم ناوێ... نا... قەبووڵی ناکەم... بۆچی وەری بگرم؟ نا، نامەوێ! دەڕۆم...!

بەدەم ئەو قسەیەوە تاوی دا کە لە دەرگای بانیژەکەوە وەدەر بکەوێت، خوشکەزایەکەی لیبدیف خۆی گەیاندێ، باسکی گرت و شتێکی بە گوێیدا چپاند. بوردوفسکی بلەز گەڕایەوە، زەرفێکی گەورەی داخراوی لە بەرکی دەرهێناو هەڵی دایە سەر مێزێکی چکۆلەی نزیکی میرزادە و گوتی:

– ئەوە پارەکەتە!... نەدەبوو رێ بە خۆت بدەی ئەم کارە بەرانبەر بە من بکەی! ئەوە پارەکەت!...

دکتۆرنکو بۆی ڕوون کردەوە:

– ئەمە ئەو دوو سەدو پەنجا ڕۆبڵەیە کە رێگەت بە خۆ دابوو، وەکو خێرو سەدەقە بە چیباروفدا بۆی بنێری!

کولیا، بەسەرسامی گوتی:

– لەوتارەکەدا، تەنیا باسی پەنجا ڕۆبڵ کرابوو!

میرزادە، بەرەو لای بوردوفسکی ڕۆیشت و گوتی:

– من، بەرانبەر بە تۆ کەمتەرخەمم! بەڵام باوەڕ بکە، ئەو پارەیەم وەکو خێرو سەدەقە بۆ نەناردبووی! من تاکو ئێستاش بەرانبەر بەتۆ کەمتەرخەمم، هەڵەم، نەدەبوو ئەو هەڵەیە بکەم. (میرزادە، زۆر شپرزە و نیگەران بوو، هیلاک و ماندوو دیاربوو، قسەکانی پچڕ پچڕ بوون). ڕاستە من باسی کەڵەکبازی و دەستبڕی و ساختەچیاتیم کرد... مەبەستم تۆ نەبوو. هەڵەم کرد کاتێ گوتم تۆش رێک، دەقاودەق وەکو من نەخۆشیت... بەڵام تۆ وەکو من نیت، تۆ لە رێگەی دەرسی تایبەتییەوە خۆت دەژێنی و یارمەتیی دایکت دەدەیت. گوتم تۆ ئابڕووی دایکت بردووە، بەڵام نا، تۆ لە ڕاستیا خۆشت ویستووە و خۆشت دەوێ. بە خۆی وا دەڵێت، شایەدیت بۆ دەدا... من نەمدەزانی... گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، فریا نەکەوتبوو هەموو ئەم شتانەم بۆ بگێڕێتەوە. ئەمانەی بۆ نەگێڕابوومەوە. من هەڵەم، زۆر کەمتەرخەمم. ڕاستە من پێشنیازی دە هەزار ڕۆبڵم بۆ کردیت، باشم نەکرد،

هەقی گلەییت هەیە، دەبوایە بە شێوەیەکی دی ئەو پێشنیازەم بکردایە... بەڵام تازە کار لە کار ترازا، شتی وا مەحاڵە، چونکە تۆ دەمبوغزێنی...

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، هەڵی دایە:

- ئێرە شێتخانەیە!

(ئاگلایا)ش، کە خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا، بەوپەڕی تورەیی گوتی:

- بە ڕاستی ئێرە شێتخانەیە!.

بەڵام دەنگی وی، لەنێو هەراوزەنا و ژاوەژاوی خەڵکەکەدا، تواوەوە. کەس بە کەس نەبوو، هەموو بە دەنگی بەرز قسە و گەنگەشەیان دەکرد. هەندێک گلەییان دەکرد، هەندێکی دی پێدەکەنین. ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچین بەو پەڕی تورەیی، وەکو پیاوێک لە کەرامەتی درابێت، چاوەڕوانی لیزاڤیتا پروکوفیڤنای هاوسەری دەکرد.

خوشکەزاکەی لیبدیف وەکو ئەوەی بیەوێ دوا قسە بکات، هەڵی دایە:

- میرزادە، پیاو دەبێ هەق بڵێ کە بە ڕاستی تۆ باش دەزانی چۆن سوود لە نەخۆ... نەخۆشییەکەت (ئەگەر بمانەوێ وشەیەکی ئەهوەن بەکار بێنین) وەر دەگریت. تۆ هێندە لێزانانە دۆستایەتی و پارەکەت عەرز کرد، کە هیچ مرۆڤێکی بەڕێزو بە حەیاو حورمەت، ناتوانێ بە هیچ شێوەیەک قەبووڵی بکات... ئیدی ئەمەت یان لەوپەڕی بلیمەتیە یان لەوپەڕی سادەییە... بەهەرحاڵ خۆت ئەمە لە هەموو کەس باشتر دەزانیت.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، کە لەو کاتەدا زەرفە پارەکەی کردبووەوە، هەڵی دایە:

- بەڕێزینە ببورن: ئەم زەرفە دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵی تیا نییە، بۆ ئاگاداریتان تەنیا سەد ڕۆبڵی تیایە. میرزادە من بۆیە ئەم قسەیە دەکەم تا هیچ بەد حاڵی بوونێ ڕوو نەدات!

میرزادە، بەدەم ئاماژەی دەستەوە، گوتی:

- گرینگ نییە، واز لەوە بێنە! وازی لێ بێنە!

خوشکەزاکەی لیبدیف، خێرا هەڵی دایە و هاواری کرد:

- نا، نا، وازی لێ مەیەنە! میرزادە کە تۆ دەڵێی "گرینگ نییە، واز لەوە

بێنە، وازی لێ بێنە!" ئەمە خۆی لە خۆیدا سووکایەتییە بە ئێمە. ئێمە لە هەوڵی شاردنەوەی هیچ شتێکدا نین، بەڵکو رووبەڕوو، بەڕاشکاوی قسەی خۆ دەکەین، گرینگ نیە زەرفەکە دوو سەد ڕۆبڵی تیا بێ یان سەد ڕۆبڵ، وەکو یەکە، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، وەکو یەک نییە؟

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بەسەرسامیەکی ساویلکانەوە گوتی:

- نا، وەکو یەک نییە!

خوشکەزایەکەی لیبدیف، بە تورەیی هاواری کرد:

- قسەکەم پێ مەبڕە. جەنابی پارێزەر، ئەوەندەش کەر نین. مەعلومە کە سەد ڕۆبڵ، دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵ نییە. گرینگ مەسەلە مەبدەئیەکەیە، گرینگ هەڵوێستە مەبدەئییەکەیە، دوو سەد ڕۆبڵ نییە و سەد ڕۆبڵە گرینگ نییە، ئەمە شتێکی دییە، گرینگ ئەوەیە کە بوردوفسکی خێرو سەدەقەی تۆ قەبووڵ ناکات، دەیداتەوە بە سەروچاوتا میرزادەی مەزن و گەورە! لەم رووەوە سەد ڕۆبڵ و دوو سدە و پەنجا ڕۆبڵ وەکو یەکە. چ سەد ڕۆبڵت بە سەروچاوا بداتەوە و چ دوو سەدو پەنجا ڕۆبڵ. تۆزێ لەمە پێش بە چاوی خۆت بینیت کە بوردوفسکی دە هەزار ڕۆبڵەکەی ڕەفزکردیت. یانی ئەگەر پیاوێکی دروستکار و سەرڕاست نەبوایە ئەو سەد ڕۆبڵەشی نەدەدایەوە! کە سەد و پەنجا ڕۆبڵی کەمە، ئەوە دراوە بە هەقی مەسرەف و سەفەری چیباروف بۆ لای میرزادە. هەقی خۆتە گاڵتەت بە غەشیمی و نەزانی ئێمە لە کاروباری بازرگانیدا، بێت. بەهەرحاڵ، تۆ هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆت خستە گەڕ کە پێمان ڕابوێری و گاڵتەمان پێ بکەیت، بەڵام نەخەڵەتابی ڕێ بە خۆت بدەی پێمان بڵێی دەستبڕ، سەرچەوت. ئێمە ئامادەین، بە هەر چوارمان، دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵەکەی میرزادە بگێڕینەوە، ئەگەر ناچار بووین، ڕۆبڵ بە ڕۆبڵ بۆی کۆ بکەینەوە، ئامادەین، چەندیش قازانجی دەخاتە سەر، هەر هەمووی بە قازانجەکەشەوە کاش بدەینەوە. بوردوفسکی هەژارو نەدارە، ملیۆنێر نییە. چیباروف دوای سەفەرەکەی، پسوولەی حیسابەکەی بۆ نارد. ئێمە بەتەما بووین ئەم داوایە ببەینەوە... هەر کەسێکی دی لەجیاتیی ئەو بوایە، هەر وای نەدەکرد؟

میرزادە (س...) هەڵی دایە و گوتی:

- مەبەستت چییە؟ مەبەستت لەم پرسیارە چییە؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا گوتی:

- خەریکە شێت دەبم!

یەڤگینی پاڤلوفیچ، کە ماوەیەکی زۆر بوو، لە جێی خۆیەوە، بە بێدەنگی تەمەشای ئەو وەزعەی دەکرد، پێکەنی و گوتی:

- ئەم وەزعە، رێک ئەوەوەبیر دێنێتەوە، کە لەو دواییانەدا، پارێزەرێکی بە نێوبانگ لە موناقەشەیەکی بەرەڤانی دادڤانیدا، پاکانەی ئەوەی بۆ موەکیلەکەی کردبوو، کە شەش کەسی لە جێیەک کوشتبوو، گوایە لەبەر هەژاری و دەستکورتی ئەو تاوانەی کردووە. ئەم پارێزەرە، بە چەند وشەیەکی لەم بابەتە کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنابوو: " ئاشکرایە کە هەژاری و دەستکورتی، موەکیلەکەی منی ناچار کردووە بیر لە کوشتنی ئەو شەش کەسە بکاتەوە، وەکو دەڵێن فەقیری رەگی هاریی پێوەیە، بۆیە ئەو کارەی بەلاوە ئاسایی بووە، یانی هەر کەسێکی دی لەجیاتیی ئەو بوایە هەر وای نەدەکرد؟" بەهەرحاڵ، بەڵگە و بیانوو دەستاوێزەکەی یەجگار کۆمیدی و عەنتیکە بووە!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، کە لە تورەییدا دەلەرزی، لەناکاودا گوتی:

- بەسە! ئیدی ئەم هەراو هەنگامەیە ببڕنەوە!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، کە یەجگار شپرزە بووبوو، سەری بردبووە دواوەوە، شەڕ لە سیمای دەباری، نیگای پڕ لە هەڕەشە و ئاگرینی، بە ئامادەبوواندا، بەدۆست و دژمندا، بێ جیاوازی دەگێڕا. ڕقی پەنگخواردووی، بە جۆرێ سەر ڕێژ بووبوو، کە دەبوایە بەسەر یەکێکیدا هەڵڕێژێت. شەڕی بە سێبەری خۆی دەفرۆشت. ئەو کەسانەی کە دەیانناسی، هەستیان دەکرد، لە ئان و ساتایە کە بتەقێتەوەو، بەسەر یەکێکدا داببارێت.

ئیڤان فیدوروفیچ بۆ سبەینێ بە میرزادە (س...)ی گوت:

- هەندێ جار ئەم حاڵەتەی لێدێ، بەڵام بەدەگمەن ئەو حاڵەی دوێنێی لێدێت. ڕەنگە بە سێ ساڵ جارێک، بگاتە ئەو حاڵی تەقینەوەیە!





لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا هاواری کرد:

- بەسە ئیڤان فیدوروڤیچ، بەسە! وازم لێبێنە! ئێستا قوڵ دێنی بیکەی بە قوڵما؟ دوای چی؟ ئەگەر پیاوبای پێشتر قوڵت دەگرتم دەتبردمە دەرەوە! لای خوایە مێردی من و سەرگەڤاری ماڵیت. بە قسەم نەدەکردیت، بەگەڵت نەدەکەوتم! گوێت بگرتمایە و بتبردمایە دەرەوە. دەبوایە بەلای کەمەوە بیر لە کچەکانت بکەیتەوە! دوای باران کەپەنک! ئێستا بەبێ تۆش دەتوانین بڕۆینەوە، تا یەک ساڵی دی بەم شەرمەزارییەوە دەتلێمەوە!... بوەستە، با سوپاسی میرزادەش بکەم! .. سوپاس میرزادە، ماڵت ئاوا بۆ ئەو میواندارییە جوان و خۆشەی کە بۆت فەراهەم کردین! نازانم چۆن ڕازی بووم، دانیشم و گوێ لە قسەی ئەو گەنجانە بگرم؟ بە ڕاستی شەرمە، حەیاچوونە! نەنگییە، خەجاڵەتبارییە، لە مۆتەکەش خراترە! ئەرێ لەم جۆرە خەڵکانە زۆر هەن؟... دەمت لێکنە ئاگلایا! ورتەت لێوە نەیەت ئەلکساندرا! ئەمە ئیشی ئێوە نییە!... یە ڤگینی پاڤلوفیچ، لاکەوە، بە گوێما مەچپێنە، لێت پەستم، تورەم مەکە، دەمارم مەگرە!...

دیسان ڕوو لە میرزادە، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

- وای لێهات دۆستی ئازیز؟ هێشتا تۆ داوای بوردن لەوان دەکەی؟ دەڵێی بمبورن کە ڕێم بە خۆدا ئەم برە پارەیەتان پێشکەش بکەم...

هەنگێ ئاوڕێکی لای خوشکەزاکەی لیبدیفی دایەوە و لەناکاودا گوتی:

- ئەدی تۆ، بەچی پێدەکەنی، هەی فشەکەری بێ چاوو ڕوو؟ ئەمە دەڵێت: "ئێمە ئەو پارەیە ڕەفز دەکەین. ئێمە داوا دەکەین، تکاو سواڵ ناکەین!" وەکو ئەوەی نەزانێت کە ئەم گەمژەیە لە سبەینێوە، خۆی، بە پێی خۆی، بە مەمنوونیەوە نەچێت بۆ لایان و ئەو پارەیەیان بۆ نەبات! دۆستایەتییان دەگەڵا تازە نەکاتەوە! وا ناکەیت میرزادە؟ ناچیت بۆ لایان!

میرزادە، بە ملکەچی و لەژێر لێوانەوە گوتی:

- با، دەچم!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، دووبارە ڕووی کردە دکتۆرنکو و گوتی:

- گوێت لێیە؟ گرەوی تۆ لەسەر ئەمەیە. وەکو ئەوەی پارەکە حازرە، لە

ئێستاوە لە گیرفانتدا بێت. تۆ بۆیە خۆت فش دەکەیەوە و وا دەنوێنی پارەکە ڕەت دەکەیەوە بۆ ئەوەی ئێمە بخەڵەتێنی... نە گیانە، خەیاڵت خاوە، ئەگەر ڕاست دەکەی و دەتوانی بڕۆ کەسێکی دی بخەڵەتێنە. من چاوم هەن،.... دەستم خوێندوویتەوە!... گەمەکەت دەبینم!

میرزادە، هاواری کرد:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا!

میرزادە "س..." بزەیەکی بۆ کرد، بە ئارامییەکی دەستکردەوە گوتی:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا! با بڕۆین! درەنگە! با میرزادەش دەگەڵ خۆماندا بەرین.

کیژەکان، بە نیمچە ترسێکەوە، لە سووچێکدا وەستابوون، بەڵام جەنەراڵ، زۆر نیگەران بوو، سەرسامی و حەپەسان بە سیمای هەموویانەوە دیار بوو. هەندێک لەوانەی کە لەدواوە بوون، ژێراوژێر، بەدەم چپە دووەوە، بە دزییەوەو، بە تەوسەوە پێدەکەنین. خۆشی و شادی لە سیمای لیبدیف دەباری.

خوشکەزایەکەی لیبدیف کە زۆر شپرزەوە پەریشان بوو، گوتی:

- خانم، فەوزاو فەزیحەت و ڕووداوی نەنگین و نەنگکاری لە هەموو شوێنێک هەیە!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بە پشم و غەزەبێکی شێتانەوە گوتی:

- بەم شێوەیە نا، بەم حەددە نا!

ئەوجا بەتوڕەیی ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەری، کە دەیانویست هێوری بکەنەوە و گوتی:

- ئەرێ بۆ وازم لێناهێنن؟ وازم لێبێنن!

هەنگێ ڕووی کردە یەڤگینی بافلوفیچ و گوتی:

- ئەگەر پارێزەرێک، لە دادگادا، وەکو خۆت تۆزێ لەمەپێش باستکرد، بە ئاشکرا بڵێت، ئاسایییە کەسێک لەبەر نەبوونی و هەژاری بەجارێ، لە یەک شوێن شەش کەس بکوژێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئاخر زەمانە. بە عەمراتم شتی وام نەبیستبوو، بەڵام ئێستا هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە.

بۆ نموونە تەمەشای ئەم نیوە زمانە، ئەم لالەپەتەیە بکەن (بەدەم ئەو قسەیەوە، ئاماژەی بۆ بوردوفسکی کرد، کە بەوپەڕی بێزاری و حەپەساوی دەیڕوانیە لیزاڤیتا) ئەمە سڵ لە کوشتن دەکاتەوە؟ من گرێو دەکەم کە یەکێک دەکوژێ. لەگینە دە هەزار ڕۆبڵەکەت لێ وەر نەگرێت. ڕەنگە لە بەرچاوی خەڵکی ڕەفزی بکات، بەڵام بە دڵ و لە دڵەوە ئەو کارە ناکات، کاتێ بە خۆت دەزانی، شەوێک دەدا بە سەرتا، بێکەسکوژت دەکات و قاسەکەت دەشکێنێ و مەردو مەردانە دەتکوژێت و پارەکەت دەبات و بەتاوانیشی نازانێ، بەڵکو بەزادەی زاڵ بوونی نا ئومێدی یان ڕەفز یان چوزانم، بە چیتری دەزانێ!... ئاوها... هەموو شتێک ئاوەژوو بووەتەوە، دنیا خراپ گۆڕاوە، خەڵکی لەسەر سەر دەڕۆن نەک لەسەر لاقان! دەبینی کچێک لە ماڵی بابی ڕێکوپێک پەروەردەکراوە، کاتێکت زانی بەدەم پیاسەوە دەگەڵ دایکیا، لە ناوەندی جادەدا، خۆی بە گالیسکەیەکدا دەکات، بە دایکی دەڵێت: "دایکە گیان من چەند ڕۆژێ لەمەبەر شووم بە فلان کارلیچ یان فیسار ئیڤانیچ کردووە و من دەڕۆم، خودا حافیز!". ئەم ڕەفتارە بە باش دەزانن؟ ئەم ڕەفتارە جوانە؟ ئاساییە؟ ئەمە کێشە و پرسی ژنانە؟ تەمەشای ئەم کوڕیژگە لە خۆباییە بکەن (بەدەم ئەو قسەیەوە ئاماژەی بۆ لای کولیا کرد). ڕۆژێک دەیگوت "پرسی ژن" هەر ئەوەیە ئیدی. گریمان دایکت گەوجە، کەرە! بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبێ مامەڵەیەکی مرۆڤانی لەگەڵدا بکەی، شارستانیانە ڕەفتاری لەگەڵدا بکەیت!... باشە بۆچی تۆزێ لەمەپێش بەو هەموو کەش و فش و فیزو ئیفادەیەوە خۆتان بە ژوورا کرد؟ مەبەستتان چی بوو؟ دەتانویست بڵێن: "ڕێ بکەنەوە، هەستنە سەر پێ، وا ئێمە دێین! هەموو مافێکمان پێبدەن، بەڵام نەکەن لە حوزوری ئێمەدا زار هەڵێنن! ئێوە هەموو ڕێزێکمان بگرن، دەستە و نەزەر لە بەرمان هەستن، بەڵام ئێمە بە نۆکەرو خولامانتان ڕاناگرین! ". بە حیساب عەوداڵی حەقیقەت و لایەنگری هەقن، کەچی وتارەکەیان یەکپارچە بوختان و ئیفتیرایە، ئیفترای کافران، بە میرزادەدا. "ئێمە داوا دەکەین، نەک سواڵ و تکا. چاوەڕوانی سوپاس لە ئێمە مەکەن، هیچ منەتێکتان لێنازانین، چونکە ئەم کارە لە ڕای

ئاسوودەیی ویژدانی خۆتاندا دەکەن! " ئەمەیە ئەخلاق! بە ڕاستی ئەقڵ بۆ بەشەر شتێکی باشە: تۆ کە سپڵەیی و پێنەزانی و نمەکنەناسی بۆ خۆت بە ڕەوا بزانی، بێزت نەیەت سوپاسی بەرانبەرەکەت بکەیت، خۆ میرزادەش هەقی خۆیەتی لە جوابی تۆدا بڵێت، سوپاسی باڤلیشچوف ناکات و هیچ منەتێکی لێهەڵناگرێت، چونکە باڤلیشچوفیش، ئەو چاکەیەی دەرهەق بەو کردوویەتی، بۆ ئەوی نەکردووە، بەڵکو بۆ ئاسوودەیی ویژدانی خۆیی کردووە. کەواتە بە چ بەڵگەیەک، حیسابی خۆت لەسەر بناغەی نمەک ناسی و بێ ئەمەکی میرزادە دەرهەق بە پاڤلیشچوف ڕۆناوە؟ میرزادە قەرزی لێکردویت، قەرزارتە! کەواتە بۆچی نکۆڵی لە هەستی نمەکەناسی و سوپاسگوزاریی دەکەیت؟ ناتەوێ سوپاسی بکەیت؟ لە کاتێکا خۆت داوا لەو دەکەیت کە دەرهەق بە پاڤلیشچوف نمەکناس و سوپاسگوزار بێت! بە ڕاستی ئەمە گومڕاییە! شێتیەتیە! لە لایەکەوە گلەیی لە کۆمەڵگە دەکەن کە بێرەحم و نا مرۆڤانیە، چونکە کیژێکی لە خشتەبرا و ڕیسوا دەکات، بە حیسابی خۆیان ئەو کیژە داماوە ناوی دەزڕێ و عەزاب دەچێژێت و ڕووی ناو خەڵکی نامێنێ. باشە ئەگەر وایە چۆن ڕێگە بە خۆیان دەدەن، کە لە غەزەتەدا باسی بکەن و بیکەن بە داستانی سەر زاران و لە سیاناوی ڕیسوایی هەڵکێشن و بەتەماش بن ناوزڕاوی ناو خەڵکی نەبێت و عەزابی زیاتر نەچێژێت؟ بە ڕاستی ئەمە شێتایەتییە! ئەمانە کۆمەڵێ لە خۆبایی بێسەروبەرن! نە باوەڕیان بە خودا هەیە نە بە مەسیح. بە ڕاستی خەڵکێکی خۆ پەسندو لە خۆبایین، خۆ پەسندی و لە خۆبایی بوون، داویەتییە دڵ و دەروونیان، هاکا بەر بوونە گیانی یەکدی و دوای یەکیان بڕییەوە، ئەمە قسەیەکە و دەیکەم! باشە ئەمە شێتی و بێسەروبەری و ڕیسوایی نییە؟ هێشتا گەرەکیانە ئەم پیاوە بێشەرمە، ئەم بێسەروبەرە، بە مەمنوونییەوە بڕوات داوای بووردنیان لێ بکات! ئەرێ خەڵکی وەکو ئێوە زۆر هەن؟ بە چی پێدەکەنن؟ بەوەی کە خۆم هێناوەتە ئاستی ئێوە و بێزم هاتووە قسەتان دەگەڵ بکەم؟ بە ڕاستی ئابڕووی خۆم بردووە، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە!... ئەدی تۆ، هیچ و پوچی مردەلۆخ (لەگەڵ هیپولیتی بوو)،

نەخەڵەتابی پێم پێبکەنی! بە حاڵ هەناسەی تیا ماوە، کەچی دەست لە خووشەڕکردنی خەڵکی هەڵناگرێت. تۆ خووی ئەم منداڵە گەوجەت (بەدەم ئەو قسەیەوە ئاماژەی بۆ لای کولیا کرد) شەڕ کردووە. لە ڕێ دەرت کردووە، تۆ بووی بە خولیای شەوو ڕۆژی. تۆ فێری خوانەناسیی دەکەیت. تۆ بەو منداڵییەی خۆتەوە باوەڕت بە خوا نییە!... دەیسا هەمووتان هەواڵە بە خوا بن! ئەوسا، کە لە تورەییدا هەناسە بڕکێی پێکەوتبوو، ڕووی کردە میرزادە و پرسیی:

- ئەرێ لیون نیکولایوفیچ میشکین، ڕاستە بەتەمای سبەی بچی بۆ لایان؟ یانی بە ڕاستی دەچیت؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، دەچم.

- کەواتە، لەمڕۆ بەدواوە نامەوێ بتبینم! نە بمناسە نە دەتناسم!

کەوتە خۆ کە بڕوات، بەڵام لەناکاودا ئاوڕی پاشەوەی دایەوە و بەدەم ئاماژە کردنەوە، بۆ لای هیپولیت، پرسیی:

- دەچی بۆ لای ئەم خوانەناسەش؟

ئەوسا بە دەنگێکی گیراوی نائاسایی هاواری بەسەر هیپولیتدا، کە پێی پێدەکەنی، کرد و لەسەری ڕۆیشت:

- ئەوە بە من پێدەکەنی، حەددت چییە؟

هەنگێ لە هەموو لایەکەوە هاوار بەرز بووەوە:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا! لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا!

ئاگلایا، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

- دایکە!... شەرمە! ...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، پەلاماری هیپولیتی دابوو و توند باسکی گرتبوو و تا هێزی تیا بوو ڕای دەتەکاند، بە چاوانی پڕ ڕق و غەزەبەوە، تەمەشای دەکرد.

هیپولیت، زۆر بە هێمنی و بەکاوەخۆ گوتی:

- ئاگلایا ئیڤانوڤنا، خۆت نارەحەت مەکە. دوایی دایکت بە خۆی بۆی دەر

دەکەوێت کە هیچ کەسێک پەلاماری بابایەکی نەخۆشی لە حاڵی مردندا، نادات... من ئامادەم بۆی ڕوون بکەمەوە بۆچی پێدەکەنیم... خۆشحاڵ دەبم ئەگەر بتوانم قەناعەتی پێ بکەم...

نۆرە کۆکەیەکی توندو ترسناک، لەپڕ گرتی و بواری نەدا تاقە وشەیەک بڵێت.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بازووی بەر دا، بە جۆرە ترسێکەوە دەیڕوانییە هیپولیت، کە خوێنەکەی سەر دەم و لێوی دەسڕی، ئەوجا گوتی:

- نەخۆشێک لە حاڵی مردندا بێ، دەبێ ئاگای لە خۆی بێ! چیت داوە لەم خوتبە خوانییە! دەتەوێ چ بڵێی؟ باشتر وایە بۆ خۆت بچیتە ماڵەوە و لە جێدا بکەوی!...

هیپولیت، کە خیزەخیزی سینگی سەعاتە ڕێیەک دەڕۆیشت، بە دەنگێکی کزی شەرمنانەی چپە ئاساوە گوتی:

- باشە، بە قسەت دەکەم. هەر کە گەیشتمەوە ماڵێ، دەچمە ناو جێگە و دڵنیام کە لە زەرفی دوو هەفتەدا دەمرم، من خۆم ئەمە دەزانم. دکتۆر "پ.ن" بە خۆی هەفتەی ڕابردوو ئەوەی پێگوتم. بۆیە حەز دەکەم ئەگەر ڕێم بدەیت، بە یەک-دوو وشەیەک خوداحافیزیتان لێ بکەم.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە ترسەوە هاواری کرد:

- لەوە دەچێ ئەقڵت لە دەست دابێت! ئەم گەوجیەتیە چییە؟ تۆ بڕۆ فریای خۆت بکەوە، تۆ پێویستت بە دەواودەرمانە، نەک بە قسە و خوتبە! خێرا بڕۆ لە جێگەدا بکەوە!

هیپولیت، بەدەم بزەوە گوتی:

- باشە باش، لە جێگەدا دەکەم. کەوتنێکی وا دەکەوم کە هەستانەوەی لەدوا نەبێت. دوێنێ ویستم بکەوم و چاوەڕوانی مەرگ بکەم، بەڵام دوایی کە زانیم هێزی ئەوەم تیایە لەگەڵیاندا تا ئێرە بێم، بڕیارم دا مۆڵەتی دوو ڕۆژان بە خۆم بدەم و بیخەمە دوو سبەی... بەڵام ئەلهەقی هەست بە ماندووبوونێکی زۆر دەکەم...

لیزاڤیتا، بە دەستی خۆی کورسییەکی بۆ هێنا و گوتی:

- کەواتە دانیشە! دانیشە! بۆچی وەستاویت؟

هیپولیت، بە دەنگێکی کز گوتی:

- سوپاس، بێزەحمەت لەبەرانبەرم دانیشە تا بتوانین قسە بکەین. لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، ئێمە پێویستە قسە بکەین، من سوورم لەسەر قسەکردن. (بزەیەکی دی بۆ کرد و لەسەری ڕۆیشت). گوێ بگرە، ئەمڕۆکە دوا ڕۆژە کە من لە هەوای ئازاد و لەنێو خەڵکدا دەبینی. دوو هەفتەی دیکە ئەم کاتانە لەژێر گڵدا دەبم. کەواتە ئەمە جۆرە ماڵئاواییەکە لە خەڵکی و لە سروشت، هەرچەندە من کەسێکی زۆر عاتیفی نیم، بەڵام ئەوە بزانە کە زۆر حەز دەکەم، ئەمە لە پاڤلوفسکدا ڕوو بدات. بەلای کەمەوە پیاو لێرە، سەوزایی و دار و درەختان دەبینێ...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، کە دەم بەدەم شپرزە و نیگەرانتر دەبوو، گوتی:

- ئاخر ئەمە کەی کاتی قسەکردنە؟ تۆ تایەکی توندت لێیە. تۆ تۆزێ لەمەپێش هاوارت دەکرد، دەت نەڕاند. هەنوکە بەئاستەم هەناسەت بۆ دەدرێت.

- ئێستا چاک دەبم، خەمت نەبێ. بۆچی ناتەوێ دوا ئاواتم بێنیتە دی؟... دەزانی، خا لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، زۆر لەمێژە بە ئاواتەوە بووم بتبینم؟ زۆر شتم دەربارەی تۆ بیستووە... کولیا بۆی باسکردووم. کولیا تاقە کەسە کە پێی لێ نەبڕیوم... تۆ ژنێکی نائاساییت، عەجیب و غەریبی – ئا ئێستا بە چاوی خۆم ئەمەم لێت بینی – دەزانی کەمێکیش خۆشم ویستیت؟....

- پەنا بەخوا! چەند کەرم، خۆ خەریک بوو لێی بدەم!

- ئەگەر لێم بە درۆ نەبێ، ئاگلایا ئیڤانوڤنا دەستی گرتیت. ئەمە کچی تۆیە؟ ئەوەندە جوانە، هەر کە چاوم پێی کەوت، هەرچەند قەت پێشتر نەمدیتبوو، یەکسەر مەزەندەم بۆی چوو.

هەنگێ هیپولیت، لەسەری ڕۆیشت و بەدەم بزەیەکی تاڵ و پڕ حەسرەتەوە گوتی:

- بانگی بکە، با بەلای کەمەوە، بۆ دواجار لە ژیانما تێر تەمەشای جوانی ئافرەتێک بکەم! سەبارەت بە تۆ ئەوە میرزادە لێرەیە، مێردەکەت دەگەڵە،

دەورت قەرەباڵغە. ئیدی بۆچی ڕازی نابیت، دوا ئاواتم لەسەر دەستی تۆ بێتە دی! بۆ کارێکی وا دەکەی ئەم ئاواتەم بەرمە ژێر گڵەوە؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا هاواری کرد، گوتی:

- کورسییەکم بۆ بێنن!

چاوەڕوانی نەکرد تا یەکێک کورسیی بۆ بێنێ، بە خۆی دەستی دایە کورسییەک، لەهەنبەر هیپولیت دای نا و لەسەری دانیشت..

ئەوسا ئەمری بە کولیا کرد:

- کولیا، هەر ئێستا لەگەڵیا برۆ و بیگەیەنەماڵەوە، سبەینێ بە خۆم...

- ئەگەر ڕێم بدەیت، داوای کوپێ چای لە میرزادە دەکەم. زۆر ماندووم. بەتەما نەبووی میرزادە بۆ ماڵی خۆتان بەریتەوە و دەعوەتی چای بکەیت؟ بێزەحمەت لێرە بمێننەوە، مەڕۆنەوە، با چەند ساتێک پێکەوە بەرینە سەر. دڵنیام میرزادە، چایمان دەداتێ. بمبورە، کە ئەم پرکێشییە دەکەم... بەڵام لە میهرەبانی و دلۆڤانی تۆ و میرزادە دڵنیام، لێتان ڕادەبینم... هەمووومان بە ڕادەیەکی کومیدییانە میهرەبان و دلۆڤانین.

میرزادە بەلەز، ڕای سپارد کە چای ئامادە بکرێت. لیبدیف لە ژوورەکە وەدەر کەوت، ڤیراش خێرا دوای کەوت.

خانم یەپانچین، لەناکاودا، بەجیددی گوتی:

- زۆر باشە، قسە بکە، بەڵام خۆت سەغڵەت مەکە، بەکاوەخۆ، بێ هیچ هەڵچوونێک قسان بکە. بە ڕاستی سۆزت بزواندم... میرزادە، تۆ ئەوە نیت کە من لە ماڵی تۆدا چا بخۆمەوە، بەڵام تازە قەیدی نییە دەمێنمەوە، تەوازۆ بۆ کەسیش نایەنمەوە! کەس کەس! چونکە هیچ مەعنایەکی نیە! بەهەرحاڵ، وێڕای ئەمەش، ئەگەر بەلاتەوە گرینگە، ئامادەم داوای بووردنت لێبکەم، کە لێت تورە بووم!

ئەوجا، لەناکاوا، ڕووی کردە کچەکانی و مێردەکەی و بەوپەڕی تورەیی، وەکو ئەوەی خەتایەکی گەورەیان دەرهەق کردبێت گوتی:

- کەستان چاوەڕێی من مەکەن، داواتان لێ ناکەم بە دیارمەوە بمێننەوە، چونکە زۆر ئاسان دەتوانم بەتەنێ بۆ ماڵ بگەڕێمەوە...

بەڵام نەیان هێشت لەوەی پتر لەسەری بڕوات، خێرا خۆیان گەیاندێ و لەدەوری خڕبوونەوە. ئیدی میرزادە یەکسەر خوڵکی هەمووانی کرد بۆ چا خواردنەوە و داوای بووردنی لێکردن کە پێشتر، ئەوەی بە بیرا نەهاتبوو. تەنانەت (جەنەراڵ یەپانچین)یش گەشایەوە، بەدەم مجامەلەوە بە هاوسەرەکەی گوت ئایا لە بانیژەکەدا هەست بە سەرما ناکات؟ تەنانەت خەریک بوو لە (هیپولیت)یش بپرسێت چ ساڵێک لە زانستگە بووە، بەڵام زوو فریا کەوت و جڵەوی خۆی گرت. یەڤگینی پاڤلوفیچ و میرزادە "س.." زۆر خۆشحاڵ بوون و گەشانەوە. سیمای ئادیلاید و ئەلکسندرا، وێڕای شادمانی، سەرسامییان پێوە دیار بوو. بە کورتی هەر هەموویان بەئاشکرا خۆشحاڵ بوون، کە نۆرە تووڕەیی و گرژییە دەروونیەکەی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بەسەلامەتی ڕەوییەوە. تەنیا ئاگلایا، چارەی دابوو بە یەکاو گرژو مۆن، مات و بێدەنگ لە سووچێکا ڕۆنیشتبوو. ئەوانی دیکەش هەموو دانیشتبوون و کەس حەزی بە ڕۆیشتن نەدەکرد، تەنانەت (جەنەراڵ ئیڤولگین)یش، بەڵام لیبدیف بەلایا تێپەڕی و شتێکی بە گوێیدا چپاند کە پێدەچوو پێی ناخۆش بێت، بۆیە چوو لە گۆشەیەکدا کزکۆڵەی کرد. میرزادە بوردوفسکی و هەموو هاوڕێکانیشی، بێ ئەوەی کەسیان ببوێرێ، خوڵکی چا خواردنەوە کرد، بەڵام بەدەم خوتە و بۆڵەوە، لە بن لێوانەوە گوتیان کە چاوەڕوانی هیپولیت دەکەن و ئەوسا بەپەلە چوون لە دوورترین سووچی بانیژەکە، بە دەستەجەمی لێی دانیشتن. دیار بوو لیبدیف، دەمێ بوو ڕای سپاردبوو کە چا ئامادە بکرێت، چونکە یەکسەر چایەکە هێنرا.

سەعات زەنگی یازدەی لێدا.

پەراوێز:

* - "پلە دەیەم...": پتروسی گەورە لە ساڵی ١٧٧٢دا زنجیرە پلەیەکی ئیداریی دانا کە چواردە پلەی سوپایی و چواردە پلەی مەدەنیی لە خۆ گرتبوو. پلەی چواردەیەم نزمترین پلەی ئەم زنجیرە پلانە بوو.

## فەسڵی دەیەم

هیپولیت، فرێکی لەو کوپە چایە دا کە ڤیرا لیبدیفا بۆی هێنابوو، پاشان کوپەکەی لەسەر مێزێکی چکۆلە دانا، ئەوجا شپرزە و پەشۆکاو و نیگەران، چاوێکی بە دەوروبەری خویدا گێژ دا. هەنگێ، بەپەلە دەستی بە قسان کرد:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا تەمەشای ئەم کوپانەی بکە، ئەمانە چینین، بەڵکو پێم وایە باشترین جۆری چینین. قەت بەکار نەهێنراون، لیبدیف هەمیشە لە جامخانەیەکی چکۆلەی تایبەتیدا هەڵی دەگرتن... قەت بەکاری نەدەهێنان... ئەمانە بەشێکن لە جیازی و مارەیی ژنەکەی... ئەمڕۆکە لەبەر خاتری تۆ دەری هێناون... بە ڕادەیەک هەستی بە شادی و خۆشحاڵی کردووە کە...

دیاربوو، هیپولیت دەیویست شتێکی دیکەش بڵێ، لێ هەرچیی کرد و کۆشا هیچی بۆ نەهات.

یەڤگینی بافلوفیچ، شتێکی بە گوێی میرزادەدا چپاند:

- تەمەشا، وەکو پێشبینیم دەکرد، هەست بە نیگەرانی و ناڕەحەتی دەکات. ئەمە نیشانەیەکی خەتەرە، وا نییە؟ ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لە ڕووی ڕکوونی و دڵڕەشییەوە، ڕەفتارێکی ناسازی ئەوتۆ دەکات، کە بەلای لیزاڤیتا پروکوڤیڤناشەوە غەریب و عەجیب بێت.

میرزادە، تەمەشایەکی پرسیارئامێزی کرد. یەڤگینی بافلیوفیچ لەسەر قسەکەی خۆی بەردەوام بوو:

- تۆ لە ڕەفتاری نەشاز ناترسیت؟ من ناترسم... بگرە حەزیش دەکەم ڕەفتارێکی نەشاز بکات، تا بو لیزاڤیتا پروکوڤیڤنای ئازیزمان ببێت بە پەند

و عیبرەت... لێی گەڕێ با ئەمشەو باجەکەی بدات. تا ئەو دیمەنە بە چاوی خۆم نەبینم نارۆم، بەڵام تۆ پەست و خەمین دیاریت، وایە؟

میرزادە، بە حەواس پەرتی و بێتاقەتی بەرسڤی دایەوە:

- دوایی وەڵامت دەدەمەوە. جارێ واز بێنە با گوێ بگرم.

میرزادە گوێی لە ناوی خۆی بوو. هیپولیت باسی ئەوی دەکرد.

هیپولیت بەدەم پێکەنینێکی تورەوە پرسیی:

- باوەڕم پێ ناکەیت؟ تەسەورم دەکرد کە باوەڕنەکەیت. لێ میرزادە یەکسەر باوەڕم پێ دەکات و هیچ بەلاشیەوە سەیر نییە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- گوێت لێیە میرزادە؟ گوێت لێیەتی؟

لە کاتێکا لیبدیف، خۆی لە لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا دەبردە پێشێ و وا خۆی دەنواند نیگەرانە. ئەوانەی دەوروبەریان پێدەکەنین.

- دەڵێت ئەم لێبۆکەی خاوەن خانووەکەت، بە وتارەکەی ئەم بەڕێزەدا چووەتەوە، مەبەستم لە وتارەکەی لەمەڕ تۆیە کە ئەم ئێوارەیە بۆیان خوێندینەوە.

میرزادە، بەسەرسامی و ناباوەڕی ڕوانییە لیبدیف.

لە کاتێکا لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بەنیگەرانی پێی بە عاردیدا دەدا، گوتی:

- بۆ قسە ناکەی؟

میرزادە، کە هێشتا هەر دەیڕوانیە لیبدیف، لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ، هەستدەکەم بە ڕاستی ئەو کارەی کردووە. بە وتارەکەدا چووەتەوە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بە توندی ئاوڕی لە لیبدیف دایەوە و پریسی:

- ڕاستە؟ وایە؟

لیبدیف، دەستی بە سینگەوە گرت و بەوپەڕی دڵنیایی گوتی:

- بەڵێ دروست وایە، پایەبەرز.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لەسەر کورسییەکەی ڕاپەڕی و هاواری کرد:

- شانازیش بەم کارەیەوە دەکات!





لیبدیف، کە بەرەبەرە زیاتر سەری شۆڕ دەکردەوە، لێکدا لێکدا دەستی بە سینگی خۆیدا دەکوتا، کەوتە مینگەمینگ:

– من پیاوێکی خوێڕیم! پیاوێکی کمم!

– تۆ خوێڕیت، خوێڕی نیت، ئەمە کێشەی خۆتە! دەیەوێ بەو قسەیە خۆی بپەڕێنێتەوە! وا دەزانێ بەو قسەیە پاک دەبێتەوە! میرزادە، جارێکی دی پێت دەڵێم: تۆ شەرم ناکەی ڕەفاقەتی ئەم جۆرە خوێڕییانە دەکەیت؟ ئەمەت لێقەبوڵ ناکەم ها.

لیبدیف، بە قەناعەتەوە و بە دەنگێکی لاڤەئامێزەوە گوتی:

– میرزادە لێم دەبورێت!

کیللەر، بەپەلە لە لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا نزیک دەبێتەوە و لەبەردەمیا دەوەستێ و بە دەنگی بەرز دەڵێت:

– خانم، من تەنیا لە پیاوەتیی خۆم، لەبەر دۆستایەتی، هەر بۆ ئەوەی دۆستێکی گیانی بە گیانی لە قاو نەدەم، تۆزێ لەمەپێش باسی ئەوەم نەکرد کە ئەو بە وتارەکەما چووەتەوە، کەم و زۆر ناویم نەهێنا، کەچی ئەو، وەکو بە خۆت گوێت لێ بوو، دەیویست دەرمان بکات. جا بۆ ئەوەی حەقیقەت لای هەمووان ڕوون بێت، ئێستا دەیڵێم کە ئەو لەم کارەدا یارمەتیی دام و شەش دانە ڕۆبڵیشی هەقدەست لێ سەندم. شێوازی نووسینەکەی بۆ چاک نەکردم، بەڵکو وەکو سەرچاوەیەکی ئاگادار، زۆر ڕووداویشی بۆ کەشف کردم کە زۆربەیانم نەدەزانی. بۆ نموونە، زەڕگاڵەکانی میرزادە، خواردنی میرزادە لەسەر حیسابی کابرای پرۆفیسۆری سویسری، ئەو پەنجا ڕۆبڵەی کە لەجیاتیی دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵ باسک رابوو، هەر هەموو ئەم زانیاریانە هی ئەو بوون. شەش دانە ڕۆبڵم لە هەقی ئەمەدا دایە. نە زمانی بۆ چاک کردوومەتەوە و نە شێوازی نووسینەکەی بۆ دەسکاری کردووم.

لیبدیف، بە دەنگێک کە تنۆک تنۆک شەرمەزاری لێدەتکا، قسەکەی بە کیللەر بڕی و لە ناوجەرگەی قاقای تەوسامێزی ئامادەبووانەوە، زەبوونانە گوتی:

– حەز دەکەی ئەوە بە هەمووان بڵێم کە من تەنیا بە بەشی یەکەمی





وتارەکەدا چوومەتەوە، بەلام کە گەیشتینە بەشی دووەمی وتارەکە، بیروبۆچوونەکانمان تێکیان نەکردەوە و تەنانەت لەسەر بابەتێکی لێمان بوو بە شەڕ و ئیدی وازم لە چاککردن و پێداچوونەوەی بەشی دووەمی وتارەکە هێنا. بۆیە هەر هەڵە و پەڵە و درۆودەلەسەیەکی تێدابێ، لەسەر من حیساب نییە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، هاواری کرد:

- تەنیا خەمی ئەمەیەتی!

یەڤگینی بافلوفیچ ڕووی دەمی کرد کیللەر و گوتی:

- دەکرێ بزانم کەی وتارەکەت دەسکاری کرد؟

کیللەر، بێ چەند و چوون بەرسڤی دایەوە:

- دوێنێ بەیانی، کۆبوونەوەیەکی دوو قۆڵیمان کرد و بەڵێنمان بە یەکدی دا کە ئەمە هەر بەینی خۆمان بێت و لای هیچ کەسێک باسی نەکەین.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا گوتی:

- یانی لەو کاتەدا کە مەرایی دەکردیت و کلکە سووتەی بۆ دەکردیت و بە ڕواڵەت وای دەنواند کە زۆر دڵسۆزتە. ئەمانە چ بەشەرێکن! من پێویستم بە پوشکینەکەی تۆ نیەو، نەخەڵەتابی کیژەکەت بنێری بۆ لام!

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، خەریک بوو هەڵدەستا، بەلام کە بینیی هیپولیت پێدەکەنێ، بە توڕەیی ڕووی تێ کرد و گوتی:

- خێرە کوڕۆ، دەتەوێ بمکەی بە گەپجاڕی خۆت، بمکەی بە مەزەی ڕابواردنی خۆت؟

هیپولیت، بەدەم ژارخەنێکەوە گوتی:

- مەعازەڵلا! حەددم نیە! لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، من سەرم لە توندەمەجازی تۆ سووڕ دەمێنێ! حەز دەکەم ئەوە بزانیت کە من بەئانقەست باسی (لیبدیف)م هێنایە ناو ناوان، چونکە دەمزانی زۆر کارت تێ دەکات و تەنیا کار لە تۆ دەکات، چونکە گومانی تیا نییە کە میرزادە دەیبورێت، ڕەنگە ئێستا لە دڵی خۆیدا بە خشیبێتی و پاکانەشی بۆ ئەو کارەی هێنابێتەوە. وا نییە میرزادە؟

هیپولیت، بەدەم قسەکردنەوە هانکە هانکی پێکەوتبوو، دەگەڵ وتنی هەر وشەیەکدا، زیاتر هەڵدەچوو.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، کە سەیری دەم و دووی کرد، توڕە بوو و گوتی:

- ئێ، مەبەستت؟

هیپولیت، لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو:

- زۆر شتم لەم ڕووەوە دەربارەی تۆ بیستووە. بە خۆشحاڵییەوە فێری ئەوە بووم کە ئەوپەڕی ڕێزت بگرم.

بە قسەکانیا دیار بوو کە ماناو مەبەستێکی دیکە لەپشت ئەو قسانەیەوە پەنهانە. بەجۆرە تەوس و توانجێکەوە قسەی دەکرد. بەوپەڕی شپرزەیی و نیگەرانی، بەبێ ئۆقرەیی دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی، حەواسی پەرت بوو، لەگەڵ هەر قسەیەکدا زیاتر توڕە دەبوو. سیمای سیلاوی و چاوانی درەخشان و نیگای ئەبڵەقی زیاد لە پێویست مایەی سەرنجی ئامادەبووان بوو.

لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو:

-.. هەرچەندە من هیچ لە دنیا نازانم، نامۆم بەدابونەریتی کۆمەڵگە (بە خۆم دان بەوەدا دەنەم) سەرم لەوە سووڕدەمێنێ کە تۆ نەک هەر لەنێو کۆمەڵگەیەکی وەکو ئێمەدا دانیشتوویت، کە خۆت گوتەنی کۆمەڵگەیەکی نا کۆمەڵگە و ناشایستەیە، بەڵکو ڕێگەت داوە ئەم کیژە عازەبانەش گوێ لەم مەسەلە ناپەسند و نەنگینانە بگرن، هەرچەندە دەبێ پێشتر ئەم جۆرە شتانەیان لە ڕۆماناندا خوێندبێتەوە. ڕەنگە من هەڵەبم، چونکە بە تەواوەتی گێژم، بەڵام گومان لەوەدا نییە، کە جگە لە تۆ، کەسی دی ڕازی نییە لەسەر داوای دەمڕووتێکی فشەکەر (بەڵێ دەم ڕووتێکی فشەکەر) ئامادەی ئەم جۆرە شەوکۆڕانە ببێت و گوێ بەوە نەدا، ئەگەر ئەم کارەی بۆ سبەینێ، تەریقی و پەشیمانییشی لەدوا بێت... (من دان بەوەدا دەنەم کە نازانم چۆن گوزارشت لە مەبەستەکەی خۆم دەکەم )، بەڵام من ستایی‌شی هەموو ئەم کارانە دەکەم، بە شایستەی ڕێزو حورمەتیان دەزانم، ئەوپەڕی بوێری و ئازایەتیە، هەرچەندە سیمای مێردە بەڕێزەکەت، ئەوە دەنوێنێ کە کارەکانتی

بە دڵ نییە و زۆریش بەم وەزع و حاڵە قەڵسە... ها ها!...

هیپولیت، لەناکاودا شپرزە بوو، گیانی کەوتە لەرزین، نۆرە کۆکەیەکی توند بۆ ماوەی دوو دەقیقە لە قسەی خست.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، نیگایەکی ساردو سڕی، بەدەر لە هەر هاوسۆزییەکی کرد و بە زمانێکی ساردو وشک گوتی:

- تەمەشا، خەریکە دەخنکێ، بەسە کوڕەکەم! بەسە. وەختی ڕۆیشتن هاتووە!

ئیڤان فیدوروفیچ، کە بەئاشکرا دیار بوو پەستە، لەناکاودا بە تووڕەیی گوتی:

- گوێ بگرە با شتێکت پێ بڵێم کوڕۆ. ژنەکەی من لێرەدا میوانی لیون نیکولایوفیچە، کە دۆست و دراوسێمانە. میوانی تۆ نییە. بۆیە تۆ بۆت نییە، حوکم لەسەر هەڵوێست و ڕەفتاری لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بدەیت، یان بە دەنگی بەرزو لە حوزوری مندا، بە خەیاڵی خۆت دەموچاوی من بخوێنیتەوە و بۆ ئەوی باس بکەیت. تێدەگەی؟

ئەوجا بە تووڕەییەکی زیاترەوە لەسەری ڕۆیشت:

-.. جا ئەگەر ژنەکەی من لێرە ماوەتەوە جەناب. لەبەر ئەوەیە حەزی کردەوە ڕەفتاری سەیروسەمەرەی ئەو گەنجانە بدینێ کە بە ڕاستی مایەی کونجکاوی و فزوڵیەتە. من بە خۆم هەندێ جار لە جادەوباناندا بۆ تەمەشاکردنی شتێک... شتێکی... دەوەستم.

یەڤگینی باڤلوفیچ، بۆ ئەوەی فریای هاوڕێکەی بکەوێ، خێرا هەڵی دایە:

- شتێکی ناباو.

جەنەراڵ، کە بۆ وشەیەکی گونجاو دەگەڕا، بە خۆشحاڵییەوە ئەو وشەیەی قۆستەوە و گوتی:

- بەڵێ، دەمخۆش، خۆیەتی، یانی شتانی نۆباو. بەهەرحاڵ ئەوەی مایەی سەرسامی و لە هەمان کاتدا خەمباری منە، ئەوەیە کە تۆ نەت توانیوە لەوە بگەیت کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا کە بەدیار تۆوە ماوەتەوە، لەبەر ئەوەیە کە تۆ نەخۆشیت و دڵنیایە کە مەرگ بەردەرکەی پێگرتوویت و هاکا بردیتیەوە، بە

کورتیەکەی کە گوێی لە قسە خەم ئەنگێزەکانت بوو، بەزەیی پێتا هاتەوە و مایەوە. بۆیە ئەمە بە هیچ جۆرێ نە ناوی، نە شۆرەت و ناوبانگی، نە پایەی کۆمەڵایەتیی لەکەدار ناکات...

بەدەم ئەو قسانەوە، لە تورەییدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و گوتی:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، ئەگەر حەز دەکەی بڕۆین، با خوداحافیزی لە میرزادە بکەین و بڕۆین و...

هیپولیت، بەشێوازێکی چاوەڕوان نەکراوو بە دەنگێکی بتەو و نیگایەکی خەیاڵاوی، قسەکەی بە ئیڤان فیدوروفیچ بڕیی و گوتی:

- سوپاسی ئەم ئامۆژگارییەت دەکەم، جەنەراڵ.

ئاگلایا، بێتاقەت و تورە، لەسەر کورسییەکەی هەستا و گوتی:

- دایکە، هەستە با بڕۆین، وا دیارە ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بە ویقارەوە، ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی:

- ئیڤان فیدوروفیچی ئازیز، بە یارمەتیت تەنیا دوو دەقیقەی دی. پێم وایە تای لێ هاتووە، وڕێنە دەکات، بە چاویا دیارە. ناکرێ بەم حاڵەوە بەجێی بێڵین. لیون نیکولایوفیچ، دەتوانی ئەمشەو لای خۆت گلی بدەیتەوە، تا ناچار نەبێ بەم ناوەختە بۆ پترسبۆرگ بگەڕێتەوە؟

ئەوسا ڕووی کردە میرزادە (س...) و گوتی:

- میرزادەی ئازیز (CHER PRINCE) خۆ بێتاقەت نەبوویت؟

ئەوجا ڕووی کردە ئەلکسندرا و گوتی:

- وەرە ئێرە ئەلکسندرا گیان، با تۆزێ قژت چاک بکەم گیانەکەم.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، قژی کچەکەی، کە هیچ پێویستی بە ڕێکخستن نەبوو، کەمێک ڕێکخست، ئەوجا ماچی کرد، کە لە ڕاستیدا مەبەستی لە بانگکردنەکەی ماچەکە بوو.

هیپولیت، کە کەمێک وەخۆ هاتەوە گوتی:

- وام تەسەور دەکرد کە تۆزە بەهرە و توانایەکی پێشکەوتنی فیکری و دەروونیت تێدا هەیە... بەڵێ، دەمویست ئەو شتەت پێبڵێم (وەکو کەسێک شتێکی لەبیرکراوی بیرکەوتبێتەوە بەو ئاوایە خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو).





تۆ تەمەشای بوردوفسکی بکە: لە کانگای دڵەوە، بە تەنگی دایکییەوەیە، وا نیە؟ بەڵام ئەنجام ئابڕووی لەکەدار کرد. تەمەشای میرزادە بکە: حەز دەکات کۆمەکی بوردوفسکی بکات، لە ڕووی پاکی و جوامێری خۆیەوە، دەیەوێ پارەیەکی مۆڵی بداتێ، دۆستایەتی بکات، ڕەنگە لە ناو هەمووماندا، میرزادە تاقە کەس بێت کە نەدەی بوغزێنێ و نە دەی بێزرێنێ، کەچی وێڕای ئەوەش بە چاوی دژمنی خوێنی سەیری یەکدی دەکەن. ها، ها، ها! هەمووتان لە بوردوفسکی پەست و بێزارن، چونکە پێتان وایە ڕەفتاری وی دەرهەق بە دایکی، نا پەسندو کرێت و دزێوە، وا نییە؟ وایە؟ ئێوە هەمووتان، ڕواڵەتبازن، ئاشقی جوانی شێوە و ڕواڵەتی پەسندن و هەموو فیکر و زیکرتان هەر ئەوەیە، وا نییە؟ (دەمێکە گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە هەموو زیکرو فیکرێکتان هەر ئەمەیە)، بەڵام چاک بزانن ڕەنگە شتاقتان بە ئەندازەی بوردوفسکی دایکی خۆی خۆش نەویستبێ. من دەزانم کە میرزادە بە دزییەوە، ژێراوژێر، بە گانیادا پارەی بۆ دایکی بوردوفسکی ناردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەم گرێو بکەم، کە بوردوفسکی زۆری پێڤناخۆشە و گلەیی لە میرزادە دەکات و ئەمە بە بێڕێزی دەرهەق بە دایکی دەزانێت، باوەڕ بکەوایە، ها، ها، ها!...

دیسان کۆکەیەکی توند، لە پێکەنین و قسەی خست.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، کە بە شپرزەیی تەمەشای دەکردو نیگای نیگەرانی لێ نەدەگواستەوە، گوتی:

– تەواو؟ هەموو شتێکی خۆت گوت؟ دەی ئێستا بڕۆ بخەوە، تایەکی توندت لێیە. ئاهـ.. خودایا!... خۆ دیسان قسان دەکات.

هیپولیت، لەناکاوا ڕووی کرد یەڤگینی پاڤلوڤیچ و گوتی:

– پێدەکەنیت؟ بۆچی هەمیشە بە من پێدەکەنی؟ بەئاشکرا هەستم بەمە کردووە!

یەڤگینی پاڤلوڤیچ، بە ڕاستی پێدەکەنی.

– ویستم پرسیاری ئەوەت لێ بکەم جەنابی... هیپولیت... بمبورە ناوی شۆرەتەکەتم بیر چووەتەوە...

میرزادە گوتی:

- بەڕێز تیرنتییف.

- بەڵێ، سوپاس میرزادە گیان. پێیان گوتبووم، بەڵام بیرم چووبووەوە... جەنابی تیرنتییف، ویستم ئەوەت لێبپرسم، ئایا ئەو شتەی دەربارەی تۆ بۆ منیان گێڕاوەتەوە ڕاستە: گوایە تۆ بە قەناعەتەوە باوەڕت وایە، تەنیا چارەکێکت بەسە کە لە پەنجەرەی ماڵەکەتەوە قسە بۆ جەماوەری گەل بکەیت، تا یەکسەر قەناعەت بە ڕاوبۆچونەکانت بێنن و پەیڕەوی دیدو باوەڕەکانت بکەن. ئایا ئەمە ڕاستە؟

هیپولیت، وەکو یەکێک بیەوێ یادگەی خۆی هەڵبداتەوە و ئەو قسەیەوەبیر خۆی بێنێتەوە، کەمێک لە فکران ڕاچوو و بەرسڤی دایەوە:

- دوور نییە ئەو قسەیەم کردبێت.

ئەوجا، دیسان، لەپڕ بە هەڵچوونەوە، ڕاست چاوانی بڕینە یەڤگینی باڤلوفیچ و لەسەری ڕۆیشت:

- بەڵێ، ئەو قسەیەم کردووە، دەتەوێ چ بڵێی؟

- هیچ. هەر حەزمکرد، بۆ زانیاری خۆم ئەو شتە بزانم.

یەڤگینی باڤلوفیچ بێدەنگ بوو، بەڵام هیپولیت وەکو ئەوەی بەتەمابێت یەڤگینی قسەی دی بکات، بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی دەکرد.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، ڕووی کردە یە ڤگینی باڤلوفیچ و پرسیی:

- دەی، تەواو بووی، قسەی دیکەت نەما؟ دەی خێرا تەواوی بکە، ئاخر درەنگە، ئەم پیاوە دەبێ بڕوا بخەوێ لەوە دەچێ قسەی دیکەت پێ مابێ؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، یەجگار بێزارو بێتاقەت بوو.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەدەم بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

- حەز دەکەم ئەمەش بڵێم: هەر هەموو ئەو شتانەی لە هاوڕێکانتم گوێ لێ بوو جەنابی تیرنتییف، هەموو ئەو شتانەش کە تۆ بەو بەهرەمەندی و جوانی و ڕەوانییە حاشاهەڵنەگرە باست کرد، هەر هەمووی لە تیۆری ئەولەویەتی هەق بەسەر هەر شتێکی دیدا بەرجەستە دەبێت، بێ ڕەچاو کردنی هیچ شتێکی دی، تەنانەت پێش ئەوەش کە هەوڵ بدرێ ئەم هەقە

بزانرێ. ڕەنگەواش نەبێ و من هەڵە بم.

– بێگومان هەڵەیت. تەنانەت نازانم تۆ مەبەستت چییە...ئێ چیتر؟

لە سووچێکی بانیژەکەوە. دەنگی چپە چپ دەهات. خوشکەزاکەی لیبدیف لە بەر خۆیەوە و بەئەسپایی قسەی دەکرد.

یەڤگینی پاڤلوفیچ بەرسڤی دایەوە:

– هیچی ترم نییە. هەر ویستم ئەوەوەبیر بێنمەوە کە جیاوازی ئەم تیۆری و بۆچوونە لەگەڵ تیۆری هەق بە زۆردارە، تەنیا یەک هەنگاوە، چەرخی ڕۆژگاریش بە زۆری هەر بەو جۆرە سووڕاوە. ئەدی پرودون نەیگوتووە هەق بە زۆرە، زۆر هەق دروست دەکات؟ ئەوە بوو لە ماوەی جەنگی ناوخۆی ئەمریکادا، بە بەرچاوی هەموومانەوە گەلێک لە لیبرالەکان، گەلێک لە لیبرالە توندڕەوەکان، لایەنی خاوەن مەزرا و جووتیارەکانیان دەگرت، بەو هەنجەتەی کە ڕەش پێستەکان، چونکە ڕەشپێستن، دەبێ پایەیان سپیپێستەکان کەمتر بێ. هەق بە سپیپێستەکانە، چونکە زۆرو دەسەڵاتیان هەیە و هەق بە زۆردار و بۆ زۆرە...

– ئێ؟.

– بەم پێیە تۆ نکۆڵی لە تیۆریی "هەق بە زۆردارە". ناکەیت

– ئێ؟ چیتر؟

– بەم جۆرە، تۆ بیرکردنەوەیەکی یەکدەستت هەیە. من تەنیا دەمویست، ئەوە بڵێم کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان هەقی زۆردار و هەقی بەور و نەهەنگان و تەنانەت دانیلوف گورسکییشدا نییە.

– نازانم... چتیر، بەردەوام بە؟

هیپولیت، بەدەم وتنی: "ئێ، چیتر، بەردوام بە!" بەوپەڕی بێتاقەتی و تەنیا وەکو عادەت، هەر بە درۆوە، گوێی لە یەڤگینی پاڤلوفیچ دەگرت، دەنا کەم و زۆر ئەو قسانەی لەلا گرینگ نەبوو.

– تەواو هیچی ترم پێ نییە،... ئەوەی مەبەستم بوو گوتم.

هیپولیت، لەناکاوا، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، بێ ئەوەی بە خۆیشی بزانێ چ دەکات، گوتی:





-بە هەر حاڵ، من نە لێت تورەم و نە ڕقم لێتە.

بەدەم زەردەخەنەیەکی وێڵەوە، دەستی برد تەوقە دەگەڵ یەڤگینی باڤلوفیچدا بکات.

یەڤگینی باڤلوفیچ کە هەوەڵ جار حەپەسابوو، پاشان بەوپەڕی جدی دەستی گوشی و، وای دەنواند کە تەوازۆیەکەی هیپولیتی قەبووڵ کردووە و هیچی لە دڵدا نەماوە. بە هەمان ڕێزو حورمەتەوە گوتی:

- من زۆر سوپاست دەکەم کە ڕێت دام قسە بکەم، چونکە زۆر جار دیتوومە کە هاوڕێ لیبراڵ و ئازادیخوازەکانی ئێمە، ڕێگە بە کەس نادەن ڕای خۆی دەر برێت و یەکسەر بە جنێو و لە جنێو خراتر، بەرپەرچی هەڤڕک و نەیارانی خۆیان دەدەنەوە...

جەنەراڵ یەپانچین گوتی:

- زۆر ڕاستە، دەقاودەق وایە.

ئەوجا، دەستەکانی خستنە پشتی و پەست و بێتاقەت، بەدەم باوێشکدانەوە بەرەو دەرگاکەی ئەوسەری هەیوان و بانیژەکە ڕۆیشت.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لەناکاوا، ڕووی کردە یەڤگینی پاڤلوفیچ و گوتی:

- دەی بەسە برادەری ئازیز! بێتاقەتت کردم!

هیپولیت، بەلەزو سەراسیمە، بەدەم دەست بادانەوە، لەسەر کورسییەکەی هەستا و نیگایەکی سلۆک و وێڵی دەوروبەری خۆی کرد و گوتی:

- کاتی ڕۆیشتنە... ماتەڵم کردن، دەمویست هەموو شتێکتان پێ بڵێم... (وام خەیاڵ دەکرد هەمووتان)... (بۆ دواجار). ئەمە خەیاڵ پلاوی من بوو....

دیار بوو بەرە بەرە وەخۆ دەهاتەوە و لەو حاڵی نیمچە ورێنەیە دەر دەهات کە گیرۆدەی بووبوو، لە حاڵەتی هوشیاریی تەواودا لەپڕێکا شتێکی وەبیر دەهاتەوە و دەکەوتە قسان. بە زۆری ئەو وردە شتانەی دەگێڕایەوە کە بەدەم نەخۆشییەوە و لە ناو جێگاداو لە کاتی بێخەویدا لە یادگەیدا کەڵەکە دەبوون و ئەزبەری دەکردن!

هەنگێ بەلەز و لەناکاودا گوتی:

- باشە... بە دووعا! پێتان وایە خوداحافیزی لە ئێوە بۆ من ئەوەندە

ئاسانە؟ ها، ها، ها! ...

خۆی بە پرسیارە ناشیانەکەی خۆی پێکەنی. ئەوجا لەخۆی تورە بوو، چونکە نەیتوانیبوو وەکو پێویست گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی خۆی بکات. بۆیە بە تورەیی و بە دەنگی بەرز گوتی:

– عالی جەناب، ئەگەر قەبووڵ بکەیت، من بە شانازییەوە دەعوەتت دەکەم کە لە پرسەکەما ئامادە بیت... خانمان، ئاغایان تکا دەکەم ئێوەش، هەمووتان، دەگەڵ جەنەراڵدا وەرنە پرسەکەم!...

دیسان لە قاقای پێکەنینی دا، بەڵام پێکەنینی ئەم جارەی لە هی کەسێکی شێت دەچوو. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا سەراسیمە بەرەو لای وی چوو، باسکی گرت. هیپولیت بە دیقەت چاوی برییە دوڕ چاوانی، لە تۆ وایە پێکەنینەکە بە دەموچاویەوە بەستوویەتی.

– دەزانن کە من بۆ سەیری درەختان بۆ ئێرە هاتووم؟ ئەوە درەختەکانە (بە دەستی ئاماژەی بۆ دارو درەختانی باخچەکە کرد). ئەمە هیچ مایەی پێکەنین نییە، وا نییە؟

هەنگێ بەوپەڕی سەلاری ڕووی کردە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و پرسیی:

– پێم وایە ئەمە هیچ شتێکی تیا نییە کە مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕی بێت.

ئیدی نقومی دەریای خەیاڵ بوو. دوای چاوتروکانێک وەخۆی هاتەوە، سەری هەڵێنا و ڕووانییە ئامادەبووان، وەک بڵێی چاو بۆ یەکێک بگێڕێت... چاوی بۆ یەڤگێنی باڤلوفیچ دەگێرا کە لە نزیکیەوە، لە دەستە ڕاستیا و لە شوێنەکەی خۆی وەستابوو، بەڵام هیپولیت، لە بیری چووبووو، دەوروبەری خۆی بۆ دەگەڕا، کە لە ئەنجامدا دیتییەوە، بەسەرسامی گوتی:

– ها... هێشتا نەڕۆیشتوویت! زۆر بەو خەیاڵەی من پێکەنیت کە گوایە بە ئاوات و ئارەزووی ئەوەوە بووم بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێک لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە قسە بۆ خەڵکی بکەم! دەیسا بزانە کە من هێشتا تەمەنم نەگەیشتبووە هەژدە ساڵان، ماوەیەکی زۆر لەناو جێگاکەمەوە، سەرم لەسەر سەرینەکەم دادەنا و لە پەنجەرەکەمەوە دەمڕوانییە دەرەوە و

بیرم دەکردەوە... بیرم لە هەموو شتێک دەکردەوە... بەتایبەتی لە خەڵکی... تۆ خۆت دەزانی مردووان تەمەنیان نیە. هەفتەی ڕابردوو، شەوێک، کە خەوم زڕا، ئەم بیرۆکەیەم وەبیرهاتەوە... دەزانی ئێوە زیاتر لە چ شتێک دەترسن؟ ئێوە هەرچەندە لە ئێمەمانان بێزارن، بەڵام لە ڕاستگۆیی ئێمە دەترسن! هەمان شەو، کاتێ لە سەر جێگاکەم ڕاکشابووم، ئەم بیرۆکەیەشم بە خەیاڵدا هات...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا. ئایا پێتوایە کە هەنووکە، لە دڵی خۆمدا دەمویست بە تۆ پێبکەنم؟ نا نەخێر بە نیازی شتی وا نەبووم. بە پێچەوانەوە دەمویست ستایشت بکەم... کولیا پێی گوتم کە میرزادە وەکو منداڵ ڕەفتاری دەگەڵ کردوویت... ئەمە ڕاستە... بەڵام بۆچی؟ دەمویست شتێکی دیکەش بڵێم...

بەدەم ئەو قسەیەوە، دەموچاوی لەنێو هەر دوو لەپی ناو بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو.

– ئا، بەڵێ... بیرم کەوتەوە: کاتێ تۆزێ لەمەپێش لێبرایت بڕۆیت، لە پڕێکا لە دڵی خۆدا گوتم: من جارێکی دی هەرگیز ئەمانە نابینمەوە، هەرگیز. جارێکی دی درەختەکانیش نابینمەوە! تاقە شتێک کە ببینم، دیوارە خشتەکەی ماڵی مایرە، کە ڕێک بەرانبەر بە پەنجەرەکەی منە... هەوڵ بدە هەموو ئەم شتانەیان بۆ ڕوون بکەوە... هەوڵ بدە کە لێت بگەن... ئەمە کچێکی زۆر جوانە... تۆ پیاوێکی مردوویت... وەکو مردوویەک خۆتی پێ بناسێنە و پێیان بڵێ "مردوو لێی ناگیرێ، بۆی هەیە هەرچییەکی بوێ بیڵێ"... دۆتمیر ماریا ئالکسییڤنا هیچ ناڵێت، بەمە قەڵس نابێت*. ها، ها، ها.... ئەدی بۆ پێناکەنن؟ (بەدەم ئەو پرسیارەوە، بەگومانەوە چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا). دەزانن لەسەر جێگاکەم چەندم شت بە بیر و خەیاڵدا هاتووە، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە تەبیعەت یەجگار گاڵتەجاڕە؟... تۆزێ لەمەپێش گوتتان من خوانەناسم، بەڵام دەزانن تەبیعەت... دیسان بەچی پێدەکەنن؟

لەناکاوا، بە تووڕەیی و خەمینی ڕوانییە ئامادەبووان و گوتی:

– بە ڕاستی دڵڕەقن!





ئەوجا بە زمانێکی تەواو جیاواز، زمانێکی جدی و پڕ قەناعەت، وەکو ئەوەی بیرێک ڕای چڵەکاندبێ، لە سەری ڕۆیشت:

- من هەرگیز خووی کولیام شەڕ نەکردووە. من لە ڕێ دەرم نەکردووە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بەوپەڕی خەمباری گوتی:

- کەس گاڵتە بە تۆ ناکات. کەس بە تۆ پێناکەنێ.... سبەی بەیانی پزیشکێکی دیکەت بۆ دێنین. دەبێ پزیشکی یەکەم هەڵە بووبێ. دانیشە! خۆت بە پێوە ناگریت! وڕێنە دەکەی...

هەنگێ لیزاڤیتا، کە لەسەر کورسییەک دای دەنا، شپرزە و پەشۆکاو هاواری کرد:

- ئاهـ.. ئێستا چی بۆ بکەین؟

بەدەم ئەو قسەیەوە، دڵۆپە فرمێسکێکی ورد، بەسەر گۆنایەوە بریقایەوە.

هیپولیت، بۆ ساتێک حەپەسا، هەنگێ دەستی برد، بە شەرمەوە ئەو دڵۆپە فرمێسکە وردەی سڕی و بزەیەکی منداڵانە کەوتە سەر لێوی. ئەوجا بە خۆشییەوە گوتی:

- تۆ نازانی من چ هەستێکم بەرانبەر بە تۆ هەیە... مەگەر هەر من بزانم کولیا هەمیشە بە چ جۆشوخرۆشێکەوە باسی تۆ دەکات... ئەو جۆش و خرۆشەیم زۆر خۆش دەوێ... من خووم شەڕ نەکردووە! ئەو، تاقە کەسە کە هیچی لێناشارمەوە، گریی دڵی خۆمی بۆ دەکەمەوە، هەرچی بیر و بیرەوەریەکم هەبێ بۆی دەگێڕمەوە. تاقە دۆستێکم مابێ هەر ئەوە، چبکەم حەزم دەکرد، خەڵکی زۆر بەشدارییان لەم کەلەپوورە بکردایە، بەڵام چبکەم هەر ئەوم بە دەستەوە ماوە. کەسی تر نییە... کەس بە دەورمەوە نەماوە... حەزم دەکرد پیاوێکی چالاک بام، پیاوی مەیدانی کردار. ئەم هەقەم هەیە.... حەزم دەکرد زۆرکاران بکەم! هەزارو یەک هیوا و خۆزیام هەبوو! لێ ئێستا ئارەزووی هیچ شتێکم نییە، حەزناکەم ئارەزووی هیچ شتێکم هەبێت. بەڵێنم بە خۆم داوە لەمڕۆ بە دواوە ئارەزووی هیچ نەکەم، هیچم نەوێ. با خەڵکی دی لەپاش من لە حەقیقەت بگەڕێن! بەڵێ تەبیعەت پێمان ڕادەبوێرێ. گاڵتەجارە!

لەپڕ بە گەرمی هاواری کرد:

- باشە تەبیعەت باشترین بوونەوەران دەخولقێنێ تا دوایی بیانکات بە





مەخسەرە؟ پێیان ڕابوێرێ؟ هەر خۆی بەشەری وەکو نموونەی کاملّی ئەفراندن نەخولّقاند؟ خۆی خولّقاندی و خۆی زمانی دایە تا قسەی وا بکات ببێتە هۆی ڕشتنی خوێنێکی ئەوتۆ، کە ئەگەر بە یەکجار ڕژابایە هەموو بەشەریەتی دەخنکاند! کەواتە مردن بۆ من شادییە! دەنا لەوە بوو منیش فریوی ئەو دریۆیەم خواردبا کە تەبیعەت لەبەر خاتری من خولّقاوە! .... من خووی کەسم شەڕ نەکردووە، کەس بەهۆی منەوە گەندەلّ نەبووە، کەسم گەندەلّ نەکردووە.... دەمویست بۆ بەختەوەری هەموو خەلّکی بژیم... دەمویست بۆ ئەوە بژیم کە حەقیقەت کەشف و بلّاو بکەمەوە... کە لە پەنجەرەکەمەوە تەمەشای دیوارەکەی مالّی مایرم دەکرد، وام تەسەوردەکرد ئەگەر دەرفەتی تەنیا یەک چارەکە سەعاتم هەبێ کە قسان بکەم، دەتوانم قەناعەت بە هەمووان بێنم، بە هەموو کەسێک! کەچی ئەوەتا لە هەموو تەمەنما، تەنیا یەک جارێک بۆم هەلّکەوت کە تەماس دەگەلّ هەموو بەشەردا نا، بەلّکو تەنیا لەگەلّ ئێوەدا بگرم، ئەنجامەکەی چی بوو؟ فایدەی چی بوو؟ هیچ! ئەنجامەکەی ئەوەیە کە ئێوە دەم بوغزێنن! ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە من کەرو کەودەن و بێزراوم، خێرم نییە و شەرم بە پای سەگ، کاتی ئەوە هاتووە نەمێنم! نامێنم و هیچ یادگارێکم لەدوا نامێنێ، چونکە نەمتوانیوە نە دەنگێ، نە ڕەنگێ، نە شوێنەوارێ، نە کردارێ لەدوای خۆم جێ بێلّم! نە باوەڕێکم بلّاو کردووەتەوە، نە برەوم بە قەناعەتێک داوە! تکایە بەم کەرپیاوە پێمەکەنن! لە بیری بکەن! هەموو شتێک فەرامۆش بکەن. تکایە دلّڕەق مەبن! دەزانن ئەگەر تووشی سیل نەهاتبام، خۆم دەکوشت؟!...

پێدەچوو بیەوێ زۆر شتی دی بلّێت، زیاتر قسان بکات، بەلّام نەیتوانی بەردەوام بێت، دیسان بەسەر کروسییەکەیدا داڕوخا، دەموچاوی لەنێو هەر دوو دەستی نا، وەکو منداڵێکی چکۆلە دەستی بە گریان کرد.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، دووبارە گوتی:

- ئێستا چی بۆ بکەین؟ پێم نالّێن چیی لێ بکەین؟

بە هەشتاو خۆی گەیاندێ، سەری گرت و نای بە سینگی خۆیەوە. هیپولیت بە کولّ دەگریا. لیزاڤیتا گوتی:

- بەسە، بەسە، بەسە! مەگری، گریان بەسە! تۆ کوڕێکی باشیت! خوا بە

نەزانیی خۆتت لەگەڵ دەکات، دەتبەخشێت. دەی، بەسە! پیاو بە، دەنا دوایی لە خۆت تەریق دەبیتەوە...

هیپولیت، بەدەم هەوڵی ئەوەوە کە سەری هەڵبڕێت، گوتی:

- من برایەک و دوو خوشکم لەوێ هەن، بچووک و بەسەزمانن... پاک و بێگەردن... ئەو ژنە خوویان شەڕ دەکات. تۆ فریشتەیت،... تۆ بە خۆت منداڵیت، لە منداڵ پاکتریت، فریایان بکەوە، لە دەستی ئەو ژنەیان دەرباز بکە... ئەو یەکپارچە نەنگ و شەرمەزاریە... ئاە... کۆمەکیان بکە، ڕزگاریان بکە! خوا سەد بەرانبەر چاکەت دەداتەوە! لە ڕای خوا، بیکە بە خاتری یەسوع فریایان بکەوە!.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بە تووڕەیی گوتی:

- ئیڤان فیدوروفیچ پێم نالێی ئێستا چ بکەین! وەختی ئەم کەشوفش و بێدەنگییە شاهانەیە نییە! ئەگەر بڕیارێک نەدەیت، ئەوا ناچارم ئەمشەو لێرە بەدیاریەوە بمێنم! مردم ئەوەندە نەرمکێشیت بۆ بکەم، ئەم دکتاتۆرییەتە تاکەی!

بەوپەڕی تووڕەییەوە قسەی دەکرد و داوای وەڵامی دەکرد. دیارە لەم حاڵەتانەدا ئامادەبووان چەندیش ژمارەیان زۆر بێت، خۆ لە قسان دەبوێرن، هەڵوێستێکی نەرێنی وەر دەگرن و بە کونجاوییەوە، تەماشای ڕەوشەکە دەکەن و خۆ لە دەربڕینی هەست و بۆچوونی خۆیان دەپارێزن، دوای ماوەیەکی زۆر، یانی دواتر ڕاوبۆچوونی خۆیان دەڵێن. لەنێو ئەو خەڵکەی ئەوێندەرش کەسانێک هەبوو ئامادەبوون تا بەیانی بمێننەوە و تاقە وشەیەک نەڵێن. یەکێک لەوانە ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا بوو کە بە درێژایی شەوەکە، دوور لەوانی دی، لە سووچێکا، بە بێدەنگی بەڵام بەوریاییەوە دانیشتبوو. ڕەنگە لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی ئەو هەڵوێستەی هەڵبژارد بووبێ.

جەنەراڵ گوتی:

- گیانەکەم، بە بۆچوونی من، سستەرێکی بەدیارەوە بێ لە هەموو ئەم هەراوزەنایەی ئێمە باشترە. چار هەر ئەوەیە ئەمشەو پیاوێکی باوەڕپێکراوی هێمن بە دیارییەوە بێت. بەهەرحاڵ دەبێ ڕاوێژ دەگەڵ میرزادەدا بکەین و ئەو قەرار بدات... ئەوجا دەبێ یەکسەر نەخۆشەکە جێ بێڵین تا ئیسراحەت بکات.





سبەینێ دێینەوە بۆ لای و تەگبیرێکی حاڵی دەکەین.

دوکتورنکو، بە تورەیی لە میرزادەی پرسیی:

– نیوەشەوە. ئێمە دەڕۆین. لەگەڵ ئێمەدا دێت یان لای تۆ دەمێنێتەوە؟

میرزادە گوتی:

– ئەگەر حەز دەکەن بەدیاریەوە دانیشسن، جێگا هەیە.

کیللەر، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، بەهەشتاو بەرەو لای جەنەراڵ ڕۆیشت و بە جۆشەوە گوتی:

– پایەبەرز، ئەگەر پێویست بکات کەسێکی لە باری جێ متمانە ئەمشەو بەدیاریەوە بمێنێ، من ئامادەم بە خۆشحاڵییەوە ئەم فیداکاریە بۆ ئەم دۆستەم بکەم... تۆ نازانی ئەم پیاوە چ گەوهەرێکە، چەند نەفسبەرزە! زۆر دەمێکە بە پیاوێکی گەورەی دەزانم، پایەبەرز! هەڵبەتە من خوێنەوارییەکی زۆرم نییە، بەڵام ئەو کاتێ قسە دەکات، ڕەخنە دەگرێت، دوڕوگەوهەر لە زاری دەڕژێت، دوڕ و گەوهەر عالی جەناب!

جەنەراڵ، بە بێزارییەوە ڕووی وەر گێڕا.

میرزادە، لەوەڵامی پرسیارە تورەکانی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنادا گوتی:

– حەز دەکەم بمێنێتەوە. زۆر ئەستەمە بتوانێ بڕوات.

– چییە خەوت دێ؟ ئەگەر ناتوانی خەمی بخۆیت، قەیدی نییە دەیبەمەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئاهـ.. خودایا!... تۆ بە هەزار حاڵ خۆت بەپێوە دەگریت، ماڵ لە خۆی نەبوو میوانش ڕووی تێ کرد. میرزادە چییە، نەخۆشیت؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، تەسەوری وا بوو کە دوای نیوەڕۆ میرزادە لەنێو جێگای نەخۆشیدا بدینێ، بەڵام کە بینی بە پێوەیە و لە جێدا نەکەوتووە و بە ڕواڵەت عەلەمی نییە، ئیدی وای زانی چاکی چاک بووەتەوە، بەڵام نۆرە نەخۆشییەکەی ئەم دواییەی میرزادە و ئەو بیرەوەرییە بەسوێیانەی کە لە دەروونیا زیندوو بووبوونەوە، ماندووبوونی لەڕادەبەدەری ئەمشەوی بە هۆی کوڕەکەی بافلیشچوفەوە و پاشان بە هۆی خرابوونی تەندروستی هیپولیتەوە، هەر هەموو ئەمانە بە ڕادەیەک کاریان تێکردبوو، دیار بوو کە تای لێهاتووە. چاوەکانی نیگەرانییەکی ترسامێزیان دەنواند. زۆر بە سەرنجەوە دیقەتی هیپولیتی دەدا، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی تەقینەوە و هەڵچوونێکی تازەی لێ

بکات.

هیپولیت، لەناکاودا هەستایە سەر پێیان، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو. جۆرە شەرمەزارییەکی ئاوێتە بە ترس سیمای مەسخ کردبوو. ئەو حاڵەتە زیاتر لەو نیگا بوغزن و ترسناکەیدا دەر دەکەوت، کە بە یەک بە یەکی ئامادەبووانیدا دەگێڕا، لەو بزەوێڵ و سەرگەردان و پڕ تەوس و توانجەیدا دەر دەکەوت کە دەنیشتە سەر لێوە لە ڕزۆکەکانی. ئەوجا چاوانی داخستن، بە هەمان بزەوە، بە هەنگاوی لەرزۆکەوە، خۆی بەرە و بوردوفسکی و دکتورنکو بکێش کرد کە لە بەردەرگای بانیژەکە چاوەڕوانیان دەکرد. دەیویست لەگەڵ ئەواندا بڕوات.

میرزادە گوتی:

- لەمە دەترسام! دەبوایە ئەمە ڕوو بدات!

هیپولیت، لەناکاوا، ئاوڕی لێ دایەوە، دەموچاوی ڕق و غەزەبی لێدەباری، گوتی:

- ئاوها... لەمە دەترسایت؟ بە ڕای تۆ دەبوایە ڕوو بدات؟ ئەوسا بە دەنگی بەرز و بەدەم کەف چەڕاندنەوە لەسەری ڕۆیشت:

- دەیسا با پێت بڵێم ئەگەر کەسێک هەبێت کە لە هەموو کەس و شتێک زیاتر ڕقم لێی بێت -ئەگەرچی ڕقم لە هەر هەمووتانە - ئەوا ئەو کەسە تۆیت، تۆیت! تۆی یەسوعی ڕیابازی ڕووبین، تۆی شێت و گەوج و گەمشۆ، تۆی خێرەومەندی ملیۆنێریت! زۆر زۆرم ڕق لێتە، ئەوەندە ئەوەندەی ڕقم لە تۆیە ڕقم لە هیچ مرۆڤ و شتێکی دیکەی ئەم دنیایە نیە. زۆر دەمێکە جەوهەرم ناسیوویت و ڕقم لێتە. لەو ڕۆژەوە کە ناوم بیستوویت لە ناخی دڵەوە بوغزاندوومیت... بە دڵ و بە گیان ڕقم لێتە... تۆ تووشی ئەم داوەت کردم! تۆ بەرپرسیت لەم زەبوونی زەلیلییەی من، تۆ وات کرد منی نەخۆشی لە حاڵی مردنا، ئاوا خۆم عەیبدار و شەرمەزار بکەم... ئەگەر تەمەن مەودای دەدام، بزانە چۆن دەمکوشتیت! من پێویستم بە خێرو چاکەی تۆ نییە. نامەوێ کەس خێرم پێ بکات. گوێت لێمە؟ خێر و سەدەقەی کەسم ناوێ! تووشی وڕێنە بووم، وڕێنەم دەکرد، قەبووڵ ناکەم خۆتم لێ بکەی بە خاوەن، شینم بۆ بکەی، لەسەر حیسابی من، خۆت بنوێنی... هەمووتان بە نەعلەت دەکەم، بۆ هەتا هەتایە بە نەعلەتتان دەکەم...

لیبدیف، بە گوێی لیزاڤیتا پروکوفیڤنایدا چپاند:

– پێی ناخۆش بوو کە گریا، تەریقی گریانەکەیەتی. میرزادە گوتی: "دەبوایە ئەمە ڕوو بدات". میرزادە سەیرە! چاوی باتینی هەیە. ناخ و نیهادی ئەوی خوێندبووەوە!

لێ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە خۆی نەگرت، هەر نیونیگایەکیشی بکات. بەوپەڕی کەش و فش و کبریاوە، وەستابوو، سەری بەرز گرتبوو، بە کونجکاوییەکی نەفرەت ئامێزەوە دەیڕوانییە سەروچاوی ئەو "ڕەشە خەڵکە نەگبەتە". کە هیپولیت لە قسەکانی بووەوە. جەنەراڵ، بەبێ موبالاتیەوە شانی هەڵتەکاند، لیزاڤیتا، بە تووڕەیی سەراپای دایە بەر نیگا، وەکو ئەوەی لێ پێچینەوەی لەگەڵ بکات و داوای هۆی ئەو کارەی لێ بکات، ئەوسا ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

– سوپاس میرزادە، سوپاس ئەی دۆستە ئەتوار غەریبەکەی خانەوادەی ئێمە، سوپاس بۆ ئەم شەوکۆڕەی کە بۆت سازکردین. پێم وایە، زۆر دڵت بەمە خۆشە کە توانیت، ئێمە بێنیتە ناو ئەم گاڵتەبازاڕو قەشمەری بازیە! ئەمە بەسە! سوپاس بۆ تۆ، کە بەلای کەمەوە دەرفەتی ئەوەت بۆ ڕەخساندین، کە لە نزیکەوە بتناسین و بزانین چتۆ بەشەرێکی، مەمنوونم!...

بە تووڕەیی سەرپۆشەکەی ڕێک خست و چاوەڕوانی ئەوەی کرد کە "ئەو ڕەشە خەڵکە" دەر بچن. ڕێک لەم کاتەدا گالیسکەیەک هات، تومەز دکتورنکو، چارەکێک لەوەپێش کوڕە خوێنکارەکەی لیبدیفی بە شوێنا ناردبوو. جەنەراڵ هەستی کرد، پێویستە بۆ پشتیوانیی گلەییەکانی ژنەکەی، ئەویش یەک دوو قسەیەک بکات، گوتی:

– ئەلهەقی میرزادە من... بەش بە حاڵی خۆم... چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە... دوای ئەم... هەموو دۆستایەتییەی کە لەنێوانماندا بوو!... ئەنجام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا...

ئادیلاید، بەهەشتاو بەرەو میرزادە چوو، دەستی گرت و هاواری کرد:

– ئەوە ئێوە چ دەڵێن؟ چۆن دڵتان دێت بەوجۆرە ڕەفتاری دەگەڵ بکەن؟

میرزادە، بزەیەکی سەرگەردانی بە ڕوویادا، بەلام زۆری پێنەچوو، چپەیەک عەینی ئاگر بە گوێیا چزا. تومەز ئاگلایا بوو، کە بە چپە پێی دەگوت:

- ئەگەر هەر ئێستا، ئەو گەجەروگوجەرە دەر نەکەیت، بە عەمراتم، قسەت لەگەڵ ناکەم!

لەوە دەچوو، تەواو دەهری بووبێ، بەڵام بەر لەوەی میرزادە فریا بکەوێ، تەمەشای بکات، ڕووی لێوەرگێڕاو دوورکەوتەوە. بە ڕێکەوت هیچ کەسێک لەوێ نەمابوو تا دەریبکەن، جماعەت نەخۆشەکەیان لە گالیسەکەکە نابوو و گالیسکەکە بە ڕێکەوتبوو، دوور کەوتبووەوە.

- تۆ چ دەڵێی ئیڤان فیدوروفیچ، تۆ بڵێی ئەم بەزمە درێژە بکێشێت؟ پێت وایە دەبێ ماوەیەکی زۆر دەگەڵ، ئەو منداڵە نەژنەو و شەڕانییانەدا هەڵبکەم؟ دەگەڵ ئەوانە خەریک بم، بە گژیاندا بچم؟

- ئاە گیانەکەم... هەڵبەتە من یەک لە باری خۆم ئامادەم... میرزادەش....

ئیڤان فیدوروفیچ، وێڕای ئەوەش دەستی برد کە تەوقە دەگەڵ میرزادەدا بکات، بەڵام پێش ئەوەی میرزادە فریا بکەوێ تەوقەی دەگەڵ بکات، بەهەشتاو دوای لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا کەوت کە بە تورەیی بە قاڵدرمەکانی بانیژەکەدا دادەبەزی، بەڵام ئایدیلاید و دەزگیرانەکەی و ئالکسندرا، بە گەرمی خواحافیزییان لە میرزادە کرد. یەڤگێنی باڤلوفیچ تاقە کەس بوو، کە خۆی شێلو نەکردبوو و چاوی لەوان کرد و بەدەم بزەیەکی زۆر دۆستانەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

- دروست هەمان شت ڕووی دا کە چاوەڕوانم دەکرد! بەداخەوە هاوڕێی کڵۆڵم، کە شەوێکی ئاوا ناخۆشت گوزەراند!

ئاگلایا، بە بێخودا حافیزی ڕۆیشت.

بەڵام هێشتا ڕووداوەکانی ئەم شەو کۆڕە، تەواو نەبووبوون. کە شتێکی چاوەڕواننەکراو هاتە ڕێی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا. هێشتا بە تەواوەتی نەگەیشتبووە دوا پلەی قاڵدرمەکەو، سەر ئەو ڕێگایەی کە (بەدەوری باخەکەدا دەسووڕایەوە) کە گالیسکەیەکی سەر ئاوالای یەجگار جوان، کە دوو ئەسپی بەڵەکی لە ژێرابوو و دوو خانمی یەجگار تەڕپۆشی تیا بوون، بە بەر ڤێلاکەی میرزادەدا هات، کە گالیسکەکە گەیشتە دە مەتری ڤێلاکە، لەپڕ ڕاوەستا، یەکێک لە دوو خانمەکە، بەپەلە ئاوڕی دایەوە، وەکو ئەوەی چاوی بە کەسێکی ناسیاو کەوتبێت و زۆر حەز بکات بەلەز بیدینێت.

ئەو خانمە بە دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا و ئاهەنگێن بانگی کرد:

- یەڤگینی باڤلوفیچ! ئەمە تۆی؟

میرزادە و ڕەنگە کەسێکی دیکەش، بەو دەنگە دڵیان داخورپا، خانمەکە، درێژەی بە قسەکەی دا:

- چەند خۆشحاڵم کە ئاخری دۆزیمیتەوە! دوو پەیکم بە دووتا ناردبوون بۆ شار، کەچی بێهودە سەرانسەری شارایان تەی کردبوو.

یەڤگینی باڤلوفیچ، وەکو یەکێک کارەبا لێی بدات، لە ناوەڕاستی قاڵدرمەکەدا لە جێی خۆی وشک بوو. لیزاڤیتا پروکوڤیڤناش لە جێی خۆی وەستا، بەڵام وەکو یەڤگینی نە حەپەسا. نیگایەکی نەفرەت ئامێزی ئەم خانمە گۆساخە تازە هاتووەی کرد. ڕێک بە هەمان فرناخی و لووتبەرزییەوە کە تۆزێ لەمەپێش، ڕوانی بووە ئەو "خەڵکە گەجەروگوجەرە". ئەوجا بەلەز نیگای گواستەوە بۆ یەڤگینی پاڤلوفیچ، نیگایەک یەکپارچە ئاوس بە پرسیار!

هەمان دەنگ، هەڵی دایە و گوتی:

- خەبەرێکی خۆشم بۆ هێناویت، خەمی سفتەکانی لای (کویفر*)ت نەبێت. (ڕوگوژین)م ناچار کرد و بە قازانجی لە سەدا سی ٣٠% لێی کڕینەوە. ئیدی دەتوانی بەلای کەمەوە تا سێ دانە مانگ ئاسوودە و خەیاڵ ڕەحەت بیت. چاری بیسکوپ و خوێری و تۆڕیەکانی دیکەش دەکەین، ئەنجام بێ کەشمەکەش (شەڕوهەرا) دەگەڵیان ڕێک دەکەوین. دەی خۆشی لە خۆت! تا سبەینێ خودا حافیز! .

گالیسکەکە کەوتە ڕێ و زوو بە زوو لە چاو ون بوو.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، لە تورەییدا سوور هەڵگەڕا، نیگەران و سەراسیمە ڕوانییە دەوروبەری خۆی. بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

- ڕەنگە شێت بێت! نەمزانی باسی چیدەکات! سفتەی چی؟ ئێستاش نەمزانی ئەم ژنە کێیە؟.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، خێسەیەکی لێ کرد، ئەوجا پشتی تێکردو بەهەشتاو بەرە و ماڵی خۆیان نشێو بووەوە، کەس و کارەکەشی دووی کەوتن. ڕێک دوای یەک دەقیقە، یەڤگینی پاڤلوفیچ پەشێو و پەریشان گەڕایەوە بۆ بانیژەکە، بۆ لای میرزادە.

- میرزادە، بە ڕاستی نەتزانی ئەوە مانای چی بوو؟

میرزادە، کە بە خۆی لەڕادەبەدەر پەشێو و پەریشان بوو، بەرسڤی دایەوە:

- نەخێر، هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانم.

- نا؟

- نەخێر!

یەڤگینی پاڤلوفیچ، لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی:

- منیش هیچ نازانم! باوەڕبکە، ئاگاو عیلم و خەبەرم لە سفتە و سەنەدان نییە، هیچ سفتەیەکم ئیمزا نەکردووە و هیچ جۆرە سەوداو مامەڵەیەکی سفتە و سفتەکاریم دەگەڵ ئەم ژنەدا نەبووە، باوەڕم پێ بکە. ئەدی ئەوە چیتە؟ دەڵێی خەریکە ببورێیتەوە؟...

- نا... نا... خەمت نەبێ، دڵنیا بە کە...

پەراوێز:

* - "دۆتمیر ماریا ئالکسییفنا هیچ ناڵێت، بەمە قەڵس نابێت...": ئاماژەیە بۆ ئەو دیالۆگەی فاموسوف دەگەڵ خۆیدا، لە شانۆنامە بە نێوبانگەکەی گریبویدوف: "ئەقڵی زۆر، بەدبەختییە" لە دوا دیمەنی شانۆنامەکەدا دەبینین کاراکتەرەکە هاوار دەکات و دەڵێت: "ئاهــ... خودایا... دەبێ دوتمیر ماریا ئالکسییفنا چ بڵێ؟".

* - "کوپفر"، "بیسکوپ": دەبێ ئەمانە سووتخۆر بن.

١

## فەسڵی یازدەیەم

دوای سێ دانە ڕۆژ ئەوسا ڕقی ماڵباتی یەپانچین بە تەواوی دامرکایەوە و هێور بووەوە. میرزادە وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، لەم ڕووداوەدا خۆی بە کەمتەرخەم و خەتابار دەزانی، لە کانگای دڵەوە ئامادەی هەر سەرکۆنە و سزایەک بوو. وێڕای ئەمەش، هەر لە سەرەتاوە قەناعەتی وابوو کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، نابێت لەو پەست و تووڕە بووبێ، بەڵکو زیاتر لە خۆی پەست و تووڕە بوو. بۆیە زۆری لەبەر گران بوو کە ئەو سێ ڕۆژە لێی تۆرابوون. زۆر فاکتەر و بویەر و ڕووداوی دیکەش، لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا بوونە مایەی زیاتر نیگەرانی و پەریشانی وی. یەکێک لەو فاکتەرانەی کە لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، بە جارێ مجێزی گوماناوی و تەبیعەتی دڕدۆنگیان هاڕوژاند (میرزادە لەو دواییانەدا گلەیی ئەوەی لە خۆ دەکرد کە جارێ "خۆشباوەڕێکی بێمانا و نا ماقووڵە" و جارێ "ڕەشبینێکی بەدگومان و لەڕادەبەدەر دوو دڵە".) مەسەلەی ئەو ئافرەتە بوو کە لەناو گالیسکەکەیەوە بانگی لە یەڤگینی باڤلوفیچ کرد. بەڵێ، لە کۆتایی ڕۆژی سێیەمدا، مەسەلەی ئەو ژنە ئەتوار غەریبەی کە لەنێو گالیسکە جوانەکەیەوە سەری کێشاو بانگی لە یەڤگینی پاڤلوفیچ کردبوو، لە هزر و بیریا گەورە بووەوە، کۆمەڵێک مەودای ترسناکی مەتەڵۆک ئاسای وەرگرت. بەلای میرزادەوە، جەوهەری ئەو مەتەڵە، بەدەر لە لایەنەکانی تری، ئەمە بوو کە بەردەوام، بە نیگەرانییەوە لە خۆی دەپرسی: ئایا گوناحی ئەم

ڕووداوە نەشازە لە ئەستۆی ئەوە یان لە ئەستۆی...؟ بەڵام نەیدەگەیانە ئەوەی ناوی ئەو کەسە بەرێت کە لەگین بوو گوناحبار بێ، بەڵام پیتەکانی هەوەڵی ناوەکە، کە بریتی بوو لە (ن، ف، ب) بەلای ئەوەوە گەمەیەکی بێگەردی منداڵانە بوو، نەک ئەوەی نەدەهێنا پیاو هەڵوەستەی لەسەر بکات، بەڵکو بە عەیبەشی دەزانی.

بەڵام بۆ سبەینێ هەمان شەوکۆڕی نەنگین، کە میرزادە خۆی بە سەبەبکاری سەرەکی دەزانی، میرزادە (س...) و ئادیلاید، بە دوو قۆڵی، پاش پیاسەی بەیانیی ناو باخەکە، بە مەبەستی هەواڵپرسین، سەری میرزادەیان دا. دیارە میرزادە زۆری پێ خۆش بوو. ئادیلاید، لە باخەکەدا چاوی بە درەختێکی کۆنە ساڵی، بەشکۆی، چڕە لق و پۆی، بە گرێ گرێ، پێچاوپێچی، تازە گەڵاکردووی، قەد کلۆر، کەوت. کەوتە خەیاڵی نیگارکێشانی پیرەدرەخت. بە درێژایی ماوەی سەردانەکەیان کە نیو سەعاتی خایاند، هەر باسی ئەو دارەی کردبوو. میرزادە (س...) وەکو هەمیشە بەوپەڕی نەزاکەتەوە دەگەڵ میرزادەدا باسی ڕابوردوو و بیرەوەرییەکاین هەوەڵی یەکدی ناسینی خۆیانی دەکرد. کەم و زۆر باسی ڕووداوەکانی دوێشەوی نەکرد. ئەنجام ئادیلاید، خۆی پێ نەگیرا و بەدەم پێکەنینەوە دانی بەوەدانا، کە بە دزییەوە هاتوونەتە دیدەنی میرزادە، جگە لەوە هیچی تری نەگوت، بەڵام میرزادە لە فیکەی خۆی حاڵی بوو، یەکسەر زانیی کە ئەم پەنهانکارییە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە دایک و بابی ئادیلاید، بە تایبەتی دایکی، واتا لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، هێشتا لێی (لە میرزادە) زویرن، بەڵام بەدرێژایی ئەم دیدارە، نە ئادیلایدو نە میرزادە (س...) شتاقیان ناوی خانم یەپانچین یان ئاگلایاو تەنانەت ئیڤان فیدوروویفیچیان نەهێنا.

کاتێ هەستان، گەڕان و پیاسەکەیان تەواو بکەن، میرزادەیان خوڵک نەکرد لەگەڵیاندا بچێتە گەڕان و پیاسە. تەنانەت بۆ ماڵەوەش خوڵکیان نەکرد، بەڵام ئادیلاید، قسەیەکی لە دەم دەرچوو کە بۆ میرزادە دڵخۆشکەرە بوو، بەدەم باسی تابلۆیەکی ئاوی خۆیەوە، گوتی: کە حەز




دەکات پیشانی میرزادەی بدات، حەز دەکات میرزادە بیدینێ. پرسیی: "چۆن، بتوانم لە زووترین کاتا تابلۆکەت نیشان بدەم"... هەر خۆی وەڵامی خۆی دایەوە: "... ئەگەر ئەمڕۆ کولیا هات بۆ ماڵمان بەودا بۆتی دەنێرم، ئەگەر ئەو نەهات، ئەوا سبەی بەیانی، کاتێ دەگەڵ میرزادەدا (س...) بۆ پیاسە و گەڕان هاتم، بە خۆم بۆتی دێنم."

بەو جۆرە، مەسەلەکەی چارەسەر کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی توانیبووی بە شێوەیەکی لە باری ئەوتۆ کە هەموو لایەک ڕازی بن، مەسەلەکەی چارەسەر کردبوو.

ئەنجام، کاتێ لێبڕان دووعاخوازی لە میرزادە بکەن و بڕۆن، میرزادە (س...) وەک بڵێی لەپڕ شتێکی بیر کەوتەوە، ڕووی کردە میرزادە و پرسیی:

– ئا، بیرم کەوتەوە، ئەرێ لیون نیکولا یوفیچی ئازیز، نەتزانی ئەو خانمەی کە دوێشە و لە ناو گالیسکەکەیەوە بانگی لە یەڤگینی پاڤلوفیچ کرد کێ بوو؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو، چما نەتناسیەوە؟ بەڵام نەمزانی کێی لەگەڵ بوو!

میرزادە (س...) بەگەرمی گوتی:

– دەیناسم، چونکە ناوبانگیم بیستووە، بەڵام مەبەستی لەو کارە چ بوو؟ سەرم لە قسەکانی دەر نەکرد، مەتەڵ بوو، چ بۆ من و چ بۆ ئەوانی دی مەتەڵ بوو.

میرزادە، زۆر بە سادەیی بەرسڤی دایەوە:

– باسی سفتە و سەنەدانی یەڤگینی باڤلوفیچی کرد کە نازانم چین، گوتی کە ڕوگوژین، لەسەر داوای ئەو، سفتەکانی لە کابرایەکی سووتخۆر کڕیوەتەوە و ڕوگوژین، بەو زووانە داوای پارەکەی لێ ناکاتەوە. یانی دەرفەتی دەدات و گوشاری ناخاتە سەر.

– ئەوە دەزانم برای ئازیز، بەڵام ناچێتە ئەقڵەوە! یەڤگینی پاڤلوفیچ، هەرگیز سەنەد و سفتەی وەهای ئیمزا نەکردووە! ئاخر زۆر لەوە

دەوڵەمەندترە، شتی وا ئیمزا بکا. ڕاستە کاتی خۆی بە هۆی سەرسەرێتی و سەرکێشی خۆیەوە تووشی شتی وا بووە و من بەخۆم کۆمەکم کردووە، بەڵام بەم سەروەت و سامانە زۆرەی ئێستایەوە مەحاڵە سفتە و کۆمپیاڵە بۆ بابایەکی سووتخۆر ئیمزا بکات و هەنوکە خەمی دانەوەی بێت. هەروەها مەحاڵیشە ئەو دۆستایەتییە نزیکەی دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا هەبێت، کە ناستاسیا بێ هیچ شەرم و شورەیەک بە ناوی خۆیەوە، بە ناوی ڕووتی خۆیەوە، بەو جۆرە گازی بکات. ڕازی مەسەلەکە لەمەدایە. گەورەترین سوێند دەخوات کە عیلم و ئاگاو خەبەری لەم مەسەلەیە نییە، من یەک لە باری خۆم باوەڕی پێ دەکەم. جا میرزادە گیان، پرسیار ئەمەیە: کە ئایا تۆ هیچ لەمبارەیەوە دەزانی؟ مەبەستم ئەوەیە: ئایا بەڕێکەوت هیچ دەنگۆیەکت لەو بارەوە بە گوێ نەگەیشتووە؟

– نا، نەخێر هیچی لەبارەوە نازانم، باوەڕم پێبکە کە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبووە و نییە.

– میرزادە، ئەمڕۆکە جۆرێکی لە بەرچاوم، لە بەرچاوم گۆڕاویت، دەڵێی ناتناسم! تۆ بڵێی شتی وام بە خەیاڵدا بێت کە دەستێکت لە مەسەلەیەکی وەهادا هەبێ؟... دەی... تۆ ئەمڕۆکە تا ڕادەیەک بێحەواس و بێتاقەتی.

بەدەم ئەو قسانەوە میرزادەی لە هەمێز گرت و ئەملا و ئەولای ماچ کرد.

لیون نیکولایوفیچ گوتی:

– مەبەستت لە دەستێکت لە "مەسەلەیەکی وەهادا هەبێ" چییە؟ من هیچ مەسەلەیەک لەئارادا نابینم.

میرزادە "س..." بە زمانێکی وشک بەرسڤی دایەوە:

– هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەم ژنە ویستویەتی، بەوەی بە بەرچاوی خەڵکانێکەوە، هەندێ کار و کردەوە بداتە پاڵ یەڤگینی پاڤلوفیچ کە هەرگیز لەو ناوەشێتەوە، تا ناوی بزڕێنێ و عەیبداری بکات.

میرزادە لیون نیکولایوفیچ، هەستی بە جۆرە پەشێوییەک دەکرد، بەڵام نیگای پەریشانی لە میرزادە (س...) کە بێدەنگ بووبوو، نە دەگواستەوە.

ئەنجام میرزادە، بە جۆرە بێقەراریەکەوە گوتی:

- باشە مەسەلەکە هەر مەسەلەی سفتە و کومپیالە نییە؟ قسەکانی دوێنێ هەر ئەوە نەبوو؟ یانی ناشێت مەسەلەکە هەر ئەوە بێ کە ئەو ژنە دەیگوت؟

- ئاخر تۆ گوێ بگرە، من شتەکەت پێ دەڵێم و تۆ خۆت داوەر بە: ئاخر دەبێ چ شتێکی هاوبەش لەنێوان یەڤگینی پاڤلوفیچ و ئەو...دا هەبێت، یان لەنێوان یەڤگینی و ڕوگوژیندا؟ دووبارەی دەکەمەوە و دڵنیات دەکەم کە یەڤگینی یەجگار دەوڵەمەندە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو تاقە میراتگری مامیەتی، گشت سەروەت و سامانەکەی مامی بەو دەبڕێت. ناستاسیا فیلیپوڤنا تەنیا....

میرزادە (س...) لەپڕ بێدەنگ بوو. دیار بوو نەیدەویست لەوەی پتر باسی ناستاسیا فیلیپوڤنا بکات.

میرزادە لیون نیکولایوفیچ، دوای بێدەنگییەکی کەم پرسیی:

- باشە، ئەمە نیشانەی ئەوە نیە کە ئاشنایەتی دەگەڵدا هەیە؟

- لەگینە، زۆریش ڕێی تێدەچێ. کابرایەکە ئەهلی ڕابواردن و تۆلازییە! بەهەرحاڵ ئەگەر شتی واش هەبێ، یەکیانیش ناسیبێ، هیی ئێستا نییە، کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ دوو سێ ساڵ لەوە پێش. ئەوسا هێشتا پەیوەندیی دەگەڵ توتسکیدا هەبوو، بەڵام ئێستا هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نەماوە. بەهەرحاڵ، پەیوەندییەکەیان قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی بە ناوی خۆیانەوە یەکدی گاز بکەن. تۆ بەخۆت دەزانی کە ناستاسیا فیلیپوڤنا تا ئەم دواییەش لێرە نەبووە و کەس نەیزانیوە لەکوێیە و لە هیچ شوێنێک نەبینراوە. تا ئێستاش زۆر کەس نازانن کە گەڕاوەتەوە. من یەک لە باری خۆم، هەمووی سێ ڕۆژە، گالیسکەکەیم دیتووە.

ئادیلاید گوتی:

- کە گالیسکەیەکی کەشخەیە!

- گالیسکەیە نە گاڵتە!

جووتە میوان، زۆر دۆستانە و وەکو ئەوەی دووعاخوازی لە برایەکی خۆیان بکەن، بەو ئاوایە ماڵاواییان لەمیرزادە کرد و ڕۆیشتن.

بەڵام ئەم دیدارە بۆ میرزادە بایەخێکی یەجگار گەورەی هەبوو. میرزادە لە دوێنێ شەوەوە، لە ڕووداوەکانی دوێنێ شەوەوە (ڕەنگە پێش ئەوەش) تووشی ترس و بەدگومانیەکی زۆر بووبوو، بەڵام تا ئەم دیدارە لە بەدگومانیەکانی خۆی دڵنیا نەبوو، بەڵام هەنوکە خەریک بوو، هەندێ بەرچاو ڕوونی لەلا دروست دەبوو: هەڵبەتە ڕاڤە و شرۆڤەی میرزادە (س...) بۆ ئەم ڕووداوە هەڵەبوو، بەڵام لەو ڕووەوە کە هەستی دەکرد پیلان و داوێک لە گۆڕێیە لە ڕاستییەوە نزیک بوو. (میرزادە لەبەر خۆیەوە دەیگوت: لەگینە هەموو شتێک بزانێت، بەڵام نایەوێ قسە بکات و بە ئانقەست ڕووداوەکە بە هەڵە لێکبدەداتەوە). هەڵبەتە بە ئاشکرا دیار بوو کە ئەو جووتە (بە تایبەتی میرزادە "س...") بۆ ئەوە هاتبوونە دیدەنی ئەو تا زانیارییەکیان دەست بکەوێت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە پێیان وایە میرزادە ڕاستەوخۆ دەستی لە دەسیسە و پیلانەکەدا هەیە. بەم پێودانگە، ئەگەر مەسەلەکە وا بێت و ئەوەندە خەتەر و ترسناک بێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانە و بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو "ژنە" ئۆێنێکی لە بن سەردایە، نیازو ئامانجێکی ترسناکی هەیە، بەڵام ئەو ئۆینە، ئەو نیاز و ئامانجە چییە؟ چ پرسیارێکە! "بەڵام چۆن دەکرێ ژێوان بکرێتەوە لەو ئامانجە؟ بەڵام کە بڕیاری شتێکی دا، هێز نییە ڕێی لێنبگرێ، هەر دەبێ بگات بە مەبەست و ئامانجی خۆی". میرزادە بە تەجرووبە ئەوەی بۆ ساغ بووبووەوە. "شێتە! شێتی تەواوە".

میرزادە، زۆر بێتاقەت بوو، خەمێکی قووڵ سەرو دڵی گرتبوو، ئەو ڕۆژە دنیایەک نهێنی و مەسەلەێن ئاڵۆز بە کەڕەتێ بەرۆکی هزرو بیریان گرتبوو، هەر هەمووشیان پێویستیان بە ڕوونکردنەوە و چارەسەری بەپەلە بوو.

ڤیرا لیبدیفا، کە لیوبوتشکای خوشکی بە باوەشەوە بوو، هاتە لای و ماوەیەکی بە قسەی خۆشەوە لەگەڵیا بردەسەر. میرزادە بەمە تۆزێک دڵی کرایەوە. ئەوسا خوشکە چکۆلەکەی هات، پاشان کوڕە خوێنکارەکەی (قوتابیی ئامادەیی) لیبدیف، هات و گوتی بە پێی ڕاڤە و لێکدانەوەی بابی،

ئەو هەسارەی ئەفسنتینەی کە مکاشەفەی یوحەنا دەڵێت لە ئاسمانەوە، لەلای سەرچاوەی ئاوان کەوتووەتە سەر زەوی، خۆی لە خۆیدا پێشبینی ئەو تۆڕی هێڵی ئاسنەیە کە ئەمڕۆ بە ئەورووپادا ڕاکێشراوە. میرزادە باوەڕی نەدەکرد ئەم ڕاڤە و شرۆڤەیە هیی لیبدیف بێ، بۆیە لێبڕا لە نزیکترین دەرفەتدا، موناقەشەی ئەمە دەگەڵ لیبدیف خۆیدا، بکات.

ڤیرا لیبدیفا، بۆ میرزادەی گێڕایەوە کە کیللەر لە دوێنێوە لە ماڵی ئەوانە، وەکو مێمڵ لە ماڵی ئەوان دایکوتاوە و لەوە ناچێ بەو زووانە بڕوات، چونکە ئێرەی لێخۆش هاتووە و هاونشینی جەنەراڵ ئیڤولگینی لە گیان خۆشە و گوتوویەتی بە مەبەستی تەواوکردن و زیادکردنی زانیاری و ڕۆشنبیریی خۆی لای ئەوان دەمێنێتەوە.

میرزادە، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر هۆگری منداڵەکانی لیبدیف دەبوو. کولیا، ئەو ڕۆژە لە هیچ شوێنێکەوە دەر نەکەوت: لە بەیانی زووەوە بۆ پترسبۆرگ ڕۆیی بوو. (لیبدیف-ش لە بەرەبەیانەوە بە کارێکی شەخسی دەرچووبوو.)

بەڵام میرزادە، بە تاسەوە چاوەڕێی هاتنی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بوو کە قەراربوو بە ڕۆژەوە سەری بدات، بەڵام ئێوارەیەکی درەنگ، لەنێوان سەعات شەش بۆ حەوت، پەیدا بوو. میرزادە هەرکە چاوی پێکەوت، لە یەکەم نیگاوە ئەوەی لادروست بوو کە گانیا دەبێ ئاگای لە هەموو ڕازو نهێنییەکانی مەسەلەکان هەبێت، بە تایبەتی کە قسەبەران و دوو زمانانی وەکو ڤارڤاراو مێردەکەی لەبەر دەستدا بوون، بەڵام پەیوەندی نێوان میرزادە و گانیا، پەیوەندییەکی هەندێ تایبەتی بوو. بۆ نموونە میرزادە، مەسەلەکەی بوردوفسکی بەو سپاردبوو و تکای لێ کردبوو ئەو کارەی بۆ ئەنجام بدات، بەڵام وێڕای ئەم متمانەیە و زۆر شتی پێشووتریش، هەندێ بابەت هەبوون کە خۆ بە خۆو بە بێدەنگی لەسەری ڕێکەوتبوون کە خۆیان لە باسکردنی نەدەن. میرزادە هەندێ جار هەستی دەکرد کە ڕەنگە گانیا حەز بکات دۆستایەتییەکی تۆخیان بکەوێتە نێوان و بەوپەڕی ڕاشکاوی و بەدەر لە هەر پارێزێ یەکدی بدوێنن و گرێی دڵیان بۆ یەکدی بکەنەوە. بۆیە هەر کە گانیا وەژوور کەوت، میرزادە یەکسەر هەستی کرد،

کە بە باوەڕی گانیا کاتی ئەوە هاتووە دیواری بێدەنگی نێوانیان بشکێنرێت، (بەڵام گاڤریلا ئاردالیونوفیچ پەلەی بوو، چونکە خوشکەکەی لە ماڵی لیبدیفدا بۆ کارێکی پێویست چاوەڕوانی دەکرد و دەبوایە پێکەوە یەکلایی بکەنەوە).

هەڵبەتە گانیا، لەوەدا زۆر هەڵە بوو، کە بەتەما بوو میرزادە، بە دەمرێژی پرسیاران دای بگرێتەوە و خۆ بە خۆ زۆر شتی بۆ کەشف بکات و بێپەردە ناخی خۆی بۆ هەڵڕێژێ و گرێی دڵی بۆ بکاتەوە. ئەو خەیاڵپڵاوەی کەڕوی هەڵهێنا، چونکە بە درێژایی ماوەی دیدارەکە، کە بیست دەقیقەی خایاند، میرزادە تەواو چووبووە ژێری و دەگەڵ خولیاکانی خۆیدا دەژیا، مات و خەمین لە فکران ڕاچووبوو. بەم جۆرە، پرسیارە چاوەڕوانکراوەکان، یان ئەو پرسیارە سەرەکییەی کە گانیا چاوەڕوانی بووە، نەکران. ئیدی گانیاش هەستی کرد باشتر وایە بێدەنگی لێ بکات و لەسەری نەڕوات. ڕاستە بە درێژایی بیست دەقیقەکە دەمی لێک نەنا، قسەی دەکرد، نوکتەی دەگوت، پێدەکەنی، بەڵام خۆی لە بابەتە سەرەکییەکە دەبواردو نەدەچوو بەلایا.

یەکێک لەو شتانەی گێڕایەوە ئەوە بوو کە ناستاسیا فیلیپوڤنا چوار ڕۆژە هاتووەتە پاڤلوفسک و بووە بە مایەی سەرنجی خەڵکی. گوتی دەگەڵ داریا ئەلکسیڤنادا، لە خانوویەکی بچکۆلەی خۆشدا لە شەقامی ماترۆسکیدا دەژی، بەڵام گالیسکەکەی ڕەنگە جوانترین گالیسکە بێت لە پاڤلوفسک دا. هەر لە ئێستاوە کۆمەڵێک هەواداری گەنج و پیر لە دەوری خڕبوونەتەوە، ژمارەیەک ئەسپسوار هەندێ جار بەگەڵ گالیسکەکەی دەکەون. ئەویش وەکو خووی هەمیشەی لە هەڵبژاردنی دۆست و ئاشنایانی خۆیدا یەجگار سەختگیرە، تەنیا دۆستایەتی کەسانی هەڵبژاردەی قەبووڵە، بەڵام وێڕای ئەمەش هەوادارانێکی زۆری پەیدا کردبوو، کە ئامادە بوون لە کاتی پێویستدا ئەوپەڕی داکۆکی لێ بکەن. بە هۆی ئەوەوە کابرایەکی جووتیاری پاڤلوفسک، لە دەزگیرانەکەی جیا بووبووەوە، جەنەراڵێکی پیریش، چیوای نەمابوو لەسەر ئەو، کوڕەکەی خۆی بە نەعلەت بکات. کە بە گالیسکەکەی بۆ گەڕان دەر دەچێت، زۆر جار کیژۆڵەیەکی یەجگار خشکۆک و زێبای

تەمەن شازدە ساڵ، کە دوورە خزمێکی داریا ئەلکسیڤنایە، دەگەڵ خۆیدا دەبات. ئەم کیژە گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشە، شەوانە خەڵکی گەڕەک، بە خۆشی دەنگی ئەوەوە دەچنە ماڵیان و لەوێ خڕدەبنەوە. ناستاسیا فیلیپوڤناش زۆر بە خۆی ڕادەگات، بایەخ بە جلوبەرگی خۆی دەدات.

جلەکانی سادەن، بەڵام یەجگار پڕ زەوق و سەلیقەن، ئیدی هەموو خانمان بەغیلی (سەلیقە، جوانی و گالیسکەکەی) پێدەبەن. گانیا لە زمانی دەرچوو و گوتی: ئەو فەرتەنەیەی دوێنێش، پێشوەختە نەخشەڕێژی کرابوو، نابێ لەسەر ئەو حیساب بکرێت، پێویستە تاوانبار بدۆزرێتەوە، دەنا خەڵکی نە هەقی دەرهەق دەکەن و لێی دەخوێنن، دەبینی بەو زووانە دەبێ بە داستان و دەکەوێتە سەر زاران.

گانیا، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە میرزادە لێی بپرسێت چۆن دەزانێ فەرتەنەکەی دوێنێ، پێشوەختە زەمینەسازیی بۆ کراوە، بۆچی قەناعەتی وایە کە خەڵکی بەو زووانە لە ناستاسیا دەکەونە خوێندن، بەڵام میرزادە خۆی لەو دوو خاڵە نەکردە خاوەن و هیچ پرسیارێکی لەبارەیانەوە نەکرد.

گانیا دوای ئەوە، بە بێ ئەوەی میرزادە هیچ پرسیارێکی لێ کردبێت، بە خوایشتی خۆی، بە دووروودرێژی کەوتە باسی یەڤگینی پاڤلوفیچ. ئەم کارەی گانیا سەیر بوو، بە تایبەتی کە بێ هیچ پێشەکییەک، خۆ بە خۆ ئەو باسەی کردبووەوە. لە یەکێک لە قسەکانیا گوتبووی کە بە قەناعەتی ئەو یەڤگینی پاڤلوفیچ لەوە پێش هەرگیز ناستاسیا فیلیپوڤنای نەناسیوە و قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیوەندیی لەگەڵیا نەبووە، تەنانەت پەیوەندیی ئێستاشیان لە سنووری سڵاو تێ نەپەڕیوە.

سێ چوار ڕۆژێک لەمەپێش، لە پیاسەیەکدا، سووکە تەعاروفێکیان پێکراوە و تەواو. باوەڕ ناکەم چ بەتەنیا و چ لەگەڵ خەڵکیدا بۆ تاقە جارێکیش چووبێتە ماڵی ناستاسیا.

بەڵام مەسەلەی سفتە و کۆمپیالەکان، لەگینە ڕاست بێ (گانیا لەمە دڵنیا بوو). دروستە یەڤگینی پاڤلوفیچ دەڵەمەندێکی گەورەیە، بەڵام "کاروباری بەڕێوەبردنی موڵکەکانی، بێسەروبەرە"....

گانیا لەپڕ لەم شوێنە هەستیارەدا باسەکەی بڕی. دەربارەی ڕەفتارەکەی دوێشەوی ناستاسیا فیلیپوڤناش، جگە لەو ئاماژەیەی کە لە هەوەڵەوە بۆ ئەو ڕەفتارەی کردبوو، هیچی تری نەگوت و لەسەری نەڕۆیشت.

ئەنجام ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا هات بەدوای گانیادا. تەنیا یەک دوو دەقیقەیەک لای میرزادە گیر بوو، لەو ماوە کورتەدا (بە بێ ئەوەی میرزادە پرسیاری هیچی لێ بکات) توانی ئەوەی بۆ بگێڕێتەوە کە یەڤگێنی پاڤلوفیچ ئەمڕۆ چووە بۆ پترسبۆرگ و لەگینە ئەمشەو و سبەیش لەوێندەر بەرێتەسەر. مێردەکەشی، واتە ئیڤان پتروفیچ پتیتسن-ش، حاڵی حازر لە پترسبۆرگە و پێدەچێ بەکاری یەڤگێنی پاڤلوفیچ، کە پێویستی بە کۆمەک بوو، بۆ ئەوێندەر چووبێت. دیارە شتێک لەئارادایە. لە کاتی ڕۆیشتناو بەسەر پێوە ئەوەشی گوت کە لیزاڤێتا پروکوڤیڤنا، ئەمڕۆ بێتاقەتە، لە دەوروبەرەکەی بێزارە. ئاگلایاش (ئەمەیان سەیرە) دەگەڵ هەموو ئەندامانی ماڵباتەکەیاندا بە شەڕ هاتووە، نەک هەر دەگەڵ داک و بابیدا، بەڵکو دەگەڵ هەر دوو خوشکەکەشیاو ئەم کارە" هەرگیز کارێکی باش نییە. "ڤارڤارا هەرکە بە کورتی ئەو هەواڵانەی گێڕایەوە (کە بەلای میرزادەوە و بۆ ئەو، هەواڵی زۆر گرینگ و هەستیار بوون) دەگەڵ براکەیدا ڕۆیشت. گانیا، بە تاقە وشەیەکیش باسی مەسەلەی (کوڕەکەی پاڤلیشچوف)ی نەکرد، ئیدی یان لە تەوازوعی خۆی بوو یان بۆ "مدارای هەستی میرزادە" بوو. وێڕای ئەمەش میرزادە، جارێکی دی سوپاسی کرد، کە ئەو کارەی بۆ کردووە و زەحمەتی کێشاوە و سەرکەوتووانە مەسەلەکەی بۆ یەکلایی کردەوە.

میرزادە، کە ئەوان ڕۆیشتن و بە تەنیا مایەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو، لە بانیژەکەوە دابەزی و بەجادەکەدا بۆ باخچەکە پەڕییەوە. دەیویست بیربکاتەوە، شتێک هەبوو دەبوا بڕیاری لێ بدات، بەڵام ئەم بڕیارانە لەو بڕیارانە نەبوون کە پیاو بیریان لێ بکاتەوە، بەڵکو لەوانە بوون، یەکسەری و بێ بیرکردنەوەی پێشوەختە بڕیاری لێ بدەیت. لەپڕ ئارەزوویەکی ترسناک هات بە دڵ و دەروونیا کە هەموو شتێک بەدەقی خۆیەوە بەجێ بێڵێ و بێ ئەوەی خوا حافیزی لە هیچ کەسێک بکات، سەری خۆی

هەڵگرێت و بڕواتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو، بۆ ئەو شوێنە دوورەدەست و تەریکەی لێوەی هاتبوو. دەترسا ئەگەر چەند ڕۆژێکی دیکە لە پاڤلوفسک بمێنێ، بە جۆرێک لەم کێشە و گرفتانەوە دەئاڵێ کە دەرچوونی نەبێت، بەڵام دوای بیرکردنەوەیەکی دە دەقیقەیی، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هەڵاتن مەحاڵە، بگرە ترسنۆکیشە، چونکە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کێشەیە کە لەسەریێتی چارەسەریان بکات، یان بەلای کەمەوە هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ چارەسەریان بخاتە گەڕ. دوای پیاسەیەکی چارەکە سەعاتی، میرزادە بەو بارە دەروونییە پەشێوەوە بۆ ماڵ گەڕایەوە. لەو ساتەدا هەستی کرد کە کابرایەکی یەجگار نەگبەت و کڵۆڵە.

لیبدیف هێشتا نەگەڕابووەوە. بۆیە کیللەر، دەمە و ئێوارە خۆی گەیاندە لای میرزادە، کیللەر سەرخۆش نەبوو، بەڵام لە حاڵەتێکی دەروونی وەهادا بوو، کە ئامادە بوو گرێی دڵی خۆی بۆ میرزادە بکاتەوە. بۆیە هەرکەوەژوورکەوت خێرا گوتی هاتووە تا سەربهووردی ژیانی خۆی بە دووروودرێژی و بە ڕاشکاوی بۆ میرزادە بگێڕێتەوە و هەر بەو نیازەش لە پاڤلوفسک ماوەتەوە. میرزادە ڕزگاربوونی نەبوو، چونکە ئەگەر دەریشی کردبا، یارۆ هەر نەدەڕۆیشت. کیللەر خۆی بۆ حیکایەتێکی دووروودرێژ ئامادە کردبوو، بەڵام دوای چەند ڕستەیەکی پچڕ پچڕ و بێسەروبەر هاتە سەر کۆتایی بەسەرهاتەکەی و دانی بەوەدا نا "بەڕادەیەک بەها ئەخلاقییەکانی ژێر پێناوە" کە (هەڵبەتە بە هۆی بێباوەڕی بە خوا) تەنانەت پەنای بردووەتە بەر دزییش. گوتی:

- دەتوانیت تەسەوری شتی وابکەیت؟

میرزادە گوتی:

- گوێ بگرە کیللەر، ئەگەر من لەجیاتیی تۆ بام، مەگەر زۆر زەرووری با، دەنا دانم بەمەدا نەدەنا. لەوە دەچێت، بە ئانقەست بوختان بۆ خۆت بکەی....

- من ئەم قسەیە تەنیا لای تۆ دەکەم، هەر تۆ و بەس، ئەویش بەو مەبەستەی خۆم چاک بکەم. ئەمە لای کەسی دی باس ناکەم، ئەم سرە

لەگەڵ خۆما دەبەمە گۆڕەوە، بەلاّم میرزادە خۆزگە دەتزانیّ پارە پەیداکردن لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا چەند قورسە! پێم ناڵێی پارە لەکویّ پەیدا بکەم؟ ببورە کە ئەو پرسیارە لە تۆ دەکەم! ئەو پرسیارە لە هەر کەسێک دەکەیت، هەر یەک وەلاّمت گویّ لێدەبێت: " زێڕو ئەڵماس بخە بارمتەوە، هەنگیّ دەتوانی بڕە پارەیەک وەر بگریت". ئیّ ئاخر من زێڕو ئەڵماسم لەکویّ بوو! باوەڕ دەکەی؟ ئەنجام، سەبرم سوا و گوتم: "باشە زومڕود بە ڕەهن وەر دەگرن؟" یارۆ گوتی: " بەڵیّ، زومڕودیش دەبێت". ئەوسا کلاّوەکەم کردە سەرم و بەدەم دەرچوونەوە گوتم: "زۆر چاکە. خوا بتانبڕیّ،ماڵتان ئاوا نەبیّ، ناکەس بەچانە!". بەسەری خۆم! ڕێک وام گوت.

- باشە زومڕودت هەبوو؟

- من و زومڕود؟ ئاە میرزادە، تۆ هێشتا تەسەورێکی سادە و بێگەردی دێهاتیانەت لەمەڕ ژیان هەیە!.

بەهەرحاڵ قسەکانی کیللەر، زیاتر میرزادەیان خەجاڵەت کرد تا بەزەیی و سۆزی بێدار بکەنەوە. بیرۆکەیەک، بروسکەئاسا لە مێشکیدا بلاّچەی دا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "باشە ناکرێت لە ڕێگەی کەسێکی دەستڕۆوە، کارێک بۆ ئەم کابرایە بکریّ؟" بەلاّم هەرچی سەری دێناو سەری دەبرد لەبەر کۆمەڵێک هۆ خۆی بە گونجاو نەدەزانی بۆ ئەو کارە، نەک لەبەر تەوازوع، بەڵکو لەبەر ئەوەی بوو کە بە شێوازێکی تایبەتی مامەڵەی لەگەڵ کاروبارەکاندا دەکرد. بەرەبەرە بەدەم گفتوگۆوە گەرم بوون و نیازیان نەبوو وا زوو لێکدی جیا ببنەوە. کیللەر بەدەم قسانەوە کەوتە ئیعتراف کردن، ئیعترافی بە کاروکردەوەی وەها دەکرد کە پیاو تەسەوری نەدەکرد کەس ئیعتراف بەو جۆرە کارانە بکات، کەس ئەو جۆرە کارانە لەقاو بدات. لەگەڵ هەر دانپێدانان و ئیعترافێکدا، لە کانگای دڵەوە سوێندی دەخوارد کە لە پەشیمانیا "فرمێسک لە چاوانی دەڕژیّ"، وێڕای ئەوەش، کە باسی کارە قوڕەکانی خۆی دەکرد، وات هەست دەکرد بە جۆرە شانازیەکەوە دەیان گێڕێتەوە، کەچی هەندیّ جار هێندە کۆمیدییانە دەی گێڕانەوە کە سەر بە قوڕی دێنایە پێکەنین... ئیدی خۆی و میرزادە، شێتانە کەوتنە پێکەنین.

میرزادە، ئەنجام گوتی:

- تۆ متمانەیەکی منداڵانەت بە خۆت هەیە، لەڕادەبەدەر ڕاشکاو و ڕاستگۆیت، ئەمە سوخەتێکی زۆر گەورەیە، دەزانی ئەم سیفەتەوا لە پیاو دەکات لە زۆر هەڵە و عەیب و عارت خۆش بێ و چاوپۆشیت لێ بکات؟

کیللەر، کە قسەکانی میرزادە زۆر کاریان تێ کردبوو و دڵی ناسک بووبووەوە، بەرسڤی دایەوە:

- میرزادە، من لە ناخا کەسێکی پاک و جوامێرم، تەنیا بە تەبیعەت وام، جا ئەمە بەچ دەچێ، فایدەی چییە، مەرج کردەوەیە. ئەمە لە واقیعدا نایەتە دی، هەر خەیاڵە. نازانم بۆ وایە؟ لەمە تێناگەم.

- گوێ مەدەیە. ڕەشبین مەبە. هەنوکە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە تۆ گرێی دڵی خۆت بۆ من کردەوە. من یەک لە باری خۆم باوەڕ ناکەم هیچ شتێک مابێت، بۆ منت کەشف نەکردبێ. وا نییە؟

کیللەر، بە زمانێکی لاقە ئامێزەوە هاواری کرد:

- هیچ شتێک نەمابێت؟ ئاە، میرزادەگیان! بیرکردنەوەی تۆ دەربارەی تەبع و تەبیعەتی ئادەمیزاد، زۆر سویسرییانەیە!

میرزادە، هایم و حەیران، بەجۆرە شەرمێکەوە گوتی:

- مەبەستت ئەوەیە جگە لەو شتانەی گوتت، هێشتا هیی دیکەش ماون؟ باشە کیللەر، تۆ بۆچی هاتی بۆ لای من، بە چ ئومێدێ ئەم شتانەت بۆ من گێڕانەوە؟ چاوەڕوانی چیت لە من دەکرد؟

- چاوەڕوانی چیم لێ دەکردیت؟ بۆچی هاتم بۆ لای تۆ؟ یەکەم پاکی و سادەیی و ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی تۆ ئەفسوونی خۆی هەیە و گفتوگۆ دانیشتن لەگەڵ تۆدا، خۆی لە خۆیدا مایەی لەزەت و خۆشحاڵیە. بەلای کەمەوە دەزانم ئەو پیاوەی کە لە هەنبەرم دانیشتووە، پیاوێکی چاک و سەرڕاست و دروستکار و بێ شێلەوبێلەیە، دووەم... دووەم... کیللەر، قسەکەی تەواو نەکرد.

میرزادە، بە ڕاشکاوییەکی شەرمنانە و بە جیددی گوتی:

- یان هاتوویت داوای قەرزم لێبکەی؟

کیللەر، ڕاچڵەکی. سەرسام و حەپەساو، ڕاستەوخۆ چاوی بڕییە دوڕ چاوانی میرزادە، مستێکی توندی بە مێزەکەدا کێشا و گوتی:

- بە ڕاستی میرزادە تۆ بنیادەم کڕ دەکەیت! تۆ ئەوەندە پاک و سادە و ساویلکەی کە سەردەمی زێڕینیش شتی وای بە خۆوە نەدیتووە! لە لایەکی دیکەوە ڕێک بیری بەرانبەرەکەت دەخوێنیتەوە، بە زەبری بە سیرەتی خۆت لە واری دەروونناسیدا، دەچیتە ناخی ناخی مرۆڤەوە، وەکو تیر بنیادەم دەبڕیت و دەچیتە ناخی ناخیەوە. بمبورە میرزادە کە ئەوە دەڵێم. ئەمە شتێکە ڕاڤە و شرۆڤەی زۆر هەڵدەگرێت... بە ڕاستی من حەپەسام. زمانم چووە کلیلە! دروستە من بەو نیازە بووم کە لە دوا ئەنجامدا داوای قەرزت لێبکەم، بەڵام تۆ بە شێوەیەک پرسیارەکەت لێ کردم، وەکو ئەوەی هیچ عەیبەیەک لەم کارەدا نەبینی و مایەی هیچ لۆمەیەک نەبێت، کارێکی زۆر ئاسایی بێت...

- بەڵێ، بەلای تۆوە زۆر ئاساییە.

- باشە تۆ بەمە نارەحەت نابیت؟

- نا، بۆچی نارەحەت ببم؟

- دەیسا گوێ بگرە میرزادە: من لە دوێ شەوەوە لە (پاڤلوفسک)م، یەکەم لەبەر خاتری خۆشەویستی تایبەتیم بۆ ئوسقوفی فەرەنسی بوردالۆ* (لیبدیف تا سەعات سێی بەرەبەیان هەر پێکی تێ کردووە). دووەم لەبەر مەبەستە تایبەتیەکەی خۆم (بە چل بار خاچ درۆت لەگەڵ ناکەم) چونکە دەمویست بە ڕاشکاوی، بێپەردە، باسی وەزع و حاڵی خۆمت بۆ بکەم، بەو نیازەی کەمێک پاک ببمەوە و لە ڕووی ئەخلاقییەوە بێمەوە تایم. بەو نیازو خەیاڵانەوە، نزیکی سەعات چوار، چاو بە گریان چوومە ناو جێگای خەوەوە. باوەڕ بە قسەی پیاوی دڵپاک و ئابڕومەند دەکەی؟ ڕێک لەو کاتەدا کە بەدەم فرمێسک ڕشتن و هەنسک هەڵدانەوە (هێشتاش جوان لە بیرمە کە زۆر گریام) چوومە ناو جێگاوە، بیرۆکەیەکی سەیرم بۆ هات و لە دڵی خۆدا گوتم: "چۆنە، لە دوای ئیعترافکردنەکەم داوای قەرزی لێ بکەم؟". ئەوە بوو دان پێدانانەکانی خۆم، وەکو قاپێکی چکۆلەی خواردن

ڕازاندەوە و بەهاراتی ڕوندک و فرمێسکم پێوە کرد، بەڵکو ئەمە خوایە دڵت نەرم بکەم و ڕەحمەت بتلیسیتەوە و سەد و پەنجا ڕۆبڵێکم بە قەرز بدەیتێ. تۆ ئەمە بە خوێڕێتی و بودەڵەیی نازانی؟

- باوەڕناکەم ئەمە پەیوەندی بە خوێڕێتی و بودەڵەییەوە هەبێت، هیچ خوێڕێتیەکی تیا نییە، ئیدی شتەکە ڕێکەوتە، لێرەدا دوو بابەت یەکیان گرتووەتەوە، دوو بیرۆکە لە هزرو زەینتدا یەکانگیر بوون. ئەمە شتێکی باوەو، من یەک لە باری خۆم شتی وام زۆر دیتووە و بەسەر خۆم هاتووە. پێم وایە شتێکی باش نییە. دەزانی کیللەر من لەو ڕووەوە، لەسەر ئەو شتە گلەییم لە خۆم زۆرە؟ ئەوەی تۆ هەنوکە دەربارەی خۆت باستکرد دەتگوت باسی من دەکەی.

میرزادە، کە دیاربوو، ئەم مەسەلەیەی بە هەندگرتبوو، بە جدی لە سەری ڕۆیشت:

- تەنانەت هەندێ جار وا زەن دەبەم کە هەموو خەڵکی هەر وان، یانی بەو بیانووەوە خۆم دەپەڕێنمەوە و پاکانە بۆ خۆم دەکەم، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هزرینە دووفاقیە یەجگار قورس و دژوارە. من ئەم قسەیە لە خۆڕاناکەم، زادەی ئەزموونی خۆمە. مەگەر هەر خوا بە خۆی بزانێت کە ئەم هزرینە دوو فاقییە چۆن لە زەینی بەشەردا پەیدا دەبێت، لەکوێوە سەر هەڵدەدا! کەچی وا تۆ بەخوێڕێتی و بودەڵەیی لە قەڵەمی دەدەی! بەم پێودانگە دەبێ بە خۆما بچمەوە و سڵ لەم دیاردەیە بکەمەوە! بەهەرحاڵ هەڵسەنگاندن و داوەری دەربارەی تۆ کاری من نییە، بەلام بە هیچ جۆرێ پێموانیە کە بشێت ئەمە ناو بنرێت خوێڕێتی یان بودەڵەیی. تۆ دەڵێی چی؟ تۆ بە نیازبووی بە بیانووی فرمێسکەکانتەوە پارە لە من بکێشیتەوە، بەلام وێڕای ئەوەش بە خۆت سوێندت خوارد کە ئیعترافەکەت، بە مەبەستێکی شەریف بووە و لە هەر نیازو بەرژەوەندییەک بە دوور بووە، بەلام سەبارەت بە پارەکە، بۆ خواردنەوە و مەینۆشیت دەوێ، وا نییە؟ دیارە ئەمە دوای ئەو ئیعترافەی کە تۆ کردت، دەکاتە خوێڕێتی و بێئەخلاقی، بەلام کێ دەتوانێ لە پڕو یەکسەری مەینۆشی

تەرک بکات؟ شتی وا مەحاڵە. ئەدی تەگبیر؟ باشترین شت ئەوەیە پیاو لەم حاڵەتانەدا ویژدانی خۆی بکات بە داوەر. وانیە؟

میرزادە بەوپەڕی سەرسامی و کونجکاوی، چاوی بڕیبووە کیللەر، دیار بوو کە مەسەلەی دوو فاقیی بیر و هزرین، لەمێژبوو، مژوولی کردبوو.

کیللەر هاواری کرد:

- من تێناگەم، تۆیەک کە خاوەنی ئەم قسانەبیت، بەچ هەقێ خەڵکی بەگێلیان لە قەڵەم داویت.

میرزادە، کەمێک سوور هەڵگەڕا.

- بوردالۆی واعیزش مدارای کەسی نەدەکرد، خاترانەی لە مەزەبا نەبوو. کەچی تۆ داوەرییەکی مرۆڤانیت دەرهەق بەمن کرد. جا من بۆ ئەوەی سزای خۆم بدەم، بۆ ئەوەی بیسەلمێنم چەند پەندو عیبرەتم وەرگرتووە، دەسبەرداری سەدو پەنجا ڕۆبڵەکە دەبم و تەنیا بە بیست و پێنج ڕۆبڵ قاییل دەبم. ئەوەندە بەسە. بەلای کەمەوە بەشی دوو هەفتەم دەکات. یانی تا پازدە ڕۆژی دی داوای پارەت لێ ناکەم. بە نیازبووم ئاگاشکا دەعوەت بکەم، بەڵام شاییستەی شتی وانیە. ئاە میرزادەی ئازیز! خوا دەست بە باڵتەوە بگرێت!

لەم کاتەدا، لیبدیف کە تازە لە پترسبۆرگ گەڕابووەوە، خۆی بە ژوورا کرد، کە ئەسکەناسە بیست و پێنج ڕۆبڵیەکەی بە دەستی کیللەرەوە بینی، بڕۆی وێکهێنانەوە و چارەی دا بە یەکا. کیللەر کە پارەی خۆی وەر گرتبوو، خوا خوای بوو ساتێ زووتر بڕوات، بۆیە دوای تۆزێک لێی داو ڕۆیشت. لیبدیف یەکسەر کەوتە غەیبەت و زەمکردنی.

میرزادە لە کۆتایید گوتی:

- بە ڕاستی تۆ غەدری لێ دەکەی، چونکە بە ڕاستی ژێوان بووەتەوە و تۆبەی کردووە.

- ئاخر ئەم تۆبەیە بەچی دەچێت، فایدەی چییە؟ ڕێک وەکو پەشیمانی و تۆبەکەی دوێنێی منە کە دەمگوت: من خوێڕیم، بودەڵەم! هەر قسەی ڕووتە، وەک دەڵێن دەمە چیت لێکەمە!

- یانی چی؟ تەنیا قسە بوو؟ من وام دەزانی...

- بەڵێ، گوێ بگرە با من ڕاستیت پێبڵێم. من ئەمە تەنیا بە تۆ دەڵێم، چونکە تۆ بیری مرۆڤ دەخوێنیتەوە، دەچییە ناخی مرۆڤەوە: قسە و کردار، درۆ و ڕاستی، هەر هەمووی لە منا، لەلای من تێکەڵاو بوون، بە ڕاستی تێکەڵاو بوون. پەشیمانی و تۆبەی من لە حەقیقەت و کردارما دیارن، باوەڕم پێ بکە، چۆنت پێدەڵێم وایە، ئامادەم سوێندت بۆ بخۆم، بەڵام مەسەلەی ڕاستی و درۆ، لەو بیرۆکە دۆزەخییەوە (کە هەمیشە لەخەیاڵ و لەبیرمە) هاتووە کە حەز دەکەم خەڵکی فریو بدەم، تەنانەت چەکی فرمێسکیش بەکار بێنم! بە شەرەفم چۆنت پێدەڵێم وایە! من ئەم قسەیە لای هیچ کەسێکی دی ناکەم، چونکە یان گاڵتەم پێ دەکەن، یان دەمبوغزێنن! بەڵام تۆ میرزادە، داوەرییەکی مرۆڤانی دەکەیت.

میرزادە گوتی:

- سەیرە! یارۆش، ئێستا دەقاودەق هەمان شتی پێگوتم. لەوە دەچێت هەر دووکتان زۆری پێوە بنەن! تێناگەم، بەڵام یارۆ لە تۆ ڕاستگۆترە. تۆ درۆت کردووە بە پیشەی خۆت. دەی! ڕووبینی و ڕیابازی بەسە لیبدیف! خۆت لە بەرچاوم فەقیر مەکە، دەستیش مەخە سەر دڵت. شتێکت هەیە پێمی بڵێی؟ تۆ بەخۆڕایی بۆ ئێرە نەهاتوویت، هەڵبەتە مەبەستێکت هەیە...

لیبدیف، وەکو کە و چوو.

میرزادە گوتی:

- من لە بەیانییەوە تا هەنوکە چاوەڕوانت بووم تا پرسیارێکت لێ بکەم. حەز دەکەم بە یەک وشە و بۆ تاقە جارێک لە ژیانتدا بە بێپەردە ڕاستیم پێ بڵێی: تۆ دەست لە ڕووداوی دوێشەوی گالیسکەکەدا هەبوو یان نا؟

لیبدیف، هەمدیس کەوتە خۆبادان و جووڵەجووڵ، دەستی بە پێکەنین کرد، دەستەکانی هەڵگلۆفتن، ئەنجام کەوتە پژمین، تا کاتەکە بەسەر بەرێت و هیچ قسەیەک نەکات.

- من دەزانم تۆ دەستت لەم مەسەلەیەدا هەیە.

- باوەڕبکە، تەنیا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەستم تیای هەبووە!

دەوری من لە مەسەلەکەدا تەنیا ئەوە بوو بە کەسێک بڵێم، کۆمەڵێک لە ماڵی مندا خڕبوونەتەوە کە فلان و فلانیان لەگەڵدایە...

میرزادە، بەوپەڕی بێئۆقرەیی گوتی:

– من دەزانم تۆ کوڕەکەی خۆت بۆ ئەوێندەر ناردبوو. بە خۆی، چەند سەعاتێ لەمەپێش، بۆی گێڕامەوە. باشە ئەم هەموو پیلان و داوە لە پای چی؟

لیبدیف، بە نیشانەی نکۆڵی کردن، کەوتە دەست بادان و گوتی:

– نا، پەیوەندی بە منەوە نییە، منی تیا نیم. خەڵکانی دی ناچاریان کردم، بەڵێ خەڵکانی دی. ئەم پیلانە ئۆینی خەڵکانی دی بوو، باشتر وایە لەجیاتیی پیلان ناو بنرێت هەوەسبازی، ڕابواردن!

– ئاخر مەسەلەکە چییە؟ تو زاتی خوا ئەگەر ڕاستیم پێ نەڵێی! ماقوولە نەزانیت کە ئەم مەسەلەیە ڕاستەوخۆ ڕیشی من دەگرێتەوە؟ نازانی کە دەیانەوێ ناوی یەڤگینی پاڤلوفیچ بزڕێنن؟

لیبدیف، کە هێشتا هەر قنگەقنگی بوو، هاواری کرد:

– میرزادەگیان، میرزادەی مەزن! ئاخر تۆ ڕێم نادەیت ڕاستی مەسەلەکەت بۆ بگێڕمەوە. چەندین جار ویستم بۆتی بگێڕمەوە، تۆ هەر نەت هێشت قسەکەم تەواو بکەم...

میرزادە، بێدەنگ بوو، لە فکران ڕاچوو، پاشان دوای کێشماکێشێکی دەروونی دژوار، بە نائومێدییەوە گوتی:

– دەی باشە... ڕاستییەکەم پێ بڵێ.

لیبدیف، بەلەز دەستی پێ کرد و گوتی:

– ئاگلایا ئیڤانوڤنا...

بەڵام میرزادە هاواری کرد:

– نا، نا، باسی ئاگلایا نەکەی...

میرزادە، لە داخا، لە تووڕەییدا، ڕەنگە لە شەرما بووبێ، سوور هەڵگەڕا و درێژەی بە قسەکانی دا:

– مەحاڵە، شتی وا نەبووە و نابێ، قسەی قۆڕە! ئەمە هەمووی بوختانی





تۆ و خەڵکانی شێتی وەکو تۆیە! نەخەڵەتابی جارێکی دی باسی شتی وا بۆ من بکەی! جارێکی دی شتی وات لێ نەبیستم ها!

کولیا، شەوێ درەنگ، دەوروبەری سەعات یازدە، هاتەوە و هەنبانەیەک هەواڵ و باسی پترسبۆرگ و پاڤلوفسکی پێ بوو. بە کورتی و پەلەپەل، هەواڵەکانی شاری (پترسبۆرگ) کە (زیاتر دەربارەی هیپولیت و فەرتەنەکەی دوێشە و بوو) گێڕایەوە و ئەوسا بلەز دایکێشا بەلای گێڕانەوەی هەواڵەکانی پاڤلوفسکدا. کولیا، سێ سەعات بوو لە پترسبۆرگ هاتبووەوە، هەر لە ڕێوە، بێ ئەوەی سەرێکی پەلەی میرزادە بدات، یەکسەر چووبوو بۆ ماڵی یەپانچین. دەیگوت "لەوێ فەرتەنە و جەنجاڵێکی سەیرە". هەڵبەتە، هۆی سەرەکیی ئەم هەرایە ڕووداوی گالیسکەکە بوو. هەڵبەتە هەندێ شتی دیکەش ڕووی دابوو کە نە میرزادە و نە کولیا، ئاگایان لێ نەبوو. کولیا درێژەی بە قسەکەی دا: " هەڵبەتە من نەمدەویست خۆم لە مەسەلەکە هەڵقورتێنم و پرسیار بکەم کە مەسەلە چییە، بەڵام پێشوازییەکی زۆر گەرمیان کردم، پێشوازییەکی لەڕادەبەدەر، گەرمتر لەوەی وێنام دەکرد، بەڵام میرزادە تاقە وشەیەکیان دەربارەی تۆ نەگوت. هەر ناویشیان نەهێنایت." جا سەیرترین هەواڵ ئەمە بوو: ئاگلایا، لەسەر گانیا دەگەڵ کەسوکارو ماڵباتەکەی خۆیدا بەشەڕ هاتبوو. کەس، وردەکاری ئەم شەڕەی نەدەزانی، کولیا تەنیا ئەوەندەی دەزانی بە هۆی گانیاوەیە. بە ڕاستی سەیرە، ئەم شەڕە قورسە دەبێ لەسەر شتێکی گەورە بووبێ. جەنەراڵ درەنگانێ، بە پەستی و بێزاری بۆ ماڵ هاتبووەوە، یەڤگینی پاڤلوفیچیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە. پێشوازییەکی گەرم و گوڕ لە یەڤگینی کرابوو، یەڤگینی زۆر خولق خۆش و بە کەیف و دەماخ بوو. دووەم هەواڵی گرینگ ئەمە بوو کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە بێدەنگی ڤارڤارا ئاردالیونوڤنای، کە هاتبووە دیدەنی کیژەکانی ئەو، گاز کردبوو و بەوپەڕی وێڵ و نەزاکەتەوە داوای لێ کردبوو کە جارێکی دی هەرگیز هاتوچۆیان نەکات و ڕۆژێ لە ڕۆژان پێ نەنێ بە ماڵیاندا، کولیا گوتی: "ڤاریا بە خۆی ئەمەی پێگوتم." ڤاریا کاتێ لەنک خانم یەپانچین هاتە دەرێ و خوا حافیزی لە کیژەکان کرد،

کیژەکان نەیاندەزانی چی ڕووی داوە، نەیاندەزانی کە دەرگای ئەم ماڵە بۆ هەتا هەتایە لە ڤاریا داخراو ڤاریا بۆ هەمیشە و بە یەکجارەکی خواحافیزییان لێ دەکات، جێیان دێڵێت.

میرزادە بەسەرسامی گوتی:

- خۆ ڤاریای خوشکت سەعات حەوت لێرە بوو.

- ئاخر دەوروبەری سەعات هەشت جوابیان کردبوو. من زۆر بەداخەوەم بۆ ڤاریا و گانیا... ڕاستە هەمیشە خەریکی پیلانگێڕی و داونانەوەن، ئیدی شتێکە خوویان پێوەگرتووە و بۆیان تەرک ناکرێت. قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمزانیوە چییان لەژێر سەردایە و ناشمەوێ بزانم، بەڵام میرزادەی ئازیز و دلۆڤان، دڵنیات دەکەم کە گانیا کوڕێکی دڵپاکە. ڕاستە لە زۆر ڕووەوە عەیبی هەیە و بێ کەموکوڕی نییە، بەڵام سیفەتی زۆر باشیشی هەن، من زۆر گلەییم لە خۆم هەیە کە زووتر وەکو پێویست نەمناسیوە. تیاماوم، نازانم ئاخۆ دوای دەرکردنەکەی ڤاریا هاتوچۆی ماڵی یەپانچین بکەم یان نا. ڕاستە من هەر لە سەرەتاوە خۆیبوونی خۆم هەبووە و بەتەواوەتی تێکەڵی وان نەبووم، مەودایەکم لەنێوان هێشتبووەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش، مەسەلەکە پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە.

میرزادە گوتی:

- زۆریش بۆ براکەت مەپاڕێوە. ئەگەر کار گەیبێتە ئەم ئاستە، مانای وایە لیزاڤێتا پروکوڤیڤنا، گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بە خەتەر دەزانێت، یانی گانیا لە هەندێ ئاواتی نزیک بووەتەوە.

کولیا، بەسەرسامی پرسیی:

- کام ئاوات؟ مەبەستت چییە؟ یانی تەسەور دەکەیت کە ئاگلایا... نا، شتی وا مەحاڵە!

میرزادە بێدەنگ بوو.

کولیا دوای یەک دوو دەقیقە هاتە قسان و لەسەری ڕۆیشت:

- میرزادە، تۆ کەسێکی یەجگار بەگومانی! هەستم کردووە لەم دواییانەدا لەڕادەبەدەر بەدگومان بوویت، وات لێهاتووە باوەڕ بە هیچ

شتێک ناکەیت، تەنانەت بە خەیاڵ، گومان بۆ خۆت دروست دەکەیت... نازانم ئاخۆ زاراوەی "گومان"م لە جێی خۆیدا بەکار بردووە یان نا؟

- پێدەچێ لە جێی خۆیدا بە کارت بردبێ، هەرچەندە یەک لە باری خۆم دڵنیا نیم.

کولیا، لەپڕ گوتی:

- نا، زاراوەی گومان و بەدگومانی پڕ بە پێستی مەبەستەکەم نییە. زاراوەیەکی گونجاوترم دۆزیوەتەوە، زاراوەیەک کە دروستتر گوزارشت لە مەبەستەکەم دەکات. تۆ بە گومان و بەدگومان نیت، بەڵکو غیرەگری. تۆ لەبەر کیژێکی گەنجی لوتبەرزی لەخۆبایی، بەغیلی بە گانیا دەبەی، غیرەی لێدەکەی.

کولیا، بەدەم ئەو قسانەوە لە جێی خۆی ڕاپەڕی و هەستایە سەر پێیان، لە قاقای پێکەنینێکی ئەوتۆی دا، دەتگوت لە عەمراتیا پێنەکەنیوە. کە بینی دەموچاوی میرزادە سوور هەڵگەڕا، شێلگیرانەتر کەوتە پێکەنین. زۆری پێخۆش بوو کە پەی بەوە بردبوو میرزادە لەبەر خاتری ئاگلایا غیرە لە گانیا دەکات، بەڵام کە بینیی میرزادە بە ڕاستی خەمینە، بێدەنگ بوو. ئەوجا نزیکەی سەعاتێک تا سەعات و نیوێکیان بە قسە و باسی زۆر جیددی بردە سەر.

* * *

میرزادە، بۆ سبەی، بەکاری پێویست سەفەری پترسبۆرگی کرد، نزیکەی سەعات پێنجی دوا نیوەڕۆ، لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ پاڤلوفسک، بەڕێکەوت ئیڤان فیودوروفیچی لە وێستگەی قیتاردا بینی. جەنەراڵ، توند باسکی گرت، وەکو ئەوەی لە شتێک بترسێت، تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، هەنگی میشکینی دەگەڵ خۆیدا بردە فارگۆنێکی نمرە یەکەوە. بەو جۆرە بوون بە هاوسەفەر، جەنەراڵ، تامەزرۆی ئەوە بوو کە باسی مەسەلەیەکی زۆر گرینگی لەگەڵدا بکاتەوە.

ئیڤان فیدوروفیچ بە میرزادەی گوت:

- میرزادە، دۆستی ئازیز، پێش هەموو شتێک ئومێدەوارم گلەییم لێ

نەکەیت و لێم زویر نەبیت. ئەگەر گلەییەکیشت هەبێ، هیوادارم لە دڵی نەگریت و لە بیری بکەیت. دوێنێ بەتەما بووم بێمە دیدەنیت، بەڵام نەمدەزانی ئەگەر ئەو کارەم کردبا، لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا چ هەڵوێستێکی دەبێت... حاڵی حازر ماڵەکەی من بووە بە دۆزەخ، دۆزەخێکە لەو گۆڕە. لە تۆ وایە دێوێکی ترسناک و نادیار خۆی لەو ماڵەدا حەشار داوە. کەم و زۆر سەر لەم مەسەلەیە دەر ناکەم، بەڵام سەبارەت بە تۆ، من پێم وایە لە هەر هەمووومان کەم خەتاو، کەم تاوانتریت، ئەگەرچی سەبەبکاری گەلێک لەم ئاڵۆزی و پەشێوییانەیت. ڕەنگە هەنوکە پەیت بەوە بردبێت کە بەشەر دۆستی شتێکی زۆر باشە میرزادە، بەڵام بە سلوکەت، لە سنووری خۆی دەر نەچێت. ڕەنگە خۆت بە ئەزموون ئەم ڕاستیەت بۆ دەرکەوتبێت و باجەکەیت دابێ. من یەک لە باری خۆم میهرەبانی و دڵپاکی و جوامێریی تۆم زۆر بە دڵە و ڕێز و حورمەتم بۆ لیزاڤیتا پروکوڤیڤنای هاوسەرم هەیە، بەڵام...

جەنەراڵ، ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە لەسەری ڕۆیشت، بەڵام قسەکانی یەجگار پچڕپچڕ و بێسەروبەر بوون. دیار بوو کە لە بویەر و ڕووداوێکی نادیار و نائاسایی، دەترسا، ترسان و پەشێوییەکی لەڕادەبەدەر.

ئەنجام، جەنەراڵ، بە ڕوونی و ڕاشکاوییەکی پترەوە، بە میرزادەی گوت:

– من، زەڕەیەک گومانم لە تۆ نییە کە دەستت لەم مەسەلەیەدا هەبێ، بەڵام تکایەکی دۆستانەت لێ دەکەم ماوەیەک خۆت لە هاتوچۆی ماڵی ئێمە دوور بگرە، تا ئەم ڕەوشە دەگۆڕێ و هێور دەبێتەوە.

ئەوسا بە گەرمی لە سەری ڕۆیشت:

– سەبارەت بە یەڤگینی پاڤلوفیچ، هەرچییەک وتراوە و دەگوترێ هەر هەمووی ئیفتیرا و بوختان و درۆو دەلەسەیە، ئیدی هەوڵی ناوزڕاندنە، پیلانێکی ئاشکرایە، دەیانەوێ بە شەڕماندا بدەن. جا میرزادە، دەمەوێ بێپەردە شتێکی گرینگت پێبڵێم: تا ئێستا هیچ قسەیەک لەنێوان ئێمە و یەڤگینی پاڤلوفیچدا نەبووە و نەکراوە. تێدەگەی؟ حاڵی حازر هیچ بەڵێنێکمان لەنێواندا نییە، بەڵام لەگینە ئەو قسەیە بکرێت. ڕەنگە ئەو قسەیە

بەم زووانە بکرێت! ئەمە کارێکی ناشیرینە! تێناگەم بۆچی و بە چ مەبەستێک ئەمە دەکەن؟ ئەمە چ نیازێکی لە پشتە؟ سەر لەمە دەرناکەم. ئەم ژنە، ژنێکی سەیرو ئەتوار غەریبە، بەلام من زۆری لێدەترسم، هێندە لێی دەترسم، کە خەوم لێ حەرام بووە! تۆ تەمەشای ئەو گالیسکە کەشخەیە، ئەو ئەسپە کوێتانە... ئەو هەموو کەش و فشە، کە بە فەرەنسی شیکایەتی پێدەڵێن! کێ ئەم ئاستە بەرزەی ژیانی بۆ دابین دەکات؟ ئەم هەموو شتەی لەکوێ بوو؟ باوەڕبکە ڕۆژێک لەم ڕۆژانەدا بیرێکی گوناحامێزم بە مێشکا هات، دەمگوت ڕەنگە یەڤگینی پاڤلوفیچ هەموو ئەو شتانەی بۆ بکات، بەلام ئاشکرایە کە گومانێکی بێ بنجوبناوانە. ئەدی باشە بۆچی دەیەوێ بە شەڕمان بدات، ناکۆکیمان بخاتە بەین؟ ئەوە لەگەزو مەتەڵۆکەکەیە! ئایا دەیەوێ یەڤگینی پاڤلوفیچ بۆ خۆی مسۆگەر بکات؟ بەلام دووبارەی دەکەمەوە و سوێند دەخۆم کە یەڤگینی پاڤلوفیچ لە بنی ناینا‌سێت و مەسەلەی سفتە و کۆمپیالەکان درۆیە و هیچ بنجوبناوانێکی نییە. هەڵبەتە ئەو گۆساخی و بێشەرمییەی کە بەو جۆرەولەسەر جادەوە بە "تۆ" بیدوێنێ، خۆی لە خۆیدا پیلانێکی ئانقەستە و هیچی تر! بۆیە لەسەرمانە کە ئەو پیلانە پوچەڵ بکەینەوە و لە جاران پتر ڕێزو حورمەتی یەڤگینی پاڤلوفیچ بگرین. هەمان شتم بە هاوسەرەکەشم گوتووە. جائێستا گەرەکمە بۆچوونێکی زۆر نهێنی بۆ تۆ بدرکێنم: من باوەڕی تەواوم بەوەیە کە دەیەوێ تۆڵەی ڕابردوو لە من بکاتەوە، هەرچەندە قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان هەڵەم دەربارەی نەکردووە و خراپەم بۆی نەبووە. کە بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە لە شەرمەزاریدا سوور دەبمەوە. ئەوەتا، لە کاتێکا دڵم خۆشبوو کە بۆ هەتاهەتایە ڕۆیشت و لە کۆڵم بووەوە، کەچی دووبارە سەروسەکوتی پەیدا بووەوە. پێم ناڵێی ئەم ڕوگوژینە کەوتە چ گۆڕێکەوە؟ خۆ من وام دەزانی دەمێکە بووە بەخانم ڕوگوژین، واتە شووی بە ڕوگوژین کردووە.

بە کورتی، جەنەراڵ کە زۆر پەشێوو پەریشان بوو، بە درێژایی ئەو سەفەرە یەک سەعاتییە، لێکدا لێکدا هەر قسەی دەکرد، پرسیاری دەکرد و

هەر خۆیشی وەڵامی دەدایەوە، دەستی میرزادەی دەگوشی و دڵنیای دەکردەوە کە کەمترین گومانی لەو نیە. ئەم خاڵە بەلای میرزادەوە، گرینگ بوو. جەنەراڵ، لە کۆتایی قسەکانیا هاتە سەر باسی مامی یەڤگینی پاڤلوفیچ، کە سەرۆکی یەکێک لە فەرمانگەکانی پترسبۆرگ بوو، گوتی: "پیاوێکە لە تەمەنی هەفتاساڵیدا، پایە و پێگەیەکی گەورەی هەیە، پیاوێکی دنیایی و ئەهلی ڕابواردن و مێزو خواردنەوەیە. بە کورتییەکەی باش بە خۆی ڕادەگات و پیرەمێرێکی زۆر دڵتەڕە... ها، ها! وەسفی ناستاسیا فیلیپوڤنای بیستبوو و ماوەیەک لە دووی دەبێت. دوێنێ چوومە سەردانی، لێ نەمبینی، چونکە نەخۆش بوو، پێشوازیی کەسی نەدەکرد، بەلام دەوڵەمەندە، دەوڵەمەندێکی حێڵە. پیاوێکی دەستڕۆ و قسەڕۆیە... خوا تەمەندرێژ و ڕاوەستاوی بکات! بەلام هەموو سەروەت و سامانەکەی بۆ یەڤگینی پاڤلوفیچ دەمێنێتەوە، جگە لەو هیچ میراتگرێکی دیکەی نییە... بەڵێ... بەلام وێڕای ئەوەش من هەر دەترسم و نازانم لە چی دەترسم... شتێکی شووم و بەدوم، شەمشەمەکوێرە ئاسا، بە سەر سەرمانەوە دەسووڕێتەوە. دڵم زۆر دەترسێت و ناڕەحەتم.

بۆ ڕۆژی سێیەم، سەرەنجام خانەوادەی یەپانچین و میرزادە بەفەرمی ئاشت بوونەوە...

پەراوێز:

* - "لەبەر خۆشەویستی تایبەتیم بۆ ئوسقوفی فەرەنسی بوردالۆ....": بۆردالۆ، واعیزێکی فەرەنسی یەسوعی بوو (١٦٣٢- ١٧٠٤) خاوەنی کۆمەڵێک خوتبەی بەناوبانگە خەڵکی دڵبەندی بەلاغەت و فەساحەتی زمان و بەهێزی بەڵگەکانی بوون. جا لێرەدا لیبدیف کە حەزی لە باسکردنی بابەتێن چاوەڕوان نەکراو بوو، یان بە ڕاستی مەبەستی بوردالۆ بووە، یان لەوەیە کیللەر ویستبێتی لە ڕێگەی گەمەی زمانەوانیەوە ئاماژە بۆ مەی "بوردو"ی بەناوبانگی فەرەنسی بکات یان ئاماژە بێت بۆ وشەی ڕووسیی "بوردا" کە کۆکتێلێکی شەرابی ئەلکولییە، بەلام بەکارهێنانی نازناوی ئوسقوف بۆ واعیزە بەناوبانگەکەی فەرەنسا، خەیاڵی ڕووە.

### فەسڵی دوازدەیەم

سەعات حەوتی ئێوارە بوو، میرزادە خۆی ئامادە دەکرد بچێت لە باخچەکەدا پیاسەیەک بکات، لەناکاودا لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە تاقی تەنیا خۆی بە بانیژەکەی ئەودا کرد و ڕووی تێ کرد و گوتی:

- یەکەم وا تێنەگەیت کە من بۆ عوزرخوایی هاتووم، چونکە ئەوە گەوجێتییە! چونکە هەرچی هەڵە و تاوانێک ڕووی داوە، هەموو لە سۆنگەی تۆوە بووە!

میرزادە، هیچی نەگوت.

- خەتای تۆ بوو یان نا؟

- هەر بەقەد تۆ خەتابارم، نە زیاتر و نە کەمتر. هەرچەندە کەسمان بەئانقەست خەتامان نەکردووە، نە تۆ و نە من، پێری خۆم بە کەمتەرخەم و خەتابار دەزانی، بەڵام هەنوکە، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر گەیشتوومەتە قەناعەت کە هیچ خەتا و کەمتەرخەمییەکم نەبووە!.

- ئاهـ.. یانی وا بیر دەکەیتەوە! زۆر چاکە، دانیشە و گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم، چونکە نیازم نیە بە پێوە بوەستم.

هەر دووکیان دانیشتن.

- دووەم، پێویست ناکات بە تاقە وشەیەکیش باسی ئەو ئەشقییانە بکەیت! چونکە هەر دە دەقیقەیەک دەرفەتی قسەکردنم هەیە، دەڕۆم، چونکە هاتووم بۆ پرسیارێک (مەگەر هەر خوا بزانێ مەزەندەت بۆچی چووە) ئەگەر بە تاقە وشەیەک باسی ئەو گۆساخانە بکەیت، یەکسەر





هەڵدەستم و دەڕۆم، ئیدی هەرگیز نە دەتناسم و نە بمناسە.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- زۆر باشە.

- دەمەوێ بپرسم کە ئایا تۆ پێش دوو مانگ، دوو مانگ و نیو، یانی لە دەوروبەری جەژنی پاکدا هیچ نامەیەکت بۆ ئاگلایا ناردووە؟

- م... بە.. لێ...

- بە چ بۆنەیەکەوە؟ دەربارەی چ شتێکە؟ ناوەڕۆکی ئەو نامەیە چییە؟ نامەکەم پێ نیشان بدە!

ئاگر لە چاوانی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا دەبووەوە، لە بێتاقەتیدا دەلەرزی.

میرزادە، بە سەرسامییەکی ترسامێزەوە گوتی:

- نامەکە لای من نییە، ئەگەر تا ئێستا مابێت، لای ئاگلایا ئیڤانوڤنایە...

- خۆت لە گێلی مەدە! لەو نامەیەدا چیت بۆ نووسیوە؟

- نەخۆم لە گێلی دەدەم و نە هیچ ترسێکم هەیە، بەڵام هەست ناکەم هیچ لەمپەرێک لە گۆڕێ بێ کە نامەی بۆ نەنووسم...

- دەمت لێکنە! دوایی ئەو قسانە بکە. هەنوکە بڵێ ئەو نامەیە چی تیابوو؟ بۆچی سوور هەڵگەڕاویت؟

میرزادە، بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو.

- من نازانم، لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا تۆ نیازت چییە و چیت لە خەیاڵە، بەڵام هەست دەکەم ئەو نامەیە زۆری پەست کردوویت. خۆ من دەتوانم وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارە نەدەمەوە، بەڵام بۆ ئەوەی بۆتی بسەلمێنم کە هیچ ترسێکم سەبارەت بەو نامەیە نیە و لە نووسینی پەشیمان نیم و خۆیشم بە شەرمەزار نازانم (میرزادە لە کاتی ئەو قسەیەدا دوو هێندە سوور هەڵگەڕا) دەقی نامەکەت، کە پێم وایە لەبەرمە، وەکو خۆی بۆ دەخوێنمەوە.

میرزادە، دەقی نامەکەی، تەقریبەن وەکو خۆی، وشە بە وشە لەبەر بۆ خوێندەوە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، پاش ئەوەی بەوردی گوێی لە دەقی نامەمە گرت، بە زمانێکی ڕەق گوتی:

– کە شتێکی بێسەروبەرە! دەتەوێ بەم قسە قۆڕانە چی بڵێی؟
میرزادە وەڵامی دایەوە:
– خۆیشم بە دروستی نازانم. ئەوەندە دەزانم لەگەڵ هەست و سۆزی خۆمدا ڕاستگۆ بووم. ئەوسا، لەو ڕۆژانەدا، وێڕای ساتە دژوار و سەختەکانی ژیانم، هەندێ جار ئومێد و هیوای گەورەم دەکەوتە دڵ.
– ئومێدو هیوای وەک چی؟
– باسکردنی ئەستەمە، ناتوانم شرۆڤەی بکەم، بەڵام لەو ئومێدانە نەبوون کە هەنوکە تۆ وێنایان دەکەیت... ئەو ئومێدانە پەیوەندیان بە ئایندەوە هەبوو، پەیوەندیان بەو شادیەوە بوو کە من وام بیر دەکردەوە بێگانە نیم، فەرەنگی نیم، لەماڵی خۆمدام. ئیدی شادی گەڕانەوە بۆ وڵات، مەستی کردم. ئەوە بوو بەیانییەکی هەتاو، کە دنیا نقومی هەتاو بوو، دەستم دایە قەڵەم و ئەو نامەیەم بۆ نووسی. بۆچی نامەکەم بۆ خودی ئەو نووسی؟ نازانم. هەندێ جار مرۆڤ حەز دەکات دۆستێکی لە نزیک بێت.
میرزادە، دوای هەڵوەستەیەک، لە سەری ڕۆیشت:
– وا بزانم، ئەو حەز و هەستە هانیدام ئەو نامەیە بنووسم.
– یانی ئاشقی نیت؟
– نە بەزاتی خوا. من وەکو خوشکێکی خۆم نامەم بۆ نووسیوە. تەنانەت بە ئمیزای: "برات"، کۆتاییم بە نامەکە هێناوە.
– ها! دەزانم، فێڵێکی باشە.
– لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، من وەڵامی ئەم پرسیارانەم لە گیان گرانە...
– دەزانم کەوایە، بەڵام ئەمە هەرگیز کێشەی من نییە. گوێ بگرە، ڕاست برۆ، وەکو چۆن لەبەردەم خوادا وەستابیت بەو ئاوایە ڕاست برۆ، پێم بڵێ: تۆ درۆم لەگەڵ دەکەیت، یان ڕاستیم پێدەڵێی؟
– ڕاستی دەڵێم. درۆت لەگەڵ ناکەم.
– یانی ڕاست دەکەی کە دەڵێی ئاشقی نیت؟
– پێم وایە، ئەوپەڕی ڕاستیم گوتووە.
– مەبەستت لە "پێم وایە" چییە؟ باشە ئەو هەتیوە فشەکەرە نامەکەی بۆ





برد؟

– من تکام لە نیکولا ئاردالیونوفیچ کرد کە...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بە تورەیی قسەکەی پێبڕی:

– هەتیو، وتم هەتیوە! من نیکولا ئاردالیونوفیچ ناناسم. بلێ هەتیوە!

– نیکولا ئاردالیونوفیچ....

– هەتیوە، پێم گوتیت...

میرزادە، ئەنجام بە دەنگێکی مکوم بەڵام هێمن گوتی:

– نە،هەتیوە نا، بەڵکو نیکولا ئاردالیونوفیچ.

– ئاە، زۆر باشە، با بە کەیفی تۆ بێ. بزانە چۆن دەیکەمەوە بەگژ تا...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بۆ ماوەی دەقیقەیەک بێدەنگ بوو تا جڵەوی تورەیی خۆ بگرێت و ئارام ببێتەوە، ئەوجا لێی پرسی:

– باشە، "سوارچاکی لات" مانای چییە؟

– نازانم. نە ئاگام لەمەیە و نە پەیوەندیی بەمنەوە هەیە. دەبێ جۆرە شۆخی و گاڵتەیەک بێت.

– چەند خۆشە پیاو لەناکاوێکا هەموو شتێکی بۆ دەر بکەوێ! باشە تۆ بڵێی بە خۆی حەزی لێ کردبێت؟ خۆ هەر خۆی ناوی گەوج و گەمشۆی لێ نایت.

میرزادە، بە گلەییەوە، بە دەنگێکی چپە ئاسا گوتی:

– هەق نەبوو ئەم قسەیە بۆ من بگێڕیتەوە.

– زویر مەبە، چونکە کچێکی خۆسەری، سەر شێتی حول حولیە، ئەوەندەی ناز دراوەتێ خووی شەڕ بووە!... ئەگەر کەسێکی خۆش بوێت، بەوە دەری دەبڕێت کە بە بەرچاوی خەڵکیەوە گاڵتەی پێ دەکات و سەردەکاتە سەری، تەشەری لێ دەدات. من بە خۆیشم وا بووم، بەڵام تکا دەکەم بەتەمای هیچ مەبە، نەشەی سەرکەوتن نەتگرێت، چونکە ئەو بۆ تۆ نابێت، باوەڕ ناکەم قەت شتی وا ببێت! من بۆیە ئەمەت پێدەڵێم تا لە ئێستاوە تەگبیری خۆت بکەیت و دوایی گلەیی نەکەیت. گوێ بگرە، سوێندم بۆ بخۆ کە ئەو ئافرەتەی ترت نەخواستووە.

میرزادە، کە لە سەرسامیا ڕاپەڕی، گوتی:

- لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، ئەوە تۆ چ دەڵێی، ئەمە چ بیرکردنەوەیەکە؟

- باشە، خەریک نەبوو بیخوازیت؟

میرزادە، سەری داخست و لە بن لێوانەوە گوتی:

- با، نزیک بوو بیخوازم.

- کەواتــە، تــۆ "ئەوت" خۆشــدەوێ؟ ئایــا لەبــەر خــاتری "ئەو" بــۆ ئێــرە هاتوویت، لەبەر خاتری "ئەو ژنە"؟

میرزادە گوتی:

- من بۆ خواستنی ئەو نە هاتووم.

- ئایا، لەم دنیایەدا هیچ شتێک هەیە بەلاتەوە پیرۆزی بێت؟

- بەڵێ.

- دەیســا بەو شــتە پیــرۆزە ســوێند بخــۆ کــە بــۆ خواســتنی "ئەو ژنــە" نەهاتوویت.

- لەجیاتیی سوێندێ هەزار سوێندت بۆ دەخۆم، سوێندی گەورە.

- باوەڕم پێ کردیت. وەرە مـاچم بکـە. ئـاخری تـوانیم هەناسـەی ئۆخـەی هەڵبکێشم، بەڵام ئەوە بزانە کە ئاگلایا ئاشقی تۆ نییە، لەبەر ڕۆشنایی ئەوە بیر لـە حـاڵ و ئاییندەی خۆت بکەوە. تـا مـن لـە دنیـا بمێنم ئاگلایا نـابێ بە هاوسەری تۆ. حاڵی بوویت؟

- بەڵێ حاڵی بووم.

میــرزادە، بــە جــۆرێ شــەرمەزار و تــەریق بووبــووەوە کــە نەیــدەتوانی ڕووبەڕوو تەمەشای لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا بکات.

- ئیدی ئەوەی کـە پـێم گـوتیت هـەر ئەوەیە و دەسـت بخـە ژێـر سـەرت. بەتـەمای هیچ مەبـە. مـن بـە تاسـەوە، وەکـو ئەوەی نێردراوی خـوایی بیـت، چــاوەڕوانم دەکردیــت، کــە (شاییســتەی ئەوە نــەبوویت!) شــەو نــەبووە بالیفەکەم لە فرمێسکا تەڕ نەبووبێ – هەڵبەتە بـۆ تـۆ نـا دۆسـتی ئـازیز، لەوە دڵنیا بە! خەمی من، شتێکی دی بوو، شتێکی جیاواز، خـەمێکی هەمیشـەیی و نەگۆڕ. جا با پێت بڵێم بۆچی بە تاسەوە، بە پەرۆشـەوە چاوەڕێی تـۆ بووم:

هێشتاش باوەڕم وایە کە خوا تۆی وەک دۆست و برا بۆ من نارد، چونکە من زۆر بێکەسم، زۆر بێپشت و پشتیوانم، لەم دنیایەدا جگە لەو پیرەژنە، لە خانم بیلوکونسکایا، هیچ کەسێکی ترم نییە، ئەویش بە خۆت دەزانی باری کردووە و لێرە نەماوە، ئەمە جگە لەوەی تەواو پیرو فەرتوس بووە، دەڵێی مەڕی گێژە! جا ئێستا گەرەکمە بە ئا یان بە نا وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە: ئایا دەزانیت کە پێریێ شەو "ئەو ژنە" بۆچی لەنێو گالیسکەکەیەوە، ئەو هاوارەی کرد؟

- بەشەرەفم نە دەستی منی تیایە، نە ئاگام لێیەتی!

- ئەوەندەم بەسە! باوەڕت پێ دەکەم. هەنوکە وێنایەکی ترم دەربارەی ئەم بابەتە هەیە. تا پێریێ دوێنێ و دوێنێ بەیانیش هەر هەموو شتەکانم بە خەتای یەڤگینی پاڤلوفیچ دەزانی، بەڵام هەنوکە هاتوومەتە سەر ڕاوبۆچوونی ئەوانی دی: وا دیارە بە مەبەست و ئامانجێکی تایبەتی، وەکو گەوجێک کراوە بە نیشانەی تیری تانە و توانجان. چۆن؟ بۆچی؟ بە چ مەبەستێک؟ ڕەفتارەکە خۆی لە خۆیدا گوماناوی و ناشەریفە. بەهەرحاڵ، ئاگلایا هەرگیز شووی پێ ناکات. ئەمە لە من بزانە! ڕەنگە پیاوێکی زۆر باش بێت، بەڵام شتی وا نەبووە و نابێت! مەحاڵە کچی خۆمی بدەمێ! جاران، پێش ئەم ڕووداوە، دوو دڵ بووم، بەڵام هەنوکە بڕیاری خۆم داوە و بڕاوەتەوە، ئەمڕۆکە ڕووبەڕوو، بەڕاشکاوی بە (ئیڤان فیدوروفیچ)م گوت: "لە پێشا من لە تابووت بنە و بە خاکم بسپێرە، ئەوسا کیژەکەت بە مێرد بدە." دەبینی چەند باوەڕم بە تۆ هەیە؟

- بەڵێ دەبینم و تێدەگەمم.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، چاوی بڕییە میرزادە. دەتگوت دەیەوێ بزانێ، ئەو قسانەی کە دەربارەی یەڤگینی پاڤلوفیچ کردنی، چ کارێکیان لە میرزادە کردووە.

- تۆ هیچ شتێک دەربارەی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ ئیڤولگین نازانی؟

- یانی.... زۆر شت دەزانم.

- ئاگات لەوە هەبووە، پەیوەندیی دەگەڵ ئاگلایا هەبێت یان نا؟

میرزادە بەسەرسامی گوتی:

- بە هیچ جۆرێ ئاگام لە شتی وا نەبووە و نییە. مەبەستت ئەوەیە کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ پەیوەندیی دەگەڵ ئاگلایا ئیڤانوڤنادا هەبووە؟ مەحاڵە!

- ئەمە تازەیە... خوشکەکەی بە درێژایی ئەم زستانە، ڕێی بۆ خۆشکردووە.

میرزادە، هایم و حەپەساو، شپرزە و پەشۆکاو، دوای سووکە بێدەنگییەک هاتە قسان و گوتی:

- باوەڕ ناکەم، شتی وا نییە، ئەگەر وا بوایە بێگومان من هەستم پێ دەکرد. پێم دەزانی.

- وا خەیاڵ دەکەی کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، دەهات بۆ ئێرە و سەری دەخستە سەر شانت و بەدەم گریانەوە ئیعترافی بۆ دەکردیت؟ کە پیاوێکی ساویلکەی!... هەموو کەسێک دەتوانێ فریوت بدات، کڵاوت لە سەر بنێ، ڕێک وەکو... وەکو... شەرم نییە کە باوەڕ بەو دەکەی؟ هەست ناکەیت، هەمیشە پێت ڕادەبوێرێت و فریوت دەدا؟

میرزادە، بە ئەسپایی و بە جۆرە بێزارییەکەوە گوتی:

- دەزانم هەندێ جار فریوم دەدات. بە خۆیشی دەزانێ کە من پێی دەزانم...

میرزادە، قسەکەی تەواو نەکرد.

- ئاوها؟ دەزانی فریوت دەدات و هێشتاش متمانەی پێدەکەیت؟ نۆبەتی ئەو قەوانەیە. هەر لە مەمان کەم بوو. تۆ تەماشای من کە، جا ئەمە سەرسامیی بۆ چییە، لە کاتێکا تۆ لەوە زیاترت لێناوەشێتەوە؟ پەنا بە خوا! لە هەموو دنیادا دوو پیاوی وەکو تۆ نییە. باشە دەزانی ئەم گانیایە یا ئەم ڤاریایە، بە ناستاسیا فیلیپوڤنایان ئاشنا کردووە و پەیوەندییان لەنێوانیاندا دروست کردووە؟

میرزادە پرسیی:

- لەنێوان ناستاسیا و کێدا؟

- ئاگلایا.

میرزادە، لە شوێنەکەی خۆی ڕاپەڕی:

- باوەڕ ناکەم! مەحاڵە. ئاخر بۆچی؟

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا گوتی:

- منیش باوەڕ ناکەم، بەڵام بەڵگە و نیشانە هەن، بۆ خۆی کیژێکی خۆسەرە، خەیاڵپەروەرە، سەرشێتە! کیژێکی شەڕەنگێزە، شەڕەنگێز و نەژنە و بەدنیهادە! ئامادەم هەزار کەڕەتی دی بیڵێمەوە کە کچێکی بەدنیهاد، جینگز، جینگن و نەکڵۆکە! کیژەکانم هەموویان خووی ئەویان گرتووە. تەنانەت ئەلکسندرای بەستەزمانیش! بەڵام ئاگلایا بە تەواوەتی شوڵی لێ هەڵکێشاوە و لەدەست دەر چووە. کەچی وێڕای ئەمەش من باوەڕ بەم شتە ناکەم.

ئەوسا لەبەر خۆیەوەو، بە خۆی گوت:

- ڕەنگە لەبەر ئەمە بێ کە نامەوێ باوەڕ بکەم.

هەنگێ جارێکی دی ڕووی کردە میرزادە و پرسیی:

- باشە بۆچی سەرت نەداین؟

بە بێتاقەتی پرسیارەکەی دووبارە کردەوە:

- باشە بۆچی ئەم سێ ڕۆژە نە دیار بوویت، نە هەواڵت پرسین؟

میرزادە، کەوتە ژماردنی هۆ و هەنجەتەکانی نەچوون و دیارنەبوونەکەی خۆی. بەلام لیزاڤیتا، هەمدیس قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- هەموویان بەگێل و گەمژەت دەژمێرن و کڵاوت دەکەنە سەر! دوێنێ چووبوویت بۆ شار، وا نییە؟ من گرە و دەکەم کە چوویتە، کڕنوشت بۆ ئەو خوێڕی هەتیوچەیە بردووە و لێی پاڕاویتەوە کە دە هەزار ڕۆبڵەکەت لێقەبووڵ بکات.

- نا، بە هیچ جۆرێ، هەرگیز نە شتی وام بە بیرا هاتووە. نە دیتووشمە، بەڵام حەز دەکەم ئەوەت پێ بڵێم کە ئەو خوێڕی و هەتیوچە نیە. نامەیەکی بۆ ناردووم.

- کوا، نامەکەم پێنیشان بدە.

میرزادە، کاغەزێکی لە جانتاکەی خۆی دەر هێنا و دایە دەست لیزاڤینا




پروکوڤیڤنا کە بەم جۆرە نووسرابوو:

" بەڕێزەکەم، هەڵبەتە من لە نۆرین و گۆشەنیگای خەڵکەوە، کەمترین مافم نییە کە هەست بە کەرامەتی خۆم بکەم. خەڵکی لەوە بە کەمتر و بچووکترم دەزانن کە ئەو مافەم پێڕەوا بدین، بەڵام ئەوە بۆچوون و نۆرینی خەڵکە، نۆرینی تۆ بۆ دنیا، بۆ شتەکان وەکو نۆرینی ئەو خەڵکە نییە، جیاوازە. من، قوربان، قەناعەتی تەواوم بەوە هەیە کە ڕەنگە تۆ لە هەموو خەڵکی باشتر بیت. من لەگەڵ بۆچوونی دکتۆرنکودا نیم، لەم خاڵەدا تەواو پێچەوانەی ئەوم. من هەرگیز، ڕۆژێ لە ڕۆژان تاقە کوپیکێک لە تۆ وەرناگرم، بەڵام تۆ یارمەتی دایکت داوم. بۆیە لەسەرمە سوپاست بکەم، هەر چەندە ئەم کارە نیشانەی لاوازییش بێت. بەهەرحاڵ، من هەنوکە بە چاوێکی دی تەمەشای تۆ دەکەم، بە پێویستم زانی ئەوەت پێ ڕابگەیەنم. لە کۆتاییدا پێم وایە، لە ئێستا بەدواوە هیچ جۆرە تەماس و پەیوەندییەکمان لەنێواندا دروست نابێ...

ئانتیپ بوردوفسکی."

"تێبینی: پاشماوەی ئەو دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵەی کە پێت قەرزار بووم، بەگوێرەی توانا، بە زووترین کات بۆتی دەنێرمەوە ".

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بەپەلە کاغەزەکەی خوێندەوە، بە قێزێکەوە فڕێی دا و گوتی:

– کە شتێکی قۆڕ و گەوجانەیە! شایستەی خوێندنەوە نییە. بۆچی پێدەکەنی؟

– دان بەوەشدا بنە کە بە خوێندنەوەی خۆشحاڵ بوویت.

– من؟ یانی بە خوێندنەوەی ئەم هەموو فشەفش و خۆهەڵکێشان و لاف و گەزافە خۆشحاڵ دەبم؟ باشە نابینی هەموو ئەو خەڵکە چۆن غروور و لە خۆبایی بوون و خۆ هەڵکێشان و لاف و گەزاف مەست و گومڕای کردوون؟

– با، دەبینم، بەڵام دانی بە هەڵەکانی خۆیدا ناوە و پەیوەندیی دەگەڵ دکتۆرنکودا بڕیوە. چەندیش بە خۆی بنازێت، ئەم کارەی زۆر گران

کەوتووە لە سەری. ئاهـ.. تۆ هێشتا زۆر منداڵی لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا!

– دڵت شەپازللەی دەوێ؟

– نا، هەرگیز دڵم بە شتی واوە نییە! من تەنیا ئەوە دەبینم کە تۆ دڵت بە خوێندەوەی ئـەم نامەیـە زۆر کرایەوە، بـەڵام دەیشـاریتەوە، نـاتەوێ دەری بڕیت. بۆچی شەرم لە سۆز و هەستی خۆت دەکەی؟ تۆ لـە هـەموو شـتێکدا هەر وایت.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لە توڕەییدا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لـە شـوێنی خۆیەوە ڕاپەڕی:

– نەخەڵـەتابی لـەمڕۆ بەدواوە پـێ بـە ماڵەکـەی منـدا بکـەی! نـامەوێ لـە ئێستا بەدواوە، بە هیچ جۆرێ چڕ و چارەی تۆ ببینم!.

– دوای سـێ ڕۆژی دی بـە خـۆت دێـی بـە دوومـا و دەعـوەتم دەکـەیت! ئەمـە چییـە؟ بـە ڕاسـتی شـەرمە بۆ تۆ کـە شـەرم لـە جوانترین و مرۆڤـانی ترین هەست و سۆزی خۆت دەکەی، ئاخر ئەمـە بۆ، لـە پـای چی؟ تۆ بـەم کارە تەنیا خۆت عەزاب دەدەیت.

– ئەگـەر بکەومـە حـاڵی مـەرگیش نـەدەنێرم بـە شـوێنتا و نـە دەعوەتـت دەکەم. ناوت لە بیری خۆما دەسڕمەوە! لە ئێستاوە سڕیمەوە و تەواو.

دوای ئەو قسەیە، میرزادەی جێ هێشت و بەهەشتاو کەوتە ڕێ.

میرزادە، لە دواوە هاواری کرد:

– بە بێ ئەوەی تۆش بڵێی، ماڵی ئێوەم لێ قەدەغە کرابوو!

خـانم یـەپانچین، لەسـەر پاژنـەی پێیـان وەرچـەرخایەوە و بەسەرسـامی گوتی:

– چی – چی؟ کێی لێی قەدەغە کردبوویت؟

میـرزادە، وەک بڵێـی هەسـت بکـات، ئەو قسـەیەی لـە زیـادە کـرد، هـیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا شێتئاسا هاواری کرد:

– کێ هاتوچۆی ماڵی ئێمەی لێ قەدەغە کردوویت؟

– ئاگلایا ئیڤانوڤنا...

- ئەمە کەی؟ قسە بکە، بۆ دەمت بووە بە تەڵەی تەقیو؟...
- ئەم بەیانییە جوابی ناردبوو کە بۆم نییە لەمڕۆ بەدواوە هەرگیز پێ بە ماڵی ئێوەدا بکەم...
لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، دەتگوت جادووی لێ کراوە، بەڵام هێشتا دەیتوانی بیر بکاتەوە. ئەوسا، لەناکاودا هاواری کرد:
- چ جوابێکی ناردبوو؟ بە کێدا؟ بە یارۆی دەمڕووتا؟ جوابی زارەکی بوو؟
میرزادە گوتی:
- نە، کاغەزێکی ناردبوو.
- کوا نامەکە؟ خێرا بمدەیە!
میرزادە، بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو، ئەوسا دەستی برد، لە گیرفانی ئێلەکەکەی پارچە کاغەزێکی بێ زەرفی دەر هێنا کە ئەم پەیامەی تیا نووسرابوو:
" میرزادە لیون نیکولایوفیچ میشکین! ئەگەر، دوای هەموو ئەو شتەی ڕووی دا، بتەوێ غافڵگیرم بکەیت و بێیت بۆ ماڵمان، دڵنیا بە لەو کەسانە نیم کە بە هاتنت خۆشحاڵ دەبم...
ئاگلایا یەپانچین".
لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو. ئەوسا بەهەشتاو بەرەو میرزادە چوو، دەستی گرت و وەپێشی دا و بەوپەڕی نیگەرانی و پەریشانی گوتی:
- هەر ئێستا! وەرە! ئیشم پێتە!
- بەڵام تۆ دەمکەی بە نیشانەی...
- بە نیشانەی چی؟ ساویلکە! کەودەن! بە جۆرێ ڕەفتار دەکەی وەکو ئەوەی پیاو نەبیت! دەی! ئەم جارەیان دەمەوێ بە چاوی خۆم هەموو شتەکان بدینم، بە چاوی خۆم...
- بوەستە با کڵاوەکەم بێنم...
- ئەوە کڵاوە پیسەکەتە! دەی ڕێکە! زەوقی ئەوەت نییە تەنانەت

کڵاوێکی جوان بۆ خۆت هەڵبژێری!...

لیزاڤیتا پروکوڤیڤنا، لە کاتێکا توند دەستی میرزادەی گرتبوو، بە دووی خۆیدا بکێشی دەکرد، لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئەوەی نووســــیوە... دوای ئەو ڕووداوەی تــــۆزێ لەمــــەپێش ئەوەی نووسیوە... دیارە لە گەرمەی هەڵچووندا نووسیویەتی...

ئەوسا ڕووی کردە میرزادە و لە سەری ڕۆیشت:

- تۆزێ لەمەپێش، هەڵبەتە لە ڕووی دڵسۆزییەوە دەرهەق بە تۆ، وەکو گلەیی، لە بەرچاوی ئەو گوتم لەبەر گەوجی نایەیت، دەنا بۆ نایەی!... خەتای منە، ئەگەر من ئەو قسانەم نەکردبا، ئەویش ئەو کەرێتییەی نەدەکرد نامەی وا گەوجانەت بۆ بنووسێت، نامەی وا بێنەزاکەت! ئەمە بۆ کیژی ماڵباتێکی خانەدان و بە ئەسڵ و فەسڵ، بە تەربێت و هۆشن، بەڵێ پڕ هۆشوگۆش، دەکاتە بێ نەزاکەتی!

ئەوسا لە سەری ڕۆیشت:

- ئم... دەبێ لە هاتوچۆنەکردنەکەی تۆ تورە بووبێت. ڕێی تێدەچێت، بەڵام دەبوایە بیزانیبا کە نابێ ئەم جۆرە نامەیە بۆ بابایەکی گەمژە، کە مانای حەرفی و ڕواڵەتی شتەکان وەر دەگرێت، بێتە نووسین، وەکو ئەمە بە عەمەلی ڕووی داوە.

کە هەستی کرد، لە قسەکانیا زیادەڕۆیی کردووە، هاواری کرد:

- بۆچی وا گوێ دەگریت؟ ئەو پێویستی بە لێبۆکێکی وەکو تۆیە، چونکە دەمێکە نەیدیویت، بیری کردوویت و ئیدی بەو شێوەیە دەعوەتی کردوویت!... زۆرم پێ خۆشە کە دەتکات بە مەخسەرەی خۆی!... سزای تۆ تەنیا ئەمەیە!.

ئەویش لەم کارەدا مەعلانە! بە ڕاستی زۆر کارامە و شارەزایە!...

٢٠١٣/١٢/٢٠




## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ۱۹۵۱دا لەدایک بووە.
- لە ساڵی ۱۹۷۵ کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (۱۷۰) ڕۆژنامەی هاوکاری لە ۱۹۷۳/٦/۸ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ۱۹۷۵ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ۲۲۲، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک،نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ۲۲۲ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کرد و وەتەوە.

*لە ساڵی ۱۹۷٤ – ۱۹۷۵دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ۲۰۱۰/۸/۲۰ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکوکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوودان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێک لە وانە:

۱- تیرۆژ، کۆ چیرۆک، چاپی یەکەم ۱۹۷۹
۲- کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم،۱۹۸۸،چاپی سێیەم ۲۰۰۷
۳- بەیداخ، چیرۆک، چاپی یەکەم ۱۹۸۸
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆک،چاپی دووەم ۲۰۰۵
٥- لەخۆ بێگانەبوون، کۆمەڵە چیرۆک، چاپی یەکەم (۱۹۹۹) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆک، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ۱۹۸۷ شاخ
۷- نینا، ڕۆمان، سابت ڕەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،۱۹۸٥ چاپی سێیەم ۲۰۰۵
۸- نامۆ، ڕۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ۱۹۸۷ چاپی چوارەم ۲۰۰۹ وەشانخانەی سایە،سلێمانی
۹- ڕێبەر، ڕۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ۱۹۸۳، چاپی دووەم، ۲۰۰۷
۱۰- شکست، ڕۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، ۲۰۰۹ خانەی وەرگێڕان.
۱۱- هاوماڵەکان، ڕۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ۲۰۰۰ دەزگای گوڵان





١٢ – بێناسنامەکان، ڕۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، ڕۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دووره وڵات، ڕۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٥- ئازادی یا مەرگ، ڕۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو ڕۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوک
٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆک، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی
٢١- چیرۆکستان،کۆمەڵێک دەق ورەخنەی جیهانی چ٢٠٠٥،١،نووسەرانی کەرکوک
٢٢-دیدارو دەق و ڕەخنە، چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ، چ٢٠٠٨،١ نووسەرانی کەرکوک
٢٥- میوان، چیرۆک، ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدرلێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدە وبیستەمدا، کریس کۆچرا، چاپی شەشەم ٢٠١١
٣١ –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(     ) دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆڕاگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەدحاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٤١- ڕیچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر. چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆک بۆ منداڵان، یەلماز گونای

٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینییە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالآن)
٤٧- چەند چیرۆکێک لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق) چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و ڕۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١، دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی - کوردی) حەمە کەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨) دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتیی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسووف و زانای گەورەی میللەتی ڕوس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاک لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ڕیالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- ڕاگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٢-ڕاگەیاندن لەنێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

---

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین). چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی ڕینیسانسەوە تا ئێستا). چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکا و ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا). چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ڕیالیزم ودژە ڕیالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام، چ١،٢٠٠٤، دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان، ڕەزا سەید حسەینی، چ١،٢٠٠٦دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی ڕ وسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەک لەمەڕ نامۆ، لویس ڕیی،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەر وژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فوئاد زکریا، چ١، یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- ڕێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، (چ١) ٢٠٠٦
٧٤- شیعر کوژی.. حەمە کەریم عارف، چ١/ ٢٠١٠/ کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکوک، ژمارە(٧٠)

٧٥- دەربارەی ڕۆمان و چیرۆک، حەمەکەریم عارف، چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەر و چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-ڕۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوک
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی، ٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم
٧٩- پەڵکەڕەنگینە، حەمە کەریم عارف، چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، (جانتا) کۆچیرۆک، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د. عەلی شەریعەتی
٨٣-ڕیوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
٨٤-وقفات فی رحاب الپقافە الکوردیە، حەمە کەریم عارف
٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (ڕۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
٨٨-ڤل الصوت و قصص اخری، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی
٨٩-شازادە و گەدا، ڕۆمان، مارک توین
٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی
٩١-سفرەی فەقیران  حەمە کەریم عارف
٩٢-باڵندەکەی من  ڕۆمان، فریبا وفی
٩٣- نامەکانی تولستۆی
٩٤- جەمیلە، ڕۆمان  جەنگیز ئایتماتوف
٩٥- حەفتا چیرۆکی چینی بۆ مناڵانی کورد
٩٦- الرحیل الدامی.... تقدیم وترجمە: جلال زنگابادی
٩٧- کۆڵوانە سوور... کۆچیرۆک بۆ منداڵان
٩٨- ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت.. ڕۆمان.. شامیسۆ
٩٩- دکتۆر... شانۆنامە... برانسیلاڤ
١٠٠- با خەییام باش بناسین /جەلال زەنگابادی
١٠١- دۆزەخی پیرۆز، ڕۆمان، برهان شاوی
١٠٢- من و نەنکم و ئیلاریون و ئیلیکۆ / ڕۆمان / نودار دومبادزە
١٠٣- یادگارییەکانی خانەی مردووان/ دۆستویفسکی
١٠٤-مێژووی ڕۆمانی تورکی
١٠٥- دیوار... کۆچیرۆک.... .... .... .... . کۆمەڵێک نووسەر
١٠٦- کۆکورۆ.... .... ... ... ڕومان.... .... . ناتسومی سوسکی
١٠٧- کانییە قارەمان.... کۆچیرۆک بۆ مێرمنداڵان /حەمەکەریم عارف
١٠٨- ئەودیوی مەرگ..... .... ..... حەمەکەریم عارف /چ١٢٠٠١/ موکریانی
١٠٩- قاوشی ژمارە شەش/ چیخۆف/ پێشەکی و پاچڤەی: حەمەکەریم عارف
١١٠- گەمژە، ڕۆمان، دوو بەرگ، دۆستۆیفسکی
١١١- دەربارەی هۆزان و هۆزانڤانی...
١١٢- ساڵنمای ژیان و بەرهەمی...
١١٣- تاراس بۆڵبا/ ڕۆمان/ گۆگۆل



گەمژە

١١٤- لە زمانی چیرۆکنووسانەوە
١١٥- جیهانی چیرۆک ( کۆمەڵێک دەق و ڕەخنە)
١١٦- ڕۆبینسۆن کرۆزۆ/ ڕۆمان/ دانیل دیفۆ
١١٧- هەزار پیشە.... .... ... حەمەکەریم عارف
١١٨- چیخۆف...هنری ترۆیا
١١٩- دۆنی ئارام/١
١٢٠- دۆنی ئارام/٢
١٢١- دۆنی ئارام/٣
١٢٢- دۆنی ئارام/٤
١٢٣- دەربارەی ئۆدیسە
١٢٤- دەربارەی نامۆکەی ئەلبیر کامۆ
١٢٥-ژیان و بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی
١٢٦-گەنجینەی ئەدەبیاتی کلاسیکی جیهان
١٢٧-بەنگکێشێکی عەودالی بەهەشت"ڕۆمان"
١٢٨- سێو و سیمرغ" کۆ حیکایەت"
١٢٩- بیرەوەرییەکانی ئانا گریگۆریڤنا دۆستۆیفسکی
١٣٠-پوشکین سەرقافڵەی ئەدەبی ڕووسی
١٣١-گۆگۆل،دامەزرێنەری ریالیزمی رەخنەیی
١٣٢-ڕەبەنێکی ڕەشپۆش, چیخۆف
١٣٣- کەنیزۆ ،کۆمەڵێک چیرۆکی هەڵبژاردەی فارسی
١٣٤- داستانی بەرخودان ، ن: ئەشرەفی دیهقانی .
١٣٥- جیرۆکی شاریک , رۆمان , ئەحمەد مەحموود.
١٣٦- مردووی زندوو ، ڕۆمان ، هنری ترۆیا
١٣٧- کۆلانی میدەق، رۆمان، نەجیب مەحفوز
١٣٨- چۆن پۆلامان ئاودا، ڕۆمان، ئۆسترۆفسکی
١٣٩- چارەنووسی مرۆڤێک و چەند چیرۆکێکی دی
١٤٠- ٢٣چیرۆکی تۆلستۆی
١٤١- ئەفسانەی ترواده..

* لە ڕاپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداریی بزاڤی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمەجۆر (نووسین و ئامادەکردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..
* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەک تەماحی بلاوکردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...

کاراکتەرانی ئەم ڕۆمانە، وەکـــو گـــەلێک لە کـــاراکتەرانی نێو ئەفسانانی ڕووسی، ڕەفتاری تایبەت بە خۆیان هەیە، کە لە زۆر ڕووەوە لە بیرکردنەوە و هزرینی ئەمریکاییەکان جیاوازە و چیرۆکەکە لای زۆربەی خوێنەران نـــاواقیعی و باوەڕنەکردەنیە. ڕەنگە جدیترین کـــێشە لای خوێنەران ئەو وێنەیەی میرزادە میشکین بێ، کە لە لایەن نووسەرەوە پیشان دراوە و بەرجەستە کراوە میشکین بەپێچەوانەی هەموو کاراکتەرەکانـــی دیکەوە، کەسێکە کە دێوانە و گـــێل و گـــــەوج دەنوێنێ، بەڵام لە واقیعدا، زۆر وریا و زیرەکـــە. بەڵام واقیعی فێدارییەکەی میرزادە، مەسەلەکـــە تـــا ڕادەیەک لە خوێنەر دەئاڵۆزێنێ و پـــیاو تیادەمێنێ کە ئایا میرزادە بە ڕاستی گەمژەیە یان نا. بەڵام وێڕی ئەمەش، گەمژە وەکـــو ڕەنگدانەوە یەکی ئەخلاقیات و ڕەفـــتار و داب و نەریـــت و فەلسەفەی ئەو ڕۆژگارەی ڕووسیا، ڕۆمانێکی جوان و پڕ عیبرەتە.




بەرگ : ئیبراهیم ساڵح